# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و حەوتەم

سوورەتەکانی

(الفتح) و (الحجرات) و (ق) و (الذاريات)



عەلی باپیر

## تەفسیری سوورەتەکانی

# الفتح و الحجرات و ق و الذاريات

نووسینی : عەلی باپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢٢ز
٧٩٥ لاپەڕە
١٧* ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْـدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْــتَعِينُهُ، وَنَسْــتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِــنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْدِه اللَّـهُ فَلاَ مُضِــلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فَـإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيـث كَلاَمُ اللَّـه، وَخَيْرَ الْهَـدِي هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَــلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَــلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەڕێــزو خۆشـەویسـتەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دواڕۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەڕێـزی فێـردەکرد، پێـش هــەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتـارە، هـەرکام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـە: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطَّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیـش - كـە وەك باسـكردنی چاكـەی خـوا (التحـدّث بنعمـة اللّـه) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم كردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاكـەی لەگـەڵ كـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی كـردووم و، بـەر لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵییەوە هیدایـەتی داوم، قورئـانی بەڕێـزو پێـز لەبـەر بكـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەكانی قورئـان و، تێوەڕامـانی ئایەتـە پڕ بەرەكەتەكانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هـەر بۆیـەش تێكـڕای كتێـب و نامیلكـەو وتـارو دەرسـەكانم، كـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، كـە دیـارە هـەر ئەمـەش شـتێكی سرووشـتییە؛ ئاخـر ئایا ئیسـلام، بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبـەر ﷺ، كـە ئەویـش هـەر ڕوونكردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێكـردن و كارپێكردنیـەتی، شـتێكی دیكەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجـا لەمێـژ سـاڵیش بـوو، كـە بـراو خوشـكانێكی دڵسـۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایان لێدەكـردم كـە دەسـت بكـەم بـە دانـانی تەفسـیرو لێكدانەوەیـەكی قورئـان، هـەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمـەوە، كـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو كارە گـەورەو گرنگـە بكـەم، بەڵكـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هـەرساڵە هـەندێكی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشـدا، هـەتا دەرفەتێـكی وام بۆ دەڕەخسـێ كـە بتوانـم خێرایـی تێدا بكـەم و خۆمـی بـۆ یەكلایـی (متفـرّغ) بكەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بكـەم، ئەگـەر تەمـەن بەبەریـەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێكدانەوەیەشـم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسـیـرانەی كـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خـودی قورئان، چونكە بێگومان قورئان: هـەندێكی هـەندێكی ڕوون دەكاتەوە: (القرآن يُفَسِّـر بَعضُهُ بَعْضَـاً)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونكە پێغـەمبـەری خـواش ڕوونكەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئـانە، وەك خـوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیكرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاكو ئەوەی بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئان پێشكەش بە مسوڵمانانی كوردستان بكەم، كە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش كە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەكانی و كتێبەكانی سوننەتدا خەریكم و، دەیان كتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەكانی زانستەكانی شەریعەتدا پێشكەش كردوون.

شایانی باسیشە كە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی كرانەم لەلایەن ئەمریكاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێكی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی كتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەكانییەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچكەسیش بۆی نیە بڵێ: كە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونكە وێڕای سنووورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر كتێبی لە هەموو ڕوویێكەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە كە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە ئێستا چاپ كراوەو، كەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەكانی ئیسلام بكەم و، تاكە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەكانی سوننەت، كە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، كراوە بە دوازدە (١٢) كتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیـم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قوڕئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعــالــی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخريج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قوڕئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســوورەتێك بۆخــۆی شــتێکی ســەربەخۆیــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قوڕئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشـدا، دیسـان حیســاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بــرا دڵسـۆزە ئێســتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قوڕئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـــان بەردەوام بێ، هەتــا کۆتــایی ئەم تەفسیــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە كە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـكەش كـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتكارییم كـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێكیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێكـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەكانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەكەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەكانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەکان لابرێن و، لە کۆتایی کۆی بەرگەکانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی كۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، كەچی ڕەنگە لە تەفسیرەكانی دیكەش - یەكێكیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە من ئەو تەفسیرەم نەكەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله رب العالمين، وصلاته وسلامه وبركاته على محمد المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين صحبا وأزواجا وقرابة والتابعين لهم بإحسان ويقين.**

خوێنەرە بەڕێزەکانم!

ئەمە بەرگی بیست و حەوت (٢٧)ە، لە تەفسیری قورئانی بەرزوبەپێز، کە هەرچوار سوورەتی: (**الفتح و الحجرات و ق و الذاريات**)ی تێدان، کە زۆربەی جوزئی (٢٦) و، تۆزێك لە جوزئی (٢٧)یشی گرتۆتەوە.

ئەم بەرگەش بەهەمان میتۆد (**منهج**) و شێوازی بەرگەکانی پێشوویەتی و، وێرای بەحەوت قۆناغ تەفسیرکردنی ئایەتەکانی هەرکام لەو چوار سوورەتە موبارەکە، ژمارەیەك کورتەباسیشمان نێواخن کردوون، کە تیشکی زیاتر دەخەنە سەر چەمك و واتای هەندێك لە ئایەتەکان، بەمجۆرەی خوارێ:

**یەکەم: سوورەتی (الفتح):**

١- بەرچاو ڕوونییەك: تەوەری یەکەم: باسی صوڵحی حودەیبییە و جەنگی خەیبەر.
تەوەری دووەم: حیکمەت و بەرهەمەکانی صوڵحی حودەیبییەو جەنگی خەیبەر.

٢- سەرنجێك لەبارەی لێبوردرانی گوناهی پێغەمبەرەوە ﷺ.

٣- کورتەباسێك لەبارەی ئەم ڕستەیەوە: (**يد الله فوق أيديهم**).

٤- کورتەباسێك لەبارەی ڕەوانەبوونی جەنگ کردنەوە، بەمەبەستی مسوڵمانکردنی خەڵك.

٥- عومرەی گێڕراوە (**عمرة القضاء**).

٦- کورتەباسێك لەبارەی ڕێنمایی و بەرنامە بوونی پەیامی خواوە.

٧- کورتەباسێك لەبارەی: خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ.

### دووەم: سوورەتی (الحجرات):

١- پێنج هەڵوێستە لەبەردەم ئەو دوو ئایەتە (٣ و ٤)ی الحجرات دا.

٢- کورتەباسێك دەربارەی ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

٣- کورتەباسێك لەبارەی دادگەریی هاوەڵانەوە.

٤- کورتەباسێك: وەرگرتنی هەشت حوكمی شەرعیی لەو پێنج ئایەتەدا (٦-١٠)ی الحجرات.

٥- کورتەباسێك: دە (١٠) پایەی بنەڕەتیی برایەتیی ئیسلامیی.

٦- کورتەباسێك لەبارەی ئەو شەش قەدەغە كراوەوە كە لە ئایەتی (١١ و ١٢)دان.

### سێیەم: سوورەتی (ق):

١- خستە ڕووی شەش وردەكاریی لە ئایەتەكانی : ١٦ و ١٧ و ١٨ دا.

٢- کورتەباسێك لەبارەی حیكمەتی خواوە لە دروستكردنی ڕووەك و دارودرەخت دا.

### چوارەم: سوورەتی (الذاریات)

١- پێنج نوكتەی ڕەوانبێژیی و بەسەرهاتێكی سەرنجڕاكێش.

٢- کورتەباسێك دەربارەی زەوی.

٣- کورتەباسێك لەبارەی جەستەی مرۆڤەوە.

٤- چەند تەوەرێكی گرنگی مامەڵەی خانەخوێ لەگەڵ میوان دا.

٥- کورتەباسێك لەبارەی لێككشانی ئاسمان (گەردوون)ەوە.

٦- کورتەباسێك لەبارەی هەبوونی جوتەییەتی لە سەرجەم دروستكراوەكانی خوادا.

٧- کورتەباسێك لەبارەی حیكمەتی خواوە لە دروستكردنی جند و مرۆڤ دا.

خوای میهرەبانیش بەبەزەیی و بەخششی بێ سنووریی خۆی، كارئاسانیی پترمان بۆ بكات، بۆ هەرچی باشتر خوێندنی قورئان و قووڵتر لێتێگەیشتنیی و چاكتر

کارلێـك لەگەڵـدا کردنـی لـە هەمـوو بوارەکانـی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی دا، چونکـە بـە دڵنیایـی بەهـۆی نزیکیـی لـە قورئـان و لـە خزمەتدابوونـی و کارلێـك (**تفاعـل**) لەگـەڵ کردنیـەوە، پێـز و هێـز دەکەوێتـە ژیانـی تـاك و کۆمەڵـگاوە، لەهەرچـی مایـەی عەیبداریـی دنیـا و گوناهباریـی قیامەتـە پارێـزراو دەبـن.

## دەستپێک

بەڕێــــزان!

ئەمــڕۆ کــە ڕۆژی (٢٠)ی جــمادي الثــاني/ ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچییــە، بەرانبــەر: (٢٠٢٠/٢/١٤)ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کـردنی سـوورەتی (الفتـح)، سـەرەتا، وەک عـادەتی خۆمـان پێناسـەو نێـوەڕۆک و مەبەسـتەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو.

## پێناسەی سوورەتی (الفتح) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

تەنیـا بـە (سُورَة الفَتْح) نـاسراوەو، نەزانـراوە هیـچ ناوێکـی دیکـەی هەبـێ، وەک لـە صەحیحـی بوخارییـدا هاتـوە:

**أ-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، سُورَةَ الْفَتْحِ، فَرَجَّعَ فِيهَا} **(أخرجه أحمد: ٢٠٥٨٤، والبخاري: ٤٨٣٥، وأبو عوانة: ٣٨٨٤، والبيهقي فـي الصغرى: ٧٨١).**

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی موغەففــەل رضي الله عنه، گــوتی: پێغەمبــەر ﷺ لــە ڕۆژی ســەرکەوتنی مەککــە (ئازادکـرنی مەککـە و دەرهێنانـی لـە چنگـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانــەرەکان)دا، ســوورەتی فەتحــی خوێنــدو، دەنگــی خــۆی پــێ دەلاراندەوە.

**ب-** ڕیوایەتێکی دیکەش، لەو بارەوە هاتوە: {قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ فِي مَسِيرِهِ سُورَةَ الْفَتْحِ عَلَى رَاحِلَتِهِ رفع بها صوته يُرَجِّعُهُ}، **(أخرجه البخاري: ٥٠٤٣، ومسلم: ١٨٨٩).**

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ لـە سـاڵی فەتحـدا، لە کاتێکـدا کە دەڕۆیـی بەڕێوە بە سـواریی وەڵاخەکـەی، سـوورەتی فەتحـی دەخوێنـدەوە، دەنگـی خـۆی پـێ هەڵدەهێنـاو، پێـی دەلاراندەوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە لـە کۆتایـی سـاڵی شەشـەمی کۆچیـی داو، بـە شـەو دابەزیـوە، لـە ڕووی جوگرافییشـەوە لـە نێـوان مەککـەو مەدینـەدا، لـە شـوێنێک کـە (**كُرَاعُ الغَمِيْم**) ی پێدەگوتـرێ، لـە کاتێکـدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە (**حُدَيْبِيَـة**)ەوە، دەگەڕایـەوە بـەرەو شـاری مەدینـە، بـەر لـە جەنگـی خەیبـەر، زانایـان لەوبـارەوە یەکدەنگـن، لـەو بـارەوەش دەق زۆرن، بـۆ نموونـە: ئـەم دەقـە دێنیـن:

{**عَـنْ قَتَـادَةَ أَنَّ أَنَـسَ بْـنَ مَالِـكٍ** ﷺ، **حَدَّثَهُـمْ قَـالَ: لَـمَّا نَزَلَـتْ:** ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ١﴾، **إلى** ﴿فَوْزًا عَظِيمًا ٥﴾، **مَرْجِعَـهُ مِـنَ الْحُدَيْبِيَّـةِ، وَهُـمْ يُخَالِطُهُـمُ الْحُـزْنُ وَالْكَآبَـةُ، وَقَـدْ نَحَـروا الْهَـدْيَ بِالْحُدَيْبِيَّـةِ، فَقَـالَ: لَقَـدْ أُنْزِلَـتْ عَـلَيَّ آيَـةٌ هِـيَ أَحَـبُّ إِلَيَّ مِـنَ الدُّنْيَـا جَمِيعِهَـا**} (**أخرجـه: مسـلم: ١٧٨٦، والترمـذي: ٣٢٦٣**).

واتـە: قەتـادە (کـە یەکێکـە لـە زانایـانی تابیعیـن)، لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ﷺ گێڕاویەتـەوە کـە بـۆی باسـکردوون و گوتوویـەتی: کاتێـک ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ١﴾، هەتـا دەگاتـە: ﴿فَوْزًا عَظِيمًا ٥﴾ دابـەزی، (واتـە: ئایەتـەکانی سـەرەتای سـوورەتی فەتـح کـە ئـەو بـەس باسـی پێنـج ئایەتەکـەی کـردوە، بـەڵام دەگونجـێ هەمـوو سـوورەتەکە بەسـەر یەکـەوە دابەزیـێ، زیاتـر ئـەوە پـێ دەچـێ، بـەڵام ئـەو پێنـج ئایەتـە، پەیوەسـتن بـەوەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ دوایـی دەیفەرمـوێ لـە کاتێکـدا ئـەوەی بـۆ دابـەزی) کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە حودەیبییـەوە، دەگەڕایـەوە بـەرەو مەدینە، ئـەوان (هـاوەڵان) دڵتەنگیـی و خەفەتبارییەکـی زۆر تێکـەڵ بـە دڵ و دەروونیـان بـوو بـوو، قوربانییەکانیشـیان لـە حودەیبییـە سـەربڕیبوون، (و نەچووبوونـە نێـو سـەر

زەمینی حەرەمەوە، پێغەمبەر ﷺ)، لەو کاتەدا فەرمووی: بە دڵنیایی ئایەتێکم بۆ سەر دابەزێنراوە، کە لە لام خۆشەویستترە لە تێکڕای دنیا.

کە فەرموویەتی: (آيَةٌ) مەرج نیە، مەبەستی پێی یەک ئایەتی دیاریکراو بوو بێ، واتە: ئەو قورئانەی بۆم دابەزیوە، بەڵام ڕەنگە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: زۆرم لەلا خۆشەویستە، ئەو پێنج ئایەتە بن، کە هەم موژدەی تێدایە بۆ خۆی، هەم بۆ هاوەڵانی بەڕێزی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە تایبەت و، بۆ بڕوادارانیش بە گشتیی.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ئێمە لە تەفسیرەکانەوە ئەم بڕگەیە دێنین و، ئەوانیش بە زۆریی لە جابیری کوڕی زەیدەوە دەیهێنن، چ (**السیوطي**) لە (**الإتقان في علوم القرآن**)دا، چ (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**التحرير والتنوير**)دا، چ زانایانی دیکە.

لە لای جابیری کوڕی زەید، ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە لە دابەزیندا، ژمارە (١١٣)یەو، لە موصحەفیشدا ژمارە (٤٨)ە، واتە: ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، کە قورئان هەمووی (١١٤) سوورەتە، ئەم سوورەتە لە پێش سوورەتی (**التوبة**) و، لە دوای (**الصَّف**) دابەزیوە، کەواتە: سوورەتی (**التوبة**)، (١١٤)ەمین سوورەتە، کە هەمووی بەسەر یەکەوە دابەزیبێ، کە کۆتا سوورەتی قورئانەو، کاتی خۆی لە کاتی تەفسیرەکردنیدا باسمان کردوە.

بەڵام کە دەگوترێ: ئەم سوورەتە کۆتا سوورەتە دابەزیوە، واتە: سوورەتی (**التوبة**)و، ئەمەیان سوورەتی پێش کۆتاییە کە سوورەتی (**الفتح**)ە، مانای وانیە هیچ ئایەتی دیکە لە هیچ سوورەتان دوای ئەوانە دانەبەزیوە، بۆ وێنە: باسی ئەو ئایەتە کە دەکرێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴿٣﴾﴾المائدة، کە ئەمە کۆتا ئایەت بێت، لە قورئان دابەزیبێ.

هەروەها باسی ئایەتێکی دیکە دەکرێ، لە سووڕەتی (البقرة)، پێش ئایەتی (الدَّیْن): ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٢٨١﴾، هەندێ دەڵێن، ئەمە کۆتا ئایەتە، کە ئایەتێکە لە سووڕەتی (البقرة).

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە موبارەکە، بیست و نۆ (٢٩)یە، بەبێ ڕاجیایی، لەوەدا هیچ کەس نەیگوتوە: (٢٨) یان (٣٠)یە، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە موبارەکە، هەمان نێوەڕۆکی قورئانی مەدینەییە، ئەمانەش سەردێڕەکانی بابەتەکانی، کە ئێمە لە دە (١٠) خاڵدا دەیانهێنین:

١- دواندنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، کە خوا سەرکەوتنێکی ئاشکرای بۆ ڕەخساندوەو، مەبەست ڕێککەوتنی حودەیبییەیە، هەروەها لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆشبووە، واتە: ئەو شتانەی بۆ پێگەو پایەی بەرزی پێغەمبەر ﷺ بە گوناهـ ناوبراون، نەک گوناهـ بەو چەمک و واتایەی باوە، هەروەها خوا ﷻ چاکەی خۆی لەسەر موحوممەد ﷺ تەواو کردوەو، ئۆخژنیشیی بەسەر دڵی بڕواداراندا ڕشتوەو، گوناهەکانی لێ سڕیونەوەو، دەیانخاتە نێو بەهەشتانێکەوە، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ئەوەش گەورەترین و مەزنترین بە مراد گەیشتن و بە ئامانج گەیشتنە.

٢- خستەڕووی ئەرکی هەر کام لە پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕوادارانی شوێنکەوتووی.

٣- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە پەیمان بەستن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پەیمان بەستنە لەگەڵ خوادا.

٤- باسی هەڵوێستی خراپی عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان، لە بواری جەنگ و جیهاددا، بە تایبەت لە سەفەری ڕۆیشتن بەرەو مەککەدا بۆ عومرە، کە صوڵحی حودەیبییەی لێ کەوتۆتەوە، ئەوان خۆیان بەجێهێشتوە.

٥- فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە بە عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکانی خۆیان بە مسوڵمان داناوە، ڕابگەیەنێ، کە لەمەودوا بۆ جەنگێکی قورس دژی کۆمەڵێکی بەهێز بانگهێشت دەکرێن، ئنجا ئەگەر بێت و فەرمانبەریی بکەن و، وەک جاری پێشێ، سەرپێچیی نەکەنەوە، پاداشتێکی گەورەیان هەیە، ئەگەرنا تووشی ئازارێکی بە ئێش دەبن.

٦- باسی پەیمان لێوەرگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە هاوەڵانی، لە ژێر درەختەکەدا، کە ناوی (**شَجَرَةُ الرِّضْوَان**)ە، بەو ناوە ناوی ڕۆیشتوەو، موژدەی خۆشی دنیا و دواڕۆژ پێدرانیان لە لایەن خواوە ﷻ.

٧- باسی چەپاڵەدانی خوا بۆ هەر کام لە مسوڵمانان و هاوبەشدانەران، لە زەبری یەکدی و پاراستنیان لە جەنگ و، دەست بە خوێنی یەکدی سوور بوون، لە پێناو سەرگرتنی صوڵحی حودەیبییەدا، کە دوایی بە قازانجی هەموو لایەک شکاوەتەوە، هەموو لایەک بەو واتایە کە چیدیکە خوێنڕێژیی نەبێ و، ئەوانەش کە ئەهلی ئیسلام بوون، دوایی دڵخۆش بن، بەو سەرکەوتنەو، بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، چاوپێچکی سەرچاویان لابچێ و، زیاتر ڕووی گەشی ئیسلامیان وەک خۆی بۆ دەربکەوێ و، ئەو تەم و مژەی لەبەر چاویانە لابچێ و، ببێتە هۆی هیدایەتدران و دڵڕۆشن بوونەوەیان بە هیدایەت و ئایینی هەقی خوا.

٨- باسی هەڵوێستی خراپی کافرەکان لە بەرانبەر مسوڵماناندا، کە بۆ عومرە کردن چوو بوون و، دڵگەرمیی و دەمارگیریی نەفامانەیان و، پاراستنی خوا بۆ بڕواداران لەو حاڵەتە نەفامییەو، پابەندکردنیان بە پارێزکارییەوە.

٩- باسی بە ڕاست دەرچوونی خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی عومرە کردنیان و، چوونیان بۆ سەردانی کەعبە لە ساڵی حەوتەمدا، کە پێی گوتراوە: (**عُمْرَةُ القَضَاء**)،

ساڵێک دوای صوڵحی حودەیبییە، کە لە ساڵی شەشەمدا بوو، ساڵێک دوای ئەوە بەپێی پەیمانەکەی کە لە حودەیبییە لەگەڵ قورەیشدا بەستیان، پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان چوون بۆ ئەنجامدانی ئەو عومرەیە.

**١٠-** پێناسەی پەیامی ئیسلام و پێغەمبەری خوا ﷺو، پێناسەی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ، بە کۆمەڵێک لە سیفەتی بەرچاوو گرنگ و بەرجەستەیان.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە سەرجەم: نۆ (٩)، تایبەتمەندییمان خستوونەڕوو، لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** ئاماژەکردن بە ڕووداوەکانی صوڵحی حودەیبییە، سەرەتا بەوە دەست پێدەکات: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾، ئەمە یەکەمین تایبەتمەندیی ئەم سوورەتەیە، کە تەنیا لەم سوورەتەدا باسی صوڵح و پێکهاتنی نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان، لە بەرانبەریشیاندا قورەیش و بەرەی کوفرو شیرک کراوە، کە لە شوێنێک بووە بە ناوی حودەیبییە، ئەو صوڵحەش هەر بەو ناوەوە هاتوە، ئەوەش دەستکەوتی زۆر گەورە گەورەی تێدا بوون، وەک دوایی باسی دەکەین و، سەرکەوتنێکی مەزنیش بوو، خوا بە بێ خوێن بۆ مسوڵمانانی هێنایە پێش.

**تایبەتمەندیی دووەم:** ڕستەی: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، واتە: ئێمە سەرکەوتنێکی ڕۆشنمان بۆ تۆ ڕەخساند.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** ڕستەی: ﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ٢﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، واتە: بۆیە خوا ﷻ ئەوەی بۆ تۆ ڕەخساند، تاکو لە گوناهی بەرو دوات خۆش بێ و، چاکەی خۆی لەسەرت تەواو بکات.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** لەم سووڕەتەدا سێ جاران باسی سەکینەت (سَكِينَة) کراوە، یانی: ئۆخژن و ئارامیی و دڵنیایی و ئۆقرەیی، هەم لە ئایەتی ژمارەی (٤)داو، هەم لە ئایەتی ژمارە (٨)داو، هەم لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا، هەر سێ جارەکەش (سكينة) تایبەت کراوە بە بڕوادارانەوە، بە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** ڕستەی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾﴾، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتووە، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی پەیمانت پێدەدەن، تەنیا پەیمان بە خوا دەدەن، دەستی خوا لەسەرووی دەستەکانیانەوەیە.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** ڕستەی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ﴿١٥﴾﴾، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتووە، واتە: دەیانەوێ فەرمایشتی خوا بگۆڕن، واتە: ئەو فەرمایشتەی خوا کە گفت و بەڵێنی تێدابوو، بۆ مسوڵمانانێک لە صوڵحی حودەیبییەدا، بەشدار بوو بوون، کە دەستکەوتی جەنگییان بە قسمەت بکات و، لەواندا کورتی هەڵبێنێ، کە بریتی بوو لەو دەستکەوتانەی لە جەنگی خەیبەر گرتیانن، بەڵام عەرەبە خێڵەکییە بیاباننشینەکان دەیانویست خۆیان وەگەڵبدەن، بۆ ئەوەی لەو دەستکەوتەدا بەشدار بن، یانی: لە شەڕێ تەریک بن و، لە خێرێ شەریک بن!

**تایبەتمەندیی حەوتەم:** ڕستەی: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴿١٦﴾﴾، تەنیا لێرەدا هاتووە، واتە: لە مەودوا بانگ دەکرێن، بۆ کۆمەڵێکی خاوەن هێزی زۆر (کە لەگەڵیاندا بجەنگن و ڕووبەڕوویان ببنەوە).

**تایبەتمەندیی هەشتەم:** ڕستەی: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ ﴿١٨﴾﴾، تەنیا لێرەدا هاتووە، واتە: بە دڵنیایی خوا لە بڕواداران ڕازیی بوو (پەسەندی کردن)، کە پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەست لە ژێر درەختەکەدا.

**تایبەتمەندیی نۆیەم:** چەند وشەیەک تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

١- ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ ١٠﴾.

٢- ﴿بِبَطْنِ مَكَّةَ ٢٤﴾.

٣- ﴿بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ٢٤﴾.

٤- ﴿وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ٢٥﴾.

٥- ﴿مَّعَرَّةٌۢ ٢٥﴾.

٦- ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا۟ ٢٥﴾.

٧- ﴿حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٢٦﴾.

٨- ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ٢٧﴾.

٩- ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ ٢٧﴾.

١٠- ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ٢٩﴾.

١١- ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ ٢٩﴾.

١٢- ﴿رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ٢٩﴾.

١٣- ﴿سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم ٢٩﴾.

١٤- ﴿أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ ٢٩﴾.

١٥- ﴿فَـَٔازَرَهُۥ ٢٩﴾.

١٦- ﴿فَٱسْتَغْلَظَ ٢٩﴾.

١٧- ﴿فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ٢٩﴾.

١٨- ﴿يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ ٢٩﴾.

١٩- ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ٢٩﴾.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان بۆ چەند دەرسێك:

كـۆی بیســت و نـۆ (٢٩) ئایەتەكـەی ئـەم سـوورەتەمان بـۆ چـوار دەرســان دابەشــكردوون:

**دەرســی یەكــەم:** ئایەتــەكانی: (١ - ١٠)، باســی ســەركەوتنی ئاشــكراو، چەنــد چاكەیەكـی مـەزنی خـوا لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺو هـاوەڵانی بەڕێزیـدا (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) و، سـزادانی خـوا بـۆ بێبڕوایـان و، خسـتنەڕووی ئەركـی پێغەمبـەری خـوا ﷺو، سـیفەتە بنەڕەتییـەكانی، هەروەهـا ئەركـی شـوێنكەوتووانی پێغەمبـەر ﷺ، چ هـاوەڵانی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـە پێـش هەمـوو كەسـداو، چ بـڕوادارانی دیكـە، تاكـو دنیـا بـە كۆتـا دێ، ئنجـا پەیـمان بەسـتنیان لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ خاتەمـدا، كـە مەبەسـت ئـەو پەیمانەیـە لـە ژێـر درەختەكـەدا، كـە دوایـی بـە (**شَجَرَةُ الرِّضْوَان**)، نـاوی دەركـرد، بەسـترا.

**دەرســی دووەم:** ئایەتــەكانی: (١١ - ١٧)، حــەوت (٧) ئایەتــە، باســی هەڵوێســتی عەڕەبــە خێڵەكییــە بیاباننشــینەكان، كــە لــە تەفســیرەكاندا ناویــان هاتــوەو دوایــی دەیانهێنیــن، هەندێكیــان گوتوویانــە: پێنــج عەشــیرەت بــوون و، هەندێكیــان گوتوویانــە: شــەش بــوون، هەڵوێســتی خــراپ و نەرێنییــان لــە بــواری جەنــگ و جیهــاداو، دواكەوتنیــان لــە ڕووداوی بــەرەو عومــرە چــوون و صوڵحــی حودەیبییــەو، دواتــر ڕەخنــە گرتنیــان لــە نەبردنیــان بــۆ جەنگــی خەیبــەر، تاكــو پشــك و بەشــیان هەبـێ لـەو دەسـتكەوتەدا، كـە لـە جەنگـی خەیبـەردا دەسـتی مسـوڵمانان كـەوت و، هـەواڵ پێدانیـان (بـەو عەڕەبـە بیابانشـینانە)، كـە لەمـەودوا بـۆ جەنـگ لـە دژی كۆمەڵێكـی بەهێـز داوا دەكرێـن، ئنجـا ئەگـەر بێـت و فەرمانبەریـی بكـەن، پاداشـتی گەورەیـان دەبـێ، ئەگەرنـا تووشـی سـزاو جەزرەبـەی خـوا ﷻ دێـن، هەروەهـا باسـی ئەوانـەی پاسـاو و عوزریـان هەبـووە، كـە نەچـن بـۆ بەشـداریی جەنـگ و جیهـاد، كـە بریتیـن لـە كوێـرو شـەل و نەخـۆش.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٦)، واتە: نۆ (٩) ئایەت، باسی پەیمان لێوەرگیرانی هاوەڵان لە ژێر درەختی (**رِضْوَان**)دا، (**شَجَرَةُ الرِّضْوَان**)و، موژدە پێدانیان بە ڕازیی بوونی خوا لێیان و، حیکمەتی دەستگێڕانەوەی مسوڵمانان و کافران لە بەرانبەر یەکدیدا، کە دەستیان نەچێتە خوێنی یەکدیی، هەرچەندە هەر کامێکیان ئەوەی دیکەی لێ هەڵکەوتوە، بە تایبەت خوا ﷻ دەستی مسوڵمانانی گێڕایەوە، لەوەی بە خوێنی کۆمەڵێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان سوور بێ، کە ویستیان پەلاماری مسوڵمانان بدەن، هەروەها مسوڵمانانیشی چەپاڵەداو پاراست، لەوە کە کافرەکان زەفەریان پێ بەرن، ئەویش هەمووی بۆ ئەوەی ئەو صوڵح و پێکهاتنە، کە خوا ناوی لێناوە سەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرا، سەر بگرێ و، باسی چەند سیفەتێکی زۆر خراپی بێبڕوایان و، ستاییشی بڕوادارانی پارێزکار.

**دەرسی چوارەم:** سێ ئایەتی کۆتایی دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٢٧ - ٢٩)، لەو سێ ئایەتەش دا:

أ- لە ئایەتی ژمارە (٢٧)دا، خوا ﷻ باسی هاتنە دی خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە خەونی بینیبوو: خۆی و هاوەڵانی دەچن بۆ مەککەو، تەواف بە دەوری کەعبەدا دەکەن و، خوا پەرستییەکانی عومرە ئەنجام دەدەن، ئنجا هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە صوڵحی حودەیبییەیان کرد، بۆیە زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو و، هۆکارێکی زۆر لەسەر دڵ قورس بوونی هاوەڵان، کە ئەو صوڵحەیان کردوە، ئەوە بوو کە نەچوون بۆ زیارەتی کەعبە و، کە هەندێکیان، جۆرێک لە گومان و دوو دڵییان بۆ دروستبوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەر! ﷺ ئایا نەتفەرموو: دەچین سەردانی ماڵی خوا دەکەین؟، ئەویش فەرمووی: بەڵێ، بەڵام گوتم: ئەمساڵ؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: دەجا دەچین، ئەم ساڵ نا، ساڵێکی دیکە، ئنجا دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆوە، کە خەونەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دێتە دی، دڵیان چاک بوو، ئایەتی ژمارە (٢٧)یش باسی ئەوە دەکات: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا ﷻ خەونی

پێغەمبەرەکەی ڕاست هێنایە دی، دەچنە نێو مزگەوتی حەڕامەوەو، بە دڵنیایی و بەبێ ترسیی، هەندێکتان سەری خۆتان تاشیوەو، هەندێکتان کورتتان کردۆتەوە، لە کەس ناترسێن، خوا ﷻ ئەوەی زانی کە ئێوە نەتاندەزانی، لە پێش ئەوەدا سەرکەوتنێکی دیکەی بۆ ڕەخساندن (کە بریتی بوو لە جەنگی خەیبەرو، ئەو دەستکەوتانەی کە لە جەنگی خەیبەردا گرتیانن و، مسوڵمانان زۆر پێیان دەوڵەمەند بوون و، زۆر بە کەڵکیان هات بۆ قۆناغەکانی دواییان).

ب- لە ئایەتی ژمارە (٢٨)یشدا، خوا ﷻ حیکمەت و ئامانجی نێردرانی پێغەمبەر ﷺ ڕوون دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خاتەم بۆچی هاتوەو بەرنامەکەی چییە؟ کە هەم ڕێنماییەو، هەم بەرنامەیەکی ڕێک و ڕاستیشە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

ج- ئایەتی ژمارە (٢٩) و کۆتایی، هەمووی پێناسەی پێغەمبەری کۆتاییە ﷺو، پێناسەی هاوەڵەکانیەتی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە دیارترین سیفەتەکانیان، کە ئەو سیفەتانەیان و ئەو پێناسەیان، هەم لە تەوڕات دا، هەم لە ئینجیلدا باسکراون، ئەو سیفەتانەی کە لە تەوڕاتدا باسکراون جۆرێکن، ئەوانەش کە لە ئینجیلدا باسکراون، جۆرێکی دیکەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ نەک هەر باسی پێغەمبەری خاتەمی ﷺ کردوە، لە کتێبە پێشووەکاندا، بەڵکو تەنانەت باسی هاوەڵانیشی کردوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە ئێستاش لەگەڵدابێ بەشێک لەو سیفەتانەی باسی پێغەمبەر و نیشانەکانی و، بەشێکیش لەو سیفەتانەی باسی هاوەڵانی پێغەمبەرن، (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پەیمانی کۆندا ماون، پەیمانی کۆن واتە: بە هەر (٣٩) کتێبەکە، یاخود بە هەر (٤٩) کتێبەکەوە، (بەپێی دوو جۆرە سەرژمێری خاوەن کتێبەکان، بۆ ئەو کتێبانەی لە چوارچێوەی پەیمانی کۆندا (**العَهْدُ القَدِيم**)دا کۆیان کردوونەوە)، بەڵکو لە پەیمانی نوێشدا کە چوار ئینجیلەکان و کۆمەڵێک کتێب و نامەی دیکەن، لەوێشدا دیسان باس و خواس و نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئێستاش لەگەڵدابێ، دوای ئەو هەموو گۆڕین و دەستکاریی کرانەی کتێبی خاوەن کتێبەکان، هەر ماون.

## بەرچاو ڕوونییەک

بەڕێـــــزان!

بـەر لـەوەی ڕاسـتەوخۆ بچینـە سـەر تەفسـیرکردنی (٢٩) ئایەتەکـەی سـووڕەتی (الفتـح)، لەبـەر ئـەوەی ئـەو (٢٩) ئایەتـە، هەموویـان لـە بـارەی دوو ڕووداوەوەن:

**یەکەم:** صوڵحی حودەیبییە، لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا.

**دووەم:** جەنگی خەیبەر، لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا.

بۆیـە بـە باشـم زانی وەک بەرچـاو ڕوونیـی باشـترو زیاتـر لـە بـارەی چەمـک و واتـای ئایەتەکانـەوەو، ئـەو کـەش و هەوایـەی ئایەتـەکانی تێـدا دابەزیـون، ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی تێـدا دابەزیـوە، ئـەو دوو ڕووداوە بگێڕینـەوە: یەکـەم: صوڵحـی حودەیبییـە. دووەم: جەنگـی خەیبـەرو، دواییـش حیکمـەت و بەرهەمـەکانی هـەر کام لـە صوڵحـی حودەیبییـەو جەنگـی خەیبەریـش ئامـاژە پـێ بکەیـن، واتـە: سـەرجەم لـە دوو تـەوەردا، ئـەم بابەتـە پێشـکەش دەکەیـن:

**تـەوەری یەکـەم:** صوڵحـی حودەیبییـەو جەنگـی خەیبـەر، لـە کۆتایـی سـاڵی شەشـەمی کۆچیـی: مانگـی (**ذي القَعـدَة**)و سـەرەتای سـاڵی حەوتـەم: مانگـی (**مُحَـرَّم**) دا، ئـەم تـەوەرەش دەکەینـە دوو بڕگـە:

بڕگەی یەکەم: صوڵحی حودەیبییە.

بڕگەی دووەم: جەنگی خەیبەر.

**تـەوەری دووەم:** حیکمـەت و بەرهـەم و سـوودەکانی صوڵحـی حودەیبییـەو جەنگـی خەیبـەر، ئەویـش دیسـان لـە دوو بڕگـەدا.

ئنجا ئێمە تەوەری یەکەمی ئەم بابەتە، واتە: باسی صوڵحی حودەیبییەو، جەنگی خەیبەر، ڕاستەوخۆ لە (**السِّيرَةُ النَّبويَّة لابْن هِشام**)، چاپی یەکەم ساڵی (١٤٢٧)ی کۆچی، (٢٠٠٩)ی زایینی، (**دار ابن الهيثم**)، وەردەگرین[١].

## تەوەری یەکەم: باسی صوڵحی حودەیبییەو، جەنگی خەیبەر:

### بڕگەی یەکەم: باسی صوڵحی حودەیبییە:

(**إبن هشام**) لە ژێر ناوونیشانی: (**أَمْرُ الْحُدَيْبِيَّةِ فِي آخِرِ سَنَةِ سِتٍّ ، وَذِكْرُ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ وَالصُّلْحِ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو**) واتە: باسی حودەیبییەو باسی پەیمان بەستنی (**رِضْوَان**)و پێکهاتنی نێوان پێغەمبەری خوا ﷺو سوهەیلی کوڕی عەمڕ، (نوێنەری قوڕەیشییەکان، یاخود دوا نوێنەری قوڕەیشییەکان):

**١)**- (**إبن إسحاق**) گوتوویەتی: دوایی پێغەمبەر خوا ﷺ لە مەدینە مایەوە، مانگی ڕەمەزان و مانگی شەووال و، لە مانگی (**ذو القعدة**)دا، بە مەبەستی عومرە، دەرچوو، بەرەو مەککە، کە مەبەستی جەنگکردن نەبوو، (**إبن هشام**) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (**نُمَيْلَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ اللَّيْثِيّ**)، لە شوێنی خۆی دانا، وەک سەرپەرشتیارو بەرپرس.

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەرەبەکان و ئەوانەی لە دەوری بوون، لە بیابانشینەکان (ئەعراب)، ئاگادار کردنەوە کە لەگەڵی بچن، چونکە مەترسیی هەبوو لە هۆزی قوڕەیش، ئەوەی کە کردیان (کە بریتی بوو لە ڕێ لێگرتن)، مەترسیی ئەوەی هەبوو، لە دژی وی جەنگ بکەن و، بیگێڕنەوە لە کەعبە، بەڵام زۆربەی عەرەبە بیابانشینەکان، سستییان نواندو لەگەڵی نەچوون، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و، ئەوانەی لە خزمەتی دابوون لە کۆچکەران

---

(١) بە نسبەت صوڵحی حودەیبییەوە، لە بەرگی (٣) لاپەڕە: (١٦٢ - ١٧٦)، لە (٢٢) خاڵ دا، بە نسبەت جەنگی خەیبەرەوە، بەرگی (٣) لاپەڕە: (١٧٦ - ١٨٨)، لە (٢١) خاڵ دا، یانی: هەردوو ڕووداوەکە لە (٤٣) خاڵدا دەخەینە ڕوو.

و لـە پشـتیوانان و، لـە عەڕەبانـەی کـە پێیانـەوە پەیوەسـت بـوون، دەرچـوون و، قوربانییشـی لەگـەڵ خـۆی بـردو، نیـەتی عومـڕەی هێنـا، تاکـو خەڵـک دڵنیا بـێ، واتـە: بەرانبـەرەکانی دڵنیابـن لـەوەی بـە تەمـای جەنـگ نیـە لـە دژیـان و، تاکـو خەڵکیـش بـە گشـتیی بزانـن، تەنیـا بـە مەبەسـتی سـەردانی ماڵـی خـواو بـە مەنزنگرتنـی دەچـێ.

**٢)- (عُرْوَةَ بْنِ الزّبَيْرِ) له (مِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ)** هێناویەتی، کە پێیان گوتوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبییەدا، واتە: ئەو ساڵەی کە صوڵحی حودەیبییەی تێداکرا، دەرچوو بە مەبەستی سەردانی ماڵی خوا، مەبەستی جەنگکردن نەبوو، حەفتا حوشتریشی بۆ قوربانیی لەگەڵ خۆی بردن، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە حەوتسەد (٧٠٠) کەس بوون، بەو پێیە هەر حوشترێک لە جیاتی دە (١٠) نەفەر.

لێرەدا ئەو وا دەڵێ.

بـەڵام جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، گوتوویـەتی: ئێمـە ئەوانـەی بەشـداریی حودەیبییـە بوویـن، چـواردە سـەد بوویـن، (١٤٠٠) کـەس، لـە گێڕدراوەیەکـی دیکـەدا هاتـوە: (١٥٠٠) کـەس بوویـن، لـە گێڕدراوەیەکـی دیکـەدا هاتـوە: (١٣٠٠) بوویـن، هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هـەر کامێکیـان بـە ڕای خـۆی ژمارەکـەی مەزەنـدە کـردوە.

**٣-** پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو تاکو گەیشتە **(عُسْفَان)** کە شوێنێکە لە نزیک مەککە، لەوێ **(بِشْر بْن سُفْيَان الْكَعْبِيِّ)** پێگەیشت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەمە هۆزی قوڕەیشە، بیستوویەتی کە تۆ دەرچووی، بۆیە ئەوانیش دەرچوون و، حوشتریان بە بەچکەوە هێناون و، هەرچی کەل و پەل و پێویستیی جەنگییە هێناویانە، پێستی پڵینگیان لەبەر کردوون - کە بۆ جەنگ بەکارهاتوون - ، لە **(ذِي طَوًى)** بارگەیان خستوە، پەیمانیان لەگەڵ خواداوە : هەرگیز تۆ ئاوا بەو شێوەیە لە شارەکەیان وە ژوور نەکەوی، ئەمەش خالیدی کوڕی وەلیدە، ئەسپەکانی ئەوانی پێن، (واتە: فەرماندەی سوارەکانیانە)، هاتوون، تاکو گەیشتوونە **(كُرَاع الْغَمِيمِ)**، (شوێنێکە لە نزیک مەککە)، دەڵێ: پێغەمبەری

خوا ﷺ فەرمووی: (**يَا وَيْحَ قُرَيْشٍ! لَقَدْ أَكَلَتْهُمُ الْحَرْبُ، مَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ خَلَّوْا بَيْنِي وَبَيْنَ سَائِرِ الْعَرَبِ ، فَإِنْ هُمْ أَصَابُونِي كَانَ الَّذِي أَرَادُوا، وَإِنْ أَظْهَرَنِي اللَّهُ عَلَيْهِمْ، دَخَلُوا فِي الْإِسْلَامِ وَافِرِينَ، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا قَاتَلُوا وَبِهِمْ قُوَّةٌ، فَمَا تَظُنُّ قُرَيْشٌ، فَوَاللَّهِ لاَ أَزَالُ أُجَاهِدُ عَلَى الَّذِي بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ حَتَّى يُظْهِرَهُ اللَّهُ أَوْ تَنْفَرِدَ هَذِهِ السَّالِفَةُ، ثُمّ قَالَ: مَنْ رَجُلٌ يَخْرُجُ بِنَا عَلَى طَرِيقٍ غَيْرِ طَرِيقِهِمْ الَّتِي هُمْ بِهَا؟**).

واتە: قورەیش بێ قەزا بن! جەنگ خواردنی، چی دەبوو ئەگەر لەمن و لە باقی عەرەبان گەڕابان، ئەگەر ئەوان منیان پێکا، ئەوە ئاواتی ئەوان هاتۆتە دی، (هی قورەیش)، ئەگەر خواش منی سەرخست، ئەو کاتە ئەوان دێنە نێو ئیسلامەوە لە حاڵێکدا کە زۆرن و بەهێزو پێزن و، جەنگ بێ هێزیی نەکردوون، ئەگەر نەشهێنە نێو ئیسلامەوە، جەنگ دەکەن، لە حاڵێکدا تواناو هێزیان هەیە، قورەیش گومانی چییە؟ (واتە: قورەیشە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان)، سوێند بە خوا بەردەوام لە پێناوی ئەوەدا، کە خوا منی پێ ڕەوانە کردوە، تێدەکۆشم و جەنگ دەکەم، تاکو ئەم ڕەگی ملەم دەردەچێ، (واتە: هەتا ژیانم لەبەردابێ)، دوایی فەرمووی: چ پیاوێک هەیە بەڕێیەکماندا بەرێ جگە لەڕێی وان، (تاکو تێکهەڵنەنگوین[1] و تووشی شەڕو کوشتار نەبین).

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو بەکری صیددیق، (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، بۆی باسکردووم، کە پیاوێک لە هۆزی (**أَسْلَم**) گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئیدی بەڕێیەکی ڕووتەن و عاسێی دا، بردن بەنێو دۆڵ و شیواند، هەتا لێی دەرچوون، ئەوەش زۆر بۆ مسوڵمانان قورس بوو، دوایی گەیشتنە سەر زەوییەکی دەشتایی لەو شوێنەی کە دۆڵەکە کۆتایی دێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەڵکی فەرموو: (**قُولُوا: نَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَنَتُوبُ إِلَيْهِ، فَقَالُوا ذَلِكَ، فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنَّهَا لَلْحِطَّةُ الَّتِي عُرِضَتْ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَلَمْ يَقُولُوهَا**)، دوای ئەوەی لە شوێنە عاسێ و زەحمەتەکە سەرکەوتن و، ئەوێیان بڕیی و

---

(١) تێکهەڵەنگوتن: بەریەککەوتن، پێکدادان

چوونــە دەشــتاییەکە، فەرمــووی: بڵێــن: داوای لێبــوردن لــە خــوا دەکەیــن و بــۆ لای دەگەڕێینــەوە، ئەوانیــش وایــان گــوت، دوایــی فەرمــووی: ســوێند بــە خــوا ئــەوە ئــەو وشــەیەی (**حِطَّــة**) بــوو، کــە بــۆ بەنــوو ئیسرائیلیــش پێشــنیار کــرا، بــەڵام نەیانگــوت، {(**وقُولُـوا حِطَّـةٌ**)، واتــە: بڵێــن: خوایــە! گوناهەکانمــان لــێ دابەزێنــە، گوناهەکانمــان لــێ بســڕەوە}.

(**إبـن هشـام**)، دەڵـێ: دوایـی پێغەمبـەری خـوا فەرمانـی بـە خەڵـک کـرد، کـە بـە لای ڕاسـتدا، لـە پشـت حەمشـەوە بـڕۆن، لـە ڕێیەکـەوە کـە بـەلای (**ثَنِيّـةِ الْمُـرَار**) دا، دەچـێ، لـەو شـوێنە کـە دادەبەزێتـە لای حودەیبییـە لـە خـوار مەککـەوە، ئیـدی سـوپایەکە بەوێـدا ڕۆی، کاتێـک ئەسـپەکانی قورەیـش، (واتـە: سـوارچاکەکانی)، تـۆزو خۆڵـی سـوپایان بینـی و، تەماشـایان کـرد، بەڕێیەکـەی خۆیانـدا نەهاتـوون، ڕایانکـرد بـە ڕاکـردن گەڕانـەوە بـۆ لای هـۆزی قورەیـش، کـە ئـەوان ڕێیـان گۆڕیـوە!، (لـەو شـوێنەی ئێمـە پێشـمان پێگرتبـوون، بەوێـدا نەهاتـوون).

٤- ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تاکو گەیشتە (**ثَنِيّةِ الْمُرَار**)، لەوێ حوشترەکەی یەخ بوو، خەڵک گوتیان: حوشترەکەت جەنەی گرتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**مَا خَلأَتْ وَمَا هُوَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ عَنْ مَكَّةَ، لاَ تَدْعُونِي قُرَيْشٌ الْيَوْمَ إِلَى خُطَّةٍ يَسْأَلُونَنِي فِيْهَا صِلَةَ الرَّحِمِ، إلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إيّاهَا**)، واتە: حوشترەکەم جەنەی نەگرتوەو ئەو ڕەفتارەشی نەبووە، بەڵکو ئەوە حوشترەکەی منی ڕاگرتوە، کە کاتی خۆی فیلەکانی سوپای ئەبرەهەی ڕاگرت، کە نەچنە نێو مەککەوە، ئنجا فەرمووی: هۆزی قورەیش ئەمڕۆ بانگم ناکەن بۆ هیچ نەخشەیەک، کە پەیوەندیی خزمایەتیی گەیاندنی تێدا هەبێ، (لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: بە مەزنگرتنی کەعبەی تێدا هەبێ)، مەگەر من ڕازیی دەبم بەو نەخشەیە، [ئەمەش لە صەحیحی بوخارییدا هاتوەو، بە پێویستی نازانم هەمیشە ئاماژە بکەمەوە بە سەرچاوەکان، مادام لە سیرەی (**ابن هشام**)ەوە، دەیهێنین، کە لە پەراوێزدا، ئاماژە بە سەرچاوەکان کراوە].

٥- دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەڵکی فەرموو: دابەزن، (واتە: دابەزن بۆ هێنانی ئاو)، پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دۆڵەکە ئاوی تێدا نیە، تاکو دابەزینە سەری، ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێناو دایە پیاوێک لە هاوەڵان، ئەویش ئەو تیرەی بردە نێو یەکێک لە چاڵەکان، لەوانەی پڕبوونەوەو ئاویان تێدانیە، تێی چەقاند ئیدی ئەو چاڵە ئاوی لێ دەرقوڵی، هەتا خەڵک هەمووی کوندەو مەشکەو، چی پێیان بوو پڕیانکرد.

لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، دەڵێ: ئەگەر سەد هەزار (١٠٠،٠٠٠) کەسیش بان، بەشی هەمووانی دەکرد، ئنجا ئایا ئەوەی تیرەکەی پێغەمبەری ﷺ بۆ ئاو دەرقوڵاندن، لە یەکێک لە چاڵەکاندا چەقاندوە، کێ بووە؟ هەندێکیان دەڵێن: یەکێ لە هاوەڵان بوو ناوی: (**نَاجِيَةُ بْنُ جُنْدُبِ بْنِ عُمَيْرِ بْنِ يَعْمُرَ بْنِ دَارِمِ بْنِ عَمْرِو بْنِ وَائِلَةَ بْنِ سَهْمٍ**)، ئەو کەسەی حوشترەکانی پێغەمبەری ﷺ لێ دەخوڕین.

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: (**البَرَاءُ بِنُ عَازِب**) بوو، گوتوویەتی: من بووم تیرەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ لەو چاڵەی ئاوی تێدا نەبووە چەقاندم و ئاوەکە دەرقوڵیی.

٦- (**الزُّهْرِي**) کە هەر کام لە: (**صحيح البخاري**) و (**صحيح مسلم**)یش لێیەوە نەقڵیان کردوە، دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەقامگیر بوو، بارگەو بنەیان خست، (**بَدِيْلُ بْنُ الوَرْقَاء الخُزَاعِي**)، لەگەڵ پیاوانێک لە هۆزی (**خُزَاعَة**) هاتنە لای، دیارە بە نوێنەرایەتیی قوڕەیش و، لەو بارەوە دواندیان و پرسیاریان لێ کرد، بۆچی هاتوە؟!، ئەویش هەواڵی پێدان: بۆ ئەوە نەهاتوە، جەنگ بکات، بەڵکو هاتوە سەردانی ماڵی خوا ﷻ بکات و، حورمەتی ماڵی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، دوایی چی بە (**بِشرِ بْن سُفْيَان**) گوتبوو: ئەوەشی بە شاندەکەی (**خُزَاعة**) گوت، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ لای هۆزی قوڕەیش و گوتیان: ئەی هۆزی قوڕەیش! ئێوە پەلە لە موحەممەد ﷺ دەکەن، موحەممەد بۆ جەنگ نەهاتوە، بەڵکو هاتوە بۆ سەردانی ئەم ماڵە، (ماڵی خوا)، بەڵام هۆزی قوڕەیش ئەوانیان تۆمەتبار کردو، قسەی ڕەقیان لەگەڵکردن، پێیان گوتن: هەرچەندە بۆ ئەوەش نەهاتبێ جەنگ

بکات، بەڵام سوێند بە خوا بە زۆر نایەتە نێو شارەکەمانەوە، نابێ عەرەب باسی ئەوە بکەن، کە موحەممەد ﷺ بە خۆی و بە ژمارەیەک لە هاوەڵانی بەبێ ڕێککەوتن لەگەڵ قورەیش دا هاتۆتە نێو شاری مەککەوە.

**(الزُّهْرِي)** دەڵێ: هۆزی **(خُزَاعَة)** زۆر دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، هەم مسوڵمانەکانیان و هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیان، هیچ شتێکیان لە کاروباری مەککە لێ پەنهان نەدەکردو، لە نزیک مەککەشەوە بوون.

٧- ئنجا قورەیش نوێنەرێکی دیکە دەنێرن، **(إبن هشام)** دەڵێ: دوایی **(مِكْرَز بْن حَفْصِ بْنِ الْأَخْيَفِ)**یان نارد، کە لە هۆزی **(بَنِي عَامِر بِنِ لُؤَي)** بوو، بە نوێنەرایەتیی خۆیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بینی بەرەو ڕوویان دێ، فەرمووی: **(هَذَا رَجُلٌ غَادِر)** ئەمە پیاوێکی پەیمانشکێنە، کاتێک هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵدا کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان شت کە: **(بَدِيْل بن الوَرْقَاء)**ی فەرموو، بەویشی فەرموو، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای قورەیش و، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوتبوو، بۆی گێڕانەوە.

٨- **(ثُمَّ بَعَثُوا إِلَيْهِ الْحُلَيْسَ بْنَ عَلْقَمَةَ، أَوْ ابْنَ زَبَّانَ وَكَانَ يَوْمَئِذٍ سَيِّدَ الْأَحَابِيشِ)**، [کە ئەمە شاندی سێیەمە، قورەیش دەینێرن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ]، دوایی: **(الْحُلَيْسَ بْنَ عَلْقَمَةَ)**، کە لەو کاتەدا گەورەی هۆزی **(أَحَابِيش)** بوو، ناردیان کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بینی فەرمووی: **(إِنَّ هَذَا مِنْ قَوْمٍ يَتَأَلَّهُونَ، فَابْعَثُوا الْهَدْيَ فِي وَجْهِهِ حَتَّى يَرَاهُ)**، واتە: ئەمە لە کۆمەڵێکە کە ئەهلی عیبادەتن و، خواپەرستن، بۆیە قوربانییەکانی بەڕوودا بنێرن، تاکو بیانبینێ. {بزانێ کە ئێمە بۆ جێبەجێکردنی عومرە هاتووین، ئەوەتا قوربانییەکانمان لەگەڵ خۆماندا هێناون، نەک بۆ جەنگ و کوشتار}.

لێرەدا پێویستە ئەو هەڵوەستەیە بکەین، کە پێغەمبەر ﷺ هەر کام لەم نوێنەرانەی هاتوون بۆ لای، باش ناسیونی، بە **(مِكْرَز بْن حَفْصِ)**ی گوتوە: ئەمە پیاوێکی پەیمان شکێنە، هەروەها بە **(الْحُلَيْسَ بْنَ عَلْقَمَةَ)**و ئەوانەی لەگەڵیدابوون،

گوتوویەتی: ئەوانە لە کۆمەڵێکن خوا پەرستیی دەکەن، بۆیە شتێکی وا بکەن بزانن، ئێمەش بۆ خوا پەرستیی هاتووین.

ئنجا کاتێک (**الْحُلَيْسَ بْنَ عَلْقَمَةَ**) قوربانییەکانی بینی بە پانایی دۆڵەکەدا دەهاتنە خوارو، گەردەنبەند (**قلادة**)یان لە ملدا بوو، {ئەوەی لە گەردنیان دەکرێ تاکو بزانرێ کە نیشانە دارکراون بۆ قوربانیی}و، هەندێکیان لە حوشترەکان تووکی خۆیان ئەوەی دەمیان دەیگەیشتێ، خوارد بوویان، لەبەر ئەوەی لە مێژ بوو لە شوێنی خۆیان ڕاگیرابوون، یەکسەر گەڕایەوە بۆ لای هۆزی قورەیش و، نەگەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لەبەر بە مەزنگرتنی ئەو دیمەنەی دیتی، بە قورەیشی گوت: شتێکی ئاوام بینی، پێیان گوت: دانیشە! تۆ ئەعرابیی زانیارییت بەو شتانە نیە.

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو بەکر، بۆی گێڕامەوە، کە حولەیس لەو قسەیە تووڕە دەبێ و، پێیان دەڵێ: ئەی هۆزی قورەیش! ئێمە لەسەر ئەوە، پەیمانمان لەگەڵتان نەبەستوەو، لەسەر ئەوە گرێبەستمان پێکەوە نەکردوە، ئایا دەبێ کەسێک کە بۆ بە مەزنگرتنی ماڵی خوا هاتوە، بەرپەرچ بدرێتەوەو بگێڕدرێتەوە؟! سوێند بەو کەسەی نەفسی حولەیسی بەدەستە، یان دەبێ ڕێگە بدەن موحەممەدو هاوەڵانی بێن و ئەو مەبەستەی بۆی هاتوە (کە بریتیە لە عومرە کردن)، ئەنجامی بدات، یان ئەوەتا من بە یەکجار، جاڕ دەدەم، هۆزی (**أحابيش**) هەموویان بە هەڵوێستی یەک پیاو هەڵسن لە دژتان، گوتیان: ئەی حولەیس! ئارام بگرە، پەلەمان لێ مەکە، تاکو ئەوەی پێی ڕازیی دەبین بۆ خۆمان وەریدەگرین، (واتە: تاکو ڕێک دەکەوین لەگەڵ موحوممەددا و بە شەڕو هێز نەیەت و، بە شێوەیەکی ئاشتییانە بێ).

٩- ئنجا قورەیش نوێنەری چوارەم دەنێرێ: (**عُرْوَةَ بْنَ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيّ**) وەک نوێنەری قورەیش دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەڵام بەرلەوەی بچێ دەڵێ: ئەی هۆزی قورەیش!

هەر کەس تاکو ئێستا ناردووتانە بۆ لای موحەممەد ﷺ کە گەڕاوەتەوە، بە قسەی زبرو توند دواندووتانە، خۆشتان دەزانن من وەک باب وام بۆ ڕۆڵەی خۆی، (لەبەر ئەوەی عورِوە لە (سُبَيْعَةَ بِنْتِ عَبْدِ شَمْس) بووە، یانی: دەبێتەوە بە گەورەی قورەیش)، ئێستاش ئەوەی تووشتان بووە، هاتوە، منیش هەرچی لە خەڵکەکەی خۆم بە قسەی کردووم، هێناومن و، خۆشم ئەوە لەگەڵتانم، گوتیان: ڕاست دەکەی تۆ لە لای ئێمە تۆمەتبار نی، (مەبەستی ئەوە بووە کە هەرچی چووەو هاتۆتەوە، ئێوە قسەکانیتان بە دڵ نەبووە، منیش وەک باب وام بۆ ئێوەو، ئەوە خۆم و خەڵکەکەشم هاتووین بۆ هاوکارییتان)، ئنجا چوو تاکو گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو، لەبەر دەمی دانیشت، گوتی: ئەی موحەممەد! ﷺ خەڵکێکی تێکەڵ و پێکەڵ و هەرچی و پەرچییت هێناوە، بۆ ئەو شوێنەی وەک قەڵغانی تۆیە، تاکو قەڵغانی خۆت بشکێنی کە مەککەیە! بۆ زانیارییت هۆزی قورەیش هاتوونە دەرو حوشترو بەچکەیان هێناون و، پێستی پڵینگانیان لەبەر کردوەو پەیمانیان بە خوا داوە، کە هەرگیز بە زۆر نەچیە نێو شارەکەیانەوە، بە خوا من ئەوانەی دەورت دەبینم کە بەیانی هەموویان بەجێت دەهێڵن، ئەبوو بەکر ﷺ، لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ دانیشتبوو، گوتی: (أُمْصُصْ بَظْرَ اللاَّتِي)، واتە: میتکەی لات (کە پەرستراوێکی مێینەیان بووە)، بمژە، ئایا ئێمە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ دەهێڵین؟، عورِوە گوتی: ئەی موحەممەد! ئەوە کێیە؟ ئەویش گوتی: (هَذَا ابْنُ أَبِي قُحَافَة)، ئەوە کوڕی ئەبی قوحافەیە، (واتە: ئەبوو بەکر ﷺ)، عورِوەش گوتی: بە خوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، چاکەیەکت لە چاوی مندا هەیە، ئێستا وەڵامی ئەو قسەیەتم دەدایەوە، (یانی: ئەو قسە زبرەت، با لە بەرانبەر ئەو چاکەیەدا بێ، کە لەگەڵت کردووم و قسەکەت پێ ناڵێمەوە)، دوایی عورِوە جارجار دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر ﷺ و دەیدواند موغیرەی کوڕی شوعبەش لەسەر سەری پێغەمبەری خوا ﷺ بەچەکەوە وەستا بوو، (واتە: بەخوودەو زرێ و ئەوانەوە)، هەر جارێ کە عورِوە دەستی بۆ لای ڕیشی پێغەمبەر ﷺ دەبرد، ئەویش دەستی لە دەستی دەدات، دەیگوت: دەستی خۆت لە ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ دووربخەوە، پێش ئەوەی دەستت نەگەڕێتەوە بۆ لات، [واتە: پێش ئەوەی دەستت بقرتێنم بە شمشێر]، عورِوە پێیگوت: بێ قەزابی چەند

قسە ڕەق و چەند زبری! پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، عورِوە گوتی: ئەی موحەممەد! ﷺ ئەوە کێیە؟ ئەویش فەرمووی: (**هَذَا ابْنُ أَخِيْكَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ**)، ئەوە برازای خۆتە موغیرەی کوڕی شوعبەیە، ئەویش گوتی: ئەی ستەمکار! هەر دوێنێ نەبووە پاشەڵم شۆردووی.

(**إبن هشام**) دەڵێ: مەبەستی عورِوە ئەوە بووە کە موغیرەی کوڕی شوعبە، بەر لەوەی مسوڵمان بێ، سێزدە کەسی لە بەنوو مالیک کوشتبوون، لە (**ثَقِيف**)، ئنجا ئەو دوو هۆزە لێک هەڵسابوون: بەنوو مالیک کە کۆمەڵی کوژراوەکەن و، (**أَحْلَاف**) کۆمەڵی موغیرە، کە هەردووکیان لە (**ثَقِيف**)ن، ئنجا عورِوەی کوڕی مەسعوودی سەقەفییش، خوێنی سێزدە نەفەرەکەی دابوو و کارەکەی چاککرد بوو.

ئنجا کاتێک کە عورِوە قسەکانی تەواو کردن، هەڵسا لە لای پێغەمبەری خوا ﷺو، ئەوەی بینی کە هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، چی بۆ دەکەن! هیچ دەستنوێژێکی نەدەشۆرد، مەگەر هەر کامێکیان پەلەی دەکرد، ئەو ئاوی دەستنوێژەکەی بۆ بێنێ، یاخود ئاوەکەی لە دەستی بکات و، هیچ جارێ تفێکی فڕێ نەدەدات، مەگەر هەوڵیان دەدا بیخەنە دەستی خۆیان و، هیچ موویەکی لێ نەدەکەوت، مەگەر هەڵیان دەگرتەوە، واتە: زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ مامەڵەیان دەکرد، گەڕایەوە بۆ لای قورەیش، گوتی: ئەی هۆزی قورەیش! (دیارە عورِوەی کوڕی مەسعوودی سەقەفیی پیاوێکی بەتەمەن بووە، مادام بە قوورەیشییەکانی گوتبێ: من بۆ ئێوە وەک باب وام بۆ ڕۆڵەکەی)، من چووم بۆ لای کیسرا لە مەقامی حوکمڕانیی خۆیداو، چووم بۆ لای قەیصەڕ لە مەقامی حوکمڕانیی خۆیداو، چووم بۆ لای نەجاشیی لە بارەگای حوکمڕانیی خۆیدا، بە خوا هیچ پادشایەک و حوکمڕانێکم نەبینیوە، لە نێو خەڵکەکەیدا، وەک موحەممەد لە نێو هاوەڵانیدا، ئەوەی من بینیم، کۆمەڵێکم بینین، کە هەرگیز دەستبەرداری نابن و پشتی بەرنادەن، ئنجا ڕای خۆتان بزانن!.

١٠- دوای ئەو چوار نوێنەرەی قورەیش، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەر دەنێرێ، (إبن إسحاق) دەڵێ: هەندێک لە زانایان بۆیان باسکردووم، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی (خِرَاشَ بْنَ أُمَيَّةَ الْخُزَاعِيّ) کردو ناردی بۆ لای هۆزی قورەیش لە مەککە، سواری حوشترێکی کرد، (واتە: حوشترێکی وێدا سواری بێ)، پێی دەگوترا: (الثَّعْلَب) تاکو پەیامی خۆی بگەیەنێتە زلە زلانی قورەیش و قسە بە دەستانیان، بەڵام کاتێک چوو بۆ لایان، سەرەتا حوشترەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ لە بندا پەی کردو سەریان بڕی و، ویستیان خۆیشی بکوژن، بەڵام (أَحَابِيش) {ئەو هۆزەی نوێنەرەکەیان هاتبوو}، نەیانهێشت و ڕێیان بەردا تاکو گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری کوڕی خەتتابی بانگ کرد تاکو بینێرێ بۆ مەککەو، پەیامێک بە قسە ڕۆیشتووانی مەککە بگەیەنێ و ئەوەی بۆی هاتوە، لێیان حاڵی بکات، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ سەبارەت بە خۆم لە هۆزی قورەیش دەترسێم و، هیچ کەس لە هۆزی (بني عَدِي بَنِي كَعْب)، لە مەککە نیە، {یانی: هۆزو خزمەکانی لە مەککە نین تاکو بەرگریی لێبکەن}، قورەیشیش دەزانێ من زۆر لە دژیان توند بووم، دوژمنێکی زۆر سەرسەختیانم و، زۆر لەسەریان زبر بووم، بەڵام من پیاوێکت پیشان دەدەم لە من لە لای قورەیشییەکان ڕێز لێگیراوترە، ئەویش عوسمانی کوڕی عەففانە، (عومەر رضي الله عنه، هەمیشە پێشنیارو نەخشەی حەکیمانەو بەجێی بوون)، پێغەمبەری خواش ﷺ عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه، بانگکردو ناردی بۆ لای ئەبوو سوفیان و گەورەکانی قورەیش، کە هەواڵیان پێ بدات، بۆ جەنگ نەهاتوە، بەڵکو هاتوە سەردانی ماڵی خوا بکات و، حورمەتی ماڵی خوا بە مەزن بگرێ.

ئیدی ئەوە بوو عوسمان رضي الله عنه، چوو بۆ مەککەو، لەوێ ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، (دیارە خزمی خۆی بووە) بینی، کاتێک چووە مەککە، یاخود پێش ئەوەی بچێ، ئەویش لە پێش دەستی خۆیەوە بردی و پەنایدا، تاکو پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنێ، عوسمانی رضي الله عنه، ڕۆیشت تاکو چوو بۆ لای

ئەبوو سوفیان و مەزنەکانی قورەیش و، پەیامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێگەیاندن، ئەوەی پێی ڕەوانکرد بوو، ئەوانیش کاتێک عوسمان لە گەیاندنی نامەو پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو بوو، پێیان گوت: ئەگەر حەزدەکەی تەواف بکە، بە دەوری کەعبەدا، ئەویش گوتی: من تەواف ناکەم، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ تەواف نەکات، ئنجا قورەیشییەکان لە لای خۆیان هێشتیانەوە، واتە: نەیانهێشت بگەڕێتەوە لای پێغەمبەر ﷺ، دوایی بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە مسوڵمانان گەیشت، کە عوسمانی کوڕی عەففان کوژراوە، کەچی هەواڵەکە ڕاست نەبوو، بەڵام ئاوایان پێگەیشتبوو.

**١١-** ئنجا پەیماننامەی (**الرِّضْوَان**): (**بيعة الرضوان**) دێتە پێش، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو بەکر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، بۆی باسکردووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پێی گەیشت عوسمان کوژراوە، فەرمووی: (**لَا نَبْرَحَ حَتَّى نُنَاجِزَ الْقَوْمَ**)، ئێرە بەجێ ناهێڵین، تاکو لەگەڵ ئەو خەڵکەدا (کە عوسمانیان کوشتوە)، جەنگ نەکەین، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکەکەی بانگکرد بۆ پەیمان بەستن، ئەو پەیمانەش ئەوە بوو کە پێی گوترا: (**بَيْعَةُ الرِّضْوَان**) کە لە ژێر درەختێک دابوو، ئنجا خەڵک دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لەگەڵ بەستوون لەسەر مردن، بەڵام جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مەرگ پەیمانی لەگەڵدا نەبەستبووین، بەڵکو پەیمانی لەگەڵدا بەستین، کە ڕانەکەین و لەسەرمەرگ (واتە: تاکو نەکوژرێین واز لە جەنگ نەهێنین و ڕانەکەین، مەگەر بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکشێینەوە، ئەگەرنا نابێ کەس پشت لە دوژمن بکات)، تەنیا کەسێک لەم پەیمانە دواکەتوەو، هەموو خەڵکەکە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەست و، یەک کەسیان لێ دوا نەکەوت لە مسوڵمانان، جگە لە: (**الجَدُّ بْنُ قَيْس أَخُو بَنِي سَلَمَة**) جەددی کوڕی قەیس لە هۆزی (**بَنِي سَلَمَة**)، ئنجا جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، گوتوویەتی: وەک ئێستا تەماشای بکەم: خۆی بە بن هەنگڵی حوشترە مێیەکەیەوە نووساند بوو، {واتە: خۆی لە حوشترەکەی گرتبوو، بۆ ئەوەی خەڵک نەیبینێ}، دوایی هەواڵ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات، کە ئەوەی لە بارەی عوسمانەوە پێی گەیشتوە، هەواڵێکی ناڕاست بووە.

(**إبـن هشـام**) دەڵـێ: کەسـێک کـە متمانـەم پێـی هەیـە، ئەویـش کەسـێک بـۆی باسـکردوە، کـە سـەنەدەکەی بردۆتـەوە سـەر (**أَبِي مَلِيْكَـةَ**) لـە (**ابْـنُ أَبِي عُمَـر**)ەوە، {واتـە: لـە ڕێیەکـی متمانـە پێکـراوەوە هەواڵەکـەی پـێ گەیشـتوە}، کـە پێغەمبـەر ﷺ بـۆ عوسـمانی کـوڕی عەففـان، دەسـتی خسـتە نێـو دەسـتی و فەرمـووی: ئەمـەش لـە جیـاتی عوسـمان، {ئـەم دەسـتەی مـن لـە جیـاتی دەسـتی عوسـمان}.

بۆیـەش کاتێـک ئەوانـە ئابڵووقـەی عوسـمان ﷺ دەدەن و شـەهیدی دەکـەن، یەکێـک لـە شـتەکان کـە بیانـووی پـێ دەگـرن، دەڵێـن: تـۆ لـە کاتی پەیـمان بەسـتن لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ لـە ژێـر درەختەکـەدا، لـەوێ نەبـووی! دەڵـێ: ڕاسـتە، بـەڵام مـن پێغەمبـەر ﷺ ناردمـی بـە نوێنـەری خـۆی بـۆ لای قوڕیـش و، پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی خـۆی خسـتۆتە نێـو دەسـتی و فەرموویـەتی: ئەمـەش لـە جیـاتی عوسـمان، بێگومـان دەسـتی پێغەمبەریـش ﷺ بـۆ مـن لـە دەسـتی خـۆم باشـتر بـوو، [ئـەو بیانووەشـتان چرووکـە].

**١٢-** ئنجا قوڕەیش نوێنەری پێنجەم دەنێرن، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: (**الزُّهْري**) گوتوویەتی: دوایی قوڕەیش سوهەیلی کوڕی عەمڕیان نارد، کە لە هۆزی (**بَنِي عَامِر بْن لؤي**) بوو، بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان گوت: بچۆ بۆ لای موحەممەدو لەگەڵی ڕێک بکەوە، بەڵام با لە ڕێککەوتنەکەدا، ئەوەی تێدابێ کە ئەمساڵ بگەڕێتەوە، دەبێ ئەوەی هەر تێدابێ، بە خوا نابێ عەڕەب باس بکەن، کە بە زۆر هاتۆتە نێو شارەکەمانەوە، سوهەیلی کوڕی عەمڕیش چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بینی، دێ، فەرمووی: {**قَدْ أَرَادَ الْقَوْمُ الصُّلْحَ حِينَ بَعَثُوا هَذَا الرَّجُل**}، (**أخرجه أحمد: ١٨٩٣٠، والبهيقي في الكبري: ١٨٥٨٩، وَسَنَدُهُ حَسَنٌ**)، خەڵکەکە (بەرانبەرەکانمان)، دیارە پێکهاتنیان ویستوە، مادام ئەم پیاوەیان ناردوە.

کاتێـک سـوهەیلی کـوڕی عەمـڕ چـوو، گەیشـتە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ قسـەی کردو زۆر قسـەو باسـیان کـرد، (ڕاوییەکـە مـەرج نیـە، هەمـوو قسـەکانی لەبـەر کردبـێ، یاخـود هەمـوو قسـەکانی زانیبـێ چـی و چـی بـوون)، دوایـی پێکهاتنیـان لـە نێوانـدا پەیـدا بـوو.

**١٣-** دوای ئەوەی ڕێککەوتنەکە پێکهات و، تەنیا ئەوە مابوو بنووسرێ، عومەری کوڕی خەتتاب هەڵسا چوو بۆ لای ئەبوو بەکر ﷺ، گوتی: ئەی ئەبوو بەکر! ئایا ئەو پێغەمبەری خوا نیە (موحەممەد ﷺ) گوتی: با، گوتی: ئایا ئێمە مسوڵمان نین؟ گوتی: با، گوتی: ئەوانیش هاوبەش بۆ خوا دانەر نین؟ ئەبوو بەکر گوتی: با، گوتی: کەواتە: بۆچی لە دینی خۆماندا ملکەچیی، (یاخود خۆ بەدەستەوەدان و ژێر دەستەیی قبووڵ دەکەین؟)، ئەبوو بەکر گوتی: ئەی عومەر! ئاوزینگی پێغەمبەر ﷺ بگرە[1]، {واتە: پێی پێغەمبەر ﷺ بگرە}، من شایەتیی دەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە، عومەر ﷺ، گوتی: منیش شایەتیی دەدەم کە پێغەمبەری خوایە، بەڵام چۆن ئەو ڕێککەوتنە، بەو شێوەیە دەکرێ؟ دوایی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیی؟ فەرمووی: با، گوتی: ئایا ئێمەش مسوڵمان نین؟ فەرمووی: با، گوتی: ئەوانیش هاوبەش بۆ خوا دانەر نین؟ فەرمووی: با، گوتی: کەواتە: بۆچی لە دینداریی خۆماندا، ملکەچیی و تەنازول قبووڵ دەکەین؟!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ لَنْ أُخَالِفَ أَمْرَهُ، وَلَنْ يُضَيِّعَنِي**)، واتە: من بەندەو ڕەوانەکراوی خوام، سەرپێچیی فەرمانی خوا ناکەم و، ئەویش من زایە ناکات (کەواتە: ئەو ڕێککەوتنە بە فەرمانی خوا بووە، با ئایەتێکی دیاریکراویشی لەسەر نەبێ، بەڵام دیارە خوا ﷻ بە ئیلهام و بە شێوەیەک لە شێوەکانی وەحیی بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە ئەو ڕێککەوتننامەیە بکات).

دوایی عومەر ﷺ، گوتوویەتی: ئێستاش لەگەڵدا بێ هەر خێر دەکەم و هەر بە ڕۆژوو دەبم و، هەر نوێژ دەکەم و، کۆیلان ئازاد دەکەم، لە ترسی ئەو قسەیەم کە ئەو ڕۆژە گوتوومە، هەرچەندە پێم وابوو چاکە، بەڵام دیارە نەم پێکابوو، خوا لێی ڕازی بێ.

ئەویش بۆ چاکەی بووە، بەڵام ئەو دووربینیی و حەوسەڵەو سینگ فراوانییەی پێغەمبەر ﷺ هەیبووە، بە دڵنیایی کەس نەیبووە، بەڵام ئەبوو بەکر ﷺ، چونکە لە هەمووان لێی نزیکتر بووە، لە ئیمانەوەو، لە بڕوا پێ هێنانیەوەو، لە ڕووی

(١) غِرْز: ئەوەیە کە سوار پێی تێدەنێ، کاتێک سوار دەبێ، بە کوردیی ئاوزینگی پێ دەڵێن.

تەمەنیـەوەو لـە ڕووی هەڵسـوکەوتەوە، بۆیـە هەمیشـە جـووت لەگـەڵ خـوو و ڕەوشـتەکانی پێغەمبـەردا ﷺ ڕۆیشـتوە.

**١٤-** ئنجا عەلی ﵁، مەرجەکانی پێکهاتنەکەی نووسین، (**إبن هشام**) دەڵێ: دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبی ﵁، بانگ کرد، فەرمووی: بنووسە: (**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**)، بەڵام سوهەیلی کوڕی عەمڕ، گوتی: من ئەمە نازانم، بەڵکو بنووسە: (**باسْمَكَ اللَّهُمَّ**)، بە ناوی تۆ ئەی خوایە! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**أُكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ**)، ئەویش وای نووسی، دوایی فەرمووی: (**أُكْتُبْ: هَذَا مَا صَالَحَ عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُهَيْلَ بْنِ عَمْرٍو**)، ئەمە ئەوەیە کە موحەممەد پێغەمبەری خوا لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمڕ لەسەری ڕێککەون، سوهەیل گوتی: (**لَوْ شَهِدْتُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ لَمْ أُقَاتِلْكَ، وَلَكِنْ أُكْتُبْ اسْمَكَ وَاسْمَ أَبِيكَ**)، ئەگەر زانیبام تۆ پێغەمبەری خوای، لە دژت نە دەجەنگام، (ڕێم پێ نەدەگرتی)، بەڵکو ناوی خۆت و ناوی بابت بنووسە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بنووسە: (**أُكْتُبْ هَذَا مَا صَالَحَ عَلَيْهِ مُحَمّدُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ سُهَيْلَ بْنَ عَمْرٍو ، اصْطَلَحَا عَلَى وَضْعِ الْحَرْبِ عَنْ النّاسِ عَشْرَ سِنِينَ، يَأْمَنُ فِيهِنّ النّاسُ وَيَكُفّ بَعْضُهُمْ عَنْ بَعْضٍ، عَلَى أَنّهُ مَنْ أَتَى مُحَمّدًا مِنْ قُرَيْشٍ بِغَيْرِ إذْنِ وَلِيّهِ، رَدّهُ عَلَيْهِمْ، وَمَنْ جَاءَ قُرَيْشًا مِمّنْ مَعَ مُحَمّدٍ لَمْ يَرُدّوهُ عَلَيْهِ، وَإِنّ بَيْنَنَا عَيْبَةً مَكْفُوفَةً، وَأَنّهُ لاَ إسْلاَلَ، وَلاَ إغْلاَلَ، وَأَنّهُ مَنْ أَحَبّ أَنْ يَدْخُلَ فِي عَقْدِ مُحَمّدٍ وَعَهْدِهِ، دَخَلَ فِيهِ، وَمَنْ أَحَبّ أَنْ يَدْخُلَ فِي عَقْدِ قُرَيْشٍ وَعَهْدِهِمْ، دَخَلَ فِيهِ**).

واتـە: بنووسـە ئەمـە ئەوەیـە کـە موحەممـەد کـوڕی عەبدوڵـلا لەسـەری ڕێککـەوت لەگـەڵ سـوهەیلی کـوڕی عەمـڕ، (نوێنـەری قورەیشـییەکان)، ڕێککەوتـن لەسـەر ئـەوەی بـۆ مـاوەی دە (١٠) ساڵان، خەڵـک پێکـەوە جەنـگ نـەکات و تێیانـدا دڵنیابـن و، دەسـت لـە یەکـدی بپارێـزن.

هەروەهـا ڕێککەوتـن لەسـەر ئـەوەی هـەر کەسـێک لـە قورەیـش هاتـە لای موحەممـەد بەبـێ مۆڵـەتی سەرپەرشـتیارەکەی، {ئەگـەر کـوڕە بەبـێ ئیـزنی بـاب و دایکـی و، ئەگـەر کۆیلەیـە بەبـێ ئیـزنی گەورەکـەی}، دەبـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ بیگێڕێتـەوە بۆیـان، بـەڵام هـەر کەسـێک لەوانـەی لەگـەڵ موحەممـەدن، چـوو بـۆ لای قورەیـش، (واتـە: هەڵگەڕایـەوە)، ئـەوان نایگێڕنـەوە بـۆ لای موحەممـەد.

لە نێوانیاندا پەیمانێک هەیە، نابێ شمشێر لێک دەرکێشن و، زیان بە یەکدیی بگەیەنن، (دەبێ سەرو ماڵیان لە نێوانیاندا پارێزراو بێ)و، هەر کەسێک حەز دەکات بچێ لەگەڵ موحەممەددا ﷺ گرێبەست بکات و ببێتە هاوپەیمانی، بۆی هەیەو، هەر کەسێکیش دەچێتە نێو گرێبەستی قورەیش و دەبێتە هاوپەیمانیان، دەچێ.

**١٥-** ئیدی هۆزی خوزاعە، گوتیان: ئێمە دەچینە نێو گرێبەست لەگەڵ موحەممەددا ﷺو لەگەڵیدا دەبینە هاوپەیمان، هۆزی بەنوو بەکریش، گوتیان: ئێمەش دەچینە نێو گرێبەست و پەیمانی قورەیشەوە، (هۆزی خوزاعەو هۆزی بەنوو بەکر هەر لە دێرین زەمانەوە پێکەوە دژایەتیی و دوژمنایەتییان بووەو، هەر کامێکیان لەگەڵ لایەک بوو بێ، ئەوی یدیکە چۆتە لای لایەکەی دیکە)، هەروەها لە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکەدا هاتبوو: دەبێ ئەمساڵ بگەڕێنەوەو، نەیەنە نێو شارەکەمان (شاری مەککە)، بەڵام لە ساڵی داهاتوودا ئێمە شار بەجێ دێڵین، تۆش لەگەڵ هاوەڵانت دێیە نێو شار، سێ شەوو سێ ڕۆژان تێیدا دەمێننەوە، بەڵام تەنیا دەبێ چەکی سوارت پێبێ، (واتە: ئەو چەکەی سوار لەگەڵ خۆی دا هەڵیدەگرێ، وەک شمشێر لە کالانێدا)و، جگە لە شمشێر لە کالانێدا، نابێ چەکی دیکە پێ بێ.

**١٦-** لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەو نووسراوەی دەنووسی لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمڕدا، (**أَبُو جَنْدَل**) کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمڕ هات و، ئاسنی لە دەست و پێیاندا بوو، ڕایکردبوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

هاوەڵانی پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێک دەرچوو بوون، گومانیان نەبوو بوو، کە مەککە ئازاد دەکەن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەونێکی لەو بارەوە دیبوو، ئنجا کاتێک ئەوەیان بینی لە پێکهاتن و، گەڕانەوەو، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە سوهەیلی کوڕی عەمڕ کرد، ئەوە خەفەت و مەراقێکی زۆری خستە دڵی خەڵکەوەو خەریک بوو بفەوتێن، (یانی: خەریک بوو، هەندێکیان بکەونە گومان و دوو دڵییەوە).

کاتێک سوهەیلی کوڕی عەمر، ئەبوو جەندەلی بینی کە کوڕیەتی و مسوڵمان بووەو بە کۆت و زنجیرەوە هاتوە، بۆی هەڵساو لە دەم و چاوی داو یەخەی گرت و گوتی: ئەی موحەممەد! ئەو ڕێککەوتنە لە نێوان من و تۆدا تەواو بووە، پێش ئەوەی ئەمە بێ، (واتە: پێش ئەوەی ئەمە بێ، ئێمە ڕێککەوتووین، کەواتە: حوکمەکە بەسەر ئەویشدا دەچەسپێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەی، ئیدی بەو شێوەیە یەخەی گرت و ڕایکێشا بۆ ئەوەی بیباتەوە لای قوڕەیش، ئەبوو جەندەڵیش بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان! چۆن دەبێ بگێڕدرێمەوە بۆ لای هاوبەش بۆ خوا دانەران و، لە دینەکەم هەڵمگێڕنەوە؟ ئیدی ئەو خەم و دڵنارەحەتییەی لە خەڵکدا هەبوو، ئەو ڕووداوە هێندەی دیکەی بۆ زیاد کردن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **(يَا أَبَا جَنْدَلٍ اصْبِرْ وَاحْتَسِبْ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ لَكَ، وَلِمَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُسْتَضْعَفِينَ فَرَجَاً وَمَخْرَجَاً، إِنَّا قَدْ عَقَدْنَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ صُلْحَاً، وَأَعْطَيْنَاهُمْ عَلَى ذَلِكَ وَأَعْطَوْنَا عَهْدَ اللَّهِ، وَإِنَّا لاَ نَغْدِرُ بِهِمْ)**[1]، واتە: ئەی ئەبوو جەندڵ! خۆت ڕاگرەو پاداشتەکە لە لای خوا حیساب بکە، بە دڵنیایی خوا دەرووی خێرو فەرەحنایی بۆ تۆو بۆ چەوسێنراوان دێنێ، (ئەوانەی لەگەڵت دان، لە چەوسێنراوان و وەک تۆن)، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا، پێکهاتنمان کردوەو پەیمانی خوامان پێداون، ئەوانیش پەیمانیان پێداوین و، ئێمە پەیمان ناشکێنین، عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه، هەڵسا لەگەڵ ئەبوو جەندەڵدا دەڕۆیشت لە تەنیشتیەوە دەیانبردەوە بۆ لای قوڕەیش، پێی دەگوت: ئەی ئەبوو جەندەڵ! خۆت ڕاگرە، ئەوانە هاوبەش بۆ خوا دانەرن، خوێنی یەکێکیان وەک خوێنی سەگ وایە، دەستکی شمشێرەکەشی لێ نزیک دەخستەوە، عومەر رضي الله عنه، دوایی گوتوویەتی: ئومێدم وابوو دەستکی شمشێرەکە بگرێ و پێی لە بابی بدات، بەڵام ئەو پیاوە، (واتە: ئەبوو جەندەڵ)

---

(١) رواه أحمد في المسند: ١٨٩٣٠، قال شعيب الأرناؤوط، والبيهقي في الكبرى: ١٨٦١١، وذكره في البداية والنهاية: (٤/ ١٨٩).

ڕژدیی کرد بە بابی، واتە: ئامادە نەبوو بابی بکوژێ و، مەسەلەکە تەواو بوو و بردیانەوە.

ئەوانەی شایەدییاندا لەسەر ئەو صولح و پێکهاتنە، لە مسوڵمانان پیاوانێک و لە هاوبەش بۆ خوا دانەران پیاوانێک، لە مسوڵمانان:

١- ئەبوو بەکری صیددیق و، ٢- عومەری کوڕی خەتتاب و، ٣- عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و، ٤- عەبدوڵڵای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمرو، ٥- سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص، ٦- مەحمووودی کوڕی مەسلەمەو، ٧- میکرەزی کوڕی حەفص، کە ئەو کاتە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوو، ٨- عەلی کوڕی ئەبوو تالیب کە ئەو نووسەری ڕێککەوتننامەکە بوو.

١٧- **(إبن إسحاق)** دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا، لە شوێنێک بوو کە نەچوو بووە نێو حەڕەمەوە، بەڵام بۆ نوێژەکان دەچوو لەنێو سنوورەکانی حەڕەمدا، نوێژی دەکرد، ئنجا کاتێک لە صولحەکە بوونەوە، هەڵسا بۆ ئەوەی قوربانییەکەی سەرببڕێ، دوایی دانیشت و سەرتاش سەری تاشیی، ئەو کەسەش کە سەری تاشیوە، پێم گەیشتوە (**خِرَاشَ بْنَ أُمَيَّةَ بْنِ الْفَضْلِ الْخُزَاعِيِّ**) بوو، ئنجا کاتێک خەڵکەکە پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی، قوربانییەکەی خۆی سەربڕیوەو، سەری خۆی تاشیوە، ئەوانیش هەڵسان بۆ سەربڕینی قوربانییەکانیان و سەری خۆ تاشین یان کورتکردنەوەی.

بەڵام لە **(صحيح البخاري)**دا بە ژمارە: **(٢٧٣١ و ٢٧٣٢)** هاتوە: کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە فەرمان بە خەڵکەکە دەکات، قوربانییەکانیان سەرببڕن و سەری خۆیان بتاشن، واتە: ئیحرام بشکێنن، سێ جاران پێیان دەفەرمووێ، کەس هەڵناستێ و بە قسەی ناکەن، چونکە زۆر تووڕەو پەستن، ئەویش دەچێتەوە نێو چادرەکەی و لەو سەفەرەی دا، ئوممو سەلەمەی لەگەڵدا دەبێ، خوا لێی ڕازی بێ، بۆ ئوممو سەلەمە باس دەکات، دەڵێ: خەڵکەکەت خەریکن بفەوتێن، سێ جاران پێمگوتن بە قسەیان نەکردم، ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا!

ﷺ قسەیان لەگەڵ مەکە، هەڵسە خۆت قوربانییەکەت سەرببڕەو، بانگ بکە با سەرت بتاشن، کە تۆ وات کرد، ئەوانیش وەدوات دەکەون! پێغەمبەریش ﷺ پێشنیارەکەی ئوممو سەلەمە جێبەجێ دەکات، ئەوانیش دوایی بە ناچاریی بە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەون، هەتا لە صەحیحی بوخارییدا، دەڵێ: (**كَادَ أَن يُهْلِكُ بَعْضُهُمْ بَعْضَاً**)، خەریک بوو هەندێکیان هەندێکیان بفەوتێنن، واتە: بە ڕقەوە سەری یەکدییان دەتاشیی.

(**إبن إسحاق**)، دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هاتوە، کە پیاوانێک لە ڕۆژی حودەیبییەدا سەری خۆیان تاشیوەو، پیاوانێکیش سەری خۆیان کورت کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**«يَرْحَمُ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ» قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يا رسول الله! قَالَ: يَرْحَمُ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يا رسول الله؟ قَالَ: رحم الله المحلّقين، قالوا: والمقصّرين يا رسول الله! قال: «وَالْمُقَصِّرِينَ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلِمَ ظَاهَرْتَ التَّرَحُّمَ لِلْمُحَلِّقِينَ دُونَ الْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ «لِأَنَّهُمْ لَمْ يَشُكُّوا»**)[1].

واتە: لە ڕۆژی حودەیبییەدا هەندێک لە هاوەڵان (پیاوان) سەری خۆیان تاشیی و هەندێکیش کورتیان کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوا بەزەیی بەوانەدا بێ کە سەری خۆیان تاشیوە، گوتیان: ئەدی ئەوانەی سەری خۆیان کورت کردۆتەوە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! جاری دووەم دیسان فەرمووی: خوا بەزەیی بەوانەدا بێ، کە سەری خۆیان تاشیوە، گوتیان: ئەدی ئەوانەی سەری خۆیان کورت کردۆتەوە، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، بۆ جاری سێیەمیش دیسان فەرمووی: خوا بەزەیی بەوانەدا بێ سەری خۆیان تاشیوە، گوتیان: ئەدی ئەوانەی سەری خۆیان کورت کردۆتەوە، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، ئنجا فەرمووی: خوا بەزەیی بەسەری خۆ کورتکەرەوانیش دابێ.

---

(١) رواه أحمد في المسند: ٣٣١١ و ٤٦٥٧ و ١٦٦٩٨، والطبراني في الأوسط: ٩١٩٨، وأبو يعلى في المسند: ١٢٦٣ و ٢٧١٨، والنسائي في الكبرى: ٤١١٤ و ٤١١٥.

گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ بۆچـی بەزەیـی خـوات بـۆ ئەوانـەی سـەری خۆیـان تاشـیبوو چەنـد بارەکـردەوە؟ فەرمـووی: لەبـەر ئـەوەی دوو دڵ نەبـوون (واتە: فەرمانەکەیـان باشـتر جێبەجـێ کـرد).

(**إبـن هشـام**) دەڵـێ: (**عَبْـدُ اللّـهِ بْـنُ أَبِي نَجِيـح**)، گوتوویـەتی: موجاهیـد بـۆی باسـکردووم لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە سـاڵی حودەیبییـەدا لـە نێـو قوربانییەکانیـدا حوشـترێکی نێـرەی کـە هـی ئەبـوو جەهـل بـووە، لێـی بـە غەنیمـەت گرتبـوو، پێیبـوو، لەسـەری حوشـترەکەدا زیـو هەبـوو، بـۆ ئـەوەی ڕقـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکانی پـێ هەڵسـێنێ. [ئـەوە بـۆ چـوونی وی بـووەو، پێـم وایـە بـۆ ئـەوەی وەبیریـان بێنێتـەوە، کـە لـە جەنگـی بـەدردا زۆر خراپتـان بەسـەر هاتـوە، جارێکـی دیکـە جەنـگ لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵان مەکـەن، نـەوەک هەمـان شـتتان بەسـەر بێتـەوە، وای تێدەگـەم ئـەوە حیکمەتەکـەی بـوو بـووێ، نـەک بـۆ ڕق هەڵسـاندنیان].

**١٨**- دابەزینی سوورەتی (**الفتح**):

(**الزُّهْـرِي**) دەڵـێ: دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەڕایـەوە هەتـا کاتێـک گەیشـتە نێـوان مەککـەو مەدینـە، سـوورەتی (**الفتـح**) دابەزیـی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾﴾، هەتـا کۆتایـی ئایەتـەکان...، هەمـووی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە نێـوان مەککـەو مەدینـەدا دابەزیـی، لـە شـوێنێک بـە نـاوی: (**كُـرَاعُ الغَمِيـم**)، (**الزهـري**) گوتوویـەتی: بۆیـە خـوا ﷻ نـاوی نـاوە ﴿فَتْحًا مُّبِينًا﴾، سـەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشـکرا، لەبـەر ئـەوەی سـەرکەوتن و وەرچەرخانێکـی گـەورە بـوو لـە مێـژووی ئیسـلام دا.

(**إبـن هشـام**) دەڵـێ: بەڵگـە لەسـەر ڕاسـتیی قسـەی زوهریـی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە (١٤٠٠) کەسـەوە، بەپێـی قسـەی جابیری کـوڕی عەبدوڵـڵا دەرچوو بۆ حودەیبییـە، بەڵام لـە سـاڵی سـەرکەوتنی مەککـەدا، دوو سـاڵ دوایـی ئـەو پێکهاتنـە لـە سـاڵی هەشـتەمدا، بـە (١٠،٠٠٠) کەسـەوە دەرچـوو، واتـە: ژمـارەی مسـوڵمانان چەنـد بەرانبـەر بۆوە.

**١٩-** چارەنووسی ئەوانەی دەچەوسێنرانەوە بە دەستی قورەیش کەسانێک کە مسوڵمان دەبوون و ئیمانیان دەهێنا:

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مەدینە، (**أَبُو بَصِيرٍ، عُتْبَةُ بْنُ أُسَيْدِ بْنِ جَارِيَةَ**)، کە یەکێک بووە لەوانەی لە مەککە مسوڵمان بوو بوو، لەبەر ئەوەی ئیمانی هێنا بوو حەپسیان کردبوو، ڕایکردو هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێک لە زلە زلانی قورەیش، نامەیان نووسی و پیاوێکیان نارد لە (**بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيّ**)، مەولایەکی وانیشی لەگەڵ بوو (واتە: کۆیلەیەکی ئازاد کراو)، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ نامەکەی (**الْأَزْهَرِ وَالْأَخْنَسِ**)یان بۆ هێنا، ئەو دووانە نامەکەیان نووسیبوو، کە نامەکەیان بۆ هێنا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**يَا أَبَا بَصِيرٍ! إِنَّا قَدْ أَعْطَيْنَا هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ مَا قَدْ عَلِمْتَ، وَلَا يَصِحُّ فِي دِينِنَا الْغَدْرُ، وَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ لَكَ وَلِمَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُسْتَضْعَفِينَ فَرَجًا وَمَخْرَجًا، فَانْطَلِقْ إِلَى قَوْمِكَ، قَالَ: يَا رَسُولَ الله! إِلَى الْمُشْرِكِيْنَ يَفْتِنونَنِي بِدِيْنِي؟ قَالَ: يَا أَبَا بَصِيرٍ! انْطَلِقْ فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى سَيَجْعَلُ لَكَ وَلِمَنْ مَعَكَ فَرَجَاً وَمَخْرَجَاً**)، واتە: ئەی ئەبوو بەصیر! وەک دەزانی پەیمانمان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بەستووە، لە دینی ئێمەشدا پەیمان شکێنیی ناگونجێ، خوا ﷻ بۆ تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆ دان لە چەوسێنراوان دەرووی خێر دەکاتەوەو فەرەحنایی دێنێ، بۆیە لەگەڵ خەڵکەکەت بچۆوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا دەمنێریەوە بۆ لای هاوبەشدانەرەکان، تاکو لە دینەکەم هەڵمگێڕنەوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی ئەبوو بەصیر! بڕۆ بێگومان خوا بۆ تۆش و بۆ ئەوانەش کە لەگەڵ تۆدان لە چەوسێنراوان، دەرووی خێر دەکاتەوەو فەرەحنایی دێنێ.

ئەبوو بەصیریش لەگەڵیان دەڕوات، هەتا دەگەنە شوێنێک بە ناوی: (**ذو الحليفة**)، لەوێ دادەنیشێ و پاڵ بە دیوارێک دەداو دوو هاوەڵەکەشی لەگەڵیدا دادەنیشن، ئەبوو بەصیر بێ چەک و ئەوانیش شمشێریان پێیە، ئەبوو بەصیر، بە یەکێکیان، دەڵێ: ئەرێ شمشێرەکەت زۆر تیژە، ئەی برای هۆزی بەنوو عامیر؟

دەڵێ: بەڵێ، ئەگەر دەتەوێ تەماشای بکە، لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، گوتی: بەڵێ زۆرم خەڵک پێ کوشتوە، تەماشای بکە، ئەبوو بەصیریش شمشێرەکە دەردەکێشێ لە کالانێی و، یەکسەر کابرای پێ دەکوژێ و، کۆیلە ئازاد کراوەکەش ڕادەکات و دەچێتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەو کاتەدا لە مزگەوت دانیشتوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبینێ دەفەرموێ: (**إنَّ هَـذَا رَجُـلٌ قَـدْ رَأَى فَزَعَـاً**)، ئەم پیاوە ترسێکی دیوە، پێش ئەوەی بگاتە خزمەتی، کاتێک دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بێ قەزا بی (**ويحك**) چیتە؟ دەڵێ: هاوەڵەکەی ئێوە هاوەڵەکەی منی کوشت! ئنجا زۆری پێ نەچوو یەکسەر ئەبوو بەصیر بە شمشێری ڕووتەوە هات، لە لای سەری پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ بەڵێنی خۆت جێبەجێ کردو، ئەوەی لەسەرت بوو تەواوت کرد، تەسلیمی ئەو خەڵکەت کردمەوە، بەڵام من دینی خۆم پاراست لەوە کە ئازارو ئەشکەنجەم بدەن، یاخود گاڵتەم پێبکەن، بۆیە من کابرام کوشتوەو ئێستا ئازادم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (**وَيْلُ أُمِّهِ مِحَشّ حَرْبٍ لَوْ كَانَ مَعَهُ رِجَالٌ**)، {ئەمە تەعبیرێکی عەرەبان بووە}، هاوار بۆ دایکی [کە ئەو پیاوە ئازایەی بووە]، ئەوە شەڕ هەڵگیرسێنەرە، ئەگەر پیاوی لەگەڵدابن.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی خەڵکی دیکەش کە مسوڵمان دەبن، پشتی بگرن و دینی خۆیان بپارێزن، چونکە مسوڵمانان نابێ پەنایان بدەن، لەولاش ئەگەر بەرپەلیان بکەون دەیانکوژن، کەواتە: دەبێ قاچاغ بن.

**٢٠-** دوایی ئەبوو بەصیر ڕۆیشت هەتا ناوچەیەک پێی دەگوترێ: (**عَيصْ**)، لەسەر کەناری دەریا، لەوێ بۆ خۆی دانیشت لەسەر ڕێی قورەیشییەکان، کە دەچوون بۆ شام بۆ بازرگانیی، بۆ خۆی لەوێ دانیشت تاکو ڕێ بەو کاروانانەی قورەیشییەکان بگرێ، ئەو هەواڵەش بە مسوڵمانان گەیشتەوە، ئەو مسوڵمانانەی لە مەککە حەپسکرا بوون، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**وَيْلُ أُمِّهِ مِحَشّ حَرْبٍ لَوْ كَانَ مَعَهُ رِجَالٌ**)، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: (**مِسْعَرُ حَرْبٍ**) واتە: ئاگر خۆشکەرە، ئەگەر پیاوی لەگەڵ دابن، بۆیە ئەو

مسوڵمانانەی لە مەککە حەپسکرابوون، ڕۆیشتن و هەموویان چوونە ناوچەی (**عِيْص**)و لەوێ چوونە پاڵ ئەبوو بەصیر، لەوێ دەوری حەفتا کەس لە ئەبوو بەصیر کۆبوونەوە، ئیدی ئەوانە هەڵسان بە ڕێگرتن لە کاروانەکانی قورەیش و تەنگیان بە قورەیش هەڵچنیی و، زەفەریان بە کەس نەدەبردو کەسیان لێ هەڵنەدەکەوت مەگەر دەیانکوشت، هیچ کاروانێکیان بەلادا تێنەدەپەڕی، مەگەر کاروانەکەیان ڕووت دەکردەوە، هەتا قورەیشییەکان نامەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردو خزمایەتییان بەگژدا کرد، کە ئەوانە بحەوێنێتەوەو لە کۆڵ ئەوانیان بکاتەوەو پێویستییان بەو مەرجە نیە، واتە: تەنازولیان لەو مەرجە کرد، ئیدی پێغەمبەری خواش ﷺ حەواندنیانەوەو هاتنە مەدینە.

**٢١-** ئەوە بە نسبەت پیاوانەوە، بە نسبەت ئافرەتانەوەش، کە مسوڵمان دەبن، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: لەو سەرو حەدەدا: (**أُمّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعِيطٍ**)، مسوڵمان بوو و کۆچی کرد، دوو برایەکەی عیمارەو وەلید کوڕانی عوقبە، بە دوایدا هاتن تاکو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ داوایان کرد، کە بۆیان بگێڕێتەوە، بەپێی ئەو پەیمانەی لەبەینیاندا هەیە، لە حودەیبییە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەوەی نەکردو خوا ﷻ ڕێی لەوە گرت، بە پێی ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**الممتحنة**)، کە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ مُهَـٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَـٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر ئافرەتانی بڕواداری کۆچکەر هاتن بۆ لاتان تاقییان بکەنەوە، خواش بە ئیمانەکەیان زاناترە، ئەگەر بۆتان دەرکەوت بڕوادارن، مەیانگێڕنەوە لای کافرەکان، نە ئەو ئافرەتانە بۆ ئەوان حەڵاڵن، نە ئەو کافرانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن، بەڵام ئێوە ئەوەی مێردەکانیان خەرجیان کردوە (لە مارەیی و مەصرەف) بۆیان بگێڕنەوەو، گوناهتان ناگاتێ

ئەگەر بشیانهێنن، هەر کاتێک مارەییەکانتان پێدان و، ئێوەش ئافرەتانی کافر لە لای خۆتان مەهێڵنەوە....

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو صوڵح و پێکهاتنە باسی پیاوان بووە، باسی ئافرەتان نەبووەو ئێمە ئافرەتەکان ناگێڕینەوە بۆ لاتان، خوای پەروەردگار لەو بارەوە ئەم ئایەتە موبارەکەی دابەزاند، کە ئەوەش دەروویەکی گەورە بوو لەو ئافرەتانە کرایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی ستەملێکراو واقیع نەبن، هەر کەسێک خێزانەکەی هاتوە، هەرچی مارەیی و مەصرەفی لێی کردوە، ئەهلی ئیسلام، مولزەم بوون بۆی بگێڕنەوە.

٢٢- (إبن هشام) گوتوویەتی: (**حَدَّثَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ: أَنَّ بَعْضَ مَنْ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ لَهُ لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ: أَلَمْ تَقُلْ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّكَ تَدْخُلُ مَكَّةَ آمِنًا؟ قَالَ «بَلَى، أَفَقُلْتُ لَكُمْ مِنْ عَامِي هَذَا؟» قَالُوا: لَا، قَالَ: «فَهُوَ كَمَا قَالَ لِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ»**)، واتە: ئەبوو عوبەیدە بۆی باسکردین، کە هەندێک لەوانەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون، کاتێک چۆوە مەدینە، پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! نەتفەرموو: دەچیە شاری مەککەوە، بەبێ ترسیی؟ فەرمووی: با، بەڵام ئایا گوتم: ئەمساڵ؟ گوتیان: نا، فەرمووی: ئنجا وەک جیبریل پێی گوتووم، ئەوە دێتە دی.

کە ئەوە بوو لە ساڵی حەوتەم دا، کە پێی دەگوترێ: (**عَامُ عُمْرَةِ الْقَضَاءِ**)، واتە: ساڵی گێڕانەوەی عومرە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی چوون بۆ مەککەو عومرەیان کردو، سێ شەوو سێ ڕۆژان تێیدا مانەوە.

**بڕگەی دووەم: باسی ڕووداوی جەنگی خەیبەر:**

**١-** (**إبن إسحاق**)، لە ژێر ناوونیشانی: (**ذِكْرُ الْمَسِيرِ إلَى خَيْبَرَ فِي الْمُحَرّمِ سَنَةَ سَبْعٍ**)، (باسی ڕۆیشتن بەرەو خەیبەر لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمدا)دا، کە [صوڵحی حودەیبییە لە مانگی (**ذي القعدة**)دا بووە، بەڵام جەنگی خەیبەر کەوتۆتە مانگی موحەڕڕەم (مانگی یەک)ی ساڵی حەوتەمی کۆچییدا]، (**إبن إسحاق**) گوتوویەتی: دوایی پێغەمبەر ﷺ کاتێک کە لە صوڵحی حودەیبییە گەڕایەوە، مانگی (**ذي الحجة**)و بەشێک لە مانگی موحەڕڕەمیش، لە مەدینەدا مایەوە، لەو ساڵەدا کە مسوڵمانان نەچوون، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان سەرپەرشتیی حەجیان کرد، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاشماوەی مانگی موحەڕڕەمدا، بەرەو خەیبەر بەڕێ کەوت، (**إبن هشام**) دەڵێ: هەر (**نُمَيْلَةَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ اللّيْثِيّ**)، کردە سەرپەرشتیار لە شوێنی خۆی و، ئاڵایەکەشی تەسلیمی عەلیی کوڕی ئەبی تالیب کرد، کە ئاڵایەکی سپی بوو.

**٢-** (**إبن إسحاق**) دەڵێ: (**إبن الدَّهْرِ الأَسْلَمِي**) بابی بۆی گێڕاوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، کاتێک ڕۆیشتوون بەرەو جەنگی خەیبەر، بە عامیری کوڕی ئەکوەع کە مامی سەلەمەی کوڕی عەمڕی کوڕی ئەکوەع بووە، پێی فەرمووە: (**إنْزِلْ يَا ابْنَ الأَكْوَعِ فَخُذْلنا مِنْ هَنَاتِكَ**)، ئەی کوڕی ئەکوەع! دابەزە هەندێک لە شیعرو بەندەکانی خۆمان بۆ بڵێ، ئەویش دابەزیوەو ئەم شیعرەی گوتوە:

وَاللّهِ لَوْلَا اللّهُ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلا تَصَدّقْنَا وَلاَ صَلّيْنَا

إنّا إذَا قَوْمٌ بَغَوْا عَلَيْنَا ... وَإِنْ أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا ... وَثَبّتْ الْأَقْدَامَ إنْ لَاقَيْنَا

واتە: سوێند بە خوا، ئەگەر خوا نەبووایە ئێمە ڕێی ڕاستمان نەدەگرت و، خێرو چاکەمان نەدەکردو نوێژمان نەدەکرد.

ئێمە هەر کاتێک کۆمەڵێک ویستیان دەستدرێژییمان بکەنە سەر، ستەممان لێبکەن و، ئەگەر ویستیان هەڵمان بگێڕنەوە، ئێمە ڕازیی نابین.

خوایە! ئارامیی و ئۆقرەیی دابەزێنە سەردڵمان و، کاتێک بە دوژمن گەیشتین، پێیەکانمان بچەسپێنە.

ئنجا کاتێک ئەو شیعرانەی گوتن، حەتمەن بەدەنگی خۆش و لارانەوە گوتوونی، پێغەمبەر فەرمووی: (**یَرْحَمُكَ اللهُ**)، خوا بەزەیی پێتدا بێ، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، گوتی: (**وَجَبَتْ وَاللّهِ یَا رَسُولَ اللّهِ! لَوْ أَمْتَعْتَنَا بِهِ، فَقُتِلَ یَوْمَ خَیْبَرَ شَهِیدًا**)، واتە: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ پێویست بوو، (بەزەیی خوای بۆ پێویست بوو)، دەبوایە بۆت هێشتباینەوە زیاتر بەهرەی لێوەربگرین! ئەوە بوو لە جەنگی خەیبەردا کوژرا، شەهید بوونەکەشی بە هۆی ئەوەوە بوو لە کاتێکدا لەگەڵ (مەڕحەب) یەکێک لە پاڵەوانەکانی خەیبەردا چووە مەیدان، شمشێرەکەی خۆی بۆ لای گەڕایەوەو بە شمشێرەکەی خۆی کوژرا بوو، ئنجا مسوڵمانان هەندێکیان کەوتوونە دوو دڵییەوە لە بارەی کوژرانەکەیەوەو، گوتوویانە: بە چەکی خۆی شەهید بووە! هەتا برازایەکەی (**سَلَمَةُ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْأَكْوَعِ**) لە پێغەمبەری ﷺ پرسی لەو بارەوەو هەواڵی پێدا: خەڵک چییان گوتوە، پێغەمبەر خواش ﷺ فەرمووی: (**إِنَّهُ لَشَهِیدٌ**)، بە دڵنیایی ئەو شەهیدە، دوایی نوێژی لەسەر دەکات و مسوڵمانانیش نوێژی لەسەر دەکەن، نوێژ لەسەر کردنەکەشی، یان ئەو کاتە جارێ نوێژ لەسەر شەهید نەکردن نەبووە، یان وەک هەندێک زانا گوتوویانە: هەم نوێژ لەسەرکردن هەیەو، هەم لەسەرنەکردنیش هەیە، یان ئەوە حاڵەتێکی تایبەت بووە.

٣- کاتێک پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕووی خەیبەر دەچێ، بە هاوەڵەکانی دەفەرموێ: بوەستن و دەوەستن، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم دووعایە دەکات: (**أَللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الْأَرَضِینَ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّیَاطِینِ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّیَاحِ وَمَا أَذْرَیْنَ، فَإِنَّا نَسْأَلُكَ خَیْرَ هَذِهِ الْقَرْیَةِ وَخَیْرَ أَهْلِهَا وَخَیْرَ مَا فِیهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَا فِیهَا، أَقْدِمُوا بِسْمِ اللهِ، قَالَ: وَكَانَ یَقُولُهَا عَلَیْهِ السَّلَامُ لِكُلِّ قَرْیَةٍ دَخَلَهَا**) واتە: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئاسمانەکان و ئەوەی سێبەریان لێکردووەو، پەروەردگاری زەوییەکان

و ئەوەی هەڵیانگرتوەو، پەروەردگاری شەیتانەکان و هەر کەس گومڕای دەکەن و، پەروەردگاری بایەکان و هەرچی شتێک ڕای دەماڵن، ئێمە چاکەی ئەم ئاوەدانییەو، چاکەی خەڵکەکەی و، هەر چاکەو خێرێکی تێیدایە، لێت داوا دەکەین و، پەنات پێ دەگرین لە خراپەی ئەو ئاوەدانییەو، خراپەی خەڵکەکەی و خراپەی هەر شتێک کە تێیدایە، ئنجا فەرمووی: بە ناوی خوا بچن.

پێغەمبەری خوا ﷺ چووبایە هەر ئاوەدانییەکەوە، ئەم دووعایەی دەکرد.

٤- (**إبن إسحاق**) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو، هێرشی کردبایە سەر هەر خەڵکێک کە پێویست بووایە، هێرشیان بکاتە سەر، هەتا ڕۆژ نەبووبایەوە، هێرشی نەدەکردنە سەر، ئنجا ئەگەر گوێی لە دەنگی بانگ بووبایە، هێرشەکەی ڕادەگرت و، ئەگەر دەنگی بانگی نەبیستبایە، هێرشەکەی دەکرد، دەڵێ: ئێمە بە شەو چووینە ناوچەی خەیبەر، پێغەمبەر ﷺ شەو مایەوە تاکو ڕۆژی کردەوەو گوێی لە بانگ نەبوو، ئیدی ئەو سوار بوو، ئێمەش لەگەڵی سوار بووین، من لە پشت ئەبوو تەڵحەوە سوار بووم، کە پێم بە پێی پێغەبەری خوا ﷺ دەکەوت، (یان لە پشتەوەی یان لە تەنیشتی ڕۆیشتوە)، کرێکارەکانی خەیبەر بەیانی زوو کە دەردەچوون بۆ ئیش، تووشمان بوون، بە بێڵ و ئەو ئامێرانەوە کە کاری کشتوکاڵیان پێ کردوون، پێیان بوون، کاتێک پێغەمبەری خوایان بینی و سوپایەکەیان بینی، گوتیان: (**مُحَمّدٌ وَالْجَيْشُ مَعَهُ**) ئەوە موحەممەد هات و سوپای لەگەڵدایە، ئیدی ئەوانە ڕایانکردو پشتیان تێکردین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (**أَللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ، فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ**)، واتە: خوا گەورەترە خەیبەر کاول بوو، ئێمە کاتێک دادەبەزین بۆ گۆڕەپانی خەڵکێک، ئەوە خراپترین بەیانییە، بۆ وریا کراوان، واتە: زەفەریان پێ دەبەین.

٥- (**إبن إسحاق**) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە مەدینە دەرچوو بەرەو خەیبەر، چوو بۆ ناوچەیەک بە ناوی (**عصر**) لەوێ مزگەوتێکیان بۆ دروستکرد، لەسەر شوێنێکی چەوو، دوایی پێغەمبەر ﷺ سوپایەکەی برد تاکو شیوێک کە پێی دەگوترێ: (**الرَّجِيع**)

لەوێ ئەو سوپایەی لە نێوان (**خیبر**) و (**غَطَفَان**)دا دانا، تاكو ڕێگا بگرێ لەوە، كە هۆزی (**غَطَفَان**) بێن، هاوكاریی خەڵكی خەیبەر بكەن، چونكە هۆزی (**غَطَفَان**) جارێ مسوڵمان نەبوون و، دژی پێغەمبەر ﷺ بوون.

٦- (**إِبن إسحاق**) دەڵێ: پێم گەیشتوە كە (**غَطَفَان**) كاتێك دەبیستن پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو شوێنە سوپای داناوە، بۆی كۆ دەبنەوە، بەڵام كاتێك دەچن بۆ ئەوەی پشتی جوولەكەكان بگرن، ماوەیەك دەڕۆن و هەست دەكەن، لە پشتیانەوە دەنگێك دێ، ئەوانیش پێیان وا دەبێ: لە پشتەوە ڕا پێغەمبەر ﷺ سوپایەكی ناردوەو، تاكو زەفەر بە ماڵ و منداڵ و كەل و پەلیان بەرێ، بۆیە دەگەڕێنەوەو، لە نێو كەس و كارو ماڵ و سامانەكەی خۆیاندا دەمێننەوەو، لە پێغەمبەری خواو ﷺ لە جوولەكەكان دەگەڕێن.

٧- ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ وردە وردە لە ماڵ و سامانی خەیبەرییەكان چووە پێش، ماڵ بە ماڵ و شوێن بە شوێن، قەڵا بە قەڵا دەیگرت، یەكەمین قەڵایان كە گرتیان قەڵای (**ناعم**) بوو، لەوێ مەحموودی كوڕی مەسلەمە كوژرا، پیاوێك دەستاڕێكی بەسەر داداو كوشتیی، دوایی قەڵای (**قَبُوس**) كە قەڵای (**إبن أبِي الحُقَيْق**) بوو.

٨- پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەردا، چەند شتێكی قەدەغە كردن، (**إِبن هشام**) دەڵێ: مسوڵمانان لە جەنگی خەیبەردا، گۆشتی كەری ماڵییان وەسەر نابوو، پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی لە خەڵك كرد، كە گۆشتی كەری ماڵیی بخۆن، كاتێك كە مەنجەڵەكان دەكوڵین، مەنجەڵەكانیان هەمووی وەرگێڕان، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی كردبوو، لە خواردنی ئەو جۆرە گۆشتە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا، ڕێگریی لێكردن ئەو كەنیزەكانەی تۆلیان هەیە (دوو گیانن) بچنە لایان.

هەروەها لێی قەدەغەكردن كە گۆشتی هەر دڕندەیەكی خاوەن كەڵبە كە گۆشتخۆرە، بخۆن، هەروەها لێی قەدەغەكردن كە دەستكەوتی جەنگیی، كڕین و فرۆشتنی پێ بكەن، تاكو دابەش دەكرێ.

(إبــن إســحاق) دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ ڕێگریــی لــە خەڵــک کــرد، گۆشــتی کــەری ماڵیــی بخــۆن، بــەڵام مۆڵــەتی دان کــە گۆشــتی ولاخــە بــەرزە بخــۆن، (ولاخــە بــەرزەش ئەســپ و ماییــنــە).

**٩-** دوایی پێغەمبەر ﷺ وردە وردە لە ماڵ و سامانی خەیبەرییەکان نزیک دەکەوتەوەو، دەستی بەسەردا دەگرتن، لەو کاتەدا هەندێک لە **(بني سهم)** لە هۆزی **(أَسْلَم)** هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ زۆر هەژارو نەدارین، هیچ شتێکمان بەدەستەوە نیە، پێغەمبەری خواش ﷺ هیچ توانای ماددیی نەبوو هاوکارییان بکات، بەڵام دوعای کردو فەرمووی: **(أَللَّهُمَّ إِنَّكَ قَدْ عَرَفْتَ حَالَهُمْ، وَأَنْ لَيْسَتْ بِهِمْ قُوَّةٌ، وَأَنْ لَيْسَ بِيَدِي شَيْءٌ أُعْطِيهِمْ إِيَّاهُ، فَافْتَحْ عَلَيْهِمْ أَعْظَمَ حُصُونِهَا عَنْهُمْ غَنَاءً وَأَكْثَرَهَا طَعَاماً وَوَدَكاً)**، واتە: ئەی خوایە! بۆ خۆت حاڵی وان دەزانی، کە هێزی ماددییان نیە، منیش هیچ شتێکم نیە، پێیان بدەم، خوایە! باشترین قەڵا کە زۆرترین سامانی تێدابێ، باشترین و زۆرترین بەزو چەوریی تێدابێ، بە دەستی ئەوان بگیرێ، ئیدی ئەوە بوو خەڵک دووبارە دەستیان بە جەنگ کردەوەو قەڵایەک بە ناوی: **(حصن الصعب بن معاذ)**، ئەوانە گرتیان، کە لە هەموو خەیبەردا هیچ قەڵایەک لەو قەڵایە زیاتر خواردن و چەوریی و گۆشت و بژیوی تێدا نەبوو.

**١٠-** مەڕحەب و کوژرانی، **(إبن إسحاق)** لە جابیری کوڕی عەبدڵڵاوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەرەو خەیبەر دەچن، مەڕحەب کە پیاوێکی پاڵەوان و ئازایان بووە، لە قەڵایەکە دێتە دەر، کە خۆی چەکدار کردوە، ئەم شیعرە دەڵێ:

**قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مَرْحَبُ ... شَاكِي السِّلَاحِ بَطَلٌ مُجَرِّبُ**

**أَطْعَنُ أَحْيَانًا وَحِينًا أَضْرِبُ ... إِذَا اللُّيُوثُ أَقْبَلَتْ تُحَرِّبُ**

**إِنَّ حِمَايَ لَلْحِمَى لَا يُقْرَبُ**

واتــە: خەڵکــی خەیبــەر دەزانــن مــن مەڕحەبــم، چەکــم بــە شــانەوەیەو پاڵەوانێکــی ئەزموونــدارم، هەندێــک جــاران بــە ڕم، (ڕم دەوەشــێنم) و هەنــدێ جاریــش بــە

شمشێر لێ دەدەم، لە کاتێکدا شێرەکان دێنە پێشێ و جەنگ دەکەن، هەر قەدەغەی من قەدەغەیە، نابێ کەس توخنی بکەوێ، پیاوی ئەزمووندار لە هێرش و پەلاماری من دەسڵەمێتەوە.

دوایی مەڕحەب گوتوویەتی: (**مَنْ يُبَارِزُ؟**) کێ دێتە مەیدان؟ کەعبی کوڕی مالیکیش گوتوویەتی:

**قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي كَعْبُ ... وَأَنَّنِي مَتَى تُشَبُّ الْحَرْبُ**

**مَاضٍ عَلَى الْهَوْلِ جَرِيءٌ صَلْبُ ... مَعِي حُسَامٌ كَالْعَقِيقِ عَضْبُ**

**بِكَفِّ مَاضٍ لَيْسَ فِيهِ عَتْبُ ... نَدُكُّكُمْ حَتَّى يَذِلَّ الصَّعْبُ**

واتە: خەیبەر دەزانێ من کەعبم، کاتێک جەنگ بەرپا دەبێ خۆم بە شوێنی مەترسییدا دەدەم، زۆر بوێرم و پتەوم، شمشێرێکیشم بە دەستەوەیە، وەک عەقیق[1] وایە زۆر چاک دەبڕێ، بە دەستێکیشەوەیە کە ئەو دەستە هیچ لۆمەی نایەتە سەرێ، دەتانهاڕین، تاکو ئەوەی قورس و زەحمەتە زەبوون دەبێ.

ئنجا کە بەو شێوەیە ئەو دوو پاڵەوانە، ئەو دوو شیعرە بۆ یەکدی دەڵێن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**مَنْ لِهَذَا؟**) (**مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ**)ش گوتی: (**أَنَا لَهُ يَا رَسُولَ اللهِ! أَنَا وَاللّٰهِ الْمَوْتُورُ الثَّائِرُ، قَتَلَ أَخِي بِالْأَمْسِ، فَقَالَ: فَقُمْ إِلَيْهِ، أَللَّهُمَّ أَعِنْهُ عَلَيْهِ**).

واتە: کێ هەیە، بۆ ئەمە بچێتە مەیدان؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، دەڵێ: من ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بە خوا من لێکوژراوی تۆڵەستێنم، دوێنێ برایەکەمی کوشتوە، مەحموودی کوڕی مەسلەمە، وەک پێشتر باسمان کرد، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: بۆی هەڵسە، خوایە! هاوکاریی بە، ئیدی کە لە یەکدی وەنزیک دەکەون، درەختێک دەکەوێتە نێوانیانەوەو، هەر کامێکیان خۆی لە درەختەکە دەگرێ کە بەرانبەرەکەی نەیبینێ، هەر کە یەکێکیان خۆی

---

(١) جۆرە بەردێکی سپی و ساف و بریسکەدارە.

تێدەگرێ، ئـەوی دیکـە لـە درەختەکـە دەدات، تاکـو هاوەڵەکـەی بـۆی دەرکـەوێ، تاکـو سـەرەنجام درەختەکـە هیـچ پەلـی پێـوە نامێنـن، تەنیـا قەدەکـەی دەمێنێتـەوە، وەک پیاوێـک کـە ڕاوەسـتاوە، دوایـی مەڕحـەب هێـرش دەکاتـە سـەر موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمەو بـە شمشـێر لێـی دەدات، ئەویـش بـە قەڵغانەکـەی شمشـێرەکەی دەگرێتـەوە، شمشـێرەکەی دەکەوێتـە نێـو قەڵغانەکـەی و شمشـێرەکەی دەگـرێ و عاسـێ دەبـێ، ئنجـا موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمە، بـە شمشـێر لێـی دەدات تاکـو دەیکـوژێ.

**١١-** لە ژێر ناوونیشانی: (**مَقْتَلُ يَاسِرٍ أَخِي مَرْحَبٍ**)، کوژرانی یاسری برای مەڕحەب دا، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: دوای مەڕحەب، یاسری برای هاتە مەیدان، ئەویش هەر دەیگوت: (**مَنْ يُبَارِزُ؟**)، کێ دێتە مەیدانێ، (**هشام بن عروة**) گوتوویەتی: کە زوبەیری کوڕی عەوام، رضي الله عنه بۆ یاسر دەچێتە مەیدانێ، دایکی صەفییەی کچی عەبدولموتتەڵیب کە پووری پێغەمبەر ﷺ خوشکی بابی و، دایکی زوبەیریشە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ کوڕەکەم دەکوژێ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**بَلْ ابْنُكَ يَقْتُلُهُ إِنْ شَاءَاللهُ**)، بەڵکو کوڕەکەت ئەو دەکوژێ، ئەگەر خوا بیەوێ، ئیدی زوبەیر بۆی دەچێتە مەیدان و پێک دەگەن و زوبەیر یاسر برای مەڕحەب دەکوژێ، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: هیشامی کوڕی عوروە کوڕی زوبەیر، کە نەوەی زوبەیرە، بۆی گێڕامەوە کاتێک بە زوبەیر دەگوترا: بە خوا شمشێرەکەت ئەو ڕۆژە زۆر تیژو دڕندە بوو، ئەویش دەیگوت: بە خوا تیژ نەبوو، بەڵام ناچارم کرد، چاک ببڕێ، واتە: بە قووەتی شانان و لە ئەنجامی بەکارهێنانی هێزی زۆردا، چاکی دەبڕی!.

**١٢-** (**الرَّسُولُ يُعْطِي رَايَةَ عَلَيّاً**): (پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵا دەداتە دەست عەلیی)، (**إبن إسحاق**) لە (**سَلَمَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَكْوَعِ**)ەوە، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوو بەکری صیددیق رضي الله عنه بە ئاڵا سپییەکەیەوە نارد، بەرەو لای هەندێ لە قەڵایەکانی خەیبەرو جەنگیان کرد، بەڵام گەڕانەوە، هەرچەندە زۆریش ماندوو بوو، بەڵام سەرکەوتنیان بە دەست نەهێنا بەسەر ئەو قەڵایانەدا، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غَداً رَجُلاً يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ لَيْسَ بِفَرَّارٍ**)، (**أخرجه البخاري: ٢٨٤٧،**

**وابن حبان: ٦١٣٢، والطبراني: في الكبير: ٥٨١٨)**، واتە: بەیانی ئاڵایەکە دەدەمە دەست پیاوێک کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێن، خوا ﷻ لەسەر دەستی ئەو سەرکەوت، وە دەست دێنێ و لە دوژمن ڕا ناکات.

هەڵبەتە ئەمە نابێ چەمکی پێچەوانە **(مفهوم المخالفة)**ی لێ بگیرێ، کە وەک بەداخەوە ئەوانەی گومانی خراپ بە ئەبوو بەکری صیددیق ؓ دەبەن، دەیکەن، بە تایبەتی (شیعە) کە گوایە: ئەوە تانەدانی پێغەمبەر ﷺ بووە لە ئەبوو بەکر!!، بەڵام ئەوە نە لە پێغەمبەر ﷺ دەوەشێتەوە، کە تانە لە نزیکترین و خۆشەویسترین هاوەڵی خۆی بدات، نە ئەبوو بەکریش ئەوەی لێ دەوەشێتەوە، بەڵکو ئەوە بەس مەدحێک بووە بۆ عەلیی ؓ، تاکو ئەوانەی لەگەڵیدان، زیاتر پشت ئەستوور بن، بە فەرماندەکەی خۆیان، بە تایبەت ئەو کاتەش عەلی ؓ، تەمەنی زۆر گەنجتر بووە، ڕەنگە نیوەی تەمەنی ئەبوو بەکری بوو بێ یان شتێک زیاتر، بۆیە ڕەنگە خەڵک زیاتر متمانەیان بە ئەبوو بەکر بوو بێ، ؓ، بۆ ئەوەی متمانەیان بە عەلییش بێ، ئەوەی پێ گوتوە.

سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بانگی عەلی ؓ کرد، لەو کاتەدا چاوی دێشان، ئەویش تفی لە چاوی دا، (یانی: هەندێ فووی لە چاوی کرد)، دوایی فەرمووی: **(خُذْ هَـذِهِ الرَّايَةَ فَامْضِ بِهَا حَتَّى يَفْتَحَ اللَّهُ عَلَيْكَ)**، ئەم ئاڵایە بگرەو بیبە، تاکو خوا ﷻ سەرکەوتنت بە قسمەت دەکات، سەلەمە دەڵێ: سوێند بە خوا ڕۆیشت بە نەرمە غار دەڕۆیی و ئێمە لە پشتیەوە بووین، بە دوایدا دەچووین، ڕۆیشت هەتا ئاڵایەکەی لە نێو کۆمەڵە بەردێکدا، چەقاند لە ژێر قەڵایەکە، جوولەکەیەک لە سەر قەڵاکەوە تەماشای کرد، پێی گوت: تۆ کێی؟ گوتی: من عەلی کوڕی ئەبوو تالیبم، جوولەکەکە، گوتی: **(عَلَوْتُمْ وَمَا أُنْزِلَ عَلَى مُوسَى)**، سوێند بەوەی بۆ سەر مووسا ؑ دابەزێنراوە، سەرکەوتن، یان قسەیەکی ئاوای کرد، ئیدی عەلی ؓ نەگەڕایەوە، تاکو سەرکەوتنی وەدەست هێناو قەڵایان گرت.

لێرەدا (إِبن هشام) شتێک دێنێ هەر وەک پەند لێوەرگرتن، دەیهێنێم، ئەگەرنا لە ئەفسانەوە نزیکە.

(أبي رافع) کۆیلەی ئازاد کراوی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئێمە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبدا ﷺ، ڕۆیشتین کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاڵاکەیەوە ناردی، کاتێک لە قەڵایەکە نیزیک کەوتەوە، خەڵکەکە بۆی هاتنە دەرێ، ئەویش لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە دژیان جەنگا، کابرایەکی جوولەکە زەبرێکی لە عەلییدا قەڵغانەکەی پەڕیی، عەلی ﷺ دەرگایەک کە لەلای قەڵایەکە بوو، دەستی دایەو کردی بە قەڵغان لەسەر سەری خۆی، ئیدی ئەو دەرگایەی هەر بەدەستەوە بوو، شەڕی پێ دەکرد، هەتا خوا ﷻ سەرکەوتووی کرد، دوایی دەرگایەکەی فڕێدا، کاتێک لە جەنگەکە بۆوە، ئێمە هەشت کەس بووین، من هەشتەمیان بووم، زۆر بەزەحمەت دەمانتوانی ئەو دەرگایە هەڵگێرو وەرگێڕ بکەین.

کە بە تەئکید ئەوە لە ئەفسانەوە نزیکەو ڕەنگە دەستێکی شیعانی تێدابێ، چونکە زۆر دوورە هەشت کەس نەتوانن دەرگایەک، هەڵگێڕو وەرگێڕ بکەن و عەلی ﷺ، بە یەک دەست بیگرێ! بەڵێ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ، زۆر ئازا بووەو، زۆریش بەهێز بووە، بەڵام ئەوە دەچێتە قاڵبی ئەفسانەوەو، دەرگای هێندە قورسیش ئەو کاتە زەحمەتە بوو بێ.

**١٣-** باسی (**أَبِي الْيُسْرِ كَعْبَ بْنَ عَمْرٍو**)، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: بورەیدەی کوڕی سوفیانی ئەسلەمیی لە هەندێ پیاوانی بەنی ئەسلەم، لە بارەی (**أَبِي الْيُسْرِ كَعْبَ بْنَ عَمْرٍو**) بۆی باسکردم، گوتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، لە خەیبەر، ئێوارەیەکیان مەڕی کابرایەکی جوولەکە هاتەوەو، دەیویست بچێتە نێو قەڵایەکەیانەوە، ئێمەش ئابڵووقەی ئەوانمان دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**مَنْ رَجُلٌ يُطْعِمُنَا مِنْ هَذِا الْغَنَمِ؟**)، چ پیاوێک هەیە، لەم مەڕە خواردنێکمان بۆ دەستەبەر بکات، (**أَبِي الْيُسْرِ**) گوتی: من ئەی

پێغەمبەری خوا! ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەی وا بکە، دەڵێ: ڕۆیشتم وەک چۆن نەعامە دەڕوا، بە خێرایی ڕۆیشتم کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای کردم، پشتم تێکردن و ئاوا بە خێرایی دەڕۆیشتم، فەرمووی: (**أَللَّهُمَّ أَمْتِعْنَا بِهِ**) خوایە! بەهرەمەندمان بکە لێی، واتە: پێمان بهێڵە، ئنجا گەیشتمە ڕانە مەڕەکەو ئەوانەی پێشێ چوونە نێو قەڵایەکە، بەڵام ئەوانەی لە دواوە مابوون، دوو مەڕم لێگرتن و لەبن قۆڵم گرتن، دوایی زۆر بە ڕاکردن هێنامن، وەک هیچ شتێکم بەدەستەوە نەبێ، هەتا هێنامنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ دامنان، ئنجا سەریان بڕین و گۆشتەکەیان خواردن، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: (**أَبِي الْيُسْر**) لە کۆتا هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە کە کۆچی دوایی کردوە، هەموو جارێ (**أَبِي الْيُسْر**) کە ئەو ڕووداوەی باس دەکردەوە، دەگریاو دوایی دەیگوت: بە دڵنیایی لە من بەهرەمەند بوون، تاکو لە دوایی هەموویان مردم.

دوعایەکەی پێغەمبەری ﷺ ئاوا بۆ قبووڵ بوو.

**١٤-** باسی صەفییە دایکی بڕواداران، صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەخطەب، سەرۆکی جوولەکەکانی (**بنو النَّضير**).

(**إبـن إسـحاق**)، دەڵـێ: دوای ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ قـەڵای (**الْقَمُـوص**)ی گـرت، کـە قـەڵای (**إبـنِ أَبِي الْحُقَيْـقِ**) بـوو، صەفییـەی کچـی حویـەی کـوڕی ئەخطـەب لەگـەڵ ئافرەتێکـی دیکـە، کـە لەگەڵـی دابـوو، هێنایانـن بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ، بـەڵام بـە لای کـوژراوەکانی جوولەکەکانیانـدا بـردن، کاتێـک ئـەو ئافرەتـەی دیکـە، کـە لەگـەڵ صەفییـە بـوو، جەنـازەکانی بینیـن، هـاواری کـردو، لـە دەم و چـاوی خۆیـداو، گڵـی بەسـەر سـەری خۆیـدا کـرد، کاتێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ بینـی، فەرمـووی: (**أَعْزِبُـوا عَنّـي هَـذِهِ الشَّـيْطَانَةَ**)، ئـەو شـەیتانەم لـێ دووربخەنـەوە، فەرمانیشـی کـرد، صەفییەیـان ﷺ، خسـتە پشـتی پێغەمبـەرەوە ﷺ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ پۆشـاکەکەی خـۆی بەسـەردادا، ئیـدی مسـوڵمانان زانییـان، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ خـۆی دیاریـی کـردوە، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ بـە بیلالی فەرمـوو، وەک پێـم گەیشـتوە، کاتێـک

ئـەو ئافرەتـە جوولەکەیـەی بینـی: (**أَنُزِعَـتْ مِنْـكَ الرَّحْمَـةُ يَـا بِـلاَلُ، حِـينَ تَمُـرُّ بِامْرَأَتَـيْنِ عَـلَى قَتْـلَى رِجَالِهِـمَا؟**)، ئـەی بیـلال! ئایـا بەزەییـت لـە دڵ داڕنـرا بـوو، کـە دوو ئافرەتـان بـە لای پیـاوانی کوژراویانـدا دەبـەی؟.

صەفییـەش لـە کاتێکـدا کـە بـووک بـووە، لـە لای (**كنانـة بْـنِ الرَّبِيـعِ بْـنِ أَبِي الْحُقَيْقِ**)، خـەونی بینیـوەو لـە خەونیـدا مانگێـک کەوتۆتـە کۆشـیی، کاتێـک خەونەکـەی بـۆ مێردەکـەی گێڕاوەتـەوە، مێردەکـەی گوتوویـەتی: ئـەم خەونـەت ئـەوە دەگەیەنێـت کـە تـۆ خۆزگـە بـە پادشـای حیجـاز (موحەممـەد) دەخـوازی، بۆیـە زللەیـەک لـە دەم و چـاوی دەدات و، چـاوی بـە هۆیـەوە شـین دەبێتـەوەو، کاتێـک صەفییـە دێ، بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـوێنەواری ئـەو زەبـرەی هـەر پێـوە بـووە، لێـی دەپرسـێ: بۆچـی وات لێهاتـوە؟ ئەویـش هەواڵەکـەی بـۆ دەگێڕێتـەوە.

لەوبـارەوە ئـەم ڕیوایەتـە هاتـوە: (**سَـبَى النَّبِـيُّ ﷺ صَفِيَّـةَ فَأَعْتَقَهَـا وَتَزَوَّجَهَـا**)، (**أخرجـه: البخـاري: ٤٢٠١**)، واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ صەفییـەی بـە دیـل گـرت، (واتـە: لـە جەنگـی خەیبـەردا)، دوایـی ئـازادی کـردو بەهاوسـەری خـۆی گـرتی.

**١٥- (إبن هشام)** لە ژێر ناوونیشانی: (**الصُّلْحُ مَعَ أَهْلِ الخَيْبَر**): (پێکهاتن لەگەڵ خەڵکی خەیبەر)دا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی خەیبەری ئابڵووقەدا، لە دوو قەڵاکەیاندا: [واتە: قەڵاکانی دیکەیان کە گیراون، هەموویان چوونە نێو ئەو دوو قەڵایەی ماون]، (**الوَطِيح وَالسَّلالِم**)، هەتا کاتێک دڵنیا بوون، دەگیرێن و دەفەوتێن، داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە خوێنیان بپارێزێ لە بەرانبەر ماڵ و سامانیان داو، هەموو ماڵ و سامانیان دەستکەوتی پێغەمبەرو مسوڵمانان بێ، پێغەمبەریش ﷺ هەموو ماڵ و سامانەکانیانی دەست بەسەردا گرتبوون، هی قەڵاکانی: (**الشِّقّ**) و (**وَنَطَاةَ** ) و (**الْكَتِيبَةَ**) و تێکڕای قەڵایەکانیان، جگە لە هەردووک، قەڵای: (**الوَطِيح وَالسَّلَالِم**)، ئنجا کاتێک خەڵکی فەدەک، دەبیستن خەڵکی خەیبەر ئەو ڕێککەوتنەیان کردوەو خۆیان بەدەستەوە داوە، ئەوانیش وەڵام دەنێرن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ دەکەن، ئەوانیش هەر بەو شێوەیە، مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، خوێنیان بپارێزێ، بەڵام ماڵ و سامانەکەیان بەجێ بهێڵن بۆ ئەوان، پێغەمبەریش ﷺ

ئەوە دەكات و، ئەو كەسەی لە نێوان پێغەمبەری خواو خەڵكی خەیبەرو فەدەكدا، ئەو پێكهاتنە دەكات: (**مُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، أَخُو بَنِي حَارِثَةَ**) دەبێ.

ڕێككەوتنەكەشیان بەو جۆرە دەبێ، دەڵێن: نیوەی بەرهەمەكەمان بۆ خۆمان و، نیوەشی بۆ ئێوە، چونكە ئێمە زاناترین بە ئێوە لە بەرهەمهێنانی ئەو شتانەی خۆماندا، [ئنجا كشتوكاڵ بووە، هەرچی بووە]و ئێمە باشتر ئاوەدانی دەكەینەوە، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەوە لەگەڵیان ڕێك دەكەوێ، بەڵام بەو مەرجەش كە هەر كاتێك ویستمان دەرتان بكەین، دەرتان دەكەین، لەبەر ئەوەی ئێوە جەنگتان كردوە، هەروەها خەڵكی فەدەكیش، هەر بەو شێوەیە لەگەڵی ڕێك دەكەون، بۆیە خەیبەر دەبێتە دەستكەوت بۆ مسوڵمانان، بەڵام فەدەك دەبێتە شتێكی تایبەت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چونكە فەدەك بە جەنگ نەگیراوە.

**١٦- (إبن هشام)** لە ژێر ناوونیشانی: (**قِصَّة الشَّاةِ المَسْمُومَة**): (بەسەرهاتی مەڕە ژەهراوییكراوەكە)دا، دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نیشتەجێ دەبێ و، سەقامگیر دەبێ، (**زَيْنَبُ بنْتُ الحَارِث**)، كە ژنی (**سَلَّامِ بْنِ مِشْكَمٍ**)، بووە، مەڕێكی برژێنراوی بۆ دەنێرێ، بەڵام پێشتر دەپرسێ، پێغەمبەری خوا ﷺ حەز لە كوێی مەڕ دەكات؟ ئەوانیش دەڵێن حەزی لە دەستەكەیەتی، بۆیە ژەهرێكی زۆر لەوێ دەكات و، ژەهریش لە هەموو گۆشتی مەڕەكە دەكات و، بۆی دێنێ كاتێك لە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنرێ، دەست دەداتە دەستی ئەو مەڕەو پارووێكی لێ دەجوێ و، قووتی نادات، بەڵام: (**بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُور**) لە خزمەتی دا دەبێ و، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ پارووی لێ دادەگرێ، ئەویش لێی دەست دەداتێ، بەڵام بیشر قووتی دەدات، پێغەمبەریش ﷺ پاروووەكە فڕێ دەداتەوەو دەفەرموێ: (**إِنَّ هَذَا العَظْمَ لَيُخْبِرُنِي أَنَّهُ مَسْمُومٌ**)، ئەم ئێسقە (ئەم گۆشتە) هەواڵم پێدەدات، كە ژەهراویی كراوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ بە دوای ئەو ئافرەتەدا دەنێرێ، ئەویش دانی پێدا دێنێ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**مَا حَمَلَكِ عَلَى ذَلِك؟**)، چ شتێك وای لێ كردی ئەوە بكەی؟ ئەویش دەڵێ: بۆیە وامكرد، خۆت دەزانی چیت بە خەڵكەكەی من كردو، لێت ناشاردرێتەوە، گوتم ئەگەر پادشاو حوكمڕان بێ، ئەوە لێی

ئاسوودە دەبم، بەڵام ئەگەر پێغەمبەر بێ، هەواڵی پێ دەدرێ، پێغەمبەری خواش ﷺ چاوپۆشیی لێکرد، بەڵام بیشر بە هۆی ئەو پاروەی خواردی، مرد.

هەڵبەتە لە هەندێ سەرچاوەی دیکەدا هاتوە، گوایە پێغەمبەر ﷺ ئەو ئافرەتەی لە تۆڵەی بیشردا کوشتۆتەوە، بەڵام **(إبن هشام)** وای دێنێ، کە پێغەمبەر ﷺ بەخشیویەتی.

**(إبن إسحاق)** دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەدا کە تێیدا وەفاتی کرد، لە کاتێکدا خوشکی **(بِشْر بْن الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُورٍ)**، سەردانی دەکات، کە لە خزمەتیدا، لەو گۆشتەی خواردوە، کە ژەهراویی کراوەو مردوە، پێی دەفەرموێ: **(يَا أُمَّ بِشْرٍ! إنَّ هَذَا أَوَانَ وَجَدْتُ فِيهِ انْقِطَاعَ أَبْهَرِي مِنَ الْأَكْلَةِ الَّتِي أَكَلْتُ مَعَ أَخِيْكِ بِخَيْبَرِ)**، واتە: ئەی دایکی بیشر! ئەمە ئەو کاتەیە کە هەست دەکەم، ئەو دەمارەم بڕاوە لەو خواردنەی کە لەگەڵ برایەکەتدا لە خەیبەر خواردم، دەڵێ: دوایی مسوڵمانان وایاندەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەهیدیی وەفاتی کردوە، وێڕای ئەوەی خوا ڕێزیشی گرتوە، بە پلەی پێغەمبەرایەتیی، چونکە فەرموویەتی: ئێستا کۆتایی تەمەنەکەمە، لە ئەنجامی ئەو پاروە ژەهراوییەدا کە کاتی خۆی ئەو ئافرەتە جوولەکەیە، ئەو گۆشتی مەڕەی بۆ هێناوە.

**١٧- (إبن إسحاق)** دەڵێ: زوهریی لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە بۆی باسکردووم، کە کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر دەگەڕێتەوە لە ڕێیە، لە کۆتایی شەودا دەفەرموێ: **(مَنْ رَجُلٌ يَحْفَظُ عَلَيْنَا الْفَجْرَ لَعَلَّنَا نَنَامُ؟)** چ پیاوێک هەیە، نوێژی بەیانییمان بۆ بپارێزێ، بەڵکو تۆزێ سەرخەوێ بشکێنین و بخەوین، واتە: بە خەبەرمان بێنێ بۆ نوێژی بەیانی؟ بیلال دەڵێ: من ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئیدی پێغەمبەر ﷺ و سوپایەکەی پشوو دەدەن و دادەبەزن و دەخەون، بیلالیش هەڵدەستێ نوێژ دەکات، ئەوەندی خوا بیەوێ نوێژ دەکات، دوایی پاڵ وە حوشترەکەی دەدات و تەماشای سپێدەی بەیان دەکات و، چاوەڕێ دەکات، کەنگێ بەرەبەیان دادێ؟ بەڵام خەو بەسەریدا زاڵ دەبێ و دەخەوێ و، بەهیچ شتێ خەبەریان نابێتەوە، مەگەر بە گەرمایی خۆر، خۆر هەڵدێ و پێغەمبەری خوا ﷺ

یەکەمین کەس دەبێ و بەر لە هاوەڵان خەبەری دەبێتەوە، دەفەرموێ: (**مَاذَا صَنَعْتَ بِنَا يَا بِلَال؟**) ئەی بیلال! چیت پێکردین؟، ئەویش دەڵێ: (**يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ**)، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوەی بەسەر تۆدا زاڵ بوو، بەسەر منیشدا زاڵ بوو، ئەویش دەفەرموێ: (**صَدَقْتَ**)، ڕاست دەکەی، دوایی پێغەمبەر ﷺ حوشترەکەی لێ دەخوڕێ و زۆر ناڕوات، بەڵام لەوێ لادەچن و بە هاوەڵانیش دەفەرموێ: لێرەدا لابچن و ئەوێ بەجێدێڵن، دوایی حوشترەکەی یەخ دەدات و دەست نوێژ دەگرێ و، خەڵکیش دەست نوێژ دەگرن و، فەرمان بە بیلال دەکات قامەت دەخوێنێ بۆ نوێژو، پێغەمبەر ﷺ نوێژ بە خەڵکەکە دەکات، کاتێک سڵاو دەداتەوە، ڕوو لە خەڵک دەکات و دەفەرموێ: {**إِذَا نَسِيتُمْ الصَّلَاةَ، فَصَلُّوهَا إِذَا ذَكَرْتُمُوهَا، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ:** ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾طه}، واتە: هەر کات نوێژتان لە بیرچوو، (واتە: بە هۆی خەوتنەوە نوێژتان فەوتا)، هەر کاتێک بیرتان کەوتەوە، (هەر کاتێک بێدار بوونەوە) نوێژەکەتان بکەن، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە کاتێکدا کە منت لە یادە نوێژ بکە، یان نوێژ بکە بۆ ئەوەی منت لە یاد بێ.

**١٨- (إبن هشام)** لە ژێر ناوونیشانی: باسی (**شُهُودُ النِّسَاءِ خَيْبَرَ**)، {بەشداریی ئافرەتان لە جەنگی خەیبەر}دا، لە (**إبن إسحاق**)ەوە دەڵێ: ژمارەیەک لە ئافرەتانی مسوڵمانان بەشدارییان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەردا، ئەویش لەو دەستکەوتە کە گیرا بوو، سەرو دیاریی دانێ، بەڵام پشک و بەشی وەک پیاوان بۆ دانەنان.

هەر لەو بارەوە (**إبن إسحاق**) دەڵێ: سولەیمانی کوڕی سوحەیم لە (**أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ**) لە ئافرەتێک لە بەنی غیفار، کە ناوی بۆ هێناوم، بۆی گێڕاومەوە کە گوتوویەتی: من لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئافرەتاندا لە بەنی غیفار، چووینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لە حاڵێک دا کە دەچوو بۆ خەیبەر گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دەمانەوێ ئەو شوێنەی بۆی دەچی، ئێمەش لە خزمەتتدا بێین، ئێمەش دێین برینداران تیمار دەکەین و، یارمەتیی مسوڵمانان دەدەین بەوەی بتوانین، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (**عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ**)، لەسەر بەرەکەت و

پێزی خـوا، وەرن، ئیـدی ئێمـە لەگەڵـی دەرچووین، ئـەو ئافرەتـە گوتوویـەتی: مـن کچێـک بـووم، تـازە دەگەیشـتمێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە پشـت خۆیـەوە لەسـەر ئـەو کـەڵ و پەلانـەی لەسـەر بارەکـەی بـوون، لەسـەر بارەکـەی سـواری کـردم، بـە خـوا کاتێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ نوێـژی بەیـانی دابەزیـی و حوشـترەکەی یەخـدا، منیـش لەسـەر بارەکـەی دابەزیـم، تەماشـام کـرد خوێنـی منـی پێوەیـە، ئـەوە یەکەمیـن جاریـش بـوو بکەومـە بـێ نوێژییـەوە، (واتـە: یەکـەم حەیـزی باڵـغ بـوونی بـووە)، منیـش خـۆم ڕێـک هێنایـەوەو چوومـە لای حوشـترەکەو شـەرمم کـرد، کاتێـک پێغەمبـەر ﷺ منـی بینـی و خوێنەکەشـی بینـی، فەرمـووی: (**مَـا لَـكِ؟ لَعَلَّـكِ نُفِسْـتِ؟ قُلْـتُ: نَعَـمْ قَـالَ: فَأَصْلِحِـي مِـنْ نَفْسِـكِ، ثُـمّ خُـذِي إِنَـاءً مِـنْ مَـاءٍ فَاطْرَحِـي فِيـهِ مِلْحَـاً، ثُـمّ اغْسِـلِي بِـهِ مَـا أَصَـابَ الْحَقِيبَـةَ مِـنَ الـدَّمِ، ثُـمّ عُـودِي لِمَرْكَبِـكِ**)، واتـە: چیتـە! ڕەنگـە کەوتبیـە بـێ نوێژییـەوە؟ گوتـم بەڵـێ، فەرمـووی: دەجـا خـۆت چـاک بکـە، (واتـە: خـۆت ببەسـتە تاکـو خوێنـت لەبـەر نـەڕوات و شـتی دیکـە خوێناویـی بـکات، دوایـی قاپێـک ئـاو بێنـەو هەندێـک خوێـی تێبکـەو ئـەو شـوێنەی خوێنـی بەرکەوتـوە لـە بارەکـە، پێـی بشـۆوە، دوایـی بچـۆوە شـوێنی خـۆت و سـوار ببـەوە[1].

ئـەو ئافرەتـە غیفارییـە دەڵـێ: کاتێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەرکەوتنی لـە خەیبـەر وەدەسـت هێنـا، لـە غەنیمـەت سـەرو دیاریـی پێدایـن، منیـش ئـەو ملوانکەیـەی پێـدام کـە ئەوەتـا لـە گەردنـم دایـە، بـە دەسـتی خـۆی لـە ملـی کـردم، بـە خـوا نابـێ ئـەو ملوانکەیـە، هەرگیـز لێـم جیابێتـەوە، ئیـدی ئـەو ملوانکەیـە هـەر لـە گـەردنی دابـوو تاکـو مـرد، دوایـی وەسـیەتی کـرد لەگەڵیـدا بنێـژرێ، هەروەهـا هیـچ کاتێـک لـە حەیـز پـاک نەدەبـۆوە، مەگـەر ئـەو ئـاوەی خـۆی پـێ دەشـۆرد تـۆزێ خوێـی تێدەکـرد، هەروەهـا وەسیەتیشـی کـرد بـۆ کەسـێ کـە دەیشـوات، دوای مـردنی ئـەو ئـاوەی پێـی دەشـۆن، خوێـی تێبکـەن، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ وا ڕێنمایـی کـردوە، گوتوویـەتی: حەتمـەن حیکمەتێکـی تێدایـە.

---

(١) بەڵام ئەم سەنەدە بێهێز (ضعیف)ە.

**١٩-** (**إبن إسحاق**) ناوی هەموو ئەوانەی هێناوە، کە لە جەنگی خەیبەردا شەهید بوون، کە سەرجەمیان بیست (٢٠) کەسن، لە هاوەڵان و زۆربەیان پشتیوانن تەنیا چواریان لە کۆچکەرانن، واتە: شازدە (١٦)یان لە پشتیوانانن.

**٢٠-** (**إبن هشام**) لە ژێر ناوونیشانی: (**أَمْرُ الْأَسْوَدِ الرَّاعِي فِي حَدِيثِ خَيْبَرَ**)، (بەسەرهاتی شوانە ڕەشەکە لەڕووداوی خەیبەر)دا، بەسەرهاتێک دێنێ جێی سەرنجەو ئێمەش دەیهێنین، دەڵێ: شوانێکی ڕەش هەبوو، (**إبن إسحاق**) دەڵێ: پێم گەیشتوە، کە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە ئابڵووقەی هەندێک لە قەڵایەکانی خەیبەری دابوو، بەڵام مێگەلە مەڕێکی پێ بوو، کابرایەکی جوولەکە بە کرێی گرتبوو، کە مەڕەکانی بۆ بلەوەڕێنێ، کاتێک دێ، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئیسلامم پێ بناسێنە، ئەویش پێی دەفەرموێ: ئیسلام ئاوایەو ئاوایەو، لەوێ مسوڵمان دەبێ، پێغەمبەری خواش ﷺ هیچ کەسی لەوە بە کەمتر نەدەزانی کە بانگی بکات بۆ ئیسلام و ئیسلامی تێبگەیەنێ، کاتێک مسوڵمان دەبێ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من کرێکار بووم بۆ خاوەنی ئەم مەڕەو، ئەم مەڕە سپاردەیە لە لام، ئێستا چی لێ بکەم؟ پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: مەڕەکە دەنگبدە دەچێتەوە بۆ لای خاوەنی، ئیدی ئەو شوانە ڕەشە هەڵدەستێ و چەنگێک چەوو زیخ هەڵدەگرێ و، بە دەم و چاوی مەڕەکەیدا دەدات و، دەڵێ: بگەڕێوە بۆ لای خاوەنەکەت، بە خوا چیدیکە هاوەڵایەتییتان ناکەم، واتە: چیدیکە ناتان لەوەڕێنم، مەڕەکەش هەمووی دەڕوات و وەک کەسێک لێی بخوڕێ دەچێتە نێو قەڵایەکە، دوایی ئەو شوانە ڕەشە، لەگەڵ مسوڵماناندا دەبێ بۆ ئابڵووقەدانی ئەو قەڵایە، بەڵام بەردێکی پێدەکەوێ و دەیکوژێ، کە تاکو ئێستا یەک نوێژیشی نەکردوە، دەیهێنن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە پشت خۆیەوە دایدەنێ، پارچە قوماشێکی پێدا دەدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوەڵانی دەبێ، ئاوڕێکی لێدەداتەوە کە جەنازەکەی دانراوە، دوایی ڕووی لێ وەردەگێڕێ، دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ڕووت لێ وەرگێڕا؟ دەفەرموێ: ئێستا دوو هاوسەرەکەی لە حۆرییەکان لەگەڵییدان.

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: عەبدوڵڵای بەنو ئەبی نوجەیح باسی کردوە کە بابای شەهید، کاتێک دەپێکرێ، دوو هاوسەرەکەی لە حۆرییەکان دێنە خوارو تۆزو خۆڵ

لـە دەم وچـاوی دەتەکێنـن و دەڵێـن: خـوا دەم و چـاوی ئـەو کەسـە خۆڵاویـی بـکات، کـە دەم و چـاوی تـۆی خۆڵاویـی کـردوەو، ئـەو کەسـە بکـوژێ کـە تـۆی کوشـتوە.

**٢١-** ئەمەش بەسەرهاتێکە جێگای سەرنجە: **(إبن هشام)** لە ژێر ناوونیشانی: **(أَمْرُ الْحَجّاجِ بْنِ عِلاطٍ السّلَمِيّ)**دا هێناویەتی، دەڵێ: **(إبن إسحاق)** گوتوویەتی: کاتێک خەیبەر گیرا، **(الْحَجّاجُ بْنُ عِلَاطٍ السّلَمِيّ ثُمّ الْبَهْزِيّ)**، قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من هەندێ ماڵ و سامانم هەیە، لە مەککە، هەروەها لە لای هاوسەرەکەم: **(أُمّ شَيْبَةَ بِنْتِ أَبِي طَلْحَةَ)**، هەروەها لەو ژنەی کوڕێکی بووە بە ناوی: **(مُعْرِضُ بْن الْحَجَّاجِ)**، هەروەها ماڵ و سامانیشم هەیە، لە لای کۆمەڵێک لە بازرگانەکانی خەڵکی مەککە، ئنجا ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ مۆڵەتم بدە، بچم ئەو ماڵ و سامانەم بێنم، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتیدا، دوایی حەججاج گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دەبێ دەرفەتم هەبێ، قسان بکەم، (واتە: قسەی وابکەم کە متمانەم پێ بکەن، ئەوان نەیانزانیوە کە مسوڵمان بووە، دەبێ قسەی وابکات متمانەی پێ بکەن بۆ ئەوەی ماڵ و سامانەکەی بێنێتەوە)، فەرمووی: چی دەڵێی بیڵێ، حەججاج دەڵێ: ڕۆیشتم تاکو چوومە مەککە، لەوێ لە **(ثنيَّة البَيْضَاء)**، (ناوی شوێنێکە)، پیاوانێکم لە قورەیش بینین گوێیان هەڵخستبووە بۆ دەنگ و باس، خەڵک کە دەهاتن لێیان دەپرسین: هەواڵ چییەو، لە کاروباری پێغەمبەری خوایان دەپرسی، پێیان گەیشتبوو کە بەرەو خەیبەر ڕۆیشتوەو، دەشیانزانی کە خەیبەر شاری گەورەی حیجازە، لە ڕووی کشتوکاڵ و بەرهەمەوەو، لە ڕووی مەحکەمییەوەو لە ڕووی پیاوانەوە، منیان بینی گوتیان: **(الحجاج بن العلاط)**، لە بەڵام نەیانزانیبوو کە من مسوڵمان بووم، بە خوا ئەو هەواڵی چاکی لە لایە، گوتیان: ئەی ئەبوو موحەممەد! هەواڵمان پێ بدە، بیستوومانە کە پچڕێنەر **(قاطع)**، {ئەوان بە پێغەمبەریان گوتوە: **(قاطع)** واتە: کەسێک کە خزمایەتیی دەپچڕێنێ}، بەرەو خەیبەر چووە، کە خەیبەریش وڵاتی سەرەکیی جوولەکەیەو شوێنی بەرهەمداری حیجاز **(ريف الحجاز)**ە، منیش گوتم: بەڵێ، ئەوەم پێگەیشتوەو لەو بارەشەوە هەواڵی وام پێیە دڵخۆشتان بکات، ئەوانیش یەکسەر بە تەنیشت حوشترەکەمەوە نووسان و گوتیان: دەی حەججاج پێمان بڵێ، گوتم: موحەممەد زۆر خراپ تێکشکاوە کە هەرگیز تێکشکانی

واتان نەبیستوەو، هاوەڵەکانی کوژراون و موحەممەد بەدیل گیراوەو گوتوویانە: نایکوژین، هەتا دەینێرین بۆ لای خەڵکی مەککە، با لەوێ لە نێو خۆیاندا بیکوژن، لە خوێنی ئەو پیاوانەدا کە پێشتر لە جەنگەکاندا لێی کوشتوون، حەججاج دەڵێ: کەوام گوت هەڵسان هاواریان کردو دەنگیان بەرزکردەوە لە مەککە، گوتیان: هەواڵتان بۆ هات ئەوە موحەممەد بوو، کە چاوەڕێ بوون بێ بۆ لاتان، ئەوە ئێستا دەیهێنن بۆ نێوتان و لە نێوتاندا دەکوژرێ، دەڵێ: منیش پێم گوتن: هاوکاریم بکەن ماڵ و سامانەکەم لە مەککە کۆ بکەمەوەو، ئەوانەی قەرزداری منن قەرزەکانیان لێ وەربگرمەوە، چونکە من دەمەوێ بچم بۆ خەیبەرو لەوێ لەو تێشکانەی موحەممەدو هاوەڵانی، پێش ئەوەی بازرگانەکان بچن بۆ ئەوێ، من بچم و ماڵ و سامانم پێ بێ و، لەو کەل و پەلە بە غەنیمەت گیراوانە بکڕم! ئیدی هەڵسان زۆر بە خێرایی ماڵ و سامانەکەیان هەموو بۆ کۆکردمەوە، ئنجا چوومە لای هاوەڵەکەم (واتە: لای خێزانم)، گوتم: بێنە ماڵ و سامانەکەمم وێبدە بۆ ئەوەی بگەمە خەیبەر، (دیارە بە خێزانیشی نەگوتوە مسوڵمان بووە)، بەڵکو لەو هەلی بازرگانیی و مامەڵەیە پێش ئەوەی بازرگانەکان بچن، ئیستیفادە بکەم.

کاتێ عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەڵیب هەواڵەکەی بیست (مامی پێغەمبەر ﷺ) هاتە لام، هات هەتا لە تەنیشتم ڕاوەستاو من لە چادرێکدابووم لە چادری بازرگانەکان، گوتی: حەججاج ئەو هەواڵە چیە هێناوتە؟ (عەبباس بە پەنهانیی مسوڵمان بووەو، بە تەئکید هەر پەرۆشی برازایەکەی خۆشی بووە)، گوتم: ئەگەر شتێکت پێ بڵێم هەواڵێکت و لە لادابنێم دەیپارێزی؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: جارێ لێم دووربکەوەوە تاکو لە شوێنێکی چۆڵ دەتبینم، چونکە من وا خەریکم ماڵ و سامان کۆ دەکەمەوە، کاتێک لە هەموو کارەکانم بوومەوە کە لە مەککە هەمبوون، خۆم ئامادە کرد کە بڕۆم لە مەککە بچمەدەر، گەیشتمە عەبباس گوتم: ئەی (أبو الفضل)! ئەوەی پێت دەڵێم بیپارێزە، چونکە من دەترسێم بە دوام بکەون، دوای سێ ڕۆژان هەرچی دەیڵێی بیڵێ، گوتی: وادەکەم، گوتم: بە خوا من برازایەکەتم بەجێهێشت، کاتێک کە من هاتم کچی حوکمڕانەکەی ئەوانی هێنابوو، (واتە: بە هاوسەری گرتبوو صەفییەی کچی حوییەی کوڕی

ئەختەب)، خەیبەریش گیراوەو هەرچی تێیدا بووە بۆتە دەستکەوتی پێغەمبەرو هاوەڵانی! گوتی: حەججاج چی دەڵێی؟

گوتم: بە خوا ئەوەی دەیڵێم وایە، بەڵام تۆ جارێ پەنهانی بکەو منیش مسوڵمان بووم و، تەنیا هاتووم ماڵ و سامانەکەم کۆ بکەمەوە، لە ترسی ئەوەی ئەگەر بزانن مسوڵمان بووم، ماڵ سامانەکەم لێ دەست بەسەردابگرن، بەڵام ئەگەر سێ ڕۆژ ڕۆیشتن، تۆ ئەوەی لە لاتە، هەواڵەکە ئاشکرا بکە، بە خوا حاڵەکە بەو شێوەیە کە تۆ پێت خۆشە.

ئنجا لە ڕۆژی سێیەمدا عەبباس ﵁، پۆشاکێکی جوان لەبەر دەکات و، بۆنی خۆش لە خۆی دەدات و گۆچانەکەی بە دەستەوە دەگرێ و، دوایی دەچێ بۆ لای کەعبە، تەوافی کەعبە دەکات و کاتێک دەیبینن، قوڕەیشیەکان پێی دەڵێن: (**أبو الفضل**)! بە ڕاستیی ئەمەیە خۆڕاگریی بۆ بەڵاو موصیبەت، (واتە: لەگەڵ ئەوەشدا برازاشت گیراوە، بەڵام ئاواش خۆت بۆن خۆشکردووەو خۆت ڕازاندۆتەوە)، ئەویش دەڵێ: نەخێر، سوێند بەو خوایەی کە سوێندی پێ دەخۆن، موحەممەد خەیبەری گرتووەو، کچی پادشایەکەشیانی بە هاوسەر گرتووەو، ماڵ و سامانەکەشیانی هەمووی گرتووەو هەرچی تێیدابووە، بۆتە موڵکی خۆی و هاوەڵانی!

گوتیان: کێ ئەو هەواڵەی بۆ هێناوی؟ گوتم: هەر ئەو کەسەی کە ئەو هەواڵەی بۆ هێنابوون، کە گوایە موحەممەد ﷺ بەدیل گیراوەو هاوەڵانی کوژراون، بە خوا کە هاتووە بۆ لاتان مسوڵمان بووەو، ماڵ و سامانەکەی کۆ کردۆتەوەو ڕۆیشتوە، تاکو بە موحەممەدو هاوەڵانی بگات و لە خزمەتیاندا بێ.

گوتیان: ئەی بەندەکانی خوا! دوژمنی خوا لە دەستمان دەرباز بووە، بە خوا ئەگەر زانیبامان، ئاواو ئاوامان دەکرد، ئیدی زۆر پێ ناچێ لە ڕێی دیکەشەوە هەواڵەکەیان پێدەگات.

## تــەوەری دووەم: حیکمەت و بەرهەمەکانی صوڵحــی حودەیبییە و جەنگی خەیبەر.

### بڕگەی یەکەم: حیکمەت و بەرهەمەکانی صوڵحی حودەیبییە:

بێگومـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە هەمیشـە بـە پێـی ڕێنمایی خـوا هەنـگاوی ناوە، چ ڕێنمایـی ڕاسـتەوخۆ کـە خـوا لـە ڕێـی جیبریلـەوە، قوڕئـانی بـۆ دابەزانـدوە، یاخـود: جگـە لـە قوڕئانیـش ئـەو وەحیـی و خورپەیـەی خـوای پـەروەردگار خسـتوویەتە دڵـی پێغەمبـەرەوەو، دڵنیـا بـووە کـە ئـەوە لـە لایـەن خـواوە ئاڕاسـتە کـراوە، چ بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ، کـە پێغەمبـەر ﷺ لەبـەر ڕۆشـنایی وەحییـدا، عەقڵـی خـۆی بەکارهێنـاوەو ڕاوێـژی کـردوە بـە هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بۆیـە کارەکانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ هەموویــان ئەوپــەڕی دووربینیــی و حیکمــەت و لێزانییــان تێدایـە، بێگومـان هـەر کەسـێکیش بـە پێـی وەحیـی خـوا ﷻ هەنگاوبنـێ و، لـە چوارچێـوەی شـەریعەتی خـوای پـەروەردگاردا ئیجتیهـاد و کۆشـش بـکات و ڕاوێـژ لـە کارەکانیـدا بـکات، کـەم و زۆر کارەکانی ئامانـج دەپێکـن و حیکمەتیـان تێدادەبـێ، بەرهەمـی دنیایـی و، بەرەکـەتی دواڕۆژییـان دەبـێ.

ئنجـا ئێمـە دە حیکمەتمـان هێنـاون لـە حیکمـەت و بەرهەمـەکانی صوڵحـی حودەیبییـە، بـەڵام پێشـەکیی بـەم دەقـە دەسـت پـێ دەکەیـن:

{رَوَى الزُّهْـرِيّ وَغَـيْرُه عَـنْ عُـرْوَةَ بْـنِ الزُّبَـيْرِ ﷺ، قَـالَ: أَقْبَـلَ النَّبـِيُّ ﷺ رَاجِعـاً، فَقَـالَ: رَجُـلٌ مِـنْ أَصْحَابـِهِ: مَـا هَـذَا الْفَتْـحُ؟ لَقَـدْ صُدِدْنَـا عَـنِ الْبَيْـتِ، وَصُـدَّ هَدْيُنَـا، وَرَدَّ رَسُـولُ اللـه ﷺ رَجلَـيْنِ مِـنَ الْمُؤْمِنـيْنِ كَانـا خَرَجَـاً إلَيْـهِ!

فَبَلَـغَ رَسُـولَ اللـهِ ﷺ قَـوْلُ ذَلِـكَ الرَّجُـل، فَقَـالَ: بِئْـسَ الـكَلَامُ بَـلْ هُـوَ أَعْظَـمُ الفَتْـح، لقـد رضي المشركـون أن يدفعوكـم بالـراح عـن بلادهـم، ويسـألوكم القضيـة، ويرغبـوا إليكـم

**في الأمـان، وقـد رأوا منكـم مـا كرهـوا، وقـد أظفركـم اللـه عـز وجـل عليهـم، وردُّوكـم سـالمين غانمـين مأجوريـن، فهـذا أعظـم الفتـوح...}**(١).

واتـە: زوهریـی و جگـە لـە ئەویش لـە عـوڕوەی کـوڕی زوبەیـرەوە ﵄، گێڕاویانەتەوە گوتوویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ گەڕایـەوە مەدینـە، پیاوێک لـە هاوەڵانی گوتی: ئەمە سـەرکەوتن نەبـوو، لـە کەعبـە گێڕدرایـنـەوەو، قوربانییەکەمـان گێڕدرایـەوەو، پێغەمبـەری خـواش ﷺ دوو پیـاو لـە بـڕواداران کـە بـۆ لای هاتبـوون گێڕانیـەوە بـۆ لای کافـرەکان، {کە مەبەسـت پێـی ئەبـوو بەصیـرو ئەبـوو جەندەڵـن)، ئەمـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەیشـت، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ئـەوە خراپتریـن قسـەیە کـە کـردت، بەڵکـو ئەمـە مەزنتریـن سـەرکەوتن بـوو، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـەش شـتی ژمـاردن، فەرمـووی:

١- هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ڕازیی بوون بەوەی بە قسەیەکی نەرم، بە لەپە دەست، ئێوە لە وڵاتی خۆیان دووربخەنەوە، نەک بە شەڕ.

٢- ڕازیی بوون و لە گەڵتاندا، پێکهاتن بکەن.

٣- ئارەزوومەند بوون کە لەگەڵ ئێوەدا هێمن و ئاسایشیان هەبێ و تەبابن.

٤- شتێکیان لە ئێوە دی کە حەزیان پێ نەدەکردو زۆر پێیان ناخۆش بوو.

٥- خوا ئێوەی بەسەر ئەواندا سەرخست و دەرفەتتان لێ بینین، [بەڵام ئەوە بوو دوایی پێغەمبەر ﷺ عەفووی کردن، کە کۆمەڵێکی لێگرتن، هەشتا (٨٠) کەسێک، لە ڕیوایەتێک دا: سیی (٣٠) کەس، دەیتوانی لەملیان بدات، بەڵام ئازادی کردن].

٦- خوا ﷻ ئێوەی بە سەلامەتیی گێڕایەوە بۆ شاری خۆتان و بە پاداشتیشەوە.

کەواتـە: ئەمـە گەورەتریـن سـەرکەوتن بـوو، ئایـا ڕۆژی ئوحوودتـان لـە بیـر چـووە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ ﴿١٥٣﴾﴾ **آل عمران،**

---

(١) (البيهقـي في دلائـل النبـوة)، ج٤، ص(١٦٠ – ١٦١)، و(الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب)، ج٣، ص(٢٢٧ – ٢٢٨: وقلنـا: هـذا مرسـل صحيح الإسـناد).

(بە چیایەکە هەڵدەگەڕان و ئاوڕتان لە کەس نەدەدایەوە)، منیش لە پشتتانەوە بانگم دەکردن؟

ئایا ڕۆژی ئەحزابتان لە بیرچۆوە، کە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ ﴾الأحزاب، کاتێک کە دوژمنەکان لەسەرێوە بۆتان هاتن و لە خوارەوەش بۆتان هاتن و، چاوەکان ئەبڵەق بوون و دڵەکان گەیشتنە گەروو و گومانی جۆراو جۆرتان بە خوا ﷻ دەبردن؟ مسوڵمانان گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان کرد، بەڕاستیی ئەوە گەورەترین سەرکەوتن بوو، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بە خوا ئەوەی تۆ بیرت لێ کردۆتەوە، ئێمە بیرمان لەوە نەکرد بۆوە، بە دڵنیایی تۆ بە خواو بە کاری خوا، لە ئێمە زاناتری.

هەڵبەتە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، بە ڕاستیی زۆربەی هەرە زۆری دەستکەوتە گرنگەکان و حیکمەت و سوودەکانی صوڵحی حودەیبییەی گرتوونە خۆی، بەڵام ئێمەش لە دە (١٠) خاڵدا هێناومانن:

١- ڕووی ڕاستەقینەی دیندارانەی مسوڵمانان بۆ خەڵکی مەککەو جگە لە ئەوانیش درەوشایەوەو، پڕو پاگەندەکانی ناحەزان باویان نەما، کە دەیانگوت: موحەممەد ﷺو هاوەڵانی شەڕ فرۆشن و گێچەڵ دەنێنەوەو دەستدرێژیی دەکەن، دەرکەوت کە نەخێر ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشتییانەو سەلامەتیی هاتوە، کە سەردانی ماڵی خوا بکات.

پاشان کافرەکان وایان پێغەمبەرو هاوەڵان وێنا کرد بوو، کە دینی ئیبراهیمیان پێشێل کردوە، بەڵام ئێستا ئەوە ئەوان هاتوون، کەعبە بە مەزن بگرن و، دینداریی خۆیان بکەن و، قوربانییان لەگەڵ خۆیاندا هێناون، کە ئەوە زیاتر ڕووی ڕاستەقینەی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ خەڵکی دنیاو بە تایبەت بۆ خەڵکی نیوە دوورگەی عەرەبیی درەوشاندەوە، کە ئەوانە دینداری ڕاستەقینەن.

**٢-** هۆزی قورەیش، {واتە: هۆزی قورەیشی کافر}، یەکەم جار بە ڕەسمیی مسوڵمانانی وەک قەوارەیەکی سیاسیی ناسی و، مامەڵەی لەگەڵدا کردن، ئەمەش بۆ نێو کۆی عەڕەبستان و دوورتریش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، کەواتە: لە مەودوا ئەو قەوارە سیاسییەی مسوڵمانان لە مەدینە قەوارەییەکی ڕەسمییە، ئەوەتا گەورەترین هێز لە نیوە دوورگەی عەڕەبییدا، کە هێزی قورەیشە، مامەڵەی و فەرمیی لەگەڵدا دەکات و ڕێککەوتنی لەگەڵدا دەبەستێ.

**٣-** دەروازە کرانەوە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، کە بە ئازادیی بێن و بچن و بانگەواز بکەن، چ لەگەڵ قورەیش و، چ لەگەڵ جگە لە قورەیشدا، چونکە وەک پێشتریش باسمان کردوە، مسوڵمانان لە کاتێکدا دەچن بۆ عومرە، بەڵام ئەو صوڵحی حودەیبییەی لێ دەکەوێتەوە، ژمارەیان (١٣٠٠) یان (١٤٠٠) یان ئەوپەڕی (١٥٠٠) کەس بووە، چەند ڕیوایەتێک لەو بارەوە هاتوون، بەڵام دوو ساڵ دوای ئەوەی قورەیشییەکان پەیمان دەشکێنن و، پێغەمبەر ﷺ دەچێ بۆ مەککەو، مەککە ئازاد دەکات و سەرکەوتنی گەورە بەدەست دێنێ، هاوەڵانی دەبن بە (١٠،٠٠٠) کەس، ئنجا: (١٤٠٠) کەس لە کوێ یان: (١٥٠٠)، لە کوێ و، دە هەزار (١٠،٠٠٠) کەس لە کوێ؟، مانای وایە ئیسلام لە حاڵەتی ئاشتیی و تەباییدا، زیاتر گەشە دەکات و، خەڵک زیاتر چاو پێچکی سەرچاویان لادەچێ.

**٤-** صوڵحی حودەیبییە زەمینەی خۆشکرد بۆ جەنگی خەیبەرو لابردنی ئەو شێر پەنجەیەو، دەستەبەر کردنی توانایەکی مادديی باشیش بۆ مسوڵمانان، کە وەک باسمان کرد، خەیبەر شوێنێک بووە، زۆرترین سەروەت و سامانی نیوە دوورگەی عەڕەبیی لەوێ دا کۆبۆتەوە، سەروەت و سامانی ئاژەڵیی و، کشتوکاڵیی و، توانایەکی مادديی زۆری لێ بووەو، هەمووشی بۆتە دەستکەوتی مسوڵمانان.

**٥-** ئەو صوڵحە هێزێکی مەعنەویی باشی بە مسوڵمانان بەخشی، بە پێچەوانەوەش کافرەکانی بێهێز پێشاندا، بۆیەش هەر کام لە (**خالد بن الولید**)و (**عمرو بن العاص**) دوای (**عمرة القضاء**)، ساڵی حەوتەم پێش ئازاد کردنی مەککەدا دێن و مسوڵمان دەبن، کە

دوو کەسایەتیی ناوداری قوڕەیش بوون، بەڵکو دوو سەرکردەی سەربازیی و سیاسیی گەورەی قوڕەیش بوون.

٦- پێغەمبەر ﷺ لە دوای صوڵحی حودەیبییەوە، دەست دەکات، بە ناردنی نامە بۆ حوکمڕانانی ئەو سەردەمە، بۆ هیرەقل حوکمڕانی ڕۆم و، بۆ کیسرا حوکمڕانی فارس، هەروەها بۆ نەجاشیی حوکمڕانی حەبەشە، هەروەها بۆ موقەوقەس حوکمڕانی میسرو ئەوانی دیکەش، نامەیان بۆ دەنێرێ و پەیامی خوای پەروەردگاریان پێ دەگەیەنێ کە وەرنە نێو ئیسلامەوەو، ئیسلام دینی برایەتیی و تەبایی و ئاشتیی و، بەختەوەریی دنیاو دواڕۆژە.

٧- وەک پێشتریش گوتمان لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا، جەنگاوەرانی مسوڵمانان لە (١٤٠٠)ەوە بوو بە: (١٠،٠٠٠) جەنگاوەر، چونکە کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ئازادکردنی مەککە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە قوڕەیشییەکان پەیماننامەکەیان هەڵوەشاند بۆوە، لەبەر ئەوەی **(بنو بكر)** کە هاوپەیمانی ئەوان بوون، هێرشیان کرد بووە سەر **(خُزاعة)** کە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ بوون، لە ئەنجامی ئەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر هاوپەیمانەکانی خۆی وەدەنگ هات، لەبەر ئەوەی **(بنو بكر)**، بیست (٢٠) کەسیان لە خوزاعە کوشتبوون، **(عمرو بن سالم)** سەرۆکی هۆزی خوزاعە هات، گوتی: ئەی موحەممەد! کوا هاوپەیمانەتییەکەت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەوەندەی فەرموو: **(نُصِرْتَ يَا عَمْرو بْن سَالِم)** ئەی عەمرى کوڕی سالیم! سەرخرای، یانی: ئێمە لەسەرت وە دەنگ دێین، هەرچەندە هەندێک مسوڵمانیان تێدا هەبوون، بەڵام ئەو کاتە زۆربەیان هەر بە هاوبەش بۆ خوا دانەر، حیساب کراون، بەڵام مادام هاوپەیمانن، دەبێ شەڕیان لەسەر بکرێ و خوێنیان لەسەر بڕێژرێ.

٨- ئەو صوڵحە، زەمینەی بۆ ئازادکردنی مەککە خۆشکرد، هەروەها بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆی نیوە دوورگەی عەرەبیی، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا، بە هۆی شکاندنی قوڕەیشەوە بۆ پەیمانەکە، لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا، پێغەمبەر ﷺ بە خۆی و بە (١٠،٠٠٠) کەسەوە چوو، بەبێ شەڕێکی ئەوتۆ و بەبێ خوێنڕێژییەکی وا، مەککەی ئازاد کرد.

٩- ئەگەر سەرنجێکی پەیماننامەکەش بدەین، ئەویش کۆمەڵێک دەرس و پەندی تێدان:

**یەکەم:** سوهەیلی کوڕی عەمرِ نوێنەری قوڕەیش بوو بۆ تاوتوێکردنی ئەو صوڵحە، کاتێک کە ئامادە نەبوو (**الرَّحْمن الرَّحِيْم**) بنووسێ و، ئامادە نەبوو (**رَسُول الله**) بنووسێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچەندە هاوەڵانی زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو، کەچی فەرمووی: باشە بنووسە: (**بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ**)، هەروەها بە نسبەت خۆیەوە کە پێشێ فەرمووی: بنووسە: موحەممەد (**رَسُولُ الله**) صوڵح دەکات لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمرِ نوێنەری قوڕەیش، گوتی: ئەگەر زانیبام پێغەمبەری خوای، شەڕم لەگەڵدا نە دەکردی!.

هەڵبەتە هەڵوێستەکەی سوهەیلی کوڕی عەمرِ بۆ خۆیان شتێکی مەنتیقیی بووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوە کێشەی نەکرد، ئەمەش ئەو دەرسەی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمانان دەبێ لەسەر شتی جوزئیی مشتومڕ نەکەن، بە تایبەت کە تەرەفی بەرانبەر بەڵگەی بە دەستەوە هەبێ، بەپێی عەقڵ و لۆژیکی خۆی، گرنگ ئەوەیە ئامانجی گەورەتر بهێنرێتە دی و، لەسەر شتی بچووک، نابێ هێنانە دی، ئامانجی گەورە پەکی بخرێ و بئاڵقێنرێ، واتە: لەبەر ئەوەی دەمانەوێ واجبێک بێنینە دی، نابێ جێبەجێکردنی سوننەتێک، ئەو واجبە، یان جێبەجێکردنی ئەو واجبەمان لە کیس بدات، ئەگەرنا قازانجمان سەری مایەمان دەخوات.

**دووەم:** بەندێکی دیکەی ئەوە بووە کە ئەمساڵ مسوڵمانان عومرەکەیان نەکەن و نەچنە نێو شاری مەککەوە، پێغەمبەر ﷺ بەوەش ڕازی بوو، چونکە گرنگ ئەوەیە ئەو عومرەیە بە ئاشتییانەو بە تەبایی بکرێ، چونکە ئەوان بۆ خواپەرستیی دەچن ئەنجامی بدەن، ئنجا خوا پەرستیی لەگەڵ شەڕو کوشتاردا تێک ناکاتەوە، بۆیەش خوا ﷻ مسوڵمانەکانی لە دەست کافرەکان پاراست و، کافرەکانیشی لە دەستی مسوڵمانان پاراست، بۆ ئەوەی خوێنڕێژیی نەبێ و تەبایی هەبێ، تاکو ئەو صوڵحە سەربگرێ، چونکە مسوڵمانان کاتێک دەست بۆ چەک دەبەن و، پەنا بۆ هێز دەبەن، بەناچارییە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ئیسلام

عەوداڵ و شەیدای ئاشتیی و تەباییەو، لە ئاشتیی و تەباییدا زیاتر گەشە دەکات، وەک دەرکەوت کە لە ماوەی دوو ساڵدا، ژمارەی جەنگاوەرانی مسوڵمانان لە (١٤٠٠)ەوە دەبێتە (١٠،٠٠٠) کەس، کەواتە: با ئەمساڵ عومرە نەکەن، مادام عومرەکردنەکە سەر دەکێشێ بۆ خوێنڕێژیی و، با ساڵی داهاتوو بێ کە بە تەبایی دەکرێ و، ڕووی ئاشتیی خوازانەی ئیسلامەتیی زیاتر پێشان دەدرێ، کە ئەوە بوو دوایی لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا کە پێی گوترا: **(عُمْرَةُ القَضَاء)** هەر ئەو (١٤٠٠) کەسە چوون، سێ شەوو سێ ڕۆژ لە مەککە مانەوەو عومرەیان کرد، بەڵام جەنگاوەرانی قورەیش و سوپای قورەیش چوو بوونە دەرەوەی شارو قەراغی شار بۆ ئەوەی نەیانبینن، هەڵبەتە ژمارەیەکیان پێغەمبەرو هاوەڵان دەبینن، ئەوەش زۆر جێی سەرنجە، کە ئەو کاتە پابەندیی بە بەڵێن و پەیمان شتێکی گرنگ بووە، لە نێو خەڵکداو لەو کۆمەڵگایەدا، چ لە لایەن مسوڵمانانەوەو، چ لە لایەن نامسوڵمانانەوە.

**سێیەم:** بەندێکی دیکەی ڕێککەوتنەکە ئەوە بوو، کە هەر کەسێک مسوڵمان بوو، بینێرنەوە بۆ لای کافرەکان، بەڵام هەر کەسێک لە مسوڵمانان هەڵگەڕایەوە، نەینێرنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، کە ئەویش حیکمەتەکەی زۆر دیارە، بێگومان هەر کەسێک لە مسوڵمانان هەڵگەڕایەوە، پێویستییان نیە، بێتەوە، کەسێک هەڵگەڕێتەوە لە ئیسلام، مسوڵمانان بۆچییانە! با هەر بۆ کافران بێ، بەڵام ئەوە کە هەر کەسێک مسوڵمان بوو، بینێرنەوە بۆ لایان، ئەوە مەرجی کافرەکان بووە، پێغەمبەریش ﷺ ئەو مەرجەی لەبەر ئەوە قبووڵ کرد، کە حیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدا بوو، چونکە دوایی ئەبوو بەصیرو ئەبوو جەندەڵ بە قیادەی ئەو دووانە، (٦٠ - ٧٠) کەسیان لێ ئاڵان و، لە شوێنێک کە کاروانی قورەیشییەکانی پێدا ڕەت دەبوو، لەوێ بنکەیان داناو زیانێکی زۆری ئابووریان بە قورەییشیەکان گەیاندو خەڵکیان لێ کوشتن، دوایی کافرەکان هەر خۆیان داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو تکایان لێ کرد، ئەوانە وە خۆی بگرێ و لە کۆڵیان بکاتەوە، واتە: هەر بۆ خۆیان دەستبەرداری ئەو مەرجە بوون و، دووربینیی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەشدا زۆر ئاشکراو دیار بوو.

**چوارەم:** بەندێکی دیکە ئەوە بوو، کە هەتا دە (١٠) ساڵان، صوڵح و ئاشتیی بێ، هەڵبەتە هەندێک لە زانایان کە بە داخەوە زیاتر تەماشای ڕواڵەتی دەق دەکەن، نەک تەماشای ڕووح و نێوەڕۆکی دەقەکان و، حیکمەت و ئامانج لێیان، کە بە تەئکید لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا تەماشای بەرژەوەندییەکان و حیکمەتەکان دەکرێ، نەک تەماشای ڕواڵەتی دەقەکان، هەندێکیان ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەوە کە هیچ ڕێککەوتن و صوڵحێک لە نێوان مسوڵمانان و نا مسوڵماناندا، نابێ لە دە (١٠) ساڵان زیاتر بێ!

بەڵام ئەو قسەیە هیچ نیە، وەک زانایانی لێکۆڵەرەوەو ساغکەرەوە، گوتوویانەو، ڕەنگە ئەوە مەرجی لایەنی بەرانبەر بوو بێ، کە هەتا دە ساڵی دیکە، شەڕ و کوشتار نەبێ، لە بەینیاندا، ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قبووڵ کردوە، وەک چۆن هەندێک شتی دیکەشی قبووڵ کردوەو پێشی خۆش نەبووە، بەڵام ئایا ئەوە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە دەوڵەتی ئیسلامیی هیچ پێکهاتنێک نەکات و هیچ ڕێککەوتننامەیەک ئیمزا نەکات لەگەڵ تەرەفێکی دیکەی بەرانبەردا، لە دە ساڵان زیاتر؟!، بێگومان نەخێر گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندیی چۆن دێتە دی؟ ئنجا ئەگەر بە دە ساڵان دێتە دی، وا باشە دە ساڵ بێ، یان بیست بێ و سەد بێ، هەرچەندێکی بێ، لە ڕاستییدا ئیسلام عەوداڵ و شەیدای ئاشتیی و تەباییە لەگەڵ لایەنەکاندا.

**پێنجەم:** بەندێکی دیکەش ئەوە بوو کە هەر کەسێ دەبێتە هاوپەیمانی قورەیش یان هی موحەممەد ﷺ ئازادە، کە ئەوە بوو هۆزی خوزاعە بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ و هۆزی بەنوو بەکریش بوونە هاوپەیمانی قورەیش و بەنوو بەکرو خوزاعەش پێکەوە کێشەیان هەبوو لە سەردەمی نەفامییشدا، دواییش بەهۆی ئەو هاوپەیمانییە تازەیەوە پێغەمبەر ﷺ زەمینەی ئازاد کردنی مەککەی بۆ دەڕەخسێ، لەبەر ئەوەی بەنوو بەکر لە شەبەیخوونێک دا هێرش دەکەنە سەر خوزاعە لە ڕیوایەتێکدا، دەڵێ: بیست نەفەرو، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: دە نەفەریان لێ دەکوژن، لە کاتێکدا خەریکی پەرستش بوون لە دەوری کەعبە، ئنجا سەرۆکەکەیان عەمری کوڕی سالیم دەچێ سکاڵا دەکات لە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش هەر

ئەوەندە دەفەرموێ: سەرخرای، کە سەرەنجام بێ ئەوەی قورەیش پێ بزانێ، سوپایەکی (١٠،٠٠٠) کەسیی ڕێک دەخات و مەککە بەهۆی ئەوەوە ئازاد دەکرێ.

**١٠-** بناغەی صوڵحی حودەیبییە بریتیە لە دووربینیی پێغەمبەر ﷺ و، بەرهەمەکەیشی زیاتر بڕوا پتەو بوونی بڕواداران و، ناونانی صوڵحەکەش بە: ﴿فَتْحًا مُّبِينًا﴾، سەرکەوتنی ڕوون و ئاشکرا، دەرکەوت کە ئەو ناوە زۆر پڕ بە پێستەو پێغەمبەر ﷺ هەر لە سەرەتاوە کە دەگەڕانەوەو هاوەڵان لێیان پرسی: ئایا ئەوە سەرکەوتنە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوە سەرکەوتنێکی ڕوونە[1].

## بڕگەی دووەم: حیکمەت و دەرسەکانی جەنگی خەیبەر.

بۆ ئەویش دە حیکمەت و دەرسمان هێناون:

**١-** ڕەنگە یەکێ بپرسێ: هۆکاری صوڵحی حودەیبییە دیارە، بەڵام جەنگی خەیبەر بۆچی ڕوویدا، بۆچی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی لە مانگی موحەڕڕەم واتە: لە مانگی یەکەمی ساڵی حەوتەمی کۆچییدا، واتە: دوو سێ مانگ دوای صوڵحی حودەیبییە، یەکسەر هەڵیکوتایە سەر جوولەکەکانی خەیبەر؟! لە وەڵامدا دەڵێین:

هۆکاری جەنگی خەیبەر ئەوە بوو کە کرا بوو بە مۆڵگە بۆ دوژمنانی ئیسلام، بەمجۆرە: (**بنو النَّضير**) کە کاتی خۆی چونکە پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەری کردوون چوونە خەیبەر، ئنجا (**بنو النَّضير**)و جوولەکەکانی خەیبەر، هەروەها (**بنو قريظة**)یش کە لە جەنگی ئەحزاب دا، خەنجەری ژەهراوییان لە پشتی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵماناندا، ئەوانە هەر خەریکی کەین و بەین و، پلانگێڕیی و خراپەکاریی بوون، لەگەڵ هۆزی قورەیش و لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە دوژمن و ناحەزی مسوڵمانان بوون، هەروەها هەردووک هۆزی (**غطفان وبنو أسد**)، بەڵێ

---

(١) (البيهقي) لە (دلائل النبوة)دا، هەروەها لە (الإستيعاب في بيان الأسباب) هێناویانە، دەفەرمووێ: (أَعْظَمُ الفُتُوح) مەزنترینی دەستکەوتەکان و سەرکەوتنەکانە.

پێغەمبەر ﷺ بۆیە پەلاماری خەیبەریدا، چونکە مۆڵگەیەک بوو بۆ کۆبوونەوەی دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام و، لەوێوە نەخشە دادەنرا لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان، ئەوە هۆکاری بنەڕەتیی جەنگی خەیبەر بوو.

**٢-** پێغەمبەر ﷺ هێزێکی داناو خستیە نێوان خەیبەرو هۆزی غەطەفانەوە لە شیوی **(الرجیع)** تاکو غەطەفان نەتوانن هاوکاریی خەیبەرییەکان بکەن، پێغەمبەر ﷺ بەشێکی هێزەکەی - ئەوانەی لە صوڵحی حودەیبییەدا بەشدار بوون کە (١٤٠٠) کەس بوون، چونکە خوای پەروەردگار ڕێگای نەدا، ئەو عەڕەبە بیابانشین و خێڵەکییانەی دوا کەوتبوون، ئەمجارە خۆ وەگەڵبدەن بە تەماعی پشک و بەش هەبوون لە دەستکەوتەکانی جوولەکەکانی خەیبەردا، کەواتە: بەس (١٤٠٠) کەسەکە بوون، کە بۆ جەنگی خەیبەر چوون- ئنجا پێغەمبەر ﷺ بەشێکی هێزەکەی خستۆتە ئەوێ، تاکو غەطەفان نەتوانن بێن هاوکاریی خەڵکی خەیبەر بکەن، کە هەموویان پێکەوە هاوپەیمان بوون.

**٣-** پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی جوولەکەکانی خەیبەر تێکدەشکێن و قەڵایەکانیان دەگیرێن و، دوو قەڵایان بەدەستەوە دەمێنن و، زۆربەیان لەوان دا کۆبوونەوە، بەڵام دەزانن ئەوانیشیان لێ دەگیرێن، ڕازیی دەبن بەوەی صوڵح لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بکەن، وەک لەم فەرمایشتەدا هاتوە: **(إِنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَعْطَى خَيْبَرَ اليَهُودَ، أَنْ يَعْمَلُوهَا وِيَزْرَعُوهَا، وَلَهُمْ شَطْرُ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا) (أخرجه البخاري: ٢٤٩٩)**، پێغەمبەر ﷺ خەیبەریدا بە جوولەکەکان، کە کاری تێدا بکەن، کشتوکاڵ و بەرهەمی تێدا ڕەنێو بێنن، بەڵام نیوەی بەرهەمەکەی بۆ مسوڵمانان بێ.

بەڵام لە **(سیرة ابن هشام)**دا هاتوە پێغەمبەر ﷺ لەو صوڵح و پێکهاتنەدا کە لەگەڵ جوولەکانی خەیبەردا کردی، ئەو قەیدەشی خستە سەرێ فەرمووی: **(عَلَى أَنَّا إِذَا شِئْنَا أَنْ نُخْرِجَكُمْ، أَخْرَجْنَاكُم)**[1]، واتە: بەڵام بەو مەرجە هەر کاتێ ویستمان دەرتان بکەین، دەرتان بکەین.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام ج٣، ص١٨٤.

ئنجا ئـەوە بـوو عومـەری کـوڕی خەتتـاب ﷺ، لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، جوولەکـەکانی خەیبەریشـی دەرکـردن، لەبـەر ئـەوەی هـەر خەریکـی پیلانگێڕیـی و کاری ژێـر بـە ژێـرو فێـڵ و پیلاننانـەوە بـوون، بێگومـان ناشـکرێ دوژمـن لـە پەنـات بـێ و لێـت نزیـک بـێ و، سـوپاش بنێـری بـۆ جەنـگ لـە دژی فـارس و ڕۆم و، ئەوانیـش خەریـک بـن بەسـەر دەوڵـەتی ئیسـلامییدا بـدەن، لـە بنـەو پاڵـەوەی خۆشـت خەڵکـی ناپـاک و موخەننـەت و لـە بنەوەبـڕ هەبـێ!!

هەڵبەتـە ئـەوەش بەسـەرهاتێکی دیکەیـەو، پێویسـتی بـە ڕوونکردنـەوەی زیاتـر هەیـە، بـەڵام ئـەوەش دیسـان دووربینیـی پێغەمبـەری خـوای ﷺ تێـدا بـووە، کـە هـەر ئـەو کاتـە فەرموویـەتی: هـەر کاتـێ بەچاکـمان زانی دەرتـان دەکەیـن.

٤- ئاڵا دانە دەست ئەبوو بەکر ﷺ، پاشان دانیە دەست عەلی ﷺ، تەنیا لەبەر بەرژەوەندیی و تاکتیکی جەنگیی بووە، سەرەتا ئاڵاکەی داوەتە دەست ئەبوو بەکر ﷺ، کە نزیکترین هاوەڵی بووەو، متمانە پێکراوترین و دڵسۆزترین و خۆشەویسترین کەس بووە لە لای، بەڵام قەڵایەکەی بۆ نەگیراوە، ئنجا داویەتە دەست عەلی ﷺ و ئەوەشی فەرمووە کە من ئاڵایەکە دەدەمە دەست کەسێک، خوا سەرکەوتن لەسەر دەستی ئەو وەدەست دێنێ، تاکو ئەمە ببێتە هێزێکی مەعنەویی بۆ جەنگاوەرەکان کە ئەگەر دوێنێ سەرکەوتوو نەبوون، ئەمڕۆ سەرکەوتووبن، ئیدی هەرچیدیکەی تێوە بپێچرێ، جگە لەو حیکمەتەی باسمان کرد، هەمووی قسەی زیادەیە، وەک شیعەکان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ پێشێ ئەبوو بەکری ناردوەو زانیویەتی سەرناکەوێ، بۆ ئەوەی پێی بشکێ، بەڵام دوایی عەلی ناردوە!! پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ڕەوشتی لەوە بەرزتر بووەو، زۆریش ئەبوو بەکری لەلا خۆشەویسترو شیرینتر بووە، کە بەو جۆرەو بەو نیەتە ئەو مامەڵەیەی لەگەڵدا کردبێ.

بـەڵام بـە هـەر حـاڵ ئەبـوو بەکـر ﷺ، شـتەکەی بەدەسـتەوە نەهاتـوە، دوایـی عـەلی ﷺ، کـە گەنجـتر بـووەو، ڕەنگـە لـە تاکتیکـی جەنگـی لێزانـتر بـوو بـێ، یاخـود ئـەو مسـوڵمانانەی بـە قیادەیـی ئەبـوو بەکـر چـوون، دوایـی لێیـان کۆڵیوەتـەوە

خاڵی بێهێزیان چی بووەو، بۆچی سەرنەکەوتوون لە جەولەی پێشێ دا؟ دەرس و پەندیان لێ وەرگرتوەو ئەمجارە سەرکەوتوو بوون.

**٥-** بەشداریی ئافرەتان لە جەنگی خەیبەردا، کە بە دڵنیایی ئەوە تاکە ئەزموونی بەشداریی ئافرەتان نەبووە لە جەنگەکاندا، وەک باسمان کرد لە صوڵحی حودەیبییەشدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممو سەلەمە لەگەڵ خۆی دا دەبات، وا پێدەچێ پیاوانی دیکەش، ئافرەتانی دیکەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابێ.

هەروەها لە جەنگی ئوحوددا لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم دا هاتوە[1]، گێڕەرەوە (راوي) دەڵێ: عائیشە و ئوممو سولەیمم دەبینین (خوا لێیان ڕازی بێ)، خۆیان هەڵکرد بوو، بە مەشکەو کوندە ئاویان دەهێناو، برینداریان دەگواستنەوەو تیماری بریندارەکانیان دەکرد.

هەروەها لە جەنگەکانی دیکەشدا، ئافرەتان بەشدار بوون لە پشتی جەبهەوەو، جاری واش بووە لە پێشی جەبهەشدا بەشدارییان کردوە، وەک نوسەیبەی کچی کەعب لە جەنگی ئوحددا و صەفییەی کچی عەبدولموتتەلیب پووری پێغەمبەر ﷺ، کە لە جەنگی خەندەقدا، بە کوتەک و تێلا، یەکێک لە جوولەکەکانی کوشتوە، کە جاسووسیی لەسەر کردوون.

**٦-** دەرس و پەندێکی دیکە، کە لە جەنگی خەیبەر وەردەگیرێ، بریتیە لە ئەمانەت پارێزیی تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیشدا، وەک لە بەسەرهاتی **(الأسود الراعي)** {شوانە ڕەشەکە}دا، باسمان کرد، کە دوای ئەوەی مسوڵمان دەبێ، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوە من مسوڵمان بووم، بەڵام کرێکاری ئەو کابرایە بووم و ئەو مەڕەی تەسلیمی من کردوە، ئایا چی لێ بکەم؟! ئەویش دەفەرموێ: دەنگی بدە با بچێتەوە بۆ لای خاوەنی، شوانەکەش چەنگە خۆڵ و چەوێکی پێدا دەدات و، دەڵێ: بڕۆ لەمەودوا هاوەڵایەتییت ناکەم، ئیدی هەمووی وەک کەسێک کەوتبێتە پێشی دەچێتەوە نێو قەڵایەکە!

---

(١) صحيح البخاري: ٢٨٨٠ و صحيح مسلم: ١٧٧٩

یـانی: پێغەمبـەر ﷺ ئامـادە نەبـووە، لـەو کاتەشـدا کـە مەڕدارەکـە دوژمنیـەتی و ئابلووقەشـی داون، ڕانـە مەڕەکـەی لـێ گل بداتـەوە، لەبـەر حورمـەتی ئـەو شـوانە، کـە مسـوڵمان بـووەو، ئـەو ڕانـە مـەڕەی بـە ئەمانـەت لـەلا بـووە، تاکـو بـۆی بـە خیانـەت لـە قەڵـەم نـەدرێ و بـۆی بـە ڕەوشـتێکی دزێـوو قێـزەون لـە قەڵـەم نـەدرێ، مەڕەکـەی پـێ ئیـزن داوەتـەوە.

٧- حیکمەتێکی دیکە ئەوەیە، کە دەبێ مسوڵمانان هەوڵبدەن، سوود لە هەموو توانایەکان وەربگرن، ئەوەش لە هەڵوێستەکەی: **(الحجاج بن العلاط السلمي)**دا دیارە، کە دوای ئەوەی مسوڵمان دەبێ، بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ماڵ و سامانێکم هەیەو خێزانیشم لە مەککەیە، هەروەها قەرزیشم لە لای بازرگانەکان هەیە، مۆڵەتم بدە، بچم ماڵ و سامانەکەم کۆ بکەمەوە، تاکو کافرەکان دەستی بەسەردا نەگرن، ئەویش مۆڵەتی دەدات، بەڵام **(الحجَّاج)**، پیاوێکی زۆر عاقڵ و لێزان بووە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دەبێ مۆڵەتم بدەی، قسەش بکەم، واتە: قسەی وابکەم متمانەم پێ بکەن، کە زەمی تۆ و ئیسلامەتیی بکەم و، قسەی وابکەم ئەوان بە نیزیکیانم بزانن و دڵیان پێی خۆش بێ، دەفەرموێ: بڵێ، چونکە تۆ دەتەوێ ئامانجێک بهێنیە دی و ئەو ئامانجەش پەکی لەسەر چی بکەوێ، وەک زانایانی: **(أصول الفقه)** دەڵێن: **(مَا لاَ يَتِمّ الْوَاجِبُ إلاَّ بِهِ؛ فَهُوَ وَاجِبٌ)**، واتە: هەر شتێک فەرزێک بەو نەبێ جێبەجێ نەکرێ، ئەویش فەرز دەبێ، نوێژ بەبێ دەستنوێژ ناکرێ، بۆیە دەستنوێژیش فەرزە، دەستنوێژگرتن بەبێ خۆ پاککردنەوەو تارەتگرتن نابێ، بۆیە ئەویش فەرزە، هەروەها هەر شتێکی دیکە واجبێک پەکی لەسەر بکەوێ، ئەو شتەش واجب دەبێ.

٨- حیکمەت و دەرسێکی دیکە ئەوەیە، کە خواردنی شتی پیس و حەڕام لە هەموو کاتێکدا دەبێ خۆی لێ بپارێزرێ، باسمان کرد کە لە جەنگی خەیبەردا، **(نَهَى رسول الله عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ)**، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە گۆشتی کەری ماڵیی بخورێ، بەڵکو هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویانە: مەنجەڵمان وەسەر نابوون، گۆشتی کەرمان دەکوڵاند، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین و مەنجەڵەکانمان

وەرگێڕان (**أَكْفَأْنَا الْقُدُورَ**)، واتە: گۆشتەکەیان فڕێ داوەو نەیانخواردوە، هەروەها هەر لەو جەنگەدا پێغەمبەر ﷺ پێیان دەفەرموێ: نابێ گۆشتی هەر دڕندەیەکی چڕنووکدارو هەر ئاژەڵێکی دڕندەی کەڵبەداری گۆشتخۆر بخۆن، یانی: هەر کام لە چوار پێ و باڵندان، مادام گۆشت خۆربن، نابێ گۆشتیان بخورێ، ئەمەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (**عَنِ ابن عباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما أن رَسُولِ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِن السِّبَاعِ، وعَن كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِن الطَّيْرِ** )[1]، هەرچەندە لە جەنگ دابوون و هەژاریی و نەداریی بووەو زۆریش ئاتاج بوون، بەڵام شتی پیس و حەڕام هەر نابێ بخورێ.

٩- حیکمەت و دەرسێکی دیکە، کە لە جەنگی خەیبەر وەردەگیرێ، ئەوەیە: کاتێک دوژمن دێتە مەیدان و تەحەددا دەکات، داوای مەیدانداریی دەکات، دەبێ بە لۆژیکی خۆی، وەڵام بدرێتەوە، دوای ئەوەی مەڕحەب شیعرێک دەخوێنێتەوەو دەڵێ: (**هَلْ مِنْ يُبَارِزُ؟**) کەعبی کوڕی مالیکیش شیعر دەخوێنێتەوەو بە شیعر وەڵامی دەداتەوە، هەڵبەتە لێرە لە سیرەی (**إبن هشام**)دا، دەڵێ: مەڕحەب بە دەستی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ کوژراوە، لە تۆڵەی برایەکەی دا: مەحموودی کوڕی مەسلەمە، کە پێشتر مەڕحەب کوشتوویەتی، بۆیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کێ بۆی دەچێ؟ دەڵێ: من بۆی دەچم، تاکو تۆڵەی برایەکەی خۆشمی لێ بکەمەوە، بەڵام لە هەندێ سەرچاواندا هاتوە، کە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ، مەڕحەبی کوشتوەو لە وەڵامی شیعرەکەی مەڕحەبدا کە دەڵێ: (**قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مرحْب**)، عەلییش ﷺ لە وەڵامییدا شیعرێک دەڵێ: (**سَمَّتْنِي أُمِّي حَيْدَرَة**)، دایکم ناوی لێناوم (**حَيْدَرَة**) یانی: شێر، بەڵام (**إبن هشام**) هێناویەتی، کە مەڕحەب بە دەستی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کوژراوە.

مەبەستم ئەوەیە: دەبێ لۆژیکی بەرانبەرەکەت چ لۆژیکێکە، تۆش هەوڵبدەی لە شێوەی ئەو و هەمان لۆژیک بەکاربێنی، ئەگەر ئەو شیعرە دەڵێ، تۆش بە شیعر وەڵامی بدەوە، ئەگەر هەڕەشە دەکات، هەڕەشە بکەوە، لە جەنگدا ئەوە

---

(١) صحيح البخاري: ٥٧٨٠ وصحيح مسلم: ٩٧٢.

دەخوات، نەک ئەو هەڕەشە بکات و تۆش دووعای خێری بۆ بکەی، بە دڵنیایی ئەوە بە کەڵک نایەت و، دوژمنەکەت زیاتر لێت سام شکاوو بێشەرم دەبێ.

**١٠-** گەڕانەوەی کۆچکەرە حەبەشەییەکانیش ڕووداوێکی زۆر خۆش بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە لە گەرمەی جەنگی خەیبەردا، کۆچکەرە حەبەشەییەکان دەگەڕێنەوە وەک لەم دەقەوە دیارە: (**عَنِ الشَّعْبِيِّ: أَنَّ جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ خَيْبَرَ، فَقَبَّلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَالْتَزَمَهُ وَقَالَ: مَا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا أَنَا أُسَرّ: بِفَتْحِ خَيْبَرَ، أَمْ بِقُدُومِ جَعْفَر**)[١].

واتە: شەعبیی دەڵێ: جەعفەری کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی سەرکەوتنی خەیبەردا، پێغەمبەریش ﷺ نێوچاوانی ماچکردو، بە خۆیەوە گووشیی، فەرمووی: نازانم بە کامیان دڵخۆشتر بم، بە سەرکەوتنی خەیبەر، یاخود بە هاتنەوەی جەعفەر!!

واتە: جەعفەرو ئەوانی دیکە کە لە حەبەشە بوون و، هەر لە قۆناغی مەککەدا چوو بوون بۆ ئەوێ، لەو ڕۆژەدا ئەوانیش گەڕانەوەو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بۆی جێی دڵخۆشیی بوو، ئەوانیش بۆیە ئەو کاتە هاتوونەوە، چونکە دڵنیا بوون کە لەمەودوا ئیسلام دەسەڵات پەیدادەکات و کۆنترۆڵی نیوە دوورگەی عەرەبیی دەکات و، جارێکی دیکە ناچاری کۆچ و کۆچبار نابنەوە.

ئەمەش کورتەو پوختەیەک لە حیکمەت و دەرس و پەندو بەرهەمەکانی، هەر کام لە صوڵحی حودەیبییەو، جەنگی خەیبەر.

لە خوای پەروەردگار داواکارین بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لە قورئان و سیرەو ژیان و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ وردبینەوە،

---

(١) أخرجه الحاكم في «المستدرك»: ٤٢٤٩، وأقَرَّهُ فيه الذَّهبي، والطبراني في «الكبير»: ٣٤٧٠، وإبن أبي شيبه في «المصنف»: ٣٢٢٦٠، والبزار في «المسند»: ١٣٢٨، وابن هشام في «السيرة»: ج٣، ص١٩٨.

بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵیداوەو لە هەوڵەکەشیدا لە سەدا سەد سەرکەوتوو بوو، کە ئەوەی خوا ﷻ پێی دەفەرموێ، ئەنجامی بدات و لە ژیانی خۆیدا بەرجەستەی بکات، چ پەیوەندیی بە لایەنی بووناسییەوە هەبێ، چ بە لایەنی ئیمان و عەقیدەوە، چ بە لایەنی پەرستشەکانەوە، چ بە لایەنی ڕەوشت و ئاکارەوە، چ بە لایەنی کۆمەڵایەتیی، چ لایەنی باری کەسێتیی، چ لایەنی جەنگ و ئاشتیی، چ لایەنی سیاسەت و حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنەوە، بۆیە هەتا زیاتر لە سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ ورد بینەوەو پتر پێی ئاشنا بین، ئەوە زەمینەمان بۆ خۆش دەکات باشتر لە چەمک و واتاکانی فەرمایشتی خوا تێ بگەین، چونکە هەرچی خوا ﷻ لە قوڕئاندا فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێبازی خۆیدا، کردوویەتی.

هەڵبەتە دوای زانینی چۆنیەتی ڕوودانی هەر کام لە صوڵحی حودەیبییەو جەنگی خەیبەرو، سەرنجدانی حیکمەت و پەندە سەرەکییەکانیان، ئێستا باشتر زەمینەی لێتێگەیشتنی بیست و نۆ (٢٩) ئایەتەکانی سووڕەتی (الفتح)مان بۆ تەخت و هەموار بووە.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**الفتح**) پێک دێ، ئایەتەکانی: (١ - ١٠)، تێیاندا، خوای بەخشەر پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، کە سەرکەوتنێکی ئاشکرای بۆ ڕەخساندوە، تاکو لە هەموو گوناهێکی ڕابردوو و دوایی ببووڕێ و، چاکەی خۆی لەسەر تەواو بکات و، بە سەرکەوتنێکی مەزن سەری بخات.

دوایی باسی دابەزاندنی ئۆقرەو ئۆخژن بۆ سەر دڵی بڕواداران دەکات، کە سەرەنجام بیانخاتە بە هەشتەکانی خۆیەوەو پاکیان بکاتەوە.

هەروەها دەغەڵ و هاوبەشدانەرە گومانی خراپ بە خوا بەرەکان، سزا بدات و، نەفرینیان لێ بکات و بە دۆزەخیان بگەیەنێ.

ئنجا خوای بەرزو مەزن ئەرکی سەرشانی هەر کام لە پێغەمبەرو بڕوادران دەخاتە ڕوو.

لە کۆتاییشدا باسی ئەو بەڵێن و پەیمانە دەکات، کە بە ناوی خواوە، پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرتوون، کە هەر کەس پێوەی پابەند بێ، پاداشتی مەزنی خوای هەیەو، کەسێکیش هەڵیبوەشێنێتەوە، هەڵوەشانەوەکەی تەنیا بە زیانی خۆی تەواو دەبێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ
عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي
قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا
﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ
وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ
وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا
﴿٧﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ
وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ
اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بەڕاستیی (ئەی موحەممەد ﷺ!) ئێمە (بە هۆی ڕێككەوتنی حودەیبییەوە) سەركەوتنێكی ئاشكرامان بۆ ڕەخساندی ﴿١﴾ تاكو (لە ئەنجامی ئەو تێكۆشان و بەرهەمە مەزنەدا)، خوا لە گوناهی ڕابردوو و دواكەوتووت ببووریٚ و، چاكەی خۆیت لەسەر تەواو بكات و، بەرەو ڕاستە ڕێ (زیاتر) ڕێنماییت بكات ﴿٢﴾ هەروەها (تاكو) خوا سەرخستنێكی باڵا دەستانە سەرت بخات ﴿٣﴾ (خوا) ئەو كەسەیە كە ئۆخژن و ئۆقرەیی خستۆتە دڵی بڕوادارانەوە، تاكو وێڕای بڕوایان، بڕوا زیاد بكەن و سەربازەكانی

ئاسمانەکان و زەویش تەنیا هی خوان و، خوا زانای کاربەجێیە ﴿٤﴾ (هەروەها خوا ئەو سەرکەوتنە ڕوونەی بۆ ڕەخساندی)، تاکو (بە هۆی فەرمانبەریی و تێکۆشانیانەوە) بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت، بخاتە بەهەشتانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن و (بەرلەوەش) خراپەکانیان لێ بسڕێتەوەو، ئەوەش لە لای خوا بردنەوەیەکی مەزن بوو بۆ بڕواداران ﴿٥﴾ هەروەها (ئەو سەرکەوتنە بەرچاوەی بۆ ڕەخساندی) تاکو (خوا) پیاوانی دەغەڵ و ئافرەتانی دەغەڵ و، پیاوانی هاوبەشدانەرو ئافرەتانی هاوبەشدانەری گومانی خراپ بە خوابەر، سزاو ئازار بدات، بەڵای خراپیان لەسەر بسووڕێ و، خوا لێیان تووڕە بووەو، نەفرینی لێکردوون و، دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون و، (ئەوێ) خراپترین سەرەنجامیشە ﴿٦﴾ سەربازەکانی ئاسمانەکان و زەوییش تەنیا هی خوان و، خوا هەردەم زاڵی کارزان بووە ﴿٧﴾ (ئەی موحەممەد!) ئێمە تۆمان بە شایەدو موژدەدەرو ترسێنەر ناردوە ﴿٨﴾ تاکو (ئەی مسوڵمانینە!) بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن و، پشتی (پێغەمبەر) بگرن و، ڕێزی بگرن و، بەیانیان و ئێوارانیش (خوا) ستاییش بکەن و، بە پاکی بگرن ﴿٩﴾ بە دڵنیایی ئەوانەی پەیمانت لەگەڵدا دەبەستن (ئەی موحەممەد!) پەیمان بە خوا دەدەن، دەستی خوا لە سەرووی دەستیانەوەیە، ئنجا هەر کەس پەیمانشکێنیی بکات، تەنیا بە زیانی خۆی بێ بەڵێنیی دەکات و، هەر کەسێکیش وەفادار بێ بەو پەیمانەی بە خوای داوەو (بە تەواویی جێ بەجێی بکات) بێگومان لەمەودوا (خوا) پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە ﴿١٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَتۡحٗا مُّبِينٗا): (الفَتْحُ: إِزَالَـةُ الإغْـلاَقِ وَالإِشْـكَالِ، وَذَلِـكَ ضَرْبَـانِ: مَـا يُـدْرَكُ بِالبَـصَرِ وَمَـا يُـدْرِكُ بِالبَصِـيْرَةِ، وَالفَتْـحُ: النُّـصْرَةُ وَالظَّفَـرُ وَالحُكْـمُ)، (فَتْـح): لـە ئەصڵـی زمانـدا لابـردنی داخراویـی و لابـردنی گـرێ و گـۆڵ و گرفتێکـە، ئەویـش دوو جـۆرە:

**جـۆری یەکەمیـان:** ئەوەیـە کـە بەچـاو ببیـنرێ، {وەک: گرێیـەک لـە گوریسـێک یـان کندرێـک دراوە، ئـەو گرێیـە بکرێتـەوە}.

**جـۆری دووەمیـان:** بـە عەقـڵ و دڵ دەبیـنرێ، وەک پرسـیارێک دەکـرێ، کەسـێک شـتێکی لـە دڵـدا بۆتـە گـرێ، یەکێکی دیکـە وەڵامـی دەداتـەوەو گرێیەکەی بـۆ لادەبات، وشـەی (فَتْـح): بـە مانـای سەرخسـتن و باڵادەسـت بـوون و دادوەریـی کردنیـش هاتـوە.

(ٱلسَّكِينَةَ): (الطُّمَأْنِيْنَـةُ وَالإِسْـتِقْرَارُ)، (سَـكِيْنَة): بـە کوردیـی دەبێتـە ئۆقرەیـی و ئۆخـژن و داسـەکنان.

(فَوۡزًا): (الفَـوْزُ: الظَّفَـرُ بِالْخَـيْرِ مَـعَ حُصُـولِ السَّـلاَمَةِ)، (فـوز): بریتیـە لە وەدەسـتهێنانی چاکـە لەگـەڵ هەبوونی سـەلامەتییدا.

(دَآئِرَةُ): (الدَّائِـرَةُ: الخَـطُّ المُحِيْـطُ وَالحَادِثَـةُ، وَالـدَّوْرَةُ وَالدَّائِـرَةُ، فِي المَكْـرُوهِ، وَالدَّوْلَـةُ فِي المَحْبُـوب)، (دائـرة) بازنەیەکـە، بـە دەوری چەقێکەوەیـەو، بـە مانـای ڕووداویـش دێ، بـەڵام وشـەی: (دَوْرَة و دَائِـرَة) بـۆ شـتی خـراپ بەکاردێـن، ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، بـەڵام وشـەی (دَوْلَـة) لـە شـتی خۆشویسـتراودا بـەکاردێ، دەگوتـرێ: (هَـذِهِ الأَيَّـامُ دَوْلَـةُ فُـلاَنٍ) واتـە: بـۆ ویـی بارودۆخەکـە بـە بـاش سـووڕاوە.

(ٱلسَّوۡءِ): (مَـا يَسُـوءُهُمْ فِي العَاقِبَـة)، ئـەوەی لـە سـەرەنجام دا، بۆیـان خـراپ بـێ، (السُّـوءُ: كُلُّ مَـا يَغُـمُّ الإِنْسَـانَ دُنْيَـاً وَأُخْـرَىً، نَفْسَـاً، أَو بَدَنَـاً، أَو خَارِجَهُـمَا)، (سـوء): هـەر

شتێکە مرۆڤ خەفەتبارو سەغڵەت و نارەحەت بکات، لە ڕووی دنیایی بێ، یاخود دوارۆژیی، لە ڕووحدا بێ یان لە جەستەدا، یاخود لە دەرەوەی ڕووح و جەستەدا، واتە: لە ماڵ و سامان و خزم و کەسدا، کەواتە: ﴿دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾ واتە: بەڵای خراپ و، سووڕی خراپی ڕۆژگار، کە بە زەرەری ئەوان تەواو بێ.

(شَٰهِدًا): (**الشَّاهِدُ: مَنْ يُؤَدِّي الشَّهَادَةَ، وَالدَّلِيْلُ، شَهِدَ عَلَى كَذَا، أَخْبَرَ بِهِ، خَبَرَاً قَاطِعَاً وَشَهِدَ بِاللهِ: حَلَفَ بِهِ، وَشَهِدَ المَجْلِسَ: حَضَرَهُ**)، (**شَاهِد**): بە کەسێک دەگوترێ کە شایەدیی ئەنجام دەدات (گەواهیی دان)، هەروەک (شاهد) بە کەسێکیش دەگوترێ: کە شتێک دەبینێ، وشەی (**شَهَادَة**) یان (**شاهِد**) بە مانای بەڵگەش دێ، دەگوترێ: (**شَهِدَ عَلَى كَذَا**)، واتە: هەواڵی لە بارەوەدا، هەواڵێکی دڵنیاکەر، دەگوترێ: ( **شَهِدَ بِاللهِ**)، واتە: سوێندی بە خوا خوارد، خوای بە شایەد گرت، (**وشَهِدَ المَجْلِسَ: حَضَرَهُ**)، واتە: لە کۆڕو مەجلیسەکەدا ئامادە بوو، دیارە هەر کام لەو مانایانە، بەپێی ئەو سیاقە و، بەپێی ئەو باس و بابەتەی دێ، ئەو وشەیە یەکێ لەو مانایانەی بۆ دیاریی دەکرێ.

(وَتُعَزِّرُوهُ): (**أَي: تُعِيْنُوهُ وَتُقَدِّرُوهُ وَتَنْصُرُوهُ**): (**تُعَزِّرُوهُ**): یارمەتیی بدەن و ڕێزی بگرن و پشتی بگرن.

(وَتُوَقِّرُوهُ): (**وَقَّرَ فُلَانَاً، أَي: رَزَّنَهُ، وَعَظَّمَهُ وَبَجَّلَهُ**)، (**تُوَقِّرُوهُ**)، (**تَوْقِير**) واتە: بە سەنگین تەماشاکردن، ڕێزو حورمەت لێگرتن، دەگوترێ: (**وَقَّرَ فُلَانَاً**)، واتە: بایەخیی بۆ دانا، ڕێزو حورمەت و پێگەی باشی بۆ دانا، بە مەزنی گرت و بە پایەداری تەماشا کرد.

(نَّكَثَ): هەڵیوەشاندەوە، (**نَكَثَ الحَبْلَ وَنَحْوَهُ: نَقَضَهُ**)، ئەگەر پەتێک هۆندرا بێ و هەڵبوەشێندرێتەوە پێی دەگوترێ: (**نَكَثَهُ: نَقَضَهُ**)، واتە: هەڵیوەشاندەوە، (**وَنَكَثَ العَهْدَ أَو اليَمِيْنَ أَو البَيْعَةَ: نَبَذَهَا**)، ئەگەر (**نَكَث**) بۆ سوێندو بۆ پەیمان و بۆ بەڵێن دان، بەکاربهێنرێ، واتە: ئەو سوێند و بەڵێن و پەیمانەی فڕێداو، کاری پێ نەکرد.

(أَوْفَىٰ بِمَا عَـٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ) (وَفَى الـشَّيءَ يَفِـي، وَفَـاءً وَوَفِياً: تَـمَّ)، (وَفَى) بـه مانـای شـتەکە تـەواو بـوو، ڕێـک بـوو، (وَفَى فُـلانٌ نَـذْرَهُ: أَدَّاهَ، أَوْفَى، وَوَفَى، وَوَفَّى بِعَهْـدِهِ: عَمِـلَ بـهِ)، (وَفَى فُـلاَنَ نَـذرَه) واتـە: ئـەوەی لـە خـۆی گرتبـوو، جێبەجێـی کـرد، (أَوْفَى، وَوَفَى، وَوَفَّى بِعَهْـدِهِ: عَمِـلَ بـهِ)، کاری بـە پەیمانەکـەی خـۆی کـردو بەڵێنەکـەی بـردە سـەرێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

ئێمـە لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە پانتاییەکـی باشـمان تەرخانکـردوە بـۆ گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی صوڵحـی حودەیبییـە، کـە خـوا ﷻ نـاوی لێنـاوە: ﴿فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾، هەروەهـا بـۆ جەنگـی خەیبەریـش، ئـەوەی پێویسـت بـووە، لـە بـارەی ئـەو دوو ڕووداوەوە، گوتوومانـە: چـۆن ڕوویانـداوەو چییـان تێـدا قەومـاوە؟ بـەڵام لـە هـەر شـوێنێکیش بـۆ تەفسـیری ئایەتـەکان پێویسـت بـێ، هـۆی هاتنـە خواریـان، ئەگـەر بـە کورتییـش بـێ، ئامـاژەی پـێ دەکەیـن، لێرەشـدا لـە بـارەی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾ و ئایەتـەکانی دواتریشـەوە، ئـەو گێڕدراوەیـە هەیـە:

**١- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: أَقْبَلْنَا مِنَ الْحُدَيْبِيَّةِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَيْنَا نَحْنُ نَسِيرُ إِذَا أَتَاهُ الْوَحْيُ، وَكَانَ إِذَا أَتَاهُ اشْتَدَّ عَلَيْهِ، فَسُرِّيَ عَنْهُ، وَبِهِ مِنَ السُّرُورِ مَا شَاءَاللَّهُ، فَأَخْبَرَنَا أَنَّهُ أُنْزِلَ عَلَيْهِ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾}، (أخرجه أحمد: ج١، ص٣٩١، والطبري في تفسيره: ٣١٤٥١، والبيهقي في دلائل النبوة، ج٤، ص١٥٥، وصحَّحه أحمد شاكر فـي المسند أحمد:٣٧١٠، وله شاهدٌ عن أنس بن مالك ﵁، أخرجه النسائي: ٥٢٢، وإسناده صحيح).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﵁، دەڵـێ: لـە حودەیبییـەوە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ هاتینـەوە بـەرەو مەدینـە، ئنجـا لـە کاتێکـدا ئێمـە دەڕۆیشـتین وەحیـی بـۆ هـات، پێغەمبەریـش ﷺ کـە وەحیـی بـۆ دەهـات، تووشـی نارەحەتیـی و سـەختیی دەبـوو {دەیانـزانی دەکەوێتـە حاڵێکـی نـا ئاساییەوە، لـەو کاتـەدا هـاوەڵان

قسەیان لەگەڵ نەکردوە، ئەگەر دانیشتبێ، جاری واهەبووە ڕاکشاوە، قوماشێک یان پۆشاکێکیان بەسەردا داوە}، دوایی کە حاڵەتە سەختیی و ناڕەحەتییەکەی لێ لاچوو، ئەوەندەی خوا ﷻ بیەوێ ئەوەندە دڵخۆش و شادمان بووو هەواڵی پێدایین کە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾، دابەزێندراوەتە سەر.

٢- ڕیوایەتێکی دیکە لەو بارەوە، لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکانەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ۝٣ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝٤ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ۝٥﴾، لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیە هاتوە:

**{عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾، مَرْجِعَهُ مِنَ الحُدَيْبِيَّةِ فَقَالَ: لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ قَرَأَهَا عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا: هَنِيئاً مَرِيئاً يَا رَسُولَ اللَّهِ! ﷺ قَدْ بَيَّنَ اللَّهُ لَكَ مَاذَا يَفْعَلُ بِكَ، فَمَاذَا يَفْعَلُ بِنَا؟ فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا﴾} (أخرجه البخاري: ٤١٧٢، ومسلم: ١٧٨٦، والنسائي في التفسير: ٥٢).**

واتە: ئەنەس ﵁، دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزیە سەر پێغەمبەر ﷺ: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢﴾، لە کاتی گەڕانەوەیدا لە حودەیبییە، فەرمووی: ئایەتێکم دابەزیوەتە سەر، لە لام خۆشەویسترە لە هەرچی لەسەر زەوییە، دوایی ئایەتەکەی بەسەردا خوێندنەوە، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتیان: (**هَنِيئاً مَرِيئاً يَا رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ)، پیرۆز و موبارەکت بێ، بە دڵی خۆشبێ ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، خوا ﷻ بۆی ڕوونکردیەوە چیت بۆ دەکات، ئەدی چی بۆ ئێمە دەکات؟ لەو کاتەدا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی: ﴿لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ

﴿عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمٗا ۝٥﴾، واتـە: تاكـو بڕوادارانـی پیـاوو بڕوادارانـی ئافـرەت بخاتـە بەهەشـتانێكەوە، ڕووبـار بـە ژێـر دارو درەختەكانیـان دا دەڕۆن، (یاخـود ڕووبـارەكان و كانیـی و سـەرچاوەكان لـە نێـو بنكـی دارو درەختەكانـدان، نـەک لـە شـوێنی دیكـەوە بۆیـان بـێ) و خراپەكانیـان لـێ بسـڕێتەوە، ئـەوەش لـە لای خـوا بردنـەوەو بـە مـراد گەیشـتنێكی مەزنـە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

وەک پێشـتریش گوتمـان، دوای گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی حودەیبییـە، تـەواو بەرچاومان ڕۆشـن بۆتـەوە، لـە بـارەی چەمـک و واتـای كـۆی ئایەتـەكانی سـووڕەتی (**الفتـح**)ەوە، هەروەهـا دوای گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی جەنگـی خەیبـەر، كە ژمارەیەک لـە ئایەتەكانیش ئامـاژەن بـە جەنگـی خەیبـەرو، بـەو دەسـتكەوتانەی مسـوڵمانان چنگیـان كەوتـن لـە ئەنجامـی جەنگـی خەیبـەردا، بۆیـە ئێمـە مانـای گشـتیی ئایەتـەكان، كورتـترو خێراتـر دەكەیـن، چونكـە لـە ئەنجامـی گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەكەدا، كـە ئـەم ئایەتانـە بـە هۆیـەوە هاتوونـە خـوار، بەرچاومـان ڕۆشـنترەو لـێ تێگەیشـتنی ئایەتـەكان سـێناترە.

خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: ئـەم كارەم، بـە نـاوی خـوای بە بەزەیی بەخشـندە دەسـت پێدەكـەم، یـان دەسـت پێكردنـم بـەم كارە، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندەیە، ئنجـا بـە لای كەمـەوە كاتـێ مـرۆڤ، دەڵـێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، دەبـێ چـوار واتایـان لـە عەقـڵ و دڵـی خـۆی ئامـادە بكـات:

١- ئەم كارە بە ناوی خوا ئەنجام دەدەم، نەک بە ناوی خۆم، یان بە ناوی هەر كەس و، هەر شتێكی دیكە.

٢- ئەم کارە بۆ خوا ئەنجام دەدەم، تاکو خوا ﷻ لێم ڕازیی بێ و، چونکە خوا ئەم کارەی پێخۆشە بۆیە ئەنجامی دەدەم.

٣- ئەم کارە بە پێی بەرنامە و شەریعەتی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەم کارە بە ئاسانکاریی و هاوکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەک بە هێزو تواناو شان و شەوکەتی خۆم.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە فەتحێکی ئاشکرامان بۆ تۆ کرد، (فتح) یانی چی؟ (فتح) لە ئەصڵی زماندا بە مانای (کردنەوە) دێ، دەرگایەک داخرا بێ و بکرێتەوە، دەگوترێ: (فَتَحَ البَابَ) دەرگاکەی کردەوە، کتێبێک پێکەوە نرابێ و لێک بکرێتەوە، دەگوترێ: (فَتَحَ الكِتَابَ) کتێبەکەی لێک کردەوە، هەروەها نامەیەک لە زەرفدابێ و بهێنرێتەدەر، پێی دەگوترێ: (فَتَحَ الرِّسَالَة)، نامەکەی کردەوە، ئنجا وەک چۆن بۆ شتی بەرهەست، وشەی (فتح) بە مانای کردنەوە دێ، بۆ شتی نا بەرهەستیش کە بە عەقڵ و دڵ دەزانرێن، بەکاردێ، کەسێک پرسیارێک گرێ و گۆتاڵێکی هەیە، یەکێکی دیکە وەڵامی دەداتەوە، دەگوترێ: گرێیەکەی بۆ کردەوە، واتە: ئەو شتەی کە لێی داخرا بوو، لێی ئاڵۆزکا بوو، ئەو بۆی کردەوەو، بۆی شیکردەوە، لێرەدا: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، واتە: ئێمە سەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرامان بۆ تۆ ڕەخساند، کە وەک پێشتر باسمانکرد مەبەست پێی بە پلەی یەکەم، پێکهاتنی حودەیبییەیە، چونکە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی سەرکەوتنە بەسەر قورەیشییەکانداو ئازادکردنی شاری مەککەییە، بەڵام ئەم سوورەتە موبارەکە بە یەکدەنگیی هەموو زانایان و، لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم و لە هەموو سەرچاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبییەوە بەرەو مەدینەو، لە شوێنێکدا کە پێی دەگوترێ: (كُرَاعُ الغَمِيمِ)، بە شەویش ئەم سوورەتە موبارەکە دابەزیوەو، بە

شێوەی ڕابردووش هێناویەتی، دواییش هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە: ئایا ئەوە فەتح بوو، سەرکەوتن بوو؟ فەرموویەتی: بەڵێ، بەڵکو لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، فەرموویەتی: (أَعْظَمُ الفُتُوحِ)، گەورەترینی سەرکەوتنەکان بووە، بەڵێ صوڵح و پێکهاتنی حودەیبییە، بۆ پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان سەرکەوتنێکی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو، بەهۆی ئەم سەرکەوتنەوە ڕێ بۆ مسوڵمانان ئاچووخ بوو، کە دوایی مەککەش ئازاد بکەن و، کۆی نیوە دوورگەی عەرەبیی ئازاد بکەن، هەروەها ڕێ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ تەخت و ئاچووخ بوو، کە نامە بنێرێ بۆ حوکمڕانانی فارس و ڕۆم و حەبەشەو میصرو ئەوانی دیکەش.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾، (ل)ی سەر (لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ) بۆ هۆکار دۆزیی (تعليل)ە، واتە: بۆیە ئەو سەرکەوتنە ڕوون و ئاشکرایەمان بۆ تۆ ڕەخساند، تاکو خوا ﷻ لە گوناهە تێپەڕیوەکانت و گوناهە دواکەوتووەکانیشت، لێت ببوورێ، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشک دەخەینە سەر چەمک و واتای (ذَنْب)و، لێبوردنی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەر ﷺ لە گوناهەکانی، بەڵام لێرەدا ئەوەندە دەڵێین: کە (ل)ی (التعليل) لێرەدا، یانی: ئێمە بۆیە ئەو سەرکەوتنە ڕوون و ئاشکرایەمان بۆ تۆ ڕەخساند، تاکو لە ئاکامدا، خوا ﷻ لەبەر ئەو هەوڵ و تێکۆشان و ماندوو بوون و خۆڕاگریی و صەبرو حەوسەڵەیەی هەتبوو، شایستەی ئەوەبێ کە خوای پەروەردگار لە هەموو شتێکت ببوورێ، لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووت، ﴿وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ﴾، تاکو چاکەی خۆی بەسەر تۆدا تەواو بکات، ﴿وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾، هەروەها ڕاستەڕێت بکات، ڕێنماییت بکات بەرەو ڕێیەکی ڕاست.

کە هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەر ڕێی ڕاست بووە، بەڵام واتە: لەم ڕووداوو پێشهاتەدا کە هاتۆتە پێش، خوا ﷻ وات لێبکات، هەڵوێستێکی ڕاست و دروستت هەبێ و، مامەڵەیەکی ڕاست و دروست بکەی و لە ڕێیەکی ڕاست و دروستەوە، بڕۆی و، مامەڵە لەگەڵ ئەو پێشهات و ڕووداوەدا بکەی، کە زۆرێک لە

هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو، بە زەحمەت بۆیان هەزم کرا، بەڵام خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ والێکرد، کە بەو شێوەیە مامەڵە بکات، بەو ڕێیە ڕاستەدا لەگەڵ ئەو ڕووداوەدا هەڵسوکەوت بکات، کە شایستەی پێغەمبەری خوایە ﷺو، بەرژەوەندیی دنیاو دواڕۆژی ئیسلام و مسوڵمانانی تێدایە، ﴿وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصۡرًا عَزِيزًا﴾، هەروەها تاکو خوا ﷻ بە سەرخستنێکی باڵادەستانە سەرت بخات، واتە: لە ئاکامدا، ئەم سەرکەوتنە ببێتە هۆی ئەوەی خوا ﷻ پشتیوانییت لێ بکات و پشتت بگرێ و، سەرکەوتنێکی باڵادەستانە، سەربکەوی بەسەر دوژمنان و ناحەزانتداو، ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی گەیاندنی پەیامی خوادا، کە لە پێش تۆدا دانراون، هەموو ئەو کۆسپ و لەمپەرانە هەڵببڕی و هەڵیانبوێری.

﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە، ئۆخژن و ئۆقرەیی دابەزاندە نێو دڵی بڕوادارانەوە، ﴿لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾، تاکو وێڕای ئیمانەکەی خۆیان، ئیمانی دیکەش زیاد بکەن، چونکە بێگومان هەر کاتێک مسوڵمان شتێکی دێتە پێش، ئەگەر بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕووداوو پێشهاتەدا بکات، کە بەپێی شەریعەتی خوا بێ و ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاری تێدابێ، مانای وایە ئیمانی دیکەشی زیاد کرد، واتە: ئیمانی بە شتەکانی پێشێ بووەو، ئەوەی دیکەش کە دێتە پێشی، ئەگەر هەر جارێ شتێ هاتە پێشی، ئیمانی پێی هەبێ، مانای وایە ئیمانی زیاد دەکات، چونکە ئیمان بە چاکە و فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بە گوناهو تاوانان کەم دەکات و بێهێز دەبێ، ئەوەش ڕاستییەکە، هەم ئایەتەکانی قورئان زۆر بە ڕۆشنیی دەیگەیەنن، کە یەکێک لە ئایەتەکان ئەمەیەو، هەم فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ، بۆیە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن و دەڵێن: (**الإيمَانُ يزيدُ وَيَنْقُص، يَزِيدُ بِالطَّاعَة وَيَنْقُص بالمَعْصِيَة**)، واتە: ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات، بە فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بە گوناهو سەرپێچیی کەم دەکات.

﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، سەربازەكانی ئاسمانەكان و زەوییش تەنیا هی خوان، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، خواش هەمیشەو هەردەم زانای كارزان بووە، زانا بووە بە هەموو شتەكان و، كارزان بووە لە هەموو كارەكانیدا.

﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، (ل)ی (لِّيُدْخِلَ) هی هۆكار دۆزیی (التعليل)ەو، دەگونجێ پەیوەست بێتەوە بە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، واتە: بۆیە ئەو سەركەوتنە ڕوون و ئاشكرایەمان بۆتان ڕەخساند، بۆ تۆو بۆ مسوڵمانان، تاكو لە ئاكامدا بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت شایستەی ئەوە بن، خوا ﷻ بیانخاتە بەهەشتەكانی خۆیەوەو خراپەكانیان لێ بسڕێتەوە، دەشگونجێ پەیوەست بێتەوە بە دابەزێنرانی ئۆقرەیی و ئۆخژن بۆ سەر دڵ و دەروونیان، واتە: خوا ﷻ ئەو كەسەیە، كە ئۆقرەیی و ئۆخژنی دابەزاندە نێو دڵی بڕواداران، تاكو وێڕای ئیمانی خۆیان، ئیمانیان زێدە ببێ و، سەرەنجامیش بە هۆی ئەو ئۆقرەیی و ئۆخژن و دڵداسەكنان و دڵدامەزرانەوە، بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، شایستە بن خوا ﷻ بیانخاتە نێو بەهەشتەكانی خۆیەوە، كە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر دارو درەختەكانیاندا دەڕۆن، یاخود ڕووبارەكان، كانیی و سەرچاوەكانیان هەر لە شوێنی خۆیان لە ژێر دارو درەختەكان هەڵدەقوڵن، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، بە هەمیشەیی تیایاندا دەمێننەوە، ﴿وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾، هەروەها خراپەكانیان لێ بسڕێتەوە، لێرەدا تێبینیی دەكرێ كە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرموویەتی: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾، بۆ ئەوەی لە گوناهەكانت كە تێپەڕیون و دادێن، بیانبووری، بەڵام لێرەدا بە نسبەت بڕوادارانی پیاوو ئافرەتەوە، فەرموویەتی: ﴿وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾، خراپەكانیان لێ بسڕێتەوە!

كەواتە: ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە خراپە لە قەڵەم نادرێ، بڕواداران خراپە دەكەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە خراپەكردن پارێزراو بووە، ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا﴾، ئەوەش لە لای خوا بردنەوەو بەمراد گەیشتنێكی مەزن بوو.

هەروەها خوا ﷻ ئەو سەرکەوتنە ڕوون و ئاشکرایەی ڕەخساند: ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ﴾، (و)ی (وَيُعَذِّبَ) بۆ بادانەوەو گێڕانەوە (عَطْف)ەو، ئەم ڕستەیە دەباتەوە بۆ پێشەوە، واش زیاتر پێدەچێ بیگێڕێتەوە بۆ سەر: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، واتە: ئەو سەرکەوتنە ڕوون و ئاشکرایەمان بۆ تۆ ڕەخساند، تاکو وێڕای ئەوەی لێت دەبووریٚ و چاکەی خۆیت لەسەر تەواو بکات و، بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییت بکات و، بە سەرکەوتنێکی باڵادەستانە سەرت بخات و، لە بڕوادارانیش ببووریٚ و خراپەکانیان لێ بسڕێتەوەو بیانخاتە بەهەشتەوە، وێڕای ئەوە: مونافیقە پیاوەکان و مونافیقە ئافرەتەکان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرە پیاوەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرە ئافرەتەکانیش، کە عادەتیان وایە، گومانی خراپ بە خوا دەبەن: ﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ﴾، واتە: گومانی خراپ بە خوا بەرەکان سزابداو ئازاربدا.

### بەڵام ئایا لە کوێ سزاو ئازاریان بدات؟

أ- دەگونجێ مەبەست پێی دنیا بێ، یانی: لە دنیادا وەختێک ئیسلام و مسوڵمانان دەبینن باڵا دەستن و دەسترۆیشتوون و، دەتوانن بەرنامەی خوا پیادە بکەن لە وڵاتی خۆیاندا، ئەوە بۆ ئەوان ئازارو ئەشکەنجەیەکی دەروونییە، چ بۆ هاوبەش بۆ خوادانەران، چ بۆ مونافیق و دەغەڵەکان، بە نێرو مێیانەوە، ئەوانەی هەمیشە گومانی خراپیان بە خوا دەبرد.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی بێ.

ج- یاخود لە یەک کاتدا مەبەست پێی هەردووکیان بێ، بەڵام ڕام وایە، زیاتر مەبەست پێی ئازارو سزای دنیایی بێ، چونکە دوایی خوا ﷻ باسی سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی دەکات.

﴿عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ﴾، سووڕانی خراپ، بازنەی خراپ، هەر لەسەر ئەوان بێ، کە لێرەدا بازنە و سووڕانی خراپ، مەبەست پێی ڕووداو و بەڵایەکە کە دێ، لەسەر

سەری خەڵک دەسووڕێ و دادەبەزێتە سەریان، ﴿ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، خواش لێیان تووڕە بووە، ﴿ وَلَعَنَهُمۡ ﴾، نەفرینیشی لێکردوون و دووری خستوونەوە لە بەزەیی خۆی، ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا ﴾، هەروەها دۆزەخی بۆ داناون و، خراپترین سەرەنجامیش دۆزەخە.

﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، سەربازەکانی ئاسمانەکان و زەوییش تەنیا هی خوان، هەموویان لە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خوای پەروەردگاردان، بۆ خۆشی دروستیکردوون و هەر خۆشی بەکاریان دێنێ بۆ ئەو مەبەستانەی بە چاکیان دەزانێ، یەکێک لەو مەبەستانەش دڵ بەهێزکردنی بڕوادارانە، بە هۆی ئیلهام و خورپەی فریشتەکانەوە کە دەیخەنە دڵی بڕوادارانەوە، هەروەها تێشکانی دوژمنان و ناحەزانی ئیسلامە، بە هاوبەش بۆ خوا دانەرو بە خاوەن کتێب و بە دەغەڵەکان و نێرو مێیانەوە، بە هۆی ئەو ترس و لەرزەوە کە فریشتەکان دەیخەنە دڵ و دەروونیانەوە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، هەمیشەش خوا باڵادەستی کاربەجێ بووە، خاوەنی ئەوپەڕی عیززەت و باڵادەستیی و، ئەو پەڕی لێزانیی و کارزانیی بووە.

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، بە دڵنیایی (ئەی موحەممەد ﷺ!) ئێمە تۆمان ناردوە، شایەد بی، یاخود چاودێر بی بەسەریانەوە، ﴿ وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، هەروەها دڵخۆشکەرو ترسێنەریشیان بی، واتە: موژدەیان پێ بدەی کە ئەگەر فەرمانبەریی خوا بکەن، جێگایان بە هەشتەو، هۆشدارییان پێ بدەی و بیانترسێنی، کە ئەگەر بێ فەرمانیی بکەن و سەرپێچیی بکەن، تووشی سزا دەبن لە دنیاو دواڕۆژدا.

﴿ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴾، هەروەها بۆ ئەوەش ئەی بڕوادارینە! پێغەمبەرمان بە شایەدو موژدەدەرو بە ترسێنەر ناردوە تاکو بڕوا بێنن، بە خوا ﷻ و ڕەوانە کراوەکەی (کە موحەممەدە

ﷺ)، ﴿ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ ﴾، هەروەها پێغەمبەرەکەی ﷺ بەهێز بکەن و پشتی بگرن و هاوکاری بن، ﴿ وَتُوَقِّرُوهُ ﴾، دیسان ڕێزو حورمەتی بگرن و بایەخی پێبدەن، بە سەنگین تەماشای بکەن، بەو شێوەیەی بۆ ئەو شایستەیە، مامەڵەی لەگەڵدا بکەن بەڕێزو حورمەتەوە، ﴿ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾، هەروەها بە پاکی بگرن بەیانیان و ئێواران، واتە: خوا ستاییش بکەن و بە پاکی بگرن، بەیانیان و ئێواران، واتە: لە بەیانی ڕا تاکو ئێوارەو، لە ئێوارە ڕا تاکو بەیانی، یاخود لەو دوو کاتەدا، کە دوو کاتی زۆر گرنگ و هەستیارن.

هەڵبەتە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: هەموویان بۆ خوای پەروەردگار دەچنەوە، واتە: (**تعزير**)و (**توقير**)و (**تسبيح**)ەکە، واتە: خوا سەر بخەن و ڕێزی بگرن و بە پاکی بگرن، وەک خوا لە سووڕەتی (**نوح**)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ ﴾.

بەڵام ئەو ڕایە بەهێزترە، کە (**تَعزِير وتَوقِير**) بۆ پێغەمبەر ﷺ بچنەوە، واتە: پشتگرتن و ڕێز گرتن، بەڵام بە پاک گرتنەکە، بێگومان لە هەموو قورئاندا (تسبيح) تەنیا بۆ خوا بەکارهاتووە.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ ئاماژە دەکات بەو پەیمانەی کە دواتر ناوی بە: (**بَيْعَةُ الرِّضْوَان**)، (پەیمانی ڕەزامەندیی) ڕۆیشت کە لە ژێر درەختێک دا، پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ بڕواداراندا بەست، کە دوای باسی دەکەین و پێشتریش هەر قسەمان لێ کردوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی پەیمان لەگەڵ تۆدا دەبەستن، تەنیا پەیمان لەگەڵ خوادا دەبەستن، ﴿ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾، دەستی خوا بەسەر دەستی ئەوانەوەیە، دەستی خوا لە سەرووی دەستی وانەوەیە، ﴿ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِ ﴾، ئنجا هەر کەسێ هەڵیوەشاندەوە، بە زیانی خۆی پەیمان هەڵدەوەشێنێتەوە، ﴿ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ ﴾، هەر کەسێک وەفاداریش بێ بەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستوویەتی

و لەگەڵ پێغەمبەردا بەستوویەتی، بەڵام خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فەرمووی: ئەو پەیمان بەستنە لەگەڵ تۆدا، لەگەڵ خوادایەو، دەستی خوا لەسەر دەستی ئەوانەوەیە، هەر کەسێ وەفادار بێ بەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستوویەتی، ﴿فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾، بە دڵنیایی (خوا) پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە، خوێندراویشەتەوە: (**فَسَنُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيْماً**)، بە دڵنیایی پاداشتێکی مەزنی دەدەینەوە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**خوا ﷻ سەركەوتنێكی ئاشكراو بەرچاوی، بەهۆی ڕێككەوتنی حودەیبییەوە بۆ پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ ڕەخساند، تاكو سەرەنجام ببێتە هۆكاری لێبوردنی لە گوناهە ڕابردوو و داهاتووەكانی و، چاكە لەسەر تەواوكرانی و، ڕاستە ڕێ پێگیرانی و، سەرخرانی بە شێوەیەكی باڵادەستانەی دوور لە شكست و دۆڕان[1]:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ١ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ٢ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ٣﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە سەركەوتنێكی ڕوون و ئاشكرامان بۆ تۆ ڕەخساند، پێشتر باسمان كرد، كە (فتح): بریتیە لە كردنەوەی دەرگایەک، یاخود عەمبارێک، یاخود چارەسەركردنی گرفتێک و كێشەیەک، وەک لە قوڕئاندا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا

---

(١) پێشتر پانتاییەكی زۆرمان تەرخانكردوە بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی صوڵحی حودەیبییە، لەبەر ڕۆشنایی كتێبە ناودارەكەی: (السيره النبويه لابن هشام)دا، كە ئەویش هەم لە (إبن إسحاق)ەوە، قسەكان دێنێ، هەم خۆشی قسەی خۆی دەخاتە سەر، بەڵام وێڕای ئەو كتێبەی: (إبن هشام)، بەسەرهاتی صوڵحیی حودەیبییە لە صەحیحی بوخارییدا، بە ژمارە: (٢٧٣١)و (٢٧٣٢)ش هاتوە، هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا بە ژمارە: (١٨٠٧) هاتوەو، لە (مسنِد) ئیمام ئەحمەد لە بەرگی (٤)، لاپەڕە: (٨٦ و ٨٧)دا هاتوە، هەروەها (النسائي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا بە ژمارە: (٥٣١) هێناویەتی و، غەیری ئەوانیش، هەروەها لەو كتێبانەی هاوچەرخیشن: (الإستيعاب في بيان الأسباب)، بەرگی (٣)، لاپەڕە: (٢٣٥ - ٢٤٠)، هەموو ئەو گێڕدراوەو ڕیوایەتانەی كە پەیوەستن بەو ڕووداوەوە، هێناونی.

﴿تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ ﴿٤٠﴾﴾ **الأعراف**، دەروازەو دەرگایەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێنەوە، بۆ ڕووحی تاوانباران، هەروەها وشەی (**فَتْح**) بۆ سەرکەوتنیش بەکاردەهێنرێ و، بۆ بابای جەنگاوەر کە دەچێتە شارو وڵاتی لایەنی بەرانبەریەوە، چونکە ئەویش کاتێک دەچێتە نێو ئەو شارو وڵات و ئاوەدانییەوە، وەک ئەوە وایە کە دەرگاو دەروازەیەکی کردبێتەوە، یان عەمبارێک، دەرگایەکەی کردبێتەوە، بۆیەش وشەی (**فَتْح**) زۆر جار بۆ سەرکەوتن بەکارهێنراوە، چونکە وشەی: (**نصر**) لە ئەنجامی جەنگدا دێتە دی، دەگوترێ: (**قَاتَلَ فُلَانٌ فُلَاناً، فَانْتَصر عَلَيْهِ**)، فلانکەس دژی فلانکەس جەنگاو بەسەریدا زاڵبوو، بەڵام (**فَتْح**) مەرج نیە لە ئەنجامی کوشتارو جەنگدا بێ، بۆیە خوا ﷻ ناوی لە صوڵحی حودەیبییە ناوە: (**فَتْح**)، ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾﴾، هەروەها بۆیە ئازادکردنی مەککەش ناوی لێنراوە: (**فَتْح**) فەتحی مەککە، چونکە ئەویش کوشتارێکی وای تێدا نەبوو لە قەدەر مەڵبەندێکی گەورەی وەک: مەککە، بەس وردە شەڕو قوڵە شەڕی تێدابوون، نەک سوپای قوڕەیش بێ بجەنگێ لەگەڵ سوپای ئیسلامدا، بەڵکو هەندێک کەس وەک: عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل، هەندێ قوڵە شەڕیان کردن، ئنجا ئایا لێرەدا بۆچی خوا ﷻ بە جەختکردنەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾﴾، بە دڵنیایی ئێمە سەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرامان بۆ تۆ ڕەخساند؟! لەبەر ئەوەی مسوڵمانان دوو دڵ بوون، ئایا ئەوە سەرکەوتن بووە، یان نا؟ پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە: (**أَوَ هَذَا فَتْح؟**)، ئایا ئەمە سەرکەوتن بوو؟ ئەویش فەرموویەتی: بەڵێ، دوایی خوا ﷻ ئەو سەرکەوتنە کە دەفەرموێ: ﴿وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾﴾، خوا ﷻ دەیکاتە هۆکار بۆ زاڵبوونێکی باڵادەستانە، کە شکستی بە دوادا نەیەتەوە، بەسەر دوژمنەکان دا لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا، بە تایبەتی هۆزی قوڕەیش، واتە: ئەو فەتحە کە صوڵحی حودەیبییەیە، خوا ﷻ کردوویەتی بە هۆکار بۆ ئەو زاڵبوونە کە زاڵبوونێکی باڵا دەستانەیەو، لە ئەنجام و ئاکام دا دێتە دی، هەڵبەتە بەرکار (**مَفْعُول به**)، (**فَتَحْنَا**) قرتێندراوە، چونکە مەبەست جینسی ئەو سەرکەوتنانەیە، نەک سەرکەوتنێکی دیارییکراو، ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾﴾، ئێمە سەرکەوتنمان بۆ تۆ ڕەخساند، سەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرا، نەیفەرمووە سەرکەوتنەکە بەسەر کێداو چۆن؟

تاكو دیاریی نەكرێ و تایبەت نەكرێ بە شتێكی دیارییكراوەوە، ئەم ئایەتە موبارەكانەش زۆر دەشوبهێنە سوورەتی (النصر)ەوە، كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾، كە سوورەتی (النصر) واتە: زاڵبوون، لە دوایی ئازادكرانی مەككە هاتۆتە خوار، وەک خوا پشتیوان بێ، دوایی دەیگەینێ، چونكە ئەوەی مەككە ساڵەهای ساڵ بوو هۆزی قورەیش شەڕو جەنگیان لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان دەكرد، بۆیە كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو شارەكەیانەوە بە سوپایەكەوەو، هەندێ قوڵە شەڕیشیان لە دژ كردن، ئەوان هیچیان بەدەستەوە نەما، ئەوە نەبێ خۆ بە دەستەوە بدەن و تەسلیم بن، بۆیە ناوی لێناوە (نصر)، ئنجا دەفەرموێ: هەر كاتێک زاڵكردنی خواو یارمەتییدانی خوا هات، هەروەها سەركەوتنیشی بەدوادا هات و، خەڵكت بینی پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایین و بەرنامەی خواوە، بە ستاییشكردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرەو، داوای لێبوردنی لێ بكە، بێگومان ئەو زۆر تۆبە وەرگرە، لێرەش دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ﴿١﴾﴾.

٢- ﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾، تاكو خوا لە گوناهی ڕابردوو و دوایەت ببوورێ، (**وَاللَّامُ: لِلتَّعْلِيلِ، أَي إِنَّا فَتَحْنَا فَتْحًا مُبِينًا لِأَجْلِكَ، لِغُفْرَانِ اللَّهِ لَكَ، وَإِتْمَامِ نِعْمَتِهِ عَلَيْكَ، وَجُعِلَتْ مَغْفِرَةُ الله للنبي ﷺ عِلَّةً لِلْفَتْحِ، لِأَنَّهَا مِنْ جُمْلَةِ مَا أَرَادَ اللَّهُ حُصُولَهُ بِسَبَبِ الْفَتْحِ**)، لامەكە بۆ هۆكارە، واتە: بۆیە خوا ﷻ ئەو سەركەوتنە ڕوون و ئاشكرایەی بۆ تۆ هێنایە پێش، تاكو لە گوناهت ببوورێ، گوناهی ڕابردوو و داهاتووت و، چاكەی خۆی لەسەر تۆ تەواو بكات، ئنجا بۆیەش لێبوردنی خوا ﷻ لە پێغەمبەر ﷺ، كراوەتە هۆكاری ئەو سەركەوتنە، چونكە لێبوردنی خوا ﷻ لە پێغەمبەر ﷺ، لە نێو ئەو ئامانجانە دایە، كە خوا ﷻ بە هۆی ئەو سەركەوتنەوە (ئەو پێكهاتنەی حودەیبییەوە) بۆ پێغەمبەری ﷺ دەستەبەر كردوون.

٣- ﴿وَيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ﴾، بۆ ئەوەی خوا ﷻ چاكەی خۆیت لەسەر تەواو بكات، (**إِتْمَامُ النِّعْمَةِ: إِعْطَاءُ مَا لَمْ يَكُنْ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ مِنْ أَنْوَاعِ النِّعْمَةِ، مِثْلَ إِسْلَامِ قُرَيْشٍ، وَخَلَاصِ بِلَادِ**

**الْحِجَازِ كُلِّهَا لِلدُّخُولِ تَحْتَ حُكْمِهِ)**، تەواو كردنی چاكە، بریتیە لەوەی خوا ﷻ ئەوەی پێشتر پێی نەداوە لە جۆرەكانی چاكە، پێی بدات، وەک ئەوە كە هۆزی قورەیش هاتنە نێو ئیسلامەوەو، وڵاتی حیجاز (واتە: نیوە دوورگەی عەرەبیی) هەمووی هاتە ژێر ڕكێف و حوكمی ئیسلامەوە.

هەروەها مونافیقەكان لووتیان شكاو، خاوەن كتێبەكان دڕكیان نەما، ئەوانە هەموویان ئەو چاكانە بوون كە خوا ﷻ لەگەڵ پێغەمبەری خاتەم و مسوڵمانانندا كردنی.

٤- ﴿وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾، بۆ ئەوەی (خوا) بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییت بكات.

**(الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ: مُسْتَعَارٌ لِلدِّينِ الْحَقِّ: أي يَجْعَلَك عَلَى طَرِيق مُسْتَقِيم في كُلِّ أَمْرٍ مِن أُمُورِك)**، بۆ ئەوەی خوا ﷻ تۆ بخاتە سەر ڕێیەكی ڕاست، لە هەموو كارو بارێكتدا، من پێم وایە كە لێرەدا: ﴿وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾، كە لە تەفسیرەكاندا نەمبینیوە ئەوە باس بكرێ - مەبەست ئەوەیە خوا ﷻ بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو پێشهاتەی پێكهاتنی حودەیبییەدا، كە بریتی بوو لەوەی پێغەمبەرو هاوەڵانی: (١٣٠٠ ، ١٤٠٠ ، ١٥٠٠) بە پێی جیاوازیی ڕیوایەتەكان، بە نیەتی عومرەكردن چوون بەرەو مەككەو مزگەوتی حەڕام و كەعبە، بەڵام كافرەكانی قورەیش ڕێیان پێگرتن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەوفیقی خواو، بە ئاسانكاریی خوا، مامەڵەیەكی ڕاست و دروستی لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا كرد، بە پێچەوانەی ڕاوو ئارەزووی زۆربەی هاوەڵانیەوە، كە پێیان وابوو دەبێ لەگەڵیاندا بە شەڕ بێن و، هەر چۆن بووە نەگەڕێنەوەو هەربچن بۆسەردانی كەعبە، ئەگەر شەڕو كوشتاریشی لێكەوتبێتەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێی ئاشتیی هەڵبژاردو، مامەڵەیەكی وای لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا كرد، كە دوایی بە خێرو قازانجێكی زۆر گەورە شكایەوە، هەم بۆ ئیسلام و هەم بۆ مسوڵمانان و، بووە هۆی چاوپێچك لاچوون لەسەر چاوی زۆرێك

لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، بە شێوەیەکی دیکە تەماشای پێغەمبەر ﷺو ئیسلام و هاوەڵانی پێغەمبەریان دەکرد.

بە دڵنیاییش ئەگەر خوا ﷻ تاکو صوڵحی حودەیبییە، نیعمەتەکانی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو نەکردوون و، هەندێک چاکە ماون لەگەڵیدا بکات، بەڵام بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەرەتا تاکو سەرەنجام، هەر لەسەر ڕێی ڕاست بووە، کەواتە: ﴿ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾، واتە: بە تایبەت لەو ڕووداوەداو بۆ مامەڵە کە لەگەڵ ئەو ڕووداوەدا کە دێتە پێش، خوا ڕێنماییت بکات، مامەڵەیەکی ڕاست و دروست بکەی و، بە شێوەیەکی سەر ڕاستانە لەگەڵ ئەو ڕووداوەدا مامەڵە بکەی.

٥- ﴿ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴾، هەروەها (سەرەنجام ببێتە هۆی ئەوە کە) خوا ﷻ تۆ بە زاڵبوونێکی باڵادەستانە زاڵ بکات، (**وَصْفُ النَّصْرِ بِالْعَزِيزِ، مَجَازٌ عَقْلِيٌّ وَإِنَّمَا الْعَزِيزُ هُوَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَنْصُورُ**)، لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ ﴾، کە (**نَصر**) زاڵبوون بە (**عزيز**) پێناسە کراوە، ئەمە مەجازێکی عەقڵییە، چونکە لە ڕاستییدا ئەوەی باڵا دەست و زاڵبووە، بریتی بووە لە پێغەمبەر ﷺ، (**وَالْعِزَّةُ: الْمَنَعَةُ، وَالْمَقْصُود بِهِ العِزُّ الَّذِي لَا يعقِبهُ ذُلٌّ**)، عیززەت بە مانای باڵادەستییە کە بەرانبەرەکەت پێت نەوێرێ و لە بەرانبەرتدا دەستە پاچە بێ، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو باڵادەستییەیە، بێ دەستەڵاتیی بەدوادا نایەتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ نَصْرًا عَزِيزًا ﴾، چونکە لە دوای پێکهاتن و ڕێککەوتننامەی حودەیبییەوە، دوژمنانی سەر سەختی پێغەمبەر ﷺ کە لە هۆزی قوڕەیشدا بەرجەستە بوون، جارێکی دیکە نەیانتوانی بە شێوەیەک زیان بە پێغەمبەر ﷺو ئیسلام و مسوڵمانان بگەیەنن، ئێشیان پێبگات، واتە: خوا ﷻ وای زاڵکرد، جارێکی دیکە بێ دەستەڵاتیی و تێکشکانی بەسەردا نەیەتەوە، ئەگەرنا بۆ وێنە: لە جەنگی بەدردا سەرکەوتن، بەڵام لە جەنگی ئوحوددا تێکشکان و، لە جەنگی حوونەین و لە جەنگی ئەحزاب دا مسوڵمانان زۆر سەغڵەت بوون و، لە جەنگی حونەیندا سەرەتاکەی مسوڵمانان سەرکەوتن، بەڵام لە دوایی دا تێکشکان و، لە کۆتایی دا سەرکەوتنەوە.

## سەرنجێک لە بارەی لێبوردرانی گوناهی پێغەمبەرەوە ﷺ

پێشتریش بەڵێنماندا بوو کە ئێمە دواتر زیاتر تیشک دەخەینە سەر چەمک و واتای: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾، کە دەفەرموێ: بۆ ئەوەی خوا لەو گوناهەت کە تێپەڕیوەو ئەوەی دواکەوتوە، ببووڕێ.

مەبەست لە (ذنب) بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە لێرەدا هاتوە، هەروەها لە سووڕەتی (**محمد**)یشدا: ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ ١٩﴾، هاتوە، مەبەست پێی گوناهو خراپەو سەرپێچیی نیە، بەو چەمک و واتایەی بۆ ئێمە زاندراوە، چونکە پێغەمبەر (محمد) ﷺو، سەرجەم پێغەمبەران لە گوناهو خراپەو لە سەرپێچیی و تاوان پارێزراون، چونکە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**)، سەر مەشقی خەڵکن، ئنجا ئەگەر پێغەمبەر لە هەڵەو لادان و گوناهو تاوان پارێزراو نەبێ، خەڵکێک ببینێ ئەو پێغەمبەرە ﷺ گوناهو تاوان دەکات، متمانەی پێی نامێنێ، کەواتە: چۆن بیکاتە سەر مەشق!

### ئەدی مەبەست لە (ذنب) چییە؟

مەبەست پێی جۆرێک لە هەڵسوکەوتکردنی پێغەمبەرە ﷺ کە نیشانەی تێدا نەپێکاوە، وەک ئەوەی ڕایەکی بوو بێ، نەیپێکا بێ، بۆ وێنە:

**١-** لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، کە بە لای هەندێک لە هاوەڵانیدا تێدەپەڕێ، دارخورما موتوربە دەکەن، تۆوی نێرەکە دەبەن بۆ مێیەکە، موسلیم بە سێ ڕیوایەت هێناویەتی[1]:

لە ڕیوایەتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێم وایە، ئەگەر واش نەکەن، زیانی نابێ، واتە: دەستی لێ هەڵبگرن و خۆتان ئەزیەت مەدەن، کە تۆوی نێرەکە

---

(١) صحيح مسلم: ٢٣٦١ و ٢٣٦٢ و ٢٣٦٣

بەرن بۆ مێیەکە، ئەوانیش دەستیان لێ هەڵگرت، دوایی ئەوە بوو دارخورمایەکان بەریان نەگرت، کە چوونەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەس ڕاو بۆچوونێکی خۆم بوو، ئەگەر شتێکم بە ناوی خواوە پێ گوتن، وەک وەحیی لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم وەک بۆچوونی خۆم پێگوتن: **(أَنْتُم أَعْلَم بِأَمْرِ دُنْيَاكُم)**، ئێوە لە کاروباری دنیاتاندا، شارەزاترن.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ دەگونجێ لە بۆچوونێکی دنیاییدا نەیپێکابێ، بۆچوونێکی دنیایی کە حوکمێکی شەرعیی پێوە پەیوەست نیە، کە بەشێک بێ لە دین، یاخود لە ڕێی وەحییەوە نەبێ، نەزانرێ.

**٢-** هەروەها لە ڕووی کردەییەوە، دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەنگاوێکی نابێ و، ویستبێتی کارێک بکات، بەڵام لەو کارەدا نەیپێکابێ، نەک لەبەر ئەوەی گوناهەو خراپەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەوە باشتر هەیە، بۆ وێنە: لە جەنگی بەدردا کە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ سوپاپایەکەی خۆی لە شوێنێک بارگەو بنە بخات و دابمەزرێنێ کە گونجاو نەبووە، **(الحبَّابِ بن المنذر)** پرسیاری لێ دەکات: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا ئەمە فەرمانی خوایەو وەحیی خوایە؟ یاخود بۆچوونی خۆتەو تاکتیکی جەنگییە؟

کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بۆچوونی خۆمەو تاکتیکی جەنگییە، **(الحباب)** دەڵێ: ئێرە باش نیە، با بچینە سەرووتر، ئەو چاڵاوانەی هەن، پڕیان دەکەینەوەو گۆلاوێکی گەورە دروست دەکەین، ئێمە ئاومان دەبێ دوژمنەکانمان ئاویان نابێ، پاشان ئەو شوێنەی بۆی دەچین زوورکەڵێنە و پێمان پێیەوە دەچەسپێ، بەڵام ئێرە گوملاییەو ئاوی تێدا دەوەستێ و دەبێتە قوڕو لە قوڕێ دەچەقین، کە پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەی حەبباب دەبیستێ، یەکسەر دەفەرموێ: **(لقد أشرت بالرأي)**[1]، ڕای ڕاست ئەوەیە کە گوتت، یەکسەر ڕایەکەی خۆی دەگۆڕێ، واتە: ئەو هەنگاوە کردەییەی ناویەتی، دەیگۆڕێ.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص ٢٣٦

٣- هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدردا، کافرەکانی بە دیل گرتن، خوای کارزانیش ڕەخنەی لێ گرت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾﴾ **الأنفال**، هیچ پێغەمبەرێک بۆی نیە، دیلی هەبن، تاکو کوشتاری زۆر نەکات لە زەویدا، واتە: تاکو دوژمنەکانی لە پەل و پۆ نەخات.

نەک بە دیلیی بیانکوژێ، چونکە دیل ناکوژرێ، بەڵام بە تەماعی ئەوەی پارەیان لە بەرانبەردا لێ وەربگرن، نابێ بەدیلیان بگرن، لە یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەدا، لەوێش خوای میهرەبان ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێ، لەسەر هەنگاوێکی کە بە بۆچوونی خۆی پێی وابووە شتێکی باشە، بەڵام باش نەبووە، بەڵام بێگومان ئەوە بە گوناهـ لە قەڵەم نادرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانێکی خوای لەبەر دەستدا نەبووە، ئەویش سەرپێچیی لێ کردبێ، بەڵکو بە بۆچوونی خۆی ئەو هەنگاوەی ناوە.

٤- هەروەها مۆڵەتدانی بە ئەوانەی داوای مۆڵەتیان کرد، لە جەنگی (تەبووک)دا: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾ **التوبة**، واتە: خوا ﷻ لێت ببوورێ بۆچی مۆڵەتت دان (نە دەبوو مۆڵەتت دابان)، تاکو ئەوانەی ڕاست دەکەن و پاساوێکی ڕاستەقینەیان هەیە، ئەوانەت بۆ دەربکەوێ، لە ئەوانەی درۆزنن.

٥- هەروەها لە هەڵوێستەکەی لەگەڵ (**عبدالله بن أم مكتوم**)دا، کە بابایەکی کوێر بوو ؓ، هات پرسیاری لە پێغەمبەر کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو کاتەدا سەرگەرم و سەرقاڵیی قسە کردن بوو لەگەڵ کۆمەڵێک لە زلە زلانی قوڕەیش داو، ڕووی لێوەرچەرخاند و، ڕووی لێ گرژ کرد، بەو واتایەی جارێ کاتی ئەوە نیە، ئەویش لەبەر ئەوەی کوێر بوو، نەیبینی و دەبێ نەیزانیبێ کە ئەوە لە کۆڕو مەجلیسێک دا دانیشتوەو گوێیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گرتوە، خەریکی بانگەواز کردنیانە، خوا ﷻ لەو بارەوە لۆمەی کردو فەرمووی:

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾
أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ

﴿ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ ﴾ عبس. لەوێش خوا ﷻ ڕەخنە دەگرێ لە پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: ڕووی خۆی گرژ کردو ڕووی وەرچەرخاند، کاتێک کە کوێرەکە هات بۆ لای، تاکو کۆتایی ئایەتەکان.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕووداوەشدا، ئیجتیهادو کۆششی کردووەو پێی وابووە باشتر وایە قسە لەگەڵ ئەو زلە زلانەدا بکات، بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات، بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم، دوایی دەرفەت هەر هەیە، کە ئەوەی خوا ﷻ لە وەحیی دیکە، دایبەزاندوە، پێی ڕابگەیەنێ، کە بۆ ئەوە هاتبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا ﷻ چیدیکەی دابەزاندوە، پێم ڕابگەیەنی؟ ئنجا ئەوەی پتر تیشکمان بۆ دەخاتە سەر ئەو مەسەلەیە فەرمایشتێکی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: {**إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ**} (**أخرجه أحمد: ١٧٨٨١، ومسلم: ٢٧٠٢، وأبو داود: ١٥١٥، وابن حبان: ٩٣١**)، واتە: تەمم بەسەر دڵدا دادێ، تاکو من ڕۆژێ سەد جاران داوای لێبوردن لە خوا دەکەم!

وەک زانایان گوتوویانە: (**غَین**) لە (**لَیغان**)دا بەبێ ئاگایی و غافڵ بوون لە یادی خوا لە قەڵەمدراوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە چاو مەقامی بەرزی، دەبووایە هەمیشە خوای پەروەردگاری لە یاد بێ، ئنجا ئەو جار جار بێئاگا بوونەی خۆی لە یادی خوای، بە تەم هاتنە سەر دڵ، لە قەڵەم داوەو، داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، کە دیارە گوناهـ نیە، بەڵام لە چاو پێگەو پایەی بەرزی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەم و کوڕیی داناوە، بۆیە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردوە.

کەواتە: مەبەست لە گوناهی پێغەمبەر ﷺ یانی: لە چاو پێگەو پایەی بەرزی پێغەمبەر ﷺ وشەی: (**ذنب**)ی بۆ بە کاردێ، گوناح، بەڵام ئەو گوناهانە بە خراپە لە قەڵەم نادرێن، بۆیە بۆ هی مسوڵمانان فەرموویەتی: ﴿ وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾، خراپەکانیان لێ بسڕێتەوە، بەڵام بۆ پێغەمبەر ﷺ بە خراپە لە قەڵەم

نادرێ، بەڵكو تەنیا جۆرێكە لە كەم و كوڕیی و، جۆرێكە لە هەڵەو ناتەواویی و، لە قەدەر پێگەو پایەی بەرزی پێغەمبەر ﷺ بە ناتەواویی لە قەڵەم دەدرێ، ئنجا لەم مەقامەدایە، زانایانی ئەهلی تەزكیەو تەصەووف، گوتوویانە: (**حَسَنَاتُ الْأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِيْن**)، چاكەكانی چاكان، خراپەكانی زۆر لە خوا نیزیكانن، واتە: ئەوەی بۆ چاكە كاران بە چاكە لە قەڵەم دەدرێ، بۆ زۆر لە خوا نیزیكان، بە خراپە قەڵەم دەدرێ.

هەروەک پێغەمبەر ﷺ عەرەبێكی خێڵەكیی بیابانشین هاتوە بۆ خزمەتی و گوتوویەتی: ئەی موحەممەد! خوا ﷻ چی لەسەر فەرز كردووین؟ ئەویش پێی ڕاگەیاندوە كە شەوو ڕۆژێ پێنج نوێژ، ئنجا زەكات و ڕۆژوو حەج، گوتوویەتی چیدیكە؟ فەرموویەتی: هیچی دیكە مەگەر خۆبەخشانە زیادە بكەی، ئەویش گوتوویەتی: نەلێی كەم دەكەم و، نە لێی زیاد دەكەم و ڕۆیشتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ڕاست بكات دەچێتە بەهەشت، بۆ ئەو، ئەوەندەی داناوە، بەڵام فەرمووشیەتی: {**نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فَكَانَ، بَعْدُ، لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إلاَّ قَلِيْلاً**} (**أخرجه البخاري: ١١٠٥، ومسلم: ٢٤٧٩**)، واتە: عەبدوڵڵا باشترین پیاوە، ئەگەر شەو نوێژان بكات، دوای ئەوە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر نەدەخەوت لە شەودا، مەگەر كەمێك.

یانی: بۆ عەبدوڵڵا ئەوەندە بەس نیە، فەڕزەكان بكات، بەڵكو دەبێ شەو نوێژیش بكات، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ ببێتە باشترین پیاو، بەڵام ئەوی دیكە هەر ئەوەندەی بەس بووە كە فەڕزەكان بكات، چونكە بۆ ئەو گرنگە بچێتە بەهەشت، بەڵام عەبدوڵڵای كوڕی عومەر، تەنیا بەچوونە بە هەشت ئیكتیفای نەكردوە، پێغەمبەر ﷺ پلەی باشتری بۆ ئەو ڕەچاو كردوە، بۆیە ئەركیشی قورستر بووە.

مەسەلەی دووەم:

هەروەها خوا ﷻ ئۆخژن و ئۆقرەی دابەزاندە نێو دڵی بڕواداران، تاکو بڕوایان پتەوتر بێ و سەرەنجام دوای پاککردنەوەیان لە خراپەکانیان، بیانخاتە بەهەشتانێکی جۆگەو ڕووبار بەژێردا ڕۆیشتوو، لە بەرانبەریشدا بێبڕوایان بە هەردوو جۆری مونافیق و هاوبەشدانەر، بە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێوە، سزا بدات لەسەر کوفرو شیرک و گومانی خراپیان بەرانبەر بە خوا، هەروەها بەڵای خراپیان لەسەر بسووڕێ و، تووڕەیی و نەفرینیان بخاتە سەرو، بیانخاتە دۆزەخەوەو، بێگومان خواش کە خاوەنی تیکڕای سەربازەکانی ئاسمانەکان و زەوییە، ئەوپەڕی باڵادەستیی هەیەو، هیچ کەس و هیچ شتێک لێی عاسێ نابێ:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقَـٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَـٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە، ئۆخژن و ئۆقرەیی دابەزاندە سەر دڵی بڕواداران، (**السَّكِينَةُ: السُّكُونُ والطُّمَأْنِينَة وَالرَّزَانَةُ وَالوَقَار**)، بە هەموو ئەو واتایانەو واتا کراوە، واتە: ئۆقرەیی و هێمنیی و، دامەزراویی و ئۆخژن.

٢)- ﴿ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ﴾، تاکو وێڕای ئیمانەکەیان، ئیمانی دیکەش زیاد بکەن، ئیمان کەم دەکات و زیاد دەکات، بە چاکەو طاعەت زیاد دەکات و، بە گوناهو تاوان کەم دەکات، دەشگونجێ لێرەدا مەبەست لە ئیمان، دڵنیایی بێ، واتە: دڵنیاییەکەیان

بەهێزتر بێ، (**لِيَزْدَادُوا يَقِيْنَاً إلى يَقِينِهِم، وَلِيَزْدَادوا طُمَأْنِينَةً إلى طُمَأْنِينَتِهِم**)، واتە: دڵنیایی بۆ گەڵ دڵنیاییان و، ئۆخژن و ئۆقرەیی بۆ گەڵ ئۆخژن و ئۆقرەییان زیاد بکەن، ئیمان پلە پلەیە، وەک پەیژەیەک چۆن مرۆڤ بە پەیژەیەکدا سەردەکەوێ، ئیمانیش پلە پلەیەو بەرزترین جۆری ئیمان، ئیمانی پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، کە وەک ئیمانی فریشتەکانە، بەڵکو لە هی ئەوانیش باشترە، چونکە فریشتەکان خوا وای خوڵقاندوون کە خاوەنی ئیمان بن، بەڵام پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) خۆیان ماندوو کردوەو کۆششیان کردوە، بەڵێ خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوون، بەڵام دوایی خۆیان زۆر ماندوو کردوە، بە بەندایەتیی کردن بۆ خوا، تاکو لە ئاستی ئەو پلەو پێگە بەرزەدا بن، کە خوای بەرز بەوانی داوە، دوایی بڕوای ئیماندارانیش هەر کەسە لە قەدەر خۆی.

٣)- ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، سەربازەکانی ئاسمانەکان و زەوییش هەموویان تەنیا هی خوان، هەموویان لەبەر دەستی ئەودان.

٤)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، بە دڵنیایی هەمیشەو هەردەم خوا زانای کارزان بووە، زانا بووە بە هەموو شتێک و، کارزان بووە، لە هەموو کارەکانیدا.

شـــایانـی باســـە:

ئیـمان لـە دوو ڕێـی سـەرەکییەوە زیـاد دەکات: لـە ڕووی عیلمییـەوەو، لـە ڕووی عەمەلییـەوە.

**یەکەم:** لە ڕووی عیلمییەوە، مرۆڤ تاکو ئەو هەقەی خوا دایبەزاندوە کە لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە، پێی ئاشناتر بێ و زیاتر لێی وردبێتەوەو پتر تێیڕامێنێ و لێی تێ بگات، ئیمانی بە هێزترو پتەوتر دەبێ.

**دووەم:** هەتا پابەندیشی بە بەرنامەی خواوە زیاتر بێ و، کردەوەی چاکی زیاتر بێ و بەندایەتیی بۆ خوا باشتر بێ، بە کردەوەش ئیمانی زیاتر دەبێ.

لـە سـەرەتای سـوورەتی (**الأنفـال**)دا، خـوا ﷻ ئامـاژە بـە هـەر کام لـەو دوو هـۆکارە دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ

ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: بڕواداران ئەوانەن کاتێک یادی خوا کرا، دڵیان ڕابچڵەکێ و، کاتێک ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێندرانەوە، ئیمانیان زیاد دەکات و پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و لەوەی کردوومانەتە ڕۆزییان دەبەخشن..

لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا، خوا ﷻ باسی هەڵوێستی بڕواداران دەکات، کە دەبێتە هۆی ئیمان زیاد بوونیان، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾، واتە: ئەوانەی خەڵک پێیان گوتن: خەڵک (واتە: دوژمنانتان) بۆتان کۆبوونەوە لێیان بترسێن، سام و هەیبەتتان بەرانبەریان هەبێ، بەڵام ئەو هەڕەشەیە ئیمانی زیاد کردن، واتە: لەو مەیدانەدا کە بە کردەوە بوون و ئەو هەڕەشەیان بیست، ئیمانی زیاد کردن.

کەواتە: ئیمان هەم بە کردەوە زیاد دەکات، هەم بە بەرچاو ڕوونیی و شارەزایی زیاتر لە بارەی ئەو هەقەوە کە خوا ﷻ دایبەزاندوە.

٥- ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، {بۆیە (خوا ﷻ)، ئەو ئارامیی و ئۆخژن و ئۆقرەییەی دابەزاندۆتە نێو دڵی بڕواداران]، تاکو سەرەنجام [بڕواداران باش بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، شایستەی ئەوە بن (خوا)}، بیانخاتە بەهەشتانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، دەشگونجێ (ل)ی (لِيُدْخِلَ)، پەیوەست بێتەوە بە: ﴿لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾، یانی: لە ئەنجامی ئیمان زیاد بووندا، شایستەی ئەوە بن، خوا بیانخاتە نێو بەهەشتەکانی خۆیەوە.

٦- ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، کە بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە.

٧- ﴿ وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، هەروەها خراپەكانیان لێ بسڕێتەوەو خاوێنیان بكاتەوە.

٨- ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ ﴾، ئەوەش لە لای خوا بردنەوەو بەمراد گەیشتنێكی زۆر مەزن بووە، (**الفَوْزُ: مَصْدَرٌ، وَهُوَ الظَّفَرُ بِالْخَيْرِ وَالنَّجَاحِ، مَعَ حُصُولِ السَّلَامَةِ**)، (**فَوز**): چاوگە مەبەست پێی سەركەوتن و بە ئامانج گەیشتنە و، دەست گەیاندنە خێرو چاكەیە، لەگەڵ سەلامەتییشدا، هەندێ لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، ئەمە خستنە نێوێكی تایبەتە، (**إِدْخَال خَاص**)، كە بریتیە لەوەی خوا ﷻ دەیانخاتە ئەو پێگەو جێگەو ڕێگایانەوە كە بۆ تێكۆشەرانی ڕێی خوا دانراون، دوای ئەوەی چوونە بەهەشتێ لەگەڵ مسوڵماناندا بەگشتیی، بە تایبەتییش خوا ﷻ جەنگاوەران و تێكۆشەران دەباتە ئەو پلە بەرزانەوە، كە بە تایبەت بۆی داناون، لە نێو بەهەشتدا، وەک لە سووڕەتی (**النساء**)دا، خوا ﷻ باسیكردوە، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ....﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ... ﴿٩٦﴾ ﴾، كەواتە: تێكۆشەرانی ڕێی خوا لە نێو بەهەشتییاندا، پلەو پایەی بەرزتریان هەیە، بۆیە زانایان گوتوویانە: ئەمە لێرەدا خستنە نێوێكی تایبەتە، خستنە نێو ئەو پێگەو پایە بەرزانەیە، كە بۆ تێكۆشەرانی ڕێی خوا داندراون.

٩- ﴿ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی (خوا) پیاوانی مونافیق و، ئافرەتانی مونافیق و پیاوانی هاوبەشدانەرو ئافرەتانی هاوبەشدانەر، سزا بدات و ئەشكەنجە بدات.

١٠- ﴿ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ﴾، گومانی خراپ بە خوا بەران.

پێشتریش گوتمان: ئەو سزاو ئازارە، دەگونجێ مەبەست پێی سزاو ئازاری دنیایی بێ، واتە: ئەوانەیان كە كوفری خۆیان ئیعلان دەكەن و، سەنگەر لە ئیسلام و مسوڵمانان دەگرن، مسوڵمانان لەگەڵیان بەشەڕ دێن و جەنگیان لە دژ دەكەن و، دەكوژرێن و، بریندار دەبن و، تووشی ئازار دێن.

هەروەها ئەوانەیان کە کوفری خۆیان ئاشکرا ناکەن، وەک مونافیقەکان، ئەوانەش هەمیشە ئازارو ئەشکەنجەیەکی دەروونییان هەیە، کە دەبینن ڕۆژ بە ڕۆژ ئیسلام و مسوڵمانان لە سەرکەوتندان و لە گەشەکردندان، گلۆڵەی ئەوانیش ڕۆژ بە ڕۆژ دەکەوێتە لێژییەوە، بۆ ئەوان دەبێتە ئازارێکی دەروونیی و، مایەی خەفەت و نارەحەتیی.

﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ﴾، واتە: گومانی خراپبەران بە خوا، (السَّوء): خوێنراویشەتەوە: (السُّوء)، (ظَنَّ السُّوء)، هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (السَّوءْ) و (السُّوءْ) واتایان هەریەکە، وەک: (کَره)و (کُره)، واتە: نارەحەتیی، یان شتێک کە مرۆڤ پێی ناخۆشە، (سَوء) یان (سُوء)، یانی: نا خۆشویستراو، پێچەوانەی (سرور) ە، واتە: دڵخۆشیی و شادمانیی، کەواتە: (سُوء) یانی: دڵنارەحەتیی، هەندێکیش گوتوویانە: (سَوء) چاوگە، بەڵام (سُوء) بریتیە لە ناوی چاوگ.

١١- ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، سووڕی خراپیان لەسەرە، (دَائِرَة)، وەک گوتمان: بازنەیەکە بە دەوری چەقێکدا، کە لێرەدا مەبەست پێی بەڵایە، وەک چۆن شتێک دێ، دەسووڕێ دوایی دەکەوێتە سەر کەسێک، بەڵای خراپ لەسەر ئەوان بێ، ﴿دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، واتە: ئەو بەڵایەی کە تایبەتە بە خراپەوەو هەمیشە لەگەڵ خراپەدایە، لەسەر ئەوان.

١٢- ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾، خواش ﷻ لێیان تووڕە بووە، ئەمە دەگونجێ تووک بێ لێیان بکرێ، دەشگونجێ هەڕەشە بێ لێیان بکرێ، واتە: خوا لێیان تووڕە دەبێ، یان: خوا لێیان تووڕە بێ.

١٣- ﴿وَلَعَنَهُمۡ﴾، نەفرینیان لێ بکات، دیسان (لَعَنَهُمْ)یش، دەگونجێ تووک و نزای خراپ بێ لێیان بکرێ، دەشگونجێ هەڕەشە بێ و هەواڵدان بێ بە هەڕەشە، یانی: خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون.

١٤- ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا ٦﴾، دۆزەخی بۆ سازو ئامادە کردوون کە خراپترین سەرەنجامە.

١٥- ﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، سەربازەكانی ئاسمانەكان و زەوییش هی خوان.

١٦- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، خوا باڵادەستی كارزانە، پێشێ فەرمووی: ﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ ﴾، سەربازەكانی ئاسمانەكان و زەوی هەموویان هی خوان و، خواش زانای كارزانە، زانایە ئەو سەربازانە كەی و بۆ كێ دەخاتە كار، كە دڵیان خۆش بكات و بەهێز بكات.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، خوا باڵادەستەو كارزانیشە، بە عیززەتی خۆی مامەڵە دەكات لەگەڵ دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام و مسوڵمانانداو تێكیان دەشكێنێ، ئەگەر سەرنج بدەین خوا ﷻ بۆ ئیمانداران چوار مژدەو دڵخۆشیی باسكردوون:

**یەكەم:** (**إدْخَالُهُم الجَنَّة**) دەیانخاتە بەهەشت.

**دووەم:** (**خُلُوْدهُم فِيْهَا**) لە بەهەشت دا هەر ماو دەبن.

**سێیەم:** (**تَكْفِيْر السَّيِّئَات**) خراپەكانیان لێ دەسڕێتەوە.

**چوارەم:** (**الفَوز العَظِيْم**) بە مراد گەیشتن و بە ئاوات گەیشتنی گەورەیان بۆ دەڕەخسێنێ.

هەروەها بۆ مونافیقەكان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، بە نێرو مێیەوە بۆ ئەوانیش چوار جۆرە سزای بۆ ڕەخساندوون، كە بریتین لە:

١- ئازارو سزادانیان.

٢- لێ تووڕە بوونیان.

٣- نەفرین لێكردنیان.

٤- دۆزەخ بۆ ئامادەكردنیان.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئەركی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە كە شایەد بێ بەسەر خەڵكەوە بە گشتیی و بڕواداران بە تایبەتی و، موژدەدەرو ترسێنەر بێ، ئەركی خەڵكیش ئەوەیە بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەكەی بێنن و، پشتی پێغەمبەر ﷺ بگرن و ڕێزی بگرن، بەیانیان و ئێوارانیش پاكیی و بەرزیی خوا ڕابگەیەنن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾، بێگومان تۆمان بە چاودێرو مووژدەدەرو ترسێنەر ناردوە، ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ (إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا) بە دڵنیایی ئێمە تۆمان ڕەوانە كردوە، شایەدبی، گەواهیدەربی، ﴿وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾، دڵخۆشكەرو موژدەدەرو ترسێنەرو وریاكەرەوە بی، بۆ خەڵك و مرۆڤایەتیی بە گشتیی، بەڵام لە نێو مرۆڤایەتییدا بە تایبەت بۆ شوێنكەوتووانی و بۆ ئۆممەتەكەی، وشەی: (شَاهِدَاً)، (فَالشَّاهِدُ: الْمُخْبِرُ بِتَصْدِيقِ أَحَدٍ أَوْ تَكْذِيبِهِ فِيمَا ادَّعَاهُ، أَوِ ادُّعِيَ بِهِ عَلَيْهِ، أَي: أَرْسَلْنَاكَ فِي حَالِ أَنَّكَ تَشْهَدُ عَلَى الْأُمَّةِ بِالتَّبْلِيغِ)، (شَاهِدْ) واتە: هەواڵدەری بە ڕاست دانانی یاخود بە درۆدانانی كەسێك، لەوەدا كە داوای دەكات و لاف لێدەدات، واتە: ئێمە تۆمان ناردوە لە حاڵێكدا كە تۆ شایەدیی دەدەی لەسەر مرۆڤایەتیی یاخود لەسەر ئۆممەت.

﴿وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾، (مُبَشِّراً)، دڵخۆشكەر، یاخود موژدەدەر، واتە: ئەوانەی كە فەرمانبەرن بۆ خوا ﷻ و، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و گوێڕایەڵن، موژدەیان پێ دەدەی لە دنیادا، بە بەختەوەریی و ژیانێكی ڕاست و دروست و پاك و چاكی مرۆڤانە و، لە دوارۆژیشدا بە بەهەشت و ڕەزامەندیی خوا، (نَذِيراً)، ترسێنەرو وریاكەرەوەشی بۆ كەسانێك كە لامل دەبن و سەرپێچییكارن، كە لە دنیادا

تووشـی مەینەتیـی و نارەحەتیـی و ژیـن تاڵیـی دەبـن و، لـە دوارۆژیشـدا تووشـی سـزاو جەزرەبـەی خـوای دادگـەر دەبـن، ئـەوە ئەرکـی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ.

### ئەدی ئەرکی ئۆممەت و ئەرکی شوێنکەوتوانی چییە؟

٢- ﴿لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، (تۆمان ناردوە، ئەی موحەممەد! ﷺ)، تاکو ئێوە ئەی بڕوادارینە، ئەی ئۆممەت و شوێنکەوتوانی موحەممەد! بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و، بەهێزی بکەن و پشتی بگرن و، ڕێزو حورمەتی بگرن.

(**لِتُؤمِنُوا**)، خوێندراویشـەتەوە: (**لِيُؤمِنـوا**) بـۆ ئـەوەی بـڕواداران و شـوێنکەوتووانت، بـڕوا بێنـن بـە خـواو ڕەوانەکـراوی خـوا.

﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، پشـتی پێغەمبـەر ﷺ بگـرن و بـە هێـزی بکـەن، (**وَتُوَقِّرُوه**)، ڕێـزی بگـرن و، بـە حورمـەت و قـەدرەوە مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـەن، هەردووکیشـیان خوێنراونـەوە: (**وَيُعَزِّرُوهُ وَيُوَقِّرُوهُ**)، بـۆ ئـەوەی بـڕواداران پشـتی پێغەمبـەر ﷺ بگـرن، بـە هێـزی بکـەن و هـاوکاری بـن، هەروەهـا ڕێـز و حورمـەتی بگـرن.

٣- ﴿وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾، هەروەها خواش ﷻ بەیانیان و ئێواران بە پاک بگرن، خوێنراویشەتەوە: (**وَيُسَبِّحُوهُ**)، بڕوادارانێک کە شوێنت کەوتوون، ئەی موحەممەد! ﷺ، خوای پەروەردگار بە پاک بگرن بەیانیان و ئێواران.

ئەگـەر بـە (**تُؤمِنوا**) بخوێندرێتـەوە، واتـە: ئەی موحەممـەد! ﷺ تـۆو ئۆممەتەکەت بـڕوا بێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبـەری خـوا، پێغەمبەریـش لەسـەری فـەرز بـووە، بـڕوای بـەوە بـێ کـە ڕەوانـە کـراوی خوایـە، (**يُؤمِنـوا**)ش بخوێنرێتـەوە، یـانی: تاکـو ئـەی بڕوادارینـە! ئێـوەش بـڕوا بێنـن بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾، بەیانیـان و ئێـواران، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەو دوو کاتـە بـێ، بـە دیارییکراویـی: بەیانیـان و ئێـواران، چونکـە بەیانیـان

ڕەمزو هێمای پەیدابوونی بوونەو، ئێوارانیش ڕەمزو هێمای لە نێو چوونی بوونەو، کۆتایی هاتنی ژیانی دنیایە.

دەشگونجێ مەبەست پێی کاتی بەردەوام بێ، وەک دەگوترێ: هەموو کات، شەوو ڕۆژ، یانی: لە بەیانی ڕا تاکو ئێوارەو لە ئێوارە ڕا تاکو بەیانی، هەر وەک دەگوترێ: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، سەرو خواری دنیا.

دەربارەی: ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، زانایان دوو ڕایان هەن، هەندێکیان بەو شێوەیە کە ئێمە تەفسیرمان کرد، تەفسیریان کردوە: وێڕای ئەوەی بڕوا دێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، پشتی پێغەمبەریش ﷺ بگرن و، بە هێزی بکەن، هەروەها ڕێزی بگرن و، حورمەتی بگرن، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە: ﴿وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾، واتە: خوای بەرزو مەزن بە پاک بگرن، بەیانیان و ئێواران، چونکە ئەم تەعبیرە تەنیا بۆ خوا بەکارهاتوە لە قورئاندا، بە پاک گرتن و دوور گرتنی لە هەرچی پەڵەو لەکەو کەم و کوڕییە.

بەڵام بۆ: ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، هەندێکیان گوتوویانە: بۆ خوای بێ وێنە دەگەڕێتەوە، واتە: هاوکاری خوا بن و بە هێزی بکەن، کە مەبەست پێی بەهێزکردنی پێغەمبەرەکەیەتی، هەروەها ڕێزو حورمەتی تەواوی بۆ دابنێن، چونکە لە قورئاندا ئەم وشەیە هاتوە: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾﴾ **نوح**، بۆچی وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، ڕێزی ناگرن؟ بەڵام واپێدەچێ مانای یەکەمیان ڕاستتر بێ، چونکە دەبێ سیفەت بگەڕێتەوە بۆ نزیکترین باسکراو و، نزیکترین باسکراویش پێغەمبەرە ﷺ ﴿لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، بەڵام بۆیە ڕاناوی: ﴿وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾، بۆ خوای بەرز دەچێتەوە، چونکە ئەم تەعبیرە لە قورئاندا زۆر هاتوەو تەنیا بۆ خواش بەکارهاتوە، بۆیە تێکەڵ نابن، ئەمە تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە، چ مەبەست لە (تسبیح) بە پاکگرتنی خوا بێ، چ مەبەست نوێژکردن بێ.

لـە سـوورەتی (**الأحـزاب**)، ئایەتـەکانی: (٤٥ - ٤٦)دا، هـەر ئـەم تەعبیـرە بـە جۆرێکـی دیکـە، هاتـوە، لـەوێ دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ ﴾، واتـە: ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ ئێمـە تۆمـان ناردوە شـایەد بـی و مـوژدەدەر بـی و، ترسـێنەر بـی و، بانگـەوازکار بـی، بـۆ لای خـوا بـە مۆڵـەتی خـواو، چرایەکـی تیشـکدەر بـی.

بۆچـی لێـرەدا ئـەو دوو سیفەتەش هـەن، بانگـەوازکارو چـرای تیشـکدەر؟ لەبـەر ئـەوەی سـوورەتی (**الفتـح**)، سـیاقەکەی بریتیـە لـە پووچەڵکردنـەوەی ئـەو گومانانـەی لـە بـارەی پێکهاتنـی صوڵحـی حودەیبییـەوە هەبـوون، کـە تەنانـەت هەنـدێ لـە هاوەڵانیـش کەوتبوونـە جۆرێـک لـە ڕاڕایـی و دوو دڵییـەوە، بۆیـە خـوای بـەرز تەنیـا ئەوەنـدەی بـە پێویسـت زانیـوەو فەرموویـەتی، بـەڵام ئـەو سـیاقەی سـوورەتی (**الأحـزاب**)، باسـی پووچەڵکردنـەوەی ئـەو شـتانە دەکات، کـە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەڵدەبەسـتران، لـە لایـەن دڵنەخۆشـەکانەوەو، لـە بـارەی هاوسـەرگیریی پێغەمبەرەوە ﷺ لەگـەڵ زەینەبـدا، بۆیـە لێـرەدا ئەوەشـی بـۆ زیـاد کـراوە: ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ ﴾**الأحـزاب**، کـە تـۆ بانگـەوازکاری بـۆ لای خـواو چرایەکـی تیشـکدەری، بۆیـە پێویسـتە سەرمەشـقی خەڵکیـش بـی لـە هەڵوەشـاندنەوەی عـادەت و نەرێتـە نەفامییەکانـداو، یەکێـک لەوانـەش ئـەوە بـووە - وەک لە تەفسـیری سـوورەتی (**الأحـزاب**)دا، باسـمان کـرد - نەرێتێکـی دێرینـی عەرەبـان بـووە، کەسـێک کەسـێکی دەکـرد بـە کـوڕی خـۆی، دوایـی هاوسـەری ئـەو بـە کـوڕ کـراو (**متبنّـى**)ەی بـۆ ڕەوا نەبـووە، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەوەی بـە پێغەمبـەر ﷺ هەڵوەشـاندەوە، چونکـە زەیـد کاتی خـۆی بـە کـوڕ کـراوی پێغەمبـەر ﷺ بـوو، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـەر زێدە خۆشویسـتنی، زەیـد کـە کۆیلـەی بـوو، کـردی بـە کـوڕی خـۆی، ئنجـا زەینەبیشـی هـەر خـۆی، بـۆی خواسـت، کـە کچـە پـووری خـۆی بـوو، بـەڵام خـوا ﷻ ویسـتی ئـەو عادەتـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەڵبوەشـێنێتەوەو، دوای ئـەوەی زەیـد لـە زەینـەب جیابـۆوە، خـوا ﷻ زەینەبـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ خواسـت و، ئـەوەش دەنگـە

دەنگێکی زۆری لێکەوتەوە، ئنجا لەبەر ئەوەی سوورەتی **(الأحزاب)**، ئەوە هەل و مەرجەکەی بووە، لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پڕوپاگەندانەی لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ کراون و، بۆ لەکەدارکردنی کەسایەتیی پێغەمبەری خوا، بۆیە بە پێویست زانراوە، لەوێ: ﴿وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾﴾ **الأحزاب**، لە سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا زیاد بکرێن.

## مەسەلەی چوارەم:

**پەیماندان بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر درەختەکەدا، پەیمان دان بوو بە خواو، وەک دەستیان خستبێتە دەستی خواوەو، شکاندنی بەڵێنەکەش بە زیانی خاوەنی و، پابەندییش پێیەوە، تەنیا بە سوودی خۆیەتی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی پەیمان بە تۆ دەدەن، بەڵێنت لەگەڵ دەبەستن، تەنیا پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستن و، بەڵێن بە خوا دەدەن.

(يُبَايِعُون)، لە (مُبَايَعَة)وە، هاتوە: (**وَالْمُبَايَعَةُ: مُشْتَقَّةٌ مِنَ الْبَيْعِ فِي مُفَاعَلَةٍ، ثُمَّ نُقِلَتْ إِلَى مَعْنَى الْعَهْدِ عَلَى الطَّاعَةِ وَالنُّصْرَةِ**)، وشەی (مُبَايَعَةُ) داتاشراوە لە (بَيْع)ەوە، واتە: فرۆشتن، کە لەسەر کێشی (مُفَاعَلَة)یە، دوایی گوازراوەتەوە بۆ بەڵێن و پەیمان، لەسەر فەرمانبەریی کردن و، پشتگرتن و سەرخستن، واتە: ئەوانەی پەیمان لەگەڵ تۆدا دەبەستن، با بزانن کە تەنیا پەیمان لەگەڵ خوادا دەبەستن و بەڵێن بە خوا دەدەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خوای پەروەردگارو ڕەوانە کراوی وی بووە.

٢- ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾، دەستی خوا بەسەر دەستی وانەوەیە، لێرەدا زانایان مشتومڕێکی زۆریان بووە لە بارەی ئەم ئایەتەوە، کە ئێمە دوایی کورتە باسێکی لە بارەوە دەکەین، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: دەستی خوا بەسەر دەستی ئەوانەوەیە، بێگومان هیچ کەس ئەوەی نایەتە زەینەوە، خوا ﷻ دەستی وەک دەستی مرۆڤانی هەبێ و، لەسەر دەستی ئەوان بێت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: وەک دەستیان خستبێتە نێو دەستی خواوە ﷻ ئاوایە، یانی: ئەو بەڵێنەش کە بە تۆی دەدەن بە خوای دەدەن، دەستی تۆش وەک

دەستی خوای پەروەردگار وایە، ئەگەر نا مەبەست ئەوە نیە خوا دەستی هەبێ بەو واتایەی کە دێتە زەینی ئێمەوە، کە ئەوە وێچواندن و جەستاندن (تشبیه وتجسیم)ە.

٣- ﴿فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ﴾، ئنجا هەر کەسێک پەیمانی هەڵوەشاندەوە، لە دژی خۆی پەیمانی هەڵوەشاندۆتەوە، (**نَكَث**) یانی: (**نقض**) هەڵوەشاندنەوە، وەک چۆن شتێک کە چنراوەو ڕێسراوە، شیی دەکرێتەوە، یاخود دیوارێک کە دروستکراوە، هەڵدەوەشێنرێتەوەو دەڕووخێنرێ.

٤- ﴿وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، بەڵام هەر کەسێک ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستوویەتی، پێی وەفادار بێ و جێبەجێکاری بێ و بە چاکیی جێبەجێی بکات، لەمەودوا پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە، (**أَوْفَى وَوَفَّى: أَتَمَّ وَأَكْمَلَ عَهْدَهُ مِنْ حَيْثُ الإِلْتِزَامِ بِهِ**)، (**أَوْفَى وَوَفَّى**) هەردووکیان، واتە: ئەو بەڵێنەی دابووی بردیە سەرو تەواوی کرد، لەو ڕووەوە کە پێیەوە پابەند بوو.

ئنجا هەر کەسێ بەو شێوەیە بێ:

٥- ﴿فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، لەمەودوا (خوا) پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە، خوێنراویشەتەوە: (**فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ**)، پاداشتێکی مەزنی دەدەینەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی ئەم ڕستەیەوە: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ﴾

بەڕێزان! ئەم کورتە باسە لە چوار بڕگەدا پێشکەش دەکەین:

### ١)- بڕگەی یەکەم:

هەمـوو زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە هەمـوو ئـەو وشـانەی خـوا ﷻ بـەکاری هێنـاون بـۆ خـۆی و، لـە زمانـدا مانـای ئەنـدام (**عضـو**) دەگەیەنـن، وەک: (**یَـد**)، (**عَـیْن**)، (**وَجـه**)، (**سَـاق**) ... هتـد.

ئـەو وشـانەی مانـای: دەسـت و، چـاوو، ڕوو و، لاق، دەگەیەنـن، تێکـڕای زانایـان بـە پێشـین و پاشـینەوە لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە ئـەو مانـا ڕواڵەتییـەی دێتـە زەینـەوە، ئـەو مانایـە مەبەسـت نیـە، چونکـە ئـەو مانـا ڕواڵەتـەی دێتـە زەینـەوە، ئـەوە هـی ئـەو ئەندامانەیـە کـە مرۆڤـەکان هەیانـن.

خـواش ﷻ لـە ئایـەتی ژمـارە (١١)ی سـوورەتی (**الشـوری**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾، واتـە: هیـچ شـتێک وەک خـوا نیـەو ئـەو بیسـەری بینـەرە.

کەواتـە: سیفەتەکانیشـی هـەروان و، وەک چـۆن زاتی وەک هیـچ زاتێـک نیـە، بـە هەمـان شـێوە سـیفەتەکانی خـواش، وەک سـیفەتی هیـچ کام لـە دروسـکراوەکانی نیـن، لێـرەدا ئـەم ئایەتـە - ئایـەتی (١١)ی الشـوری -- بەربەسـتێکە لـە بـەردەم هـەردووک لادانی دژ بـە یـەک: پەکخسـتن (**تعطیـل**) و وێچوانـدن و جەسـتاندن (**تَشْبیه و تجْسید**)، وێچوانـدن (**تشبیه**) کـە بـە داخـەوە هەندێـک لـە حەنبەلییـەکان پێـوەی گیـرۆدە بـوون، وەک کاردانـەوە لـە بەرانبـەر ئەوانـەدا کـە سـیفەتەکانیان لـە خـوا دادڕنیـون و، نـەک تەنیـا گوتوویانـە: وشـەکانی: (**یَـد، عَـیْن، وَجْـه، سـاق**)،

مانا ڕواڵەتییەکەیان مەبەست نیە، بەڵکو هەڵساون سیفەتەکانی دیکەشیان لە خوای پەروەردگار داڕنیون، بە حیسابی خۆیان بۆ ئەوەی خوا بە پاک بگرن، لەوەی کە لە دروستکراوەکان بچێ و، سەرەنجام بە بیانووی بە پاکگرتنەوە، سەریان بە پەکخستن گەیشتوە، هەروەک چۆن ئەوانی دیکەش بە بیانووی چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خواوە، سەریان بە وێچواندن و جەستاندن گەیشتوەو هەردووکیشیان هەڵەن، وەک پێشتریش لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی **(الزمر)**، ئایەتی ژمارە (٦٧)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾، لەوێ کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، هەروەها لە کتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)دا، لەوێشدا بە تەفصیل باسمان کردوەو، لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یش دا، کتێبێکی: (٤٠٠ - ٥٠٠) لاپەڕەییمان هەمووی بۆ باسی ناوو سیفەتەکانی خواو پەرستراوێتیی خوا، تەرخانکردوە، کە کتێبی سێیەمی ئەو مەوسووعەیە.

بەڵام لێرەشدا بە تایبەت لە بارەی ئەم ڕستەیەوە کە توێژەرەوان مشتومڕی زۆریان لە بارەیەوە بووە، بە چاکمان زانی ئەم کورتە باسە بکەین.

## ٢)- بڕگەی دووەم:

با لەو بارەوە سەرنجێکی قسەی توێژەرەوانی قورئان بدەین:

**١-** یەکێک لەوانە **(الطبري)**[1] دەڵێ: **(وَفِي قَوْلِه:** ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾**، وَجْهَانِ مِنَ التَّأْوِيل)** لە فەرمایشتی (يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ)دا دوو ڕووی تەئویل هەن، (ئەو مەبەستی لە تەئویل مانا لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەیە)، بە دوو شێوە مانای لێکدەدرێتەوە:

**أ- (أَحَدُهُمَا: يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ عِنْدَ الْبَيْعَةِ، لِأَنَّهُمْ كَانُوا يُبَايِعُونَ اللَّه بِبَيْعَتِهِمْ نَبِيَّهُ ﷺ)**، مانای یەکەمیان، تەئویلی یەکەمیان ئەوەیە کە دەستی خوا بەسەر دەستی وانەوەیە، لە

---

(١) جامع البيان ج٢٦، ص٧٨.

کاتێکدا پەیمانیان دەدا، چونکە کە پەیمانیان بە پێغەمبەرەکەی دەدا، پەیمانیان بە خوا دەدا، کەواتە: مانا مەعنەوییەکەی مەبەستە.

**ب-** (وَالْآخَرُ: قُوَّةُ اللَّهِ فَوْقَ قُوَّتِهِمْ فِي نُصْرَةِ رَسُولِهِ ﷺ لِأَنَّهُمْ إِنَّمَا بَايَعُوا رَسُول اللَّه ﷺ عَلَى نُصْرَتِهِ عَلَى الْعَدُوِّ)، مانای دووەم و تەئویلی دووەم، ئەوەیە کە هێزی خوا بەسەر هێزی وانەوەیە، لەسەر خستنی پێغەمبەرەکەیدا، چونکە ئەوان پەیمانیان بە پێغەمبەری خوادا، لەسەر ئەوەی پشتی بگرن و سەری بخەن لە بەرانبەری دوژمندا.

**٢-** (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[١]، دەڵێ: (قِيلَ: يَدُهُ فِي الثَّوَابِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فِي الْوَفَاءِ، وَقِيلَ: يَدُهُ فِي الْمِنَّةِ عَلَيْهِمْ بِالْهِدَايَةِ، فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فِي الطَّاعَةِ، وقيل: مَعْنَاهُ نِعْمَةُ اللَّهِ عَلَيْهِم فَوْقَ مَا صنعوا فِي الْبَيْعِةِ، وَقِيْلَ قُوَّةُ اللَّهِ وَنُصْرة اللَّهِ فَوْقَ نُصْرَتِهِم):

**ئەویش چوار ڕای هێناون، وەک تەئویل و مانا لێکدانەوە:**

**یەکەم:** دەستی خوا لە پاداشت دانەوەدا، لە سەرووی دەستی ئەوانەوەیە، لە وەفادار بوون بەو پەیمانەیان.

**دووەم:** دەستی خوا لە چاکە بەسەر ئەوانەوە بوون، بەوە کە ڕێنمایی کردوون و ڕاستە ڕێی کردوون، بەسەر دەستی ئەوانەوەیە لە فەرمانبەرییکردنیاندا بۆ خواو بۆ پێغەمبەر ﷺ.

**سێیەم:** چاکەی خوا بەسەر وانەوە، لە سەرووی ئەو چاکەوەیە، کە ئەوان پەیمانیان بە پێغەمبەر داوە ﷺ.

**چوارەم:** هێزی خواو پشتگیریی خوا (بۆ پێغەمبەر ﷺ)، لە سەرووی هێزو پشتگیریی ئەوانەوەیە بۆی.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج٢٦، ص٢٠٩.

بۆیــەش (**القرطبــي**) وا دەڵــێ، چونکــە دەگوتــرێ: (**لِفُــلان يَــدٌ عــلَيّ**)، فڵانکــەس دەســتێکی بەســەرمەوە هەیــە، واتــە: دەســتی چاکەکاریــی، یــان دەگوتــرێ: دەســتی فڵانکەســی لەســەر بــە زیــاد بــێ، واتــە: هێــزی فڵانکــەس بەســەر ئــەوەوە هەیــە، هەروەهــا لــە زمــانی عەرەبییــدا (**يَــد**): أ- بــە مانــای پاداشــت دانــەوە دێ، ب- بــە مانای چاکەکاریــی دێ، ج- بــە مانــای نیعمــەت دێ، د- بــە مانــای هێــزو دەســتەڵاتیش دێ.

کەواتــە: لێــرەدا هیــچ کام لــەو مانایانــە پێــی ناگوتــرێ: تەئویــل بــەو واتایــە کــە لــە مانــای خــۆی لابــدرێ بــۆ مانایەکــی دیکــە، وەک لــە پێناســەی (**تأویــل**)دا وەک زاراوەیــەک گوتــراوە[1]، چونکــە وشــەی (**يَــد**) لــە زمــانی عەرەبییــدا، وەک چــۆن بــە مانــای ئەنــدام (**جَارِحَــة**) هاتــوە، بــە مانــای هێــزو چاکــەو نیعمەتیــش هــەر هاتــوە، کەواتــە: ئــەوە پێــی ناگوتــرێ تەئویــل، بــەو واتایــەی لــە مانایــەک کــە نەگونجــاوە لــە ڕواڵەتــدا، لای بــدەی بــۆ مانایەکــی دیکــە کــە گونجــاوە، چونکــە وشــەی (**يَــد**) لــە زمــانی عەرەبییــدا، هــەر کام لــەم مانایانــەی هاتــوون.

**٣-** هەروەها (**الشوكاني**)یش لە تەفسیرەکەی خۆی دا[2] دەڵێ: (**وَالمَعْنَى أَنَّ عُقْدَةَ المِيثَاقِ مَعَ رَسُولِ الله ﷺ كَعَقْدِهِمْ مَعَ اللهِ مِنْ غَيْرِ تَفَاوتٍ**)، مانای ئەوەیە کە گرێدانی ئەو پەیمانە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ وەک بەستنیەتی لەگەڵ خوادا، بەبێ جیاوازیی.

ئەویش ڕێک مانا مەعنەوییەکەی گرتوە.

**٤-** دیسان (**الآلوسي**) لە تەفسیرەکەی دا[3]، دەڵێ: (**وَالسَّلَفُ يمُرُّونَ الآيَةَ كَمَا جَاءَتْ مَعَ تَنْزِيهِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ عَنِ الجَوَارِحِ وَصِفَاتِ الأَجْسَامِ، وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ مَعَ جَمِيعِ المُتَشَابِهَات، وَيَقُوُلُونَ: إنَّ مَعْرِفَةِ حَقِيْقَةِ ذَلِكَ، فَرْعُ مَعْرِفَة حَقِيْقَة الذَّاتِ، وأَنَّى ذَلِكَ هَيْهَات هَيْهَات!!**)، (**الآلوسي**) ئەو مانا لێکدانەوانەی (**الطبري والقرطبي والشوكاني**)، ئاماژەیان پێدان، ئەویش

---

(١) التأويل: صرف لفظٍ عن معناه الظاهر المتبادِر إلى معنى آخر لقرينةٍ.

(٢) فتح القدير : ج٥، ص٥٨.

(٣) روح المعاني: ج١٣، ص٣٤٣.

دەیانهێنێ، بەڵام دوایی دەڵێ: زانایانی پێشین ئایەتەکە، وەک هاتوە دەیڕۆێنن لەگەڵ بە پاکگرتنی خوا ﷻ، لە ئەندامان و لە سیفەتی جەستان و، لەگەڵ هەموو ئەو ئایەتانەش دا کە مانای وێکچوویان هەن، هەروا مامەڵە دەکەن و، دەڵێن: زانینی حەقیقەتی ئەو سیفەتانە، لقێکە لە زانینی چییەتی خودی خوا، ئەوەش چۆن پێی دەگەین، زۆر زۆر دوورە!!.

**٥-** یەکێکی دیکەش هەر لەو بارەوە لە تەفسیری (شیعەکان)دا دێنین، کە قسەی (**السيد محمد حسين الطباطبائي**)یە، لە تەفسیری (**الميزان**)دا[1]، ئەویش ئەم تەعبیرە دێنێ: (**فَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ ﴿١٠﴾﴾، تَنْزِيْلُ بِيْعَتِهِ ﷺ مَنْزِلَةَ بَيْعَتِهِ تَعَالَى، بِدَعْوَى أَنَّهَا هِيَ، فَمَا يُوَاجِهُوْنَهُ ﷺ بِهِ مِنْ بَذْلِ الطَّاعَةِ، لاَ يُوَاجِهُوْنَ بِهِ إِلاَّ اللهَ ﷻ لأَنَّ طاعَتَهُ طَاعَةُ اللهِ، ثُمَّ قَرَّرَهُ زِيَادَة تَقْرِيْر وَتَأْكِيْد بقَوْلِه: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾، حَيْثُ جَعَلَ يَدَهُ ﷺ يَدَ الله، كَمَا جَعَلَ رَمِيَهُ ﷺ رَمِيَ الله نَفْسِهِ فِي قَوْلِه: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ ﴿١٧﴾﴾الأنفال، وَفِي نِسْبَةِ شَأْنِه ﷺ إلى نَفْسِ تَعَالَى، آيَاتٌ كَثِيْرَةٌ، كَقَولِه تَعَالَى: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ ﴿٨٠﴾﴾النساء، وَقَوْلُه: ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾الأنعام**).

واتە: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ﴾، ئەمە دانانی پەیمان بەستنە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، وەک پەیمان بەستن لەگەڵ خوای بەرزدا، بەو جۆرە کە ئەوەی پێی ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ دەبنەوە، لە فەرمانبەریی بۆ کردن و بەقسە کردن، بێگومان ئەو مامەڵەیە لەگەڵ خوای پاک و بێگەرددا دەکەن، چونکە بە قسە کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەکردنی خوای پەروەردگارە، دوایی ئەم ڕاستییە زیاتر دەچەسپێنێ و جەختی لەسەر دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾، کە دەستی پێغەمبەر ﷺ وەک دەستی خوا دادەنێ، هەروەک چۆن خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الأنفال**)، ئایەتی: (١٧) دا، هاویشتنی پێغەمبەری ﷺ، وەک هاویشتنی خۆی داناوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا

(١) ج١٨، ص٢٧٤.

رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾، تـۆ کـە هاویشـتت نەتهاویشـت، بەڵکـو خـوا هاویشـتی، هاویشـتنەکەی بـۆ بەهاویسـتنی خـۆی دادەنـێ.

ئـەوە کـە زۆر جـار خـوا ﷻ شـتێک کـە تایبەتـە بـە پێغەمبـەرەوە ﷺ، پاڵیداوەتـە لای خـۆی، لـە زۆر ئایەتانـدا هاتـوە، وەک خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾﴾النساء، هـەر کەسـێ فەرمانبەریـی پێغەمبـەر ﷺ بـکات، فەرمانبەریـی خـوای کـردوە، هەروەهـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾الأنعام، ئەوانـە تـۆ بـە درۆ دانانێـن، بەڵکـو ئـەو سـتەمکارانە نکووڵیـی لـە ئایەتـەکانی خـوا دەکـەن.

### ٣)- برگەی سێیەم:

هەرچەنـدە پێشـتریش ئاماژەمـان پێـدا، گرنگـە بزانـرێ: ڕاسـت نیـە، کـە زانایـانی پێشـین هیـچ تەئویلیـان نەکـرد بـێ، ئـەوە تەنها وەهمێکـی بـاو (وَهـمْ شَـائِع) بـووەو، هەندێـک کـەسی کـەم زانیاریـی و دەمارگیـر ڕەواجیـان پێـداوە، چونکـە هەمـوو زانایـانی پێشـین بەبـێ هـەڵاواردن، هەندێـک شـتیان تەئویـل کـردوە، بـۆ نموونـە:

١- ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴿٤﴾﴾الحديد، هەموویان بەبێ هەڵاواردن تەئویلیان کردوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو (خوا) لەگەڵتانە لە هەر جێیەک بن، (لەگەڵتانە) هیچ کام لە زانایانی پێشین نەیانگوتوە: خوا ﷻ ئێستا لێرەیەو هەر دروستکراوێک لە هەر شوێنێک بێ، خوا ﷻ لەوێیە!! هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە خوا ﷻ لەسەر عەرشی خۆیەتی و، لە سەرەوەی دروستکراوەکانیەتی، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە.

هەموویـان ئەوەیـان تەئویـل کـردوەو گوتوویانـە: (**وَهُـوَ مَعَكُـمْ أي بِعِلْمِـه وَقُدْرَتِـه**)، واتـە: خـوا بـە زانیاریـی و بـە دەسـتەڵاتی لەگەڵتانـە.

٢- ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾﴾الأنفال، خوا ﷻ لەگەڵ بڕواداران دایە، هەموویان گوتوویانە: واتە: بەسەرخستنی و بە مشوور خواردنی و سەرپەرشتییکردنی لەگەڵیاندایە، (**أي بِوَلَايَتِه وَنُصْرَتِه**).

٣- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ﴿٨٤﴾﴾ **الزخروف**.

٤- ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ﴿٣﴾﴾ **الأنعام**، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن و گوتوویانە: واتە ئەو (خوایە) کە حوکمڕانیی و باڵادەستیی و سیفەتەکانی لەسەر زەویی و لە ئاسمانەکاندا هەن، نەک خوا ﷻ بۆ خۆی لەسەر زەوی بێت و، لە نێو ئاسماناندا بێ! بەڵکو خوا ﷻ لە دەرەوەی دورستکراوەکانی خۆیەتی، خوا ﷻ لە دەرەوەی کات و شوێنەو، لە دەرەوەی دورستکراوەکانی خۆیەتی.

## ٥)- بڕگەی چوارەم:

ئەو پەیمان بەستنە، کە بە: (**بيعة الرّضوان**)، یاخود (**بيعة شجرة الرّضوان**) ناسراوە، وەک پێشتریش لە درێژەی بەسەرهاتی صوڵحی حودەیبییەدا باسمان کردو (**إبن هشام**) لە (**السيرة النبوية**)دا[1]، هێناویەتی، کە ئەو پەیمان بەستنە کاتێک بووە، پێغەمبەر ﷺ بیستی عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه کە بە نوێنەرایەتیی مسوڵمانان چوو بوو بۆ مەککە، کوژراوە، ئەمەش دەقی قسەکەی (**إبن هشام**)ە:

(**قَالَ ابْنُ إِسْحَاق: فَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حِينَ بَلَغَهُ أَنَّ عُثْمَانَ قَدْ قُتِلَ «لَا نَبْرَحُ حَتَّى نُنَاجِزَ الْقَوْمَ»، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ إِلَى الْبَيْعَةِ، فَكَانَتْ بَيْعَةُ الرِّضْوَانِ تَحْتَ الشَّجَرَةِ، فَكَانَ النَّاسُ يَقُولُونَ: بَايَعَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمَوْتِ، وَكَانَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُبَايِعْنَا عَلَى الْمَوْتِ، وَلَكِنْ بَايَعَنَا عَلَى أَنْ لَا نَفِرّ**).

ئیبنو هیشام لە کتێبەکەی خۆیدا، دەڵێ: ئیبنو ئیسحاق، گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو بەکری صیددیق، بۆی باسکردووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک بیستوویەتی و پێی گەیشتوە کە عوسمان کوژراوە، فەرموویەتی: ئێرە بە جێ ناهێڵین تاکو دژی ئەو خەڵکە جەنگ نەکەین، ئنجا پێغەمبەری خوا

---

(١) ج٣، ص(١٦٧ - ١٦٨).

ﷺ خەڵکەکەی بانگ کردوە بۆ پەیمان، کە سەرەنجام پەیمانی ڕەزامەندیی (**رضوان**)ی لە ژێر درەختەکەدا لێکەوتەوە، ئنجا خەڵک دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مردن (واتە: تاکو نەکوژرێن، پشت لە دوژمن نەکەن)، پەیمانی لەگەڵدا بەستوون، بەڵام جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مردن پەیمانی لەگەڵ نەبەستین، بەڵکو پەیمانی لەگەڵ بەستین کە ڕانەکەین و پشت لە دوژمن نەکەین، {تاکو دەمرین یان دەکوژرێین، جەنگ بکەین، چونکە جاری وایە دەبێ بە فەرمانی فەرماندە پاشەکشە بکەی، یاخود پشت بکەیە دوژمن، وەک تاکتیکی جەنگیی وەک لە سوورەتی (**الأنفال**)دا، خوا ﷻ باسیکردوە: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾}.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە حەوت (٧) ئایەتەو، بریتین لە ئایەتەكانی: (١١ - ١٧)، كە هەموویان لە بارەی عەڕەبە خێڵەكیی و بیابانشینەكانەوەن، كە لە حاڵەتی دوو دڵیی و گومانەوە نیزیك بوون، بەڵام بە موونافیق و بێبڕوا لە قەڵەم نەدراون و، وەك مسوڵمان مامەڵەیان لەگەڵدا كراوە، بەڵام لە كاتی داواكردنی پێغەمبەردا ﷺ بۆ چوونیان بەرەو مەككە بۆ عومرە، بیانوویان هێنایەوەو نەچوون، كەچی دوایی كە زانیان پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بەرەو خەیبەر دەچن، دەشیانزانی كە لەوێ دەستكەوتی باشی جەنگیی دەبێ، ویستیان بچن! بەڵام خوا ﷻ ڕێی لێگرتن.

دوایی خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ كرد كە پێیان بڵێ: لە مەودوا بۆ جەنگ لە دژی كۆمەڵێكی خاوەن هێز، بانگ دەكرێن، ئنجا ئەگەر ئەو كاتە بە دەم بانگی جیهادو فیداكارییەوە بچن، پاداشتی باشتان دەبێ و، بە پێچەوانەوەش: دووچاری سزای بە ئێش دەبن، بەڵام كەسانی كەم ئەندام و بێ توانا هەڵاوێردراون لەو حوكمە گشتییە، وەك كوێرو شەل و نەخۆش.

﴿سَيَقُولُ لَكَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَاۚ يَقُولُونَ
بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ ضَرًّا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ
نَفۡعَۢاۚ بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرَۢا ﴿١١﴾ بَلۡ ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهۡلِيهِمۡ
أَبَدٗا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمۡ وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ وَكُنتُمۡ قَوۡمَۢا بُورٗا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمۡ يُؤۡمِنۢ
بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَعِيرٗا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ
وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلۡمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقۡتُمۡ
إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأۡخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعۡكُمۡۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا

كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾ قُل
لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ
ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ
وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی پێغەمبەر ﷺ!) لە مەودوا بەجێهێڵراوەکان لە عەرەبە دەشتەکییە بیابانشینەکان (بۆ پۆزش هێنانەوەی بەجێمانیان) پێت دەڵێن: سامانەکانمان و کەس و کارمان سەرقاڵیان کردین (نەمانتوانی بێین)، ئنجا داوای لێبوردنمان بۆ لە (خوا) بکە، شتێک بە زمانەکانیان دەڵێن کە لە دڵەکانیاندا نیە، بڵێ: ئایا ئەگەر خوا بیەوێ زیانێکتان لێ بدات، یان سوودێکتان پێ بگەیەنێ، کێ هیچ شتێکی لە بەرانبەر خوادا بە دەستە؟ (ڕاست ناکەن)، بەڵکو خوا شارەزای ئەوە بوو کە دەتانکرد ﴿١١﴾ بەڵکو (هۆکاری دواکەوتنەکەتان ئەوە بوو کە) پێتان وابوو: هەرگیز پێغەمبەرو بڕواداران ناگەڕێنەوە لای کەس و کاریان (سەریان بە فەتارەت دەچێ)، ئەو گومانەش لە دڵەکانتاندا ڕازێنرایەوەو گومانێکی زۆر خراپتان (بە خوا) بردو، کۆمەڵێکی فەوتاوو بێخێر دەرچوون ﴿١٢﴾ هەر کەسیش بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی نەهێنێ، بە دڵنیایی ئێمە کڵپەی (ئاگر)مان بۆ بێبڕوایان سازکردوە ﴿١٣﴾ حوکمڕانیی و دەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوییش بەس هی خوایەو، خواش هەردەم لێبوردەی بە بەزەییە ﴿١٤﴾ لە مەودوا هەر کات بۆ گرتنی دەستکەوتانێک چوون بیانگرن، بەجێهێڵراوەکان دەڵێن: لێمان گەڕێن، با شوێنتان بکەوین (و لەگەڵتان بێین)، دەیانەوێ فەرمایشتی خوا بگۆڕن (کە بەڵێنی

داوە دەستکەوتەکانی خەیبەر تەنیا بۆ بەشداربووانی ڕێککەوتنی حوودەیبییە بن) بڵێ: نەخێر نابێ شوێنمان بکەون، خوا پێشتر وایفەرمووە، ئنجا دەڵێن: بەڵکو ئیرەییمان[1] پێ دەبەن! بەڵکو کەمێک نەبێ تێناگەن (بۆیە وابیر دەکەنەوە) ﴿١٥﴾ (ئەی موحەممەد!) بە دواخراوان لە عەرەبە (بیابانشینە)کان، بڵێ: لە مەودوا بۆ (جەنگکردن لە دژی) کۆمەڵێکی خاوەنی هێزی توند بانگ دەکرێن، لە دژیان دەجەنگن، یان ملکەچ دەبن (خۆ بە دەستەوە دەدەن)، ئنجا ئەگەر فەرمانبەریی بکەن، خوا پاداشتێکی باشتان دەداتێ و، ئەگەر پشتیش هەڵبکەن، وەک پێشتر پشتتان هەڵکرد، بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات ﴿١٦﴾ کوێر سەغڵەت ناکرێ (بە ناچارکردنی بەشداریی لە جەنگدا)و، شەل سەغڵەت ناکرێ و، نەخۆشیش سەغڵەت ناکرێ، هەر کەسیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، (خوا) دەیخاتە چەند باغێکەوە، کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن و، هەر کەسیش پشت هەڵبکات، بە ئازارێکی بە ئێش سزای دەدات ﴿١٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**ٱلْمُخَلَّفُونَ**): (**الْمُخَلَّفُون: جَمْعُ المُخلَّف، المَتْرُوكُ فِي مَكَانٍ خَلْفَ الخَارِجِيْنَ مِنَ البَلَدِ كَالنِّسَاءِ وَالأَطْفَال**)، (**مُخَلَّفُون**) كۆی (**مُخلَّف**)ە، واتە: بەجێهێڵراوو واز لێهێنراو لە شوێنێک، لە دوای ئەوانەوە کە لە وڵات دەرچوون، ئەوانەی دەمێننەوە، وەک ئافرەتان و منداڵان، واتە: پیشەی ئەوانیان ڕەچاو کردوە، ئنجا زانایان گوتوویانە: (**مُخَلَّفُون**) بە مانای بەجێهێڵراوانە، بەڵام مەبەست پێی کەسانێکە کە بەجێماون، ئەگەرنا بە ئانقەست بەجێ نەهێڵدراون و، خۆیان خۆیان بەجێهێشتوە، بەڵام یانی: ئەوان کە بەجێماون، پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزیشی، نادیدەیان گرتوون و، پشتگوێیان خستوون.

---

(١) ئیرەیی: حەسوودیی.

(ٱلۡأَعۡرَابِ): (سُكَّانُ البَادِيَة) بە دانیشتووانی بیابان دەگوترێ، وشەی (أَعْرَاب) لە ئەصڵدا كۆی (عَرَب)ە، بەڵام دوایی كراوە بە ناو بۆ بیابانِنشینان، كۆی (أَعْرَاب) یش (أَعَارِيب)ە، (أَعْرَابِيّ) كراوە بە ناو بۆ كەسانێك كە بیاباننشینن، بەڵام (عَرَبِيّ)، ناوە بۆ كەسێك كە شارنشینە، دەگوترێ: (هُوَ عَرَبِيُّ اللِّسَانِ، أَي: مُفْصِحُ اللِّسَان)، واتە: زمانێكی ڕەوانی هەیە، (إِعْرَاب) بە مانای ڕوونكردنەوە دێ، (إِعْرَاب)ی ئەو ڕستەیەم بۆ بكە، واتە: بۆم ڕوون بكەوە، پێكهاتەكانی چۆنن؟ پێشتریش چەند جارێك باسی ئەوەمان كردوە.

(شَغَلَتۡنَآ): واتە: سەرقاڵ و بێئاگای كردین، (الشُّغْلُ والشُّغُلُ: العَارِضُ الَّذِي يُذْهِلُ الإِنْسَان، شُغِلَ: فَهُوَ مَشْغُولٌ، وَشُغُلٌ شَاغِلٌ، وَأَشْغُلَنِي لُغَة رَدْيئة): (شُغْل وشُغُل): هەردووكیان بە مانای شتێك دێن كە مرۆڤ بێ ئاگا دەكات، لە شتێكی دیكە، دەگوترێ: (شُغِلَ فُلَان فَهُوَ مَشْغُول)، فڵانكەس سەرقاڵكرا، بۆیە سەرقاڵە، دەگوترێ: (شُغُلٌ شَاغِلٌ) واتە: كارێك كە مرۆڤ سەرقاڵ بكات و، سەرگەرمی بكات و، پڕ ئیشی بكات، (أَشْغَلَنِي) واتە: سەرقاڵی كردم، ئەمە كەمتر بەكارهێنراوەو، وا باشترە هەر بگوترێ: (شَغَلَنِي) واتە: سەرقاڵی كردم.

(ضَرًّا): (الضُّرُّ: سُوءُ الحَالِ فِي نَفْسِهِ، وَبدَنِهِ، وَخَارِجِهِمَا)، (ضُرّ) حاڵی خراپ چ لە دەروونی مرۆڤدا، چ لە جەستەیدا، چ لە دەرەوەی جەستەو دەروونیدا، یانی: ماڵ و سامانی كەس و كاری كە تووشی زیانێك بووبن، پێی دەگوترێ: (ضُرّ).

(بُورًا): (البَوَارُ: فَرْطُ الكَسَادِ، وَالفَسَادُ وَالهَلَاكُ، وَبَارَ شَيء يَبُورُ بَوْرَاً وَبَوَارَاً، وَرَجُلٌ حَائِرٌ بَائِر، وَقَوْمٌ حُورٌ بُورٌ)، (بَوَار): بە مانای زۆر زیانباریی و، تێكچوون و فەوتان دێ، دەگوترێ: (بَارَ الشَّيءُ يَبُورُ بَوْرَاً وَبَوَارَاً)، واتە: شتەكە فەوتا، دەفەوتێ، فەوتان یان تێكچوو، تێكدەچێ، تێكچوون، دەگوترێ: (وَرَجُلٌ حَائِرٌ بَائِر) پیاوێكی سەراسیمەی فەوتاوو زیانبار، (وَقَوْمٌ حُورٌ بُور)، ئەمە بۆ كۆیە (حُور) واتە: سەراسیمەكان (بُور) واتە: فەوتاوەكان.

(سَعِيرًا): (سَعَرْتُ النَّارَ، مِن بَابِ مَنَعَ: أَوْقَدْتُهَا، وَهَيَّجْتُهَا، وَسَعَّرْتُهَا وَأَسْعَرْتُهَا): (سَعَرْتُ النَّارَ) واتە: ئاگرەکەم خۆشکردو بڵێسەدارم کرد، هەروەها (سَعَّرْتُهَا وَأَسْعَرْتُهَا)ش هەر هەمان مانایان هەیە.

(مَغَانِمَ): (مَغَانِم جَمْع مَغْنَم، وُهُوَ مَا يُغْنَم، وَالغَنَم: مَعْرُوفٌ، وَالغُنْمُ إِصَابَتُهُ وَالظَّفَرُ بِهِ، ثُمَّ اسْتُعْمِلَ فِي كُلِّ مَظْفُورٍ بِهِ مِنْ جِهَةِ العِدَى وَغَيْرِهِم): (مَغَانِم) کۆی (مَغْنَم)ە، واتە: دەستکەوت، ئەویش بریتیە لەوەی لە دوژمن دەگیرێ، لە (غَنَمَ)ەوە هاتوە، (غَنَم) واتە مەڕ، (غُنْم) دەگوترێ: (الغُنُم: بِالْغُرْمِ)، واتە: زەفەر بە مەڕ بردن، دەستکەوتنی مەڕ، دوایی بەکارهێنراوە بۆ هەر شتێک کە زەفەری پێ ببردرێ و دەستەبەر بکرێ، چ لە لایەنی دوژمنانەوە بێ، چ لە لایەنی غەیری دوژمنانیشەوە بێ.

(انطَلَقْتُمْ): (انْطَلَقَ فُلاَنٌ أَي: مَرَّ مُتَخَلِّفاً)، کەسێک کە لە کۆمەڵێک دوادەکەوێ، دوایی دەردەچێ بە پەلە بۆ ئەوەی بیانگاتێ، پێی دەگوترێ: (انْطَلَقَ)، واتە: بە خێرایی دەرچوون لە دوای دواکەوتن.

(ذَرُونَا)، یانی: (اتْرُكُونَا دَعُونَا، ذَرْهُ: دَعْهُ، يَذَرُهُ: يَدَعُهُ، وَلَمْ يُسْتَعْمَل مِنْهُ المَاضِي)، (ذَرُونَا) واتە: وازمان لێ بێنن، لێمانگەڕێن، (ذَرْهُ) واتە: وازی لێ بێنە (دَعْهُ)، (يَذَرُهُ يَدَعُهُ)، وازی لێ دێنێ، بەڵام ئەم وشەیە، تەنیا حاڵەتی (مُضَارِع)ی هاتوەو حاڵەتی فەرمانیشی هاتوەو، حاڵەتی ڕابردووی نەهاتوە، بۆچی حاڵەتی ڕابردووی نەهاتوە؟ {اكْتِفَاءً بِ(تَرَكَ تَرْكاً فَهُوَ تَارِك)}، لەبەر ئەوەی وشەی (تَرَكَ) هەیە واتە: وازی لێهێنا، (تَرَكَ يَتْرُك فَهُوَ تَارِك)، وازیهێناوەو واز دەهێنێ ئەو وازلێهێنەرە، (تَرَك)یان لە جێی ڕابردووی (ذَرْنَا، يَذرْنَا) داناوە.

(يُبَدِّلُوا): (أَي: يُغَيِّرُوا، الإِبْدَالُ وَالتَّبْدِيلُ والتَّبَدُّلُ وَالإِستِبْدَالُ: جَعْلُ الشَّيءِ مَكَانَ آخر)، ﴿أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، واتە: فەرمایشتی خوا بگۆڕن، (إِبْدَالُ وتبْدِيلُ وتبَدُّلُ وإِستِبْدَالُ)، هەرچواریان بە مانای ئەوەن شتێک لە شوێنی شتێکی دیکە دابنرێ.

(تَحْسُدُونَنَا): واتە: ئیرەییمان پێ دەبەن، حەسوودییمان پێ دەبەن، (الحَسَدُ تَمَنِّي زَوَالِ نِعْمَةٍ مِنْ مُسْتَحِقٍّ لَهَا، وَرُبَّمَا كَانَ مَعَهُ سَعِيٌ فِي إِزَالَتِهَا)، (حَسَد): بریتیە لە خۆزگە خواستن بە لاچوونی چاكەیەك لە كەسێك دا كە شایستەیەتی و، جاری وا هەیە هەوڵدانیشی لەگەڵدا دەبێ، هەوڵدان بۆ ئەوەی ئەو نیعمەت و چاكەیە لابچێ.

(أَوْ يُسْلِمُونَ)، یان ملكەچ دەبن، بە داخەوە بەشێك لە تەفسیرەكان، وەك دوایی باسی دەكەین، لە كورتە باسێكدا، ئەم وشەیان، بە مانای مسوڵمان بوون و هاتنە نێو ئیسلام لێك داوەتەوە، بەڵام وانیە، بەڵكو: (تُقَاتِلُونَهُمْ، أو يُسْلِمُون)، یانی: لە دژیان دەجەنگن، یاخود خۆیان بەدەستەوە دەدەن، (أو يُسْلِمُون: أي يَدْخُلُونَ فِي السِّلْمِ، وُهُوَ أَنْ يَسْلَم كُلّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَنْ يَنَالهُ مِنْ أَلَمِ صَاحِبِهِ، فَهُمْ مُسْلِمُون، أي: مُنْقَادُون لِلْحَقِّ مُذْعِنُون لَهُ)، ئیسلام واتە: هاتنە نێو ئاشتیی، ئایینی ئیسلام بۆچی ناونراوە: ئیسلام؟ لەبەر ئەوەی مرۆڤەكان كە دێنە نێو حاڵەتی ئاشتییەوە لەگەڵ خوای پەروەردگاریاندا، سەرپێچیی و بێ فەرمانیی ناكەن، ئنجا دەڵێ: ئیسلام بریتیە لەوە كە هەر كامێك لە دوو لایەنەكان سەلامەت بێ لەوەی كە ئازاری بەرانبەرەكەی پێبگات، بەڵام بەپێی لێكدانەوەی هەڵەی زۆربەی تەفسیرەكان كە دەفەرموێ: (فَهُمْ مُسْلِمُون)، واتە: ملكەچن بۆ هەق و دانیان پێدا هێناوە.

(حَرَجٌ)، (أَصْلُ الحَرَجِ وَالحِرَاجِ: مُجْتَمَعُ الشَّيْئَيْنِ، وتُصُوِّرَ مِنْهُ ضِيقُ مَا بَيْنِهِمَا، فَقِيْلَ لِلْضَيِّقِ: حَرَجْ وَلِلإِثْم: حَرَج)، وشەی (حَرَجٍ وَحِرَاجٍ)، لە بنەڕەتدا بە شوێنی كۆبوونەوەی دوو شتان دەگوترێ، دوایی لەوەوە ئەوە وێنا كراوە كاتێك دوو شت پێكدەگەن، نێوانەكەیان تەنگەبەرە، بۆیە بە شتی تەنگ گوتراوە: (حَرَج)، هەروەها بە گوناهیش گوتراوە (حَرَج) لەبەر ئەوەی گوناهیش مرۆڤ تووشی سەغڵەتیی و تەنگانە دەكات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

ئێمە پێشتر بەسەرهاتی صوڵحی حودەیبییەمان باسکرد، لە نێویشیدا باسی عەرەبە خێڵەکییەکان کە دواکەوتن، کە زانایان باسی شەش تیرەیان کردووون، بەڵام خوا ﷻ بە گشتیی باسیکردووون.

ئنجا لە بارەی ئەم ڕستەوە: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ﴿١١﴾ ﴾، تاکو کۆتایی حەوت ئایەتەکە، دوو ڕیوایەتان دێنین:

**یەکەم:** (قَالَ ابْنُ إِسْحَاق: وَاسْتَنْفَرَ ﷺ الْعَرَبَ وَمَنْ حَوْلَهُ مِنْ أَهْلِ الْبَوَادِي مِنَ الْأَعْرَابِ لِيَخْرُجُوا مَعَهُ، وَهُوَ يَخْشَى مِنْ قُرَيْشٍ الَّذِي صَنَعُوا، أَنْ يَعْرِضُوا لَهُ بِحَرْبٍ، أَوْ يَصُدُّوهُ عَنِ الْبَيْتِ، فَأَبْطَأَ عَلَيْهِ كَثِيرٌ مِنْ الْأَعْرَابِ)[١].

واتە: پێغەمبەر ﷺ عەرەبەکان و، بیابانشینەکانی کە لە دەوری بوون، دەنگی دان و داوای لێکردن کە لەگەڵی بچن، چونکە مەترسیی هەبوو لە هۆزی قورەیش، مەترسیی ئەوەی لێیان هەبوو کە کردیان کە بریتی بوو لە ڕێ لێگرتن و، مەترسیی ئەوەی هەبوو شەڕی پێ بفرۆشن و لە کابە بیگێڕنەوەو بەرپەرچی بدەنەوە، بەڵام زۆرێک لە عەرەبە خێڵەکییەکان لێی دواکەوتن، ئنجا ئەو ئایەتانە لە بارەی ئەوانەوە هاتن.

**دووەم:** گێڕدراوەیەکی دیکە کە (الطبري)[٢] هێناویەتی، (عَنْ مُجَاهِدٍ رَحِمَهُ الله قَالَ: رَجَعَ يَعْنِي رَسُولُ الله ﷺ عَنْ مَكَّة فَوَعَدَهُ اللهُ مَغَانِمَ كَثِيْرَة، فَعُجِّلَتْ لَهُ خَيْبَر، فَقَالَ الْمُخَلَّفُون: ﴿ ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾، وَهِيَ المَغَانِم التيَ أُخُذوهَا، قَالَ اللهُ جَلَّ

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام ج٣، ص١٦٢.

(٢) برقم: ٣١٥٥٩.

ثَنَاؤُهُ: ﴿إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا﴾، وَعَرَضَ عَلَيْهِم فَقَالَ: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾).

واتە: موجاهید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە گەڕایەوە، خوا بەڵێنی دەستکەوتانێکی زۆری پێدا، بەڵام دەستکەوتەکانی خەیبەری بۆ پێشخستن، {ئەوان لە مانگی (**ذي القعدة**)دا، بەرەو عومرە چوون بۆ مەککە، مانگی (**ذي القعدة**)ی ساڵی شەشەمی کۆچیی، مانگی (**ذي الحجة**)ش دانیشتن لە مەدینە، دوایی لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچییدا، بەرەو خەیبەر چوون}، ئنجا لەو کاتەدا بەجێهێڵراوەکان لە عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ﴿ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، لێمانگەڕێن با شوێنتان بکەوین، دەیانویست فەرمایشتی خوا بگۆڕن، {کە بریتی بوو لە بەشدارییان لەو دەستکەوتانەدا کە خوا بەڵێنی دابوو، تەنیا بۆ ئەو کەسانە بن کە بەشداربوون لە صولحی حودەیبییەدا، واتە: (١٤٠٠) کەسەکە}، وەک خوا ﷻ فەرمووی: ﴿إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا﴾، کاتێک دەرچوون بۆ گرتنی دەستکەوتانێک، دەیانویست، ئا ئەوە بگۆڕن و ئەوانیش بێن، بەڵام خوا ﷻ فەرمووی: ﴿قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ﴾، بڵێ: شوێنمان ناکەون خوا پێشتر وای فەرمووە، (کە دوایی باسی دەکەین، وا فەرموونەکەی خوا چۆنە؟) بەڵام دوایی بۆی پێشنیارکردن کە لە مەودوا بانگ دەکرێن بۆ جەنگکردن لە دژی کۆمەڵێکی بەهێز، (ئەو کاتە دەتوانن ئەوە قەرەبوو بکەنەوەو تێیهەڵێننەوە)[1].

---

(١) تێیهەڵێننەوە: پڕی بکەنەوە، تۆڵەی بکەنەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

وەک گوتمان: ئەو ئایەتانە هەموویان لە بارەی یەک بابەتەوەن، ئەویش بریتیە لە خۆ بەجێهێشتنی کۆمەڵێک لە خێڵە عەرەبە بیابانشینەکان کە لە دەوری مەدینە بوون و، توێژەرەوانی قورئان ناوی شەشانیان هێناوە، ئەوانە کە بەجێمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە دەچوو بۆ عومرە، بەڵام دوایی صوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوە، دوایی خوا ﷻ بەڵێنی بەو (١٤٠٠) کەسەدا، ئەوە لە جیاتی ئەو عومرەکردنە کە نەیانتوانیوە عومرە بکەن، وەک دڵدانەوەو دڵهێنانەوە جێی خۆی ئەوان و، بۆ ئەو حاڵەتە دەروونییە خراپەی کە بەسەریان هات، تاکو ئەو حاڵەتەیان لابچێ، خوای پەروەردگار جەنگی خەیبەری بۆ هێنانە پێش، کە ئەوەش هەر دەبوو بکرێ، وەک پێشتر باسمان کرد، لەوێ دەستکەوتی زۆریان دەستەبەرکردن، ئنجا ئەو خێڵە عەرەبە بیابانشینانە، دەیانزانی کە ئەگەر بچن بۆ جەنگی خەیبەر، دەستکەوتیان دەبێ، بۆیە بۆ ئەوێ پێیان خۆش بووە بچن، بەڵام بۆ عومرەکردن لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کە مەترسیی شەڕو گێچەڵ پێکردنی قورەیش هەبوو، نەچوون، بۆیە خواش ﷻ ڕێی لێگرتن کە لەگەڵیاندا بچن بۆ جەنگی خەیبەر، بەڵام فەرمووی: دواتر کە جەنگی دیکە دێتە پێشێ، لەگەڵ کەسانێکی بەهێزدا، ئەو کاتە دەتوانن ئەوە قەرەبوو بکەنەوە.

لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ ﴾، لەمەودوا بەجێهێڵراوەکان لە خێڵە عەرەبە بیابانشینەکان پێت دەڵێن، واتە: وەک پاساوو پۆزش هێنانەوە بۆ کاری دواکەوتنیان کە لەگەڵتدا نەهاتن بۆ عومرە کردن لە مەککە، کە صوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوە: ﴿ شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا ﴾، ماڵ و سامانەکانمان و کەس و کارمان ئێمەیان سەرقاڵکرد، بە هۆی ئەوانەوەو

سەرپەرشتییکردنی ئەوانەوە، ئێمە نەمانتوانی لە خزمەتتدا بین، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ: ﴿فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا﴾، ئنجا داوای لێبوردنمان بۆ بکە، واتە: داوای لێبووردنمان بۆ لە خوا بکە!

خواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ﴾، بە زمانەکانیان شتێک دەڵێن کە لە دڵەکانیاندا نیە، یانی: کە گوتوویانە: داوای لێبوردنمان بۆ لە خوا بکە، زۆر بەڕاستییان نەبووەو بە گشتیی بە دڵیان نەبووە، خوای پەنهانزان ئاگاداری دڵیشیانەو زمانیشیانە، بەڵکو زیاتر مەبەستیان ئەوە بووە، خۆیان پیاو چاک بکەن، خۆیان وا پیشاندەن کە هەر بۆیان نەگونجا بێن! تاکو زەمینە خۆشبکەن، بۆ دوایی کە بۆ جەنگی خەیبەر وەگەڵ خۆیان بدەن و ڕێگایان بدەن بچن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾، بڵێ: ئایا کێ لە بەرانبەر خوادا شتێکی بۆ ئێوە بەدەستە؟ کێ شتێکی لە دەست دێ، لە لایەن خواوەو لە بەرانبەر خوادا؟ ﴿إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا﴾، ئەگەر بیەوێ زیانێکتان لێ بدات، یاخود بیەوێ سوودێکتان پێ بگەیەنێ؟ ﴿بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا﴾، {ڕاست ناکەن سەرقاڵ بووبن بە هۆی ماڵ و سامان و، بە هۆی کەس و کارتانەوە}، بەڵکو خوا شارەزا بوو بەوەی ئەنجامتان دەدا، واتە: خوا هۆکاری ڕاستەقینەی دواکەوتنەکەتان دەزانێ کە ئەنجامتان دەدات، شارەزایەو دەزانێ هۆکارەکە ئەوە نەبوو، بەڵکو هۆکارەکە ئەوە بوو، کە خوا ﷻ باسی دەکات:

﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾، بەڵکو پێتان وابوو پێغەمبەر ﷺو، بڕواداران هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ لای کەس و کاریان، پێتان وابوو: ئەو چوونەی دەچن، ناگەڕێنەوە، سەریان بە فەتارەت دەچێ و لە نێو دەچن، هەتا هەندێکیان گوتوویانە: (مَـا مُحَمَّـد وَأَصْحَابَـهُ إلاّ أَكَلَـةُ رَأْسٍ)، موحەممەدو هاوەڵانی بایی ئەوەندەن، بە کەللە سەرێکی حوشترێک تێر دەخۆن، ئەوانە چۆن بە قوڕەیش دەوێرن!

﴿ وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾، ئەوەش لە دڵتاندا ڕازێنرایەوە، ئەو گومانە خراپە لە دڵتاندا ڕازێنرابۆوە لە لایەن شەیتانەوە، ﴿ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ﴾، گومانی خراپتان (بە خوا) برد، هی پێشێ گومانتان وابوو کە پێغەمبەر ﷺو بڕواداران هەرگیز بۆ لای کەس و کاریان ناگەڕێنەوە، ئەو گومانە خراپە لە دڵتاندا ڕازێنرایەوەو دواییش گومانی خراپتان بە خوا ﷻ برد کە پشتگیریی پێغەمبەرەکەی و بڕوادارانی شوێنکەوتووی ناکات و، سەرپەرشتییان ناکات و ئاگای لێیان نیە، ﴿ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾، لە ئەنجامی ئەو گومانی خراپ بردنەدا کە پێغەمبەرو هاوەڵانی ناگەڕێنەوەو، ئەو ڕازێندرانەوەی گومانە خراپە لە دڵتانداو، ئەو گومانی خراپ بردنە بە خوای پەروەردگار، ئێوە بوونە کۆمەڵێکی بێ خێری فەوتاو، (بُور) کۆی (بَائِر)ە، بە مانای فەوتاو (هَالِك)و، بە مانای تێکچوو (فَاسِد) دێ، واتە: فەوتاوو تێکچوو و بێخێرو بێ بەرهەم، دەگوترێ: زەوییەکی بەیار، زەوییەک کە هیچی لێ نەکرابێ و، بێ بەرهەم بێ.

﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴾، هەر کەسێک بڕوا نەهێنێ بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، بە دڵنیایی ئێمە بۆ بێبڕوایان کڵپەی ئاگرمان ئامادە کردوە، (سَعِيْر): (النار المتسعِّرة النَّار المُتَأَجِّجة) ئاگرێکی هەڵکراو، ( سَعَرتُ النَّارَ وَسَعَّرْتُهَا وَأَسْعَرْتها)، واتە: ئاگرەکەم بڵێسەدار کردوەو هەڵمگیرساندوەو کڵپەدارم کرد، ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، حوکمڕانیی و باڵادەستیی لە ئاسمانەکان و زەویدا هی خوایە، ﴿ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ﴾، هەر کەسێ بیەوێ لێی دەبووریّ و، هەر کەسێ بیەوێ سزای دەدات، بەڵام بێگومان نە لێبوردنی خواو نە سزادانی خوا، هیچیان بە گۆترە نین، هەمووی لە جێی خۆیدایە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بەس دەیەوێ ڕەهایی ویستی خۆی و باڵا دەستیی خۆی پێشانی ئێمە بدات، بەڵام هەموو ئایەتەکان دەبێ پێکەوە فام بکرێن، یەکێ لە سیفەتەکانی خوا ﷻ ئەوەیە کە حەکیمە، کەواتە: هەموو شتێکی بە حیساب و کیتابەو کاربەجێ و کارزانە، دەزانێ لە کێ دەبووریّ و، چەندە لێی دەبووریّ

و، بۆچی لێی دەبووریٚ؟ دەشزانیٚ کیٚ سزا دەدات و، چۆنی سزا دەدات و، بۆچی سزای دەدات؟ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، خوا ﷻ هەمیشە لێبووردەی بە بەزەیی بووە، واتە: ئەگەر ئێوەش بگەڕێنەوە، خوا هەم لێبووردنی هەیە بۆ گوناهو تاوانتان، هەم بەزەییشی هەیە بۆ چاکە لەگەڵدا کردنتان.

﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا﴾، بەجێهێڵراوەکان پێتان دەڵێن: هەر کاتێک دەرچوون بۆ چەند دەستکەوتێک کە بیانگرن، واتە: بۆ جەنگی خەیبەر کە سەرەنجامەکەی ئەوەیە دەستکەوتان دەگرن، پێتان دەڵێن: ﴿ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ﴾، جاریٚ نەیانگوتوە، بەڵام خوا ﷻ زانیویەتی کە دەیڵێن، بۆیە پێشیٚ پێغەمبەری ئاگادار کردۆتەوە، پێتان دەڵێن: لێمان گەڕێن با شوێنتان بکەوین، لەگەڵتان بێین، ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، دەیانەویٚ فەرمایشتی خوا بگۆڕن، ئنجا ئایا کوا فەرمایشتی خوا لە کوێیە، کە فەرموویەتی نابیٚ بێن؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا، ڕوونی دەکەینەوە، دیار نیە خوا ﷻ لە هیچ ئایەتێکدا فەرمووبێتی: نابیٚ عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان لەگەڵتان بێن بۆ جەنگی خەیبەر، بەڵام دیارە خوا ﷻ بە شێوەی تایبەت بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندوەو خورپە (إلهام)ـی بۆ کردوەو بە شێوەیەک لە شێوەکانی وەحیی، پێغەمبەری خوای ﷺ ئاگادار کردۆتەوە، ئنجا خوا ﷻ ئەوەی ناو لێناوە: ﴿كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، فەرمایشتی خوا، چونکە ئەوەی خوا لە قورئاندا دایبەزاندوە فەرمایشتیەتی و، ئەوەش کە لە ڕێی جیبریلیشەوە بۆ پێغەمبەری ناردوە، هەر فەرمایشتی خوایە، ئەمەیان فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خوایە، ئەوەی دیکەش فەرمایشتی ناڕاستەوخۆیەتی و، پێغەمبەری خوا ﷺ خراوەتە دڵی و بەرچاوی پیٚ ڕۆشن کراوەتەوە.

﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ﴾، هەر بەو شێوەیەتان، خوا ﷻ پێشتر فەرمووی {نابیٚ بێن}، واتە: کاتیٚ ویستتان بچن بۆ جەنگی خەیبەرو ئەوان گوتیان: دێین، بڵیٚ: خوا پێشتر فەرموویەتی: نابیٚ بێن، ئنجا ئەو پێشتر

فەرموونـەی خـوای پـەروەردگار، بـە شـێوەی خسـتنە نێـو دڵ و، بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکانی دیکـەی وەحیـی بـووە، چونکـە ئەگـەر بـە ئایەتێـک بووایـە، دیـار دەبـوو، ﴿ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ﴾، ئنجـا ئـەوان دەڵێـن: بەڵکـو ئێرەیـی و حەسـوودییمان پێدەبـەن، واتـە: ئـەوەی بـۆ خۆتـان پێتـان چاکـە، بـۆ ئێمەتـان نـاوێ، ﴿ بَلْ كَانُواْ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، بەڵکـو ئـەوان کەمێـک نەبـێ تێناگـەن، عادەتیـان وایـەو هـەر لـە سـەرەتاوە وابـوون، کـە کەمێک نەبـێ حاڵیـی نابـن و تێناگـەن، بۆیـە نازانـن کـە ئـەوە سـزادانێکی خوایـە بۆیـان، نـەک حەسـوودیی بـردنی مسـوڵمانان بـێ پێیـان، بەڵکـو ئـەوە سـزادانی خوایـە بۆیـان.

ئنجـا وەک چـۆن ئـەوان کاتی خـۆی، مـاڵ و سـامان و کـەس و کاریـان کـردە بیانـوو بـۆ نەچـوون لەگـەڵ خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ بـۆ عومـرە کـردن، ئێسـتاش خـوا ﷻ لـەو مـاڵ و سـامانەی کـە مەزەنـدەی هەیـە لـە جەنگـی خەیبـەردا ببێتـە دەسـتکەوت، بـێ بەشـیان دەکات، خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ ﴾، بـە بەجێهێڵـراوەکان لـە عەرەبـە بیاباننشـینەکان بفەرمـوو: ﴿ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾، لـە مـەودوا بانـگ دەکرێـن بـۆ جەنـگ کـردن لـە دژی کۆمەڵێکـی خـاوەن هێـزی زۆر، خـاوەن هێـزی سـەخت و پتـەو، ئایـا ئـەو کۆمەڵـە کێـن؟ هەندێـک گوتوویانـە: ڕۆمەکانـن و، هەندێک گوتوویانە: فارسـەکانن و، هەندێـک گوتوویانە: بەنوو حەنیفـەن و، هەندێـک گوتوویانـە: فڵانـە هـۆزەو گوتوویانـە: فیسـارە، بـەڵام دیاریـی نەکـراوەو هەموویـان دەگرێتـەوە، ﴿ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ﴾، لـە دژیـان دەجەنگـن، یـان خـۆ بەدەسـتەوە دەدەن، واتـە: مـل کـەچ دەکـەن و ئاشـتیی پێشـان دەدەن و لەگەڵتاندا تەبـا دەبـن، ئنجـا مسـوڵمان بـبن یـان نەبـن، ئنجـا ئـەو ئاشـتیی نوانـدن و تەبایـی پێشـاندانە، چ لـە دانی سـەرانەدا بەرجەسـتە ببـێ، چ لـە هـەر جـۆرە ڕێککەوتنێکـدا کـە لـە نێـوان قـەوارە سیاسـییەکان و قـەوارەی سیاسـیی ئیسـلامییدا ئەنجـام دەدرێ، گرنـگ ئەوەیـە ئـەوان ئاشـتیی پێشـان دەدەن و، تەبایـی دەنوێنـن و سـەنگەرتان لـێ ناگـرن، کەواتـە: تەنیـا دوو حاڵەتتـان لـە نێوانـدان: یـان دەبـێ لـە دژیـان بجەنگـن، یـان دەبـێ ئـەوان خـۆ بەدەسـتەوە بـدەن و ئاشـتیی و سـەلامەتیی بنوێنـن.

﴿ فَإِن تُطِيعُواْ يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗا ﴾، هـەر کات ئـەوان حاڵـەتی جەنگیـان هەڵبـژارد، ئەگـەر ئێـوە فەرمانبەریـی (خـواو پێغەمبـەری خـوا) بکەن، خوا پاداشـتێکی باشـتان دەداتـەوە، ﴿ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ ﴾، بـەڵام ئەگـەر پشـت هەڵبکـەن و لـە فەرمانبەریـی خـوا ڕوو وەربچەرخێنـن و، ڕوو وەربگێـڕن لـە فەرمانبەریـی کـردن بـۆ خـوا، وەک پێشـتر پشـتتان هەڵکـردووەو ڕووتـان وەرگێـڕاوە، ﴿ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾، بـە ئازارێکـی بـە ئێـش و ژان سـزاتان دەدات.

دوایـی خـوا ﷻ هەندێکیـان هەڵداوێـرێ لـەو حوکمـە گشـتییە، واتـە: ئەوانـەی کـە بـە زاراوی ئەمـڕۆ پێیـان دەگوتـرێ: خـاوەن پێداویسـتیی تایبـەت، ئەوانـەی کـەم ئەندامـن و، ئەرکـی جەنـگ و جیهادیـان بـۆ ئەنجام نـادرێ:

﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ ﴾، کوێـر سـەغڵەتیی نایەتـە سـەر، یاخـود گوناهـی نایەتـە سـەر (ئەگـەر نەچـێ بـۆ جەنـگ و جیهـاد)، ﴿ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ ﴾، هەروەهـا بابـای شـەلیش بـە هەمـان شـێوە سـەغڵەتیی و گوناهـی نایەتـە سـەر، ﴿ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ ﴾، هەروەها بابای نەخۆشـیش سـەغڵەتیی و گوناهـی نایەتـە سـەر، ئەگـەر بەشـداریی جەنـگ نـەکات، لەبـەر ئـەوەی بۆیـان ناکـرێ، ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، هـەر کەسـێک فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەشی بـکات، ﴿ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، دەیخاتـە نێـو چەنـد باغ و بێسـتانێکەوە کـە ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن، واتـە: ڕووبـار بـە ژێـر درەختەکانیانـدا دەڕۆن، یاخـود ڕووبـارەکان هـەر لـە ژێـر درەختەکانـدا هەڵدەقوڵـن و دەڕۆن، نـەک لـەو لاڕا ئاویـان بـۆ بـێ، ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ﴾، هـەر کەسـێکیش پشـت هـەڵ بـکات، پشـت بکاتـە خـوا ﷻ و پێغەمبـەری خـوا ﷺ و پەیـام و بەرنامـەی خـواو، ئەرکێکـی شـەرعیی کـە بـۆی دیاریـی کـراوەو پێشـی ئەنجـام دەدرێ، هـەر کەسـێ وابـکات، ﴿ يُعَذِّبۡهُ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾، بـە ئازارێکـی بـە ئێـش سـزای دەدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

هەواڵدانی خوای پەنهانزان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە لە مەودوا عەرەبە بیابانشینە جێهێڵراوەکان، بەوە پۆزشی دواکەوتنی بۆ دێننەوە، کە سەرقاڵیی بووە بە ماڵ و سامان و خێزان و کەس و کاریانەوە، بەڵام ڕاستییەکەی هۆکاری خۆ بەجێهێشتنیان لەو سەفەرە، گومانی خراپ بردنیان بووە بە خوا ﷻ، کە پێغەمبەر ﷺو بڕواداران سەریان بە فەتارەت دەچێ و ناگەڕێنەوە! خواش هەر کام لە ترس و ئومێدیان وەبەردەنێ، بەڵکو لە داهاتوودا هەڵوێستی چەوتی خۆیان ڕاست بکەنەوە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا بَلْ كَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا (١١) بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًا بُورًا (١٢) وَمَن لَّمْ يُؤْمِن بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا (١٣) وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (١٤) ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

١)- ﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ ﴾، لە مەودوا بەجێهێڵراوەکان لە عەرەبە بیابانشینەکان دەڵێن، پێشتریش باسمان کرد، ڕوونکەرەوانی قورئان و مێژوو نووسان

بە تایبەت (**إبن هشام**) دەڵێ: ئەو هۆزە عەڕەبە بیاباننشینانە، شەش هۆز بوون: (**غِفار، مُزَيْنَة، جُهَيْنَة، أَشْجَع، أَسْلَم، الدِّيل**)، ئەوانە لە دەوروبەری مەدینە بوون، ڕەنگە هی دیکەش بووبن و، ئەوانە زەقترینیان بووبن.

٢)- ﴿ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا ﴾، {پێت دەڵێن:} سامانەکانمان و، ماڵ و خێزان و کەس و کارمان، سەرقاڵیان کردین، چونکە (**أَمْوَال**) کۆی (**مَال**)ە، (**أَهْلُونَ**)یش کۆی (**أَهْل**)ە، بەڵام بەبێ قیاس، بەڵکو لەو جۆرەیە کە پێی دەگوترێ: (**أُلْحِقَ بِجَمْعِ الْمُذَكَّرِ السَّالِم**)، پەیوەست کراوە بە کۆی نێرینەی سەلامەتەوە: (**أَهْل، أَهْلُونَ**)، واتە: ماڵ و سامانەکانمان و خێزانەکانمان و کەس و کارمان، ئێمەیان سەرقاڵ و دەستگیراو کرد.

٣)- ﴿ فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ﴾، ئنجا داوای لێبوردنمان بۆ بکە، واتە: داوای لێبوردنمان بۆ لە خوا ﷻ بکە.

٤)- ﴿ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ﴾، بە زمانەکانیان شتێک دەڵێن کە لە دڵیاندا نیە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان ڕاستگۆ نەبوون لەوەدا، کە داوای لێبوردنیان کردوە، واتە: داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات و، ئەوەی لە مەودوا دێ، ئەوە دەگەیەنێ کە هاندەریان ئەوە نەبووە، هەست بە گوناهباریی بکەن و، داوا لە پێغەمبەر ﷺ بکەن، داوایان بۆ لە خوا بکات: خوا لێیان ببوورێ.

٥)- ﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، بڵێ: لە بەرانبەر خواداو، لە لایەن خواوە کێ شتێکی بۆ ئێوە بە دەستە، یانی: (**مَنْ يَمْلِكُ لَكُمْ مِنْ إِرَادَةِ اللهِ، مِنْ جِهَةِ الله**)، لە ویستی خوا کێ شتێکی بۆ ئێوە بەدەستە، لەلایەن خواوە کێ شتێکی بۆ ئێوە بەدەستە، یان لە بەرانبەر خوادا کێ شتێکی لە دەست دێ؟

٦)- ﴿ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا ﴾، ئەگەر زیانی بۆتان بوێ، یاخود سوودی بۆتان بوێ؟ (**ضَراً**) خوێنراویشەتەوە بە (**ضُراً**)، واتە: ئەگەر زیانگەیاندنی بۆتان بوێ، زیان و خراپەی بۆتان بوێ، یاخود قازانج و سوودی بۆتان بوێ، کێ شتێکی بەدەستە لەلایەن خواوە کە نەهێڵێ، زیانتان لێ بدات، یان نەهێڵێ خێرتان پێ بگەیەنێ؟ واتە: ئەو

بەجێمان و خۆ بەجێهێشتنەتان، نە زیانتان لێ دووردەخاتەوەو نە سوودێکیشتان بۆ دێنێتە پێش.

٧)- ﴿بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾، بەڵکو خوا ﷻ شارەزا بوو بەوەی دەتانکرد، ئنجا ئەوەی دوایی کە دێ، ئەوە ڕوون دەکاتەوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾، (بَلْ: لـلإِضْرَابِ الإِبْطَالِيِّ، إِبْطَالٌ لِقَوْلِهِم: ﴿شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا﴾)، (بَلْ) لێرەدا بۆ گواستنەوەی هەڵوەشاندنەوەیە، واتە: وانە بووە کە دەڵێن: ماڵ و سامان و کەس و کارو خێزان سەرقاڵیان کردین.

٨)- ﴿بَلۡ ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهۡلِيهِمۡ أَبَدٗا﴾، بەڵکو هۆکاری ڕاستەقینەی خۆ بەجێهێشتنتان {لە پێغەمبەری خوا ﷺو بڕواداران لە چوونیان بۆ مەککەو، بۆ عومرە}، ئەوە بوو گومانتان وابوو، نە پێغەمبەر ﷺو نە بڕواداران هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ لای کەس و کاریان.

بەڵکو ئەو چوونەی کە دەچن گەڕانەوەی نیەو، سەریان بە فەتارەت دەچێ و، جارێکی دیکە چاویان بە کەس و کارو شاریان ناکەوێتەوە!!.

٩)- ﴿وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾، ئائەوەش لە دڵتاندا ڕازێنرایەوە، واتە: پێشی گومانتان بردوە، دوایی وردە وردە شەیتان ئەو گومانەی لە دڵتاندا زیاتر ڕازاندۆتەوەو چەسپاندوویەتی، چونکە شەیتان هەر لە بۆسەدایە بۆ مرۆڤ، خەیاڵ و خولیایەکی خراپ بچێتە نێو دڵی، ئنجا شەیتان زیاتر ئەو خولیایەی کە بە شێوەیەکی زوو تێپەڕ دێ و دەچێ، هەوڵدەدات بیچەسپێنێ و جوانی بکات و بیڕازێنێتەوە.

١٠)- ﴿وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ﴾، گومانی خراپتان برد.

ئەو گومانە تایبەترە لەوەی پێشێ، ئەوەی پێشێ گومانیان برد بە پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران، کە هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ لای کەس و کاریان و، ئەو گومانە خراپە لە دڵیاندا ڕازێندرایەوە، ﴿وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ﴾، هەروەها گومانی خراپتان

بـرد، ئەمـە گومانێکـی تایبەتـە، واتـە: گومـانی خراپتـان بـە خـوا ﷻ بـرد، کـە پێتـان وابــوو پێغەمبــەر ﷺو هــاوەڵانی ناگەڕێنــەوە بــۆ لای کــەس و کاریــان و هەرگیــز چاویـان پێیـان ناکەوێتـەوە، لـە ئەصڵـدا ئـەو گومانـە خراپـەی بەوانتـان بـردوەو، ئـەو خەونـە خراپـەی بەوانتانـەوە بینیـوە، سـەرچاوەکەی گومـانی خـراپ بـردن بـووە بـە خـوا، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ خـوا سەرپەرشـتیی دەکات، بـڕواداران خـوا سەرپەرشـتیارو دۆسـت و هاوەڵیانـە، ئنجـا تـۆ پێـت وابـێ ئـەوان سـەریان بـە فەتـارەت دەچـێ، مانـای وایـە گومانـە خراپەکـەت بـە خـوا بـردوە، گوایـە: خـوا مشـووریان لـێ ناخـوات و سەرپەرشـتییان نـاکات و سـەریان ناخـات!

**١١)** - ﴿ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾، سەرەنجام ئێوە بوونە کۆمەڵێکی فەوتاو، یان کۆمەڵێکی بێ خێر، (**البُورُ: مَصْدَرٌ كَالْهُلْكِ، بِنَاءً وَمَعْنَىً**)، وشەی (**بُور**) وەک چۆن دەگونجێ کۆی (**بَائِر**) بێ، واتە: فەوتاوەکان، دەشگونجێ چاوگ بێ، وەک (**هُلْك**) واتە: فەوتان، ئێوە بوونە کۆمەڵێکی فەوتاو، (**وَمِثْلُ البَوَار كَالْهَلاَك**)، (**بَوَار**): ﴿وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ۝٢٨﴾ **إبراهيم**، واتە: خەڵکەکەی خۆیان بردە مەنزڵگای فەوتانەوە، (**بَوَار**)یش بە مانای (**هَلَاك**)ە، واتە: فەوتان، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾، (**إقْحَامُ قَوْماً لإفَادَةِ أنَّ البَوَارَ سَارَ مُقَوِّماً لَهُمْ**)، بۆیە وشەی (**قَوْماً**) خراوەتە نێو ئەو ڕستەیەوە، تاکو ئەوە بگەیەنێ کە ئەوانە فەوتان و بێ خێریی بۆتە پێکهێنەرێکی بنەڕەتییان، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾، وەک چۆن دەگونجێ (**بُور**) کۆی (**بَائِر**) بێ: فەوتاو، فەوتاوەکان، دەشگونجێ (**بُور**) چاوگ بێ، هەر بۆیەش بە تاک کراوە بە وەصف، بەڵام دوایی وەسفکراوەکە لە مانای کۆدایە، (**بُور**) واتە: فەوتێنران، بەڵام ئەوەی بۆی کراوەتە وەصف کۆیە: ﴿ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا ﴾، چونکە چاوگ پێویستیی بە کۆکردنەوە نیە، چاوگ ئەو شوێنەی کە شتەکەی لێوە هەڵدەقوڵێ، پێویستیی بە کۆ کردنەوە نیە.

**١٢)** - ﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، هەر کەسێکیش بڕوا نەهێنێ بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

١٣)- ﴿فَإِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَعِيرٗا﴾، بە دڵنیایی ئێمە بۆ بێبڕوایان ئاگری کڵپە سەندوومان ئامادە کردوە، (مَنْ) لێرەدا، (مَن الشَّرْطِيَّة)یە، هەر کەسێ بڕوا نەهێنێ بە خواو پێغەمبەرەکەی، (فإنَّا)، ئەم (ف)ە، وەڵامی ئەو مەرجەیە، بەدڵنیایی ئێمە بۆ بێبڕوایان ئاگرێکی کڵپەدارمان ئامادە کردوە، (الكَافِرِين: إِظْهَار فِي مَقَامِ الإِضْمَار)، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرمویٚ: (وَمَنْ لَمْ يُؤْمِن بِالله وَرَسُولِهِ، فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لَهُمْ سَعِيْرًا)، ئێمە ئاگری بەکڵپەی دۆزەخمان بۆ ئامادە کردوون، بەڵام بۆیە (كَافِرِين)ی هێناوە لە جێی ڕاناوەکە، تاکو دەرکەوێ: لەبەر ئەوەی بێبڕوان، خوای پەروەردگار ئەو ئاگرە بڵێسەدارەی بۆ ئامادە کردوون.

١٤)- ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، حوکمڕانێتیی ئاسمانەکان و زەوییش تەنیا هی خوایە ﷻ، (المُلْكُ: الحُكْمُ وَالسَّيْطَرَةُ وَالسُّلْطَةُ المُطْلَقَة)، (ملك) حوکمڕانیی و دەسەڵات و باڵا دەستی ڕەهایە، کە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا، تەنیا هی خوایە.

١٥)- ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾، لە هەر کەسێ بیەوێ دەبووریٚ.

١٦)- ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾، هەر کەسێکیشی بیەوێ سزای دەدات.

١٧)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾، خواش ﷻ هەردەم لێبوردەی بە بەزەیی بووە، ئەوەی پێشێ ترساندن بوو، ئەمەشیان تەماع وەبەرنانە، کە پێشێ فەرمووی: ئاگری کڵپەداری دۆزەخمان بۆ ئامادە کردوون، بەڵام ئنجا خوا ﷻ تەماعی وەبەرنان، کە لێبوردەی میهرەبانیشە، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای.

شایانی باسە: ئەو عەڕەبە بیابانشینە خێڵەکییانە، پێشتر پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبووەو، لەگەڵ مسوڵماناندا هاوپەیمان بوون، بۆیە گلەیی و سەرزەنشتیان هاتۆتە سەرێ، مسوڵمان بوون، بەڵام دیارە ئیمان لە دڵیاندا چەسپاو نەبووەو بڕواداری تەواو نەبوون، بەڵام مونافیق و دەغەڵ نەبوون، ڕەنگە دڵ نەخۆشیشیان تێدا بووبن، بەڵام بە گشتیی بە مسوڵمان لە قەڵەم دراون، هەروەک چۆن لە سووڕەتی (التوبة)شدا، خوا ﷻ باسی عەڕەبە خێڵەکییەکان دەکات، لەوێشدا خوا ﷻ پۆلێنیان دەکات بۆ دوو جۆر:

أ- جۆرێكیان كە بڕوادارن و پابەندن بە شەریعەتەوە.

ب- جۆرێكیشیان كە دڵ و دەروونیان نەخۆشیی تێدایە.

أ- دەفەرموێ: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ ﴾.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾ ﴾.

هەڵبەتە سوورەتی **(التوبة)** وەک پێشتر تەفسیرمان كردوە لە دوای جەنگی تەبووک، كە لە ساڵی دەیەمی كۆچییدا بووە، ئەو كاتە دابەزیوە، واتە: لەوێ عەرەبە خێڵەكییەكان وردە وردە لێک جیابوونەوە، هەندێكیان بە یەكجاریی بە لای كوفرو نیفاقدا چوون و، هەندێكیشیان بە یەكجاریی بە لای ئیمان و مسوڵمانەتییدا شكاونەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**داواکردنـی بەجێهێڵـراوەکان کـە بەشـداریی جەنگێـک بکەن، ئەگەری دەسـتکەوتی جەنگیـی زۆرەو، لـە کاتی ڕێ پـێ نەدانیشـیاندا، بـە بەڵگـەی فەرمایشـتی خـوا، کـە پێشـتر بڕیـاری داوە، ئـەو ڕێ پـێ نەدانەیـان، بـە حەسـوودیی لێکداوەتـەوە، بـە هـۆی کـەم فامیـی و دەروون ناسـاغییەوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ﴾، عەرەبە خێڵەکییە بیابانـنشینە بەجێهێڵراوەکان (یان خۆ بەجێهێڵەرەکان)، هەر کاتێک ئێوە دەرچوون بۆ دەستکەوتانێک کە دەستەبەریان بکەن، بە هۆی جەنگی خەیبەرەوە، پێتان دەڵێن:

٢)- ﴿ ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ﴾، لێمانگەڕێن با بە دواتان بکەوین و، لەگەڵتاندا بێین، ئەمەش هەواڵپێدانە بە پێغەمبەر ﷺ کە لە داهاتوودا ئەوە دەبێ، کە فەرموویەتی: ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ ﴾، (أل)ی سەر (**الْمُخَلَّفُون**) بۆ (**عهد**)ە، واتە: عەرەبە خێڵەکییە بیابانـنشینەکان، بۆیە لێرەدا بە پێویست نەزانراوە دووبارە بکرێتەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ﴾، ئەمـەش ئاماژەیـە بۆ ئـەوە کە جەنگی خەیبـەر دێتـە پێشـێ و، دەسـتکەوتی جەنگیش دەسـت مسـوڵمانان دەکەوێ.

پێشـتر فەرمـووی: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ ﴾، بـەڵام لێـرەدا وشـەی (لَـكَ)ی تێـدا نیـە، پێـت دەڵێـن، چونکـە ئـەوەی پێشـێ بـە ڕاسـتیان نەبـووەو، بـە دڵـەوە بـە پێغەمبەریـان ﷺ نەگوتـوە، بـەڵام لێـرەدا بـە دڵ و گیـان پێـی دەڵێـن،

لەبەر ئەوەی تەماعی تێدایە، بۆیە ئەوەی ئەوێ: (لَكَ)ی زیاترە، ﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ ﴾، بە تایبەتیی بە تۆ دەڵێن، بۆ ئەوەی قەناعەتی پێبێ، چونکە بە دڵیان نەبووە، بۆیە زۆر بە جەختکردنەوە ویستوویانە ئەو پۆزشە بۆ پێغەمبەر ﷺ بێننەوە، بەڵام لێرەدا چونکە بە ڕاستیان بووە، زۆر بە پێویستیان نەزانیوە جەختی بکەنەوە.

٣)- ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ﴾، دەیانەوێ فەرمایشتی خوا بگۆڕن، ئەوە لە مەقامی حاڵ دایە، یانی: لە حاڵێکدا ئەو قسەیان دەکرد، دەیانویست فەرمایشتی خوا ﷻ بگۆڕن.

٤)- ﴿ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا ﴾، بڵێ: هەرگیز شوێنمان ناکەون و لەگەڵمان نایەن، ئەم تەعبیرە بۆ ئەوەیە تەما بڕاو بن، چونکە (لَنْ) بۆ جەختکردنەوەو بۆ داکۆکییکردنە، یانی: هەرگیز لەگەڵمان نایەن.

٥)- ﴿ كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ ﴾، پێشتریش خوا ﷻ وای فەرمووە، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە لێرەدا ئایەتێک نابینینەوە، خوا ﷻ وای فەرموو بێ، کەواتە: لێرەدا مەبەست پێی ئەو وەحییەیە کە خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری ﷺ کردوە، کە دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر، تەنیا بۆ ئەو کەسانە دەبن، لە صولحی حودەیبییەدا بەشداربوون، ئەو (١٤٠٠) کەسە زانراوو ناسراوە، مەبەست ئەوە نیە، خوا ﷻ ئایەتێکی فەرموبێ، ئەگەرنا ئایەتەکە دیار دەبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچی خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە، فەرمایشتی خوا بووەو، بە کەلامی خوا لە قەڵەم دەدرێ، چ لە قورئاندا بەرجەستەبێ، کە فەرمایشتی ڕاستەخۆی خوایە، چ بە شێوەی دیکە بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ فەرموو بێ.

٦)- ﴿ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ﴾، ئەوان پێتان دەڵێن: بەڵکو ئێوە حەسوودییمان پێ دەبەن، حەسەدیش ئەوەیە ئینسان پێی ناخۆش بێ کەسێک چاکەی تووش ببێ، وەک بۆ خۆی هاتۆتە پێش، یاخود: پێی ناخۆش بێ جگە لە خۆی چاکەیەکی بۆ بێتە پێش، ئنجا

چ پێی خۆش بێ، ئەو چاکەیەی تووشی ئەو نەبێ، بۆ خۆی بێ، چ بەس پێی خۆشبێ، چاکەکە بۆ ئەو نەبێ.

**٧)- ﴿بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾**، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) بەڵکو کەمێک نەبێ تێناگەن، یانی: کەمێک تێدەگەن، چونکە ئەوان تەنیا لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی خۆیانەوە تەماشا دەکەن و، لە دڵی نەخۆشیی خۆیانەوە دەڕوانن و، بۆیە لە وردەکارییەکان حاڵیی نابن و، نازانن: خوا ﷻ بۆیە ڕێیان لێ دەگرێ بچن بۆ جەنگی خەیبەر، تاکو سزایان بدات، چونکە ئەوان پێشتر بەوە پۆزشیان هێنایەوە، کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نەچوون بۆ عومرە، بۆ مەککە، گوتیان: لەبەر سەرقاڵییمان بە ماڵ و سامان و کەس و کارمانەوە، ئنجا لێرەش خوا ﷻ لەو ماڵ و سامانە کە ئەگەری هەیە ببێتە دەستکەوتی جەنگیی، بێ بەشیان دەکات، وەک سزادانێک.

کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، زانایان سێ واتایان بۆ **(کلام الله)** لێکداونەوە:

**یەکەم:** بەڵێنی خوا کە دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر تەنیا هی ئەوانە بن، کە لە صوڵحی حودەیبییەدا بەشدار بوون، (١٤٠٠) کەسەکە.

**دووەم:** وشەی: ﴿كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ مەبەست پێی فەرمانی خوایە کە بە پێغەمبەری فەرمووە، جگە لەو (١٤٠٠) کەسە، کەسی دیکە لەگەڵ خۆی نەبات، خوای پەروەردگار بە تایبەت بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە، غەیری قورئان.

**سێیەم:** ئیبنو زەید بۆ تەفسیری **(کلام الله)**، ئەو ئایەتەی (٨٣)ی سوورەتی **(التوبة)** دێنێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ﴿٨٣﴾﴾، ئەگەر داوای مۆڵەتیان لێکردی بۆ دەرچوون، بڵێ: هەرگیز لەگەڵ من دا دەرناچن و هەرگیز لەگەڵ مندا، جەنگ لە دژی هیچ دوژمنێک ناکەن! بەڵام وەک **(الطبري)**و توێژەرەوەکانی دیکە، گوتوویانە: **(إبن زيد)** لەوەدا نەیپێکاوە، چونکە سوورەتی **(التوبة)** لە دوای فەتحی خەیبەر دابەزیوەو، بگرە لە دوای فەتحی مەککەش هاتوە،

ئنجا ئەمانەی ئێرە بەرەهایی قەدەغە نەکراون کە بەشداریی جەنگ و جیهاد بکەن، بەڵکو پێیان گوتراوە: ﴿سَتُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾، بەڵام ئەوانەی لە سوورەتی (**التوبة**)دا، خوا ﷻ باسیان دەکات، خوای دادگەر بە یەکجارەکیی فەرموویەتی: نابێ هەرگیز لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ جارێکی دیکە بەشداریی هیچ جەنگێک بکەن.

کۆتایی ئەم مەسەلەی دووەمەش بە قسەیەکی (**طبري**) دێنین، کە تێیدا نەیپێکاوە:

پێشەوا (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەیەوێ مانای ئەمە کۆ بکاتەوەو بە کورتیی، دەڵێ: ئەی موحەممەد! ﷺ بەجێهێڵراوەکان لە نێو کەس و کاری خۆیاندا کە هاوەڵاتیی تۆیان نەکرد، کاتێک ڕۆیشتی بۆ جەنگی خەیبەر، کە ئەگەری ئەوە هەیە، دەستکەوتت دەستکەوێ، پێت دەڵێن: با بێین، لە حاڵێکدا خوا ﷻ بە تۆی ڕاگەیاندوە، دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر تەنیا دەبێ بۆ ئەوانە بن کە لە صولحی حودەیبییەدا بەشدار بوون، بۆیە ئەوانە دەیانەوێ ئەو بەڵێنەی خوا ﷻ بە خەڵکی بەشدار بووی حودەیبییە داوە، ئەو بەڵێنە بگۆڕن، بەڵام بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەو تەماعەیان بۆ ناهێنێتە دی، ئنجا لێرەدا (**الطبري**) شتێک دەڵێ: کە تێیدا نەیپێکاوە، دەڵێ: (**عِوَضاً مِنْ غنَائِمِ أَهْلِ مَكَّة**)، ئەوە وەک قەرەبوویەک بووە بۆ دەستکەوتەکانی خەڵکی مەککە! بەڵام بێگومان ئەمە ڕاست نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر لە ئەصڵدا بۆ مەککە، بە نیازی جەنگ نەدەچوو تاکو تەماعی دەستکەوتیان ببێ، بەڵکو بۆ عومرە بەجێهێنان دەچوو!

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بە بەجێماوەکان بفەرمووێ: لە مەودوا بۆ جەنگ لە دژی کۆمەڵێکی زۆر بەهێز بانگهێشت دەکرێن، ئنجا ئەگەر فەرمانبەریی بکەن، پاداشتی باشتان دەدرێتەوە، نەک دەستکەوتی ماددیی! ئەگەرنا دوو چاری سزای بە ئێش و ژان دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ﴾، (ڕووی دواندن لە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەدە ﷺ، خوا ﷻ دەفەرمووێ:) بە عەرەبە خێڵەکییە بەجێهێڵراوەکان بڵێ، یان، بە بەجێماوەکان لە عەرەبە بیاباننشیین و خێڵەکییەکان بفەرموو:

٢)- ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، لە مەودوا بانگ دەکرێن بەرەو کۆمەڵێکی خاوەن هێزی زۆر، یانی: (**إِلَى قِتَال قَوْمٍ**)، لێرەدا ئەم دواندنەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ:

**یەکەم:** هەواڵدانە بە نادیار (غیب) بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بە عەرەبە بەجێهێڵراوەکان بفەرمووێ: لە مەودوا بانگ دەکرێن، واتە: بە مسۆگەریی بانگ دەکرێن، کە جاریٚ ئەو شتە نەبووە، بە دڵنیاییش جگە لە خوا ﷻ کەس ناتوانێ قسەی وابکات، شتێک کە نەهاتوە بڵێ: بێگومان دەبێ.

**دووەم:** ئەو دواندنەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بە عەرەبە بیاباننشیینەکان ئاوا بفەرمووێ، هەم دڵنیاکردنەوەیانەو، هەم جۆرێک لە دڵدانەوەیانە کە ئەگەر ئەمجارە

بێ بەشکران لە بەشداریی لە جەنگی خەیبەردا، وەک سزادانێک بۆ نەچوونیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆ عومرە، لە مەودوا ئەوەیان بەوە بۆ قەرەبوو دەکرێتەوە: کە بانگ دەکرێن بۆ جەنگ و نەک هەر ڕێیان پێ دەدرێ، بەڵکو داواشیان لێ دەکرێ و بانگهێشتیش دەکرێن، بەڵام بۆ جەنگ لە دژی کۆمەڵێکی خاوەن هێز، واتە: نەک بۆ نێچیرێکی بە بۆچوونی ئەوان تووک نەرم و ئاسان، وەک جوولەکەکانی خەیبەر، بەڵکو بۆ خەڵکێکی خاوەن هێزی زۆر.

کە دەفەرمـوێ: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، یانی: بـۆ جەنـگ لـە دژی کۆمەڵێکـی بەهێـز، چونکـە سـیاقەکە ئـەوە دەگەیەنـێ و، بـاس باسـی جەنـگ و جیهـادەو، ئـەوان لـە چـوون لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ دواکەوتـن و، دوایـی داوایانکـرد کـە لـە خزمـەت پێغەمبـەرو هاوەڵانیـدا بچـن بـۆ جەنگـی خەیبـەر، کەواتـە: ئـەوەی بـۆی بانـگ دەکرێـن، هـەر ئەوەیـە کـە لێـی دوا کەوتـوون و دوایـی لێـی بێبـەش کـراون، کـە بریتیـە لـە جەنـگ لـە دژی کۆمەڵێکـی خـاوەن هێـزی پتـەو، ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، (**أي: أَصَحـابَ قُـوَّة حَرْبِيَّـة جَيِّـدَة مُقَارَنَـةً بِأَهْـلِ خَيْبَرَ**)، خـاوەن هێزێکـی جەنگیـی بـاش بـە بـەراورد لەگـەڵ خەڵـی خەیبـەردا، ئنجا ئایـا ئـەو کۆمەڵـە خـاوەن هێـزی زۆرە لـە بـواری جەنـگ و ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا، کـێ بـوون و مەبەسـت پێیـان کـێ بـووە؟ زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی هۆزی (**هوازن**)ە.

ب- هەندێک گوتوویانە: مەبەست پێی هۆزی (**بنو حنيفة**)یە، کە هۆزی (**بنو حنيفة**) لە ڕۆژگاری ئەبوو بەکری صددیقدا رضي الله عنه، هەڵگەڕانەوەو جەنگی لە دژ کردن، یانی: هەڵگەڕاوەکان.

ج- هەندێک گوتوویانە: مەبەست پێی گەلی فارسە.

د- هەندێک گوتوویانە: مەبەست پێی گەلی ڕۆمە، گەلی فارس و گەلی ڕۆمیش لە ڕۆژگاری ئەبوو بەکرو عومەردا رضي الله عنهما، جەنگیان لە دژ کرا، دوای ئەوەی مەترسییان دروستکرد بوو بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامیی.

بەڵام (**الطبري**) قسەیەک دەکات کە بە زۆریی لەو سیاقانەداو لەو حاڵەتانەدا (**الطبري**) قسەیەکی گشتگیر دەکات، کە زۆر زۆرم بە دڵەو چەند جارێکیش ئاماژەم پێداوە، ئەویش ئەوەیە: مادام خوا ﷻ دیاریی نەکردوە، ئێمەش هەروا بە کراوەیی بەجێی دەهێڵین و دیاریی ناکەین و، هەر ئەوەش لە ڕەهایی قورئان و، لە بێ سنووریی قورئان و، لە پەیامبوونی قورئان بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، دەوەشێتەوە، ئەو جۆرە مانا لێکدانەوەیە، خوا ﷻ پاداشتی (**الطبري**) بداتەوە کە بە خۆڕایی ناویان لێ نەناوە پێشەوای توێژەرەوان (**إمام المفسِّرين**)، (**الطبري**) دەڵێ:

(**وَأَوْلَى الْأَقْوَال فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ أَنْ يُقَالُ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى ذِكْره، أَخْبَرَ عَنْ هَؤُلَاءِ الْمُخَلَّفِينَ مِنْ الْأَعْرَاب، أَنَّهُمْ سَيُدْعَوْنَ إِلَى قِتَال قَوْم أُولِي بَأْس فِي الْقِتَال، وَنَجْدَة فِي الْحُرُوب، وَلَمْ يُوضَع لَنَا الدَّلِيل مِنْ خَبَرٍ وَلَا عَقْلٍ، عَلَى أَنَّ الْمَعْنِيَّ بِذَلِكَ هَوَازِن، وَلَا بَنُو حَنِيفَة، وَلَا فَارِس، وَلَا الرُّوم، وَلَا أَعْيَانٌ بِأَعْيَانِهِمْ، وَجَائِزٌ أَنْ يَكُون عُنِيَ بِذَلِكَ بَعْض هَذِهِ الْأَجْنَاس، وَجَائِزٌ أَنْ يَكُون عُنِيَ بِهِمْ غَيْرهمْ، وَلَا قَوْل فِيهِ أَصَحّ مِنْ أَنْ يُقَالُ: كَمَا قَالَ اللَّه جَلَّ ثَنَاؤُهُ:** ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾)[١].

دەڵێ: نیزیکترینی قسەکان لە ڕاستییەوە لەو بارەوە ئەوەیە، کە بگوترێ، لێرەدا خوا ﷻ ناوی بەرز بێ، هەواڵی داوە لە بارەی ئەو دواکەوتووانەوە لە عەڕەبە بیاباننشیینەکان، کە لە مەودوا بانگ دەکرێن بۆ جەنگ کردن لە دژی کۆمەڵێکی خاوەن هێز لە جەنگداو، شارەزا لە جەنگداو، هیچ بەڵگەیەکمان لە هەواڵی ڕاست، {مەبەستی ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ}، هەروەها لە عەقڵ بۆ دانەنراوە، کە مەبەست لەو کۆمەڵە نەهۆزی هەوازینەو، نە هۆزی بەنوو حەنیفەیەو، نە گەلی فارسەو، نە گەلی ڕۆمەو، نە کۆمەڵە کەسانێک، یان خەڵکانێکن بە دیارییکراویی، ئنجا دەگونجێ مەبەست لەوە هەندێک لەوانە بن، دەشگونجێ مەبەست پێی جگە لەوان بێ، بەڵام هەر قسەیەک

---

(١) جامع البيان: ج٢٦، ص٨٥.

کە لەوبارەوە بگوترێ، ڕاستتر نیە لە قسەی خوا ﷻ، ستایشی خوا هەر بەرز بێ، کە دەفەرموێ: بانگ دەکرێن بۆ جەنگ کردن لە دژی کۆمەڵێکی خاوەن هێز لە جەنگدا، ئیدی ئەو کۆمەڵە کێن؟ هەموو ئەوانە دەگرێتەوەو جگە لە ئەوانیش دەگرێتەوە.

٣)- ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، لە دژیان دەجەنگن یاخود خۆ بەدەستەوە دەدەن، یانی: تەبایی پێشان دەدەن و ئاشتییان دەوێ، (**أي: تُقَاتِلُونَهُمْ إنْ لَمْ يَسْتَسْلِمُوا وَلَمْ يُسَالِمُوكُم**)، لە دژیان دەجەنگن ئەگەر خۆیان بەدەستەوە نەداو، لەگەڵ ئێوەدا ئاشتییان پێشان نەدا، ئەوە مانا ڕاستەکەیەتی، چونکە لەو بارەوە دواتر باسێک دەکەین، بۆیە ئێستا بە خێرایی بەسەر شیکردنەوەی بڕگەکانی دیکەدا ڕەت دەبین.

٤)- ﴿فَإِن تُطِيعُواْ يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗا﴾، ئەگەر فەرمانبەریی بکەن و گوێڕایەڵیی بکەن، {ئەو کاتەی بانگ دەکرێن بۆ جەنگکردن لە دژی ئەو خەڵکە بەهێزە}، خوا پاداشتێکی باشتان دەداتەوە، واتە: ئەگەر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن، بە وەڵامدانەوەی بانگەوازی جەنگ و فیداکاریی، لەو کاتەدا کە بانگ دەکرێن، لە داهاتوودا خوا پاداشتێکی باشتان دەداتەوە.

٥)- ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ﴾، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەن و، پشت بکەنە بانگەوازێک کە بۆ لای جەنگ و جیهادو فیداکاریی بانگتان دەکات و، پشتی تێبکەن، وەک پێشتریش پشتتان تێکردو ڕووتان وەرچەرخاند.

٦)- ﴿يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾، بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات، ئەمە وا پێدەچێ مەبەست پێی ئازاردان و سزادانی ڕۆژی دوایی بێ، هەرچەندە هی دنیاش دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، چونکە پاداشتەکەش هەر پەیوەندیی بە ڕۆژی دواییەوە هەیە، ﴿يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗا﴾، پاداشتی باش هەر لە دواڕۆژدا هەیەو، لە ژیانی دنیادا جێگای نابێتەوە!

جێی سەرنجە: کە خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا﴾، ئەگەر فەرمانبەریی بکەن، خوا پاداشتێکی باشتان دەداتەوە، نافەرموێ: دەستکەوتتان بۆ دەڕەخسێنێ، ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ﴾، ئەگەر پشتیش هەڵبکەن، وەک لە ڕابردوودا پشتتان هەڵکردوە، (**يَعْنِي: وَإِنْ تُعْرِضُوا كَإِعْرَاضِكُمْ السَّابِقِ**)، ئەگەر وەک پشت هەڵکردنی ڕابردووتان، پشت هەڵکەن، ﴿يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات.

ئنجا ئایا ئەو ئازارە بە ئێشە، مەبەست پێی سزای دنیایە؟ یان هی ڕۆژی دواییە؟ یاخود هەم دنیایەو هەم دواڕۆژییشە؟ هەر سێ ئەگەرەکە هەن، بەڵام وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی ئازاری ڕۆژیی دوایی بێ.

ئەم ئایەتەش وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (**التوبة**) وایە، کە خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ....﴿٣٩﴾﴾، واتە: ئەگەر نەچن بۆ جەنگ و جیهاد، خوا سبحانه وتعالى بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات، ئەویش دیسان دەگونجێ مەبەست پێی سزای دنیا بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ، یاخود هی دنیاو دواڕۆژبێ، بەڵام لەوێش واپێدەچێ سزایەکە مەبەست پێی سزای ڕۆژیی دوایی بێ.

## کورتە باسێک : لەبارەی ڕەوانەبوونی جەنگکردنەوە، بە مەبەستی مسوڵمانکردنی خەڵک

بەڕێـــــزان!

ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### بڕگەی یەکەم: هۆکاری ئەم کورتە باسە لێرەدا:

ئێمە پێشتر لە سوورەتی (**الأنفال**)یشدا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتی: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ...﴿٣٩﴾ ﴾، لەوێ کورتە باسێکمان کردوە، کە دروست نیە، تۆبزیی و زۆر بکرێ لە خەڵک، بۆ ئەوەی مسوڵمان بن و بێنە نێو ئیسلامەوە، چونکە لەوێش زۆربەی توێژەرەوانی قورئان وشەی (**فِتْنَة**) یان بە شیرک لە قەڵەم داوە، (**الدِّينُ**)یشیان بە ئیسلام لە قەڵەمداوە، کە لە ڕاستییدا لە ئایەتە موبارەکەکەدا، (**فِتْنَة**) بە مانای شیرک، نیە، کە هەر ئەم ئایەتە بە تۆزێ جیاوازییەوە لە سوورەتی (**البقرة**)ش دا، هاتوە: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ...﴿١٩٣﴾ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (**الأنفال**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ...﴿٣٩﴾ ﴾، ئنجا لە هەردوو ئایەتەکانی، سوورەتەکانی: (**البقرة**) و (**الأنفال**)دا، (**فِتْنَة**) بە مانای شیرک نیە.

هەروەها (**الدِّين**)یش بە مانای ئیسلام نیە، بەڵکو (**فِتْنَة**) بە مانای سزادان و ئازاردان و ئەشکەنجەدانی مسوڵمانانەو، (**الدِّين**)یش بە مانای ملکەچییە، کەواتە: لەوێ خوا ﷻ دەفەرموێ: لە دژیان بجەنگن، تاکو توانای ئازاردان و ئەشکەنجەدانی مسوڵمانانیان نامێنێ کە لەسەر ئەوەی دێنە نێو ئیسلامەوە،

سزایان بدەن و ئەشکەنجەیان بدەن و هەڵیانگێڕنەوە، ملکەچییش تەنیا بۆ خوا دەبێ، واتە: وای لێ دێ کە تەنیا خەڵک هەیمەنەو دەستەڵاتی ئایین و بەرنامەی خوای بەسەرەوە دەبێ، نەک هی ڕێچکەو بیردۆزەکان، کە دوایی خەڵک ناچار بکەن لەسەر بڕوا هێنان بە شتێ کە قەناعەتیان پێی نیە.

لێرەش ئەم ڕستە موبارەکە: ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، وەک سەرنجی تەفسیرەکانم داوەو، ئێستا ئاماژەیەک بە زۆربەی ئەوانە دەکەم، کە سەرنجم داون، هەموویان ئەم ڕستەیان بە هەڵە تەفسیر کردوە بە بۆچوونی من، کە دەفەرموێ: ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، واتە: لە دژیان دەجەنگن، یاخود تەبایی پێشان دەدەن و ئاشتیی دەنوێنن و خۆیان بە دەستەوە دەدەن، ئەصڵە مانایەکەی ئاوایە، بەڵام ئەوان وایان لێکداوەتەوە: ئەگەر مسوڵمان نەبن، لە دژیان بجەنگن، کە لەو حاڵەتەدا تۆبزیی کردن لە دینداریيدا دێتە دی!

جارێ با تەماشایەکی ئەو تەفسیرانە بکەین، تاکو هەموو لایەک فێربین بە چاوی وردەوە تەماشای بەرهەمی فیکریی بەشەر بکەین، چ لە بواری تەفسیردا، چ لە بواری شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەرداو، چ لە بواری فیقهیی داو، چ لە بواری بنچینەکانی فیقە داو، چ لە بواری تەزکیەی نەفس داو، چ لە بواری عیلمی عەقیدەو کەلام داو، چ لەبواری حوکم و سیاسەت دا، لە هەموو بوارەکاندا، دەبێ چاو ورد بکەینەوە، لە بەرهەم و تێگەیشتنی زانایان لە بارەی قورئان و سوننەتەوە، چونکە دەگونجێ بەشەر نەیپێکن و، هەندێک جار زۆرێک لە زانایان شتێک بڵێن، نەیانپێکابێ، کە لێرەدا پێم وایە بەو شێوەیە، هەڵبەتە دوایی ڕوونی دەکەمەوە: بۆچی و چۆن ناگونجێ ئەم ڕستە قورئانییە مانایەکەی ئاوا بێ: لە دژیان بجەنگن، یان دەبێ مسوڵمان بن، ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، بەڵام ئێستا با تەماشایەکی تەفسیرەکان بکەین:

**یەکەم:** لە تەفسیری (**الطبري**)[1] یەوە پێدا دێم، دەڵێ: (**تُدْعَوْنَ إِلَى قِتَالِهِمْ ، أَوْ يُسْلِمُونَ مِنْ غَيْرِ حَرْبٍ وَلَا قِتَالٍ**)، ئێوە لە مەودوا بانگ دەکرێن بۆ شەڕکردن لە دژی کۆمەڵێکی خاوەن هێز، بانگ دەکرێن بۆ جەنگ کردن لە دژیان، یاخود بێ ئەوەی جەنگیان لە دژ بکرێ و کوشتاریان لە دژ بکرێ، مسوڵمان ببن.

**دووەم:** (**القرطبي**)[2]، ئەویش دەڵێ: (**يَكُونُ أَحَدُ الأَمْرَيْنِ: إِمَّا المُقَاتَلَة أَوِ الإِسْلامَ، لا ثَالِثَ لَهُمَا**)، یەکێک لە دوو کاران دەبێ، یان جەنگ لە دژیان، یاخود مسوڵمان بوون سێیەمیان نیە.

**سێیەم:** خاوەنی (**التفسير الكبير**) یان (**مفاتيح الغيب**)[3]، دەڵێ: (**وهَذَا مَا يُضْعِفُ قَوْلَ القَائِلِ: الدَّاعِي هُوَ عُمَرُ، وَالقَوْمُ فَارِسُ وَالرُّومُ؛ لِأَنَّ الفَرِيقَيْنِ يُقِرَّانِ بِالجِزْيَةِ، فالقِتالُ مَعَهما لا يَمْتَدُّ إلى الإِسْلامِ، لِجَوازِ أَنْ يُؤَدُّوا الجِزْيَةَ**)، هەڵبەتە (**الرازي**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، پێشێ چەند قسەیەک دەکات، لە بارەی ڕای زانایان و لە بارەی ئەم ڕستە قورئانییەوە، کە یەکێک لە ڕیوایەتەکان ئەوەیە، گوتوویانە: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، بانگهێشتکەرەکە عومەرە رضي الله عنه، لە سەردەمی حوکمڕانیی خۆیداو، خەڵکە بەهێزەکەش مەبەست پێی فارس و ڕۆمن، دەڵێ: ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾، ئەو قسەیە بێ هێز دەکات، چونکە هەر کام لە فارس و ڕۆم دان، بەسەرانەدا دێنن، بۆیە جەنگکردن لەگەڵیاندا، تاکو مسوڵمان بوون، درێژە ناکێشێ، لەبەر ئەوەی دەگونجێ سەرانە بدەن و، لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوەو مسوڵمان نەبن، وەک گوتم: ئەم ڕستە قورئانییە وا تەفسیر دەکات کە لە دژیان دەجەنگن، یاخود دەبێ مسوڵمان ببن.

**چوارەم:** تەفسیری (**إبن كثير**): (**المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير**)[4]، ئەویش بە هەمان شێوە دەڵێ: (**وَقَوْلُهُ تَعَالَى:** ﴿تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾، **يَعْنِي: شَرَعَ لَكُمْ جِهَادَهُمْ**

---

(١) ج٢٦، ص٨٥.

(٢) ج٢٦، ص٢١٣.

(٣) ج٢٦، ص٨٥.

(٤) ص١٢١٠.

**وَقِتَالَهُمْ فَلَا يَزَالُ ذَلِكَ مُسْتَمِرّاً عَلَيْهِمْ، وَلَكُمْ النُّصْرَةُ عَلَيْهِمْ، أو يُسْلِمُون فَيَدخُلُون فِي دينكم بلا قِتَالٍ بَلَ اخْتِيَاراً**)، واتە: قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: لە دژیان دەجەنگن، یاخود: ملکەچ دەبن، واتە: خوا ﷻ بۆی ڕەوا کردوون کە لە دژیان جیهادو جەنگ بکەن و، ئەوە لەسەریان بەردەوام دەبێ و ئێوە بەسەریاندا سەردەکەون، یاخود دەبێ مسوڵمان بن و بێنە نێو ئایینەکەتانەوە بەبێ جەنگ کردن، بەڵکو بە ویستی خۆیان.

**پێنجەم:** (**إبن عجيبة**) خاوەنی تەفسیری: (**البحر المديد في تفسير القرآن المجيد**)[1]، ئەویش دەڵێ: (**أَنْ يَكُونُ أَحَدُ الأَمْرَيْنِ: إِمَّا المُقَاتَلَةُ، أَو الإِسْلَامُ، وَمَعْنَى ﴿يُسْلِمُونَ﴾، عَلَى هَذَا التَّأْوِيْل: يَنْقَادُونَ لأَنَّ الفَارِس مَجُوسٌ، تُقْبَلُ مِنْهُمُ الجِزْيَة**)، دەڵێ: یەکێک لە دوو شتان دەبێ، یان جەنگ کردن، یاخود مسوڵمان بوون، مانای ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، واتە: ملکەچ دەبن، چونکە فارس مەجووسن و سەرانەیان لێ وەردەگیرێ.

**شەشەم:** (**إبن الجوزي**) خاوەنی تەفسیری (**زاد المسير فـي علم التفسير**)، لە لاپەڕە (١٣٢١) دا، هەمان شت دووبارە دەکاتەوە.

**حەوتەم:** (**الشوكاني**) خاوەنی تەفسیری (**فتح القدير**)[2] دەڵێ: (**أَنْ يَكُونُ أَحَدُ الأَمْرَيْنِ: إمّا المقَاتَلَةُ، أو الإِسْلَامُ، لَا ثالِثَ لَهُمَا، وَهَذَا حُكْمُ الكُفَّارِ الَّذِين لَا تُؤَخَذُ مِنْهم الجِزْيَة**)، واتە: یەکێک لە دوو کارەکان دەبێ، یان جەنگ کردن لە دژیان، یاخود مسوڵمان بوون، سێیەمیان نیەو، ئەوە حوکمی ئەو کافرانەیە کە سەرانەیان لێوەرناگیرێ.

**هەشتەم:** (**الآلوسي**) خاوەنی تەفسیری (**روح المعاني**)[3] دەڵێ: (**عَلَى مَعْنَى يَكُونُ أَحَدُ الأَمْرَيْنِ: إِمَّا المُقاتَلَةُ، أَوِ الإِسْلامُ، لاَ ثَالِثَ لَهُما**)، ئەویش بە هەمان شێوە قسەی ئەوانی دیکە دووبارە دەکاتەوە.

---

(١) ج٧، ص١٤٠.

(٢) ج٥، ص٦١.

(٣) ج٢٦، ص٣٥١.

**نۆیەم:** (المراغي) خاوەنی تەفسیری (تفسیر المراغي)[1] دەڵێ: (**فَعَلَيْكُمْ أَنْ تُخَيِّروهُمْ بَيْنَ الأَمْرَيْنِ: إِمَّا السَّيْفُ، وَإِمَّا الإِسْلَامَ**)، لەسەرتان پێویستە سەرپشکیان بکەن، لە نێوان دوو شتاندا: یان شمشێر، یاخود مسوڵمان بوون، [یان کوژران بە شمشێر، یاخود مسوڵمان بوون].

**دەیەم:** لەم بارەوە کە هەمان قسەی هێناوە، تەفسیرەکەی (**التحرير والتنوير**)ی (**محمد الطاهر بن العاشور**)ە[2]، دەڵێ: (**وَقَوْلُ:** ﴿أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، **يَتَعَيَّنُ أَنَّ القَوْمَ مَن العَرَب، لأَنَّ قَوْلَهُ:** ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾ **يُشْعِرُ بِأَنَّ القِتَالَ لاَ يُرْفَعُ عَنْهُمْ، إلاَّ إِذَا أَسْلَمُوا، وَإِنَّمَا يَكُونُ هَذَا حُكْمٌ فِي قِتَال المُشْرِكِينَ العَرَبِ، إِذ لَا تُقْبَلُ مِنهُمُ الجِزْيَة**)، دەڵێ: ئەو کۆمەڵەی کە خاوەن هێزێکی جەنگی پتەون، دیارییکراوە دەبێ کۆمەڵێک بن لە عەرەب، چونکە کە دەفەرموێ: لە دژیان دەجەنگن، یاخود مسوڵمان دەبن، ئەمە وامان لێدەکات، بزانین کە جەنگ کردن لە دژیان لاناچێ، تاکو مسوڵمان دەبن، ئەمەش حوکمێکە بۆ جەنگکردن لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرانی نەتەوەی عەرەب، چونکە ئەوان سەرانەیان لێ وەرناگیرێ.

ئەو قسەیەش وەک دوایی ڕوونی دەکەینەوە، ڕاست نیە.

یازدەیەم: (**محمد حسین الطباطبائي**) خاوەنی تەفسیری (**المیزان**)[3]، کە لە شیعەی دوازدە ئیمامییە، دەڵێ: (**إِمَّا** ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، **أَي: إِنَّهُمْ مُشْرِكُون لَا تُقْبَلُ مِنْهُمُ الجِزْيَةَ، كَمَا تُقْبَلُ مِنْ أَهْلِ الكِتَاب، بَلْ إِمَّا أَنْ يُقَاتَلُوا، أَو يُسْلِمُوا**)، واتە: یان لە دژیان دەجەنگن، یاخود مسوڵمان دەبن، واتە: لەبەر ئەوەی ئەوانە هاوبەش بۆ خوا دانەرن سەرانەیان لێ وەرناگیرێ، وەک لە خاوەن کتێبان وەردەگیرێ، بەڵکو یان دەبێ جەنگیان لە دژ بکرێ، یان دەبێ مسوڵمان بن.

---

(١) ج٢٩، ص(٩٨، ٩٩).

(٢) ج٢٦، ص١٧١.

(٣) ج١٨، ص٢٨١.

**دوازدەیەم:** تەفسیری (**نمونه**)یە، کە تەفسیرێکی فارسییەو، کۆمەڵێک لە زانایانی شیعە مەزهەب دوازدە ئیمامی دایانناوە، بەسەرپەرشتیی و چاودێریی (ناصری مکارمی شیرازی)[١].

ئەو ڕستەیەی دەفەرموێ: ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾، لە دژی ئەوان جەنگ بکەن، تاکو مسوڵمان دەبن، بەڵگەیە کە ئەوانە خاوەن کتێب نەبوون و، مەبەست خاوەن کتێبەکان نین، چونکە خاوەن کتێبەکان ناچار ناکرێن مسوڵمان بن، بەڵکو سەرپشک دەکرێن لە نێوان مسوڵمان بوون و، قبووڵکردنی مەرجەکانی هاوپەیمان بوون لەگەڵ مسوڵمانان و ژیانی ئاشتییانە لەگەڵیانداو، دانی سەرانە.

ئەویش هەمان قسە دەکات.

**سێزدەیەم:** کە لەو بارەوە قسەکەیم هێناوە، تەفسیرەکەی (**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**)ە، (**تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنَّان**)[٢]، هەمان قسەی ئەوان دووبارە دەکاتەوە.

**چواردەیەم:** تەفسیرەکەی (**جمال الدين القاسمي**)یە، (**محاسن التأويل**)[٣]، ئەویش هەمان قسەی ئەوانی پێشێ دووبارە دەکاتەوە.

**پازدەیەم:** (**التفسير المنير**)ە، هی (**وهبة الزحيلي**)[٤]، ئەویش هەمان قسەی ئەوانەی پێشێ دووبارە دەکاتەوە.

**شازدەیەم:** تەفسیرەکەی (**سعيد حوّى**)یە، (**الأساس في التفسير**)[٥]، ئەویش هەمان قسەی ئەوانەی پێشێ دووبارە دەکاتەوە.

---

(١) ج٢٢، ص٦١.

(٢) ٧٩٣.

(٣) ج٩، ص٨٢.

(٤) ج١٣، ص ٥٠٠، ٥٠١.

(٥) ج٩، ص٥٣٦.

**حەڤدەیەم:** (**المختصر في تفسير القرآن الكريم**)ی (**جماعة من العلماء التفسير**)[1]، لاپەڕە (٥١٣)، هەمان ئەو قسەیەی پێشێ، ئەویش دەیهێنێ.

هەڵبەتە هەندێ لە تەفسیرەکانی دیکەش وەک تەفسیری: (**في ظلال القرآن**)ی (**سيد قطب**)، هەروەها (**أضواء البيان**)ی (**الشنقيطي**) و، هەندێ لە تەفسیرەکانی دیکە، بە لای مانای ئەو ئایەتەوە نەچوون و، ژمارەیەک لە تەفسیرەکانیشم لەبەردەستدا نەبوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە دەتوانین بڵێین: تێکڕای ئەو تەفسیرانەی من بینیومن، هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەو مانایەو، تەفسیری (**نابلسي**)شم، لەلایە، بەڵام ئەویش باسی مانای ئایەتەکە بەو شێوەیە ناکات، ئەگەرنا ئەوانی دیکە هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە: ئەوانەی بانگ دەکرێن بۆ جەنگ لە دژیان، دەبێ لە دژیان بجەنگن یان مسوڵمان بن، بەمەرجێک خاوەن کتێب نەبن، ئەگەر خاوەن کتێب بن، جگە لە مسوڵمان بوون، سەرانەشیان لێ قبووڵ دەکرێ!

کەواتە: هۆکاری ئەم کورتە باسە، لێرەدا ئەوەیە کە هەموو ئەو تەفسیرانە، بە بۆچوونی من بەهەڵە لەم ڕستە قورئانییە تێگەیشتوون و، ئەو مانایەی ئەو ڕستە قورئانییە، کە ڕوونکەرەوان هێناویانە، لەگەڵ ئایەتەکانی دیکەی قورئان و سیرەی پێغەمبەر ﷺ و عەقڵ و لۆژیکیش دا ناگونجێ.



---

(١) ص ٥١٣.

## بڕگەی دووەم: تۆبزیی لێ نەکردن و ناچارنەکردن لەسەر مسوڵمان بوون، بنەمایەکی ڕوونی ئیسلامەو، ناگونجێ تۆبزیی لە خەڵك بکرێ و، ناچار بکرێن لەسەر مسوڵمان بوون:

سەرەتاش دەڵێین: جارێ لەو بارەوە چەند ئایەتێکی زۆر مانا ڕۆشن و ڕاشکاو و بێ پێچ و پەنا هەن:

١- یەکێک لەوانە ئایەتی ژمارە (٢٥٦) لە سووڕەتی **(البقرة)**دا: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾، واتە: تۆبزیی کردن لە دیندا نیە، کە کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی **(البقرة)**دا، باسمانکردوە، هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەوە بووە:

هەندێک لە خەڵکی مەدینە لە هەردوو هۆزی (ئەوس و خەزرەج) کە جوولەکەکان لە نێویاندا دەژیان، ئافرەتی وا هەبوو نەزۆک بوو، کوڕی نەدەبوو، لەسەر خۆی نەزر دەکرد کە ئەگەر کوڕی بوو، کوڕەکەی دەکاتە جوولەکە، دەیانزانی کە ئەوان خاوەن کتێبی ئاسمانیین، دوایی کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مەدینە، باب و دایکەکان ویستیان کوڕەکانیان بە زۆر مسوڵمان بکەنەوە، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾، تۆبزیی کردن و ناچارکردن نیە لە وەرگرتنی ئایین دا.

زانایان گوتوویانە: (لا) بۆ لابردن **(نفي)**ە، بەڵام نەهێشتن **(نهي)** دەگەیەنێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ ﴾، یانی: تۆبزیی کردن نیە، بۆ لابردنە، بەڵام مەبەست پێی قەدەغەیە، واتە: مەیکەن، هەڵبەتە ئەگەر مەبەست پێی نەفییش بێ، واتە: ناگونجێ خەڵک ناچار بکرێ لەسەر وەرگرتنی ئایین، چونکە کە ناچارت کرد، ئەو کوفرەکەی هەر لەدڵدایەو، ئەو کاتەش تۆ ناچاری دەکەی نیفاق بکات و دەیکەی بە مونافیق، واتە: دەیکەی بە خراپتر لە کافری ڕواڵەتیی!

٢- لە سووڕەتی **(یونس)**یشدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩ ﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت

ویستبای، تێکڕای خەڵکی سەر زەوی هەموو بڕوایان دەهێنا، ئایا تۆ خەڵک ناچار دەکەی بیانکەیە بڕوادار؟! لێرەدا وەک پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: بۆت نیە، بە زۆر بیانکەیە بڕوادارو، خوا ﷻ ئەگەر ویستبای، هەمووی بە ئیماندار دەخوڵقاندن، ئنجا ئێستا کە ئازادی کردوون، تۆ بۆت نیە ناچاریان بکەی لەسەر بڕوا هێنان.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (**الغاشیة**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾.

(خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:) بیریان بخەوەو ئامۆژگارییان بکە تۆ بەس بیرخەرەوەو ئامۆژگارییکەری، تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا نیە، (کە ناچاریان بکەی ئیمانن بێنن، دەستەڵاتت بەسەر دڵ و دەروونیاندا نیە)، مەگەر کەسێک پشت هەڵبکات و بێبڕوا بێ، (ئەم هەڵاواردنەش هەڵاواردنی دابڕاوی پێ دەڵێن، ئەوەی پشت هەڵبکات و بێبڕوا بێ)، خوا سزای هەرە گەورەی دەدات لە ڕۆژی دوایی دا، گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیەو، لێپرسینەوەشیان تەنیا لەسەر ئێمەیە، کەواتە: ئەی موحەممەد! ﷺ بۆت نیە، زۆریان لێ بکەی.

٤- هەروەها لە سووڕەتی (ق)دا: ﴿فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾، واتە: تۆ بەهۆی قورئانەوە ئامۆژگاریی کەسێک بکە، کە لە هەڕەشەی من دەترسێ.

٥- هەروەها لە سووڕەتی (**الكهف**)دا: ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾، بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ دەیەوێ بابڕوا بێنێ و، کێش دەیەوێ با بێبڕوا بێ.

کاتێک ئەم ئایەتە موبارەکانە دەبینین، ئاوا بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن، بە دڵنیایی نابێ ئایەتێکی دیکە، وا تەفسیر بکرێ، لەگەڵ هەموو ئەو ئایەتانەدا تێک بگیرێ.

بەڵــێ بەڕێـــــزان!

تۆبزیـی لـێ نەکـردن و ناچـار نەکـردن لەسـەر مسـوڵمان بـوون، بنەمایەکـی ڕوونی ئیسـلامە، هەروەهـا بـە گوێـرەی عەقـڵ و واقیـع، تۆبزیـی لێکـردن، ئیـمان پەیـدا نـاکات، بەڵکـو نیفـاق پەیـدا دەکات، ئەمـەش شـتێکی زۆر ڕوونـە، کەسـێک بـڕوای بـە ئیسـلام نیـە، تـۆش دەڵێـی: ئەگـەر نەڵێـی بـڕوام بـە ئیسـلام هەیـە، دەتکـوژم، ئەویـش دەڵـێ: ئاخـر بـڕوام پێـی نیـە، دەڵێـی: نـا هـەر دەبـێ بڵێـی بـڕوام پێـی هەیـە، یـانی: دەبـێ پێچەوانـەی ئـەوەی لـە دڵـت دا هەیـە بیڵێـی! کـە ئـەوەش نیفاقـە تـۆ کەسـێک ناچـار بکـەی، شـتێک بـە زمـانی بڵـێ، پێچەوانـە بـێ، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە لـە دڵیـدا هەیـە، نیفـاق یانـی چـی؟ (**المُنَافِـقُ مَـنْ يُبْطِـنُ الكُفْـرَ، وَيُعلِـن الإِسْـلَام**)، مونافیـق کەسـێکە کوفـر پەنهـان دەکات و ئیسـلام ئاشـکرا دەکات و دەردەبـڕێ.

منیـش لـە کۆمەڵێـک لـە کتێبـەکانی خۆمـدا بـە ڕوونیـی ئـەو مەسـەلەیەم تاووتـوێ کـردووە، لـە کـەوو بێژینـگ داوەو شـیمکردۆتەوە:

أ- ڕەنگە فراوانترین کتێب لەو بارەوە کتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**) بێ، (**الكتاب الثاني عشر**)، لە ژێر ناوونیشانی: (**الإسلام نظرة سديد تجاه الناس، وتعامل صحيح معهم**)، لە چاپی دووەمی ئەو مەوسووعەیەدا، بۆتە کتێبی دوازدەیەم.

ب- هەروەها کتێبی: (هەڵوەشانەوەی پەڕگیریی)، کە ئەو کتێبە بە عەرەبییش تەرجەمە کراوە، (**نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين**)، هەروەها تەرجەمەی زمانەکانی تورکیی و ئینگلیزیی و فارسییش کراوە.

ج- کتێبێکی دیکە، کە ئەو مەسەلەیەم جوان تێدا شیکردۆتەوە: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)، لەوێشدا هەم لە کاتی باسکردنی مافەکانی مرۆڤ، هەم لە کاتی باسکردنی (بنەمایەکانی تەبایی و ئاشتیی لە قورئاندا) باسم کردووە، ئەو کتێبەش وێڕای کوردیی بە عەرەبییش تەرجەمە کراوە، هەروەها بە تورکییش و بە فارسییش.

د- کتێبێکی دیکەم لەو بارەوە، کتێبی چوارەمی مەوسووعەی (ئیسلام و دەوڵەتداریی) یە، بە ناوونیشانی: (نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا).

## بڕگەی سێیەم: سەرانە لێوەرگیران مەرجی هاووڵاتیی بوون نیە بۆ نامسوڵمانان:

کە بە داخەوە لەوەشدا هەڵەی زۆر کراون، وەک من لەو کتێبانەدا کە ئاماژەم پێدان و، هەروەها لە تەفسیری سووڕەتی (**التوبة**)شدا، لە ئایەتەکانی سەرەتای دا باسمان کردوە، کە سەرانە لێ وەرگیران، مەرجی هاووڵاتیی بوون نیە، بۆ نا مسوڵمانان، واتە: دەگونجێ نامسوڵمانانێک هەبن، وەک قەوارەیەکی سیاسیی و، وەک کۆمەڵە خەڵکێک و چەند تاکێک، بەڵام سەرانەشیان لێ وەرنەگیرێ و هاووڵاتییش بن لە دەوڵەتی ئیسلامییداو، ئەوەش لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بووە، لەو سەرچاوانەدا بە تەفصیل نموونەم هێناونەوەو باسمکردوون.

## بڕگەی چوارەم: ڕاست نیە، کە سەرانە تەنیا لە خاوەن کتێبان وەردەگیرێ:

ئەوەش وەک لەو سەرچاوە پێشووانەدا کە ئاماژەم پێدان، باسمکردوەو هەر لە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: دەفەرمووێ: {«**إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ أَوْ خِلَالٍ فَأَيَّتُهُنَّ أَجَابُوكَ إِلَيْهَا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ**} (**أخرجه أحمد: ٢٣٠٨٠، ومسلم: ١٧٣١، وأبو داود: ٢٦١٢، والترمذي: ١٤٠٨**)، کە دوایی باس دەکات و دەفەرمووێ: ئیسلامیان بۆ پێشنیار بکە، دوایی دەفەرمووێ: ئەگەر مسوڵمان نەبوون سەرانەیان لێ داوا بکە، ئەگەر ئامادەی ئەوەش نەبوون، با ئامادەی جەنگ بن.

وەک دەبینین دەفەرمووێ: ئەگەر تووشی دوژمنەکەت بووی لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، نافەرمووێ خاوەن کتێبان، هەڵبەتە خاوەن کتێبیش هەبوون

لە مەدینەداو سەرانەشیان نەداوە، وەک هەر سێک تیرەی: (**بنو قریظة و بنو قینقاع و بنو النضیر**)، کەواتە: ئەوەش ڕاست نیە، کە خاوەن کتێبەکان هەموویان سەرانەیان لێ وەردەگیرێ، بەڵکو ئەو مەسەلەیە دەکەوێتەوە سەر بۆچوون و ڕای دەوڵەتی ئیسلامیی، ئایا چۆنی پێباشە مامەڵە لەگەڵ ئەو نامسوڵمانانەدا بکات؟ چ خاوەن کتێب بن و، چ بێ کتێب بن، لەسەر بناغەی ئەوە کە سەرانەیان لێ وەردەگرێ، یاخود لەسەر بناغەی ئەوە کە پێکەوە کاری هاوبەش دەکەن، بۆ وێنە: پێکەوە بەرگریی دەکەن لە مەدینە، وەک پێغەمبەر ﷺ لەو (**کتاب**) و (**صحیفة**)یەدا کە بە هەردووک ناوەکان هاتوە، لە کتێبەکانی سیرەدا، کە لە نێوان خۆی و مسوڵمانان و پێکهاتەکانی دیکەی شاری مەدینەدا لە نامسوڵمانان نووسیی، ڕایگەیاندوە کە یەکێ لە برگەکانی ئەوەیە: (**وَأَنَّ أَهْلَ هَذِهِ الوَثِيْقَةِ يَدٌ عَلَى مَنْ دَهَمَ يَثْرِب**)، ئەوانەی ئەم وەثیقەیان ئیمزا کردوە، یەکدەستن، لە بەرانبەر هەر کەسێک دا، کە پەلاماری شاری مەدینە بدات، واتە: بەرگرییکردنی هاوبەش (**دفاع مشترك**)، بۆیە داوای سەرانەیان لێ نەکراوە.

## برگەی پێنجەم:

ئایەتی: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾ **الأنفال**، کە شێوەی ئەوەش لە سووڕەتی (**البقرة**)دا هاتوە، بەم دەقە: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ... ﴿١٩٣﴾ ﴾، ئەم ئایەتە: ﴿ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ... ﴿١٦﴾ ﴾ **الفتح**، ناگونجێ مانایەکەیان پێچەوانەی ئەو بنەما گشتییەی قورئان بێ، کە گوتمان و، دەبێ بە شێوەیەک مانایان لێک بدرێتەوە کە لەگەڵ ئەو بنەمایەدا بگونجێ، لە سووڕەتی (**الأنفال**)و لە سووڕەتی (**البقرة**)ش دا، کە خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى دەفەرموێ: ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾، ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾، (**دین**) بە مانای ملکەچیی دێ، نەک بە مانای ئیسلام، چونکە ئیسلام هەمووی هەر هی خوایە، مسوڵمانان جەنگ بکەن، لە پێناوی خوادا، یان جەنگ نەکەن، ئیسلام

بەشی کەسی پێوە نیەو، بەس هی خوایە، بەڵام ملکەچیی جاری وا هەیە بۆ خوایەو بۆ دینی خوایە، جاری واش هەیە بۆ بەرنامەی جگە لە خوایە، جاری وایە بۆ تاغووتێک و دیکتاتۆرێکی خۆ سەپێنە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: دەبێ لە دژیان بجەنگن تاکو ملکەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ و کەس نابێتە کۆیلەی کەس، ئنجا کە ملکەچیی تەنیا بۆ خوا بوو، ئەو ملکەچانەی تەنیا دەستەڵاتی خوایان بەسەرەوە هەیە، ئەوانە چ خوا ﷻ بپەرستن و ئازادانەو مسوڵمان بن، چ خوا نەپەرستن و مسوڵمان نەبن، ئازادن، ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾ الكهف، بەڵام گرنگ ئەوەیە هیچ هێزێک و دەستەڵاتێک نەبێ، ناچاریان بکات لەسەر بڕوا هێنان بە شتێک کە قەناعەتیان پێی نیەو، دەبێ هیچ شتێکیان لەسەر فەرز نەکات، بەر لە هەموویان، خوا ﷻ دینە هەقەکەی بەزۆرو هێز خۆی فەرز ناکات لەسەر بەندەکانی، بۆیە ڕێگاش نادات، دینە ناهەقەکانیش بەسەر بەندەکانیدا فەرز بکرێن، بۆیە دەبێ هەم هەردوو ئایەتەکەی (**البقرة**) و (**الأنفال**)و، هەم ئەم ڕستە قورئانییەی سوورەتی (الفتح)یش، وا تەفسیر بکرێن کە لەگەڵ ئەو بنەما گشتییەی قورئاندا دژ نەوەستن.

## بڕگەی شەشەم: وشەی (إسلام، مسلمون، أَسْلِم) تەنیا بە مانای ملکەچیی و ئاشتەوایی و تەبایی بەکارهاتوون لە هەموو قورئانداو، مسوڵمان بوون مانایەکی عورفیی ئەو وشەیە، نەك مانای ئەصڵیی:

یانی: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾﴾ **البقرة**، کە باسی ئیبراهیمە عليه السلام، کاتێک پەروەردگاری پێی فەرموو: ملکەچ بە، گوتی: ملکەچم بۆ پەروەردگاری جیهانییان.

(**مسلم**) واتە: ملکەچ، نەک بە مانای مسوڵمانەتیی، ئەوە مانایەکی عورفیی ئەو وشەیە، ئەگەرنا مانا ئەصڵییەکەی لە قورئاندا (**إسلام**) واتە: پێشاندانی: تەبایی یان ملکەچیی یان ئاشتیی، ئنجا بۆیە خوا ﷻ ئەو ناوەی هەڵبژاردوە

بـۆ دوا پەیامـی خـۆی، چونکـە کەسێک کـە دێتـە نێـو ئاییـن و بەرنامـەی خـواوە، حاڵـەتی ئاشـتیی و تەبایـی لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا پیشـان دەدات.

## بڕگەی حەوتەم و کۆتایی:

کەواتـە: ﴿ تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ ﴾، یـانی: تەبـاو ئاشـتییخواز دەبـن یـان دژیـان دەجەنگـن، یـان دەبـێ لەگەڵتانـدا تەبـا بـن، یـان دەبـێ لـە دژیـان بجەنگـن:

هـەروەک ئایـەتی ژمـارە (٦١)ی سـوورەتی: **(الأنفال)** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ... ﴿٦١﴾ ﴾، ئەگـەر باڵیـان بـۆ ئاشـتیی شـۆڕ کـرد، تـۆش باڵـی بـۆ شـۆڕ بکـە، بـەڵام ئەگـەر ئـەوان سـەنگەریان لێگرتـی، تـۆش سـەنگەریان لـێ بگـرە، بـەڵام نافەرمـوێ: سـەنگەریان لـێ بگـرە بـۆ ئـەوەی ناچاریـان بکـەی مسـوڵمان بـن، چونکـە کـە ناچـارت کـردن، نابنـە مسـوڵمان و دەبنـە مونافیـق، ئنجـا ئـەوەش پێچەوانـەی هەمـوو ئـەو ئایەتانەیـە کـە باسـمانکردن و، پێچەوانـەی عەقـڵ و مەنطیـق و واقعیشـە.

## مەسەلەی چوارەم:

**کەسانی کوێرو شەل و نەخۆش، گوناهیان ناگات و سەغڵەت ناکرێن، ئەگەر بەشداریی جەنگ نەکەن و، هەر کەس فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، جێگای بەهەشتەو، پشت هەڵکردووانیش ئازاری بە ئێشیان هەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴾، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) کوێر گوناهی ناگات یاخود: سەغڵەت ناکرێ، کە داوای لێ بکرێ بچێ بۆ جەنگ.

**٢)-** ﴿ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ ﴾، هەروەها شەل سەغڵەت ناکرێ و، گوناهی ناگات ئەگەر نەچێ بۆ جەنگ.

**٣)-** ﴿ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ﴾، هەروەها بابای نەخۆش سەغڵەت ناکرێ، بە داوا لێکردنی بۆ جەنگ، هەروەها گوناهی ناگات ئەگەر نەیکات.

**(الطبري)[1] دەڵێ: (لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى مِنْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ! ضِيقٌ، وَلاَ عَلَى الْأَعْرَج ضِيق، وَلَا عَلَى الْمَرِيض ضِيق، أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِ الْجِهَاد مَعَ الْمُؤْمِنِينَ، وَشُهُود الْحَرْب مَعَهُمْ إِذَا هُمْ لَقُوا عَدُوّهُمْ ، لِلْعِلَلِ الَّتِي بِهِمْ، وَالْأَسْبَاب الَّتِي تَمْنَعهُمْ مِنْ شُهُودهَا).**

واتە: ئەی خەڵکینە! کوێر لە ئێوە سەغڵەتیی لەسەر نیە، هەروەها شەل و نەخۆش کە لە جەنگ لەگەڵ بڕواداراندا، دوابکەون و، لەگەڵیاندا ئامادەی جەنگ بن، لە کاتێکدا کە بە دوژمنیان دەگەن، لەبەر ئەو هۆکارانەی هەیانن و، لەبەر ئەو نەخۆشییانەی هەیانن، کە ڕێگایان لێ دەگرن ئامادەی جەنگ بن.

---

(١) جامع البيان: ج٢٦، ص٨٥.

وشـەی (**حـرج**) وەک پێشـتر باسـمان کـردوە، لـە ئەصڵـدا بـە مانـای شـتێکی تەنگەبـەر دێ و، بـە مانـای کۆمەڵێـك درەخـت دێ، کـە سـەر پێکـەوە دەنێـن و مەودایەکەیـان تەنگـە بـەر دەبـێ، دوایـی خوازراوەتـەوە بـۆ گوناهـو هـەر شـتێک کـە مـرۆڤ سـەغڵەت بـکات.

٤)- ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، هەر کەسێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، دەیخاتە چەند باغ و بێستانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

(**يُدْخِلْـهُ**) خوێنراویشـەتەوە: (**نُدخِلْـهُ**) دەیخەینـە نێـو چەنـد بـاغ و گـوڵ و گوڵزارێکـەوە، کـە ڕووبـار بـە ژێـر درەختەکانیانـدا دەڕۆن.

٥- ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**نُعذِّبه**)، هەر کەسێ پشت هەڵبکات، بە ئازارێکی بە ئێش سزای دەدات، یاخود: بە ئازارێکی بە ئێش سزای دەدەین.

(**حَـرَجٍ**) پێشـتریش باسـمانکرد: (**أَصْلُ الحَـرَجِ وَالحِـرَاجِ: مُجْتمـع الشَّـيْئَيْنِ وَتُصوِّر فِيْـهِ ضِيْـقُ مَـا بَيْنِهِـمَا، فَقِيْـلَ للضِّيِّـقِ حَـرَج، وَللإِثْـمِ حَـرَج**)، (**حَـرَجٍ وَحِـرَاجٍ**): لـە ئەصڵـدا بـە کۆبوونـەوەی دوو شـتان دەگوتـرێ و، لەوێـدا وێنـای ئـەوە کـراوە، کـە دوو شـتەکە پێکدەگـەن، بەینەکەیـان تەنگەبـەر بـێ، لەبـەر ئـەوە، هـەم بـە شـتی تەنـگ گوتـراوە: (**حَـرَجٍ**)، هـەم بـە گوناهیـش گوتـراوە (**حَـرَج**).

خـاوەنی تەفسـیری (**الميـزان**)[1]، دەڵـێ: (**رَفْـعٌ لِلحُكْـمِ بوجُـوبِ الجِهَـاد عَـنْ ذَوِي العَاهَـةِ الَّذِيْـنَ يَشُـقّ عَلَيهِـم الجِهَـاد، بِرَفْـع لَازِمِـهِ وهُـوَ الحَـرَج**)، کـە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ﴿١٧﴾ ﴾).

واتـە: ئەمـە لابـردنی حوکمـە بـە پێویسـت بـوونی جەنـگ و جیهـاد، لەسـەر کـەم ئەندامـان و لەسـەر ئەوانـەی گرفتـی جەسـتەییان هەیـە، کـە لەسـەریان قورسـە

---

(١) ج١٨، ص٢٨٢.

جەنـگ و جیهـاد بکـەن، بـە لابـردنی ئـەوەی پەیوەسـت (لازم)ی جەنـگ و جیهـادە، کـە بریتیـە لـە سـەغڵەتیی، یـانی: گوناهـی نـاگات و ئەرکەکـەی لەسـەر پێویسـت نابـێ، یاخـود سـەغڵەت ناکرێ، واتـە: جەنـگ و جیهادەکـەی لەسـەر پێویسـت ناکـرێ و سـەغڵەت بکـرێ.

لـە کۆتایـی تەفسـیری ئـەم ئایەتـە موبارەکـەدا، بـا ئامـاژە بـە چەنـد وردەکارییـەک بکەیـن کـە **(الـرازي)** لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] هێنـاونی:

**١-** لێرەدا خوا ﷻ سێ نوقصانیی باسکردوون: (کوێریی، شەلیی، نەخۆشیی)، لەبەر ئەوەی بابای کوێر ناگونجێ نە هێرش بکات و، نە ئەگەر دوژمنیش پەلاماری بدات، ڕابکات، هەروەها شەلیش بە هەمان شێوەو، دیسان نەخۆشیش نەخۆشێک کە نەتوانێ بچێ بەشداریی جەنگ بکات، هەڵبەتە نەک کەسێ کە هەڵامەتی گرتوە، بەڵکو نەخۆشییەکی وا کە ڕێگای بەشداریی لێ بگرێ، نە توانای هێرش بردنیان هەیەو، نە توانای کشانەوەیان هەیە.

**٢-** ئەو سێیە کە خوا ﷻ باسی کردوون: (کوێریی، شەلیی، نەخۆشیی) دوو جۆرن: جۆرێکیان کەم و کوڕییە لە ئەندامدا، کە بریتیە لە شەلیی و کوێریی، ئەوەی دیکەیان بریتیە لە کەم و کوڕیی لە هێزی جەستەدا، کە نەخۆشییە، ئنجا خوا ﷻ کەم و کوڕیی لە ئەندامدای، لە کەم و کوڕی لە هێزدا، پێشخستوە، چونکە کەم و کوڕیی لە هێزدا دەگونجێ مرۆڤ ئێستا نەخۆشە، دوایی چاک ببێ، بەڵام کەم و کوڕیی لە ئەندامدا چاک نابێ، کوێر هەر کوێرەو، شەل هەر شەلە.

**٣-** خوا ﷻ کوێری پێش شەل خستوە، چونکە بابای کوێر پاساوەکەی هەر بەردەوامە، ئەگەر بچێ بۆ جەنگیش، یانی: هەمیشە هەر بەردەوامە، کوێر هەر کوێرە، بەڵام بابای شەل ئەگەر سواری وڵاخێک یان ئامێرێک ببێ، دەتوانێ سوود بگەیەنێ.

---

(١) ج ٣٦، ص٨٦ ، ٨٧.

٤- لێرەدا خوا ﷻ باسی قۆڵبڕاوی نەکردوە، چونکە کەسێک یەک دەستی بڕابێ، کارێکی هەر پێدەکرێ، بەڵام ئەگەر هەردوو قۆڵی بڕابن، دیارە هیچی پێ ناکرێ، هەروەها باسی ئیفلیجیشی نەکردوە، چونکە بابای ئیفلیجیش دیسان شتێکی ئاشکرایە، هیچی لە دەست نایەت بۆ جەنگ و جیهاد، هەروەها باسی یەک چاو (**أعور**)یشی نەکردوە، چونکە بابای یەک چاو دەگونجێ بەشداربێ و سوودیش بگەیەنێ، بۆیە خوا ﷻ باسی ئەوی نەکردوە کە لە خاوەن پاساوەکان بێ، بۆ بەشداریی نەکردن لە جەنگ دا.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، هەر کاتێک ئیسلام پێویستی بە سەرو ماڵ و ڕووحمان بوو، لە پێناویدا بیبەخشین و، هەر کاتێک بەرنامەی خوا پەکی لەسەر سامان و گیانی ئێمە کەوت، چ لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەو جەنگ و جیهاددا، چ لە کاتی ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان و، وەستان دژی ستەم و گەندەڵیی و ناشەرعییەکاندا، ئامادەبین کە هەرچی بۆ بەرنامەی خوا پێویستە، لە پێناویدا بیبەخشین و ڕژدیی (**بُخل**) نەکەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە نـۆ (٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٨ - ٢٦)، تـەوەری سـەرەکییان باسـی پەیـمانی ڕیـزوان (**بیعـة رضـوان**)ەو، مـوژدەی ئـەو دەسـتکەوتە جەنگییانـەی خـوای بەخشـەر بـەو هاوەڵـە بەڕێزانـەی داون، کـە بەشـداریی پەیمانەکـە بـوون، لـە مانگـی (**ذي القعِـدة**)ی سـاڵی شەشـەمی کۆچییـدا.

هەروەهـا باسـی دەسـتگێڕانەوەی هـەر کام لـە مسـوڵمانان و دوژمنەکانیانـە لـە یەکـدی، کـە خـوا دەسـتی گێڕاونـەوەو، هـەر کامێکیـانی لـەوەی دیکـە پاراسـتوە، تاکـو خوێـن نـەڕژێ و ڕێککەوتنەکـەو ئاشـتەوایيەکە تێـک نەچـێ، ئاشـتەوایی حودەیبییـە.

دیسـان ئاماژەکردنـە بـە چەنـد ڕەفتـارو خەسـڵەتێکی خراپـی کافـرەکان، کـە شایسـتەی سـزادان بـوون، بـەڵام بـۆ ئـەوەی بڕوادارانێکـی بـێ چـارە لـە پیـاوان و ئافرەتـان لـە مەککـەدا، یـان لـە دەوروبـەری مەککـە، تووشـی زیـان نەبـن، خـوا نەیهێشـت کوشـتار ڕووبـدات، ئەگەرنـا لەبـەر چـاوی کاڵیـی ئـەوان نەبـوو، ئـەوان شایسـتەی ئـەوە بـوون خـوا سـزایان بـدات، هێندەیـان کارو کـردەوەی خـراپ هەبـوو، کـە لەسـەری سـزا بدرێـن، بـەڵام وەک گوتـراوە: لـە پەنـای گوڵـە گەنمێکـدا دە گوڵـە جـۆش ئـاوێ دەخۆنـەوە.

هەروەهـا باسـی دەمارگیریـی نەفامانـەی بێبڕوایـان و، ئۆقرەیـی و ئۆخـژن و دابەزانـدن بـۆ سـەر دڵـی بـڕواداران و، پابەندکردنیـان بـە وشـەی پارێزکارییـەوەو بـە پارێزکارییـەوە، باسـی ئـەوەش کـراوە.

﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا

﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ
وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ
بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ
وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ
وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ
لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ
جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ
وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ
عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی خوا لە بڕواداران (ی هاوەڵت) ڕازیی بوو (ئەی موحەممەد!) لە کاتێکدا لەبن (سێبەری) درەختەکەدا پەیمانیان پێدەدای، ئیدی (خوا) زانی چی لە نێو دڵیان دایە، ئنجا ئۆقرەیی و ئۆخژنی دابەزاندە سەریان و، بە سەرکەوتنێکی نیزیکیش پاداشتی دانەوە ﴿١٨﴾ (خوا) دەستکەوتانێکی زۆر (ی پاداشت دانەوە)، کە لە مەودوا دەیانگرن و، خواش هەر زاڵی کارزان بووە ﴿١٩﴾ خوا بەڵێنی دەستکەوتانێکی زۆری پێداون (لە مەودوا) دەیانگرن، بەڵام ئەم (سەرکەوتن)ەی، (وەک دەستکەوتێکی گەورەو گرنگ) بۆ پێشخستن و، دەستی خەڵکی (بێبڕوای) لێ گێڕانەوە، تاکو ئەم (سەرکەوتن)ە، ببێتە نیشانەیەک بۆ بڕواداران (لەسەر پشتیوانیی و سەرپەرشتیاریی خوا بۆیان)و، تاکو ڕێیەکی ڕاستیشتان پیشان بدات (بۆ مامەڵە لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا) ﴿٢٠﴾ هەروەها (خوا

بەڵێنی پێداون) دەستکەوتانێکی دیکە (بگرن) کە جارێ تواناتان بەسەریان دا نەشکاوە، (بەڵام) بێگومان خوا دەوری داون (بۆی هەڵگرتوون)و، خواش هەردەم بەسەر هەمووو شتێکدا توانا بووە ﴿٢١﴾ بێگومان ئەگەر ئەوانەی بێبڕوان جەنگیشیان لە دژ کردبانایە، پشتیان تێدەکردن (و ڕایان دەکرد)و، هیچ سەرپەرشتیارو یاریدەدەریشیان چنگ نەدەکەوتن لە بەرانبەرتاندا ﴿٢٢﴾ (ئەمەش) یاسایەکی خوایە کە پێشتر ڕابردووەو، هەرگیز گۆڕینیشت بۆ یاسای خوا چنگ ناکەوێ ﴿٢٣﴾ هەروەها (خوای سەرپەرشتیارو پشتیوانتان) ئەو کەسەیە کە لە لای سکی مەککە (ئاقاری شاری مەککە) دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوەو، دەستی ئێوەشی لەوان گێڕایەوە، دوای ئەوەی بەسەرواندا باڵادەستی کردبوون (و وایکرد زەفەریان پێ ببەن)و، خواش بینەری ئەوە بوو کە دەتانکرد ﴿٢٤﴾ (دوژمنەکانتان) ئەوانەن کە بێبڕوا بوون و لە (چوونە) مزگەوتی حەڕام گێڕایاننەوە، لە حاڵێکدا قوربانییەکان وەستێنرابوون کە بگەنە شوێنی خۆیان (حەرەمی مەککە کە تێیدا سەرببڕێن)، کە ئەگەر لەبەر پیاوانێکی بڕوادارو ئافرەتانێکی بڕوادار نەبووایە کە نەتاندەزانین، نەبادا بکەونە بەر پێتان (و لە کاتی جەنگدا تووشی زیان ببن)و، سەرەنجام بە نەزانیی خراپەو زیانێکتان تووش ببێ، تاکو هەر کەس خوا بیەوێ بیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە (و چەپاڵەی بدات)، ئەگەر (بڕواداران لە بێبڕوایان) جیابووبانەوە، مسۆگەر ئەوانەی بێبڕوان لەوان، ئازارێکی بە ئێشمان دەدان ﴿٢٥﴾ (یاد بکەوە!) کاتێک ئەوانەی بێبڕوان (دەمارگیریی و) دڵگەرمییان خستە نێو دڵیانەوە، دڵگەرمیی نەفامیی، خواش ئۆقرەیی و ئۆخژنی خۆی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر بڕواداران و، بە وشەی پارێزکارییەوە پابەندی کردن و، هەر ئەوانیش پێی شایستەتر بوون و، خاوەنی (ڕاستەقینەی) بوون و خواش هەمیشە بە هەمووو شتێک زانا بووە ﴿٢٦﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلسَّكِينَةَ): (السَّكِيْنَةُ: الإِطْمِئْنانُ وَالوَقَار وَالثَّبَات)، (سكِينَة): بە مانای هێمنیی و سەنگینیی و چەسپاویی دێ، بە كوردیی پێم وایە ئەگەر بۆ (سكِينَة) بگوترێ: ئۆقرەیی و ئۆخژن و داسەكنان، مانایەكی تاكو ڕاددەیەك پڕ بە پێستە.

(وَمَغَانِمَ): (جَمْعُ مَغْنَم، وَالغَنَمُ مَعْرُوفٌ، وَالغُنْمُ إِصَابَتُهُ وَالظَّفَرُ بِهِ، ثُمَّ اسْتُعْمِلَ فِي كُلِّ مَظْفُورٍ بِهِ مِنْ جِهَةِ العِدَى وَغَيْرِهِم)، (مَغَانِم) كۆی (مَغْنَم)ە، یانی: دەستكەوت، ئەویش لە (غَنَم)ەوە هاتوە، (غَنَم)یش یانی: مەڕ، ئنجا (غُنْم): بریتیە لە تووشبوون و وەدەستخستنی مەڕ، دوایی وشەی (غُنْمُ و مَغْنَم) بەكارهێنراون بۆ هەر شتێك زەفەری پێ ببردرێ، چ لە لایەنی دوژمنانەوە بێ، كە دەستكەوتی جەنگییە، چ بە هەر شێوەیەكی دیكە، مرۆڤ دەستی لە بەرژەوەندییەك و ماڵ و سامانێك گیربێ، ئەو ناوەی بۆ بەكارهاتوە.

(وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ): دەستی خەڵكی لێ گێڕانەوە، (عُورِفَ الكَفّ بِالْدَفْعِ عَلَى أَيِّ جِهةٍ كَانَ)، وشەی (كَفّ) لە ئەسڵ دا بە مانای لەپە دەست دێ، چونكە كەسێك زەبرێكی بۆ لابێ، لەپە دەستی پێوە دەنێ، ئنجا (كَفّ): بریتیە لە گێڕانەوە بە هەر شێوەیەك لە شێوەكان بێ، كەواتە: ﴿وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ﴾، دەستی خەڵكی لێگێڕانەوە.

(سُنَّةَ ٱللَّهِ): ئەمە یاسای خوایە، (سُنَّةُ اللهِ قَدْ تُقَالُ لِطَرِيْقَةِ حِكْمَتِهِ وَطَرِيْقَةِ طَاعَتِهِ)، (سُنَّةُ الله)، هەم بۆ ڕێبازی حیكمەتی خواو، هەم بۆ ڕێبازی فەرمانبەریی خوا بەكاردەهێنرێ، بەڵام لە قورئاندا وشەی: (سُنَّةُ الله)، كە بە (سُنَن)، كۆكراوەتەوە، بۆ ئەو یاسا گەردوونییانە بەكارهاتوە، كە خوا دایناون لە ژیانی بەشەردا.

(قَدْ خَلَتْ): (مَضَتْ، خَلَا الزَّمَانُ: مَضَى وَذَهَب)، (قَدْ خَلَتْ)، واتە: ئەو یاسایە تێپەڕیوە، دەگوترێ: (خَلَا الزَّمَانُ)، ڕۆژگارەکە ڕابردو و تێپەڕی.

(بِبَطْنِ مَكَّةَ): (البَطْنُ: الجَارِحَة، وَالبَطْنُ خِلَافُ الظَّهْرِ فِي كُلِّ شَيء، وَيُقَالُ للجِهَةِ السُّفْلَى: بَطْن، وَبَطْنُ الوَادِي: عَكْسُ ظَهْرِه)، وشەی (بَطْن): واتە: سک، ئەو ئەندامەی مرۆڤ لە ئەصڵدا ئەوەیە، کە دیارە ئەو کاتە (بَطْن) پێچەوانەی (ظَهْر)ە، بەڵام مەرج نیە، تەنیا بۆ سک و پشتی مرۆڤ بەکاربێن، بەڵکو دەگوترێ: ئەو قوماشە، ئەوە دیوی نێوەوەیەتی و ئەوەش دیوی پشتەوەیەتی، هەروەها بە هەر شتێکی دیکە، دیوی پەنهانی پێ دەگوترێ: (بَطْن) و، دیوی ئاشکرای پێ دەگوترێ: (ظَهْر)، هەروەها بە لای خوارەوەی هەر شتێ دەگوترێ: (بَطْن: بَطْن الوَادِي)، لای خوارەوەی شیوو و دۆڵەکە، کە دەفەرموێ: (بِبَطْنِ مَكَّةَ)، واتە: لە ئاقاری مەککە یان لە نیزیک مەککەوە، کە وەک چۆن سکی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤە، ئەو شوێنەش لە مەککەوە زۆر نیزیک بووە.

(مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ)، دوای ئەوەی ئێوەی بەسەر ئەواندا سەرخست، (الظَّفَرُ: الفَوْزُ، وَأَصْلُهُ مِنْ ظَفَرَ عَلَيْهِ: نَشَبَ ظَفْرَهُ فِيْهِ)، (ظَفَر): بە مانای زەفەر پێبردن، بە کوردییش هەر دەیڵێین واتە: وەدەست خستن و دەستەبەر کردن، (ظَفَرَ عَلَيْه)، لەوەڕا هاتوە کە نینۆک لە شتێک گیر بکرێ، (نَشَبَ ظَفْرَهُ فِيْه)، واتە: نینۆکی لێ گیر کرد.

(وَٱلۡهَدۡيَ): (الهَدِيُ: مُخْتَصٌّ بِمَا يُهْدى إلى البَيْتِ، وَالوَاحِدَةُ هَدِيَّة)، (هَدْي): تایبەتە بەوەوە کە دەکرێتە دیاریی بۆ کابە، واتە: ئەو ئاژەڵانەی دەبرێن لەوێ سەر ببڕدرێن، تاکەکەی (هَدِيَّة)ی پێ دەگوترێ و کۆیەکەی (هدي).

(مَعۡكُوفًا): (عَكَفَهُ يَعْكُفُهُ وَيَعْكِفُهُ عَكْفاً: حَبَسَهُ)، کەواتە: (عَكَفَهُ) واتە: حەپسی کرد، نەیهێشت و ڕێی لێگرت، ڕێی لێدەگرێ، (عَكْف) ڕێلێگرتن و نەهێشتن.

(تَطَـُٔوهُمۡ): (تطَئُوهُـمْ: تَدُوسُـوُهمْ وَالمـرَادُ تُهْلِكُوهُـمْ)، (وَطِئْتُـهُ) واتـه: پێـم لێنـاو ژێرپێـم خسـت، (تَطَئُوهُـمْ) واتـه: پێیـان لـێ بنێـن و ژێـر پێیـان بخـەن، کـه لێـرەدا مەبەسـت پێـی کـوژران و زیـان پێگەیاندنیانـه.

(مَّعَـرَّةُۢ): (مَكْـرُوهٌ وَأَذَى، وَالمُـرَادُ بـهِ: السُّبَّةُ، عَـرَّهُ يَعُـرُّهُ عَـرّاً: إِذَا أَصَابَـهُ بِمَكْـرُوهٌ، وَالمَعَرَّةُ مَفْعَلَـةٌ مِنْـهُ)، (مَعَـرَّة): بـه مانـای شـتی ناخـۆش و ئـازار دێ و، مەبەسـت لێـرەدا شـوورەییە، شـوورەییەکیان بێتـه سـەر، یاخـود ڕەخنەیەکیـان بێتـه سـەر، بـه هـۆی ئـەوەوە کـه ئـەو پیـاوە بـڕوادارو ئافرەتـه بڕوادارانـەی نەیانناسـیون، لەبـەر دەسـت و پێیانـدا فەوتـاون لـه جەنگەکـەدا، دەگوتـرێ: (عَـرَّهُ يَعُـرُّهُ عَـرّاً: إِذَا أَصَابَـهُ بِمَكْـرُوهٍ)، تووشـی زیـانی کـرد، تـووشی دەکات، زیانگەیانـدن، (عَـرَّهُ: عَـرَّ فُـلَانٌ فلانـاً) فڵانکـەس فڵانکـەسی تووشـی شـتێکی ناخـۆش کـرد، (مَعَـرّة)ش (مَفْعَلَةٌ)یـه لـه کـرداری (عَـرَّهُ، يَعَـرُّهُ).

(تَـزَيَّلُواْ): (زِلْتُـهُ زَيْـلاً: مِزْتُـهُ وَزَيَّلَـهُ فَتَزَيَّـلَ: فَرَّقَـهُ فَتفَـرَّقَ)، (زِلْتُـهُ زَيْـلاً: مِزْتُـهُ) واتـه: لێکـم جیاکـردەوە، (زَيَّلَـهُ فَتَزَيَّـلَ)، واتـه: (فَرَّقَـهُ فَتفَـرَّقَ)، بـڵاوی کـردەوەو بـڵاو بـۆوە، یـان جیـای کـردەوەو جیابـۆوە.

(ٱلۡحَمِيَّةَ): (الحَمِيَّـةُ: الأَنَفَـةُ وَالتَّكَـبُّر، حَمِـيَ مِـنَ الـشَّيء، كَـرَضِيَ، حَمِيَّـةً: أَنِـفَ مِنْـهُ)، (حَمِيّـة): بـه مانـای خۆبەزلگریـی و لـه خـۆ نەوەشـاندنەوەیە، بـەڵام بـه بـاری خراپـەدا، دەگوتـرێ: (حَمِـيَ مِـنَ الـشَّيءِ، كَـرَضِيَ، حَمِيّـةً: أَنِـفَ مِنْـهُ)، واتـه: ئـەو شـتەی پـێ لـه خـۆی نەوەشـایەوەو خـۆی پـێ بەرزتـر بـوو، بـەڵام بـه ناهـەق، ئەگەرنـا جـاری وایـه، ئینسـان شـتێک لـه خـۆی ناوەشـێنێتەوە، بـەڵام بـه هـەق، بـۆ وێنـه: شـتی خـراپ لـه خـۆی ناوەشـێنێتەوە، بـەڵام ئەوانـه لـه ئەنجامـی خـۆ بەزلگرییـدا، شـتی باشـیان لـه خۆیـان نەدەوەشـاندەوە، کەواتـه: (حَمِيّـة) دەگونجـێ بگوتـرێ: دڵگەرمیـی نەفامانـه، یـان دەگونجـێ بگوتـرێ: لـه خۆنەوەشـاندنەوەی شـتی بـاش لـه ئەنجامـی خـۆ بەزلگرییـدا.

(ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ): (الجَهْـلُ عَـلَى ثَلَاثَـةِ أَضْرُبٍ: ١ـ خُلـوّ النَّفْـسِ مِـنَ العِلْـم، ٢ـ إعْتُقَـادِ الـشيء بِخِـلَافِ مَـا هُـوَ عَلَيْـه، ٣ـ وَفِعْـلُ الـشَّيء بِخِـلَافِ مَـا يليـق بـه)، ڕاغیبـی ئەسـفەهانیی دەڵـێ: (جَهْـلُ) نەزانیـی سـێ جـۆرە:

١- ئەوە کە نەفس زانیاریی لە بارەی ئەو شتەوە نەبێ.

٢- ئەوە کە مرۆڤ قەناعەتی بە شتێک بێ، پێچەوانەی ئەوەی واقیعەکەی لەسەریەتی.

٣- کردنی شتێک بە پێچەوانەی ئەوە کە شایستەیە بکرێ.

کەواتـە: (جَاهِـل)، تەنیـا ئـەو کەسـە نیـە کـە شـت نازانـێ، بەڵکـو یـان شـتەکە نازانـێ، یاخـود زانیارییەکـی هەڵـەی لـە بـارەی شـتەکەوە هەیـە، یـانی: زانیارییەکـەی ڕاسـت نیـە لـەو بارەیـەوە، یاخـود دەشـیزانێ و زانیارییەکەشـی ڕاسـت و دروسـتە، بـەڵام ئـەو بـە شـێوەیەک مامەڵـە دەکات، کـە پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە شایسـتەیە مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـرێ.

(وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ)، واتـە: پابەنـدی کـردن بـە وشـەی پارێزکارییـەوە، (أَوْجَـبَ عَلَيْهِـم الكَلِمَـة الَّتِـي يُتَّقَـى بِهَـا الـشِّرْكُ وَالعَذَابُ، وَهِـيَ كَلِمَـةُ التَّوْحِيْـدِ وَالإِخْلَاص)، واتـە: خـوا ﷻ ئـەو وشـەیەی لەسـەر پێویسـت کـردن، کـە خـۆی پـێ دەپارێـزرێ لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان و لـە سـزاو ئـازاری ڕۆژی دوایـی، کـە بریتیـە لـە وشـەی خـوا بـە یەکگرتـن و وشـەی سـاغکردنەوەی بەندایەتیـی بـۆ خـوا، کـە: (لاَ إِلَـهَ إلاَّ الله)یـەو (كَلِمَـةُ التَّوْحِيْـد) و (كَلِمَـةُ الإِخْـلَاص)، وشـەی بـە یەکگرتنـی خـواو، وشـەی سـاغکردنەوەی بەندایەتیـی خـۆ بـۆ خـواشی پێدەگوتـرێ.

(أَحَقَّ بِهَا): (أي: أَجْـدَرُ وَأَلْيَـق)، (حـق)، یـانی: مـاف یـان شایسـتە، (أَحَـقُّ) واتـە: شایسـتەترو لـێ وەشـاوەتر.

(وَأَهْلَهَا): دەگوتـرێ: (فُـلَانُ أَهْـلٌ لِكَـذَا أَي: خَلِيْـقٌ بـهِ)، واتـە: شایسـتەیەتی و خاوەنیـەتی، (وَيُقَـالُ: مَرْحَبَـاً وَأَهْـلاً: وَجَـدْتَ سَـعَة مَـكَانٍ عِنْدَنَـا، وَمَـنْ هُـوَ أَهْـلُ بِيْـتٍ لَـكَ

فِي الشَّـفَقَة)، واتـە: تـۆ شـوێنێکی فراوانـت لـە لای ئێمـە چنـگ کـەوت، کـە هـاتی بـۆ لامـان ئـەی میـوان! خـاوەن ماڵیـش کەسێکە بـۆ تـۆ وەک خـزم و نیزیـک وایـە، لـە ڕووی بەزەییـەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

**١-** ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، ئایەتەکانی: (١٨ و ١٩)، ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾﴾، لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەیانەوە، ئەم دەقە دێنین:

(الطـبري) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] گوتوویـەتی: (وَكَانَ سَـبَبُ هَـذِهِ الْبَيْعَـةِ مَـا قِيـلَ: إِنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ كَانَ أَرْسَـلَ عُثْـمَانَ بْـنَ عَفَّـانَ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ بِرِسَـالَتِهِ إِلَى الْمَـلَإِ مِـنْ قُرَيْـشٍ، فَأَبْطَـأَ عُثْـمَانُ عَلَيْـهِ بَعْـضَ الْإِبْطَـاءِ، فَظَـنَّ أَنَّـهُ قَـدْ قُتِـلَ، فَدَعَـا أَصْحَابَـهُ إِلَى تَجْدِيـدِ الْبَيْعَـةِ عَـلَى حَرْبِهِـمْ عَـلَى مَـا وَصَفْـتُ، فَبَايَعُـوهُ عَـلَى ذَلِـكَ، وَهَـذِهِ الْبَيْعَـةُ الَّتِـي تُسَـمَّى بَيْعَـةَ الرِّضْـوَانِ، وَكَانَ الَّذِيـنَ بَايَعُـوهُ هَـذِهِ الْبَيْعَـةَ، فِيـمَا ذُكِـرَ فِي قَـوْلِ بَعْضِهِـمْ: أَلْفًـا وَأَرْبَـعَ مِئَـةٍ، وَفِي قَـوْلِ بَعْضِهِـمْ: أَلْفًـا وَخَمْـسَ مِائَـةٍ، وَفِي قَـوْلِ بَعْضِهِـمْ: أَلْفًـا وَثَـلَاثَ مِئَـةٍ..

عَـنْ جَابِـرِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـه رضي اللـه عنهـما أَنَّهُـمْ كَانُـوا يَـوْم الْحُدَيْبِيَّـةِ أَرْبَـع عَـشْرَة مِائَة، فَبَايَعْنَـا رَسُـول اللَّـه ﷺ وَعُمَـر آخِـذٌ بِيَـدِهِ تَحْـتَ الشَّـجَرَةِ، وَهِـيَ سَـمُرَةٌ، فَبَايَعْنَـاهُ عَـلَى أَنْ لَا نَفِـرَّ، وَلَـمْ نُبَايِعْـهُ عَـلَى الْمَـوْتِ، يَعْنِـي النَّبِـيَّ ﷺ) (أخرجـه مسـلم: ٨٥٦، والبخـاري: ٤١٥٣ ، ٤١٥٤).

واتـە: هـۆی ئـەو پەیـمان پێدانـە بـە پێغەمبـەر ﷺ وەک گوتـراوە: ئـەوە بـوو کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ عوسـمانی کـوڕی عەففـانی رضي الله عنه، بـە نامەیەکـەوە نـارد بـۆ لای

(١) جامع البيان: ج٢٦، ص٨٦.

بڕیار بە دەستانی هۆزی قورەیش، ئەویش ماوەیەک دواکەوت و پێچوو، ئەویش پێی وابوو کوژراوە، (یان بانگەشە کرا کە کوژراوە)، ئەویش هاوەڵانی بانگ کرد بۆ تازە کردنەوەی پەیمان لەسەر جەنگکردن لە دژیان، بەو شێوەیەی باسمان کرد، ئەوانیش بەڵێنیان پێیدا لەسەر ئەوە، ئەو پەیمانەی پێی دەگوترا: (**بَيْعَةُ الرِّضْوَان**) پەیمانی ڕەزامەندیی، (پەیمانێک کە بۆتە هۆی ئەوەی خوا لێیان ڕازیی بێ)، ئەوانەی ئەو پەیمانەیان لەگەڵدا بەست، وەک باسکراوە لە قسەی هەندێکیاندا گوتوویانە: (١٤٠٠) کەس بوون و، هەندێکیان گوتوویانە: (١٥٠٠) کەس بوون و، هەندێکیان گوتوویانە: (١٣٠٠) کەس بوون، جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازیی بێ)، دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژی حودەیبییەدا (١٤٠٠) کەس بووین، پەیمانمان بە پێغەمبەر ﷺدا، عومەر لە ژێر درەختەکەدا دەستی پێغەمبەری گرتبوو، درەختەکەش درەختی (**سَمُرَة**) بوو، پەیمانمان پێدا کە ڕانەکەین، بەڵام پەیمانمان پێ نەدا لەسەر مردن، بەڵکو لەسەر پشت نەکردنە دوژمن، واتە: ئەو پەیمانەمان بەو جۆرە بە پێغەمبەردا ﷺ.

لە شوێنی دیکەدا هاتوە، دەڵێ: عومەر رضي الله عنه، بۆیە دەستی پێغەمبەری ﷺ گرتبوو، تاکو دەستی شل نەبێ (١٤٠٠) کەس زۆرە، تەوقە لەگەڵ هەمووواندا قورسە، ئەو دەستی گرتبوو بۆ ئەوەی هەموو جارێ دەست بەرز نەکاتەوە و دەستی ڕاگرتبوو.

٢- لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئایەتی ژمارە (٢٤)ەوە: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾﴾، ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

**{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ ثَمَانِينَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ مِنْ جَبَلِ التَّنْعِيمِ عِنْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ لِيَقْتُلُوهُمْ، فَأَخَذَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَعْتَقَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ:** ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ﴾**}** (أخرجه مسلم: ١٨٠٨)،

واتــە: ئەنەســی کــوڕی مالیــک ﷺ، دەڵــێ: هەشــتا پیــاو لــە خەڵکــی مەککــە دابەزینــە ســەر پێغەمبــەری خــوا ﷺو هــاوەڵانی لــە چیــای (**تنعیــم**)ەوە، لــە کاتی نوێــژی بەیانییــدا تاکــو بیانکــوژن، {گوتوویــان: لــە نوێــژدان زەفەریــان پــێ دەبەیــن}، پێغەمبــەری خــواش ﷺ زەفــەری پێبردن و گرتنــی و، دوایــی بەرهەڵــدای کــردن، لــەو بــارەوە، ئــەم ئایەتــە هاتۆتــە خــوارێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ﴾.

چەنـد ڕیوایەتێـک لـەو بـارەوە هاتـوون، لـە یەکێـک لـە ڕیوایەتـەکان دا، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی فەرمـوون: ئایـا پەیمانتـان هەیـە لەگـەڵ ئێمـەدا؟، گوتیـان: نەخێـر، فەرمـووی: بڕۆنـەوە ئـەوە بەمنـەت و چاکـە ئـازادم کـردن.

تاکــو چاکەیەکــی لــە چــاوی ئەوانــدا هەبــێ و، ببێتــە هاندەریــان کــە ئــەو ڕێککەوتننــەی دوایــی نــاوی لێــنرا: (ڕێککەوتنــی حودەیبییــە) ئەنجــام بــدرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

ئــەو ئایەتانــەی ئێســتا تەفســیریان دەکەیــن، بــە تایبــەت ئایەتــەکانی ســەرەتا هەموویــان لــە بــارەی ڕووداوی گرنگــی پەیــمان و بەڵێــن لێوەرگرتنــی پێغەمبــەری خــواوەن، لــە هــاوەڵانی لــە ژێــر درەختێــک دا کــە دواتــر بــە درەختــی ڕەزامەندیــی (**شــجرة الرضــوان**) نــاوی دەرکــردوەو، ئــەو ڕووداوەش یەکێکــە لــە ڕووداوەکانی ئــەو ڕێککەوتــن و ئاشــتتەوابیە، کــە نــاوی لێــنرا (صوڵحــی حودەیبییــە)، ئــەو پەیــمان لێوەرگرتنــەی پێغەمبــەری خــواش ﷺ لــە هــاوەڵانی (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)، پێــش ئەنجامــدانی پەیمانەکــەو تێپەڕاندنــی صوڵــح و پێکهاتنەکــە بــووە، کــە ئەگــەری هەبــووە لەگــەڵ دوژمــن دا تێکبگیرێــن و بەشــەڕ بێــن، بــەڵام خــوا ﷻ بــە شــێوەیەک هــۆکارەکانی ڕەخســاندن و، هــەل و مەرجەکــەی والێکــرد کــە لەگــەڵ یەکــدا تووشــی

شەڕ نەبن و، وەک خوا ﷻ ئاماژەی پێداوە: چەند جارێک دەستی کافرەکانیشی لە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی گێڕاوەتەوەو، دەستی ئەوانیشی لە کافرەکان گێڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێ و، سەرەنجام ئەو پێکهاتنە سەر بگرێ.

خوا دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾، بە دڵنیایی خوا ڕازی بوو لە بڕواداران، کاتێک پەیمانیان لە ژێر درەختەکەدا لەگەڵدا دەبەستی، پەیمانیان پێ دەدای، ئەمەش مژدەو دڵخۆشییەکی زۆر زۆر گەورەیە: ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾، (خوا) زانیی چی لە دڵەکانیاندا هەیە، هەڵبەتە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پەیمانەکەیان لە خزمەت پێغەمبەردا بەستوە، ئەگەر ئەم ئایەتە ئەو کاتە بۆیان دابەزیبایە، بێگومان ئەو هەموو دڵە ڕاوکەو دڵناڕەحەتییەیان نەدەبوو لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ هۆزی قوڕەیشدا دەکرد، بەڵام ئەو ئایەتانە دوایی دابەزیون، پێشێ خوا ﷻ تاقیکردوونەوە، کە ستایش بۆ خوا لە تاقیکردنەوەکە، سەربەرزانە دەرچوون، ئنجا دوایی خوا ﷻ ئەو خەڵاتەی پێ بەخشیون کە: من لێتان ڕازیی بووم، ئەی ئەو بڕوادارانەی پەیمانتان بە پێغەمبەردا ﷺ لە ژێر سێبەری درەختەکەدا! ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾، خوا ﷻ زانیی چی لە دڵیاندا هەیە! ئیمانێکی مەحکەم و، خوا بە یەکگرتنێکی ڕاستەقینەو، بەندایەتییەکی ساغی بێ خڵتەو، لێبڕان و فیداکارییەکی تەواو، لە پێناوی خواو ئایین و بەرنامەکەیداو، بە شوێن پێغەمبەرەکەیدا، ﴿فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ﴾، بۆیە ئۆخژن و ئۆقرەیی دابەزاندە سەریان، پێشتر فەرمووی: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە، ئۆخژن و ئۆقرەیی خستە نێو دڵی بڕوادارانەوە، هەروەها دواتریش وشەی: (السَّكِينَة) هاتوە: ﴿فَأَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾، ئنجا ئێمە بەهۆی ئایەتی ژمارە (٤)وە: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ﴾، دەزانین کە (السَّكِينَة)، هەم لێرەداو، هەم لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا، ئۆقرەییەکە چۆتە نێو دڵ و دەروونیانەوە، چونکە ئۆقرەیی و ئۆخژن پەیوەندیی بە دڵ و

دەروونـەوە هەیـەو، لـە ڕاسـتییدا جەوهـەری مـرۆڤ و کەسـایەتیی مـرۆڤ، لـە دڵ و دەروونـی و دیـوە مەعنەوییەکەیـدا بەرجەسـتە دەبـێ، ئەگـەر ئینسـان لـە ڕووی دڵ و دەروونـەوە ئـارام و هێمـن و خـاوەن ئۆقرەیـی و داسـەکنان بـوو، جەسـتە بـە هـۆی ئـەو دڵـە ئـارام گرتـووەوە، خۆڕاگـر دەبـێ، ﴿ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئۆقرەیـی دابەزانـدە سـەریان سـەر دڵ و دەروونیـان، ﴿ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ﴾، سـەرکەوتنێکی نیزیکیشـی بـە پاداشـت دانـەوە.

ئـەو دەسـتکەوتە نیزیکـەش، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەو پێکهاتنـە بـێ، کـە دوایـی لـە حودەیبییـەدا مـۆر کـرا، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی جەنگـی خەیبـەر بـێ، بـەڵام زیاتـر وا پـێ دەچـێ مەبەسـت صوڵحەکـە بـێ، چونکـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةٗ يَأۡخُذُونَهَا ﴾، زۆر دەسـتکەوتی جەنگیشـی بـە پاداشـتدانەوە کـە دوایـی دەیانگـرن، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴾، خـواش ﷻ هـەر زاڵـی کارزان بـووە.

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةٗ تَأۡخُذُونَهَا ﴾، خـوا ﷻ دەسـتکەوتانێکی زۆری بەڵێـن پێـداون، دەیانگـرن، واتـە: لـە داهاتـوودا، دەیانگـرن، ﴿ فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ ﴾، ئنجـا ئەمـەی بـە پەلـە بـۆ هێنانـە پێـش، ئایـا مەبەسـت لە: (ئەمـە) کامەیـە؟ جـارێ جەنگی خەیبـەر نەبـووە، تاکـو دەسـتکەوتەکانی جەنگـی خەیبـەر بگـرن! واتـە: ئـەم پێکهاتـن و صوڵحـەی بـە پەلـە بـۆ هێنانـە پێـش و کـردی بـە پێشدەسـت و، زەمینـە خۆشـکەر بـۆ دەسـتکەوتەکانی دیکـەو، بـۆ سـەرکەوتنەکانی داهاتـوو، ﴿ وَكَفَّ أَيۡدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمۡ ﴾، هەروەهـا دەسـتی خەڵکـی لـە ئێـوە گێڕایـەوە، واتـە: دەسـتی کافـرەکانی مەککـە، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ، کـە لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـدا باسـمانکرد، ئـەو هەشـتا کەسـەی لـە چیـای تەنعیمـەوە دابەزیـوون، لـە کاتێکـدا کـە پێغەمبـەر ﷺو هـاوەڵان لـە نوێـژی بەیانییـدا بـوون، هەروەهـا دەگونجـێ مەبەسـت ئـەو هێـزە بـێ، کـە قورەیـش کـۆی کردبـۆوە، کـە ئەگـەر پێغەمبـەرو هـاوەڵانی بـەرەو مەککـە بچـن، لـە دژیـان بجەنگـن، خـواش ﷻ دەسـتی ئـەوانی لێگێڕانـەوە، ﴿ وَلِتَكُونَ ءَايَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، تاکـو ئـەو سـەرکەوتنەو، ئـەو دەسـتکەوتە نیزیکـە ببێتـە نیشـانەیەک بـۆ

بڕواداران، نیشانەیەک لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ مشووری وایان لێ دەخوات، خۆیان عەقڵیان پێی ناشکێ، ئەوان صوڵحی حودەیبییەیان بە بەڵاو خراپ و تەنازول دەزانی و زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو! بەڵام خوا ﷻ دەیزانی کە باشترین دەستکەوت و سەرکەوتنە بۆ ئەوان، ﴿وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾، بۆ ئەوەی خوا ﷻ بتانخاتە سەر ڕێیەکی ڕاست، واتە: لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا، کە هاتە پێش، ئەگەرنا بێگومان هەر لەسەر ڕێی ڕاست بوون.

﴿وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا﴾، هەروەها خوا ﷻ بەڵێنی دەستکەوتانێکی دیکەی پێداون، جارێ تواناتان بەسەریاندا نەشکاوە، ﴿قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا﴾، بەڵام خوا ﷻ دەوری ئەو دەستکەوتانەشی داوە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا﴾، خواش ﷻ هەمیشەو هەردەم لەسەر هەموو شتێک توانا بووە.

﴿وَلَوۡ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوَلَّوُاْ ٱلۡأَدۡبَٰرَ﴾، ئەگەر گریمان ئەوانەی بێبڕوان لەگەڵتاندا بەشەڕهاتبان و جەنگیان لەدژکربانایە، پشتیان تێدەکردن و ڕایاندەکرد، ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾، دواییش هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتییدەرێکیان نەدەبوو، یانی: نە کەسێکیان دەبوو سەرپەرشتییان بکات بە گشتیی، نە کەسێکیشیان چنگ دەکەوت لەو ڕووداوەدا، بە تایبەت، هاوکاریان بێ و دەستبارگریان بێ، (ولي): سەرپەرشتیار، ئەو کەسەیە بە گشتیی سەرپەرشتیی بکات لە هەموو کاتەکاندا، بەڵام (نَصِير) یامەتییدەر، کەسێکە لە کاتێکی دیارییکراوداو بۆ شتێکی دیارییکراو، هاوکارو دەستبارگرو سەرخەرو پشتیوان بێ.

﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلُ﴾، {ئەو تێکشکانەی بێبڕوایان لە بەرانبەرتاندا، ئەگەر جەنگیان لە دژتان کردبایە}، یاسای خوایە کە پێشتر تێپەڕیوەو ڕابردووە، کە هەمیشە هەر کاتێک کۆمەڵێک، بە ڕاستیی بڕواداربووبن و، لە بەرانبەر ئەهلی کوفردا، خۆیان بینبیێتەوە، ئەهلی کوفر خۆیان بۆ نەگرتوون، ئەوە یاسایەکی خوایە، ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾، گۆڕینیشت بۆ یاسای خوا چنگ

ناکەوێ، واتە: یاسای خوا گۆڕانی بۆ نیە، وەک چۆن لە گەلانی پێشوودا ئەو یاسایەی خوا تێپەڕیوەو ڕابردووە، بۆ ئێوەش ئەو یاسایەی خوا، هەر هەیەو بەردەوامە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم﴾، هەروەها (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە، کە دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوەو، دەستی ئێوەشی لە ئەوان گێڕایەوە، لە کوێ؟ ﴿بِبَطْنِ مَكَّةَ﴾، لە ئاقاری مەککەو لە نێو هەناوی مەککەدا، لە شوێنێک کە زۆر لە مەککەوە نیزیکە، ﴿مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾، دوای ئەوەی ئێوەی بەسەر ئەواندا سەرخست، مەبەست پێی ئەو کەسانەیە کە هاتن پەلاماری پێغەمبەرو هاوەڵانیاندا، بەڵام هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆسەیان بۆ دانابوون و کەوتنە بۆسەی هاوەڵانەوەو گرتیانن و، پێغەمبەریش ﷺ دوایی منەتی لەسەرکردن و بەریدان، خوای پەروەردگار ئەمە بە چاکەو نیعمەتێکی خۆی دەزانێ لەسەر بڕواداران، کە دەستی کافرانیشی لەوان گێڕاوەتەوە، زەفەر بە بڕواداران نەبەن و، دەستی بڕوادارانیشی لەوان گێڕاوەتەوە، دوای ئەوەی بەسەریاندا زاڵبوون و زەفەریان پێ بردوون، بەڵام خوا ﷻ ئیلهامی دڵی پێغەمبەری ﷺ کردوە، یان وەحیی بۆ ناردوە، کە دەستیان لێ نەدەن و نەیانکوژن، چونکە لەوەدا بەرژەوەندییەکی گەورەتر لە کوشتنی ئەوان بۆ مسوڵمانان هەبوو، کە پێکهاتنەکەی حودەیبییە بوو، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾، خواش ﷻ بینەری ئەوە بوو کە دەتانکرد، هی هەموو لایەکتان، هەم هی بڕواداران، هەم هی بەرانبەرەکانیشیان.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە ڕوون دەکاتەوە: وەنە بێ کە خوا ﷻ دەستی بڕوادارانی لەوان پاراستوەو، وایکردوە بڕواداران تووشی زیانیان نەکەن، دوای ئەوەی زەفەریشیان پێ بردوون و، پێیان وێراون و، کەوتوونە ژێر کۆنترۆڵ و دەستەڵاتیان، وەنەبێ لەبەر چاکەی بێبڕوایەکان بوو بێ، ئنجا بۆ ئەوەی بۆچوونی وا دروست نەبێ و، کەسێک زەینی ساتمەی پێ نەبات، پێی وابێ خوا پێی ناخۆش بووە

بێبڕوایەکان تووشی ئازارو سزا بن، بە دەستی مسوڵمانان، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بێبڕوایەکان زۆر شتی وایان کردوە، شایستەی ئەوە بوون سزا بدرێن، بەڵام ئەو دەستگێرانەوەی خوای کاربەجێ، کە دەستی بڕواداراني لەوان گێڕایەوە، دوای ئەوەی بڕواداراني بەسەریان دا زاڵکردو زەفەریان پێبردن، حیکمەتەکەی شتێکی دیکەیە، دەفەرموێ: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾، ئەوان، ئەوانەن کە بێبڕوا بوون (بە هەموو شتێک) و ئێوەشیان لە مزگەوتی حەرام گێڕایەوە، ﴿ وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ ﴾، هەروەها قوربانییەکانیشیان گێڕایەوە، کە بگەنە شوێنی خۆیان، (**الهدي**) بە (مفتوح) خوێندراوەتەوە، یانی: (**وصدّوا الهديَ**)، هەروەها قوربانییەکانیشیان گێڕانەوە (**هدي**) کۆی (**هدية**)یە، ئەو ئاژەڵانەن کە دەبرێن بۆ لای حەرەمی مەککە، کە لەوێ سەرببڕرێن، وەک قوربانیی، ئەوانیشیان گێڕایەوە، (**معكوفاً**) لە کاتێکدا کە ڕاگیرابوون و وەستێدرابوون، ﴿ أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ ﴾، کە بگەنە شوێنی خۆیان و لەوێ سەرببڕدرێن، یانی: بگەنە حەرەم، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (**والهَدِيُ معكوفٌ**)، یان (**وَالهَدِيُ معكوفاً**)، هەروەها قوربانییەکانیش لە حاڵێکدا کە ڕاگیرا بوون، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (**عَنِ المَسْجد الحرام والهَدِي مَعْكُوفاً**)، یانی: ئێوەیان گێڕایەوە لە مزگەوتی حەرام و لە قوربانییەکانیشتان کە سەریان ببڕن، لە حاڵێکدا کە ڕاگیرابوون، ﴿ أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ ﴾، کە بگەنە شوێنی خۆیان.

﴿ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ ﴾، ئەگەر پیاوانێکی بڕوادارو ئافرەتانێکی بڕوادار نەبوونایە، ئەمە هۆکارەکەیە، کە بۆچی خوا ﷻ دەستی مسوڵمانانی لە ئەوان پاراست و دەستی ئەوانیشی لە مسوڵمانان پاراست، هۆکارەکەی ئەوەیە: ئەگەر پیاوانێکی بڕوادارو ئافرەتانێکی بڕوادار نەبوونایە، ﴿ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ ﴾، نەتاندەزانین، یانی: نەتاندەزانی کە ئەوان بڕوایان هێناوەو نەتاندەناسین، ﴿ أَن تَطَـُٔوهُمۡ ﴾، نەبادا پێیان لێ بنێن و بکەونە بن دەست و پێتان، واتە: زیانیان پێ بگەیەنن، ﴿ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ﴾، سەرەنجام لە لایەن ئەوانەوە،

بۆ ئـەوەی پێـی بزانـن، زیانێکتـان تـووش بووایـە، یاخـود ڕەخنەیەکتـان بێتـە سـەرو عەیبەیەکتـان بێتـە سـەرو، بەرانبەرەکانتـان لێتـان بـە ڕەخنـە بگـرن و بڵێـن: ئـەو پیـاوە بـڕوادارو ئافرەتـە بڕوادارانـەی هـاو ئایینـی خۆشـیانیان کوشـتن!! ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، خـوا هەمـوو ئـەوەی کـرد، تاکـو هـەر کەسـێ بیـەوێ، بیخاتـە نێـو بەزەیـی خۆیـەوە، واتـە: بـۆ ئـەوەی دۆخێکـی هێمـن و ئـارام لـە نێـوان ئەهلـی ئیسـلام و ئەهلـی کوفـردا، بێنێتـە کایـەوەو، ئەوانـەی خـوا ﷻ دەیـەوێ هیدایەتیـان بـدات، بیانخاتـە نێـو بەزەیـی خۆیـەوە.

یاخـود: بـۆ ئـەوەی ئـەو پیـاوە بـڕوادارو ئافرەتـە بڕوادارانـەی کـە ئێـوە نەتاندەزانی لـە مەککـەن، خـوا ﷻ بیانخاتـە ژێـر سـایەی بەزەیـی خۆیـەوەو بیانپارێـزێ و چەپاڵەیـان بـدات، ﴿لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، ئەگـەر لێـک جیـا بووبانـەوە، بـڕوادارو بێبـڕوا لێـک جیابووبانـەوە، ﴿لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، مسـۆگەر ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـەوان، بـە ئازارێکـی بـە ئێش سـزامان دەدان، واتـە: لـە دنیـادا بەدەسـتی بـڕواداران سـزامان دەدان و، کـوژراو و بریندارییـان لـێ دەبـوون.

لـە کۆتایـی دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾ یـاد بکـەوە! کاتێـک ئەوانـەی بێبـڕوان، گەرمییـان خسـتە دڵـی خۆیـان، گەرمیـی نەفامیـی و دەمارگیریـی نەفامیـی، یـانی: خـۆ بەزلگریـی و دڵگەرمیـی نەفامییـان خسـتە دڵـی خۆیـان، ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، خـواش ﷻ ئۆخـژن و ئۆقرەیـی دابەزانـدە سـەر پێغەمبەرکـەی ﷺو سـەر بڕوادارانیـش، لـە بەرانبـەر دڵگەرمیـی نەفامیـی و، دەمارگیریـی نەفامیـی ئەوانـدا، خـوا ﷻ ئۆقرەیـی و ئۆخـژنی دابەزانـدە سـەر پێغەمبەر ﷺو سـەر بـڕواداران، تاکـو خۆڕاگربـن لـە بەرانبـەر دەمارگیریـی و سـەختگیریی و خۆبەزلگریـی نەفامانـەی ئەوانـدا، ﴿وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾، پابەندیـشی کـردن بـە وشـەی پارێزکارییـەوە، یاخـود: بـە وشـەیەکەوە کـە دەبێتـە هـۆی پاراسـتنیان لـە شـیرک و کوفـر لـە دنیـاداو،

لـە سـزای خـوا لـە ڕۆژی دواییـدا، کـە بریتیـە لـە وشـەی خـوا بەیەکگرتـن (**لآ إلَـهَ إلاَّ اللـه**)، ﴿وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَا﴾، بـەس ئـەوان شایسـتەی بـوون و، تەنیـا ئەوانیـش خـاوەنی بـوون، واتـە: بـڕواداران شایسـتەو خـاوەنی ئـەو وشـەیە بـوون، کـە مـرۆڤ دەپارێـزێ و، دەبێتـە هـۆی پاراسـتنی و دەبێتـە هـۆی ئـەوەی پارێزکاریـی تێـدا پەیـدا بـکات، پێـش هەمـوو شـتێک پارێزکاریـی لـە شـیرک و لـە کوفـر، ئنجـا لـە گوناهـو تـاوان و لادان، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا﴾، بـە دڵنیایـی خـواش بـە هەمـوو شـتێک زانایـە، هەمیشـە بـە هەمـوو شـتێک زانـا بـووە، بۆیـە خـوا ﷻ بـە پێـی زانیاریـی و حیکمـەتی خـۆی، مامەڵـە لەگـەڵ مرۆڤەکانـدا دەکات، هـەر کەسـێک چـی شایسـتە بـێ، ئـەوەی بـۆ دەکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕازیبوونی خوا ﷻ لە بڕوادارانی پەیماندەر بە پێغەمبەر ﷺ لە ژێر درەختەکەدا، دوای ئەوەی زانی چییان لە دڵ دایە! ئیدی ئۆقرەیی و ئۆخژنی بەسەر دڵیاندا ڕژاندو، سەرکەوتنێکی نیزیکیشی بۆ ڕەخساندن، وێڕای گەلێک دەستکەوتی دیکەی گەورە لە داهاتوودا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ﴾، بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوەوە، خوا ﷻ لە بڕواداران ڕازیبوو، یانی: لەو بڕوادارانە ڕازیبوو، کە زاندراو و ناسراون، چونکە (**الـمُؤْمِنُون**) (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ئنجا بێگومان خوا ﷻ لە تێکڕای بڕواداران ڕازییە، هەر کەسە بە ئەندازەی ئیمانەکەی، بەڵام لێرەدا بەپێی سیاق دەزانین کە (أل)ەکە بۆ جینس نیە، بەڵکو بۆ (**عهد**)ە، واتە: لە بڕوادارەکان ڕازیبوو، کە دیارە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر بوون، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەو (١٤٠٠) کەسە، کە پەیمانیان بە پێغەمبەری خوادا ﷺ.

**٢)-** ﴿إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾، لە کاتێکدا لە ژێر (سێبەری) درەختەکەدا، پەیمانیان لەگەڵ تۆدا دەبەست.

(**إِذْ ظَـرْفٌ مُتَعَلِّـقٌ بِفِعْـلِ رَضِيَ، وَالتَّعْرِيـفُ فِي الشَّـجَرَةِ لِلْعَهْـدِ وَهِـيَ: الشَّـجَرَةُ الَّتِـي عَهِدَهَـا أَهْـلُ الْبَيْعَـةِ حِـينَ كَانَ النَّبِـيُّ ﷺ جَالِسـاً فِي ظِلِّهَـا**)، (**إذ**): دەلالەت لەسەر کات

دەكات و پەیوەستە بە كرداری (رَضِيَ)وە لە چ كاتێكدا خوا لێیان ڕازیی بوو؟ لەو كاتەدا كە پەیمانیان لەگەڵ تۆدا دەبەست ئەی پێغەمبەر! ﷺ، (أل)ی (الشَّجَرَة)ش، دیسان بۆ (عهد)ە، واتە: درەختەكە، ئەو درەختەی پەیماندەرەكان بە پێغەمبەری خوا ﷺ زانیویانە كامەیە، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێبەری درەختەكەدا دانیشتبوو، كە دەفەرموێ: ﴿إِذۡ يُبَايِعُونَكَ﴾، لە حاڵێكداو لە كاتێكدا كە پەیمانیان لەگەڵ تۆدا دەبەست، بە (فعل المضارع) دەیهێنێ، بۆ ئەوەی وێنەكە بهێنێتە بەر خەیاڵ و ئەندێشەی بیسەرو خوێنەر.

٣)- ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾، زانی چییان لە دڵ دایە! كە دەفەرموێ: ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾: (يَعْنِي: عَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْكَآبَةِ)، (ف)ەكە پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، لە ئەنجامی ئەوەدا، كە زانیی چییان لە دڵدا هەیە، لە خەم و خەفەت و ناڕەحەتیی.

یاخود: (عَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الإِيْمَان وَالإِخْلَاص)، زانیی چییان لە دڵدا هەیە، لە ئیمان و ئیخلاص، هەردووكیشیان ڕاستن و، لە ڕاستییدا، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەو كاتەدا زۆر خەفەتبارو دڵتەنگ بوون، هەروەها دڵیشیان پڕبوو لە ئیمان و یەكلابوونەوە بۆ خوا ﷻ.

٤)- ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ﴾، بۆیە (لە ئەنجامی ئەوەدا)، خوا ﷻ ئۆقرەیی و ئۆخژنی ڕژاندە سەریان، كە بێگومان وەك لە سەرەتای سوورەتی (الفتح)دا، هاتوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ...٤﴾، (سَكِيْنَة) ئۆخژن و ئۆقرەیی دەچێتە نێو دڵ، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ﴾، یانی: وێڕای ئەوەی چۆتە نێو دڵیان، سەرتاپای جەستەشیانی داگرتوە، یاخود: چونكە لە ئایەتی (٤)دا وشەی (في قلوبهم) هاتوە، بۆیە لە دوو ئایەتەكەی دواتردا، بە پێویست نەزانراوە بهێنرێ.

٥)- ﴿وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا﴾، سەركەوتنێكی نیزیكیشی بە پاداشت دانەوە، (وَمَعْنَى أَثَابَهُمْ: أَعْطَاهُمْ ثَوَابَاً، وَعِوَضَاً)، مانای (أَثَابَهُمْ): خوا پاداشت و قەرەبووی دانەوە، هی ئەو خۆڕاگریی و فەرمانبەرییەیان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو، ئەو دان بە خۆ داگرتنەیان، خوا

چی بە پاداشت دانەوە؟ دەستکەوتێک و سەرکەوتنێکی نیزیک، کە دەگونجێ مەبەست خودی صوڵحی حودەیبییە بێ و ئەوە زیاتر پێدەچێ، چونکە صوڵحی حودەیبییە خوا ﷻ هەر ناوی لێناوە: (فتح): ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ①﴾، بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ڕۆشنمان بۆ ڕەخساندی.

دەشگونجێ مەبەست پێی سەرکەوتن بێ بەسەر جوولەکەکانی خەیبەرداو، دەستگرتن بێ بەسەر ئەو ناوچەیەی جوولەکەکاندا، کە ناوچەیەکی زۆر پڕ پیت و پێزو پڕ بەرهەم بوو.

٦)- ﴿وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا﴾، هەروەها پاداشتدراونەوە بەوەی دەستکەوتانێکی زۆر دەگرن، دەستیان بەسەردا دەگرن، ئەمەیان بە دڵنیایی مەبەست پێی دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەرە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً﴾، دەستکەوتانێکی زۆر، چونکە دەستکەوتەکان زۆرو جۆراو جۆر بوون، هەر لە ئاژەڵ چەندان جۆری ئاژەڵ، هەروەها لە بەروبوومی کشتوکاڵیی: دانەوێڵەو میوەو تەڕەکارو خورما، هەروەها ماڵی نەغدینە، زێڕو زیو، دیسان چەک و تفاقێکی زۆر، هەموو ئەوانەیان لێ بە دەستکەوت گرتن.

٧)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾، خواش ﷻ هەمیشە زاڵی کاربەجێ بووە.

لە بارەی ئەو بەڵێن و پەیمانەوە، دوو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دێنین و پێشتریش بە تەفصیل باسی ئەو بەڵێن و پەیمانەمان کردو دووبارەی ناکەینەوە:

أ- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أَنْتُمُ اليَومَ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ} **(أخرجه البخاري: ٤١٥٤، ومسلم: ٧١)**، واتە: ئێوە ئەمڕۆ باشترین خەڵکی سەر زەویین، ڕووی دواندنی لە هاوەڵانی پەیماندەری بووە لە ژێر سێبەری درەختەکەدا.

ب- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لَا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} **(أخرجه أحمد: ١٤٨٢٠، وأبو داود: ٤٦٥٣، والترمذي: ٣٨٦٠، وابن حبان: ٤٨٠٢، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح)**، واتە: هیچ کەس لەوانەی لە ژێر درەختەکەدا، پەیمانیان بەست، ناچنە نێو ئاگرەوە.

ئنجا با دوو سێ قسەش لە بارەی (حودەیبییە)وە بکەین: (**الْحُدَيْبِيَة، بتَخْفِيف الْيَاء: هِيَ عَلَى عَشْرَةِ أَمْيَالٍ مِنْ مَكَّةَ**)، حودەیبییە دە (١٠) میل لە مەککەوە دوورە، واتە: نزیکەی (١٥ - ١٦) کیلۆمەتر.

(**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ: لە سەردەمی (**المتوكل جعفر بن المعتصم**) لە ساڵی (٢٤٤) کۆچییدا، لەو شوێنەی پێیان وابووە درەختەکەی لێ بووە، ئەو درەختەی بەڵێن و پەیمانی لە ژێردا بەستراوە، مزگەوتێکیان دروستکردوە، دوایی (المستنصر بالله)[1] لە ساڵی (٦٢٩)ی کۆچییدا، تازەی کردۆتەوە، دواییش سوڵتان مەحموود خانی عوسمانیی لەساڵی (١٢٥٤)ی کۆچییدا تازەی کردۆتەوەو، (**محمد الطاهر بن عاشور**) گوتوویەتی: (**وَهُو قَائِمٌ اليَوْم**)، ئێستا ئەو مزگەوتە بە پێوەیەو ماوە.

بۆیەش ناو لەو پەیمانە نراوە: (**بَيْعَة الرِّضْوَان**)، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ لەوێدا فەرموویەتی: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، بۆیەش نەیفەرمووە: (**رَضِيَ اللهُ عَنِ الصَّحَابَة**) یان (**أَصْحَاب**)، تاکو سەرنجمان ڕابکێشێ بۆ ئەوە کە ئەو هاوەڵانە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەهۆی ئەو ئیمانەوە کە لە دڵ و دەروونیاندا هەیە، بوونە جێی پەسەندیی خواو، بوونە جێی ئەوەی خوا لێیان ڕازی بێ.



---

(١) یەکێکە لە حوکمڕانانی عەبباسییەکان.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەڵێندانی خوا بە بڕواداران کە دەستکەوتانی زۆر بگرن، بەڵام هی خەیبەر (یان سەرکەوتنی حودەیبییە)ی بۆ پێشخستوون و، لە دەستی خەڵکی کافر پاراستوونی، تاکو نیشانەو بەڵگەیەک بێ بۆ بڕواداران و بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، هەروەها گەلێک دەستکەوتی دیکە کە خوا ﷻ دەوری داون و، بڕواداران توانایان بەسەریاندا ناشکێ، خوا ﷻ بۆ بڕوادارانیان دێنێتە پێش (بۆ هاوەڵان) بەپێی یاسای دێرینی خواش ﷻ ئەگەر بێبڕوایان دژی بڕواداران جەنگابانایە، ڕایان دەکردو تێک دەشکان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا ﴾، خوا ﷻ دەستکەوتانێکی زۆری گفت پێداون کە دەیانگرن.

٢)- ﴿ فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ ﴾، ئەمەیانی بۆ پێشخستن، ئەمەیانی بە زوویی بۆ هێنانە پێش، ئایا مەبەست لە ئەمەیان (هَذِهِ) چییەو، ئەم ناوی ئاماژەیە بۆچی دەگەڕێتەوە؟:

أ- هەندێک گوتوویانە: بۆ دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر، دەگەڕێتەوە.

ب- هەندێک گوتوویانە: بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانەی لە ژێر درەختەکە درا بە پێغەمبەرﷺ دەگەڕێتەوە.

ج- هەندێک گوتوویانە: بۆ پێکهاتنی حودەیبییە، دەگەڕێتەوە.

بەڵام بەپێی سیاق دەزانرێ کە زیاتر مەبەست پێکهاتنەکەی حودەیبییەیە، کاتێک ئەم سوورەتە موبارەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەخوار کە شەو بوو لە لای (کُـرَاعُ الغَمِیْـم)، کاتێک کە دەگەڕانەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، واتە: لە مانگی (ذي القَعِـدة)ی ساڵی شەشەمی کۆچیی دا، واتە: کە جارێ جەنگی خەیبەر نەکراوە، بۆیە وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی پێکهاتنەکەی حودەیبییە بێ، بەڵێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مَغَانِمَ كَثِيرَةً﴾، دەستکەوتانێکی زۆر، بەڵام بە تەئکید صوڵحی حودەیبییە، هەرچەندە دەستکەوتی ماددیی تێدا نەبوو، بەڵام دەستکەوتی سیاسیی و مەعنەویی و، سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو.

بەڵام دەشگونجێ مەبەست دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر بێ، بەو واتایە کە لە لای خوا شتێکی بڕاوەیە، چونکە جاری وا هەیە خوا ﷻ باسی شتێکی داهاتوو دەکات، وەک ڕابردوو لەبەر ئەوەی بە نسبەت خواوە، ئێستاو ڕابردوو و داهاتوو هەمووی یەکسانە.

**٣)-** ﴿وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنكُمْ﴾، دەستی خەڵکی لە ئێوە گێڕایەوەو پاراستنی، (**المَقْصُودُ بالنَّاسِ: قَبِيلَةُ بني أَسَدٍ وغَطَفَانَ، هَمُّوا عِنْدَ مَسِيرِ النَّبِي إلى خَيْبر، أَن يُغيرُوا عَلَى الْمَدِينَة، فصرفهم الله**)، مەبەست لە خەڵک: هەردوو هۆزی بەنوو ئەسەدو غەطەفانە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بۆ خەیبەر بچێ، ویستیان بەسەر مەدینەدا بدەن، بەڵام خوا ﷻ لایدان.

ئەوەش لە حاڵێکدایە کە مەبەست لە ئەمە (هَـٰذِهِ) دەستکەوتەکانی جەنگی خەیبەر بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست لە ئەمە: (هَـٰذِهِ)، پێکهاتنی صوڵحی حودەیبییە بێ، ئەوە بە تەئکید مەبەست لە: خەڵک (**النَّـاس**) لە: ﴿وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنكُمْ﴾دا، هۆزی قورەیشن، کە هێزێکی زۆریان کۆکردبۆوەو، هەندێکیشیان پەلاماری پێغەمبەرو هاوەڵانیاندا، کاتێک لە نوێژی بەیانیی دابوون و پێشتر

باسـمان کـرد، هەشـتا (٨٠) کـەس بـوون، بـەڵام مسـوڵمانان بـە دیلیـان گرتـن و، پێغەمبـەری خـواش ﷺ بەرپەهەڵـدان و ئـازادی کـردن، کەواتـە: زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت لـە: خەڵـک (النَّاس)، ئـەو خەڵکـەی زانـدراون، تێکـڕای خەڵـک نیـەو (ألـ) ەکـەی بـۆ عەهـدە، خەڵکەکـە، کـە خەڵکـی قورەیشـە، دەسـتی وانـی لـێ گێڕانـەوە.

٤)- ﴿وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾، بۆ ئەوەی ئەوە ببێتە نیشانەیەک بۆ بڕواداران، کە دیسان ڕاناوی سەر (لِتَكُونَ) هەر دەچێتەوە بۆ (هَذِهِ) تاکو ئەوەی خوا بۆی پێشخستن، ببێتە نیشانەیەک بۆ بڕواداران، کە هەروا پێدەچێ مەبەست پێی صوڵحی حودەیبییە بێ، کە بوو بە نیشانەیەک بۆ بڕواداران، لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ مشووریان دەخوات و سەرپەرشتییان دەکات و بە شێوەیەک تەگبیریان بۆ دەکات، کە بۆ خۆیان عەقڵیان پێ ناشکێ، بەڵکو خۆیان جاری وایە، شتێک بە باش دەزانن، بەڵام زیانی تێدایە، خوا ﷻ بڕیارێکیان بۆ دەدات، زۆر لەسەر دڵیان قورسەو، زۆر پێیان ناخۆشە، بەڵام زۆر لە بەرژەوەندییانە، بۆ وێنە:

وەک پێشـتریش باسـمان کـرد: یەکێـک لـە بەنـدەکانی پێکهاتنەکـە ئـەوە بـوو: (هەر کەسـێک لـە کافـرەکان مسـوڵمان بـێ، دەبـێ پێغەمبـەر ﷺو مسـوڵمانان بیگێڕنـەوە بـۆ لایـان)، کـە لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ئەبـوو بەصیـرو ئەبـوو جەنـدەڵ کـە مسـوڵمان بـوون، دوایـی (٦٠ -- ٧٠) کەسـی دیکەیـان لـێ ئـاڵاو، لـە شـوێنێک بۆسـەیان دانـا بـوو بـۆ کاروانـەکانی قورەیـش، ئنجـا دوای ئـەوەی زیانێکـی باشیشـیان گەیانـد بـە قورەیشـییەکان لـە ڕووی ئابووریـی و لـە ڕووی بەشـەرییەوە، ئنجـا زۆر تەکلیـف و داوایـان لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد، کـە وەخۆیانگـرێ و بیانباتـەوە لای خـۆی!! ئـا ئـەوە نیشـانەیەکە لەسـەر ئـەوە کـە خـوا ﷻ ئـەوەی بـە پێغەمبەرەکـەی خـۆی ڕادەگەیەنـێ و خـوا بـۆ پێغەمبـەری خـۆی بڕیـاری دەدات، ئـەی بڕوادارینـە! دەبـێ ببێتـە نیشـانە بـۆ ئێـوە، کـە خـوا ﷻ سەرپەرشـتییتان دەکات و، کەسـێکیش خـوا ﷻ سەرپەرشـتیی بـکات، هەمـوو کارەکانی بەرهەمـدار دەبـن و ئاکامیـان خێـر دەبـێ، کەواتـە: بۆیـان دەبێتـە نیشـانەو، واشـبوو بۆشـیان بـوو بـە نیشـانە ئـەو پێکهاتنـەی

حودەیبییە، لەسەر ئەوە کە ئەوان خوایەکیان لەپشتەو سەرپەرشتییان دەکات و ئاگای لێیانە.

٥)- ﴿وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾، هەروەها بتانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، یاخود ڕێی ڕاستتان پێشان بدات، لێرەدا مانایەکان هەردووکیان دەگونجێن، دەگونجێ (**هداية**) بە مانای ڕێ نیشاندان بێ، دەشگونجێ بە مانای ڕێی ڕاست پێگرتن بێ، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە ئەو ڕێیەی دەتانگەیەنێ بەوەی وشەی هەق و ناوی خوا بەرزبکەنەوەو، ئایینی خوا زیاتر بڵاو بکەنەوە، یاخود ڕێیە ڕاستەکە ئەوە بوو، کە پشت بە خوا ببەستن و متمانەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، یاخود: بریتی بوو لە مامەڵەی ڕاست و دروست و لێزانانە لەو قۆناغە هەستیارەدا، لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا کە بۆیان هاتە پێش، کە بەرپەرچدانەوەی قورەیشییەکان بوو بۆیان و، ڕێ لێگرتنیان بوو کە بچن بۆ عومرە، خواش ﷻ خستنیە سەر ڕێیەکی ڕاست و ڕێنمایی کردن، هەڵسوکەوتێکی سەر ڕاستانە بکەن.

٦)- ﴿وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا﴾، هەروەها خوا ﷻ بەڵێنی دەستکەوتانێکی دیکەی پێداون کە جارێ تواناتان بەسەریان دا نەشکاوە.

(**أُخْـرَى: مُبْتَـدأ «لَـمْ تَقْـدِرُوا عَلَيْهَـا» صِفَتـه «وَقَـدْ أَحَـاطَ اللـهُ بِهَـا»، خَـبَرُه الثَّـانِي، وَخَـبَرُهُ الأَوَّل مَحْـذُوف**)، کـە دەفەرمـوێ: (**أُخْـرَى**) دیـارە ئەمـە نیهـاد (**مُبْتَـدأ**)ەو، واتـە: دەسـتکەوتانێکی دیکـە، ﴿لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا﴾ سـیفەتی (**أُخْرَى**)یـە، جـارێ ئێسـتا تواناتان بەسـەریاندا نەشـکاوە.

٧)- ﴿قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا﴾، ئەمە گوزارە (**خبر**)ی دووەمیەتی، بەڵام گوزارەی یەکەمی قرتێنراوە، واتە: خوا ﷻ دەستکەوتانێکی دیکەشی بۆ داناون و، بەڵێنی پێداون کە ئێستا تواناتان بەسەریاندا ناشکێ، بەڵام خوا ﷻ دەوری داون و بۆی هەڵگرتوون.

٨)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا﴾، بە دڵنیایی خواش ﷻ هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا توانادار بووە.

ئایا مەبەست لە: ﴿ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُواْ عَلَيْهَا ﴾ چییە؟ ئایا مەبەست پێی تێکڕای ئەو دەستکەوتانەیە کە مسوڵمانان بە گشتیی، دەیانگرن، یاخود: پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بە تایبەت دەیانگرن؟ مانای دووەمیان زیاتر پێدەچێ، چونکە خوای پەروەردگار ئەوان دەدوێنێ، کە بۆی هەڵگرتبوون و لە داهاتووشدا بە قسمەتیان بوون، چ لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، چ لە ڕۆژگاری خەلیفە ڕاشیدەکانیدا (خوا لێیان ڕازی بێ).

٩)- ﴿ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوَلَّوُاْ ٱلْأَدْبَٰرَ ﴾، ئەگەر ئەوانەی بێبڕوان لە دژتان جەنگیان بکردبایە، پشتیان تێدەکردن، پاشیان تێدەکردن و ڕایان دەکرد.

١٠)- ﴿ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، دواییش هیچ سەرپەرشتیارو هاوکارو یارمەتییدەریشیان چنگ نەدەکەوتن، ئەمەش هەواڵدانێکی دیکەیە، کە خوای بەرز هەواڵ دەدات بە بڕواداران، کە کافرەکان لەوە بێهێزترن لە دژی بڕواداران بجەنگن، بەڵێ ئێوەیان گێڕایەوە کە بچن بۆ عومرەکردن، بەڵام خوای ﷻ کارزان و توانا وای لە بەرژەوەندیی ئێوەو پێغەمبەرەکەی و ئایین و بەرنامەکەی، زانی، ئەگەرنا وا نەبوون بتوانن ئێوە بگێڕنەوەو، ئەگەر لە دژیشتان جەنگیان کردبایە، پشتیان تێدەکردن و ڕایان دەکرد، دواییش هیچ سەرپەرشتیارێکیان دەست نەدەکەوت کە بە گشتیی سەرپەرشتیی کاروباریان بکات، بەڵکو هیچ هاوکارو یارمەتییدەرێکیشیان چنگ نەدەکەوت، لە شتێکی دیارییکراویشدا پشتگیرییان بکات و هاوکارییان بکات.

ئەم تەعبیرە: ﴿ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە، ئایا حیکمەتەکەی چییە؟ (**فَخرالدين الرازي**) دەڵێ: (**دَفْعُ الضَّرِّ عَنِ الشَّخْصِ، إِمَّا أَنْ يَكُونَ بِوَلِيٍّ يَنْفَعُ بِاللُّطْفِ، أَوْ بِنَصِيرٍ يَدْفَعُ بِالْعُنْفِ**)، تەعبیرەکەیم زۆر پێ جوان بوو، بۆیە هێنام، دەڵێ: لابردنی زیانێک لە کەسێک، یان لە لایەن سەرپەرشتیارێکەوە دەبێ، کە بە شێوەیەکی پەنهانکارانەو بە نەرم و نیانیی سوودی پێ بگەیەنێ، یاخود بە هاوکارو یارمەتییدەرێک دەبێ کە بە توندیی بەرگریی لێ بکات،

بەڵام ئەوان نە سەرپەرشتاریان چنگ دەكەوت، ئەگەر لەگەڵ ئێوەدا ڕووبەڕوو و بەرەنگاربووبانەوە، نە یارمەتییدەرو هاوكاریشیان دەبوو.

١١)- ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلُ ﴾، ئەمە یاسای خوایە كە پێشتر تێپەڕیوەو ڕابردوە.

ئایا لە ڕووی ڕێزمانییەوە وشەی: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ﴾ بەچی مەنصووبە؟

زانایان گوتوویانە: ((سنة) **مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ لِفْعْلِ مُقَدَّرٍ: سَنَّ اللهُ سُنَّةً، فَهِيَ سُنَّةٌ قَدِيمَةٌ لله تَعَالَى فِي نَصْرِ أَوْلِيَائِهِ**)، واتە: (سنة) بەركارێكی ڕەهایە بۆ كردارێكی مەزەننەكراو، خوا ﷻ یاسای داناوە، یاسایەك كە پێشتر تێپەڕیوە.

١٢)- ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴾، تۆ هیچ گۆڕانكارییەك بۆ یاسای خوا نابینی، ناگونجێ یاسای خوا بگۆڕرێ، پێشتریش خوا ﷻ هەر بەپێی ئەو یاسایە مامەڵەی كردوە لەگەڵ پێغەمبەرانی دیكەدا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بەو شێوەیە مشووری لێ خواردوون و سەرپەرشتیی كردوون و كارەكانی بۆ ڕاست هێناون.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خـوای کارزان بـۆ ئـەوەی صوڵحـی حودەیبییـە سـەر بگرێ، هـەر کام لە بـڕواداران و بێبڕوایـانی لـە دەسـتی یەکـدی پاراسـت و، لەبـەر خاتـری سـەلامەتیی بڕوادارانێکی پیـاوو ئافـرەت کـە لـە شـاری مەککـەدا هەبـوون و، مسـوڵمانان نەیاندەزانیـن، نـەوەک بـێ ئـەوەی پێبزانـن بـە هـۆی زیانبـار بوونیانـەوە لـە ئەنجامـی جەنگـدا، مسـوڵمانان تووشـی عەیبـەو ناڕەحەتییـەک بـبن، ئـەو پێکهاتنـەی ڕەخسـاندو لـە حاڵێکـدا کـە کافـرەکان دڵگەرمیـی و دەمارگیریـی نەفامییـان هەبـوو، خـوا ئۆقرەیـی و ئۆخـژنی دابەزانـدە سـەر پێغەمبـەر ﷺو بـڕواداران و، بـەو پارێزکارییـەوە پابەنـدی کـردن، کـە بـەس ئەوانیـش شایسـتەینی و، هـەر ئـەوان خـاوەنی ڕاسـتەقینەینی بەپێـی زانیاریـی بـێ سـنووری خـوا:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ
بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ
عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَـٰتٌ لَّمْ
تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ
لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ
وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم﴾، (ئەو خوایەی ﷻ کە بە دیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆرو سەرپەرشتیارتانە)، ئەو کەسەیە کە دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوە، ئەوانی لە ئێوە بەرپەرچدایەوەو، دەستی ئێوەشی لە ئەوان گێڕایەوە.

٢)- ﴿بِبَطْنِ مَكَّةَ﴾، لە نیزیک و ئاقاری مەککە، (بَطْن) بە مانای سک دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای: ئاقاری مەککە و نیزیکی مەککە دێ، واتە: دەستی هەر کامێکتانی لەوی دیکە گێڕایەوەو، هەر کامێکتانی لە دەستی ئەوەی دیکە پاراست.

٣)- ﴿مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾، دوای ئەوەی ئێوەی بەسەرواندا سەرخست، (**الظَّفَرُ: الفَوْزُ بِالمَطلوب فَهُوَ أَعَمُّ مِنَ النَّصْرِ الَّذِي لَا يَكُونُ إلاَّ بِقِتَالٍ**)، (ظَفَر): بریتیە لە وەدەستهێنانی ئامانج و، بە ئامانج گەیشتن، بۆیە گشتییترە لە سەرکەوتنێک، کە بە جەنگ نەبێ نایەتە دی، لێرەدا: ﴿مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾، واتە: دوای ئەوەی شتێک کە بۆ ئێوە سوودی تێدایە، لەوانەوە بۆی بەرهەم هێنان، کە بریتی بوو لەو صوڵح و پێکهاتنە.

یاخود: دوای ئەوەی ئێوەی بەسەر واندا سەرخست، بە تایبەتی ئەو هەشتا (٨٠) کەسەی لە لای (**جبل التنعيم**)ەوە دابەزین، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لە نوێژی بەیانییدا بوون، دوایی بە دیل گیران، دەیانتوانی بیانکوژن و، ئەوەش زەبرێکی زۆر گەورەو کوشندە دەبوو لێیان دەدرا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشیی لێکردن لەبەر بەرژەوەندییەکی گەورەتر، کە ئەویش ئەوە بوو، ئاشتەوایی و صوڵحێک بکرێ لەگەڵ هۆزی قوڕەییشداو، سەرەنجام دنیا هێمن و ئارام بێ، بە دڵنیاییش ئیسلام هەمیشە لە کەشی ئارام و هێمندا، زیاتر گەشە دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿بِبَطْنِ مَكَّةَ﴾، واتە: هەر کام لە ئێوەو ئەوانی لە دەستی یەکدی پاراستوە، بە تایبەتی مسوڵمانانی لە دەستی ئەوان پاراست، لە حاڵێکدا کە گەیشتبوونە هەناوو ئاقاری مەککەو لە نزیک مەککەوە بوون، چونکە (**بَطن**) بە مانای سک دێ، بەڵام لێرەدا یانی: تەنیشتی مەککەو هەناوی مەککەو، کەسێ غیرەتی هەبێ، کاتێک دوژمن دەیەوێ لێی نزیک بکەوێتەوە، لە ماڵ و حاڵی، لە جێگاو ڕێگای، زیاتر هاندەری دەبێ بۆ بەرگرییکردن و جەنگ کردن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوەی لە لای هەناوی مەککەو لە نیزیک مەککە پاراست لە دەستی ئەوان، کە نەتوانن زەبرتان لێ بدەن.

٤)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا﴾، خواش ﷻ بینەری ئەوە بوو کە دەتانکرد، ئەمە دەگونجێ تەنیا مەبەست پێی هاوەڵان بێ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوانیش و بەرانبەرەکانیشیان بێ، واتە: خوا ﷻ بینەری کردەوەی هەموو لایەکتان بوو، دەیبینین و ئاگاداری هەموو شتێکتان بوو، لەم ئایەتە موبارەکەدا دوو ڕاستیی مەزن دەرەوشێنراونەوە:

**یەکەم:** خوا ﷻ بە حیکمەت و بەزەیی خۆی وایکرد: لە نێوان ئێوەو ئەواندا جەنگ ڕوونەدات، ئەگەرنا هەر کام لەو دوو لایەنە، هەم ئەوانیش و هەم ئێوەش، سوور بوون لەسەر ئەوەی زەبر لە یەکدی بدەن، بەڵام خوا ﷻ نەیهێشت، واتە: خوا نەیهێشت زەبر لە یەکدی بوەشێنن، لەبەر ئەو بەرژەوەندییەی، خوا ﷻ دەیزانی لەو صوڵح و پێیکهاتن و تەبابییەدا هەیە.

**دووەم:** کاتێک ئێوە گەیشتبوونە لای نیزیک مەککەو ئاقاری مەککە، هاندەرێکی بەهێز هەبوو بۆ ئەوان، کە ئێوە چوونە لای شارەکەیان، کە زۆر بەو شارەوەیان دەنازیی و، بە حەرەمی مەککەو بە پیرۆزییەکانی ئەو شارەیانەوە دەنازیی، بە کەعبەو بە مەقامی ئیبراهیم و بە شوێنەکانی دیکە، کەچی کە گەیشتنە ئەوێ و، ئەوە زۆر خوازیاری ئەوە بوو، ئەوان توند بن لەگەڵتان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، خوا ﷻ نەیهێشت شەڕو کوشتار ڕووبدات.

کەواتە: پارێزەرێک هەبوو بۆ ئێوەو بۆ ئەوانیش، کە کوشتارتان لە بەیندا ڕوونەدات و خوێنتان نەکەوێتە بەینێ، لەبەر ئەو بەرژەوەندییەی خوا ﷻ دەیزانی، بەڵام ئێوە فیکرتان پێی نەدەشکا.

**(الزمخشري)** لە کتێبە ناودارەکەی خۆی: **(أساس البلاغة)**دا دەڵێ: **(الْبَطْنُ جَوْفُ الْإِنْسَانِ وَالْحَيَوَانِ، وآسْتِعْمَاله فِي مَعَانِي الْمُنْخَفَضِ مِنَ الشَّيْءِ أَوِ الْمُتَوَسِّطِ، مَجَازٌ)**، واتە: **(بَطْنِ)** بریتیە لە بەتاڵایی مرۆڤ، یان هەناوی مرۆڤ و ئاژەڵ، بەڵام بەکارهێنانی لە نزماییەکەی شوێنێک و لە نێوەڕاستی دا، مانایەکی مەجازییە.

(راغب الأصفهاني)یش گوتوویەتی: (يُقَالُ لِلجِهَةِ السُّفْلَى: بَطْن، وَللعُلْيَا: ظَهْر، وَيُقَالُ بَطْنُ الوَادِي، أي: وَسَطُهُ وَالمَعْرُوفُ مِنْ إطْلَاقِ اللَّفْظ إذَا أُضِيفَ إلى مَكَانٍ أن يُرَادَ بِه وَسَط المَكَانِ وَالمَقْصُود: مَكَانٌ قَرِيبٌ جِدّاً إلى مَكَّةَ، وَهُوَ الحُدَيْبِيَّة).

واتە: بە شوێنی لای خوارێی شتێک دەگوترێ: (بَطْن)و بە لای سەرێی دەگوترێ: (ظهر)، (واتە: سک و پشت)، هەر لە عەرەبییدا دەگوترێ: (بَطْن الوَادِي) واتە: نێوەڕاستی دۆڵەکەو شیوەکە، کاتێک بێژەیەک پاڵدەدرێتە لای شوێنێک، مەبەستی پێ نێوەڕاستی ئەو شتەیە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە شوێنێکی زۆر نیزیک لە مەککە، کە حودەیبییە بوو.

ئنجا خوا ﷻ ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ کە ئەو دەست گێڕانەوەیەی خوای پەروەردگار، هی ئێوە لەوان، کە زەفەریشتان پێبرد بوون، کەوتبوونە ژێر کۆنترۆڵیشتان لەبەر ئەوە نەبوو، کە لەبەر چاوی کاڵیی ئەوان نەبوو، لەبەر ئەوە نەبوو کە لە لای ئەوان، ئەوان لە لای خوا حورمەتێکیان هەبێ، یاخود خوا بیەوێ بیانپارێزێ نا.

٥)- ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوان ئەوانە بوو کە بێبڕوا بوون.

٦)- ﴿ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، هەروەها ئێوەیان لە مزگەوتی حەڕام گێڕایەوەو بوونە پەرچتان لە چوونە نێوی دا.

٧)- ﴿ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ﴾، هەروەها قوربانییەکانیشیان گێڕایەوە، لە حاڵێکدا کە بەستراوە بوون، ڕاگیرابوون، کە بگەنە شوێنی خۆیان (کە بریتیە لە حەڕەمی مەککە، لەلای مینا، نەیانهێشت قوربانییەکان بگەنە شوێنی خۆیان و لەوێ سەرببڕدرێن).

(مَعْكُوفَاً: مَحْبُوسَاً وَمَمْنُوعَاً)، واتە: ڕاگیراوو، وەستێنراو، وشەی (هَدِي) کۆی (هَدِيّة)یە، کە بریتیە لەو ئاژەڵانەی ناوی قوربانییان لێ هێنراوەو زۆرجار نیشانەداریش کراون، ئنجا کە دەفەرموێ: (الهَدِيَ) دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر

ڕاناوی (كُمْ) لـه (وَصَدُّوكُـم)دا، كـه بۆتـه بـەركار (مفعـول بـه)، یـانی: (وصَـدّوا الهـدي)، هەروەهـا قوربانییەكانیشـیان گیڕایـەوە.

**بەڵام دوو جۆرە خوێندنەوەی دیكەشی هاتوون:**

أ- (وَالهَدِيِ) بە ژێر (كسرة)، یانی: (وَصَدُّوكُم عَنِ المَسْجِدِ الحَرَامِ وَالهَدِيِ)، ئێوەیان گێڕایەوە لە مزگەوتی حەڕام و لە قوربانییەكانیش كە سەریان ببڕن، یانی: (وصدّوكم عَنْ ذَبْحِ الهَدِيِ) لە سەربڕینی قوربانییەكان ئێوەیان گێڕایەوە لە شوێنی خۆیدا.

ب- هەروەها خوێندراویشەتەوە: (الهَدِيُ)، یانی: (وَصَدُّوكُم عَنِ المَسْجِدِ الحَرَامِ والهديُ، بِتَقْدِيرِ صُدَّ)، یانی: هەروەها قوربانییەكانیش ئەوانیش گێڕدرانەوە.

(مَعْكُوفَـاً) لـە ڕووی ڕێزمانییـەوە حاڵـە، یـانی: لـە حاڵێكـدا كـە وەسـتێنرابوون و ڕاگیرابـوون، ﴿أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ گێڕایانـەوەو نەیانهێشـت بگاتـە شـوێنی خـۆی.

كەواتـە: هیـچ پاسـاوێک نەبـوو، خـوا ﷻ ئـەوان بپارێـزێ، بەنسـبەت خۆیانـەوە، ئـەدی بۆچـی خـوا ﷻ ئـەوانی لـە دەسـتی ئێـوە پاراسـت و نەیهێشـت كوشـتار ڕووبـدا؟ دوایـی خـوا ﷻ باسـی هۆكارەكـەی دەكات:

٨)- ﴿وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ﴾، (باسی هۆكارە ڕاستەقینەكەی دەكات و دەفەرموێ:) ئەگەر پیاوانێكی بڕوادارو ئافرەتانێكی بڕوادار نەبوونایە، كە ئێوە نەتاندەزانین.

﴿لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ﴾، یـانی: (لَـمْ تَعْرِفُوهُـم) نەتاندەناسـین، یاخـود: (لَـمْ تَعْلَمُـوا، يَعْنِـي: لَـمْ تَعْلَمُوهُـمْ أَنَّهُـم مُؤْمِنُـون)، نەتانـدەزانی كـە ئـەوان بـڕوادارن.

٩)- ﴿أَن تَطَـُٔوهُمۡ﴾، كە ئێوە پێیان لێ بنێن.

(الـوَطْءُ: الـدَّوْسُ، وَاسْـتُعِيرَ للقَتْـلِ وَالإِضْرَارِ)، (وَطْء) بـە مانـای پـێ لێنانـە، بـەڵام خوازراوەتـەوە بـۆ كوشـتن و زیـان پێگەیانـدن، واتـە: لەبـەر دەسـت و پێـی ئێـوەدا زایـە بـن و تووشـی زیـان بـن.

١٠)- ﴿فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، سەرەنجام بە هۆی ئەوانەوە (کە دەکوژرێن یان زیانیان پێ دەگات)، زیانێکتان پێ بگات، یاخود عەیبەیەکتان بێتە سەرێ، بۆ ئەوەی ئێوە زانیارییتان بەوان هەبێ، (بِغَيْرِ عِلْمٍ لَكُمْ بِهِمْ، أَو بِوَطْئِهِم)، بۆ ئەوەی زانیارییتان هەبێ بەوان، کە مسوڵمانن و بڕوادارن، یاخود: بەوە کە پێتان لێناون و زیانتان پێگەیاندوون.

یاخود: بۆ ئەوەی کەسێک کە بەو هۆکارەوە عەیبەتان لێ دەگرێ، زانیاریی هەبێ، بەوەی ئێوە نەتانزانیوە، بۆیە کەوتوونە بەر دەست و پێتان، ئەگەرنا بڕوادار، زیان بە بڕواداری چەوسێنراوە ناگەیەنێ، (جَوَابُ لَوْلَا مَحْذُوفٌ، يَعْنِي: لَوْلَا ذَلِكَ، لَمَا كَفَّ أَيْدِيَكُمْ عَنْهُم)، وەڵامی (لَوْلَا) قرتێنراوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ﴾، ئەگەر پیاوانێکی بڕوادارو ئافرەتانێکی بڕوادار نەبوونایە، خوا ﷻ دەستی ئێوەی لەوان نەدەگێڕایەوە.

ئنجا خوای موتەعال ڕایدەگەیەنێ بۆچی ئەمەی کرد؟

١١)- ﴿لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، تاکو خوا ﷻ هەر کەسێ بیەوێ، بیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، واتە: بۆیە وایکرد، تاکو زەمینە بڕەخسێ کە بەرانبەرەکانتان مسوڵمان ببن، چونکە لە کەش و هەوای ئاشتیی و تەباییدا، زیاتر هیدایەت دەچێتە دڵی خەڵکەوە، یاخود: بۆ ئەوەی ئەو بڕوادارە پیاوو ئافرەتانە، کە بۆ ئێوە نەناسراوو نەزانراو بوون، خوا ﷻ بە هۆی بەزەیی خۆیەوە، بیانپارێزێ و سەلامەتیان بکات.

١٢)- ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا۟﴾، ئەگەر لە یەک جیابووبانەوە، (التَّزَيُّلُ: التَّفَرُّقُ وَالتَّمَيُّزُ)، (تَزَيُّل) بڵاوبوون و جیابوونەوەیە ئەگەر لێک بووبانەوە.

١٣)- ﴿لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوا بوون لەوان، سزاو ئازارێکی بە ئێشمان دەدان، یانی: بە دەستی مسوڵمانان، تووشی کوژران و بریندارکران و گرفتاریی دەبوون، بەڵام بۆیە پاڵیداوەتە لای خۆی، وەک ڕێزگرتن لە

ئەهلی ئیمان و، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ لە پشت هۆکارەکانەوەیە، ئەگەرنا مەبەست پێی سزای دنیاییەو بەدەستی بڕواداران.

وشەی (مَعَرَّة) دەڵێ: (**عَرَّهُ يَعُرُّه: أَصَابَهُ بِمَكْرُوه، وَالمَعَرَّة مَفْعَلَةٌ مِنْهُ**)، (**عَرَّهُ يَعُرُّه**) واتە: زیانی پێگەیاند، زیانی پێدەگەیەنێ، (**المَعَرَّةُ: الضُّرُ والمَشَقَّةُ وَالمَكْرُوه، وَالعَيْبُ، وَالإِثْمُ وَالمَسَبَّةُ**)، (**معرَّة**)یان بە زۆر وشان مانا کردوە، گوتوویانە: زیانگەیاندن و، نارەحەت بوون و، شتی ناپەسەند و، عەیبە هاتنە سەرو، گوناح هاتنە سەرو، قسە پێ گوتران، یانی: لە ئەنجامی لەبن دەست و پێیاندا چوونی ئەو بڕوادارانەی نەناسراو و نەزانراو بوون لە مەککە، ئەو حاڵەتە بۆ ئێوە دەهاتە پێش.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا حاڵەتی دەروونیی هەر کام لە بێبڕوایەکان و بڕواداران و، خەسڵەتە خراپەکانی بێبڕوایان و، خەسڵەتە چاکەکانی بڕواداران، دەخاتە ڕوو:

١٤)- ﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک ئەوانەی بێبڕوابوون دڵگەرمییان خستە دڵیانەوە.

(**إذ**) کاتی ڕوودانەو پەیوەستە بە قسەی پێشوویەوە (**صَدُّوكُمْ**)، واتە: کاتێک ئێوەیان لە مزگەوتی حەرام گێڕایەوە، کە دڵگەرمیی و دەمارگیریی نەفامییان خستە دڵیانەوە، یان پەیوەستە بە (یاد بکەوە) (**أذْكُر**)یەکی مەزەننە کراوەوە یانی: یاد بکەنەوە لە کاتێکدا ئەوانەی بێبڕوان دەمارگیرییان خستە دڵی خۆیانەوە.

١٥)- ﴿ حَمِيَّةَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ﴾، دڵگەرمیی و دەمارگیریی نەفامیی، (**حَمِيَّة الجَاهِلِيَّة: حَمِيَّة المِلَّةِ الجَاهِلِيَّة**)، واتە: دڵگەرمیی و دەمارگیریی ئایینێکی نەفامانە، (**الحَمِيَّةُ: الأَنَفَةُ وَالتَّكَبُّر حَمِيْتُ عَنْ كَذَا حَمِيَّةً وَمَحْمِيَّةً، إِذَا أَنِفْتَ مِنْهُ، أَنْ تَفْعَلَهُ، وَالحَمِيَّة: العَصَبِيَّة والإِسْتِنْكَافُ عَنْ أَمْرٍ**)، (**حَمِيَّة**): بە مانای خۆ بەزلگریی و لە خۆ نەوەشاندنەوە دێ، بەڵام لە خۆ نەوەشاندنەوەی شتی چاک، دەگوترێ: (**حَمِيْتُ عَنْ كَذَا حَمِيَّةً وَمَحْمِيَّةً**)، ئەگەر بێزت نەیەت شتێک بکەی، یاخود فیزت نەیەت شتێک بکەی، بەڵام شتەکە چاک بێ و پێت

وابێ، عەیبەت دێتە سەرێ، ئەگەر بیکەی، هەروەها (حَمِيَّة) بە مانای دەمارگیریی و خۆبەزلگریی لە ئەنجامدانی کارێکیش، هاتوە.

١٦)- ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، سەرەنجام خوا ﷻ ئۆخژن و ئۆقرەیی خۆی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺو سەربڕواداران، (ف)ی (فأنزل) (**فَاءُ للتَفْرِيع وَيُفِيْدُ نَوْعَاً مِنْ المُقَابَلَةِ، كَأَنَّهُ قِيْلَ: جَعَلَوُا فِي قُلُوبِهِمْ الحَمِيَّةَ، فَقَابَلَهُ الله بِإِنْزَالِ السَّكِيْنَةَ عَلَى رَسُولِه، وَعَلَى المُؤْمِنِيْنَ فَاطْمَأَنَتْ قُلُوبِهِم**)، ئەم (ف)یە جۆرێک لە بەرانبەریی دەگەیەنێ، وەک گوترابێ: بێبڕوایەکان دەمارگیریی و دڵگەرمیی و نەفامییان خستە دڵی خۆیانەوە، خواش ﷻ لە بەرانبەردا ئارامیی و ئۆقرەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺو بڕواداران، بۆیە دڵیان ئارام بوو.

١٧)- ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾، پابەندی کردن بە وشەی تەقواوە، واتە: تەقوای کرد بە هاودەم و هاوڕازیان کە لێیان جیانەبێتەوە، (**كلمة التَّقْوَى**)ش زۆربەی زانایان گوتوویانە: (**كَلِمَةُ التَّقْوَى: كَلِمَةُ التَّوْحِيد، أو كَلِمَةُ الإِخْلَاص، أو الثَّبَاتُ عَلَى العَهْد**)، (**أخرجه: الترمذي: ٣٢٦٥، أحمد ج٥، ص١٣٨**)، واتە: وشەی خوا بەیەکگرتن، کە (**لَا إِلَهَ إِلَّا الله**)یەو، وشەی ئیخلاسیشی پێ دەگوترێ، هەروەها چەسپاویی لەسەر بەڵێن و پەیمان.

مەبەستیش لە: (**تَقْوَى**) ئەوەیە کە پارێزی پێ دەکرێ لە شیرک و لە سزاو ئازاری خوای دادگەر لە ڕۆژی دواییدا.

١٨)- ﴿وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾، ئەوان پێی شایستەتر بوون، ئەو هاوەڵانە، (خوا لێیان ڕازی بێ) و، خاوەنی ڕاستەقینەشی بوون.

١٩)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾، خواش ﷻ بە هەموو شتێک، هەمیشە هەر زانا بووە، کەواتە: خوا دەفەرموێ: ئەگەر بڕواداران بە پیاوو ئافرەتەوە، جیابووبانەوە لە کافرەکان، بڕواداران و مسوڵمانان بەسەر هاوبەشداراندا زاڵدەکردو، بڕواداران بێبڕوایانیان سزا دەدا بە کوشتن و بە دیل گرتن و جگە لە ئەوانەش، بەڵام خوا ﷻ

دەستی مسوڵمانانی لەوان گێڕایەوە لەبەر ئەو بڕوادارانەی لە مەککەدا بوون، لە پیاوان و ئافرەتان، بەڵام مسوڵمانان پێیان نەدەزانین و نەیاندەناسین، نەوەک لەبن دەست و پێیاندا بچن و تووشی زیان ببن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە سێ ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**الفتح**)، پێـک دێ، کـە بریتیـن لـە ئایەتـەکانی: (٢٧ - ٢٩)، هـەر کام لـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـەش، بابەتێکـی تایبەتیـی گرتۆتـە خـۆی:

**یەکەم:** ئایەتی ژمارە (٢٧)، باسی ڕاست دەرچوواندنی خوای پەروەردگارە بۆ خەونەکەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ کە بینیبووی بە عومرەکردن چوونە مزگەوتی حەرامەوە، لە حاڵێکدا کە هەندێکیان سەری خۆیان تاشیوەو، هەندێکیان سەری خۆیان کورت کردۆتەوە، واتە: ئیحرامیان شکاندوە.

**دووەم:** ئایەتی ژمارە (٢٨)، باسی ئامانجی نێررانی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە خوا ﷻ ڕێنمایی و بەرنامەی هەق و ڕاستی پێدا ناردوە، تاکو بەسەر تێکڕای بەرنامەکانی دیکەدا باڵا دەست بێ.

**سێیەم:** ئایەتی ژمارە (٢٩)و کۆتاییش، پێناسەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانیەتی و، ژمارەیەک لە خەصڵەتە بەرزو ناوازەکانی هاوەڵان، کە هەم لە تەورات و هەم لە ئینجیلیشدا هاتوون.

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی خوا خەونەکەی پێغەمبەری خۆی بە چەسپاویی ڕاست دەرچوواند، بێگومان ئەگەر خوا بیەوێ بە هێمنیی دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە لە حاڵێکدا کە (بەشێکتان تووکە) سەری خۆتانتان تاشیوەو (بەشێکتان) کورتتان کردۆتەوە (لە هیچ کەس) ناترسن، بەڵام ئەوەی ئەو زانی (لە بەرژەوەندییتان) ئێوە نەتاندەزانی، بۆیە پێش ئەوە سەرکەوتنێکی نیزیکی بۆ ڕەخساندن ﴿٢٧﴾ (خوا) ئەو کەسەیە پێغەمبەری خۆی بەڕێنمایی و بەرنامەی ڕاست و دروستەوە ناردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەیەکدا سەری بخات و، خواش بەسە شایەدو چاودێر بێ ﴿٢٨﴾ موحەممەد پێغەمبەری خوایەو، ئەوانەی لەگەڵیدان لەسەر بێبڕوایان (لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا) توندو بەهێزو، لە نێو خۆیاندا بە بەزەیین، (هەمیشە) بە ڕکووع بردوویی و کڕنووش بردوویی دەیانبینی، (لە ژیانیاندا) بەخشش و ڕەزامەندیی لە خوا دەخوازن، بە کاریگەریی کڕنووش بردن، نیشانەیان لە ڕوویان دایە، ئەوە وەسف و پێناسەیانە لە تەوراتدا، وێنەشیان لە ئینجیلدا، وەک درەختێکە لق و پۆپ (ەکان)ی خۆی دەرکردوە، ئنجا (لق و پۆپەکەی) بەهێزی کردوە، ئیدی پتەوو قایم بووە، ئنجا لەسەر قەدەکانی ڕێک وەستاوە، جوتیاران سەرسام دەکات (خوا بەو جۆرەی لێکردوون) تاکو بێبڕوایانیان پێ پەست و تووڕە بکات، خوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشتێکی مەزنی بەوانەیان داوە، کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان دەکەن ﴿٢٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ): دەگوترێ: (حَلَقَ رَأْسَهُ: جَزَّ شَعْرَهُ وَقَطَعَهُ، وَرَأْسٌ حَلِيْقٌ وَلِحْيَةٌ حَلِيْقٌ)، (حَلَقَ رَأْسَهُ) واتە: تووکە سەری خۆی بڕیی و، کورتی کردەوە یان بڕیی و، تاشیی، دەگوترێ: (رَأسٌ حَلِيْقٌ وَلِحْيَةٌ حَلِيْقٌ)، سەرێکی تاشراوو ڕیشێکی تاشراو.

(وَمُقَصِّرِينَ ): (قَصَرْتُ كَذَا: جَعَلْتُهُ قَصِيْراً)، ئەو شتەم کورتکرد، (قَصَّرَ فِي كَذَا: تَوانَى)، واتە: لەو شتەدا تەنبەڵیی کرد.

(ءَامِنِينَ ): (أَصْلُ الأَمْنِ: طُمَأْنِيَنَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ)، (آمِنِينَ)، واتە: هێمنن، وشەی (أَمْن) لە ئەصڵدا بریتیە لە دڵ ئارامیی و، ئۆخژن و لاچوونی ترس و بیم.

(بِٱلْهُدَىٰ): (الهِدَايَةُ: دَلاَلَةٌ بِلطْفٍ، وَالهُدَى: البَيَانُ الوَاضِح)، (هِدَايَة): بریتیە لە ڕێنمایی کردن بە شێوەیەکی نەرم و پەنهان، هەروەها (هُدَى): بە مانای ڕوونکردنەوەیەکی ڕاشکاو دێ.

(وَدِينِ ٱلْحَقِّ ): وشەی (حَقّ) یان بە مانای خوایە، یانی: (دِيْنِ اللە) یاخود (دِيْنُ أَمْرِ الحَقِّ)، واتە: ئایین بەرنامەی هەق و بەجێی خوای پەروەردگار.

(لِيُظْهِرَهُۥ): یانی: (لِيُعْلِيَهُ وَيُقَوِّيَهُ)، بۆ ئەوەی بەرزی بکاتەوەو بەهێزی بکات، (والإِظْهارُ: أَصْلُهُ مُشْتَقٌّ مِن ظَهَرَ بِمَعْنى بَدَا، فَاسْتُعْمِلَ كِنَايَةً عَنِ الإِرْتِفَاعِ الحَقِيقِيِّ أَظْهَرَهُ بِمَعْنى أَعْلاَهُ)، (إِظْهَار) لە وشەی (ظَهَرَ)ەوە داتاشراوە، (ظَهَرَ) واتە: دەرکەوت، دوایی بە مانای بەرزکردنەوەی ڕاستەقینە بەکارهێنراوە، (أَظْهَرَهُ) واتە: سەریخست.

(شَهِيدًا )، (شَاهِداً)، گەواهییدەرو، شایەد، هەروەها بە مانای چاودێریش دێ.

(أَشِدَّآءُ): كـۆی (شَـدِيْد)ە، (شَـدِيْد): واتـە: بەهێـز یـان سـەخت و پتـەو، واتـە: لـە بەرانبـەر ئەهلـی كوفـردا سـەخت و پتـەون، بەدەمـارن و زبـرن.

(يَبْتَغُونَ): (الإِبْتِغَـاءُ: طَلَـبٌ بِجِـدٍّ، إِبْتِغَـاء: البَغِـيُ: الطَّلَـبُ)، (إِبْتِغَـاء) كـە (افْتِعَـال) لـە (بَغِـي)، واتـە: داواكردنێكـی زۆر جیددیـی، بەدواداچوونێكـی بـاش.

(سِيمَاهُمْ ): (عَلاَمَتُهُـم)، نیشـانەیان، (حُسْـنُ سَـمْتٍ، يَجْعَلُـه اللـهُ فِي الدُّنْيَـا)، حاڵەتێكـی جـوانی نوورانیـی كـە لـە دنیـادا خـوا بـە بـڕوادارانی دەبەخشـێ، لـە ئەنجامـی خـوا پەرسـتییاندا، یاخـود مەبەسـت لـەو نیشـانەیە: (نُـورٌ يَجْعَلُـهُ اللهُ يَـوْمَ القِيَامَـة)، ڕووناكییەكـە خـوا لـە ڕۆژی دواییـدا، بـە بـڕوادارانی دەدات.

(وَمَثَلُهُمْ ): (المَثَـلُ: الوَصْـفُ العَجِيْـب الشَّـأن)، (مَثَـل): بریتیـە لـە سیفەتێك جێـگای سەرسـوڕمان بـێ، (الجَـارِي مَجْـرَى الأَمْثَـال)، كـە وەك پەنـد چـۆن بەدەمـەوە دەگیرێن، پەنـدی پێشـینان بـەو شـێوەیە، ئـەو وەسـفە هێنـدە سەرسـوڕهێنەر بـێ، وەك پەنـد بگوترێتـەوەو بـاس بكـرێ.

(كَزَرْعٍ ): (الـزَّرْعُ: الإِنْبَـاتُ، وَالـزَّرْعُ مَصْـدَرٌ عُـبِّرَ بِـهِ عَـنْ الْمَـزْرُوع)، وشـەی (زَرْع): بـە چـاوگ دێ، واتـە: ڕوانـدن، بـەڵام (زَرْع): كـە چاوگـە، لێـرەدا بـە مانـای (مَـزْروع)ە، واتـە: چێـنراو ڕوێـنراو، مەبەسـت ڕووەكـە، ئنجـا ئـەو ڕووەكـە، ئایـا دانەوێڵەیـە وەك گەنـم و جـۆو نیسـك و نـۆك و ئەوانـە، یاخـود دارو درەختـە، یـان تـەڕەكارە، بەپێـی سـیاقەكە دەردەكـەوێ مەبەسـت پێـی كامەیانـە؟.

(شَطْـَٔهُۥ): (الشَّـطْء جَمْعُـهُ: الأَشْـطَاء، وَالشُّـطُوء، مَـا يَخْـرُجُ مِنْـهُ وَيَتَفَـرَّعُ مِـنْ شَـاطِئَيْهِ، وَالأَشْـطَاءُ فُـروخُ الـزَّرْعِ، شَـطَأَ الـزَّرْع وَأَشْـطَأَ: أَخْـرَجَ فِرَاخَـهُ)، (شَـطْء)، بـە (أَشْـطَاء وَشُـطُوء) كـۆ دەكرێتـەوە كـە بریتیـە لـەوەی لـەو لاو لای درەختەكـە دەردەچـێ، واتـە: لـە تەنیشـتەكانی دەردەچـێ، مەبەسـت پێـی لـق و پۆپەكانـن (فُـروخ الـزَّرْعِ) بێچـووەكانی ئـەو كشـتوكاڵە، ئەگـەر درەختـە ئـەو لقانـەی لێـی دەردەچـن، ئەگـەر ڕووەكـە، گەنـم و جۆیـە، ئـەو لقانـەی لێـی دەردەچـن، پێشـێ چەكەرەیەكـە دوایـی،

وردە وردە لقــی دیکــە دەر دەکات، دەگوتــرێ: (شَـطَأَ الـزَّرْعُ وَأَشْـطَأَ: أَخْـرَجَ فِرَاخَـهُ)، واتــە: لقــەکانی دەرکــردن.

(فَـَٔازَرَهُۥ): (أي: قَـوَّاهُ، أَصْلُـهُ مِـنْ شَـدِّ الإِزَارِ، أَزَرْتُـهُ وَآزَرْتُـهُ: قَوَّيْتُـهُ)، (أَزَرَه: أي: قَـوَّاه) واتــە: بەهێــزی کــرد لــە ئەصڵــدا لــە (شَـدُّ الإِزَار)ەوە هاتــوە، واتــە: پشــتێن بەســتن، یــان (شَـدِّ المِـأْزَر)، دەگوتــرێ: (أَزَرْتُـهُ وَآزَرْتُـه: قَوَّيْتُـه)، واتــە: بەهێــزم کــرد.

(فَٱسْتَغْلَظَ): (تَحَـوَّلَ مِـنَ الدِّقَّـةِ إلى الغَلِيْـظ)، واتــە: لــە بارییکییــەوە ئەســتوور بــوو، پتــەوو مەحکــەم بــوو.

(فَٱسْتَوَىٰ): (قَوِيَ وَاشْتَدَّ وَاسْتَقَام)، واته: بەهێزو پێزبوو پتەو بوو، ڕێک وەستا.

(عَلَىٰ سُوقِهِۦ): (سُـوق) کـۆی (سَـاق)ە، کــە بــە کوردیــی دەبێتــە قــەدو لاســک، ئەگــەر درەخــت بــێ، دەگوتــرێ: قــەدی درەختەکــە، ئەگــەر گەنــم و جــۆو نیســک و نــۆک و ... هتــد بــێ، دەگوتــرێ: لاســکی گەنمەکــەو، جۆیەکــەو برنجەکــە، (سَـاقُ الـزَّرْعُ: الأَصْـلُ الَّـذِي تَخْـرُجُ مِنْـه السَّـنَابِل وَالأَغْصَـان)، قــەد، یاخــود لاســکی ئــەو کشــتوکاڵە ئــەو بنەچەیــە کــە گوڵــەکانی لێدەردەچــن، یاخــود لــق و پۆپــەکانی لــێ دەردەچــن.

(يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ): جوتیــارەکان سەرســام دەکات، (يُعْجِـبُ، أي: يُدْهِـشُ)، سەرســامیان دەکات، دەیانخاتــە حاڵــەتی عاجباتیــی و سەرســوڕمانەوە.

(ٱلزُّرَّاعَ): (الـزُّرَّاعُ: جَمْـعُ زَارِعِ الَّـذِي زَرَعَ)، (زَارِع): کەسێکە کــە دەڕوێنــێ و، دەچێنێ و، دەنێــژێ، واتــە: ئــەو ڕووەکــەی هــاوەڵانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ پێــی تەشــبیهکراون، وێچوێندراوەکــە هێنــدە جــوان و بەرچــاوو بــەدەوە، کــە تەنانــەت ئــەوەی چاندوویەتی چێنەرەکانیشــی، یاخــود جوتیارەکانیشــی سەرســام دەکات، چ جــای خەڵکــی دیکــە.

(لِيَغِيظَ بِهِمُ): (لِيُغْضِـبَ بِهِـمْ)، واتــە: بــۆ ئــەوەی ڕقــی کافرانیــان، پــێ هەڵســێنێ و پەســت و تووڕەیــان بــکات.

## هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتەكان

هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئـەم ئایەتـه موبارەكـه، كـه خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾:

**سێ گێڕراوە دێنین لەو بارەوە:**

**١- {عَنْ قَتَادَةَ، فِي قَوْلِهِ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ...﴿٢٧﴾﴾ قَالَ: «أُرِيَ فِي الْمَنَامِ أَنَّهُمْ يَدْخُلُونَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَأَنَّهُمْ آمِنُونَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَهُمْ وَمُقَصِّرِينَ»}، (أخرجه الطبري: ٣١٦٧٣، ج٢٦، ص١٠٩).**

واتــه: قەتــادە دەربــارەی ئــەم ئایەتــه: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ...﴿٢٧﴾﴾، دەڵـێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ لــه خەونــدا پێشــانی درا كــه دەچنــه نێــو مزگــەوتی حەرامــەوە، لــه حاڵێكــدا كــه دڵنیــان هێمنــن و، ســەری خۆیانیــان تاشــیوەو (هەندێكیشــیان) ســەری خۆیــان كــورت كردۆتــەوە.

**٢- {قَالَ ابْنُ زَيْدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ...﴿٢٧﴾﴾، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ قَالَ: قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنَّكُمْ سَتَدْخُلُونَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ» فَلَمَّا نَزَلَ بِالْحُدَيْبِيَةِ وَلَمْ يَدْخُلْ ذَلِكَ الْعَامَ، طَعَنَ الْمُنَافِقُونَ فِي ذَلِكَ، فَقَالُوا: أَيْنَ رُؤْيَاهُ؟ فَقَالَ اللَّهُ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ...﴿٢٧﴾﴾، فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ ﴿وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ...﴿٢٧﴾﴾، إِنِّي لَمْ أَرَهُ يَدْخُلُهَا هَذَا الْعَامَ، وَلَيَكُونَنَّ ذَلِكَ} (أخرجه الطبري: ٣١٦٧٤، ج٢٦، ص١٠٩)،**

واتــه: ئیبنــو زەیــد دەربــارەی تەفســیری ئــەم ئایەتــه: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ...﴿٢٧﴾﴾، دەڵـێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ پێــی فەرمــوون (بــه هــاوەڵانی):

من بینیم (واتە: لە خەوندا) کە ئێوە دەچنە مزگەوتی حەرامەوە، لە حاڵێکدا هەندێکتان سەری خۆتان تاشیوەو، هەندێکیشتان کورتتان کردۆتەوە، کاتێک لە حودەیبییەدا دابەزیی و ئەو صوڵح و پێکهاتنەی کرد لەگەڵ هۆزی قوڕەیشداو، ئەو ساڵە نەچوو بۆ مزگەوتی حەرام، مونافیق و دڵ نەخۆشەکان لەو بارەوە تانەیان لە پێغەمبەردا ﷺ گوتیان: کوا خەونەکەی؟ (واتە: خەونەکەی ڕاست دەرنەچوو)، خواش ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾، (بۆیەش بە (لقَدْ) بە (ل)ی سوێندو بە (قد)ی ساغکردنەوە (تحقیق)، سوێند بە خوا، بە دڵنیایی خوا ڕاستیکرد لە خەونەکەی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بە شێوەیەکی چەسپاو)، نەمبینی ئەمساڵ بچێتە مزگەوتی حەرامەوە، بەڵام بە دڵنیایی ئەوە دەبێ، (لە ساڵی داهاتوودا).

٣- هەر لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیەش دێنین:

{عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: أُرِيَ بِالْحُدَيْبِيَةِ أَنَّهُ يَدْخُلُ مَكَّةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ: ﴿ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾، فَقَالَ لَهُ أَصْحَابُهُ حِيْنَ الخَر بالحُدَيْبِيّة: أَيْنَ رُؤيَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾، **يَعْنِي النَّحْرُ بِالْحُدَيْبِيَةِ، وَرَجَعُوا فَافْتَتَحُوا خَيْبَرَ، ثُمَّ اعْتَمَرَ بَعْدَ ذَلِكَ، فَكَانَ تَصْدِيقُ رُؤْيَاهُ فِي السَّنَةِ الْقَابِلَةِ} (أخرجه: الطبري: ٣١٦٧٢، «الإستيعاب في بيان الأسباب» ج٣، ص٢٥١، قلنا: هذا مرسل صحيح الإسناد).**

واتە: موجاهید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیشانی درا لە کاتێکدا کە لە حودەیبییە بوو، (بەپێی قسەی ئەو دەبێ خەونەکەی لە حودەیبییە بینیبێ، بەڵام هەموو ئەوانی دیکە وا پیشان دەدەن خەونەکەی پێشتر بینیبێ)، بینی کە دەچێتە مەککە خۆی و هاوەڵانی بەبێ ترس و، سەری خۆیان تاشیوەو هەندێکیش کورتیان کردۆتەوە، کاتێک کە قوربانییەکانی خۆی سەر بڕی لە

حودەیبییە هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەونەکەت کوا، بۆچی نەهاتە دی؟ ئنجا خواش ﷻ ئەم ئایەتە موبارەکەی دابەزاند، قوربانیی سەربڕینەکە لە حودەیبییە بوو، لە ئەنجامی ئەوەدا دڵیان سەغڵەت بوو، دوایی کە گەڕانەوە، جەنگی خەیبەر هاتە پێش و خەیبەر خرایە ژێر کۆنترۆڵی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی و، دوای ئەوە عومرەی کرد، لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا، بۆیە بەڕاست دەرچوونی خەونەکەی لە ساڵی داهاتوودا بوو، (نەک لە خودی ئەو ساڵەدا، کە تێیدا بەرەو مەککە چوون، پێغەمبەریش ﷺ نەیفەرموو بوو: هەر لەو ساڵەدا، کە دەچن بینیویەتی ئەو خەونە دێتە دی).

## عومرەی گێڕراوە (عمرة القضاء):

لێرەدا پێویستە باسێکی بەسەرهاتی عومرەی گێڕدراوە (**عمرة القضاء**) بکەین، کە لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی و هەر لە مانگی (**ذي القعدة**)دا، ڕوویداوە، یەکسەر لە تەفسیرەکەی (**إبن كثير**) لە خولاسەکەی: (**المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير**) دەیهێنم[1]، هەڵبەتە ڕێک مانا کوردییەکەی دێنم، چونکە (**إبن كثير**) لە کۆمەڵێک سەرچاوەوە دەیهێنێ، بۆ خۆشیی هەر مێژوو نووسێکی متمانە پێکراوو موعتەبەرەو، سیرەی پێغەمبەریشی ﷺ هەیەو، مێژووشی هەیە بە ناوی: (**البداية والنهاية**).

دەڵێ: لە مانگی (**ذي القَعِدَة**) لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی دا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەککە بە نیەتی عومرە کردن خۆی و ئەوانەی کە لە حودەیبییەدا لە خزمەتی دابوو بوون، ئەو (١٤٠٠) کەسە دەرچوون و، لە (**ذي الحُلَيْفَة**) ئیحرامی بەست و قوربانییشی لەگەڵ خۆی بردن، گوتراوە: شەست حوشتر بووە، هەندێکیش لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە کە حەفتا بووە، یان کەمتر یان زیاتر، ئیدی دەستی کرد بە تەلبیە لێدان، یانی: (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ،**

(١) ص ١٢٩٦، ١٢٩٧.

**إِنَّ الْحَمْدَ، وَالنِّعْمَةَ، لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ**)، هەروەها هاوەڵانیشی دەستیانکرد بە تەلبیە، کاتێک کە نیزیک کەوتنەوە لە (**مَرّ الظَّهْرَان**) موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ﷺ بە ئەسپانەوەو بە چەکەوە لە پێش خۆیەوە ڕەوان کرد، کاتێک هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیان بینی، ئەسپ و چەکی پێن، ترسێکی زۆریان چووە دڵ و، پێیان وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە جەنگیان لە دژ بکات، پێیان وابوو ئەو پەیمانەی لە نێوان ئەوان و ئەو دابووە، هەڵیوەشاندۆتەوە، کە بڕیار بووە دە (١٠) ساڵان لە دژی یەکدی نەجەنگن! ئیدی ئەوانەی کە بینیبوویان ڕۆیشتن و هەواڵیان بە خەڵکی مەککەدا، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات، لە (**مَرّ الظَّهْرَان**) کە شوێنێکە، لەوێ سوپایەکەی خست و سەقامگیربوون، کە لەوێوە بتەکانی کە لە حەڕەمدا چەقێندراون، تەماشای دەکردن، ئنجا لەوێ چەک و چۆڵی کە پێیان بوو، لە تیرو کەوان، لە تیرو لە ڕم، هەمووی ناردن بۆ (**بَطن يَأْجَجُ**) کە شوێنێکە لە نیزک مەککەیە، بەرەو مەککە ڕۆیی بە شمشێرەوە، شمشێرەکانیش لە کالانەکانیاندا بوون، وەک مەرجی لەگەڵدا گرتبوون، لەگەڵ قوڕەیشییەکان لە صوڵحی حودەیبییەدا، کە دەبێ تەنیا بە شمشێری نێو کالانەوە بێن.

کاتێک قوڕەیشییەکان نوێنەری خۆیان (**مِكْرِز بْنُ حَفْص**)یان نارد، لە ڕێگادا پێی گەیشت، گوتی: ئەی موحەممەد! نەمانزانیوە تۆ پەیمان بشکێنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی بووە؟ گوتی: ئەوە نیە تۆ بە چەک و تیروکەوان و ڕمەوە هاتوویە نێومان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {**لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ، وَقَدْ بَعَثْنَا بِهِ إِلَى يَأْجُجَ**}، شتی وا نەبووە ئەو چەک و چۆڵەمان ناردوە بۆ (یأجج)، ئنجا میکریز گوتی: هەروامان ناسیوی کە تۆ خاوەنی چاکەی و خاوەنی وەفای.

ئیدی سەرانی کوفر لە مەککە چوونەدەر تاکو تەماشای پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ) نەکەن، لە داخ و خەفەتان چاویان بەرایی نەدا تەماشایان بکەن و، شاریان چۆڵکرد، بەڵام ئەوانی دیکە، لە خەڵکی مەککە،

لـە پیـاوان و ئافرەتـان و منـداڵان مابوونـەوەو، لەسـەر ڕێ و بانـان و لەسـەر بانـان دانیشـتبوون تەماشـای پێغەمبـەرو هاوەڵانیـان دەکـرد (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، ئیـدی پێغەمبـەر ﷺ چـووە نێـو مەککـەوە لـە حاڵێکـدا هاوەڵەکانی لـە پێش دەسـتیەوە بوون تەلبیـە (**لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ لَبَّيْكَ**)یـان دەکـردو، قوربانییەکەشـیان پـێ بـوون، قوربانییەکـەی خۆیـشی پێشـتر نـارد بـوو بـۆ (**ذي طـوى**)، (ئەویـش ناوچەیەکـە)، خۆیشـی سـواری ئـەو حوشـترەی بـوو بـوو، کـە لـە کاتی صوڵحـی حودەیبییەشـدا هـەر سـواری ئـەو حوشـترە بـوو بـوو، عەبدوڵـڵای کـوڕی ڕەواحـەی ئەنصارییـش جڵـەوی حوشـترەکەی پێغەمبـەری خـوای ﷺ گرتبـوو، ڕایدەکێشـا، ئنجـا لـە کاتێکـدا جڵەوەکـەی ڕادەکێشا، ئـەو شیعرەشـی دەگـوت:

{بِاسْمِ الَّذِي لَا دِينَ إِلَّا دِينُهُ
بِاسْمِ الَّذِي مُحَمَّدٌ رَسُـــولُهُ
خَلُّوا بَنِي الْكُفَّار عَنْ سَبِيلـه
الْيَوْم نَضْرِبُكُمْ عَـلَى تَأْوِيلِـهِ
كَمَا ضَرَبْنَاكُمْ عَـــلَى تَنْزِيلِهِ
ضَرْبًا يُزِيلُ الْهَامَ عَن مَقِيلِهْ
وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَــنْ خَلِيلِهْ
قَدْ نَزَّلَ الرَّحْمَنُ فِـي تَنْزِيلِهِ
بِأَنَّ خَيْرَ الْقَتْلِ فِـي سَـبِيلِهِ
يَا رَبِّ إِنِّي مُؤْمِـــنٌ بِقِيلِهِ}

(**إبـن كثـير**)، دەڵـێ: لـە چەنـد گێڕدراوەییەکـی جـۆراو جـۆردا، ئـەوەی گوتـرا هێناومـە، شـیعرەکەش مانایەکـەی ئاوایـە:

بـە نـاوی ئـەو کەسـەی جگـە لـە بەرنامـەی ئـەو، بەرنامەیەکـی دیکـە نیـە، (بەرنامەیـەک کـە شایسـتەی مـرۆڤ بـێ)، بـە نـاوی ئـەو کەسـەی موحەممـەد

ڕەوانەکراوی ئـەوە، ئـەی ئەهـلی کوفـر! ڕێـی چۆڵبکـەن، ئەمـڕۆ ئێمـە لەسـەر جێبەجێکـردنی قورئـان لێتـان دەدەیـن، وەک چـۆن پێشـتر لەسـەر دابەزانـدنی لێـمان دەدان، لێدانێـک کـە سـەر لەسـەر جەسـتە هەڵبگـرێ، لێدانێـک کـە دۆسـت خۆشەویسـت بێئـاگا بـکات لـە خۆشەویسـتەکەی، خـوای خـاوەن بەزەیـی لـە دابەزێنراوەکـەی خۆیـدا دایبەزانـدوە، لـە چەنـد لاپەڕەیەکـدا کـە لەسـەر پێغەمبەرەکـەی دەخوێندرێنـەوە، کـە باشـترین کـوژران، ئەوەیـە لەڕێـی خوادابـێ، ئـەی پـەروەردگارم! مـن بـڕوام هەیـە بـە فەرمایشـتەکەی.

ئیمام ئەحمەد لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە کـە پێغەمبـەر ﷺو هـاوەڵانی چوونـە مەککـە لـە حاڵێکـدا کـە (تـا)ی یەثریـب، (مەدینـە) بێتاقـەتی کردبـوون و، تووشـی نارەحەتیـی بـوو بـوون، بۆیـە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان، گوتیـان: کۆمەڵێـک دێنـە نێـو شـارەکەتانەوە، کـە گرانەتـاو نەخۆشـیی یەثریـب، بێتاقـەت و بێهێـزی کـردوون! هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان لـەو لایـەی لـە لای حیجرەوەیـە دانیشـتبوون، تەماشـایان دەکـرد، خـواش ﷻ پێغەمبـەری خـۆی ﷺ لـەوەی گوتیـان ئـاگادار کـردەوە، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـانی بـە هـاوەڵانی کـرد، کـە لـە سـێ طـەوافی یەکـەم، کـە بـە دەوری کەعبـەدا دەسـووڕێنەوە، بەشـێوەی: **(رَمَل)** بـڕۆن، ئەویش ئەوەیـە کـە بـە نەرمـە غـار بـڕۆن، تاکـو هێـزو پێزیـان پێشـانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران بـدەن، ئیـدی سـێ سـووڕی یەکـەم بـە نەرمـە غـارو گورگـە لۆقـە، ڕۆیشـتن، بـەڵام فەرمـانی پێکـردن کـە لـە نێـوان دوو پایەکانـدا کـە بـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان نەیاندەبینیـن و لـە دیـواری کەعبـە دەگیـران، بـە ڕۆیشـتنی ئاسایی بـڕۆن، پێغەمبـەر ﷺ تەنیـا ئـەوە ڕێـی لێگـرت کـە هـەر حـەوت سـووڕەکە بـە گورگـە لۆقـە بـڕۆن، تاکـو ئـاگای لێیـان بێـت و زۆر مانـدوو نەبـن، ئنجـا هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان کـە ئەوانیـان وا بینـی، گوتیـان: ئەوانـە بـوون کـە پێتـان وابـوو تـاو نەخۆشـیی یەثریـب بـێ تاقـەتی کـردوون؟ ئەوانـە لـە فـڵان و فیسـارکەس بەهێزتـرن! ئـەوەی باسـمان کـرد، هـەر کام لـە: صەحیحـی بوخاریـی و صەحیحـی موسـلیم هێناویانـە.

لێرەدا ڕیوایەتێکی دیکە دێنین، کە هەر کام لە بوخاریی و موسلیم و هەندێک لە فەرموودە ناسانی دیکەش هێناویانەو، ئەوەمان بۆ کورت دەکاتەوە: **{وَعَن ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ خَرَجَ مُعْتَمِرًا، فَحَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَنَحَرَ هَدْيَهُ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ بِالْحُدَيْبِيَةِ، وَقَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يَعْتَمِرَ الْعَامَ الْمُقْبِلَ، وَلَا يَحْمِلَ سِلَاحًا عَلَيْهِمْ إِلَّا سُيُوفًا، وَلَا يُقِيمَ إِلَّا مَا أَحَبُّوا، فَاعْتَمَرَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ، فَدَخَلَهَا كَمَا كَانَ صَالَحَهُمْ، فَلَمَّا أَنْ أَقَامَ بِهَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، أَمَرُوهُ أَنْ يَخْرُجَ، فَخَرَجَ}، (أخرجه البخاري: ٢٥٥٤، ومسلم: ٣٠٤٩).**

واتە: ئیبنو عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە نیەتی عومرە دەرچوو، بەڵام کافرەکانی قورەیش ڕێیان لێگرت، بچێ بۆ لای ماڵی خوا (کەعبە)، بۆیە قوربانییەکەی خۆی سەربڕی (هاوەڵان قوربانییەکانی خۆیان سەربڕین) بەر لەوەی بگاتە سەر زەمینی حەرەم لە حودەیبییەو، سەری خۆیشی تاشیی، بەڵام لەگەڵیاندا ڕێککەوت کە ساڵی داهاتوو بێت بۆ عومرەو، چەکیش، تەنیا شمشێر لەکالاندا هەڵبگرێ و، تەنیا ئەوەندەش بمێنێتەوە لە مەککە کە ئەوان حەز دەکەن، (کە گوتوویانە: سێ شەوو سێ ڕۆژان بمێنەوە)، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی داهاتوودا عومرەی کردو، بەو شێوەیەی لەگەڵیان ڕێککەوتبوو، چووە نێو شاری مەککە، دوای ئەوەی سێ ڕۆژان و سێ شەوان مایەوە، داوایان لێکرد چۆڵی بکات، پێغەمبەریش ﷺ مەککەی چۆڵکردو بەجێیهێشت.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا، کـە کۆتایـی سـوورەتی فەتحیـان پێهاتـوە، لـە هـەر کامیانـدا بابەتێکـی سـەربەخۆ، بـەڵام پێکـەوە پەیوەسـت دەخاتـەڕوو:

**١-** لە ئایەتی یەکەمیاندا فەرموویەتی: ﴿لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ بە شێوەیەکی چەسپاوو ڕاست، خەونی پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ڕاست دەرچوواند، یانی: (**صَدَّقَ اللهُ رَسُولَه فـي رُّؤيَاهُ**) خوا ڕاستیکرد لەگەڵ پێغەمبەرەکەی لە خەونەکەیدا، چونکە خەونێ کە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**) دەبینین، وەحییە: (**رُؤيَا الأَنْبِيَاء وَحِي**)[1]، بۆیەش خوا ﷻ پاڵیداوەتە لای خۆی، واتە: خوا ﷻ خەونی پێغەمبەرەکەی کە پێشانیدابوو، وەک وەحییەک ڕاستی دەرچوواند بە شێوەیەکی چەسپاو، هەڵبەتە خەونەکە، جارێ نەهاتبۆ دی، چونکە هەر لە مانگی (**ذي القعدة**)ی ساڵی شەشەمی کۆچییدا ئەم سوورەتە هەمووی دابەزیوە، بەڵام بۆیە خوا ﷻ بە ڕابردوو دەیفەرموێ: ڕاستی دەرچوواند، واتە: دڵنیابن دێتە دی، ﴿لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ، دەچنە نێو مزگەوتی حەڕامەوە، دیارە خوا ویستوویەتی، بەڵام بۆ ئەوەیە ئێمە فێری ئەو ئەدەبە بەرزە بکات، کە هەموو شتێک بگێڕینەوە بۆ ویستی خوا، وەک (**ثعلب**) کە یەکێکە لەزانایان دەڵێ: خوا ﷻ لە شتێکدا کە زانیویەتی، فەرموویەتی: ﴿إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، بۆ ئەوەی ئێمە لە شتێکدا کە نایزانین، بڵێین: ﴿إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾!

﴿ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾، چوار سیفەتیان لێ هەڵدەدات:

**یەک:** دڵنیاو هێمنن لە کاتێکدا دەچنە نێو شارەکە.

**دوو:** ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ﴾، هەندێکتان سەری خۆتانتان تاشیوە ﴿وَمُقَصِّرِينَ﴾.

**سێ:** هەندێکیشتان کورتتان کردۆتەوەو هەڵتان پاچییوە، ﴿لَا تَخَافُونَ﴾.

---

(١) رواه البخاري: برقم: ١٣٨، من قول عبيد بن عمير.

**چوار:** وەک چۆن لە چوونێدا هێمنن و دڵنیان، لەمانەوەشدا ترستان لە کەس نیە.

﴿ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُواْ ﴾، ئنجا خوا ﷻ ئەوەی زانیی کە ئێوە نەتاندەزانی، ﴿ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾، ﴿ مِن دُونِ ذَٰلِكَ ﴾، یانی: (مِنْ قَبْلِ ذَلِك)، بەر لەوە، خوای پەروەردگار پێش ئەو چوونەتان کە لە ساڵی حەوتەمدا دەبێ، سەرکەوتنێکی نیزیکی بۆ ڕەخساندن، کە دەگونجێ مەبەست پێی صوڵحی حودەیبییە بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی جەنگی خەیبەرو دەستکەوتەکانی بێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی صوڵحی حودەیبییە بێ، خوا ئەوی ناوناوە سەرکەوتن (فتح)، بەڵام بە نسبەت جەنگی خەیبەرەوە، زیاتر دەستکەوتەکان لەبەرچاو گیراون.

**٢-** لە ئایەتی دووەمیشیان دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) کەسێکە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی و بە بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە، ﴿ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵی بکات و سەریبخات لە ڕووی بەڵگەوە، لە حاڵێکدا کە مسوڵمانان بێ دەستەڵاتن، یاخود ئەگەر خاوەن دەستەڵاتن، لە ڕووی دەسترۆیشتوویی و دەستەڵاتەوە، لە کاتێکدا کە بڕواداران لەگەڵیدا ڕاست دەکەن و، بەو پێیەی ئیسلام دەفەرمووێ مامەڵە دەکەن، ئەو کاتە ئەهلی ئیسلام باڵادەست دەبن، ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾، خواش ﷻ بەسە چاودێر بێ، یاخود بەسە شایەد بێ، بەڵگەو شایەدی ڕاستیی ئایین و بەرنامەکەی خۆی بێ، کە بە پێغەمبەری خاتەمی خۆیدا ﷺ ناردوویەتی.

**٣-** لە ئایەتی سێیەم و کۆتایی دا، خوا ﷻ هەم پێناسەی پێغەمبەر ﷺ دەکات و، هەم پێناسەی هاوەڵانی و، سەرجەم ئەوانەش کە لە خزمەتی دا دەبن و، دەفەرمووێ: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾، موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، زانایانی ڕێزمانزان دەڵێن: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾، دەگونجێ: نیهادو گوزارە (**مبتدأ وخبر**) بن، یانی: (**محمد**) نیهاد (**مبتدأ**)ەو (**رَّسُولُ**) گوزارە (**خبر**)کەیەتی، بەڵام دەڵێن: ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە، بۆیە چاکتر وایە بگوترێ: (**هو**

**محمَّد رسول الله**)، یانی: ئەوەی باسکرا، موحەممەدە ﷺو ڕەوانەکراوی خوایە، ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾، ئەوانەش کە لەگەڵیدان، بۆیە فەرموویەتی: ئەوانەی لەگەڵیدان، تاکو هەم هاوەڵان بگرێتەوە بە پلەی یەکەم (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە پیاوو ئافرەتیانەوە، هەم بە درێژایی مێژوو و بە پانایی زەمین، هەموو ئەوانەش بگرێتەوە کە لە خزمەت بەرنامەکەیدان، ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾، لەسەر کافران توندو تیژن، توندو سەختن و، لە نێو خۆیاندا بە پەرۆش و بەزەیین، ﴿تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا﴾، هەمیشە بە ڕکووع بردوویی و کڕنووش بردوویی دەیانبینی، واتە: بەردەوام لە حاڵەتی نوێژدا دەیانبینی، لەو کاتانەدا کە کاتی نوێژن، ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا﴾، بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوا دەخوازن، یانی: زۆر بەجیددیی دەیخوازن، ئاواتیان ئەوەیە خوا لێیان ڕازی بێ و لە بەخششی خۆی بەشیان بدات، ﴿سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم﴾، نیشانەیان، نیشانەی ئیمانداریەتیی و بەندایەتییان بۆ خوا، لە ڕوویاندا دیارە، ﴿مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ﴾، بە هۆی کاریگەریی زۆر و چاک کڕنووش بردنەوە، ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ﴾، ئەوە وەسف و پێناسەیانە لە تەوڕاتدا.

﴿وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ﴾، وەسف و پێناسەشیان لە ئینجیلدا، ئاوایە: ﴿كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾، وەک درەختێک یان کشتوکاڵێک کە لق و پۆپ دەردەخات، ئەو لق و پۆپەش قەدەکە بەهێز دەکات، دوایی پتەوو بەهێز دەبێ، ئنجا لەسەر قەدو بنکەکانی خۆی ڕادەوەستێ، ﴿يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ﴾، جووتیارەکان سەرسام دەکات، ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ﴾، بۆیەش خوا ﷻ وا گەشەی پێدان و نەش و نمایان کرد، تاکو ڕقی کافرانیان پێ هەڵسێنێ، ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم﴾، خوا ﷻ بەڵێنی بەوانەیان داوە، کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، بەڵێنی چی پێداون؟ ﴿مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾، لێبوردن و پاداشتێکی مەزن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی خوای بەرزو مەزن: لەو خەونەدا کە پێشانی پێغەمبەرەکەی داوە، کە موحەممەد ﷺ ڕاستیکردووەو، بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕواداران بە هێمنیی و بێ ترس و بیم، دەچنە مزگەوتی حەڕامەوە، لە حاڵێکدا بەشێکیان قژی خۆیان تاشیوەو، بەشێکیشیان کورتیان کردۆتەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾، بە دڵنیایی خوا لە خەونەکەیدا لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ڕاستیکرد.

پێشتر گوتوومانە: (ل) و (قد) جەختکردنەوە دەگەیەنن: (ل) بۆ سوێندە یاخود زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، (مُمَهِّدَة للقسم)، (قد)یش کاتێک دەچێتە سەر کرداری ڕابردوو بۆ ساغکردنەوە (تحقيق)یە، کەواتە: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾، واتە: بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوە خوا ﷻ لەو خەونەدا کە پێشانی پێغەمبەرەکەی خۆیدا، ڕاستیکرد، یان: ڕاستیی خوا لە خەونەکەدا کە پێشانی پێغەمبەری داوە ﷺ شتێکی چەسپاوە، یاخود پڕە لە حیکمەت و ئامانجی ڕاست.

لێرەدا پرسیارێک دەکرێ: بۆچی خوا ﷻ ئەوەی بە جەختکردنەوەوە هێناوەو، هەم بە (ل) و هەم بە (قد) جەختی لەسەر کردۆتەوە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەو جەختکردنەوەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی شوبهەو گومانی مونافیق و دڵنەخۆشەکانە، کە گوتیان: (أَيْنَ رُؤيَاهُ)؟، کوا خەونەکەی موحەممەد ﷺ چی لێهات؟! بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بە دڵنیایی خوا لە خەونەکەدا، کە پیشانی پێغەمبەرەکەی خۆیدا، ڕاستی فەرموو، یانی: دێتە دی.

ئنجا زانایان بە چەند شێوەیەک تەعبیریان لە ماناو لێکدانەوەی، ئەم ڕستە موبارەکە کردوە:

أ- یەکێکیان دەڵێ: (لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ فِي الرُّؤْيَا)، خوا ﷻ لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ڕاستی کرد، لە خەونەکەدا.

ب- یەکێکی دیکەیان، دەڵێ: (حَقَّقَ اللهُ رُؤْيَا رَسُولِهِ)، خوا ﷻ خەونی پێغەمبەرەکەی چەسپاندو، هێنایە دی.

ج- یەکێکی دیکەیان دەڵێ: (أَرَاهُ رُؤْيَا صَادِقًا)، خەونێکی ڕاستی پیشاندا، دیارە خەونی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) وەحییە، بۆیە خەونەکە سەرەنجام بۆتەوە بە هەواڵێک و بە ڕاستیی وەسف کراوە.

د- (الطبري)یش ئاوا تەعبیر دەکات لەوەو لە ڕستەکەی دواییشی کە دەفەرموێ: ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾، دەڵێ: (لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ مُحَمَّدًا رُؤْيَاهُ الَّتِي أَرَاهَا إِيَّاهُ، أَنَّهُ يَدْخُلُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ بَيْتَ اللَّهِ الْحَرَامِ آمِنِينَ ، لَا يَخَافُونَ أَهْلَ الشِّرْكِ، مُقَصِّرًا بَعْضُهُمْ رَأْسَه، وَمُحَلِّقًا بَعْضُهمْ)[(١)]، واتە: بە دڵنیایی خوا لەگەڵ موحەممەد پێغەمبەرەکەی خۆیدا ﷺ ڕاستی فەرمووە، لەو خەونەدا کە پیشانیدا، بە دڵنیایی خۆی و هاوەڵانی دەچنە نێو ماڵی حەرامی خواوە، بە دڵنیایی و

---

(١) جامع البيان: ج٢٦ ، ص: ١٠٩، عن ابن عباس: ٣١٦٧٠ .

هێمنیی و، لە خەڵکی هاوبەش بۆ خوا دانان ناترسێن، لە حاڵێک دا هەندێکیان سەری خۆیان کورتکردۆتەوەو، هەندێکیشیان تاشیویانە.

٢)- ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، بە دڵنیایی دەچنە مزگەوتی حەرامەوە، ئەگەر خوا بیەوێ، (ثَعْلَب) کە یەکێکە لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: (إِسْتَثْنَى اللهُ فِي مَا يَعْلَمُ، لِيَسْتَثْنِيَ الخَلْقُ فِيْمَا لَا يَعْلَمون)، واتە: خوا ﷻ هەڵاواردنی کردوە [إن شاءالله ی فەرمووە] لە شتێکدا کە دەیزانێ و دڵنیایە، کە هەر دێتە دی، تاکو خەڵکیش لە شتێکدا کە نایزانن (إن شاءالله) بکەن، هەڵبەتە لێرەدا (إستثنى الله)، یانی: (قَالَ الله: إن شاءالله)، خوا فەرمووی: ئەگەر خوا ویستی.

٣)- ﴿ءَامِنِينَ﴾، بێترس و دڵنیان، واتە: کاتێک ئێوە دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە، هێمنن، بێترسن.

٤)- ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾، سەری خۆتان تاشیوەو کورتتان کردۆتەوە، ئەمیش حاڵە، لە ڕاناوی (ءَامِنِينَ): (وَهُمَا كِنَايَتَانِ عَنِ التَمَكُّنِ مِنَ إِتْمَامِ الحَجِّ وَالعُمْرَة)، ئەم دووانە کنارەن بۆ توانایی لەسەر تەواوکردن و بە جێهێنانی حەج و عومرە، یانی: ئێوە دوای ئەوەی بەبێ ترسیی دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە، لە حاڵێکدا دەچن، کە هەندێکتان قژە سەری خۆتانتان تاشیوەو، هەندێکیشتان کورتتان کردۆتەوە، دیارە کاتێکیش مرۆڤ لە ئەنجامدانی خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەدا، دەگاتە قۆناغی سەری خۆ تاشین و سەری خۆ هەڵپاچین و کورتکردنەوە، کە خوا پەرستییەکانی حەج یان عومرەی تەواو کرد بن.

کەواتە: ئەمە کینایەیە بۆ ئەوە کە عومرەکەیان بە تەواویی دەکەن، چونکە ئەو کاتە حەج نەبووە، ئەو خوا پەرستییەی بۆی چوون عومرە بووە.

٥)- ﴿لَا تَخَافُونَ﴾، هیچ ناترسن، پێشێ دەفەرموێ: (آمِنِينَ)، لەحاڵێکدا کە ئێوە بەهرەمەندن لە هێمنیی و ئاسایش، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَخَافُونَ﴾، واتە: لە کاتی چوونە ژووری مزگەوتی حەرام و چوونە نێو مەککەدا، ئێوە هێمنن و بێ ترس و

بیمن و، دوای چوونیش: ﴿ لَا تَخَافُونَ ﴾، دوای ئەوەی لەوێش دەمێننەوەو، دەیکەنە نشینگەو تێیدا سەقامگیر دەبن، دیسان ترستان لەسەر نابێ، (**تَأْمَنُونَ حِيْنَ الدُّخُولِ، وَلاَ تَخَافُونَ بَعْدَهُ**)، لە کاتی چوونە نێو مزگەوتی حەرامدا بە هێمنیی دەچن و، دواییش ترستان لەسەر نابێ و دڵەڕاوکێتان نابێ.

٦)- ﴿ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُواْ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) زانیی ئەوەی ئێوە نەتاندەزانی، دەڵێ: (**تَفْرِيعٌ عَلَى مَا مَرَّ ذِكْرُهُ، أَي: بِمَا أَنَّ اللهَ عَلِمَ مِنَ المَصَالِحِ الجَمَّةِ لَكُمْ مَا لاَ تَعْلَمُون**: ﴿ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾، ئەمە بیناکردنە لەسەر ئەوەی گوتراو لق لێکردنەوەیەتی، لە ئەنجامی ئەوەدا، کە خوا ﷻ بەرژەوەندییانێکی زۆری بۆ ئێوە دەزانین، کە ئێوە فیکرتان پێیان نەدەشکا، ﴿ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ ﴾، بۆیە پێش ئەوە یان نزیکتر لەوە سەرکەوتنێکی نیزیکی بۆ ڕەخساندن، کە وەک پێشتر گوتوومانە: مەبەست پێی پێکهاتنی حودەیبییەیە، چونکە خوا ﷻ ناوی لە صوڵح و پێکهاتنی حودەیبییە ناوە: فەتح: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ ﴾، یانی: (**فَتَحَ لَكُمْ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيْباً**)، بەرلەوە سەرکەوتنێکی نیزیکی بۆ ڕەخساندن.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی:

٧)- ﴿ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾، ئنجا (خوا) بەرلەوە سەرکەوتنێکی نیزیکی بۆ ڕەخساندن؟ بەڵام نەیفەرمووە: (**فَتَح لَكُمْ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيْبَا**)؟! هۆکارەکەی ئەوەیە تاکو ئەوە بگەیەنێ کە ئەو سەرکەوتنە کارێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، ئەگەر خوا ﷻ نەیگێڕاباو نەیڕەخساند بایە، پەیدانەدەبوو.

کە دەفەرموێ: (**إن شاءالله**)، یانی: ئەگەر خوا ﷻ ویستی، بەڵام لێرەدا سێ حیکمەتی تێدان:

**یەکەم:** بۆ ئەوەیە کە مسوڵمانان فێری ئەدەبی ئاخاوتن بکات، کاتێک پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەیە، ببەستنەوە بە ویستی خوای پەروەردگارەوە، ئەوە ئەدەبێکی بەرزە، کە مسوڵمان بۆ داهاتوو کە نازانێ چی لە هەگبەی نادیار (غیب)دا هەیە، هەمیشە

بیبەستێتەوە بە ویستی خواوەو بڵێ: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ، وەک لە سووڕەتی (**الكهف**) دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾، ئەگەر ویستت کارێک بڵێی کە بەیانی، (واتە: دوای ئەو کاتەی ئێستا تێیدای) ئەنجامی دەدەی، بڵێ: (**إن شاءالله**)، ئەگەر خوا ویستی، هەرکاتیش لەبیرت چوو یادی خوا بکەو بڵێ: بەڵکو خوا بۆ نیزیکتر لەوە، لە ڕووی سەر ڕاستییەوە ڕێنماییم بکات، کەواتە: ئەمە حیکمەتێکی گوتنی: (**إن شاءالله**).

**دووەم:** حیکمەتی دووەمی ئەوەیە کە ئێوە بەویستی خوا ﷻ و توانا و ڕەخساندنی وی دەچنە نێو مزگەوتی حەڕامەوە، نەک بەهێزو شان و شەوکەتی خۆتان.

**سێیەم:** حیکمەتی سێیەم کە ئەم ڕستەیە دەیگەیەنێ ئەوەیە: (**مَتَى شَاءَالله، لَا مَتَى شِئْتُم، أو وَإنْ لَمْ يَشَأ الكُفَّار**)، واتە: کاتێک خوا ﷻ ویستی ئێوە دەچن، نەک ئەو کاتەی کە دەتانەوێ، یان هەرچەندە کافرەکانیش نەیانەوێ، بەڵکو هەڵبڕینی هەر شتێک، سەرەنجامەکەی دەکەوێتە دەست ویستی ڕەهاو بێ سنووری خوا ﷻ.

## مەسەلەی دووەم:

**خـوا ﷻ پێغەمبـەری کۆتایـی خـۆی (موحەممـەد) ﷺی بـە ڕێنمایـی و بەرنامـەی هـەق و ڕاسـتەوە نـاردوە، تاکـو بەسـەر تێکـڕای بەرنامەکانـدا زاڵـی بـکات:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) ئەو زاتەیە، ڕەوانەکراوی خۆی بەڕێنمایی و بەرچاو ڕوونییەوە، ڕەوانە کردوە، ئایا پێغەمبەری کۆتایی تەنیا بەرچاو ڕوونیی و ڕێنمایی پێیە؟ نەخێر.

٢)- ﴿ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾، هەروەها بەرنامەیەکی هەق و چەسپاوو ڕاستیش[1]، بۆچی خوا ﷻ ئەو دوو وشەیەی بەکارهێناون؟ شایانی باسە: لە سێ ئایەتی قورئانیشدا، هەم لە سووڕەتی (**توبة**)دا، هەم لێرەدا لە سووڕەتی (**الفتح**) و، هەم لە سووڕەتی (**الصف**)دا، ئەم ڕستەیە دووبارە بۆتەوە، وەک دوایی باسی دەکەین، لەبەر ئەوەی مرۆڤ وەک تاک پێویستیی بە هیدایەت و بەرچاو ڕوونیی و ڕێنمایی خوا هەیە، هەم لە ڕووی بووناسییەوەو، هەم لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوەو، هەم لە ڕووی پەرستشەکانەوەو، هەم لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوەو، هەم لە ڕووی تەزکیەی نەفس و تەقواوە، وەک کۆمەڵیش پێویستییان بە بەرنامەیەکی ڕێک و ڕاست هەیە، کە هەموو کاروبارەکانی ژیانیان، لە ڕووەکانی: بەڕێوەبردن و حوکمڕانیی و، ئابووریی و، پەیوەندییەکان و، کۆمەڵایەتیی و، کارو کاسبیی، لە هەموو ئەو ڕووانەوە بۆ ڕێک بخات، کە ئەویش پێی دەگوترێ: ئایین، ئنجا بۆچی خوا ﷻ پێغەمبەری کۆتایی خۆی بەهیدایەت و بە دینی هەقەوە ناردوە؟

---

(١) دوایی لەو بارەوە کورتە باسێك دەکەین.

٣- ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، تاكو بەسەر تێكڕای بەرنامان دا سەری بخات، دەگونجێ ڕاناوی سەر (لِيُظْهِرَهُ)، بچێتەوە بۆ (الدِّيْن)، یانی: ئەو دینە هەقە سەربخات، یاخود بچێتەوە بۆ (رسول) تاكو ئەو پێغەمبەرە زاڵ بكات، ﴿عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، بەسەر هەموو بەرنامەكاندا كە دەفەرموێ: زاڵی بكات، ئەمە دوو واتایان دەگەیەنێ:

واتـای یەكـەم: بـە بەڵگـە سـەری بخـات، هیـچ بەرنامەیـەک لـە بەرانبـەر ئیسـلامدا لـە ڕووی بەڵگـەوە، خـۆی ڕاناگـرێ، هـەر هەقیقەتێـک ئیسـلام دەیڵـێ و، ئـەوەی لـە بەرانبـەری دا دەگوتـرێ و، پێچەوانەیـەتی و دژیەتـی، حەتمـەن پووچەڵـە، بـۆ وێنـە:

أ- ئیسلام دەفەرموێ: دەبێ لە ڕووی ئیداریی و سیاسییەوە، كاروبار، بە ڕاوێژ بێ، كەواتە: هەموو جۆرەكانی دیكەی بەڕێوەبردنی كاروبار، بە تایبەت حوكمڕانیی، ناڕەوان، چ حوكمی میراتیی بێ و، چ بنەماڵەیی بێ، چ خۆسەپاندن بێ ...هتد، هەموو شێوەكانی دیكەی حوكمڕانیی جگە لەوەی بە ڕاوێژ لە نێو خۆی، كۆمەڵگادا بەرپرسان دیاریی بكرێن، ناڕەوایە.

ب- هەروەها لە ڕووی ئابوورییەوە، ئیسلام لە لایەكەوە دان بە خاوەنداریەتیی تاک دادێنێ، لە لایەكیشەوە دەڵێ: ئەو خاوەندارێتییەی تاک، نابێ لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی گشتیی بێ، واتە: هەم ڕەچاوی بەرژەوەندیی گشتییش دەكات و، هەم ڕەچاوی مافی تاكیش دەكات، ئەمەش هێڵێكی نێوەڕاست و میانجییە لە نێوان لە لایەكەوە: كاپیتالیزم و لیبڕالیزم دا، كە دەستی تاک واڵا دەكەن، بە كەیفی خۆی هەڵسوكەوت بكات، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی گشتیی، لەولاشەوە: سۆشیالیزم و كۆمۆنیزمدا كە تاک لە ژێر پێی كۆمەڵگادا دەپلیشێننەوە، ئیسلام دەڵێ: نەخێر، دەبێ هەم تاكیش مافی پارێزراو بێ و، حورمەت و ڕێزی هەبێ، بەڵام بەرژەوەندیی گشتییش نابێ بخرێتە مەترسییەوە.

ج- هەروەها لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوەو، لە هەموو ڕووەكانی دیكەوەش.

ئـەوە واتایەكـی زاڵكـردنی ئایینـی خـوا، یـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەسـەر هەمـوو بەرنامـەو ڕێبـازەكانی دیكـەدا.

واتــای دووەم: ئەوەیــە کــە بــە دەســتەڵات بەســەریاندا زاڵبــێ و ســەر بکــەوێ، واتــە: لــە حاڵــەتی ڕووبەڕووبوونــەوەو بەرەنگاربوونــەوەدا، کــە بــە درێژایــی مێــژوو هــەروا بــووەو، کاتێــک ئەهلــی ئیســلام بەڕاســتیی بــڕوادار بووبــن، ئەهلــی کوفــر لــە بەرانبەریانــدا خۆیــان نەگرتــوە، چونکــە بــڕواداران: هــەم لــە ڕووی بووناســیی و ئیــمان و عەقیــدەو پەرســتش و، ڕووی ڕەوشــت و ئــاکارو تۆکمەیــی نێــو خۆیانــەوە، تــەرازوو، نایەنــەوە لەگــەڵ بەرانبەرەکانیانــدا، هــەم لــە ڕووی ئــەو ئامانجــە هەقانەی لــە پێناویاندا دەجەنگــن، کــە بریتیــە لە لابــردنی ســتەم و گەیاندنی پەیامی خــوا بە هەمــوو مرۆڤایەتیی و، بەرگرییکــردن لــە چەوســێنراوان و دەســتگرتنی ســتەمکاران، واتــە: هــەم ئامانجیــان لــە ڕووبــەڕوو بوونەوەکەیانــدا هەقــە، هــەم خۆشــیان لەســەر ڕێبازێکــی هەقــن، هــەم لــە ڕووی تیۆریــی و، هــەم لــە ڕووی کردەییــەوە. کەواتــە: مەبەســت زاڵکــردنی ئایینــی خوایــە بەســەر هەمــوو بەرنامەکانــدا، یــان پێغەمبــەری خوایــە ﷺ بــەڵام زیاتــر وا پێدەچــێ مەبەســت پێــی ئاییــن و بەرنامــەی خــوا بــێ، چونکــە ئەگــەر پێغەمبــەری خــوا ﷺ بــێ، تەنیــا ڕۆژگاری خــۆی دەگرێتــەوە، بــەڵام ئەگــەر بڵێیــن: ئاییــن و بەرنامــەی خــوا، هەمــوو ڕۆژگارەکان دەگرێتــەوە، هەڵبەتــە بــۆ پێغەمبەریــش ﷺ دەتوانیــن بڵێیــن: ئــەوە پێغەمبــەری خوایــە ﷺ و پەیامەکــەی ئــەوە ســەرکەوتووە.

بەڵــێ (لِيُظْهِـرَهُ): بــە هــەردوو مانایەکــەی دێ، هــەم لــە ڕووی بەڵگــەوەو، هــەم لــە ڕووی دەســتەڵات و خســتنە ژێــر ڕکێفــی خۆشــەوە.

٤- ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾، خواشتان بەسە شایەد و گەواهییدەر بێ، یانی: (**كَفَاكُمُ اللهُ شَهِيْدَاً عَلَى أَنَّ وَعَدَهُ كَائِنٌ، أَو عَلَى نُبَوَّتِهِ بِإِظْهَارِ المُعْجِزَاتِ**)، واتە: خواتان بەسە شایەدو گەواهییدەر بێ، کە ئەوەی بەڵێنی پێداون، دێتە دی، یاخود خواتان بەسە شایەد بێ لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ بە دەرخستنی موعجیزەکانی.

وشــەی (شَـهِيْدَاً) بــە مانــای شــایەدە، بــەڵام دەشــگونجێ بــە مانــای چاودێریــش بــێ، واتــە: بەســە خــوا ﷻ چاودێــر بــێ بــۆ هێنانــە دی، ئەو گفــت و بەڵێنــەی فەرموویــەتی و، چاودێــر بــێ بەســەر مســوڵمانانەوەو ئــاگای لێیــان بــێ و، ئــەو بەڵێنەیــان بــۆ بێنێتــە دی.

## کورتە باسێک: لە بارەی ڕێنمایی و بەرنامە بوونی پەیامی خواوە

بەڕێـــزان!

**ئێمە لە چوار بڕگەدا، ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو:**

**بڕگـری یەکـەم:** خـوا ﷻ ئـەم ڕاسـتییە، کـە پێغەمبـەری کۆتایـی خـۆی ﷺ بـە دوو شـتەوە نـاردوە: ﴿بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾، بـە ڕێنمایـی (هـدى) و بـە بەرنامـەی ڕاسـت (دیـن الحـق)ەوە، لـە سـێ شـوێندا فەرموویـەتی:

أ- لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی ژمارە (٣٣)دا، دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٣٣﴾.

ب- لە سوورەتی (الفتح)دا، کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ٢٨﴾.

ج- لە سوورەتی (الصف)یشدا هەمان ڕاستیی و هەمان ڕستە هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٩﴾.

کەواتـە: لـە ئایـەتی (٣٣)ی (التوبـة)و (٩)ی (الصـف)دا، ئەمـەی لـێ زیـاد کـردوە: ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾، بـەڵام لـەم سـوورەتی فەتحـدا: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا﴾ هاتـوە.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە خـوا ﷻ بەسـە چاودێـر بـێ بەسـەر هێنانـە دی، ئـەو بەڵێنـەوە، بـەڵام لـە سـوورەتی (التوبـة)و لـە سـوورەتی (الصـف)دا، کـە ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾، هاتـوە، هۆیەکـەی ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ دەزانـێ: هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان ئەوەیـان پـێ ناخۆشـەو پێـی قەڵسـن، بۆیـە دەفەرمـوێ: هەرچەنـدە

ئەوانیش پێی قەڵس بن و پێیان ناخۆش بێ، بەڵام خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ بە ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونیی بۆ تاکەکان و، بە بەرنامەی ڕاست و تێرو تەواوییشەوە بۆ کۆمەڵگاکان ڕەوانە کردوە.

**بڕگەی دووەم:** واتاو چەمکی **(الهدی)** و **(دین الحق)**:

**یەک:** چەمکی وشەی **(الهدی)**:

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾، **(هدی)** بە کوردیی دەگونجێ بگوترێ: ڕێنمایی، دەشگونجێ بگوترێ: بەرچاو ڕوونیی، دەشگونجێ بگوترێ: ڕاستە ڕێکردن و خستنە سەر ڕێی ڕاست، لە قورئاندا خوا ﷻ وشەی **(هدی)**ی بە گشتیی بە سێ واتایان بەکارهێناوە:

**١-** واتایەکی گشتیی کە هەموو دروستکراوەکان دەگرێتەوە، وەک لە سوورەتی **(طه)** - ٥٠ - دا، کاتێ فیرعەون لە مووسا علیه السلام دەپرسێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾، ئنجا پەروەردگاری ئێوە کێیە، ئەی مووسا؟ مووسا علیه السلام لە وەڵامیدا دەفەرموێ: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾، پەروەردگارمان ئەو زاتەیە، بوونی بە هەموو شتێک داوە، دواییش ڕێنمایی کردوە، کەواتە: هەرچی دروستکراوی خوایە، هەمووی خوا هیدایەتی بۆ ڕەخساندوەو ڕێنمایی کردوەو بەرچاوڕوونی کردوەو، وای لێکردوە بە شێوەیەک بەردەوام بێ و، بەڕێوەبچێ، کە ئەو حیکمەتەی بۆی دروستکراوە، بیهێنێتە دی، هەر لە گەردیلەوە تاکو کەهکەشان و، هەموو ئەو شتانەی دەکەونە نێوانیان، چونکە خوا ﷻ لێرەدا وشەی هیدایەتی بۆ هەموو شتێک **(كُلَّ شَيۡءٍ)** بەکارهێناوە، بێگومان هەموو شتێک بە شێوەیەک لە شێوەکان، خوا ﷻ ڕێنمایی کردوەو سیستمی بۆ داناوەو بەپێی ئەو سیستمە بەڕێوە دەچێ و لێی لانادات.

**٢-** واتایەکی دیکەی هیدایەت، بریتیە لە ڕێ پێشاندان و بەرچاو ڕوونکردنەوەو ڕێنمایی کردن، وەک لە سوورەتی **(السجدة)**دا، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا ﴿٢٤﴾ ﴾، باسی بەنوو ئیسرائیل دەکات، دەفەرموێ: ئێمە چەند پێشەوایەکمان لێ

ڕەخساندن، بە فەرمانی ئێمە، خەڵکیان ڕێنمایی دەکردو، ڕێیان پێشانی خەڵکی دەدات، هەروەها خوا ﷻ لە ئایەتی پێش کۆتایی (**الشورى**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی تۆ خەڵک ڕێنمایی دەکەی بۆ ڕێیەکی ڕاست، ئاشکراشە ئەوەی بەدەستی پێغەمبەر (**محمد**)ە ﷺ و بە دەستی پێغەمبەران و جێگران و میراتگرانی پێغەمبەرانیشە، بریتی بووە لە ڕێ پێشاندان و بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵک بەرەو ڕێی ڕاست، وەک لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەی سوورەتی (**الشورى**) دا باسمان کردوە، کە خوا ﷻ لە هەندێ شوێناندا هیدایەت لە پێغەمبەر ﷺ لا دەبات و، لە هەندێک شوێناندا بۆی دەچەسپێنێ، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**القصص**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: تۆ ئەوەی خۆشت بوێ هیدایەتی نادەی، لێرەدا (**هداية**) بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مانای یەکەمی هیدایەت هەموو لایەکی ڕێنمایی کردوە: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾**الشورى**، بەڵام: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾**القصص**، بە دڵنیایی کەسێکت کە خۆشدەوێ، ناتوانی ڕاستە ڕێی پێ بگری.

ئەمەش مانای دووەمی هیدایەتە، کە بریتیە لە ڕاستە ڕێ کردن و تەنیا بە دەست خوایە.

لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴿٢٤﴾ ﴾ **السجدة**، پێشەوایانێکمان لە نێودا پەیداکردن و تێداگێڕان، کە بە فەرمانی ئێمە خەڵکیان ڕێنمایی دەکرد، ڕێی ڕاستیان دەخستە بەر چاویان.

مانای یەکەمی ڕاستەڕێکردنی هەرچی دروستکراوە، ئەوە گشتییە.

مانای دووەمی ڕێنمایی کردنی خەڵک.

**٣-** مانای سێیەمی تایبەتتری هیدایەت، بریتیە لە خستنە سەر ڕاستە ڕێ و ڕێی ڕاست پێگرتن، وەک لە سوورەتی (**محمد**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتوەو هیدایەتی خۆیان قبووڵ

کردوەو، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، واتە: لەسەرەتاوە کە خوا ڕێی پێشانداون، ئەو ڕێ پیشاندانەی خوایان قبووڵکردوە، ڕێنماییەکەیان قبووڵکردوەو وەریانگرتوە لە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا لەبەرەکەتی قبووڵکردنی ئەو هیدایەتەدا، خوا ﷻ هیدایەتی بۆ زیاد کردوون، کە بریتیە لەوەی ڕێی ڕاستیان پێ بگرێ و بیانخاتە سەر ڕاستە شەقام، وەک چەند جارێک لەو بارەوە وێنەمان بەوە هێناوەتەوە، بۆ ئەو دوو مانایەی هیدایەت: ڕێ پێشاندان و، ڕێی ڕاست پێ گرتن:

کەسێک بە تۆ دەڵێ: فڵان شار، یان فڵان دێ، یان لەو شارەدا فڵان گەڕەک یان فڵان جادە لە کوێیە؟ تۆ دوو حاڵەتت بۆ هەن:

أ- یەکێکیان ئەوەیە کە ڕێیەکەی پێشان بدەی و بڵێی: بچۆ بۆ فڵان شوێن و، بچۆ بۆ فڵان شوێن، هەر ئاوا ڕێنمایی بکەی، ئەوە بریتیە لە ڕێنمایی کردن.

ب- حاڵەتێکی دیکەی ڕێ پێشاندان ئەوەیە، تۆ دەستی بگری و لەگەڵ خۆتی بەری و بیبەی بۆ شوێنەکە.

مانای گشتیی هیدایەت، بە نسبەت مرۆڤەکانەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێشانداون، کە ئەوە بە پێغەمبەر ﷺ دەکرێ و بە هەموو ئەو کەسانەش دەکرێ کە بەرچاوی خەڵک ڕۆشن دەکەنەوە بەرەو هەق، بەڵام هیدایەت بە مانای دووەمی، تەنیا بە خوا دەکرێ، کە ئەوەیە ڕێی ڕاستیان پێ بگرێ و، ئەوەش تەنیا بە خوای کاربەجێ دەکرێ، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ٥٦﴾ **القصص**، واتە: ناتوانی ئەو کەسەی خۆشتدەوێ ڕاستە ڕێی بکەی، بەڵێ دەتوانی ڕێی پێشان بدەی، بەڵام ناتوانی بیخەیە سەر ڕاستە ڕێ، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ ٥٦﴾ **القصص**، بەڵام خوا ﷻ هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات، خواش ئەوانە ڕاستە ڕێ دەکات، کە هیدایەتی خوا لە سەرەتاوە، قبووڵ دەکەن.

**دوو:** چەمكی وشەی (دِین الحق):

وشـەی (دِیـن) كـە پاڵدراوەتـە لای هـەق: ﴿ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾، **(الحـق)** دەگونجـێ مەبەسـت پێـی خـوای موتەعـال بـێ، واتـە: دینـی خـوای هـەق، یاخـود: ﴿ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾ دەگونجـێ مەبەسـت پێـی وەسـفكرانی دیـن بـێ بـە هـەق، كـە بریتیـە لـە شـتی چەسـپاوو پـڕ لـە حیكمـەت.

وشـەی (**دین**)یـش لـە قوڕئانـدا، بەزۆریـی بـە مانـای بەرنامـەی ژیـان دێ، هەڵبەتـە وشـەی (**دیـن**) چەنـد واتایەكـی هەن:

**أ-** بە مانای سزاو پاداشت دێ: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ﴾ **الفاتحة**.

**ب-** بە مانای ملكەچیی دێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۝١٩٣ ﴾ **البقرة**.

**ج-** بە مانای بەرنامەی ژیان دێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦ ﴾، **الكافرون**.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾، **(الكافـرون)** (أل) ناسـاندنی لەسـەرەو بـۆ جینسـەو، هەمـوو كافـرەكان دەگرێتـەوە، بـە هەمـوو جۆرەكانیانـەوە: چ مولحیـد بـن، چ هەڵگـەڕاوە بـن، چ خـاوەن كتێـب بـن، چ هاوبـەش بـۆ خـوا دانەربـن، هەمـوو جـۆرەكانی كافـران دەگرێتـەوە، كەواتـە: هەمـوو كافرێـك دینـی هەیـە، بۆیـە (دیـن)، واتـە: ئـەو بەرنامەیـەی مـرۆڤ پێـی بەڕێـوە دەچـێ، بـە تایبـەتی لـە حاڵـەتی كۆمـەڵ بوونیانـدا، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ ﴾، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦ ﴾، ئاییـن و بەرنامەی خۆتـان بـۆ خۆتـان، منیـش ئاییـن و بەرنامـەی خـۆم بـۆ خـۆم.

هەروەهـا (**دیـن**) بـە مانـای بەرنامـەی ژیـان هاتـوە، لـە سـووڕەتی (**یوسـف**)دا، كـە خـوا ﷻ لـە بـارەی ئـەوەوە كـە یوسـف عليه السلام بـۆی هەیـە برایەكـەی (بنیامیـن) لـە

لای خۆی گلداوەتەوە، بە پاساوی ئەوە کە ئەو دەفرەی دەغڵیان پێ پێواوە، لە باری ئەودا دۆزراوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَاءِ أَخِيهِ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: دەستیکرد بە پشکنینی بارەکانیان پێش باری برایەکەی، دوایی لە باری برایەکەی دەری هێنا (دەفرەکەی دەرهێنا)، ﴿ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ ﴿٧٦﴾ ﴾ (یوسف) بۆی نەبوو، بەپێی بەرنامەی پادشا (پادشای میسر) برایەکەی لە لای خۆی گلداتەوەو بیگرێ، کە هەندێک لە زانایان دەڵێن: بە ڕواڵەت لە بەرانبەر بردنی دەفرەکەدا کردوویەتی بە کۆیلە، بەڵام ئایەتەکە ئەوە بە ڕاشکاویی ناگەیەنێ، گرنگ ئەوەیە لە بەرانبەر ئەوەدا کە دەفرەکە لە بارەکەی دا بووە، گلی داوەتەوە، وەک بەردەست یان وەک کۆیلە، کە دەبێ ماوەی ئەوەندە لە لامان بێ، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بەپێی بەرنامەو حوکمی پادشایەکە بۆی نەبوو، برایەکەی لە لای خۆی گلداتەوە، بۆیە بە برایەکانی گوت: سزایەکەی چییە، ئەگەر ئەو دەفرە لە باری ئەودا دۆزرایەوە؟ ئەوانیش گوتیان: ﴿ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ﴿٧٥﴾ ﴾، سزایەکەی هەر ئەوەیە، کە هەر کەسێ لە بارەکەیدا دۆزرایەوە، خۆی دەبێتە بارمتەی، واتە: خۆی دەبێتە سزای، واتە: دەبێ ببێتە بەر دەستی، یاخود کۆیلەی ئەو کەسەی دزیی لێکردوە، ئەوەش پێشنیارەکەی ئەوان بووەو، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**یوسف**)دا، باسم کردوە، مەرج نیە لە دینی یەعقووبیشدا وابوو بێ، وەک زۆر لە تەفسیرەکان وایان گوتوە! بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو کات ئەوان ئەوەیان بەزاردا هاتوەو، گوتوویانە: هەر کەسێک ئەوەی کردبێ، با خۆی ببێتە موڵکی ئەو کەسەی دزییەکەی لێکراوەو، دزیی لێکراو ببێتە خاوەنی وی، ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ ﴿٧٦﴾ ﴾یوسف، کەواتە: (**دین**) یانی: بەرنامەیەک کە بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بەکاردەهێنرێ.

هەروەها لە سووڕەتی (**الشورى**)دا، خوا ﷻ دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ

﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴿١٣﴾﴾، فەرموویەتی: ﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ الدِّينَ﴾، لێرەشدا (**الدِّين**) دیسان بە مانای بەرنامەی ژیانە، واتە: ئەو بەرنامەو ڕێبازەی خوا بۆی ناردوون، بۆ هەمووو پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) ناردوە، وەک ئەصڵەکەی، بۆ ئێوەشی ناردوە، وەک هێڵە گشتییەکانی بەرپای بکەن و، تێیدا پەرتەوازە مەبن.

**بڕگەی سێیەم:** حیکمەتی ئەو دوو بەشە چییە؟

بۆچی خوا ﷻ تەعبیری کردوە لە دوا پەیامی خۆی کە بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەددا ﷺ ناردوویەتی، کە ناوە عورفیی و باوەکەی بریتیە لە ئیسلام و، لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە، بۆچی ئەو دوو وشەیەی بەکارهێناون، بۆ تەعبیرکردن لەو ئایین و بەرنامەیە، کە یەکیان (**هدى**) یەو ئەوەی دیکەیان (**الدين**)ە؟

بە بۆچوونی من هۆکارەکەی ئەوەیە کە (**هدى**) پەیوەندیی بەتاکەوە هەیە، هەر کۆمەڵگایەک پێشێ، تاکەکانی یەک یەکیان پێویستییان بەوە هەیە، لە ڕووی بوونناسییەوە بەرچاویان ڕوون بێ و بزانن: خۆیان و گەردوون و دەوروبەریان لە کوێوە هاتوون؟ بۆچی هاتوون؟ بۆ کوێ دەچن؟ کێ دروستی کردوون؟ ئەم ژیانە دنیاییە چییە؟ قۆناغی دیکەی بەدوا دێ، یان نا؟ کە ئەمانە پێکهێنەرەکانی بوونناسیین، وەک لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)دا، کتێبی یەکەممان هەمووی بۆ ئەوە تەرخانکردوە، هەروەها لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلام)یشدا باسمان کردوەو، لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی)یشدا، باسمان کردوە، کە بوونناسیی لە پێش ئیمان و عەقیدەشەوەیە، چۆنیەتیی تێڕوانینی مرۆڤ بۆ ئەوە کە خۆی چییە؟ ئەم گەردوونە چیە؟ لە کوێوە هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ هەروەها ئەوە دەبێتە بناغە بۆ ئیمانیش و، لەسەر بناغەی ئەوە، ئنجا مرۆڤ ئیمان بە خوا دێنێ، کە بەس ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی و گەردوون و دەوروبەرە، پاشان

ئەوەش پەلكێشی دەكات بۆ ئەوە، كە ئەو خوایە ﷻ لێی چاوەڕێ دەكرێ لە لوتف و كەرەمی، كە مرۆڤی تەنیا بۆ ئەم ژیانی دنياییە نەخوڵقاندبێ و، ئەم ژیانە قۆناغی دیكەی بەدوا دابێ، ئنجا بۆ گوزەراندنی ئەم ژیانە دنياییە بە شێوەیەک كە جێگای ڕەزامەندیی و پەسەندیی خوا بێ، دیسان خوا ﷻ وای لێ چاوەڕوان دەكرێ، كە ڕێنمایی خۆی بنێرێ و، بەرنامە بۆ مرۆڤ بنێرێ بە پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، لە ڕێی فریشتەكانەوە.

كەواتە: لە ڕاستییدا لەسەر بناغەی بووناسیی، هەموو پایەكانی ئیمان هەڵدەچنرێن، هەروەها (**هدى**) دوای بووناسیی، ئیمان و عەقیدەیە، بە هەر شەش پایەكەیەوە، دوایی پەرستشەكانن، دوایی پارێزكارییەو تەزكیەی نەفسەو، ڕەوشت و ئاكارە، ئەمە وەک تاک، بەڵام پەیامی خوا جگە لە هیدایەتێک كە بە تاک جێبەجێ دەكرێ، بەو موفرەدانەوە كە باسمانكردن: بووناسیی، ئیمان، عیبادەت، تەقوا، تەزكیە، ڕەوشت، وێڕای ئەوە بەرنامەیەكیشە كە بە كۆمەڵ بەڕێوە دەبردرێ، (**الدين**)، یانی: ئەو بەرنامەیەی ژیانی پێ بەڕێوە دەچێ، ژیانی كۆمەڵگا لە هەموو ڕووەكانی: سیاسیی و، ئیداریی و، ئابووریی و، كۆمەڵایەتیی،... هتدەوە، بۆیە خوا ﷻ ئەو دوو وشەیەی بەكارهێناون، بۆ تەعبیركردن لەو پەیامەی خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی، كە ببێتە سایەو سێبەر بۆ هەموو مرۆڤایەتیی.

چونكە خوا كە دەفەرموێ: ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، بەس ئەوە ناگەیەنێ كە بە زەبری هێز بەسەر هەموو بەرنامەكاندا بیسەپێنێ، چونكە بێگومان: تۆبزییكردن لە ئایین دا نیە: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ٢٥٦﴾ **البقرة**، بەڵكو ئەوە سێ واتایان دەگەیەنێ:

**یەكەم:** لە ڕووی بەڵگەوە زاڵی بكات بەسەر هەموو بەرنامەكاندا.

**دووەم:** لە كاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا، بە هێز زاڵ و سەركەوتووی بكات.

**سێیەم:** بە هەردوو واتایەكە، زاڵی بكات و سەری بخات.

کە ئەوەش ڕاستییەکی بەرجەستەیەو، ئێستا لە دنیای واقیعدا دەیبینین، لە مێژووشدا دیارە بە هەر سێک چەمک و واتایەکە، دوا ئایین و پەیامی خوای پەروەردگار، لە ماوەیەکی زۆر کەمی تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکانیدا، نیوەی زیاتری دنیای ئەوسای خستە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی خۆیەوە، نەک تەنیا بە زەبری هێز، بەڵکو وەک گەیاندنی هیدایەتی خواو، بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵک و، بەهرەمەندکردنیان لە ڕاستییەکانی ئیسلام.

**برگەی چوارەم:** بەبێ وەرگرتنی (**هدی**) لەلایەن تاکەکانەوەو، (**دین**) لەلایەن کۆمەڵگاوە، ئیسلام لە لای کۆمەڵگاوە بەڕێوە ناچێ، واتە: ئەگەر بویسترێ ئیسلام وەک بەرنامەی ژیان لەلایەن کۆمەڵگاوە بەڕێوە بچێ، پێشێ دەبێ تاکەکان ئەو ڕێنمایی و هیدایەتەی خوا وەربگرن، هەر بۆیەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ وایکردوەو، هەموو پێغەمبەرانیش هەر وایان کردوەو، هەر کاتێکیش بویسترێ گۆڕانکاریی بکرێ لە کۆمەڵگایەکدا، دەبێ بەو شێوەیە بکرێتەوە، واتە: لە تاکەکانەوە دەست پێ بکرێ، تاکەکان تێ بگەیەنرێن و، پێ بگەیەنرێن، پەروەردە بکرێن، بە هەموو موفرەدەکانی: بووناسیی، ئیمان، عیبادەت، پارێزکاریی، تەزکیە، تەقوا، ڕەوشتی بەرز، ئنجا ئەو تاکانە دەتوانن ئەو ئایینە هەقەی خوا، لە ڕووە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکەیەوە، لە ژیانی خۆیاندا بەڕێوە ببەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێناسەی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون و لەگەڵیدا دەبن و، خەسڵەتە بنەڕەتییەکان و پێناسەو وەسفیان، لە هەر کام لە تەورات و لە ئینجیلدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ﴾، {خوا ﷻ ئەم ڕاستییە مەزنە ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ:} موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایەو نێردراوی خوایە.

هەندێک لە زانایان گوتوویانە: لە ڕووی ڕێزمانییەوە (**مُحَمَّد**) نیهاد (**مبتدأ**)ە و، (**رَسُولُ اللـه**) گوزارە (**خبر**)یەتی، موحەممەد پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایە، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (**مُحَمَّد**) گوزارەی نیهادێکی قرتێندراوە، کە بریتیە لە: ئەو (**هو**)، چونکە مەبەست ئەوە نیە، خوا ﷻ ڕایبگەیەنێ کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەوە لە شتە ڕوون و ئاشکرایەکانە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: ئەو پێغەمبەرەی ﷺ لە ئایەتەکانی پێشێ دا وەسفی کرا، ئەو موحەممەدەیە، کە ڕەوانە کراوو نێردراوی خوایە، هەردوو واتاکانیش لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، گونجاون.

٢)- ﴿وَالَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى الْكُفَّارِ﴾، ئەوانەش کە لەگەڵیدان، لەسەر بێبڕوایان توندو بەهێزن، (مَعْنَى مَعَهُ: المُصَاحَبَةُ الكَامِلَةُ بِالطَّاعَةِ والتَّأْيِيدِ، مِثْلُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ﴿١٢﴾﴾)، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾، ئەوانەش کە لەگەڵیدان، مەبەست: لەگەڵدا بوون و هاوەڵایەتیی تێرو تەواوە، بە فەرمانبەریی و بە پشتگرتن، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ﴿١٢﴾﴾، خواش ﷻ فەرمووی: من لەگەڵتانم، واتە: لەگەڵدابوون بە پشتگرتن و هاوکاریی کردن و مشوور خواردن.

ئەوانەش کە لەگەڵیدان، بێگومان بە پلەی یەکەم هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرن ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پیاوان و ئافرەتان بە وردو درشتەوە، هەموو ئەوانەی پێناسەی (صحابي) و (صحابية) دەیانگرێتەوە، کە دوایی لە کورتە باسێکدا، باسی گرنگترین خەسڵەتەکانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، بەڵام دوای ئەوان، هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە بە ڕێبازی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ دەڕۆن و، هەڵگری هەمان بووناسیی و، هەمان ئیمان و عەقیدەو، هەمان پەیامن و، بە دوای هەمان بەرنامە دەکەون، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺو هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەری بوون، واتە: بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، هەموو ئەوانەی بەڕێی پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆن و، بە شێوەیەک لە شێوەکان لە خزمەتیدان، با لە ڕووی جوگرافییشەوە دووربن و، با لە ڕووی کاتیشەوە هاوچەرخی ئەو نەبووبن، ﴿وَالَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾، (ئەوانەی لەگەڵیدان)، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، بەڵام کەسانێک کە لە ڕۆژگاری خۆی دابوون و، لە ڕووی جوگرافییشەوە لەنێو نیشتیمانەکەی خۆی دابوون، بەڵام لە خزمەت بەرنامەکەی دانەبوون و، بووناسیی و ئیمان و عەقیدەو شێوەی ژیان بە ڕێکردنیان، وەک هی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووبێ، نایانگرێتەوە، ئنجا دەفەرموێ: ئەوانەی کە لەگەڵیدان بە چەند وەسفێک وەسفیان دەکات، کە ئێمە بە خێرایی بەسەریاندا دەڕۆین، لەبەر ئەوەی دوایی لە کورتە باسێکدا باسی سیفەت و خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر دەکەین،

دەفەرمـوێ: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ﴾، لەسـەر بێبڕوایـان سـەخت و تونـدو تیـژن، (أشِـدَّاء) کـۆی (شَـدِیْد)ە، یـانی: کەسـێک کـە لـە هەڵسـوکەوتدا، دڵـی ڕەق بـێ و بـە سـەختیی مامەڵـە بـکات لەگـەڵ بەرانبەرەکەیـدا، وەک خـوا ﷻ لـە بـارەی فریشـتەکانەوە کـە بەسـەر دۆزەخ ڕادەگـەن، دەفەرمـوێ: ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ﴿٦﴾﴾التحریـم، ئـەو دۆزەخـە چەنـد فریشـتەیەکی بەسـەرەوەن و سەرپەرشـتیی دەکـەن، کـە زبـرن و زۆر تونـد و سـەختن، دیـارە کـە دەفەرمـوێ: لەسـەر کافـران تونـدو تیـژن، واتـە: لـە حاڵـەتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەو بەرەنگارییـدا، ئەگەرنـا هیـچ کەسـێک لـە هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ و لـە بـڕوادارانی شـوێنکەوتووی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، خـۆش مامەڵەتـر نەبـووە، بەڕێزتـرو بـە حورمەتـترو میهرەبانـتر نەبـووە، لەگـەڵ هەمـوو پێکهاتـەکانی کۆمەڵـگادا، بـە مسـوڵمان و نامسـوڵمانەوە، لـە ڕووی هەڵسـوکەوتەوە، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی حاڵـەتی بەرەنگاریـی و ڕووبـەڕوو بوونەوەیـە.

٣)- ﴿رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾، نەرم و نیان و بە بەزەیین لە نێو خۆیاندا.

٤)- ﴿تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا﴾، هەمیشە بە ڕکووع بردوویی و کڕنووش بردوویی دەیانبینی، واتە: تۆی بینەر، هەر کەسێک بی، هەمیشە ئەگەر سەرنجیان بدەی، لە حاڵەتی ڕکووع بردن و سەجدە بردندا دەیانبینی، کە مەبەست پێی نوێژە، چونکە ئەگەر بگونجێ کڕنووش بردن لە دەرەوەی نوێژیشداو بە تەنیاش ببێ، بەڵام ناگونجێ چوونە ڕکووع بە تەنیا ببێ و، تەنیا لە نوێژدا ڕکووع بردن هەیە.

٥)- ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾، بەخشش و ڕەزامەندیی لە پەروەردگاریانەوە دەخوازن، واتە: ئەوەی لێی دەخەفتێن و زۆر مەبەستیانەو هەوڵی بۆ دەدەن، ئەوەیە کە بەخششی خوا وەدەستبێنن، کە لە بەهەشتدا بەرجەستەیەو، هەروەها ئەوەیە ڕەزامەندیی خواش وەدەست بێنن، کە وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٧٢﴾﴾التوبة، واتە: ڕەزامەندیی لە خواوە، لە هەموو شتێک گەورەترە.

٦)- ﴿ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾، (ئەمیش خەسڵەتێکی دیکەیانە)، نیشانەیان لە ڕوویاندا دیارە، بە هۆی کاریگەریی کڕنووش بردنەوە.

واتە: وەک شوێنەواری کڕنووش بردن کە گەورەترین حاڵەتی بەندایەتییە بۆ خوا، لە کاتێکدا مرۆڤ کڕنووش دەبات، لە هەموو کاتان لە خوا نیزیکترە، ئنجا ئەو خوا پەرستییە وای لێکردوون، نیشانەی خوا پەرستیی لە دەم و چاویاندا دیار بێ، چونکە (سِیْما)، یانی: (عَلَامة) نیشانە، بەڵام دەبێ لێرەدا وریا بین کە مەبەست لە (وُجُوه) واتە: دەم و چاوو ڕوو، جیایە لە نێوچەوانەکان (جباه) و نەیفەرمووە: (جباههم) واتە: نێو چاوانیان، بەڵکو فەرموویەتی: (وُجُوه)، ئنجا بۆیە زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە و بە گشتیی سێ ڕا هەن، لە بارەی مانای نیشانە دەرکەوتنی ئەوان لە دەم و چاویاندا:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: نیشانەیەکی بەرهەستە.

ب- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست نیشانەی مەعنەوییە و ئاکاریی و ڕەوشتییە لە دنیادا.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی نیشانەی ڕۆژی دواییەو، لە ڕۆژی دواییدا ئەوە دەردەکەوێ.

ئەو ڕایەی (**الطبري**)یش لەو بارەوە، پێم وایە ڕایەکی زۆر جوانە کە لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] هێناویەتی، دەڵێ: ﴿ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾، **(فَكَانَ سِيمَاهُمُ الَّذِي كَانُوا يُعْرَفُونَ بِهِ فِي الدُّنْيَا أَثَرُ الإِسْلَامِ، وَذَلِكَ خُشُوعُهُ وَهَدْيُهُ وَزُهْدُهُ وَسَمْتُهُ، وَآثَارُ أَدَاءِ فَرَائِضِهِ وَتَطَوُّعِهِ، وَفِي الْآخِرَةِ مَا أَخْبَرَ أَنَّهُمْ يُعْرَفُونَ بِهِ، وَذَلِكَ الْغُرَّةُ فِي الْوَجْهِ وَالتَّحْجِيلُ فِي الْأَيْدِي وَالْأَرْجُلِ مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ، وَبَيَاضُ الْوُجُوهِ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ)**.

---

(١) جامع البيان: ج٢٦ ، ص: ١٠٤.

واتـە: ئـەو نیشـانەیان کـە لـە دنیـادا پێـی دەنـاسران شـوێنەواری ئیسـلام بـووە، کـە ملکەچییەکـەی و شـێوەکەی و دنیـا بەکەمگرتنەکـەی و ئاکارەکـەی و، شـوێنەوارەکانی ئەرکـە پێویسـتەکانی و پەسـندەکانیەتی.

لـە ڕۆژی دواییـش دا ئـەو نیشـانەیە ئەوەیـە کـە هەواڵیـداوە پێـی دەناسرێـن، ئەویش درەوشـاوەیی ڕوو و دەسـت و لاق و بازوو بوونە، لە شـوێنەواری دەسـتنوێژو، سـپێتیی ڕووەکانـە بەهـۆی کڕنـووش بردنـە.

(القرطبي)یـش لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1]، لـەو بـارەوە دەڵـێ: (**قَـالَ مَنْصُورٌ: سَـأَلْتُ مُجَاهِـداً عَـنْ قَوْلِـهِ تَعَـالَى:** ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾، **أَهُـوَ أَثَـرٌ يَكُـونُ بَـيْنَ عَيْنَـيِ الرَّجُـلِ؟ قَـالَ: لَا، رُبَّمَـا يَكُـونُ بَـيْنَ عَيْنَـيِ الرَّجُـلِ مِثْـلُ رُكْبَـةِ الْعَنْـزِ، وَهُـوَ أَقْسَى قَلْبَاً مِـنَ الْحِجَـارَةِ! وَلَكِنَّـهُ نُـورٌ فِي وُجُوهِهِـمْ مِـنَ الْخُشُـوعِ**)، (**مَنْصُـور**) دەڵـێ: لـە موجاهیـدم پرسـی لـە بـارەی قسـەی خـوای بـەرزەوە: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾، ئایا ئـەوە شـوێنەوارێکە لـە نێـو چـاوانی پیـاودا دەردەکـەوێ؟ گـوتی: نەخێـر، بەڵکـو جـاری وا هەیـە لـە نێـو چـاوانی پیاوانـدا وەک ئەژنـۆی بـزن هەیـە، (واتـە: بـەرز دەبێتـەوەو دەبێتـە گـرێ)، بـەڵام دڵـی لـە بـەرد ڕەقتـرە، بەڵکـو مەبەسـت پێـی ڕۆشـناییە، کـە لـە دەم و چاویانـدا دەردەکـەوێ، لـە ئەنجامـی ملکەچییانـدا بـۆ خـوا.

یەکێکـی دیکـە لـە زانایـانی پێشـین، وەک توانـج لـە هەندێـک لەوانـەی ڕەنگـە نێوچـاوانی خۆیـان زۆر لـە زەوی خشـاند بـێ، تاکـو شـوێنکەی لـێ پەیـدا کـردوە، ئنجـا ئایـا بەڕیـا بازیـی بـووە، یاخـود ڕەنگـە بـۆ خواشـیان بووبـێ، بـەڵام نێـو چاوانیـان شـوێندار بـووە، گوتوویـەتی: (**لَا أَدْرِي أَخَشُـنَتُ الأَرْضُ، أَمْ ثَقُلَـتِ الـرُّؤوسُ!**)، نازانـم ئایـا زەوی زبـر بـووە، یـان سـەرەکان قـورس بـوون! واتـە: جـاران هـاوەڵان خواپەرسـتیی باشیشـیان کـردوەو، زۆریـش لـە کڕنووشـدا ماونـەوە، بەڵام شـوێنکە لـە نێـو چاوانیاندا پەیـدا نەبـووە!.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦ ، ص: ٢٢٩.

٧)- ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾، ئەوەی باسکرا، ئەوە وەسف و وێنەیانە لە تەوڕاتدا، (المثَلُ: الوَصْفُ وَالحَالَة العَجِيْبة)، (مَثَل) بریتیە لە وەسف و حاڵەتی سەرسوڕهێنەر.

٨)- ﴿وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ﴾، وێنەو وەسفیان لە ئینجیلدا وەک کشتوکاڵێک وایە، یان وەک درەختێک وایە، یان وەک ڕووەکێک وایە.

٩)- ﴿أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ﴾، لقەکەی خۆی دەرکردوە، لق و پۆپێ کە لێی جیا دەبێتەوە، (شَطْءُ) خوێندراویشەتەوە: (شَطَئَهُ).

(فَـآزَرَهُ) خوێندراویشـەتەوە: (فـأَزَرَهُ)، هەردووکیـان یـانی: (فَقَـوَّاهُ)، واتـە: ئـەو لقانـەی جیابوونـەوە، لـەو قـەدە، یـان لـەو لاسـکە، بـە نسـبەت گەنـم و جـۆو مـەرەزەو نیسـک و ...هتـدەوە، (فـأَزَرَهُ) بەهێـزی کـردوە.

١٠)- ﴿فَٱسۡتَغۡلَظَ﴾، ئنجا زەبەلاح و چڕو پڕ بوو، دوایی ئەو ڕووەکە، چ درەخت، ئەگەر لق و پۆپی دەرکردبن، چ گەنم و جۆیە، کە لاسکەکەی گوڵی دەرکردبن، بەهێزی کردوە، دوایی پتەو بووە.

١١)- ﴿فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾، لەسەر قەدەکانی خۆی، یان لەسەر لاسکەکانی وەستاوە.

(سـوق) کـۆی (سـاق)ە، کـە بـە کوردیـی دەبێتـە قـەد بـۆ درەخـت و، دەبێتـە لاسـک بـۆ گەنـم و جـۆو ...هتـد، خوێندراویشـەتەوە: (عـلى سـئوقه)، (سـئوق) یـان (سـوق) هەردووکیـان کـۆی (سـاق)ن، کـە بریتیـە لـەوەی لـق و پۆپـەکان، یاخـود گوڵـەکان، کـە لێـی دەردەچـن.

١٢)- ﴿يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ﴾، جووتیاران سەرسام دەکات، یان چێنەر یان نێژەر، ئەو کەسەی نەمامەکە دەنێژێ، یاخود دانەوێڵەکە دەنێژێ.

دەگوتـرێ: (أَعْجَبَـهُ: رَاقَـهُ وَعَـدَّهُ نَفِيْسَـاً مَرْغُوبَـاً فِيْـه)، (أَعْجَبَهُ) واتـە: زۆری پێ جوان بـوو، پێـی سەرسـام بـوو، بـە شـتێکی گرانبەهـاو ئـارەزوو بۆ کـراوی لـە قەڵەمدا.

**١٣)**- ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾، تاكو ئەوانەی بێبڕوان، پێیانیان پەست بكات، (**الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَبِ، وَغَاظَهُ: أَغْضَبَهُ أشَدَّ الغَضَب**)، (**غيظ**): بریتیە لە ئەوپەڕی تووڕەیی، دەگوترێ: (**غَاظَه**)، واتە: تووڕەی كرد، تووڕە بوونێكی زۆر، كەواتە: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾، یانی: (**لِيُغْضب بِهِمُ الكُفَّار**)، بۆ ئەوەی ڕقی كافرەكانیان پێ هەڵبستێنێ، ئەمە دیارە زانایان وایان لێكداوەتەوە دەڵێ: (**تَعْلِيلٌ لِمَا تَضَمَّنَهُ تَمْثِيلُهُمْ بِالزَّرْعِ الْمَوْصُوفِ مِنْ نَمَائِهِمْ وَتَرَقِّيهِمْ فِي الزِّيَادَةِ وَالْقُوَّةِ، فَعَل اللهِ ذَلِكَ**: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾)، ئەمە هۆكارە دۆزییە بۆ تەشبیهكردنی ئەوان، بە كشتوكاڵ، یان بە درەختێك كە بەوە وەسف كراوە، گەشەی كردووەو زۆر بەرەو پێشەوە چووەو، زیادی كردوەو، بەهێزو پێز بووە، واتە: خوا ﷻ بۆیە وای لێكردن تاكو ڕقی كافرەكانیان پێ هەڵبستێنێ.

ئەوانەی ناحەزی خواو پێغەمبەری خوا ﷺو پەیامی خوان، بێگومان ئەوان تووڕەو پەست دەبن، ئەگەر ببینن پەیڕەوانی دینی خوا لە گەشەكردن و لە نەش و نماو، زیاد بوون و بەرەو پێشچوون دان.

**١٤)**- ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا﴾، خوا ﷻ بەڵێنی داوە بەوانەیان كە بڕوایان هێناوەو كردەوە باشەكانیان كردوون، لێبوردن و پاداشتێكی مەزنیان بداتێ.

لێرەدا خاوەنی (**محاسن التأويل**)، (**جمال الدين القاسمي**)[1]، لە تەفسیرەكەی خۆیدا قسەیەك لە (**إبن كثير**)ەوە نەقڵ دەكات، بەڵام دوایی ڕەخنەی لێ دەگرێ، دەڵێ:

(**قَالَ ابْنُ كَثِير: مِنْ هذه الآية انتَزَعَ الإمام مالك رحمة الله عليه، فِي رواية عنه: تكفير الروافض الَّذِين يُبْغِضُون الصَّحَابة رضي الله عنهم. قال: لأنَّهُمْ يغيظونهم، ومن غاظ الصَّحابة، فهو كافر لهذه الآية، ووافقه طائفة من العلماء على ذلك، ولا يَخْفَاك أن هذا خلاف ما اتفق عليه المحقِّقون من أهل السنة والجماعة، من أنه**

---

(١) ج٢٦ ، ص: ١٠٤.

**لا يُكفَّر أحدٌ من أهل القبلة**)، دەڵێ: (**إبن كثير**) گوتوویەتی: لەم ئایەتەدا ئیمام مالیک ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئەوەی هەڵهێنجاوە لەیەکێک لە ڕیوایەتەکاندا لەوەوە، کە ڕافیزەکانی بە کافر داناون، [شیعەی دوازدەی ئیمامیی کە ڕەفزی جێنیشینایەتیی و حوکمڕانیی هەر سێ خەلیفەی بەڕێز: ئەبوو بەکر و عومەرو عوسمان دەکەن (خوا لێیان ڕازی بێ)]، ئەوانەی هاوەڵان دەبوغزێنن، چونکە ڕقیان لە هاوەڵانەو، هەر کەسێکیش ڕقی لە هاوەڵان بێ، بێبڕوایە، ئنجا (**جمال الدين القاسمي**) دەڵێ: بەڵام تۆ لێت پەنهان نیە، ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە لێکۆڵەرەوان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، (واتە: جەماوەری مسوڵمانان) لەسەری یەکدەنگن، کە هەر کەسێک ئەهلی قیبلە بێ، بە کافر دانانرێ!

بەڵێ، بە گوناهبارو خەتابارو بە لاڕێ دادەنرێ، بەڵام بە کافر لە قەڵەم نادرێ، دیارە شیعەی دوازدە ئیمامییش وەک موعتەزیلەو مورجیئەو قەدەرییەو جەبرییەو ئەوانی دیکە، بە ئەهلی قیبلە لە قەڵەم دراون، بەڵام زانایان خستوویاننە ژێر ناوونیشانی: (**الفِرَق، أهل البدع، أهل الأهواء**)، کۆمەڵە جیابووەکان، شوێن ئارەزوو کەوتووەکان و، داهێنەرەکان، بەو جۆرە ناوانە پێناسەیان کردوون، بەڵام هەر لە بازنەی ئوممەتی پێغەمبەردا ﷺ هێشتوویاننەوە.

شایانی باسە: وەک چۆن ئەوان، واتە: بەشێک لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەم ڕستەیە: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَ﴾، دەکەنە بەڵگە لەسەر لە ئیسلام دەرکردنی شیعەی دوازدە ئیمامیی، دەڵێن: لەبەر ئەوەی ڕقیان لە هاوەڵانە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە بە دڵنیایی ئەوە هەڵەو گوناهێکی گەورەیە، بۆ هەر کەس هاوەڵان ببوغزێنێ، بەڵام جەماوەری مسوڵمانان بە هۆی گوناهانەوە، ئەهلی قیبلەیان لە بازنەی ئوممەت نەبردۆتە دەرێ.

ئنجا هاو کات شیعەش (**مِن**) لە وشەی (**مِنۡهُم**)ی ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم﴾دا، کە دەڵێن: (**مِن**) بۆ هەندێک (**بعض**)ە، واتە: خوا ﷻ

بەڵێنی بەوانە لە هاوەڵانداوە، کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، بەڵێنی پێداون: لێیان ببووڕێ و پاداشتێکی مەزنیان بداتەوە، دەیکەنە بەڵگەی بۆچوونێکی هەڵەیان و دەڵێن: کەواتە: دەگونجێ ئایەتەکە هاوەڵان هەمووان نەگرێتەوە!! بەڵام زۆرینەی مسوڵمانان کە هەندێک لە قۆناغە مێژووییەکاندا بە: (**أهل السنة والجماعة**) ناسراون، دەڵێن (**مِنْ**)، لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوە (**بيانيَّة**) یە، بۆیەش (**مِنْهُم**)، یانی: هەموو ئەوانەی خاوەنی ئیمان و کردەوەی باش بوون لە هاوەڵان، خوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشتێکی مەزنی پێداون.

بەڵام قسەکەی شیعان غەڵەتە، چونکە (**من**) دەگونجێ بۆ بەشێک (**تبعيض**) بێ و، دەشگونجێ بۆ ڕوونکردنەوە (**بيانية**)بێ، بەڵام لێرەدا بەپێی سیاق دیارە کە خوا ﷻ مەدحی هاوەڵان دەکات، ئەوانەی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون، بە تایبەتی ئەو هەزار و چوارسەد (١٤٠٠) کەسەی لە ژێر درەختەکەدا بەڵێن و پەیمانیان پێدا، ئەوانەش کە شیعە دەیانبوغزێنن، بە زۆریی لەنێو ئەو (١٤٠٠) کەسەدان، کە هەر سێ خەلیفە ڕاشیدەکان و هاوەڵە یەک یەکەکانی دیکەن: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و، زوبەیری کوڕی عەووام و، طەڵحەی کوڕی عوبەیدیڵلاو هەموو ئەوانی دیکە، تێکڕایان لە نێو ئەو (١٤٠٠) کەسەدان، بۆیە خوا ﷻ پێش ئەوە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾، بە دڵنیایی خوا ڕازی بوو لە بڕواداران، کە بەڵێنیان بە تۆ دەدا لە ژێر درەختەکەدا، بۆچی؟ ﴿فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ﴾، زانیی چی لە دڵیاندا هەیە، بۆیە ئۆخژن و ئۆقرەیی ناردە سەریان، زانیی چی لە دڵیاندایە! واتە: زانیی کە ئیمان و تەوحیدو بەندایەتیی بۆ خواو یەکلابوونەوە بۆ خوایان لە دڵدا هەیە، خوای پەروەردگار ئەو بەڵێن و موژدە خۆشەی پێیدابوون، زانیویەتی ئەوانە سەرەنجامیشیان چۆن دەبێ! کەواتە: ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی پێشێش، هەر ئەوە دەگەیەنن کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بە تایبەتی ئەوانەی شیعەی دوازدە ئیمامیی ڕق و بوغزیان

لەسەر چڕ دەکەنەوە، کە سێ خەلیفەکانن (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان، پاشان تەڵحەو زوبەیرو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و ئەوانەن و، هەمووشیان لە نێو (١٤٠٠) کەسەکە بوون!!

بەڵام زۆر جاران دەمارگیریی طائیفیی و مەزهەبیی وایکردوە، کە هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان لە تێگەیشتن لە ئایەتەکان بەلاڕێداو بەو لاو لادابچن، لە کاردانەوەی یەکدیدا، کە شیعە گوتوویانە: ئایەتەکە هەمووان ناگرێتەوە، لەولاشەوە هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئێوە مادام ڕقتان لە هاوەڵانە، بەپێی ئەم ئایەتە بە بێبڕوا لە قەڵەم دەدرێن!

کە لە ڕاستییدا هەردووکیان جۆرێک لە زێدەڕۆیی و تێپەڕاندنیان تێدا هەیە، بەڵام بێگومان هەڵوێستەکەی شیعە کە هاوەڵان دەبوغزێنن، پێچەوانەی ئایەتەکانە، ئەو هەموو ئایەتانەی مەدحی هاوەڵان دەکەن، (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوا و سیرەی پێغەمبەریشە ﷺ کە ئەو ئیعتیمادی سەرەکیی لەسەر ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و سەعدو سەعیدو طەڵحەو زوبەیرو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و ئەوانە بووە، پاشان پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقیشە: چۆن دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵە یەکە یەکەکانی، تۆمەتبار بکرێن، گوایە لایانداوە! دیسان ئەوەی شیعە دەیکەنە بیانوو بۆ تۆمەتبارکردنی هاوەڵان، شتێکی بێ بنەماو ئەفسانەیە، کە گوایە پێغەمبەر ﷺ عەلی داناوە! کوا ئەوە لە کوێدا هەیە؟ ئەوە (**نهج البلاغة**): عەلی کوڕی ئەبوو تالیب رضي الله عنه لە یەکێک لە وتارەکانی دا {هەرچەندە (**نهج البلاغة**)، هەمووشی جێی متمانە نیە، بەڵام بە لای کەمەوە لە لای شیعە، جێی متمانەیە}، ئاماژە بۆ ئەوە ناکات کە ئەو ئیمامی مسوڵمانان بووەو خەلیفەی بەهەقیان بووە، بەڵکو ئەوە بە بەڵگە دێنێتەوە دەڵێ: هەر ئەوانە بەیعەتیان بە منداوە، کە بەیعەتیان بە ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان داوە، واتە: ڕەوایەتیی من، بە

هـۆی ئەوانەوەیـە، کـە ڕەوایەتییـان بـە ئەبـوو بەکـرو عومـەرو عوسـمان داوە، ئنجـا ئەگـەر هـی عەلـی ڕەوابـێ، هـی ئەوانیـش ڕەوابـووەو، ئەگـەر هـی ئـەوان نـاڕەوا بووبـێ، هـی ئەویـش هـەر ناڕەوایـە! بـەڵام هەمـوو ئـەو شـتانەی دیکـە، کـە شـیعە بـە بەڵگەیـان دێننـەوە، لـە گێـڕراوان و لـە تێگەیشـتن لـە هەندێـک ئایەتـان، وەک ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (المائدة)شـدا باسـی ئەوەمانکـردوە، عـەلی رضي الله عنه هیـچ کام لەوانـە بـە بەڵگـە ناهێنێتـەوە، کەواتـە: یـان ئەوانـە هیچیـان بـە بەڵگـە ناشـێن، یـان دەبـێ بڵێـن: عـەلی نەیزانیـون!.

## کورتە باسێک: لە بارەی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ

بەڕێـــــزان!

لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەماندا بـە باشـی دەزانـم، کورتـە باسـێک لـە بـارەی خەسـڵەتە بنەڕەتییـەکانی هاوەڵانـی بەڕێـزی پێغەمبـەرەوە ﷺ بکەیـن.

مـن لەبـەر ڕۆشـنایی شـەش کۆمەڵـە ئایەتـدا، سـیی (٣٠) لـە ڕەوشـت و خەسـڵەتە بنەڕەتییـەکانی هاوەڵانـم خـوا لێیـان ڕازی بـێ، هەڵهێنجـاون، ئەویـش لـە مەوسـووعەی: **(الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)**، لـە کتێبـی حەوتەمـدا: **(الكتاب السابع خاتم النبيين محمد ﷺ موجز سيرته وبراهين نبوته ومقامُهُ الرفيع وواجبنا تجاهه)**[1]، چەنـد ئایەتێکم هێنـاون، لـە ئایەتەکانـدا سـیی (٣٠) خەسـڵەتی بنەڕەتیـی هـاوەڵانی بەڕێـزم (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، کـە ئایەتـەکان دەیانگەیەنـن، دەرهێنـاون و هەڵهێنجـاون:

١- یەکەمین ئایەتیان ئەم ئایەتەی سووڕەتی **(الفتح)** ئایەتی ژمارە: بیست و نۆ (٢٩)، کە ئێمە تەفسیرمان کرد.

٢- دووەم لە ئایەتەکان، ئایەتەکانی: (١٨ و ١٩)، هەر لە سووڕەتی **(الفتح)**ن: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾﴾.

٣- ئایەتی ژمارە (١٠٠)ی، لە سووڕەتی **(التوبة)**: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾.

---

(١) چاپی دووەم لە لاپەڕە: (٢٤٦ - ٢٤٩).

٤- ئایەتەکانی: (٨ و ٩)ی سوورەتی **(الحشر)**ن، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩)﴾.

٥- ئایەتەکەی سوورەتی **(التوبة)**یە، ئایەتی ژمارە (٨٨)ە، ﴿لَٰكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٨٨)﴾.

٦- ئایەتەکانی: (١٧٢ - ١٧٤) سوورەتی **(آل عمران)**ن، کە کاتی خۆی لە کتێبەکەدا نەنووسراون، بەڵام ئێستا هێناومن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ (١٧٢) الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ (١٧٤)﴾.

کە ئێمە بە ڕیز پێیاندا دەچین، جارێ لە سوورەتی **(الفتح)**، ئایەتی ژمارە: (٢٩)، دە (١٠) سیفەتمان وەرگرتوون:

**سیفەتی یەکەم:** سەختیی لەسەر بێبڕوایان لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا: ﴿أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ﴾، کەواتە: هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، یەکێک لە خەسڵەتەکانیان ئەوە بووە کە لە بەرانبەر دوژمنانی خواو، ناحەزانی پەیامی خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ توندو زبرو بە دەمار بوون، بەڵام لە حاڵەتی ڕووبەڕوو بوونەوەو جەنگ و بەرەنگاریی دا.

**سیفەتی دووەم:** ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانیی لە نێو خۆیاندا: ﴿رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾.

**سیفەتی سێیەم:** زۆر ڕکووع بردن و زۆر کڕنووش بردن، کە مەبەست پێیان بەرپا کردنی نوێژە: ﴿تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا﴾، کەواتە: لە پەیوەندییان لەگەڵ ئەهلی

ئیمانـدا، نـەرم و نیـان و بـە بەزەییـن و، لەگـەڵ ئەهـلی کوفـرو ناحـەزانی پەیامـی خـوادا، لـە کاتی سـەنگەر لـە یەکدیـی گرتنـدا، زۆر زبـرو بـە دەمـارو تونـدو تیـژن، لـە پەیوەندییشـیان لەگـەڵ خـوادا خـاوەنی ئـەو پـەڕی بەندایەتیـی و، ملکەچییـن بـۆ خـوا، کـە لـە ڕکـووع و سـەجدەدا بەرجەسـتە دەبـێ و، ئەوانیـش دوو پایـەی بنەڕەتیـی نوێـژن.

**سیفەتەکانی چـوارەم و پێنجـەم:** بـە ئامانجگرتنـی بەخششـی خـواو، ڕەزامەندیـی خـوا لـە ژیـانی دنیـادا، کـە مەبەسـت لـە بەخششـی خـوا، بـە هەشـتی خـواو پاداشـتەکەیەتی، کـە لـە بەهەشـتدا بەرجەسـتە دەبـێ، مەبەسـتیش لـە ڕەزامەندیـی خـوا ئەوەیـە، کـە خـوا لێیـان ڕازی بـێ و ئەوانیـش لـە خـوا ڕازیبن: ﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ﴾.

**سیفەتی شەشـەم:** نیشـانەداربوون بـە نیشـانەی بەندایەتیـی بـۆ خـواو چاکیەتیی و پاکیەتیـی، ﴿ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾، نیشـانەیان لـە دەم و چاویاندایـە، بـە هـۆی کاریگەریـی کڕنـووش بردنـەوە.

لـە تـەوڕات دا خـوا بەو وەسـفانە پێناسـەی هـاوەڵانی بەڕێـزو دڵسـۆزی پێغەمبەری خوای کـردوە.

**سـیفەتی حەوتـەم:** بەهێزکـردن و پاڵپشـتی کردنیـان بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺو، پشـتگیریی کردنیـان و هاوکارییکردنیـان بـۆی، وەک خـوا ﷻ لـە ئینجیلـدا بـەو وەسـفە، وەسـفی کردوون، ﴿ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ﴾، کـە خـوا ﷻ پێغەمبەرەکـەی خـۆی ﷺ بـە درەختێکـی پـاک و چـاک شـوبهاندوەو، هاوەڵانیشـی بـەو لقانـەی کـە لـەو درەختـە دەردەچـن و، دوایـی دەبنـە هـۆی بەهێزکـردن و چڕوپڕکـردن و پتەوکـردنی.

**سـیفەتی هەشـتەم:** پشـت بـە خـوا بەسـتن و لەسـەر پێـی خۆ وەسـتان، ﴿ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ﴾، (سُـوقِ) کـۆی (سـاق)ە، واتـە: ئـەو کشـتوکاڵە، ئەگـەر دەغـڵ و دانـە،

لەسـەر لاسـکەکانی و، ئەگـەر دارو درەخـت و باغـە، لەسـەر قـەدو بنکـەکانی خـۆی، وەسـتاوە.

**سـیفەتی نۆیـەم:** ڕازیـی بوونی خـوای پـەروەردگارو پەسـەندکردنی بۆیـان: ﴿ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ ﴾، چونکـە چێنـەری ئـەو کشـت و کاڵـەو نێـژەری ئـەو نەمامـە، خـوای میهرەبان بـوو، واتـە: خـوای ڕەخسـێنەریان ﷻ لێیـان ڕازییە.

**سـیفەتی دەیـەم:** ڕق هەڵسـاندنیان بـۆ کافـران: ﴿ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ﴾، بێگومـان کافرەکانیـش، بۆیـە دەیانبوغزێنـن، چونکـە بـە باشـترین شـێوە هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ ئـاڵای ئاییـن و بەرنامـەی خوایـان بەرزکردۆتـەوەو، دڕکـی کوفریـان شـکاندوە، دڕکـی کوفریـش لـە دەسـتەڵاتی تاغـووت و زۆردارە خۆسـەپێنەکاندا، بەرجەسـتە بـووە.

پێشـتریش باسـمانکرد کـە: ﴿ **الذيـن معه** ﴾، وێـڕای هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبەر ﷺ هەمـوو ئـەوانی دیکـەش دەگرێتـەوە، کـە بـەو ڕێیـەدا ڕۆیشـتوون و، ئـەو خەسـڵەت و سیفەتانەی ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانەیـان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـە خۆیانـدا هێناونـە دی و، لـە دەوری پێغەمبـەر ﷺ و لـە دەوری پەیـام و بەرنامـەی پێغەمبـەری خـوا بـوون، هەرچەنـدە لـە ڕووی جوگرافیـی و کاتـەوە دوور بووبـن.

پێنـج سیفەتەکانی: (١١ و ١٢ و ١٣ و ١٤ و ١٥): لـە ئایـەتی (١٨)ی سـووڕەتی **(الفتح)** دان، کـە خـوا ﷻ تێیـدا فەرموویەتـی:

**سـیفەتی یازدەیـەم:** ڕازییبـوونی خـوا لێیـان: ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ ﴾، خـوا ﷻ لێیـان ڕازییـەو پەسـەندی لای خـوان، کـە بـە پلـەی یەکـەم مەبەسـت ئـەو (١٤٠٠) هاوەڵەیـە، (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، کـە لـە ژێـر درەختەکـەدا لەسـەر جەنـگ کـردن لەگـەڵ دوژمنـدا، پەیمانیـان بە پێغەمبـەردا ﷺ پێش ئـەوەی صوڵحـی حودەیبییـە پێـک بـێ، دوای ئـەوەی پێیـان گەیشـت، کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان عوسـمانی کـوڕی عەففـان ﵁، نوێنـەری پێغەمبەریـان ﷺ کوشـتوە.

بەڵام لە ئایەتی ژمارە (١٠٠)ی سوورەتی (**التوبة**)دا، خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە لە تێکڕای پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان و، لەوانەی بە چاکییش شوێنیان کەوتوون، لە هەموویان ڕازییە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ١٠٠﴾.

کە بێگومان چەمکی ئەم ئایەتە گشتگیرە، بۆ تێکڕای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کە بە کۆچکەران و پشتیوانان وەسفکراون، ئەوانەی کە لە ئیمان هێناندا پێش غەیری خۆیان کەوتوون، هەروەها لە کۆچکردن و فیداکاریی و پشتگرتنی پەیامی خواشدا، هەر بۆیە لە ڕووی زەمەنییەوە پێشکەوتوونەو، لە ڕووی پاداشتیشەوە پێش هەموویان کەوتوونەوە، چونکە دوایی لە پاداشتی هەموو ئەوانەدا بەدوایان کەوتوون بە چاکیی، بەشدار بوون.

**سیفەتی دوازدەیەم:** جێگیربوونی ئەوەی خوا ﷻ خۆشیویستوە لە دڵیاندا کە بریتیە لە ئیمان و بەرهەمەکانی ئیمان: ﴿فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ﴾، خوا ﷻ زانی چییان لە دڵدا هەیە!

**سیفەتی سێزدەیەم:** دابەزاندنی ئۆقرەیی و ئۆخژن بۆ سەر دڵ و دەروونیان: ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ﴾.

**سیفەتی چواردەیەم:** پاداشت دانەوەی خوا بۆیان، بەوە کە دەستکەوت و سەرکەوتنی نیزیکیان بە نسیب بکات: ﴿وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ١٨﴾.

**سیفەتی پازدەیەم:** ڕەخساندنی دەستکەوتانێکی زۆر بۆیان: ﴿وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا﴾.

شەش سیفەتەکانی: (١٦ و ١٧ و ١٨ و ١٩ و ٢٠ و ٢١) کە تێکڕا دەبن بە شەش (٦) سیفەت، ئەمانەش هەموویان لە ئایەتەکانی (٧ و ٨ و ٩)ی سوورەتی (**الحشر**) وەردەگیرێن:

**سیفەتی شازدەیەم:** کۆچکردن و بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵ لە ڕێی خوادا: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ﴾، ئەمە تایبەتە بە هاوەڵانی کۆچکەرەوە ﷺ، لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بە پلەی یەکەم، بەڵام بێگومان دوای ئەوانیش هەر کەسێکی دیکە بە درێژایی مێژوو ئامادە بووبێ، زێدو نیشتیمان و ماڵ و حاڵ و کەس و کاری خۆی لە پێناوی خوادا بەجێ بهێڵێ، چەمکەکەی ئەوانیش دەگرێتەوە.

**سیفەتی حەڤدەیەم:** سەرخستنی دینی خوای بەرزو، ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێز: ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾، پشتگیریی و پشتیوانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن.

**سیفەتی هەژدەیەم:** ڕازانەوە بە ڕاستیی، بە دڵ و بە قسەو بە کردەوە: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ۝٨﴾، ئا ئەوانەن ڕاستانن.

**سیفەتی نۆزدەیەم:** پەنادانی کۆچکەران لە پێناوی خواداو خۆشویستن و پشتگرتنیان: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾، ئەوانەی پێشتر مەنزڵگایان دامەزراندو ئیمانیان لەو مەنزڵگایانەی خۆیاندا سەقامگیر کردووەو، ئەوانەیان خۆش دەوێ کە کۆچیان بۆلا دەکەن، (بۆ ئەوەی هاوکارییان بکەن و بیانحەوێننەوە).

**سیفەتی بیستەم:** حەسوودیی نەبردن بە برا کۆچکەرەکانیان، بەهۆی ئەوەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جار بە جار لە دەستکەوتی جەنگیی پێی داون، وەک قەرەبوو کردنەوەیەک بۆ ئەو ماڵ و حاڵە فەوتاوەیان کە لە مەککە بەجێیان هێشتوە: ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟﴾، لەبەر ئەوەی پێیان دەدرێ، هەست بە ئیرەیی و حەسەدو دڵ ناڕەحەتیی ناکەن.

**سیفەتی بیست و یەکەم:** بەسەرخۆدا هەڵبژاردن لەگەڵ پێویستیی هەبوونی زۆریش دا: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾، (براو خوشکانیان) بە سەر خۆیان دا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان پێویستییان پێی بێ، ئەو

بەسەرخۆدا هەڵبژاردنەش سیفەتێکی یەکجار گەورەیەو، بە زەحمەت مرۆڤ دەیگاتێ.

**سیفەتەکانی بیست و دووەم و بیست و سێیەم:** تێکۆشان بە ماڵ و بە نەفس لە ڕێی خوادا، واتە: بەختکردنی سامان و گیان، کە ئەمە لە ئایەتی ژمارە (٨٨)ی سوورەتی **(التوبة)** وەردەگیرێ، ﴿ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ﴾، بەڵام پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە لەگەڵیدا، بە سامان و گیانیان لە پێناوی خوادا تێکۆشیون.

حەوت وەسفیشیان لە ئایەتەکانی: (١٧٢ - ١٧٤)، سوورەتی **(آل عمران)** وەردەگیرێن:

**سیفەتی بیست و چوارەم:** لە کاتی گرفتاریی و ناڕەحەتییدا بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە چوون: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُ ﴾، ئەوانەی وەڵامی خواو پێغەمبەریان داوەتەوە، دوای ئەوەی برینیان تێبوو بوو و زۆر ناڕەحەت بوو بوون.

مەبەست پێی وەڵامدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ ڕۆیشتن بەرەو جەنگی **(حمراء الأسد)**، کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کافرەکانی قوڕەیشدا مەوعیدیان پێشتر دانا بوو لە **(حمراء الأسد)**، مسوڵمانانیش هەرچەندە لە جەنگی ئوحوددا زۆر زیانیان پێگەیشت و ئازاریان بینیبوو، بەڵام کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی مەوعیدو ژوانگەمان هەیە، لەگەڵ قوڕەیشدا، هەبوو کە بە برینداریی و، هەبوو بە لۆژە لۆژ چوون!

**سیفەتەکانی بیست و پێنجەم و بیست و شەشەم:** خاوەنی پارێزکاریی و چاکەکاریی بوون و، پاداشتی مەزن بوون: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ١٧٢ ﴾، بۆ ئەوانەیان کە چاکەکار بوون و پارێزکار بوون، پاداشتێکی مەزن هەیە.

**سیفەتی بیست و حەوتەم:** ئیمان زیاد بوون بە هەڕەشەی دوژمنان: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾، ئەوانەی کە کۆمەڵێک لە خەڵک پێیان گوتن: خەڵک، واتە: قورەیش بۆتان کۆبوونەوە، ئنجا لێیان بترسێن، بەڵام: هەر ئیمانی زێدەکردن، ئەو هەڕەشەیەو ئەو هەواڵە کە بۆ کەسانی دیکە جێی ئەوە بوو، ئەژنۆیان پێی بلەرزێ، ئەوان ئیمانیان پێ زیاد بوو، تیغی ڕەسەن هەتا شتی پێبڕی زیاتر سپیی و ساف (**صقل**) دەبێ و، زیاتر تیف تیفە دەدرێ!.

**سیفەتی بیست و هەشتەم:** پشت بە خوا بەستن و بێ منەتبوون لە دوژمن: ﴿وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣﴾، گوتیان: خوامان بەسەو باشترین کار پێ سپێردراویش خوایە.

**سیفەتی بیست و نۆیەم:** بەهرەمەندبوون لە چاکەی خواو پارێزران لە زیان: ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾، بە نیعمەتی خواو بەخششی خواوە گەڕانەوەو زیانیان تووش نەبوو، چونکە قورەیش هاتبوون، بەڵام کە هەواڵیان بیست پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بۆیان هاتوونەدەر، بە پەلە ڕۆیشتن و، کۆمەڵێک زادو زەخیرەش کە پێیان بوو، بارگرانیی بوو، بەجێیان هێشت و، بوو بە دەستکەوت بۆ هاوەڵان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ﴾، بە چاکەو نیعمەتی خواوەو بە بەخششی خواوە گەڕانەوە، ﴿لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾، هیچ ناڕەحەتیی و ئازارێکیان تووش نەبوو، هیچ خراپەیەکیان بەسەر نەهات.

**سیفەتی سییەم:** شوێنکەوتنی ڕەزامەندیی خوا: ﴿وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ﴾، ئەمە کۆتا سیفەتیانە، کەوتنە شوێن ڕەزامەندیی خوا، ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ١٧٤﴾، بێگومان خواش ﷻ خاوەنی بەخششی مەزنە.

لە کۆتایی باسی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەم شەش ژمارە دەقەدا، کە لە ئایەتەکانی قورئاندا

وەرمانگرتـن، دەڵێیـن: ئەگـەر ئێمـە بمانـەوێ سـەرژمێری، كـۆی خەسـڵەت و سـیفەتە بنەڕەتییـەكانی هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بكەیـن، لـە هەمـوو قورئانـدا، چ جـای لـە دەقـەكانی سوننەتیشـدا، دەبـێ كتێبێكـی سـەربەخۆی لـە بـارەوە بنووسـین، ئنجا لێـرەدا دەڵێـم:

هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ كـە خـوا ﷻ بـۆ خـۆی چـاك ناسـیونی و، ئـەو هەمـوو مەدحـەشی كـردوون لـەو هەمـوو ئایەتانـەدا، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (**الحديد**) دا، دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾، واتـە: ئەوانەتـان كـە پێـش ئازادكـردنی مەككـە ماڵـی خۆیـان بەخشـیوەو جەنگیـان كـردوە، یەكسـان نیـن، لەگـەڵ ئەوانـەدا كـە لـە دوای ئازادكـردنی مەككـە، بەخشـیویانەو جەنـگاون، دەفەرمـوێ: ﴿ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ﴾، ئەوانـەی پێشـێ پلەیـان مەزنـترە لەوانـەی دوایـی مـاڵ و سـامانی خۆیـان بەخشـیوەو جەنگیشـیان كـردوە، ﴿ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴾، بـەڵام خـوا ﷻ بەڵێنـی پاداشـتی هـەرە چاكـی بـە هەموویـان داوەو، خـواش شـارەزای ئەوەیـە كـە دەیكـەن، ئەوانـەش كـە شـیعە ڕقیـان لێیانـە هەموویـان پێـش ئازادكـردنی مەككـە مسـوڵمان بـوون، بـە عەمـڕی كـوڕی عـاص و، موعاویـەی كـوڕی ئەبـوو سوفیانیشـەوە، كـە لـە سـاڵی حەوتەمـی كۆچییـدا مسـوڵمان بـوون، بـەڵام پیـاوانی وەک ئەبـوو بەكـرو عومـەرو عوسـمان و عەلیـی و تەڵحـەو زوبەیـرو سـەعدو سـەعیدو ئەبـوو عوبەیـدەو عەبدوڕڕەحمانـی كـوڕی عـەوف، هـەر دەیـان لـە یەكەمـە كۆچكـەرەكان بـوون (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بـەڵام خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴾، خـوا گفتـی باشـترین پاداشـتی بـە هەموویـان داوە، یـانی: ئەوانـەی دوای ئازادكـردنی مەككـەش، مسـوڵمان بـوون، خـوا هـەر بەڵێنـی چاكـی پێـداون.

بۆیـە ئێمـە ئەگـەر چـاک لـە ئایەتـەكانی خـوای تـێ بگەیـن و، واقیـع بینانـەش تەماشـای سـیرەو ژیـانی پێغەمبـەر ﷺو هـاوەڵانی بەڕێـزی بكەیـن، ناچـار دەبیـن

ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییمان بۆیان هەبێ، بەڵام سەد حەیف و مخابن لە بەرانبەر هاوەڵان دا شیعە کورتیان هێناوە، هەندێکیش لە کاردانەوەی شیعەدا، تییان پەڕاندوەو هاوەڵانیان بە پارێزراو لە گوناهو هەڵە (**معصوم**) داناوە، کە پارێزراو نەبوون لە هەڵە، بەڵام باشترین کەسانێک بوون کە ئۆممەتی پێغەمبەر پێکدێنن و، ئۆممەت هەرچی دەیکات، هەتا دنیا بە کۆتا دێ، (ئۆممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەو هاوەڵە بەڕێزانە لە پاداشتی هەموویدا بەشدارن، بەڵام بێگومان لێرەشدا مەبەستمان ئەوە نیە بڵێین: هاوەڵان هەموویان وەک یەکن و یەک ئاستن، بەڵکو پێویستە پۆلین (**تصنیف**) بکرێن و، هەر کەسە لە پێگەو پلەی خۆیدا دابنرێ.

خوا پشتیوان بێ لە کاتی تەفسیری سوورەتی (**الحجرات**)دا، کورتە باسێک دەکەین، دەربارەی ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ و، ڕێزگرتنمان لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺو، خزمانی و لە نێویانداو پێش هەموویان هاوسەرانی، ئنجا شوێنکەوتووانیان و دوایی زانایانی نێو ئۆممەتەکەی، هەروەها لەوێ باسی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر دەکەین، کە دەبێ پۆلێن بکرێن، چونکە هاوەڵان هەموویان لە یەک ئاستدا نەبوون، خوای پەروەردگاریش بە یەک ئاست باسی نەکردوون:

أ- ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۝١٠﴾ **الحديد**.

ب- هەروەها: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ ۝١٠٠﴾ **التوبة**.

ج- هەروەها: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا ﷻ لە هەموو ئەوانە ڕازیی بوو، کە لە ژێر درەختەکەدا بەڵێنیان بە تۆ دەدا...

زانایـان دەڵێـن: بـەس یـەک کـەس، ئەویـش کابرایەکـی مونافیـق بـوو خـۆی لـە حوشـترەکەی گرتبـوو، تەنیـا ئـەو نەهـات، بەڵێـن لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ ببەسـتێ، ئـەوانی دیکـە هەموویـان بەڵێنیـان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا بەسـت، بـەس عوسـمان لـەوێ نەبـوو، لـەو کاتـەدا پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی خسـتە نێـو دەسـتی خـۆی و فەرمـووی: ئەمـەش لـە جیاتی عوسـمان ﷺ، دوایـی عوسـمان ﷺ، کـە تانـەی ئەوەیـان لێدا، دەیانگـوت: تـۆ لـە کاتی (**بيعة الرضوان**)دا، لـەوێ نەبـووی، گـوتی: مـن لـەوێ نەبـووم، بـەڵام دەسـتی پێغەمبـەر ﷺ لـە دەسـتی خـۆم چاکـتر بـوو بـۆم!! کەواتـە: ئـەو (١٤٠٠) کەسـە، خـوا لێیـان ڕازیـی بـێ، خـوا ﷻ بـە دەق فەرموویـەتی لێیـان ڕازییـم و فەرمووشـیەتی: ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾، زانـی چییـان لـە دڵـدا هەیـە! هـەر بۆیـە بوغزانـدنی هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـە لایـەن شـیعەی دوازدە ئیمامییـەوە، هەڵەیەکـی زۆر کوشـندەیەو خراپـە بۆیـان، بـەڵام لەگـەڵ هەمـوو ئەوانەشـدا لێکۆڵـەرەوان و سـاغکەرەوان لـە زانایـانی ئەهلـی سـوننەت و جەماعـەت و پێشـەوایان، شـیعەیان بـە هەمـوو ئـەو لادان و غەڵەتانـەوە، کـە غەڵـەتی دیکەشـیان هـەن، هـەر بـە ئەهلـی قیبلـە لـە قەڵـەم داون، هەروەهـا خەڵکـی دیکـەی، کـە ڕەنگـە لادان و هەڵـەی خراپتریشـیان هەبـێ، وەک خەواریـج کـە عەلـی کـوڕی ئەبـوو تاڵیبیـان کوشـتوەو، (**مرجئة و جهمية و معطلة و جبرية و قدرية**)شیان، مـادام ئەهلـی قیبلـە بـوون، گوتوویانـە: (**لا نُكَفِّرُ أَهْلَ قِبْلَتِنَا**)، ئەهلی قیبلەمـان بـە بێبـڕوا لـە قەڵـەم نادەیـن، لـە بازنـەی ئیسـلام نایانبەینـە دەرێ.

ئـەوەش یەکێکـە لـە تایبەتمەندییـەکانی جەمـاوەری مسـوڵمانان کـە هەمیشـە بـە چـاوی ڕەحـم و بەزەیـی تەماشـای کۆمـەڵ و گرووپەکانیـان کـردوە، بـە پێچەوانـەی ئەوانـەوە کـە هەمیشـە هەوڵیانـداوە: زۆرینـەی مسـوڵمانان لـە بازنـەی ئیسـلام بەرنـەدەر، بـەڵام هەمیشـە زۆرینـەی مسـوڵمانان گوتوویانـە: ئەهلـی قیبلـەی خۆمانن و، بـرای دینیمانـن بـا غەڵـەت و پەڵەتیشـیان هەبـێ، هـەروەک (عـەلی ﷺ)، کاتـێ لـە بـارەی خەواریجـەوە لێـی پـرسرا، ئایـا مونافیقـن؟ گـوتی: نەخێـر مونافیـق نیـن، مونافیقـان بـە کەمیـی یـادی خـوا دەکـەن، بـەڵام ئەوانـە عیبـادەت و تاعەتیـان زۆرە.

گوتیان: ئایا کافرن؟ گوتی: نەخێر، لە کوفر ڕایان کردوە، گوتیان: ئەدی چین؟ گوتی: (**إِخْوَانُنَا بغُوا عَلَيْنَا**)، برامانن، بەڵام ستەمیان لێکردووین، بۆیە ئێمەش بەرپەرچمان داونەوە.

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (الفتح).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کە (١)ی مانگی ڕەجەبی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٢/٢٥)ی زایینی، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە ڕوونکردنەوەی مانـاو مەبەستەکانی سـوورەتی **(الحجـرات)**، وەک عـادەتی خۆمـان سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی سـوورەتی **(الحجـرات)** دەخەینـە ڕوو، لـە حـەوت بڕگـەدا.

## پێناسەی سوورەتی (الحجرات) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

تەنیا نـاوی: **(سـورةُ الحُجُـرات)**ی بـۆ بەکارهێـنراوە، ئەویـش بـە هـۆی هاتنی وشـەی **(الحجـرات)**ەوە، لـە ئایـەتی ژمـارە (٤)دا، **(حُجُرات)**یـش کـۆی **(حُجُرَة)**یـە، **(حُجُـرَة)**ش، واتـە: هـۆدە، یـان ژوور، کـە مەبەسـت پێیـان هـۆدەو ژوورەکانی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوان ﷺ، دایـکانی بـڕواداران، کـە دەرگایەکیـان بەسـەر مزگەوتـدا دەکرایـەوەو، دەرگایەکـی دیکەشـیان لـە دەرەوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە سـوورەتێکی مەدینەییـەو، زانایـان لـەو بـارەوە یەکدەنگـن، کـە لـە مەدینـە دابەزیـوە، بـەڵام لـە کتێبـی **(أسـباب النـزول)**ی **(الواحـدي)**دا، هاتـوە: کـە ئایـەتی ژمـارە (١٣)، لـە مەککـە دابەزیـوەو، لـە کاتی ئازادکـردنی شـاری مەککـەدا **(فتح**

**المكّة**)، بەڵام مشتومڕ لەو بارەوە هەیە، هەڵبەتە ئەگەر ئەو ئایەت موبارەکە لە شاری مەککەش هاتبێتە خوار، مادام دوای کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە بووبێ، هەر بە مەدینەیی دادەنرێ، واتە: لە قۆناغی مەدینەدا هاتۆتە خوارو، زۆربەی هەرە زۆری زانایانیش گوتوویانە: ئەم سوورەتی (**الحجرات**)ە، لە ساڵی نۆیەمی کۆچیی دا دابەزیوە، کە بە ساڵی شاندەکان (**عام الوفود**) ناسراوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزینی دا:

ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتیب النزول**)دا، ژمارە (١٠٨)ی هەیە، پێش سوورەتی (**التحریم**)و، لە دوای (**المجادلة**) دابەزیوەو، لە موصحەفیشدا ژمارە (٤٩)یە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

تێکڕای ژمێرەرەرانی ئایەتەکانی قورئان، هی هەموو شارەکان و شوێنەکان گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی (١٨)یە، نە کەمترو نە زیاتر.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

وەک سەرجەم سوورەتە مەدینەییەکان، لەم سوورەتەدا، باسی ژمارەیەک لە یاسا شەرعییەکانی ڕێکخەری کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی کراوە، کە دەتوانین بڵێین: سەرجەم ئەو یاساو حوکمانە یان سەرەکییەکانیان، بریتین لەم دوازدەیە:

١- پێش نەکەوتنەوە لە خواو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە کاتی بڕیاردان و هەنگاوناندا، ئایەتی: (١).

٢- دەنگ هەڵنەهێنان بەسەر دەنگی پێغەمبەری خوادا ﷺو، بە ئەدەبەوە دواندنی، ئایەتەکانی: (٢ - ٣).

٣- ڕەچاوی ئەدەب و حورمەت کردن لە کاتی بانگکردنی پێغەمبەردا ﷺ، ئایەتەکانی: (٤ - ٥).

٤- ساغکردنەوەی هەواڵێک، کە بابایەکی گومانلێکراو، (یان متمانە پێنەکراو) دەیهێنێ، ئایەتی: (٦).

٥- ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆر کاردا بە قسەی خەڵکی کردبایە، دووچاری گرفت و کێشە دەبوون، ئایەتی: (٧).

٦- لە کاتی تێکگیران و دەمەقاڵێ و بەشەڕ هاتنی دوو کۆمەڵ لە مسوڵماناندا، پێویستە ئاشتەواییان لە نێواندا بکرێ و، هەر لایەکیان ستەمی کردو بەردەوام بوو لەسەر ستەم و دەستدرێژیی، بەهێز ڕێی لێ بگیرێ و، بەرپەرچ بدرێتەوە، ئایەتی: (٩).

٧- بڕواداران بران، (برایەتیی ڕاستەقینە هەر لە نێو ئەواندا هەیە)، بۆیە پێویستە ئاشتەوایی لە نێوان دوو کەسی ناکۆکیشدا بکرێ، چ جای دوو کۆمەڵ، کاتێک کە بە گژیەکدا دێن و دەمەقاڵێ و ناکۆکییەکیان دەبێ، ئایەتی: (١٠).

٨- حەڕام و قەدەغەیە مسوڵمانان، گاڵتە بە یەکدی کردن و، عەیب لە یەکدی گرتن و، ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵدانیان، لە نێودا هەبێ، ئایەتی: (١١).

٩- قەدەغەیە مسوڵمانان، گومانی خراپ بە یەکدی بردن و، سیخوڕیی لەسەر یەکدی کردن و، بە خراپە پاشملە باسی یەکدی کردن، (غیبة)یان لە نێودا هەبێ، ئایەتی: (١٢).

١٠- بانگکردنی خوا ﷻ بۆ مرۆڤایەتیی، کە ئاگاداربن! هەموویان لە دایک و بابێکن و، بە مەبەستی پێک ئاشنا بوون و هاوکاریی پێکەوە کردن، بۆ چەند گەل و هۆزێک دابەشکراون، ئایەتی: (١٣).

**١١-** بەرپەرچدانەوەی لاف لێدانی عەرەبە بیابانشینەکان کە گوایە ئیمانیان هێناوەو، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵیان، بەڵام دەتوانن بڵێن: هاتوونە نێو ئیسلامەوەو ملکەچ بوون، ئایەتی: (١٤).

**١٢-** پێناسەی بڕوادارانی ڕاستەقینە، کە ئەوانەن بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، دوو دڵ نین و، بە سامان و گیانیان لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، ئایەتی: (١٥).

هەڵبەتە جگە لەم دوازده (١٢) حوکمە، شتی دیکەش لەم سوورەتەدا زۆرە، کە دوایی پێیان دەگەین، بەڵام پێم وایە ئەم دوازده حوکمە، دوازده حوکمی زەق و بنەڕەتیین، کە لەم سوورەتی **(الحجرات)**دا، هاتوون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئەم سوورەتە موبارەکە، وەک هەر کام لە سوورەتەکان، تایبەتمەندیی زۆرن، بەڵام ئێمە ئاماژە بە زەقترینیان دەکەین، کە ئەم پێنجەن:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** وشەی **(الحجرات)**، کە ناوی سوورەتەکەشە، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، کە پێشتر گوتمان: **(حُجُرات)** کۆی **(حُجرَة)**یە، حوجرەش، واتە: هۆدە، ژوور، شوێنێک کە چوار دیوارێکی بە دەوردا دەکرێ و، ئەصڵی خۆشی بە شوێنێکیان گوتوە، کە بەردی لە دەور کۆ بکرێتەوە، وەک نیشانەدارکردن.

**تایبەتمەندیی دووەم:** لەم سوورەتەدا پێنج جاران وشەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، هاتوەو، هەر جارەی بۆ فێرکردنی ئەدەبێکی گەورەو گرنگ بە مسوڵمانان، وەک **(فخر الدين الرازي)** ڕەحمەتی خوای لێبێ، لە تەفسیرەکەیدا[1] ئاماژەی پێداوە:

**یەکەمیان:** ئەدەب لەگەڵ لەگەڵ خوادا، کە لە ئایەتی ژمارە: (١)دا هاتوە.

**دووەمیان:** ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە ئایەتی ژمارە: (٢)دا.

---

(١ ) التفسير الكبير، ج٢٦، ص١٠٧.

**سێیەمیان:** ئەدەب لەگەڵ مسوڵمانێکی لادەردا، کە هەواڵێک دێنێ، ئایەتی ژمارە: (٦).

**چوارەمیان:** ئەدەب لەگەڵ مسوڵمانانی ئامادەدا، کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، ئایەتی ژمارە: (١١).

**پێنجەمیان:** ئەدەب لەگەڵ مسوڵمانانی نادیاردا، کە لەو کاتەدا ئامادە نین و نا ئامادەن، ئایەتی ژمارە: (١٢).

**تایبەتمەندیی سێیەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا، لە دوو ئایەتدا، باسی قەدەغەکردنی شەش گوناهی گەورە: (سێی ئاشکراو سێی پەنهان)، لە بواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا کراوە، ئایەتەکانی ژمارە: (١١ - ١٢).

**تایبەتمەندیی چوارەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا باسی دروستکرانی مرۆڤایەتیی لە دایک و باپێک و دابەشکردنیان بۆ چەند گەل و هۆزێک، بە مەبەستی پێک ئاشنا بوون و یەکدیی ناسین، کراوە، لە ئایەتی ژمارە: (١٣)دا.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا، ئیسپاتی ئیسلام بۆ عەڕەبە بیابانشینەکان و، لابردنی ئیمان لێیان کراوە، لە ئایەتی ژمارە: (١٤).

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئەم هەژدە (١٨) ئایەتەمان، بۆ چوار دەرسان دابەش کردوون، کە سێ دەرسیان یەکی پێنج ئایەتن و، دەرسێکیشیان سێ ئایەتە.

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی ژمارە: (١ - ٥)، واتە: پێنج ئایەتی سەرەتا کە تێیان دا باسی ئەدەب و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ڕێک و پێک و بە ئەدەب، لە خزمەت خوا ﷻو، پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکرێ.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی ژمارە: (٦ - ١٠)، واتە: پێنج ئایەتی دووەم، کە تێیان دا باسی چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ هەواڵی بابای لاڕێ و، چارەسەری

کێشەو شەڕی نێوان دوو کۆمەڵ لە مسوڵماناندا کراوە، کە بە زۆریی بە هۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵی ناڕاست و دروستەوە پەیدادەبێ.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی ژمارە: (١١ - ١٣)، واتە: سێ (٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تێیان دا باسی خۆ پاراستن لە هەموو ئەو ڕەفتارو خەسڵەتانەی مایەی تێکدانی پەیوەندییەکانن، کراوە، بە تایبەتی هەر شەش گوناهو تاوانی: گاڵتە بەیەکدی کردن و، عەیب لە یەکدی گرتن و، ناوو ناتۆرە لە یەکدی نان، پاشان گومانی خراپ بە یەکدی بردن و، سیخوڕیی لەسەر یەکدی کردن و، بە خراپە پاشملە باسی یەکدی کردن.

**دەرسی چوارەم و کۆتایی:** پێنج (٥) ئایەتی کۆتایی، کە ئایەتەکانی ژمارە: (١٤ - ١٨)ن، پێناسەی ئیسلام و ئیمان و مامەڵە لەگەڵ کەسانێکدا کە خۆیان بە مسوڵمانەتیی هەڵدەکێشن، هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە تەنیا خوا چاکەو بەخششی بەسەرخەڵکەوە هەیەو، تەنیا خوا منەتی هەیە لەسەر خەڵک و، خەڵک منەتباری خوان، نەک خوا سبحانه وتعالى، یان پێغەمبەری خوا ﷺ منەتباری هیچ کەس بن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرســەمان لـە ئایەتـەکانی ژمـارە: (١ - ٥)، پێنـج ئایـەتی سـەرەتای ئـەم سـوورەتە پێـک دێ، کـە تێیانـدا بـاسی ئـەدەب و شـێوازی هەڵسـوکەوت لەگـەڵ خـوای بـەرزو مـەزن، پاشـان پێغەمبەرەکـەی موحەممـەددا ﷺ کـراوە، کـە بێگومـان هـەر کەسـێکیش ڕۆڵـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بگێـڕێ، لـە هـەر ڕوویەکـەوە لـە نێـو مسـوڵماناندا، ئەویـش پێویسـتە لـە قـەدەر خـۆی ئـەو ئـەدەب و ڕێـزەی لەگەڵـدا ڕەچـاو بکـرێ، بـە بەڵگـەی فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ: {**مَـنْ أَطَاعَنِـي فَقَـدْ أَطَـاعَ اللَّـهَ، وَمَـنْ يَعْصِنِـي فَقَـدْ عَـصَى اللَّـهَ، وَمَـنْ يُطِـعِ الأَمِـيرَ، فَقَـدْ أَطَاعَنِـي، وَمَـنْ يَعْـصِ الأَمِـيرَ فَقَـدْ عَصَـانِي**} (**أخرجـه البخـاري: ٢٧٩٧، ومسـلم: ١٨٣٥**).

واتـە: هـەر کەسـێک فەرمانبەریـی مـن بـکات، فەرمانبەریـی خـوای کـردووە، هـەر کەسـێ سـەرپێچیی مـن بـکات، سـەرپێچیی لـە خـوا کـردووە، هـەر کەسـێک فەرمانبەریـی فەرماندەکـەی بـکات، (کـە بـە شـێوەیەکی ڕەواو شـەرعیی بەسـەریەوە کراوەتـە فەرمانـدە)، ئـەوە فەرمانبەریـی منـی کـردووە، هـەر کەسـێک سـەرپێچیی لـە فەرماندەکـەی بـکات، سـەرپێچیی لـە مـن کـردووە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ
بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ
عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ٣

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ
تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هیچ (بڕیارو کارێک) مەخەنە پێش خواو پێغەمبەرەکەیەوە (و پێشیان مەکەون)و، پارێز لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا بیسەری زانایە ﴿١﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دەنگتان ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر مەخەن و، وەک دەنگ بەرزکرنەوەتان بەسەر یەکدیدا، بە دەنگی بەرز مەیدوێنن، نەوەک بێ ئەوەی هەست پێبکەن، کردەوە چاکەکانتان پووچەڵ ببنەوە ﴿٢﴾ بێگومان ئەوانەی لە لای پێغەمبەری خوا دەنگیان نزم دەکەنەوە، ئەوانە خوا دڵیانی بۆ پارێزکاریی تاقیکردۆتەوەو (پاڵفتە کردوە)، لێبوردنێک و پاداشتێکی مەزنیان هەیە ﴿٣﴾ بەڕاستیی (ئەی پێغەمبەر!) ئەوانەی لە پشت هۆدەکان (ی هاوسەرەکانت)ەوە، بانگت دەکەن، زۆربەیان نافامن ﴿٤﴾ ئەگەر خۆیان گرتبایە تاکو (بە شێوەی ئاسایی) دەچوویە دەر بۆ لایان، باشتر بوو، خواش لێبوردەی بە بەزەییە}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ): (أَي: لَا تَتَقَدَّمُوهُـما، وَحَقِيقَتُـهُ لَا تَسـبِقُوهُمَا بِالقَـولِ وَالحُكـمِ، بَـلِ افعَلُـوا مَـا يَرسُـمَاهُ لَكُـم)، (لَا تُقَدَّمُـوا بَـيْنَ يَـدَيِ اللـهِ وَرَسُـولِه)، واتـە: پێشـیان مەکەونـەوەو، ماهییـەتی پێشـکەوتنەوەکەش، واتـە: قسـەو بڕیـار لـە پێـش ئەوانـدا مەڵێـن، بەڵکـو ئـەوەی ئـەوان بۆتـان دیاریـی دەکـەن، ئەنجامـی بـدەن.

(لَا تُقَدِّمُـوا)، خوێندراویشـەوتەوە: (لَا تَقَدَّمُـوا)، واتـە: پێـش مەکەونـەوە، کـە (لَا تُقَدِّمُـوا)ش، وەک دوایـی بـاسی دەکەیـن، دەگونجـێ هـەر بـە مانـای پێـش کەوتنـەوە بـێ، واتـە: دەگونجـێ بـە حاڵـەتی (لازم)ی هاتبـێ، دەشـگونجێ حاڵـەتی (مُتَعَدِّي) هەبێ، واتـە: (لا تُقَدِّمُـوا شَـيْئاً)، هیـچ شـتێک بـە پێـش خـواو پێغەمبـەری خـوا مەخـەن.

(وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ): دەنگـی بـۆ بـەرز مەکەنـەوە، دەنگتـان بەسـەر دەنگیـدا بـەرز مەکەنـەوە، (جَهْـرَ: يُقَـالُ: لِظُهُـورِ الـشَّيءِ بِإِفْـرَاطِ حَاسَّـةِ البَـصَرِ، أَو حَاسَّـةِ السَّـمْعِ، كَلَامٌ جَوهَـرِيٌّ وجَهِـير: رَفِيـعُ الصَّـوْت)، (جَهْـر): بـە دەرکەوتنـی شـتێک دەگوتـرێ، کـە زۆر بـۆ هەسـتی چـاو یاخـود هەسـتی بیسـتن زەق بـێ، دەگوتـرێ: (كَلَامٌ جَوهَـرِيٌّ، وجَهِـير)، کـە دەنگەکـەی بـەرز بـێ و، ئـەو قسـەیە بـە دەنگـی بـەرز بکـرێ.

(ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ): خـوا ﷻ دڵیـانی تاقـی کردۆتـەوە، دەڵـێ: (المَحْـنُ وَالإِمتِحَـانُ: نَحْـو الإِبتِـلاءِ، إِمْتَحَـنَ قُلُوبَهُـم: أَخْلَـصَ قُلُوبَهُـم وَصَفَّاهَـا)، (مَحْـنُ)و (إِمْتِحَـان): وەک (بَـلاء) و (إِبتِـلاء)ەو، واتاکەیـان لێـک نیزیکـە، هەردووکیـان بـە مانـای تاقیکردنـەوەو جەڕبانـدن دێـن، (إِمتَحَـنَ اللـه قُلُوبَهُـمْ لِلتَّقْـوَى)، واتـە: دڵییـانی سـاغکردۆتەوەو پاڵفتـە کـردوە، تاکـو شایسـتەی ئـەوە بـێ، پارێزکاریـی بچێتـە نێـو.

(ٱلْحُجُرَٰتِ): (جَمْـعُ الحُجُـرَة، أَوِ الحُجْـرَة، مِثْـلُ: الغُرْفَـة وَالغُـرُف)، (حُجُـرات) کـۆی (حُجُـرة) و (حُجْـرَة) یـە، وەک (غُرفَـة)و (غُـرُف)، هەڵبەتـە (غُرفَـة)و (غُرُفات)یـش هاتوە

لـە قورئانـدا، (وَفِي الأَصْلِ: الحُجْـرَةُ حَظِـيرَةُ الإِبِـلِ، وَحَجَـرَهُ: أَيِ مَنَعَـهُ، وَالمَـكَانُ المَحجُـور الَّـذِي جُعِـلَ حَوْلَـهُ حِجَـارَة)، لـە ئەصڵـدا حوجـرە بـە تەویلـەی حوشـتر دەگوتـرێ، (وَحَجَـرَهُ: أَيِ مَنَعَـهُ)، واتـە: ڕێـی لـێ گـرت، قەدەغـەی کـرد، (وَالمَـكَانُ المَحْجُـور) شـوێنێ کـە بـەردی بـە دەورەوە داندرابـن، پێـی دەگوتـرێ: (مَحجُـور)، واتـە: دەور گیـراو.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

**١)-** هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ...﴾، لەو بارەوە دوو ڕیوایەتان دێنین:

**یەکەم:** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمِّرِ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدِ بْنِ زُرَارَةَ، قَالَ عُمَرُ: بَلْ أَمِّرِ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا أَرَدْتَ إِلَّا خِلَافِي، قَالَ عُمَرُ: مَا أَرَدْتُ خِلَافَكَ، فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ ...﴾ حَتَّى انْقَضَتْ ) (أخرجه البُخاري: ٤٣٦٧، ٤٨٤٧}.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دەڵـێ: شـاندێک لـە بەنـوو تەمیـم هاتـن بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ (دیـارە هاتـوون و دانیشـتوون) ئەبووبەکـر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گـوتی: (الْقَعْقَـاعِ بْـنِ مَعْبَـدِ بْـنِ زُرَارَة) بکـە بـە فەرماندەیـان، عومەریـش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گـوتی: بەڵکـو (الْأَقْـرَعِ بْـنَ حَابِـس) بکە بـە فەرماندەیـان، ئەبـوو بەکـر گـوتی: هـەر ویسـتت پێچەوانـەی مـن قسـە بکـەی! عومـەر گـوتی: نەمویسـت پێچەوانـەی تـۆ قسـە بکـەم، ئیـدی لـەو بـارەوە مشـت و مڕیـان بـوو، هەتـا دەنگیـان بـەرز بـۆوەو، لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـە موبارەکـە هاتـە خـوار: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، ئەمـە هـۆی هاتنـە خـواری یەکـەم بـوو، بـۆ ئـەم ئایەتـە موبارەکـە.

ب- {عَنْ مَسْرُوقٍ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ مِن رَمَضَان، فَقَالَتْ: يَا جَارِيةُ! خَوِّصِي لَهُ سوِيْقاً، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَتْ: تَقَدَّمْتَ الشَّهْرَ؟ فَقُلْتُ: لاَ وَلكِنِّي صُمْتُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، فَوافَقَ ذَلِكَ هَذَ الْيَوْم، فَقَالَتْ: إِنَّ نَاسَاً يَتَقَدَّمُونَ الشَّهْرَ فَيَصُومُونَ قَبْلَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَنزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، (أخرجه الطَّبَراني فِي الأَوسَط: ٢٧١٣، «وذَكَرَهُ السِّيُوطِي فِي الدُّرِّ المَنْثور: ج٧، ص٥٤٧، وَزادَ نِسبَتَهُ لابنِ مُردَوَيه، وَأَخرَجَهُ الدَّارَقُطنِي فِي المُؤتَلَف وَالمُختَلَف: ج٢، ص٥٩٧، قُلنا: وَإِسنادُهُ صَحِيح، وَرِجالُهُ ثِقاتٌ، وَفِي الجُملَةِ: الحَدِيثُ بِمَجمُوعِ ما تَقَدَّمَ ثابِتٌ لا رَيْبَ)[1].

واتـە: لـە مەسـڕووقەوە (کـە یەکێکـە لـە زانایـانی شـوێنکەوتووانی هـاوەڵان و لـە دوای هـاوەڵان هاتـوون)، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، گێڕدراوەتـەوە کـە چۆتـە لای عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لـەو ڕۆژەدا کـە دوو دڵیـی هەبـووە، داخـۆ ڕەمەزانـە؟ (ئایـا یەکـی ڕەمەزانـە، یاخـود سییەمی شـەعبانە)؟ دایکـمان عائیشـەش گوتوویـەتی: ئـەی کەنیـزەک! (کەنیزەکێـک و خزمەتچییـەک بـووە لـە ماڵیانـدا)، ڕێـزی بگـرەو سـەویقی بـۆ بێنـە، (سـەویق: شـۆربایەکە لـە گەنـم و جـۆ کـە دەهـاڕدرێ، دروسـت دەکـرێ)، ئەویـش گوتوویـەتی: مـن بـە ڕۆژووم، دایکـمان عائیشـەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گوتوویـەتی: ئایـا پێـش مانگـی ڕەمـەزان کەوتـووی؟ (واتـە: پێـش ئـەوەی ڕەمـەزان بـێ، تـۆ بـە ڕۆژووی؟) گوتـم: نـا، بـەڵام مانگـی شـەعبان هەمـووی پـێ بووم و، ئەمـڕۆش ڕێکـەوت بـووە لەگـەڵ ڕۆژووەکـەی خۆمـدا، (واتـە: ئەمـڕۆ بـە حیسـابی مـن سییەمی شـەعبانە)، دایکـمان عائیشـەش پێـی دەڵـێ: کەسـانێک لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ پێـش ئـەوەی پێغەمبـەر بـەڕۆژوو بـێ، مانگـی ڕەمەزانیـان دەسـت پـێ دەکـرد، خـوا (عَـزَّ وَجَـلّ) ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾.

هەڵبەتـە ئـەم ئایەتـە چ لـە بـارەی شـاندەکەوە هاتبـێ، چ وەک دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: لـە بـارەی ئـەوەوە هاتبـێ کـە بـەر لـەوەی پێغەمبـەر ﷺ

---

(١) الإِستِيعاب فـي بَيان الأَسباب ج ٣ ص٢٥٥،٢٥٤.

دەست بكات بە گرتنی مانگی ڕەمەزان، خەڵكێك دەستیان پێ كردبێ، گرنگ ئەوەیە بەسەر هەردووك ڕووداوەكاندا چەسپاوە.

٢)- لە بارەی دابەزینی ئەم ئایەتە موبارەكەوە كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾، لەو بارەشەوە دوو ڕیوایەتان دێنین:

أ- { عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ كَادَ الْخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا رَفَعَا أَصْوَاتَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَدِمَ عَلَيْهِ رَكْبُ بَنِي تَمِيمٍ فَأَشَارَ أَحَدُهُمَا بِالْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الْآخَرُ بِرَجُلٍ آخَرَ، قَالَ نَافِعٌ لَا أَحْفَظُ اسْمَهُ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: مَا أَرَدْتَ إِلَّا خِلَافِي، قَالَ مَا أَرَدْتُ خِلَافَكَ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فِي ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾، قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فَمَا كَانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ هَذِهِ الْآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذَلِكَ عَنْ أَبِيهِ يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ) (أخرجه البُخاري: ٤٨٤٥، ٧٣٠٢، قَالَ الحافِظُ فِي فَتح الباري: ج٨، ص٥٩٠، ثُمَّ هَذَا السِّيَاقُ صُورَتُهُ الإِرْسَالُ لَكِنْ ظَهَرَ فِي أَخِرِهِ أَنَّ ابْنَ مُلَيْكَةَ حَمَلَهُ عَن عَبْدِ اللهِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، وَسَيَأْتِي فِي هَذَ البابِ الَّذِي بَعْدَهُ التَّصرِيحُ بِذَلِك).

ئیبنو ئەبوو مولەیكە، دەڵێ: خەریك بوو دوو پیاوە هەرە باشەكان بفەوتێن، ئەبوو بەكرو عومەر، بەهۆی ئەوەوە كە دەنگیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەرز كردەوە، كاتێك كە شاندی بەنوو تەمیم هاتن بۆ خزمەتی، یەكێكیان ئاماژەی بۆ پێغەمبەر كرد ﷺ ئەقرەعی كوڕی حابیس دابنێ، واتە: سەرۆكی هۆزی بەنی موجاشیع، ئەوی دیكەشیان ئاماژەی بۆ پیاوێكی دیكە كرد، نافیع دەڵێ: ناوەكەیم لە یاد نیە، ئەبوو بەكر بە عومەری گوت: هەر ویستت پێچەوانەی من قسە بكەی! عومەر گوتی: نەمویستوە پێچەوانەی تۆ قسە بكەم، دەنگیان لەوبارەوە بەرز بووەوە، لەو بارەوە خوای بەرز ئەو ئایەتەی نارده

خـوار: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! دەنگـی خۆتـان ڕەسـەر دەنگـی پێغەمبـەر مەخـەن ﷺ و دەنگـی بـۆ بـەرز مەکەنـەوە، وەک دەنـگ لەگـەڵ یەکـدی بـەرز دەکەنـەوە، نـەوەک کردەوەکانتـان هەڵبوەشـێنەوە، بـێ ئـەوەی هەسـت پـێ بکـەن، دەڵـێ: دوای ئـەوە عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، کـە قسـەی لـە خزمـەت پێغەمبـەردا دەکـرد ﷺ هێنـدە دەنگـی نـزم دەکـردەوە، وەک دەنگـی نەبیسـتێ، هەتـا دەیفەرمـوو: چیـت گـوت؟ دەڵـێ: بـەڵام عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر ئـەوەی لـە بـارەی بابیـەوە، (واتـە: لـە بـارەی باپیریـەوە بـابی دایکـی، بـابی ئەسـماء کـە ئەبـوو بەکـرە) نەگێڕاوەتـەوە.

(حافـظ **إبـنُ حَجـر العَسـقَلاني**) لـە (**فتـح البـاري**)دا، گوتوویـەتی: ئـەم گێڕدراوەیـە بـە موڕسـەل دادەنـرێ، کـە یەکسـەر لـە تابیعییـەوە کـە (**ابْـنُ أَبِي مُلَيْكة**)یـە، بـەرز کراوەتـەوەو، بـاسی هـاوەڵ نەکـراوە، بـەڵام لـە کۆتاییەکـەی دا دەرکەوتـوە کـە (**ابْنُ أَبِي مُلَيْكـة**) ئەمـەی لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـرەوە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) وەرگرتوە.

ئـەوەش کـە دەڵـێ: لـە بـارەی بابیـەوە ئـەوەی بـاس نەکـردوە، وانیـەو، لـە بـارەی ئەبـوو بەکریشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، وەک دوایـی بـاسی دەکەیـن، هـەر هەمـان شـت هاتـوە، کـە عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، هێنـدە بـە نزمیـی قسـەی کـردوە، پێغەمبـەر ﷺ لێـی پرسـیوەو، جارێکـی دیکـە قسـەکەی بـۆ کـردوە، بـۆ ئـەوەی گوێبیسـتی بـێ.

**ب-** {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ:** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾، **جَلَسَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ فِي بَيْتِهِ، وَقَالَ: أَنَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَاحْتَبَسَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ، فَقَالَ يَا أَبَا عَمْرٍو: مَا شَأْنُ ثَابِتٍ، أَشْتَكَى؟ قَالَ سَعْدٌ: إِنَّهُ لَجَارِي وَمَا عَلِمْتُ لَهُ بِشَكْوَى، قَالَ: فَأَتَاهُ سَعْدٌ**

**فَذَكَرَ لَهُ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: ثَابِتٌ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي مِنْ أَرْفَعِكُمْ صَوْتاً عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ سَعْدٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَلْ هُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ) (أخرجه البخاري: ٣٦١٣ و ٤٨٤٦، ومسلم: ١١٩).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک (خوا لێی ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە کە کاتێک ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾، سابیتی کوڕی قەیس لە ماڵێ دانیشت، گوتی: من ئەهلی ئاگرم و، نەچوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەعدی کوڕی موعاذی پرسی فەرمووی: ئەی ئەبا عەمر! سابیت چییەتی، ئایا نەخۆشە؟ سەعد گوتی: دراوسێمەو نەشمزانیوە نەخۆش بێ، ئیدی سەعد چوو بۆ لای و قسەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ باس کرد، سابیت گوتی: ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار، خۆشتان دەزانن کە من دەنگم لە هەمووتان بەرزترە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە من بەپێی ئەو ئایەتە بێ، خەڵکی دۆزەخم، سەعد ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: {**بَلْ هُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ**}، بەڵکو ئەو خەڵکی بەهەشتە.

چونکە ئەو هەر دەنگەکەی وابووەو ئەوە نەبووە کە لە ڕووی کەمتەرخەمییەوە، دەنگ هەڵبڕێنێ بەسەر دەنگی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

**٣)-** هۆی هاتنە خوارەوە ئەو ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئەوانەی لە پشت هۆدەکانەوە بانگت دەکەن، زۆربەیان نافامن، ئەگەر خۆیان مەرزەم بکردبایە، تاکو دەچوویە دەر بۆ لایان، (بە شێوەی ئاسایی)، بۆوان باشتر بوو و، خوا لێبووردەی بە بەزەییە.

لەوبارەوەش ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

{عَـنْ أَبِي سَـلَمَةَ بْـنِ عَبْـدِ الرَّحْمَـنِ، عَـنِ الأَقْـرَعِ بْـنِ حَابِـسٍ، أَنَّـهُ أَتَى النَّبِـيَّ صَـلَّى الله عَلَيـه وسَـلَّم، فَقَـالَ: يَـا مُحَمَّـد! إِنَّ حَمْـدِي زَيْـنٌ، وَإِنَّ ذَمِّـي لَشَـيْنٌ؟ فَقَـالَ: ذَاكَ اللَّـهُ، فَأَنْـزَ اللـهُ تَعَـالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾) (أَخرَجَـهُ أَحمَـد فـي المُسـنَد: ج٣، ص٤٨٨، ج٦، ص٣٩٣، ٣٩٤)، وَالطَّـبَري فِي جامِـعِ البَيـان: ج٢٦، ص٧٧، وَالطَـبَرَانِي فِي الكَبِـير: ٨٧٨، قـال مؤلِّفـا الإسـتِيعاب فِي بَيـانِ الأَسـباب: قُلْنَـا وَسَـنَدُهُ صَحِيـحٌ، وَصَحَّحَـهُ شَـيخُنا الأَلبـانى فِي صَحِيـحِ التِّرمِـذِي: ٢٦٠٥).

واتـە: ئەبـوو سـەلەمەی کـوڕی عەبدوڕڕەحـمان لـە ئەقرەعـی کـوڕی حابیسـەوە دەگێڕێتـەوە: کـە چۆتـە لای پێغەمبـەر ﷺو گوتوویـەتی: ئـەی موحەممـەد! سـتاییش کـردنی مـن ئینسـان جـوان دەکات و، سـەرکۆنەو زەمکـردنی مـن، ئینسـان ناشـیرین دەکات، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: ئـەوە خوایـە، (کە هەر کەسـێ سـتاییشی بـکات، جـوان دەبـێ و، هـەر کەسـێک سـەرکۆنە بـکات، ناشـیرین دەبـێ)، خـوای بـەرز لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بـە نـاوى خـواى بـە بەزەیـى بەخشـندە، واتـە:

دەستپێكردنم بە ناوى خوایە، مەبەستیش پێى ئەوەیە:

١- ئەم كارە تەنها بۆ خوا دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێى شەرعى خوا دەكەم.

٣- ئەم كارە بە تواناو یارمەتیى خواى پەروەردگار دەكەم.

٤ - ئەم كارە بۆ هێنانەدى ڕەزامەندیى خوا ئەنجام دەدەم.

دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئـەى ئەوانـەى بڕواتـان هێنـاوە! پێـش دوو دەسـتى خـواو پێغەمبەرەكـەى مەكـەون، واتـە: پێشـیان مەكەونـەوە لـە هیـچ بڕیارێـك و لـە هیـچ كارێكـدا، یاخـود هیـچ كارو بڕیارێـك پێـش ئـەوان مەخـەن، هەتـا نەزانـن خـوا ﷻو، پێغەمبەرەكـەى ﷺ لـەو بـارەوە چییـان فەرمـووەو، چـى دەفەرمـوون؟ ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾، پارێزیـش لـە خـوا بكـەن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، بـە دڵنیایـى خـوا بیسـەرى زانایـە، سـەرجەم قسـەو هەڵسـوكەوتەكانتان، دەزانـێ: هەرچـى ڕەنگـى هەیـە دەیبینـێ و، هەرچـى دەنگـى هەیـە دەیبسـتێ، خـوا هەمـوو شتێكیشـتان دەزانـێ، تەنانـەت نیازو مەبەسـتى نێـو دڵیشـتان، ئـەم ئایەتـەى یەكـەم، وەك لـە پێناسـەى ئـەم سوورەتەشـدا گوتمـان: بـاسى ئەدەبـە لـە خزمـەت خـواى پـەروەردگاردا، مرۆڤـى بـڕوادار هەتـا نەزانـێ هـەر شـتێك خـوا ﷻ چـى لـە بـارەوە فەرمـووەو، فەرمایشـتى خـوا كـە قوڕئانـە، چـى لـەو بـارەوە ڕاگەیانـدوە؟ هـەر لەخـۆوەو بـە پێخواسـیى بـە نێـو ناكـەوێ، هەروەهـا دواى خـوا ﷻ، پێغەمبـەرى خاتـەم موحەممـەد ﷺ ئەگـەر شـتێك لـە قوڕئانـدا نەبـوو، دەگـەڕێ بزانـێ پێغەمبـەر

ﷺ لەو بارەوە چی كردووەو چی فەرمووە؟ لە ڕێبازەكەی ئەودا لەو بارەوە چی هاتوە، پێی پابەند دەبێ، ئەگەرنا ئەوجار لە چوارچێوەو لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، عەقڵی خۆی دەخاتە كار، بۆ چۆنیەتیی مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا كە هاتۆتە بەر دەمی.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! (یانی: ئەی بڕوادارینە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ هەڵمەهێنن، دەنگی خۆتان ڕەسەر دەنگی ئەو مەخەن، ﴿ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ ﴾، دەنگی بۆ هەڵمەهێنن و دەنگ بەرز مەكەنەوە، لە كاتێكدا دەیدوێنن، وەک دەنگ بەرز كردنەوەی هەندێكتان بەسەر هەندێكتاندا، ﴿ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾، نەبادا كردەوەكانتان پووچەڵ ببنەوە، بێ ئەوەی هەست پێ بكەن، واتە: (**أَنْ لاَ تَحبَطَ أَعْمَالُكُم**)، بۆ ئەوەی كردەوەكانتان پووچەڵ نەبنەوە بێ ئەوەی هەست پێ بكەن، یاخود: (**كَرَاهَةَ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُم وَأَنْتُم لا تَشْعُرُون**)، چونكە ناخۆشە كردەوەكانتان هەڵبوەشێنەوە، بێ ئەوەی هەست پێ بكەن، لە ئەنجامی ڕەچاو نەكردنی ئەدەب و ڕێزو حورمەت، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی دەنگی خۆیان نزم دەكەنەوە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، لە دەنگی خۆیان دەگرنەوە، چونكە (**غَضّ**) واتە: (**نَقص**)، كەمی كرد، یانی: لە دەنگی خۆیان كەم دەكەنەوەو، لە دەنگی خۆیان دەگرنەوە، دەنگی خۆیان كپ دەكەن، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەدوێنن، یان هەر لە كۆڕو مەجلیسی ئەودا، لەگەڵ یەكدیشدا قسە بكەن، دەنگ هەڵناهێنن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾، ئەوانە كەسانێكن خوا دڵی بۆ پارێزكاریی تاقیكردوونەوە، یاخود دڵیانی پاڵفتە كردووەو خاوێن كردۆتەوە، تاكو پارێزكاریی بچێتێ، ﴿ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴾، لێبوردنێک و پاداشتێكی مەزنیان بۆ هەیە، لێبوردنێكی ناوازەو، پاداشتێكی مەزن، بۆ ئەوان

هەیە، لەسەر ئەو ئەدەب و ڕێزو حورمەت ڕەچاوکردنە، لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ و لە کۆڕو مەجلیسیدا.

ئنجا خوا ﷻ باسی جۆرێکی دیکە لە ڕەچاو نەکرنی ئەدەب و ڕێز دەكات، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئەویش نەک لە کۆڕو مەجلیسی دا، بەڵکو لە کاتی بانگکردنیدا: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە پشت هۆدەکانەوە، لە پشت ژوورەکانەوە بانگت دەکەن، زۆربەیان نافامن.

هۆی هاتنە خوارەوەکان کە باسمان کردن، هەم هی ئایەتی یەکەم، هەم هی ئایەتی دووەم و سێیەم و چوارەمیش، تیشکی باشترو زیاترمان بۆ دەخەنە سەر چەمک و واتای ئایەتەکان، هەڵبەتە مەبەست لە: (**حُجُرات**) كۆی (**حُجُرَة**) و (**حُجْرَة**)یە، حوجرەیە، بە مانای هۆدە، ژوور، بۆچی نەیفەرمووە: (**مِن وَرَاءِ البُيُوت**)؟ چونکە (**بَيْت**) بە کۆی ماڵەکە دەگوترێ و، (**دار**) بە فراوانتر لە ماڵیش دەگوترێ، جاری وایە چەند ماڵێک لە (دار)ێک دان، یانی: گەڕەک، بەڵام (**حُجُرات**) ئەو هۆدانەن کە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ تێیاندا نیشتەجێ بوون، کە نۆ هۆدە بوون و، بەسەر مزگەوتەوە بوون، دەرگایەکیان دەچۆوە نێو مزگەوت و، دەرگایەکیان دەبێ لە دەرەوەی مزگەوت بووبێ، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێک بیەوێ سەردانیان بکات، ناچار نەبێت هەمیشە لە نێو مزگەوتەوە بێ، کە دواتر تیشکی زیاتر دەخەینە سەر شێوەو هەڵکەوتەی ئەو نۆ ژوورە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوسەرانی بەڕێزی بەسەر مزگەوتی خۆیەوە دروستی کردبوون.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانەی لە پشت ژوورەکانەوە بانگی تۆ دەکەن، زۆربەیان نافامن، بێگومان هەشیان بووە، ئەو زەم و سەرزەنشتە هەڵنەگرێ، بۆیە فەرموویەتی: زۆربەیان، یاخود زۆربەیان مەبەست هەموویانە، چونکە لە زمانی عەرەبییدا جاری وایە: زۆربە (**أَكثَر**) یان زۆر (**كَثِير**)، بە مانای هەموو (**كُلّ**) دێ، بەڵام وا پێدەچێ هەر مانا ڕواڵەتییەکەی مەبەست بێ، واتە: زۆربەیان نافامن،

چونکە خەڵکیشیان لەگەڵدا هەبووە کە مەرج نیە بەو جۆرە بانگی پێغەمبەری کردبێ، بەڵام ئەو کەسەی وەک ڕیش سپی لەگەڵیان بووە، بەو جۆرە بانگی پێغەمبەری کردوە ﷺ بەڵام وانەبووە هەموویان هێندە بێ سەلیقە بن!.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەگەر ئەوانەش خۆیان مەرزەم کردبایە، چاوەڕێیان کردبایە، تاکو دەچوویە دەر بۆ لایان، واتە: تاکو لە حاڵەتی ئاسایی خۆتدا دەچوویە دەر بۆ لایان، نەک لەو کاتەدا کە ئەوان دەیانەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ وەک لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە: پشووی داوە لەو کاتەدا، پشووی پێش نیوەڕۆ، سەرخەوێکی شکاندوە یان: لە حاڵەتێکی دیکەی نا ئاسایی دابووە، لەگەڵ هاوسەرو خێزانیدا، دانیشتوە، یان لەگەڵ هاوسەریدا کۆ بۆتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ئەگەر چاوەڕێیان کردبایەو خۆیان مەرزەم کردبایە، تاکو دەچوویە دەر بۆ لایان، واتە: بە حاڵەتی ئاسایی خۆت.

ئنجا ئەو تەعبیرە بە ڕاشکاویی لەو ئایەتەدا نیە، بەڵام هەر شتێ بە سەلیقەو عەقڵ بزانرێ، خوا ﷻ کتێبی خۆی پێ قەڵەباڵغ نەکردوە، واتە: (**حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِم خُرُوجاً عَادِيّاً**)، یان (**حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِم كَعَادَتِكَ فِي الخُرُوج**)، تاکو دەردەچوویە لایان وەک حاڵەتی ئاسایی خۆت، ئەگەر وایان کردبایە، ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەوە بۆ ئەوان باش بوو، (**خَيْراً**)، وەک جاری دیکەش گوتوومانە: (**خير**) و (**شرّ**)، وەک چۆن مانای باشتردانان (**تَفضِيل**)یان هەیە، (**هَذَا شَرٌّ مِن هَذَا، وَهَذَا خَيرٌ مِن هَذَا**)، ئەمە لە ئەمە خراپترەو، ئەمە لەمە چاکترە، مانای ئەصڵی چاکەو خراپەشیان هەیە، بەبێ لەبەر چاوگرتنی بەراورد پێکردن لەگەڵ شتێکی دیکەدا، واتە: چاک و خراپ، ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەوە بۆ وان باش بوو، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، خوا ﷻ لێبوردەی میهرەبان و بە بەزەییە، واتە: خوا ﷻ بەڵێ ئەدەبیان دادەداو، سەرزەنشتیان دەکات، بەڵام لەسەر ئەوەندە لێیان تووڕە نابێ، سزایان بدات، چونکە لێبوردەی میهرەبانە، بە تایبەت ئەگەر ئەوان چاو بەو هەڵسوکەوتە نەشیاوو، نەگونجاوەی خۆیاندا بگێڕنەوە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**قەدەغەکردنی خوا لە بڕواداران کە هیچ بڕیارو کارێک پێش خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بخەن و، هۆشیارکردنەوەیان بە پارێزکردن، چونکە خوا بیسەری زانایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ①﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە جاری یەکەمە لەو سوورەتەداو، بە پلەی یەکەم باسی ئەدەب و ڕێزە لە خزمەت خوای پەروەردگاردا، چونکە وەک لە ئیمام فەخرەددین ڕازییەوە، هێنامان: ئەم سوورەتە پێنج جاران: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ی، تێدا دووبارە بۆتەوە، هەرجارە جۆرە ئەدەبێکی تێدا فێری بڕواداران کراوە، جاری یەکەم ئەدەبیان لە مامەڵە لە خزمەت خوای پەروەردگاردا.

٢)- ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئەمە بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە، یەکەم: (**لَا تُقَدِّموا بَيْنَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ**)، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (**لَا تَقَدَّمُوا**)، (**لَا تَقَدَّمُوا**)، واتە: پێش مەکەونەوە، کە لە ئەصڵی خۆیدا (**لَا تَتَقَدَّمُوا**)یە، بەڵام ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟﴾، دوو مانای هەن:

أ- دەگونجێ لە (**قَدَّمَ**)ی (**لازِم**)بێ، یانی: (**تَقَدَّمَ**)، چونکە (**قَدَّمَ**) هەم حاڵەتی لازیمی هەیە، (**قَدَّمَ مُحَمَّدٌ**)، واتە: موحەممەد پێشکەوت، بەڵام (**قَدَّمَ مُحَمَّدٌ الكِتابَ**)، موحەممەد کتێبەکەی خستە ڕوو (پێشکەش کرد)، ئەمە حاڵەتی (**مُتَعَدِّي**)یەتی.

ئنجا ئەگەر (لَا تَقَدَّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ)، مەبەست پێی حاڵەتە (لازِم)ەکەی بێ، ئەوە لە: (قَدَمَ، يَقدُمُ، قُدوماً، أي تَقَدَّمَ)، لەوەوە هاتوە، واتە: پێش مەکەونەوەو، پێش دوو دەستی خواو پێغەمبەرەکەی مەکەونەوە ﷺ دەگوترێ: (قَدَّمَ بَيْنَ يَدَيهِ وَتَقَدَّمَ)، واتە: پێشی کەوتەوە، (أي: لا تَتَقَدَّمُوا عَلَيهِما)، واتە: پێشیان مەکەونەوە، هەتا دەزانن خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى چی دەفەرموێ و، پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرموێ، لە خۆوە بڕیارێک مەدەن و، هەنگاوێک مەنێن و، کارێک مەکەن.

**ب-** بەڵام (لَا تُقَدِّمُوا)، وەک چۆن حاڵەتی لازیمی هەیەو، بە مانای (لَا تَقَدَّمُوا)یە، پێش مەکەونەوە، حاڵەتی (مُتَعَدِّي)یشی هەیە، کە ئەو کاتە پێویستیی بە بەرکار (مَفْعُولٌ بِهِ) ێک دەکات، کە قرتێنراوەو بە مەزەنەکردن دەزانرێ، (أَي: لَا تُقَدِّمُوا أَمْراً أَو قَوْلاً)، واتە: هیچ کارێک یان هیچ قسەیەک پێش مەخەن، لە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها دەشگونجێ بەرکار (مَفعُولٌ بِهِ)ەکەی، قرتێندرابێ، بە بێ مەزندەکردن، وەک (فُلانٌ يُعطِي وَيَمنَع)، فلان دەبەخشێ و دەست دەگرێتەوە، واتە: بەبێ ڕەچاو کردن و لەبەر چاو گرتنی بەرکارێک، (لَا تُقَدِّمُوا)، هیچ شتێک پێش مەخەن، بێ ئەوەی شتەکە باسکرابێ، ئنجا ئایا قسەیە، کردەوەیە، هەنگاونانە، هەرچی هەیە؟

لێرەدا ئەوەی جێی سەرەنجە ئەوەیە، کە بە هەردوو حاڵەتی خوێندنەوەکە چ: (لَا تَقَدَّمُوا) بێ، پێش مەکەونەوە، چ: (لَا تُقَدِّمُوا)، بێ، کە دیسان بە مانای پێش کەوتنەوەش دێ و، بە مانای وەپێش خستنی شتێکیش دێ، بە هەردوو خوێندنەوەکە، ئەم پێکهاتەیە وێچواندنە بە حاڵی کەسێک کە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى و لە پێغەمبەرەکەی ﷺ قسەیەک دەکات، یان بڕیارێک دەدات، هەنگاوێک دەنێ، بێ ئەوەی بزانێ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ چییان فەرمووە، وێچواندنیەتی بە حاڵی کەسێک کە پێش کەسێک دەکەوێتەوە لە ڕۆیشتنیداو، دەیخاتە پشت خۆیەوە، ڕووی وێچواندن (وَجْهُ الشَّبْه)ەکەش، بریتیە: لە (الإِنْفِرَادُ عَنهُ فِي الطَّرِيق)، خۆڵێ لێ تاککردنەوە لە ڕێدا، یانی: ئەو دەخاتە

پشت خۆیەوەو خۆی بەتەنێ دەڕوا، خۆبەسەرانە دەڕواو مل لێ دەنێ، کە ئەوە حاڵەتێکی لێ نەوەشاوەیە لەگەڵ مرۆڤی بڕوادارا.

بێگومان هۆی هاتنە خوارەوەکانیش تیشکی زیاتر دەخەنە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتەو، ئێمە لەو بارەوە دوو ڕیوایەتمان هێنان.

زانایان لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە قسەی زۆریان گوتوون و، بە تەعبیرو دارشتنی جۆراو جۆر، هەوڵیانداوە چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکە ڕوون بکەنەوە، بۆ وێنە:

**یەکەم:** **(الطبري)**، لە **(إِبنُ عَبَّاس)**ەوە، (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هێناویەتی کە گوتوویەتی: **(لَا تَقُولُوا خِلَافَ الكِتابِ وَالسُّنَّه)**، **(جامع البيان: ٣١٧٢٧)**، پێچەوانەی کتێب و سوننەت مەڵێن.

**دووەم:** هەروەها (الطبري) هەر لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆیی و بابی ڕازی بێ)، ئەم تەعبیرەشی هێناوە: **(نُهُوا أَنْ يَتَكَلَّمُوا بَيْنَ يَدَي كَلَامِهِ)**، **(جامع البيان: ٣١٧٢٨)**، لێیان قەدەغە کراوە کە قسە بکەن پێش فەرمایشتی خوا ﷻ، یان پێش فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**سێیەم:** لە موجاهیدەوە - کە قوتابی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس بووە، (خوا لە خۆیی و بابی ڕازی بێ)و یەکێک بووە لە زانایانی زۆر شارەزا لە تەفسیرداو لە تابیعین بووە - هاتوە کە بۆ تەفسیرو لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە گوتوویەتی: **(لاَ تَفْتَاتُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ بِشَيءٍ حَتَّى يَقْضِيهِ اللهُ عَلَى لِسانِهِ)** **(جامع البيان: ٣١٧٢٩)**، واتە: هیچ شتێک پێش پێغەمبەری خوا مەڵێن و لێی پێش مەکەونەوە و، پشتاوی مەکەن، تاکو خوا ﷻ لەسەر زمانی ئەو بڕیار دەدا.

**چوارەم:** دیسان هەر **(الطبري)** لە قەتادەوە، کە قەتادەش یەکێک بووە لە زانایانی تابیعین و لە تەفسیردا زۆر شارەزا بووە، هێناویەتی کە گوتوویەتی: **(ذُكِرَ لَنَا أَنَّ نَاساً كَانوا يَقُولُونَ:**

لَو أُنْزِلَ فِي كَذَا لِوَضْعِ كَذَا وَكَذَا، قالَ: فَكَرِهَ اللهُ ذَلِك)، (جامع البيان: ٣١٧٣٠)، قەتادە گوتوویەتی: بۆمان باسكراوە كە كەسانێک هەبوون دەیانگوت: ئەگەر لەو بارەوە فڵان ئایەت دابەزیبایە، لە بارەی فڵان شت و فڵان شتەوە، خواش ئەوەی پێ ناخۆش بوو، بۆیە ئەو ئایەتە موبارەكەی ناردە خوار، كە پێشنیاران مەكەن بۆ خوا ﷻ.

**پێنجەم:** (الطبري) لە (**الحسن البصري**)یەوە هێناویەتی كە گوتوویەتی: (**أُنَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ذَبَحُوا قَبْلَ صَلاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَومَ النَّحرِ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ أَنْ يُعِيدُوا النَّحْرَ**)، (**جامع البيان:** ٣١٧٣١)، واتە: كۆمەڵێک لە مسوڵمانان لە پێش ڕۆژی قوربانیی سەربڕیندا، [واتە: ڕۆژی دە (١٠)ی (**ذِي الحِجَّة**)]، قوربانییان سەر بڕی، پێش نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ [كە نابێ پێش ئەوەی نوێژەكە بكرێ، قوربانییەكە سەر ببڕدرێ، دەبێ سەرەتا نوێژ بكرێ، ئنجا قوربانییەكە سەر ببڕدرێ، ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾الكوثر]، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردن كە قوربانیی سەر بڕینەكەیان دووبارە بكەنەوە، ئەوەی پێش نوێژ سەریان بڕیوە بۆیان حیساب ناكرێ، دەبێ دووبارەی بكەنەوە، ئنجا لەو بارەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

بێگومان هەموو ئەو تەعبیرانەو، هۆی هاتنەوە خوارەوەكانیش كە باسمان كردن، هەموویان لە چوار چێوەی ئەو چەمكە گشتییەی ئەم ئایەتە موبارەكەدا دەسووڕێن، كە بریتیە لەوەی مسوڵمان نابێ بە پێخواسیی بە نێو بكەوێ و، بڕوادار دەبێ تەماشا بكات بزانێ، خوا ﷻ لەو بارەوە چی فەرمووە، ئەگەر شتەكە ڕوون و ئاشكرا بێ، بە ئاشكرا زاندراو بێ، جا چ بە هۆی نەقڵەوە، چ بە هۆی عەقڵەوە، ئەوە دیارە، بەڵام ئەگەر حوكمەكەی دیار نەبێ، دەبێ چاوەڕێ بكات، داخۆ خوا ﷻ چی دەفەرموێ، یان پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووەو، چی دەفەرموێ؟

لەم ئایەتە موبارەكە چەند حوكمێک وەردەگیرێن، دەیانخەینە ڕوو، هەڵبەتە زیاتریشی لێوەردەگیرێن، بەڵام ئێمە ئەو چوارەمان لێ هەڵبژاردوون:

١- شەرعزانان گوتوویانە: بابای ئەركدار (**مكلَّف**)، هیچ كارێک ناكات و ناچێتە نێو هیچ كارێكەوە، ئەگەر قسەیەكە، ئەگەر كارێكە، هەنگاوێكە، هەتا حوكمی خوای لە

بارەوە نەزانێ، کە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟ بَیْنَ یَدَیِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، مەبەست پێی ئەوەیە: دروست نیە، شتێک کە حوکمەکەی بۆ تۆ زاندراو نیە، نەک ئەوەی بە عەقڵ زاندراوەو ئاشکرایە چییە، یان بە نەقڵ زاندرابێ، بەڵکو شتێک کە حوکمەکەی نەزاندراوە، دەبێ چاوەڕێ بکەی تاکو حوکمەکەیت بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئنجا هەنگاوی بۆ بنێی.

**٢-** بەڵام لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنە نیە، یاخود: لە کاتێکدا کە ئایەتێکی قورئانمان پێ شک نایەت لەو بارەوەو، دەقێکی سوننەتیش نیە، ئەوە نەک هەر ڕەوایە، بەڵکو پێویستە مسوڵمان کۆشش **(إجتهاد)** بکات، بۆ ئەوەی حوکمی شەرع بۆ ئەو شتەی هاتۆتە پێشی، بیزانێ، وەک لە فەرموودەکەی موعاذدا هاتوە، کە زۆربەی زانایان هێناویانە، بەڵێ هەندێک لە بارەی سەنەدەکەیەوە قسەیان کردوە، بەڵام زانایانی زۆر موعتەبەر گوتوویانە: نێوەڕۆکەکەی زۆر ڕاستە، ئەگەر لە ڕووی سەنەدەکەشیەوە ئیشکالێک هەبێ، کە دواتر (سند)ەکەی دێنین و دەقەکەشی بە چەند ڕیوایەتێک هاتوە، ئەمە یەکێکیانە:

**{أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ لَهُ: «كَيْفَ تَقْضِي إِذَا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ؟»، قَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟»، قَالَ: أَقْضِي بِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْهُ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ»، قَالَ: أَجْتَهِدُ بِرَأْيِي لاَ آلُو، قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ: «الْحَمْدُ للَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ، لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ»} (أخرجه الطيالسي: ٥٥٩، وأحمد: ٢٢٠٦٠، والطبراني: ٣٦٢، والبيهقي في السنن: ٢٠١٢٦، وعبد بن حميد: ١٢٤، والدارمي: ١٦٨، والحديث أصله في سنن أبي داود: ٣٥٩٢، والترمذي: ١٣٢٧، ١٣٢٨، وقال: لا نعرفه إلاَّ من هذا الوجه، وليس إسناده عندي بمتصل).**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن و پێی فەرموو: چۆن دادوەریی دەکەی، ئەگەر کێشەیەکت بۆ هاتە پێش؟ گوتی: بە

کتێبی خوا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لە کتێبی خوادا حوکمەکەیت چنگ نەکەوت؟ گوتی: بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لە ڕێبازی پێغەمبەری خواشدا ﷺ حوکمەکەیت چنگ نەکەوت؟ گوتی: عەقڵی خۆم بەکاردێنم و کەمتەرخەمییش ناکەم، موعاز گوتی: پێغەمبەر ﷺ دەستی لە سینگ دام و فەرمووی: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە نێردراوی ڕەوانەکراوی خوای سەرکەوتوو کردوە بۆ شتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەسندی دەکات.

**٣-** ئەم ئایەتە موبارەکە بناغەیە، لەوەدا کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺو دەقەکانی سوننەت چۆنن، دەبێ ئاوا شوێنیان بکەوین، بەڵام هەوڵبدەین بە باشترین شێوەو بەڕاسترین شێوە لێیان تێبگەین، ئەگەرنا دوای ئەوەی لێی تێگەیشتین و لەوە دڵنیابووین کە پێغەمبەر ﷺ ئاوای کردوە، یان ئاوای فەرمووە، لە ڕاستییدا هیچ ڕێیەکمان بۆ نەماوەتەوە، جگە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ.

**٤-** ئەوانەی کە گوتوویانەو ئەم ئایەتە موبارەکەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر بەرپەرچدانەوەی قیاس، (قیاس)یش ئەوەیە: شتێک کە حوکمەکەی دیارە، شتێکی دیکە کە حوکمەکەی دیار نیە، لەبەر ئەوەی لە هۆکاری ڕەوابوون، یان ڕەوانەبووندا یەکن، دووەمیشیان پێوانە بکرێتە سەر هی یەکەمیان.

ئنجا هەندێکیان کە قیاسیان بەرپەرچداوەتەوە، ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوەو گوتوویانە: ئەوەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: هیچ شتێک وە پێش خواو پێغەمبەری خوا ﷺ مەخەن!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگەی ئەوە، چونکە کارکردن بە قیاسی ڕاست و دروستیش، هەر کارکردنە بە کتێبی خواو بە ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار کە لە سوورەتی (**الحشر**)دا، دەفەرموێ:
﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ۝١ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم

﴿مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾﴾ الحشر.

﴿فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ﴾، یانی: ئەی خاوەن عەقڵینە! پەند وەربگرن، واتە: پەند وەربگرن و ئێوەش کارێک مەکەن وەک ئەوەی بەنوو ننەضیر کردیان، هۆزی بەنوو ننەضیری جوولەکە کە پەیمان شکێن بوون، بۆ ئەوەی هەمان بەڵا کە بەسەر ئەوان هات، بەسەر ئێوەش نەیەت! بێگومان ئەوەش قیاسە، واتە: ئەوان پەیمانیان شکاندو لە مەدینە دەرکران و ئاوایان بەسەر هات، ئنجا ئێوەش و خەڵکی دیکەش ئەگەر پەیمان شکێنیی بکەن، واتان بەسەر دێ، کەواتە: کارکردن بە قیاسی ڕاست و دروست، هەر کار کردنە بە قورئان و بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

### مەسەلەی دووەم:

**ڕێگریی کردنی خوا ﷻ لە دەنگ هەڵێنان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ و بە دەنگی بەرزو زل دواندنی، کە مایەی پووچەڵ بوونەوەی کردەوە باشەکانەو، بە پێچەوانەوەش ئەوانەی خوا ﷻ دڵی بۆ پارێزکاریی پاڵاوتوون، لە کاتی دواندنی پێغەمبەردا ﷺ دەنگیان نزم دەکەنەوە، ئەوانە لێبوردنێکی تایبەت و پاداشتێکی مەزنیان لە لای خوا ﷻ هەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە جاری دووەمە لەم سوورەتەداو، بە تایبەت بریتیە لە باسکردن و خستنە ڕووی ئەدەبێکی بەرزو جوان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ.

٢)- ﴿ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ ﴾، دەنگی خۆتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ، لێرەدا وشەی (**جَهْر**): بە مانای دەرکەوتن و ئاشکرا بوونە، بەڵام بەرزکردنەوەی دەنگ خوازراوەتەوە، بۆ دەنگ هەڵێنان، بە شێوەیەک کە سنووری حاڵەتی ئاسایی ببەزێنێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ ﴾، (**أَي مُتَجَاوِزَةً إِيَّاهُ**)، دەنگەکانتان با لە ڕووی بەرزییەوە، لە دەنگی پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ نەکات.

٣)- ﴿ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ ﴾، لە کاتی دواندندا قسە لەگەڵ کردنی و دواندنی دا، دەنگ بەسەر دەنگیدا هەڵمەهێنن، وەک چۆن دەنگ بۆ یەکدی

هەڵدەهێنن و دەنگ بەرز دەکەنەوە لە یەکدی، لە کاتی دواندندا لە ئاست پێغەمبەردا ﷺ دەنگ هەڵمەهێنن و بەرز مەکەنەوە.

٤)- ﴿أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، نەبادا کردەوەکانتان پووچەڵ ببنەوە، بێ ئەوەی هەست پێ بکەن، کە دەفەرموێ: ﴿كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ﴾، (أَي: كَعادَةِ بَعْضِكُم مَعَ بَعضٍ فِي الحَدِيث)، واتە: وەک عادەت وایە، ئەگەر دۆست و برادەرن پێکەوە بە جۆرێک قسە دەکەن، دەنگ بەسەر دەنگی یەکدیدا هەڵدێنن و، بەسەر یەکدی دا دەقیرێنن، بەڵام لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نابێ بەو شێوەیە قسە بکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، ئەمە ڕێزمانزانان بە سێ شێوە لێکیان داوەتەوە:

أ- (خَشْيَةَ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُم)، لە ترسی ئەوەی کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە.

ب- (كَرَاهَةَ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُم)، واتە: لەبەر ئەوەی پێ ناخۆش بوون هەیە کە کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە.

ج- (أَنْ لاَ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُم)، بۆ ئەوەی کردەوەکانتان هەڵنەوەشێنەوە، لە حاڵێکدا کە ئێوە هەست پێ ناکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، دەپرسین: ئایا هەندێ لە کردەوە خراپەکان، کردەوە چاکەکان هەڵدەوەشێننەوە؟

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە[1]، بە دڵنیاییەوە بە هۆی کوفرەوە هەموو کردەوەکان هەڵدەوەشێنەوەو، ئەوەش لە دەقی قورئاندا هاتوە: ﴿حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾﴾التوبة، بەڵام ئایا لێرەدا مەبەست پێی چییە؟ زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (محمد)دا کورتە باسێکمان لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی کردەوە چاکەکانەوە کردوە.

**١-** ئەدەبی خراپ لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ خاوەنەکەی پەلکێش دەکات بەرەو کوفر، چونکە بەردەوام بوون لەسەر هەندێ گوناهو، جڵەو شل کردن بۆ نەفس بۆ هەندێ گوناهو تاوانان، نەفس عادەت پێ دەکات و خووی پێوە دەگرێ و، وردە وردە دەچێتە دوێ و دەچێتە دوێ و سەر دەکێشێ بۆ کوفر.

**٢-** یاخود مەبەست لە: ﴿أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ﴾، یانی: بەشێک، یاخود زۆربەی کردەوە باشەکانتان هەڵدوەشێنەوە.

**(الطبري)** بەم تەعبیرە، ئەم ئایەتە موبارەکە ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: **{يَاأَيُّهَا الَّذِينَ صَدَّقُوا اللهَ وَرَسُولَهُ! لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُم فَوْقَ صَوْتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ تَتَهَجَّمُونَهُ بِكَلَامِ وَتُغْلِظُونَ لَهُ فِي الخِطَابِ: ﴿وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ﴾، وَلَا تُنَادُوهُ كَمَا ينادي بَعْضُكُم بَعْضَاً بِاسْمِهِ: يَا مُحَمَّد، يَا أَحْمَد، وَلَكِن فخِّمُوهُ، وَاحْتَرِمُوهُ، وَقُولوا لَهُ قَوْلاً لَيِّنَاً، وَخِطَابَاً حَسَنَاً، بتَعْظِيم، وَتَوْقِير: يَا نَبي الله، يَا رَسُول الله}**، (أخرجه: الطبري: ج٢٦، ص١٢٠، عن مجاهد: ٣١٧٣٦، عن قتادة: ٣١٧٣٧، عن الضَّحاك: ٣١٧٣٨)،

واتە: ئەی ئەوانەی خواو پێغەمبەرەکەیتان بەڕاست داناون! دەنگەکانتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوەو، بە شێوەیەکی ترش و تاڵ قسەی لەگەڵدا مەکەن و، لە دواندنی دا قسەی زبر مەکەن، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ﴾، دەفەرموێ: هەروەها بانگی مەکەن و مەیدوێنن، وەک هەندێکتان هەندێکتان دەدوێنن، کە بڵێن: ئەی موحەممەد! ئەی ئەحمەد! بەڵکو بە قسەیەکی نەرم و، دواندنێکی جوان و، بە بەرز گرتن و، بەرێز لێگرتنەوەو، بە هەیبەت و حورمەت بۆ پاراستنەوە، بڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ڕەوانەکراوی خوا!.

٥)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی دەنگی خۆیان نزم دەکەنەوە لە لای پێغەمبەری

خوا ﷺ، ئەوانە ئەو کەسانەن، کە خوا ﷻ دڵی تاقی کردوونەوە بۆ پارێزکاریی، (واتە: دڵی پاڵاوتوون و پاڵفتە کردوون)، لێبوردنێکی ناوازەو، پاداشتێکی مەزنیان بۆ هەیە.

(**الغَضُّ: خَفْضُ العَيْنِ**)، (**غَضّ**)، بریتیە لە، لە نیگای چاوگرتنەوە، (**وَهُوَ هُنَا مُسْتَعَارٌ لِخفضِ الصَّوْتِ، وَالمَيْلِ بِهِ إِلَى الإِسرار**)، لێرەدا وشەی (**غَضّ**): (کە لە ئەصڵدا بە مانای گرتنەوەیە لە ڕوانین و نیگای چاو)، خوازراوەتەوە بۆ دەنگ نزمکردنەوەو، بردنی دەنگ بەرەو ئەوە، کە بە کپیی و بە پەنهانیی قسە بکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰ﴾، (**الإِمْتِحَانُ: الإِخْتِبَارُ، وَالتَّجْرِبَةُ، وَهُوَ إِفْتِعَالٌ مِنْ مَحَنَهُ أَي: اخْتَبَرَهُ، وَاللَّامُ: لامُ العِلَّةِ لِلتَّقْوَى، إِمْتَحَنَ قُلُوبَهُم لأَجْلِ التَّقْوَى، أَي: لِتَكُونَ فِيهِ التَّقْوَى وَلِتَكُونُوا أَتْقِيَاءَ**)، وشەی (**إمتِحان**) بە مانای تاقی کردنەوەو جەڕباندنە، کە (**إفتِعال**)ە، لە (**مَحَنَهُ**)، (**مَحَنَهُ: أَي: اخْتَبَرَهُ**)، تاقیکردەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰ﴾، ئەم (ل)ە، (**لامُ العِلَّة**)ی پێ دەڵێن، لامی هۆکار، واتە: خوا دڵیانی تاقی کردۆتەوە، لە پێناوی پارێزکاریی دا، واتە: بۆ ئەوەی پارێزکاریی بچێتێ، یان بۆ ئەوەی پارێزکار بن.

## پێنج هەڵوەستە لە بەردەم ئەو دوو ئایەتە(٣و٤ی الحجرات)دا

**١- هەڵوەستەی یەکەم:** ئەم دوو ئایەتە ستایشێکی گەورەیان تێدایە، بۆ هەر کام لە ئەبوو بەکرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەردوو وەزیرەکەی پێغەمبەر ﷺ، چونکە هۆی هاتنە خوارەوەکان، یەکێکیان پەیوەندیی هەبوو بەو دوو بەڕێزەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەنگیان هەڵێناوە، بەڵام دوای ئەوە ئەوەندە دەنگیان نزم دەکردەوە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ جاری وا هەبوو ناچار دەبوو بفەرموێ: چیت گوت؟ وەک لەم گێڕدراوەیەدا هاتوە: (**قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فَمَا كَانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ هَذِهِ الْآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذَلِكَ عَنْ أَبِيهِ يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ**) (**أخرجه البُخارِي: ٤٨٤٥، ٧٣٠٢**)، واتە: عومەر خوا لێی ڕازی بێ، لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتە، وای نەدەکرد پێغەمبەر ﷺ ببیستێ تاکو بۆ خۆی داوای لێ دەکرد، دەیفەرموو: چیت گوت؟ بەڵام ئەوەی لە بارەی باییەوە باس نەکردوە.

بەڵام جێی سەرنجە کە تەفسیرە شیعییەکان بۆ وێنە: (**تَفسِير المِيزان**)[١]ی (**الطباطبائي**)، هەروەها تەفسیری (**الكاشف**)، هی (**محمد جواد مغنية**)[٢]، ئەم هۆی هاتنە خوارەوەیان هەر باس نەکردوە، تەفسیری (نمونە)ش کە تەفسیرێکی فارسییە، هی ناصری مەکاریمی شیرازیی[٣]، هێناویەتی، بەڵام هەر ئەوەندەی هێناوە کە بە حیساب زەم و نوقسانیی بۆ ئەبوو بەکرو عومەر تێدایە، خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵام ئەوەی کە مەدحی بۆ ئەوان تێدایە، لەو بارەوە بێ دەنگییان

---

(١) ج ١٨، ص٣١٧.

(٢) ج٧، ص١٠٧

(٣) ج٢٢، ص١٣٥.

لێ كردوه، كه بەڕاستیی زۆر جار دەمارگیریی مەزهەبیی وادەكات، كه تێگەیشتن لە ئایەتەكانی بەلاڕێدا ببردرێ و كەم و كوڕیی تێدا پەیدابێ.

**٢- هەڵوەستەی دووەم:** ئەوەیە كه زەمەخشەریی دەڵێ: ئەم ئایەتە موبارەكە كه بەو شێوەیە هێنراوە: ئەوانەی دەنگی خۆیان كپ دەكەنەوە، كراوە بە ناو (إسم) بۆ ﴿إِنَّ﴾، و ﴿إِنَّ﴾ش، كه جەختكەرەوەیە، خەبەرەكەشی كراوە بە ڕستەیەك كه لە موبتەداو خەبەرێك پێك دێ، كه ناسێنراون و، دوایی موبتەدایەكە كه ناوی ئاماژەیەو، ئەو ڕستەیەش ڕستەیەكی تێهەڵچوونەوە (**إستِئنافية**)یە، كه ئەوەی پاداشتیانە لەسەر ئەو كردەوەیە گرتوویەتە نێو خۆی و، دوایی پاداشتەكەی بە نەزانراو (**نكِرَة**) هێناوە، بۆ ئەوەی بزانرێ كه پاداشتەكە هێندە گەورەیە، سنوورەكەی هەر نازانرێ، ئەمە هەمووی ئەو پەڕی ڕێزو حورمەت و پایە بەرزیی تێدا هەیە، بۆ ئەوانەی ئەو ئایەتە لە بارەیانەوە دەدوێ، كه وەك گوتمان: بە پلەی یەكەم ئەبوو بەكرو عومەرن، خوا لێیان ڕازی بێ و، لە دوای ئەوانیش هەر كەسێكی دیكەیە كه لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەو شێوەیە دوابێ.

هەڵبەتە دەبێ هەر كەسە بەپێی خۆی ڕێزی لێ بگیرێ، (**القرطبي**) دەڵێ: (**وَكَرِهَ بَعْضُ العُلَمَاءِ رَفعَ الصَّوتِ فِي مَجَالِس العُلَمَاءِ تَشرِيفاً لَهُم إِذْ هُم وَرَثَةُ الأَنبِيَاء**)[١]، واتە: هەندێك لە زانایان پێیان شتێكی خراپ بووە دەنگ لە كۆڕی زانایاندا بەرز بكرێتەوە، وەك ڕێز لێگرتنیان، چونكە ئەوانیش میراتگری پێغەمبەرانن ﷺ.

منیش دەڵێم:

هەم زانایان كه میراتگرانی پێغەمبەرانن لە ڕووی زانستییەوەو، هەم بەرپرسانی دادگەرو مشوورخۆرانی دیكە، هەم هەر كەسێكی دیكە هەر كەسە بەپێی خۆی، پێویستە ڕێزو حورمەتی لێ بگیرێ.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦، ص٢٣٩.

**٣- هەڵوەستەی سێیەم:** دەنگ هەڵێنان لە کاتی پێویستییدا، لەو حوکمە هەڵاوێردراوە، چ لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بۆ وێنە: لە جەنگی حونەیندا پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی فەرموو: {**أُصْرُخْ بالنَّاس**}، واتە: هاوار بکە بە نێو خەڵکدا، بۆ ئەوەی ئەو کاتەی بۆسەیەکیان بۆ داندرا بوو لە شیوی حونەیندا، کە سووپایەکەی پێغەمبەر ﷺ تێکشکا، بە عەبباسی فەرمووە: بانگبکە، بە دەنگی بەرز، چونکە عەبباس دەنگی زۆر بەرز بووە، کەواتە: دەنگ بەرز کردنەوە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر پێویست بووبێ، یاخود خەتیبێک کە وتاری داوە، یان قسەی کەسێک کە شیعری خوێندۆتەوە بۆ ئەوەی خەڵک ببیستێ، ئەوە هەڵاوێردراوە لەو حوکمە، یان ئەوەی دەنگەکەی بۆ خۆی هەر بە شێوەی سرووشتیی وابووبێ، وەک ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس، لەو حوکمە هەڵاوێردراون.

**٤- هەڵوەستەی چوارەم:** مەبەست لە دەنگ بەسەردا هەڵێنان، بێڕێزیی نواندن و بە کەم سەیر کردن نیە، چونکە ئەگەر کەسێک بۆیە دەنگ بەسەر دەنگی پێغەمبەردا هەڵبێنێ ﷺ کە بێ ڕێزیی بەرانبەر بکات و، بە کەم تەماشای بکات، بێگومان ئەوە کوفرەو ئینسانی پێ کافر دەبێ، وەک (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا هێناویەتی[1]، شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستیشە، هەر جۆرە بێ ڕێزییەک بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بە کوفر لە قەڵەم دەدرێ، کەواتە: ئەو دەنگ هەڵێنانەی ڕێی لێگراوە، دەنگ هەڵێنانێک بووە، لە ڕووی کەمتەرخەمییەوەو، لە ڕووی کەم سەلیقەییەوە، نەک لە ڕووی بێ ڕێزیی و بە کەم تەماشا کردنەوە.

**٥- هەڵوەستەی پێنجەم:** ئەگەر دەنگ بەسەردا هەڵێنان لە کاتی دواندندا هێندە خراپ بێ، بێگومان دەنگ بەسەردا هەڵێنانی مەعنەویی، کە زاڵکردنی قسەو بیرو ڕایەکە بەسەر هی پێغەمبەردا ﷺ، زۆر زۆر خراپترە، واتە: مرۆڤی

---
(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦، ص٢٣٩.

مسوڵمان دەبێ هیچ بڕیارێکی سیاسیی و، هیچ زەوقێکی ڕووحانیی و، هیچ ڕایەکی فیقهیی و، هیچ بۆچوونێکی فیکریی و فەلسەفیی، بەسەر فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ زاڵ نەکات و بە سەریدا هەڵنەبژێرێ، ئەگەرنا ئەگەر دەنگ بەسەردا هەڵێنانی ئاسایی ببێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی کردەوەکان، بە تەئکید دەنگ بەسەردا هەڵێنانی مەعنەویی، کە بریتیە لەوەی شتێک پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بخەی، ئنجا چ زەوقێکی سۆفییانە بێ، چ بۆ چوونێکی فەلسەفییانە بێ، یان عیلمی کەلامییانە، چ ڕایەکی سیاسییانە بێ، چ بۆ چوونێکی فەقیهانە بێ، فەرمایشتی پێغەمبەر لەوێ بێ ﷺ تۆش بڵێی: ئاخر فلانکەس وای گوتوە! ئەوە بێگومان تاوانەکەی زیاترەو، سزایەکەشی قورسترە.

### مەسەلەی سێیەم:

**وەسفکردنی کەسانێک کە لە پشت هۆدەکانی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، بانگیان کرد، بەوە کە زۆربەیان نافامن و، ئەگەر چاوەڕوانییان کردبایە، تاکو خۆی (پێغەمبەر ﷺ) بە شێوەی ئاسایی دەچوە دەر، هەر ئەوە باش و پەسند بوو:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ ﴾ بە دڵنیایی ئەوانەی بانگت دەکەن، لە پشت ژوورەکانەوە، لە پشت هۆدەکانەوە، (**حُجُرات**) خوێندراویشەتەوە: (**حُجَرَات**)، (**حُجُرات**) و (**حُجْرات**)، هەردووکیان کۆی (**حُجْرَة**)ن، (**الحُجْرَةُ: البُقْعَةُ المَحْجُورَةُ، وَكَانَت تُفْتَحُ إِلَى المَسْجِدِ**)، حوجرەش شوێنێکە کە دەورە درابێ، (کاتێ خۆی شوێنێکیان نیشانە کردووەو بەردیان لە دەور داناون، (**مُحَجَّرَة**)، واتە: شوێنێک کە بەردی لێ داندراوە، یاخود نێوان و پەردەی بۆ کراوەو نیشانەدار کراوە)، ئەو ژوورانە (هی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ) بەسەر مزگەوتدا دەکرانەوە.

ئنجا لێرەدا باس نەکراوە، ئەگەرنا هەم دەرگایەکی دەرێیان هەبووەو، هەم دەرگایەکیشیان هەبووە بۆ نێو مزگەوت.

ئێمە پێشتر لە هۆی هاتنەوە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کە ئەم دوو ئایەتە لە بارەی شاندێکی بەنوو تەمیمەوە دابەزین، کە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ پشووی دابوو، وا پێدەچێ لە کاتی قەیلوولەدا بووبێ، واتە: سەرخەو شکاندن و پشوودانی کاتی نیوەڕۆ، لەو کاتەدا ئەوانە هاتوون بە ناوەخت، دیارە دەبێ پێشتر

داوایـان کردبـێ، ئنجـا کـە پێغەمبـەر ﷺ نەچۆتـە دەرو خەریکـی پشـوودان بـووە، بانگیـان کـردوە، یـان هـەر یەکسـەر هاتـوون و بانگیـان کـردوە، خـوای موتەعـال دەفەرمـوێ: ئەوانـەی لـە پشـت هۆدەکانـەوە بانگـت دەکـەن:

٢)- ﴿أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾، زۆربەیان نافامن، کە دەفەرموێ: زۆربەیان، یان مەبەست پێی هەموویانە، جاری وایە وشەی (**أَكْثَر**) یان (**كثير**) بە مانای هەموو دێ، لە زمای عەڕەبییدا، یان لەبەر ئەوەی ئەوانەیان کە بانگیان کردوە، ڕیش سپییەکانیان بوون، بەڵام بێگومان خەڵکێکیش لەگەڵ ئەو شاندەدا هەبووە، فیکرو سەلیقەی بەوە شکاوە، کە ئێستا کاتێکی ناوەختەو، کاتی ئەوە نیەو بەو شێوازەش ناکرێ پێغەمبەر ﷺ بانگ بکرێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: زۆربەیان.

٣)- ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەگەر ئەوان ئارامیان گرتبایە، تاکو دەچوویە لایان، واتە: چاوەڕوانییان کردبایە، یاخود خۆیان ڕاگرتباو بانگیان نەکردبای، ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەوە بۆ ئەوان چاک بوو، (**خَير**)، (**مُطْلَقُ الخَيْرِ بدُون المُقَارنَةِ بغَيْرِه**)، (**خير**) یانی: باش بە ڕەهایی بەبێ بەراوردکردن لەگەڵ جگە لە خۆیدا، یاخود (**خَيْراً**)، هەر لەسەر حاڵەتی خۆیەتی، واتە: بۆ هەڵبژاردن (**تَفْضِيل**)ە، واتە: چاوەڕوانیی کردنیان و خۆ ڕاگرتنیان، تاکو تۆ بە شێوەی ئاسایی دەچوویە لایان و دەچوویە دەر، بۆ ئەوان باشتر بوو، لە جێبەجێکردنی هەندێ کاریان، کە مەزەندەیان وابووە ئەگەر بانگی تۆ بکەن و، قسەت لەگەڵ بکەن، تۆش ئەو داواکارییانەیان بۆ جێبەجێ دەکەی.

٤)- ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، خواش لێبوردەی میهرەبانە، لەو هەڵەو کەم و کوڕییانەیان دەبوورێ و، میهرەبان و بە بەزەییشە، لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە گشتیی و بە تایبەت ئەو کەسانەی بە نەزانیی و، نەفامیی هەندێک شت دەکەن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، تاکـو دەچوویـە دەر بـۆ لایـان، واتـە: بـە شـێوەی ئاسـایی و لـە حاڵـەتی ئاسـایی خۆتـدا، بـێ ئـەوەی ئـەوان هەڵتپێچـن، بێگومـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێکـی هەبـووە پشـووی تێـدا داوە،

هەروەها کاتی نوێـژی هەبـووە، کاتی حەقـی هاوسـەرانی هەبـووەو، کاتانێکـی زۆریـشی داناون بـۆ دیتنـی میـوان و خەڵـک و، جێبەجێکـردنی کاروبـارو چارەسـەر کـردنی گرفـت و کێشـەکان.

لـە بـارەی ئـەو هۆدانـەوە، ئـەو ژوورانـەی ماڵـەکانی هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر ﷺ (**محمد الطاهر بن عاشور**) لـە تەفسیرەکەی خۆیـدا[1]، چەنـد زانیارییـەک دەڵـێ، بـە بـاشی دەزانـم دەقـی قسـەکانی خـۆی بێنیـن و مانایـان بکەیـن، گوتوویـەتی: (**كَانَتِ الْحُجُـرَاتُ تِسْـعًا وَهِـيَ مِـنْ جَرِيـدِ النَّخْـلِ، أَيِ الْحَوَاجِـزِ الَّتِـي بَـيْنَ كُلِّ وَاحِـدَةٍ وَالْأُخْـرَى، وَعَلَى أَبْوَابِهَا مُسُـوحٌ مِـنْ شَـعْرٍ أَسْوَدَ، وَعَـرْضُ الْبَيْـتِ مِـنْ بَـابِ الْحُجْـرَةِ إِلَى بَـابِ الْبَيْـتِ نَحْـوَ سَـبْعَةِ أَذْرُعٍ، وَمِسَـاحَةُ الْبَيْـتِ الدَّاخِـلِ، أَيِ الَّـذِي فِي دَاخِـلِ الْحُجْـرَةِ عَـشَرَةُ أَذْرُعٍ، أَيْ فَتَصِيرُ مِسَـاحَةُ الْحُجْـرَةِ مَـعَ الْبَيْـتِ سَبْعَةَ عَـشَرَ ذِرَاعًـا. قَـالَ الْحَسَـنُ الْبَـصْرِيُّ: كُنْـتُ أَدْخُـلُ بُيُـوتَ أَزْوَاجِ النبـي صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِي خِلَافَـةِ عُثْـمَانَ بْـنِ عَفَّـانَ فَأَتَنَـاوَلُ سُـقُفَهَا بِيَـدِي. وَإِنَّمَـا ذَكَـرَ الْحُجُـرَاتِ دُونَ الْبُيُـوتِ، لِأَنَّ الْبَيْـتَ كَانَ بَيْتًـا وَاحِـدًا مُقَسَّـمًا إِلَى حُجُـرَاتٍ تِسْـعٍ**).

واتـە: حوجـرەکان (هـۆدەکان)، نـۆ بـوون، کـە نێوانیـان بـە گـەڵای دارخورمـا (پـووش و پـەڵاشی دارخورمـا) گیرابـوو، دەرگاکانیـان قوماشـێک کـە لـە مـوو دەچێـنرێ، لـەوە دروسـتکرابوون، (بەسـەر دەرگاکانـدا درابـوو)، پانایـی هـەر کام لـەو ژوورانـە لـە دەرگای ژوورەکـەوە هەتـا دەرگای ئـەولا، حـەوت باسـک بـووە، ڕووبـەری ژوورەکە، (واتـە: کە لە نێـو ژوورەکـەدا هەیـە)، دە باسـک بـووە، واتـە: پانتایـی هـەر ژوورێـک لەگـەڵ ماڵەکەدا حەڤـدە گـەز بـووە، (واتـە: ژوورەکان گـەورە نەبـوون، گچکـە گچکـە بـوون)، حەسـەنی بەصرایـی دەڵـێ: مـن کاتی خـۆی لـە سـەردەمی حوکمڕانیـی عوسـماندا (عوسـمانی کوڕی عەففـان) خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەچوومـە نێـو ژوورو هـۆدەکانی هاوسـەرانی پێغەمبەر ﷺ و دەسـتم هەڵدەهێنـاو بـە سـەقفی هـۆدەکان دەکـەوت.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص٢٢٨-٢٢٩.

(**محمد الطاهر بن عاشور**) دەڵێ: بۆیە باسی (**حُجُرات**) کراوە، نەک (**بُیُوت**)، چونکە (**بَیت**) واتە: ماڵ، بەڵام حوجرە واتە: هۆدە (ژوور)، بۆیە گوتراوە: (**حُجُرات**) و نەگوتراوە: (**بُیُوت**)، {هەڵبەتە لە شوێنی دیکەش دا لە بارەی جێ و ڕێی پێغەمبەرو هاوسەرانییەوە وشەی (**بُیُوت**) هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا}، بەڵام ماڵ (**بَیت**)ەکە، دابەش بووە بۆ نۆ هۆدە (نۆ ژوور)، هەر کام لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لە یەکێ لەو هۆدانەدا بوون.

## کورتە باسێک دەربارەی
## ئەرکی سەر شانمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ

هەڵبەتە ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، زۆر شت دەگرێتەوە، بەڵام من بە باشم زانی پوختەیەک لەو بارەوە بهێنم[1]:

ئەرکی سەر شانمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئێمە لە چوار بڕگەدا پوختی دەکەینەوە، واتە: ئەوەی کە لەو کتێبەدا کە ئاماژەمان پێدا هاتوە، بە گوشراویی و پوختیی لە چوار بڕگەدا دەیخەینە ڕوو:

١)- بڕوا پێ هێنانی و صەڵات و سەلام لەسەر دانی.

٢)- خۆشویستنی و پشت گرتنی و، ڕێز لێگرتنی و، شوێنکەوتنی.

٣)- تێکۆشان بۆ بووژاندنەوەی ڕێبازەکەی و، بڵاوکردنەوەی بە قسەو بە کردەوە.

٤)- خۆشویستن و ڕێز لێگرتنی هاوەڵەکانی و نیزیکەکانی و، شوێنکەوتووەکانی و، ئۆممەتەکەی بە گشتیی و، میراتگرە زانایەکانی بە تایبەت.

### ١)- بڕوا پێهێنانی و صەڵات و سەلام لەسەر دانی:

یەکەمین ئەرکی سەر شانمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بریتیە: لە بڕوا پێهێنانی و صەڵات و سەلام لەسەر دانی، جارێ مەبەستمان لە بڕوا پێهێنانی پێغەمبەر ﷺ بە کورتیی، ئەوەیە بەڕاستی بزانین لەوەدا کە کۆتایی

---

(١) ئەم کورتە باسەمان لە: (موسوعة: الإسلامُ كَما يَتَجَلَّى في كِتابِ اللهِ، الكِتابُ السَّابِع: خاتَمُ النَّبِيِّينَ مُحَمَّدٍ ﷺ ... الفَصْلُ الرَّابع: واجِبنا تِجَاهَ خَاتمِ النَّبِيِّينَ)، وەرگرتوە، بڕوانە: ص ٢٧٥ – ٣٠٩: ط٢/ ٢٠١٧م – ١٤٣٨هـ.

پێغەمبەرانەو، ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانییانەو، هەرچی لە لایەن خوای بەرزەوە هێناویەتی، بەڕاستی بزانین، بەڕاست زانینێک کە هاوکات بێت لەگەڵ ملکەچ بوون و، پەسندکردن و، خۆشویستن و، ڕازیی بوون و، مل بۆ کەچکردن و شوێنکەوتندا، ئەمە بە کورتی مانای بڕوا پێ هێنانیەتی.

مەبەستیش لە صەڵات و سەلام لەسەر دانی، ئەوەیە کە خوا ﷻ لە سوورەتی: (**الأحزاب**)، ئایەتی (٥٦)دا، فەرمانی پێکردووین: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦ ﴾، واتە: (خوا ﷻ دەفەرموێ:) بە دڵنیایی خواو فریشتەکانی صەڵات لەسەر پێغەمبەر دەدەن و صەڵاتی بۆ دەنێرن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئێوەش صەڵاتی لەسەر بدەن و، بە سەلام کردنێکی باش، سەلامیشی لێ بکەن.

بەر لەوەی بێینە سەر مانای صەڵات و سەلام، باسی ئەوە دەکەین کە ئێمە مولزەمین بڕوا بە پێغەمبەری خاتەم (**محمد**) ﷺ بێنین و، لە زۆر ئایەتاندا خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی خستۆتەڕوو، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی: (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٨ ﴾

واتە: (خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ) تۆ بڵێ: ئەی خەڵکینە! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای تێکڕاتان، ئەو زاتەی کە حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، دەژیەنێ و دەمرێنێ، دەجا بڕوا بێنن بە خواو، بە ڕەوانەکراوە پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی، کە بڕوا دێنێ بە خواو بە وشەکانی خواو، شوێنی بکەون، بەڵکو بە ئامانج بگەن و، ڕێی ڕاست بگرن.

٢- هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بڕوا بێنن بە خواو بە ڕەوانەکراوەکەی و، بەو کتێبەی دایبەزاندۆتە سەر ڕەوانەکراوەکەی و، بەو کتێبانەی پێشتر دایبەزاندوون و، هەر کەسێک بە خواو بە فریشتەکانی و، بە کتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی بێبڕوا بێ، بە گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە.

ئەم تەعبیرە کە خوا ﷻ دەفەرمویّ: ئەی بڕوادارینە! بڕوا بێنن، واتە: لە بڕوا زیاد بکەن، هەوڵبدەن بڕوایەکەتان کامڵتر بێ، یان بەردەوام بن لەسەر بڕوایەکەتان.

٣- لە سوورەتی (الحديد)دا، دیسان خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و، بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بێنن، دوو ئەندازە لە بەزەیی خۆیتان پێ دەداو، ڕووناکییەکەتان بۆ دەڕەخسێنێ، کە پێی بڕۆن (بەر پێی خۆتانی پێ ببینن) و، لە گوناهەکانتان دەتانبووریّ و، خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

٤- هەروەها لە سوورەتی (الحديد) ئایەتی ژمارە: (٧)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، بڕوا بێنن بە خواو بە ڕەوانەکراوەکەی.

بە نسبەت پێویستبوونی صەڵات و سەلام ناردنیشەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾الأحزاب، کە پێشتر مانامان کرد.

## مانای صەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری خوا:

صـەڵاتی خـوا ﷻ لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ بریتیـە لـە بەزەیـی پێـدا هاتنـەوەی و سـتاییش کـردنی و، ڕێـز لێگرتنـی، فەرهەنگـی (**المصباح المنیر**)[1]، دەڵـێ: (**الصَّـلاةُ فِي اللُّغَـةِ مُشْـتَرِكَةٌ بَـيْنَ الدُّعَـاءِ وَالتَّعْظِيـمِ وَالرَّحْمَـةِ وَالبَرَكَـةِ**)، (صَلَاة): لـە زمانـدا بەشـداره لـە نێـوان پاڕانـەوەو، بـە مەزنگرتـن و، بەزەیـی نوانـدن و، پیـت و پێـز پـێ بەخشـین.

هەروەهـا مانـای صـەڵاتی فریشـتەکان لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ بریتیـە لـە داواکـردنی بەزەیـی و ڕێـز لێگرتنـی خـوا بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

کەواتـە: مانـای صەڵاتـدانی ئێمـەو سـەلام نـاردنی ئێمـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، ئەوەیـە کـە داوا بکەیـن لـە خـوا، بەزەیـی پێیـدا بـێ، بەزەییەکـی تایبـەت و، ڕێـزی لێبگـرێ و سـتاییشی بـکات، هەروەهـا ئـەوە کـە سـەلامەت و بـێ بـەڵای بـکات و بـێ گرفتـی بـکات، لـە هـەر شـتێک کـە پێـی ناخۆشـە.

ئنجـا کـە خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە ئیمانـداران کـە صـەڵات و سـەلام بنێریـن بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ ئـەوە ئاشـکرایە، کـە لەسـەریان پێویسـت (واجـب)ەو، زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەر کام لـە صـەڵات و سـەلامی خسـتۆتە تەحییـاتی نوێـژ (**التَّشَـهُّد**)ەوە، کـە سـەلام بـەم شـێوەیە هاتـوە: {**السَّـلامُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللهِ وَبَرَكَاتُـهُ**} (**أخرجـه البخـاري: ٦٢٣، ومسـلم: ٤٠٢ عـن عبداللـه بـن مسـعود**)، واتـە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! سـەلام لەسـەر تـۆ بـێ و بەزەیـی خـواو پێـزەکانی خـوا.

شـێوەی صەڵاواتدانیـش لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ زۆر شـێوەو صیغـەی هـەن، یەکێکیـان ئەوەیـە:

---

(١) ص١٨٠.

**(أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، أَللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)، (أخرجه البخاري: ٥٥٩٦، ومسلم: ٩٣٥.**

واتە: ئەی خوایە! صەڵات بدە لە سەر موحەممەدو لە سەر شوێنکەوتووانی موحەممەد، وەک صەڵاتت ناردوە بۆ سەر ئیبراهیم و بۆ سەر شوێنکەوتووانی ئیبراهیم، بە ڕاستیی تۆ ستاییشکراوی پایە بەرزی، ئەی خوایە! بەرەکەت و پیز بۆ سەر موحەممەدو بۆ سەر شوێنکەوتووانی موحەممەد بنێرە، هەروەک بەرەکەت و پیزت بۆ سەر ئیبراهیم و شوێنکەوتووانی ئیبراهیم ناردوە، بێگومان تۆ ستاییشکراوی پایە بەرزی.

هەڵبەتە چەند ڕێژگە (**صيغة**)یەک هەن، هەم بۆ صەڵات و، هەم بۆ سەلام و، هەم بۆ بەرەکات ناردن بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ کە پێم وایە ئەم صیغەیە: (**أَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّم وَبارِك عَلَى مُحَمَّدٍ وَءَالِهِ**)، (خوایە صەڵات بدەو، سەلام بنێرەو، بەرەکەت بنێرە بۆ سەر موحەممەدو شوێنکەوتووانی)، لە هەموویان کۆکەرەوەترە، هەڵبەتە کە صەڵات لە سەر پێغەمبەر ﷺ دەدەین و سەلامی بۆ دەنێرین، ئەمە پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە، بۆ خۆمان، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووین، وەک دەفەرموێ: {**مَن صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيهِ عَشراً**}، (**أخرجه: مسلم: ١٣٩ عن أبي هريرة**)، واتە: هەر کەسێک یەک صەڵەواتم لێ بدات، خوا دە صەڵاتی لێ دەدات.

بێگومان هەر کەسێکیش خوا صەڵاتی بۆ بنێرێ، لە بەرەکەتی ئەو صەڵاتەی خوا بۆی ناردوە، لە تاریکاییان دەرباز دەبێ بۆ ڕۆشنایی، وەک خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الأحزاب**)دا، دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَـٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾﴾،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە یاد کردنێکی زۆر یادی خوا بکەن و، بە بەیانیان و ئێواران بە پاکی بگرن، خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە خۆی و فریشتەکانی صەڵاتتان لێ دەدەن، تاکو دەربازتان بکات لە تاریکاییان بەرەو ڕۆشنایی و، خوا بەرانبەر بە بڕواداران بە بەزەییە، ئەو ڕۆژەی بە دیداری دەگەن، بە سەلام سڵاویان لێ دەکات و، پاداشتێکی پڕ ڕێزو حورمەتی بۆ داناون.

کەواتە: صەڵات و سەلام ناردنی ئێمە بۆ پێغەمبەر ﷺ، دەبێتە هۆی ئەوەی خوا صەڵاتمان لێ بدات، صەڵاتدانی خواش لە ئێمە، دەبێتە هۆی ئەوەی لە تاریکاییان دەربازمان بکات بەرەو ڕۆشنایی، تاریکاییەکانیش: لە ڕووی بووناسیی و، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەو، لە ڕووی پەرستشەکان و، لە ڕووی ڕەوشت و، لە ڕووی ئیدارەدانی کۆمەڵگاو، لە ڕووی باری کەسیەتیی و، لە ڕووی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی و، لە ڕووی سیاسەت و، لە ڕووی کارو کەسابەت و لە هەموو ڕووەکانەوە.

## ٢)- خۆشویستنی و پشت گرتنی و ڕێز لێگرتنی و شوێنکەوتنی:

دووەمین ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە خۆشویستنی و، ڕێز لێگرتنی و، پشتگرتنی و، شوێنکەوتنی و، سەرخستنی، بێگومان ئەوەش لە چەندان ئایەتدا هاتوە، کە ئێمە دەبێ پێغەمبەری خوامان ﷺ خۆشبوێ و، ڕێزی لێ بگرین و، پشتی بگرین و، هاوکاری بین و، شوێنی بکەوین.

لەو بارەوەش کە پێویستە بڕواداران پێغەمبەری خوایان ﷺ دوای خوا ﷻ، لە هەموو کەس خۆشتر بوێ، تەنانەت لە خۆشیان:

١- لە سووڕەتی (**الأحزاب**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ...﴿٦﴾ ﴾، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان، لێیان لە پێشترە، (واتە: دەبێ لە خۆیان خۆشتریان بوێ) و، هاوسەرەکانیشی دایکیانن.

٢- لە سوورەتی (**التوبة**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ...﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: خەڵكی مەدینەو عەرەبە بیابانشینەکان کە لە دەوریانن، بۆیان نیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنن، (نابێ خۆیان خۆشتر بوێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ).

٣- لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ ئاوا باسی ئەوانە دەکات، کە بەزەیی خوا دەیانگرێتەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾، واتە: (ئەوانە بەزەیی خوا دەیانگرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا)، شوێن ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار (یان نە شارەزا لە کتێبە پێشووەکان) دەکەون، کە بە نووسراویی دەیبینن لە لایان لە تەورات و لە ئینجیلدا، فەرمانیان پێ دەکات بە هەموو پەسندێک و، ڕێگرییان لێ دەکات لە هەموو ناپەسندێک، هەرچی پاک و چاک و سوود بەخشە بۆیان حەڵاڵ دەکات و، هەرچی پیس و زیانبەخشە لێیان قەدەغە دەکات و، ئەو بارە قورسەو ئەو کۆت و پێوەندانەی گرفتار بوون بە دەستیانەوە لێیان لا دەبات، ئنجا ئەوانەی بڕوایان پێ هێناوەو پشتیان گرتوەو، سەریان خستوەو، شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون کە لەگەڵی دابەزێندراوە، تەنیا ئەوانە سەرفرازن.

٤- لە سوورەتی (**الفتح**)یشدا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ ﴾، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، لە دوای ئەویش بڕواداران و دەفەرمویٚ: بە دڵنیایی ئێمە تۆمان ناردوە شایەد بی و موژدەدەرو ترسێنەر بی (دوایی بڕواداران دەدوێنێ و، دەفەرمویٚ:) بڕوا بێنن بە خواو، بە پێغەمبەرەکەی و، ڕێزی بگرن و پشتی بگرن و، (خوای پەروەردگاریش) بەیانیان و ئێواران بە پاک بگرن.

٥- ئەو ئایەتانەش کە لە سووڕەتی (**الحجرات**)دا، خەریکی توێژینەوەیانین:

أ- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ۝١﴾.

ب- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ۝٢﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دەنگی خۆتان ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ مەخەن و بە دەنگی بەرز مەیدوێنن، وەک دواندنتان بۆ یەکدی، نەوەک کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوەو پووچەڵ ببنەوە، بێ ئەوەی پێی بزانن.

ئنجا با سەرو تیشک بخەینە سەر هەر کام لەو چوار موفڕەدانەی کردوومانە ناوونیشانی ئەم بڕگەیە:

١- خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ، خۆشویستنی ئێمە بۆ پێغەمبەر ﷺ چەمکەکەی ئاشکرایە، کە دەبێ ئینسانی بڕوادار لە دوای خوا ﷻ، پێغەمبەری خوای ﷺ لە هەموو شتێک و لە هەموو کەس و، تەنانەت لە خۆشی خۆشتر بوێ، وەک پێشتر ئایەتەکەمان هێنا: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ...۝٦﴾الأحزاب، کەواتە: دەبێ بڕواداران لە پێشتریی بدەنە پێغەمبەر ﷺ و بەسەر خۆیاندا هەڵیبژێرن و پێشیبخەن، لە هەموو ڕوویەکەوە، وەک پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە دەفەرموێ: {**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُم حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيهِ مِن وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجمَعِين**}، (**أخرجه: البخاري: ٣٢، ومسلم: ٣٣ عن أنس بن مالك**)، واتە: یەکێک لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ، تاکو منی لەلا خۆشەویستتر نەبێ، لە باب و دایکی و لە ڕۆڵەی و لە تێکڕای خەڵکی.

٢- بە نسبەت (توقیر)ی، پێغەمبەرەوە ﷺ واتە: ڕێز لێگرتنی و حورمەت لێگرتنی، بریتیە لەوە کە وەک بۆ پێغەمبەر ﷺ شایستەیە، بەبێ کەمتەرخەمیی، بەڵام لەولاشەوە بەبێ لێ تێپەڕاندن، ڕێزو حورمەتی پێغەمبەری خوا بزانین ﷺ، نە کەمتەرخەمییەک بێ کە سەر بکێشێ بۆ جەفاو کورت هێنان و، کەم ڕێزیی و کەم حورمەتیی لە بەرانبەری داو، نە زێدەڕۆییشی تێدا بکرێ و، سەر بکێشێ بۆ شیرک و بردنەدەری پێغەمبەر ﷺ لە مەقامی خۆی کە پێغەمبەری خواو بەندەی خوایە.

**٣-** بە نسبەت پشتگرتنی پێغەمبەر ﷺ (**تعزيز النبي**)ەوە، کورتەکەی ئەوەیە کە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بگیرێ و هاوکاریی بکرێ و، سەر بخرێ و، دەستباری بۆ بگیرێ، لەچییدا؟ لە بەندایەتیی کردن بۆ خواو، لەسەر خستنی پەیامەکەی و، لە بەرز ڕاگرتنی بەیداغی تەوحیدو، لە بووژاندنەوەی ڕێبازەکەیدا.

**٤-** بە نسبەت شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ (**إتِّباع النبي**)ەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێتە پەیڕەویی لێکراوو سەرمەشق لە هەموو شتێکدا، لە کاروبارەکانی دینداریی و بەندایەتیی بۆ خوادا، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا، فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا باشترین سەر مەشق هەیە بۆ ئێوە، هەر کەسێک بڕواو ئومێدی بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێت و زۆریش یادی خوا بکات.

**٥-** بە نسبەت سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ (**نَّصر النبي**)ەوە، ئەوەیە کە بەرگریی لێ بکرێ و، پشتیوانیی لێ بکرێ، بەوە کە بەیداغی ئاینەکەی بەرز ڕابگیرێ و، شەریعەت و بەرنامەکەی پیادە بکرێ و، ڕێبازەکەی بڵاو بکرێتەوە، وەک پێشتریش گوتمان: هەر کامێک لەوانە دەگونجێ زۆر زیاتر قسەیان لەسەر بکەین.

## ٣)- تێکۆشان بۆ بووژاندنەوەی ڕێبازەکەی و بڵاوکردنەوەی بە قسەو بە کردەوە:

سێیەم ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە هەوڵدان بۆ بووژاندنەوەی ڕێبازەکەی و، بڵاوکردنەوەی بە قسەو بە کردەوە، لێرەدا پێویستە ئاگامان لە دوو شتان بێ:

**ئاگاداری یەکەم:** چەمکی وشەی سوننەت، نابێ کورت هەڵبهێنرێ لە هەندێک شتی بچووک و لاوەکییدا، یاخود لە سەرگەرم بووندا بە هەندێک شتی گچکە لەسەر حیسابی شتە بنەڕەتیی و سەرەکییەکان، بۆ وێنە:

**یەکەم:** ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ نێوەڕۆک و کاکڵەکەی بریتیە لە خوا بە یەکگرتن و، تاککردنەوەی خوا بە پەرستن، بە مانای فراوان و گشتگیری پەرستن.

**دووەم:** هەروەها ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ پایەیەکی دیکەی گرنگی بریتیە لە پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، لە هەردوو بواری تاکیی و کۆمەڵایەتییدا.

**سێیەم:** هەروەها بانگەواز کردن بۆ لای خواو، بۆ لای ڕاستە شەقامی خوا، دیسان پایەیەکی دیکەی گرنگی ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.

**چوارەم:** هەروەها فەرمان بە پەسند کردن و، ڕێگریی لە ناپەسند کردن، دیسان پایەیەکی دیکەی ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.

**پێنجەم:** جەنگ کردن و تێکۆشان لە پێناوی خواداو، بەختکردنی گیان و سامان، لە کاتی خۆیدا بە مەرجەکانی خۆی، ئەویش دیسان پایەیەکی دیکەی ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.

**شەشەم:** هەروەها خۆ ڕازاندنەوە بە ئاکارو ڕەوشتە دەروونیی و ڕواڵەتییەکان و، خۆ بژارکردن لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، لە خوو و خدە خراپەکان و، چ ڕووحیی و دەروونیی، چ ڕواڵەتیی و جەستەیی، ئەویش دیسان پایەیەکی دیکەی گرنگی ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.

**حەوتەم:** هەروەها مامەڵەکردن لەنێو خۆداو، لەگەڵ خەڵکدا، بەپێی ئەدەبە شەرعییەکان.

ئەوانە هەر هەموویان دەچنەوە نێو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ.

**ئاگاداری دووەم:** ئەوەیە کە لە کاتێکدا ئێمە دەمانەوێ ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ببووژێنینەوە، دەبێ ئاگامان لەوەبێ شتی گرنگ پێش گرنگتر نەخەین و، فەرز بە قوربانیی سوننەت نەکەین، بەڵکو پێویستە لە پابەندییمان بە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ وەک پێغەمبەری خوا بکەین، هەر شتە لە شوێنی خۆیدا دابنێین، نەک بە بیانووی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ و بەرز ڕاگرتنی ڕێبازەکەیەوە، بێنین هەندێک وردە شت خۆمانی پێوە سەرقاڵ بکەین، لەسەر حیسابی شتە

بنەڕەتییەکان، پێشمان وابێ بە دوای پێغەمبەر کەوتووین ﷺ کە لە ڕاستییدا، ئەوە لادانە لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ.

**٤)- خۆشویستن و ڕێز لێگرتنی هاوەڵەکانی و نیزیکەکانی و شوێنکەوتووەکانی و ئۆممەتەکەی بە گشتیی و، میراتگرە زانایەکانی بە تایبەت:**

بڕگەی چوارەم و کۆتایی لە ئەرکی سەر شانمان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە: أ- هاوەڵانیمان خۆشبوێ، ب- هەروەها نیزیکانیمان خۆشبوێ و، ج- شوێنکەوتووانیمان خۆشبوێ و، د- ئۆممەتەکەیمان بە گشتیی و، بە تایبەتی زانایانی میراتگریمان خۆش بوێ و، ڕێزیان لێ بگرین و، حورمەتیان بزانین:

**أ- هاوەڵانی پێغەمبەر:**

وشەی **(الصَّحابة)**، تاکەکەی **(صَحابِي)** بۆ پیاو و **(صَحابِيَّة)**یە بۆ ئافرەت، بۆ پێناسەی هاوەڵان **(صحابة)**، دەڵێین: هاوەڵان، ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو، هاوەڵایەتیی پێغەمبەری خوایان کردووەو، هاوکاری بوون و، پشتیان گرتوە، لە بانگەوازەکەیداو، لە پێکهێنانی یەکەمین کۆمەڵ و کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، لە خزمەتی دابوون و هاوکار و، پشتیوانی بوون. **(البخاري)** لە ژێر ناوونیشانی: **(بابُ فَضائِلِ أَصحابِ النَّبِيِّ ﷺ)**دا دەڵێ: **(وَمَن صَحِبَ النَّبِيَّ أَو رَءَاهُ مِنَ المُسلِمِينَ، هو مِن أَصحابَهِ)**، **(أخرجه: البخاري: ٦٦٥)**، هەر کەسێ هاوەڵایەتیی پێغەمبەری کردبێ ﷺ یان بینیبێتی لە مسوڵمانان، ئەوە لە هاوەڵانیەتی.

**(المُعجَمُ الوَسِيط)**[1]، دەڵێ: **(الصَّحابِيُّ مَن لَقِيَ النَّبِيَّ مُؤمِناً بِهِ وَماتَ عَلَى الإِسلام وَالجَمعُ صَحابَة)**، واتە: هاوەڵ کەسێکە بە بڕوا پێهێنانەوەو، بە پێغەمبەری

---

(١) ص٥٠٧ .

خـوا گەیشـتبێ ﷺ و لەسـەر ئیسـلامیش مردبـێ، وشـەی (**صَحـابِيٌّ**) بـە (**صَحابَـة**) كـۆ دەكرێتـەوە، دیـارە (**صَحابِيَّـة**)ش، بـە (**صَحابِيّـات**) كـۆ دەكرێتـەوە، بەڵگـە لەسـەر خۆشویسـتنی هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ و ڕێـز لـێ گرتنیـان و حورمـەت زانینیـان زۆر زۆرن، بـۆ وێنـە:

١- لە سوورەتی (**التوبة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچكەران و لە پشتیوانان و، ئەوانەی بە چاكیی شوێنیان كەوتوون، خوا لێیان ڕازییەو، ئەوانیش لە خوا ڕازیین و، بەهەشتەكانی بۆ داناون... تاكو كۆتایی، كەواتە: خوا ﷻ لە كێ ڕازییە؟ یەكەم لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و، دوایی لە شوێنكەوتووانی هاوەڵان بە چاكیی، بۆیە ئەگەر بمانەوێ خوا لێمان ڕازی بێ، دەبێ چاك شوێنی هاوەڵان بكەوین بە تایبەت پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچكەران و لە پشتیوانان.

٢- بەڵگەیەكی دیكەش لەسەر ئەوە، ئەوەیە كە خوا ﷻ لە ئایەتەكانی (٨ و ٩)دا، لە سوورەتی (**الحشر**)دا، باسی كۆچكەران و پشتیوانان دەكات، دوایی دەفەرموی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار مەدح و ستاییشی كۆچكەران و پاشان پشتیوانان دەكات، دەفەرموێ: ئەوانەی لە دوای وانیش دێن، (واتە: هەموو ئەو مسوڵمانانەی تاكو دنیا بە كۆتا دێ، لە دوای كۆچكەران و پشتیوانان دێن)، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان كە بە ئیمانەوە پێشمان كەوتوون، ببوورەو، كینە مەخە دڵمان بەرانبەر ئەوانەی بڕوایان هێناوە، پەروەردگارمان! بێگومان تۆ زۆر بە پەرۆشی و زۆر بە بەزەیی.

كەواتـە: گرنگتریـن و تایبەتتریـن سیفەتی جیلـەكانی مسـوڵمانان كـە لـە دوای جیـلی هاوەڵانـەوە دێـن، بریتیـە لـەوە كـە داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خوا بكـەن و، ستاییشـیان

بکەن، کە پێش ئەوان کەوتوون بە ئیمان، دوایی لە خوا داوا بکەن کینەو بوغز نەخاتە دڵیان بەرانبەر بەو بەڕێزانە، هەر بۆیە زۆر جێی سەرسوڕمانە کەسێک لافی ئیمان و ئیسلام لێ بدات و لافی خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی و ﷺ دینی خوا لێ بدات، کە چی کەسانێکی خۆش نەوێ و ڕێز لە کەسانێک نەگرێ، کە خوا ﷻ خۆشیویستوون و ستاییشی کردوون و، فەرموویەتی: لێیان ڕازییم و، بەڵێنی پاداشتی باشیشی پێداون، ئەوانەی خوایان خۆشویستوەو پێغەمبەرەکەییان خۆشویستوەو هاوەڵی بوون و پشتیوانی بوون، لەگەڵیدا کۆچیان کردوە، یاخود پشتیوانییان کردوەو، سەروماڵیان بۆ سەرخستنی ئایین و پەیامی خوا ﷻ کە بە پێغەمبەری کۆتاییدا، ناردوویەتی، بەخت کردوە!! هەڵبەتە هەر لە نیشانەکانی خۆشویستنمان بۆ هاوەڵان و ڕێز لێگرتنمان بۆیان، ئەوەیە کە بەڕێزەوە باسیان بکەین، هەر بۆیە زانایان گوتوویانە: هەر کاتێک مرۆڤ ناوی یەکێک لە هاوەڵانی هێنا، وا باشە بڵێ: (**رَضِيَ اللهُ عَنهُ**)، ئەگەر ئافرەت بێ (**رَضِيَ اللهُ عَنهَا**)، ئەگەر خۆی و بابی باس بکرێن، وەک (**عَبدِ اللهِ ابنِ عُمَر**)، بگوترێ: (**رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا**)، ئەگەر کۆ بن، بگوترێ: (**رَضِيَ اللهُ عَنهُم**)، ئەگەر کۆمەڵە ئافرەتێک بن، بگوترێ: (**رَضِيَ اللهُ عَنهُنَّ**).

هەروەها لە ڕێز لێگرتنی ئێمە بۆ هاوەڵان ئەوەیە، کە ئەو کەم و کوڕیی و هەڵەو گوناهانەی هیچ بەشەرێک لێیان خاڵیی نابێ، جگە لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) گەورەیان نەکەین و، باسیان نەکەین، مەگەر مەبەستێکی شەرعیی پەکی لەسەر ئەو باسکردنە کەوتبێ و، حوکمێکی شەرعیی پێوەی پەیوەست بێ، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لَا تَسُبُّوا الأَموَاتَ فَإِنَّهُم قَد أَفضَو إِلَى مَا قَدَّمُوا**}، (**أخرجه: البخاري: ٧٣١٩، عن عائشة**)، واتە: قسە بە مردووان مەڵێن، چونکە ئەوان ڕۆیشتوون بەرەو ئەوەی پێشیانخستوە.

ئنجا بە تایبەت ئەو مردووانە ئەگەر هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر بن ﷺ، بەڵام ئەمە ئەوەش ناگەیەنێ کە ئێمە هاوەڵان بە پارێزراو لە هەڵە، (**مَعصُومِينَ مِنَ

**الأَخطَاء**)، لـە قەڵـەم بدەیـن، یاخـود هەرچـی کردوویانـە، هەمـووی هـەر پاسـاو بدەینـەوەو، هـەر تەئویـل و پینـەو پـەڕۆی بکەیـن، وەک: (**إِبـنُ العَـرَبِي**) لـە کتێبەکـەی خـۆی (**العَواصِـم مِـنَ القَواصِـم**)دا، کردوویـەتی، کـە هەرچـی هەڵـەی موعاویـەی کـوڕی ئەبـوو سـوفیانە خـوا لێـی ببـوورێ، کـە حوکمڕانیـی ئیسـلامیی لـە شـووڕاوە گـۆڕی بـۆ حوکمـی میراتیـی و، بنەماڵەیـی و، یەزیـدی کـوڕی کـە نـاودار بـووە بـە لاڕێ بـوون و فاسـیقیی و گوناهباریـی، بـە زۆر بەسـەر مسـوڵمانانـدا سـەپاند، کـە بـە تەئکیـد ئـەو کاتـە لەنێـو مسـوڵمانانـدا کەسـانێک هەبـوون زۆر لـە خۆشـیی و لـە بابیـشی چاکـتر بـوون، هـەر ئـەو هەڵوێسـتەی موعاوییەشـە کـە ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ ئامـاژەی بـۆ دەکات، کـە دەفەرمـوێ: {**أَوَّلُ مَـن يُغَـيِّرُ سُـنَّتِي رَجُـلٌ مِـن بَنِـي أُمَيَّـة**}، (**أخرجـه: الألبـاني في سِلسِـلَةُ الأَحادِيـث الصَّحيحَـة: ١٧٤٩**)، واتـە: یەکەمیـن کـەس کـە ڕێبـازی مـن دەگـۆڕێ، پیاوێکـە لـە بـەنی ئومەییـە، {لـە هـۆزی بەنـی ئومەییـە}، ئەویـش موعاویـە بـوو، کـە لەسـەر دەسـتی ئـەو کۆتایـی بـە چاخـی خیلافەتیـی ڕاشـیدە هـات و، حوکمڕانیـی و پادشـایەتیی و میراتیـی دەسـتی پێکـرد.

جگـە لـە گۆڕینـی حوکمڕانیـی لـە ڕاوێـژەوە بـۆ میراتیـی و بنەماڵەیـی موعاوییـە چەنـد شـتێکی دیکـەی هەڵـەو خراپـی کـردوون، بـۆ وێنـە:

**أ-** یەکێک لەوانە کە لە دژی خەلیفەی چوارەم (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب خوا لێی ڕازی بێ)، جەنگا، کە بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی لەگەڵ ئەودا لە دژی عەلی جەنگاون، بە (**بُغاة**) یاخییان لە قەڵەم دراون، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ کە (مسلم) هێناویەتی، بە (**عمار بن یاسر**)ی فەرمووە: (**تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ**)[1].

**ب-** هەروەها ئەوەی کردبووە بە داب و نەریتێک کە لەسەر مینبەر جنێو بە عەلی کوڕی ئەبی طالیب بگوترێ، تەنانەت دوای شەهید کرانیشی، هەتا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەو نەریتە نەفامییەی بەنی ئومەییەی هەڵوەشاندەوەو، ئەو ئایەتەی

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٢٦٦٣، ومسلم: ٢٩١٥، وغيرهما.

لە شوێن دانا[1]: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾النحل.

پێویستە بشزانرێ کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، هەموویان یەک پلە نین، بەڵکو دەبێ ئەوانیش پۆلێن بکرێن و، زانایان زۆر قسەیان کردوە لە بارەی پۆلێنکردنی هاوەڵانەوە، بۆ وێنە: ئەوانەی لە جەنگی بەدردا بەشدار بوون، ئیمتیازێکی تایبەتیان هەیە، هەروەها ئەوانەی لە صوڵحی حودەیبییەدا بەشدار بوون، کە بۆتە هۆی هاتنە دی، سەرکەوتنی ڕوون و ئاشکرا (**الفتح المبين**)، کە ژمارەیان (١٤٠٠) یان (١٥٠٠) کەس بووەو، خوا ﷻ لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾الفتح، ئەوانە بێگومان جیا بوون، لە ئەوانەی دوایی و، لە فەرمایشتی خوای دادگەریش دا هاتوە، لە سوورەتی (**الحديد**)دا: ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ...﴿١٠﴾ ﴾الحديد، ئەوانەتان کە پێش ئازادکردن (ی مەککە) جەنگیان کردو ماڵی خۆیان بەخشی، وەک ئەوانە نین و پلەیان بەرزترو مەزنترە لەوانەی دوایی ماڵی خۆیان بەخشیی و جەنگیان کرد، بەڵام لە کۆتایی ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (**الحديد**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ...﴿١٠﴾ ﴾، هەمووشیان خوا بەڵێنی پاداشتی هەرە باشی پێداون.

## ب- خزمان و نیزیکانی پێغەمبەر ﷺ، (أَهلُ البَيت النَّبَوِيّ):

بێگومان وشەی: (**أَهلُ البَيت**)، لە قورئاندا تەنها لە دوو شوێندا هاتوە:

**یەکەم:** لە ئایەتی (٣٣)ی سوورەتی (الأحزاب) و، لە ئایەتی (٧٣)ی سوورەتی (هود)داو، لە هەردووکیاندا مەبەست پێی ئافرەت و ماڵ و خێزانە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ

---

(١) الكامل في التأريخ لابنِ الأثير، ج٥، ص٥٤٣ و، تَارِيخ الْأُمَم الإِسلامية، الدّولَة الْأُمَوِيَّة: شيخ محمد خضري بك: ج٢، ص(١٢١، ١٨٣، ١٨٤)، هەروەها هەر کام لە: (الطبري) و (إبن كثير)یش لە مێژووەکانیان دا هێناویانن.

﴿لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ٣٣﴾الأحزاب، کە دیارە ڕووی دواندن لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ،

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (هود)دا، فریشتەکان بە خێزانی (ئیبراهیم) کە سارا خانە، دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ٧٣﴾هود، بەڵێ بێگومان چەمکی: ﴿أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ﴾، یانی: ئەوانەی لە ماڵدان، کە بە پلەی یەکەم ژن و خێزان دەگرێتەوەو، دوای ئەویش منداڵ و نەوە، هەر بۆیە زانایان هەر کام لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ و (حەسەن و حوسەین) یشیان، خستوونە نێو چەمکی: (**أَهلُ البَيت النَّبَوِيِّ**)، بەڵکو هەندێکیان خزمەکانی دیکەشی لە مامەکانی پێغەمبەر ﷺ و لە ئامۆزایەکانی و لە پوورەکانی، ئەوانەشیان خستوونە نێو ئەو چەمکەوە، گرنگ ئەوەیە دەبێ هەموو ڕێزو حورمەتێک بنوێنرێ، بۆ ئەوانەی کە لە ماڵی پێغەمبەردا بوون ﷺ بە پلەی یەکەم وەک گوتمان: هاوسەرە بەڕێزەکانی و، ئنجا کچ و نەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کوڕەکانی بە نەباڵغیی مردوون.

### ج- شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی پێغەمبەر (آل النبيِّ):

سێیەم لەوانەی کە دەبێ ڕێزو حورمەتی تەواویان لێ بنرێ، بریتیە لە (**ءالُ النَّبِيِّ**)، کە بریتین لەوانەی پەیوەندیی تایبەتیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەبووە لە ڕووی ئیمان پێهێنان و شوێنکەوتنیەوەو، پێویستە ئەو هەڵەیە ڕاست بکرێتەوە کە وشەی (**ءال**)، هاوواتا نیە لەگەڵ (**أَهل**)دا، وەک هەندێک گوتوویانە، بە بەڵگەی ئەوە کە وشەی (**أَهل**)، لە قورئاندا تەنیا پاڵدراوەتەوە لای (**بَيت**)، (**أَهلُ البَيت**)، بەڵام وشەی (**ءال**)، هەمیشە پاڵدراوەتە لای مرۆڤ، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی:

١- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٣﴾آل عمران.

٢- ﴿فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ٥٤﴾النساء، ئنجا ئەم (**ءال**)ە، مەرج نیە تەنیا لە چاکەدا شوێنکەوتوو بن، بەڵکو دەگونجێ لە خراپەدا،

شوێنكەوتوو بن، وەك لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ٤٥ ﴾

هەروەها دیسان لە سوورەتی (غافر)دا، دەفەرمووێ: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ٤٦ ﴾، كەواتە: (ءال)، بریتیە: لە شوێنكەوتووانی ڕاستەقینەی كەسێك، ئنجا لە خێردا یان لە شەڕدا، بەڵام (أهل)، ئەوانەن لە ماڵەكەیدان، ئنجا ئەگەر بێت و ئەوانەی (لە چوارچێوەی ماڵی پێغەمبەردان)، وەك هاوسەرو منداڵ، بە ڕاستیی شوێن پێغەمبەر ﷺ بكەون، ئەوە هەم ئەهلنی و هەم ئالیشنی، بەڵام كەسێك كە لە چوار چێوەی ماڵەكەیدا نیە، بەڵام بەڕاستیی شوێنی بكەوێ، ئەوە ئالی پێغەمبەرە ﷺ بەڵام بە ئەهلی لە قەڵەم نادرێ، لەو بارەوە شاعیرێك دەڵێ:

ءَالُ مُحَمَّدٍ هُمُ أَتباعُ مِـــلَّتِهِ مِنَ السُّـــودانِ وَالعُـــجمِ وَالعَرَبِ
وَلَو لَم يَكُن ءَالُـهُ إِلَّا قَـــرَابَتُهُ لَصَلَّى المُصَلِّي عَلَـى الطَّاغِي أَبِي لَهَـبِ

واتە: ئالی موحەممەد ﷺ بریتین لە شوێنكەوتووانی ڕێبازەكەی، لە ڕەش پێستان و لە عەجەم و لە عەرەب، ئەگەر ئالەكەی تەنیا خزمەكانی بوونایە، كەسێك كە صەڵەوات دەدات، دەبوو صەڵاتەكەی ئەبوو لەهەبی یاخییش بگرێتەوە.

## د- چوارەم و كۆتایی بریتیە لە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ :

دەبێ ڕێز لە ئوممەتەكەی بگیرێ و، بە تایبەت زانایانی میراتگری، كە گومانی تێدا نیە، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ، واتە: ئەوانەی بەڕاستیی شوێنی كەوتوون و بە دوای پەیامەكەیەوەن و، زانایانی میراتگری پێغەمبەریش ﷺ ئەوانەن، كە هەمان ئەركی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ئۆممەتەكەیدا ئەنجام دەدەن كە بریتیە لە پاراستنی میراتەكەی و، پاراستنی ڕێبازەكەی و، بڵاو كردنەوەی ڕێبازەكەی و، هەوڵدان بۆ چەسپاندنی شەریعەتەكەی.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە ئەرکـی سەرشـانیان بـە تێـرو تەواویـی، بـە ڕێکیـی و بـە چاکیـی بەرانبـەر بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ ئەنجـام دەدەن، لێرەشـدا کۆتایـی بـەم دەرسـەمان دێنیـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان پێنـج ئایەتـە، ئایەتـەکانی: (٦ - ١٠)، کـە تێیـان دا دوو بابـەتی زۆر گـەورەو گرنـگ خراونـە ڕوو:

**یەکەم:** لە کاتێکدا بابایەکی لاڕێ و متمانە پێ نەکراو، هەواڵێک دێنێ، پێویستە بە وریایی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و، بەبێ ڕوونکردنەوە و ساغکردنەوە، هیچ شتێکی لەسەر بنیات نەنرێ.

**دووەم:** لە کاتی دەمەقاڵێ و لە گژیەک ڕاچوونی دوو کۆمەڵ لە بڕواداراندا، پێویستە ئاشتەواییان لە نێواندا بکرێ و، پێکبهێنرێنەوەو، لە کاتی مل نەدانی لایەکیاندا، بەهێز ملی بۆ هەق و دادگەریی پێ نەوی بکەن، بڕوادارانیش برای ڕاستەقینەی یەکدین، بۆیە پێویستە ئاشتەواییان لە نێواندا بکرێ، تەنانەت ئەگەر ناکۆکییەکە لە نێوان دوو کەسیشدا بێ، لە بڕواداران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ
عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ
أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨ وَإِن طَآئِفَتَانِ
مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ
تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ
٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەگـەر کەسـێکی لـە ڕێ لادەر (متمانـە پێنەکـراو) هەواڵێکـی بـۆ هێنـان، ڕوون و سـاغی بکەنـەوە (داخـۆ ڕاسـتە یـان نـا؟) نـەوەک بـە نەزانیـی کۆمەڵێـک تـووش(ی زیـان) بکـەن، سـەرەنجامیش لەسـەر ئـەوەی کردووتانـە پەشـێمان ببنـەوە ﴿٦﴾ بشـزانن کـە پێغەمبـەری خواتـان لـە نێودایـە، (کەواتـە: لێـی بەهرەمەنـد بـن و وریـا بـن بـێ فەرمانیـی نەکـەن)، ئەگـەر لـە زۆر کاران دا بـە قسـەتان بـکات (و بـە ئـارەزووی ئێـوە بجووڵێتـەوە)، تـووشی گرفـت و نارەحەتیـی دەبـن، (چونکـە بەهـۆی ڕاو بۆچوونەکانتانـەوە تـووشی هەڵـە دەبـێ)، بـەڵام خـوا (تەنیـا چاکـەی بۆتـان دەوێ و)، بـڕوای لـە لا خۆشەویسـت کـردوون و لـە دڵتانـدا ڕازاندوویەتـەوەو، بێبڕوایـی و لادان و سـەرپێچییشی لـە لاتـان ناپەسـند کـردوون (ئەوانـەی بـەو جـۆرەن)، تەنیـا ئەوانـە شـارەزاو سـەر ڕاسـتن ﴿٧﴾ (ئـەوەش) بەخشـش و چاکەیـە لـە خـواوەو، خـواش زانـای کاربەجێیـە ﴿٨﴾ ئەگـەر دوو کۆمەڵیـش لـە بـڕواداران بەگژیەکـدا هاتـن! (بەشـەڕ هاتـن)، بـە زوویـی ئاشـتەواییان لـە نێوانـدا بکـەن (و پێکیـان بێننـەوە)، ئنجـا ئەگـەر لایەکیـان دەسـتدرێژیی کـردە سـەر ئـەوی دیکەیـان، ئێـوە لـە دژی ئـەوەی سـنوور شـکێنیی دەکات، بجەنگـن، تاکـو دەگەڕێتـەوە بـۆ لای فەرمـانی خـوا، ئنجـا کـە گەڕایـەوە بـە دادگەریـی تەباییـان لـە نێوانـدا بکـەن و، دادگەریـی بکـەن (لـە پێـدانی پشـک و بـەشی هـەر لایەکـدا)، بـە دڵنیایـی خـوا دادگـەرانی (لـە پێـدانی مـاف و پشـکاندا) خۆشـدەوێن ﴿٩﴾ بەڕاسـتیی تەنیـا بـڕواداران بـرای یەکدیـن، ئنجـا پێکهاتـن لـە نێـوان دوو برایەکەتانـدا بکـەن (کـە پێکـەوە ناتەبـان)و، پارێزیـش لـە خـوا بکـەن، بەڵکـو بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێـنرێ، (لـە لایـەن خـوای بـە بەزەییـەوە}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(فَاسِقٌ): (فَسَقَ فُلانٌ، أَي: خَرَجَ عَنْ حَجْرِ الشَّرْعِ، فَسَقَ الرُّطَبُ: خَرَجَ عَنْ قِشْرِهِ)، دەگوترێ: (فَسَقَ فُلانٌ)، واتە: لە بازنەی شەرع چۆتە دەرێ، هێشووە خورما كە لە كیفەكەی دێتە دەرێ، پێی دەگوترێ: (فَسَقَ الرُّطَبُ)، واتە: فەریكە خورما لە كیفەكەی هاتە دەرێ، كەواتە: فاسیق كەسێكە لە بازنەی شەرع چۆتە دەرێ.

(بِنَبَإٍ): (النَّبَأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحصلُ بِهِ عِلمٌ، أَو غَلَبَةُ ظَنٍّ، وَحَقُّ الخَبَرِ الَّذِي يُقَالُ فِيهِ نَبَأ، أَن يَتَعَرَّى عَنِ الكَذِب)، وشەی (نَبَأ) هەواڵێكە سوودێكی مەزنی هەیە، بە هۆیەوە زانیاریی، یاخود گومانێكی زاڵ پەیدادەبێ، هەواڵێك كە پێی دەگوترێ: (نَبَأ) هەقی خۆیەتی كە هیچ درۆی تێكەڵ نەبووبێ.

(فَتَبَيَّنُوٓا): (بَانَ وَاسْتَبَانَ وَتَبَيَّنَ، أَي: وَضحَ وَظَهَرَ)، واتە: ڕوون بوو، ئاشكرا بوو، (تَبَيَّنْتُهُ، أَي: وَضَّحْتُهُ وَعَرَّفتُهُ)، ڕوونمكردەوەو ناساندم، (التَّبْيِينُ: الإِيضاحُ)، (تَبيين)، واتە: ڕوونكردنەوە، ئنجا وەك چۆن (فَتَبَيَّنُوٓا)، خوێنراوەتەوە، (فَتَثَبَّتُوا)ش، خوێنراوەتەوە، دەگوترێ: (ثَبَتَ: إِسْتَقَرَّ، أَقَامَ)، واتە: نیشتەجێ بوو، دامەزرا (وَثَبَتَ الأَمْرُ، أَي: تَحَقَّقَ وَصَحَّ)، واتە: شتەكە ساغ بۆوەو، ڕاست دەرچوو، (وَفُلَانٌ تَثَبَّتَ فِي الأَمْرِ وَالرَّأي: أَي تَأَنَّى وَلَم يَعجَلْ)، واتە: لە كارەكەدا شێنەیی كردو، پەلەی نەكرد.

(بِجَهَٰلَةٍ): (الجَهْلُ: ضِدُّ العِلْمِ)، (جهل) پێچەوانەو دژی زانیارییەو، (جهل) بە سێ واتا هاتووە:

١- (عَدَمُ العِلمِ)، نەبوونی زانیاریی بە شتێك.

٢- (العِلمُ بِالشَّيءِ بِخِلاَفِ مَا هُوَ عَلَيهِ)، زانیاریی هەبوون بە شتێك، بەڵام بە پێچەوانەی حاڵ و واقیعی ئەو شتەوە.

٣- (العَمَلُ بِخِلافِ مَا يَنْبَغي) کارکردن بە پێچەوانەی ئەوە کە شایستەیە بکرێ.

(نَٰدِمِينَ): (النَّدْمُ: والنَّدَامَةُ: التَّحَسُّرُ مِن تَغَيُّرِ رَأيٍ فِي أَمرٍ فائِتٍ)، (نَدمْ و نَدامة) هەردووکیان بە مانای خەفەت خواردنن، بە هۆی ڕاگۆڕانەوە لە بارەی شتێکەوە کە تێپەڕیوە.

(لَعَنِتُّمْ): (عَنِتَ فُلَانٌ يَعنِتُ عَنَتَاً: وَقَعَ فِي أَمْرٍ يُخافُ مِنْهُ التَّلَف)، (عَنِتَ فُلَانٌ يَعنِتُ عَنَتاً)، واتە: کەوتە نێو حاڵێکەوەو کارێکەوە، کە مەترسیی هەیە تێیدا زایە بێ، یان بفەوتێ، واتە: تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی بوون.

(وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ): (أَي: صَيَّرَهُ كَرِيهاً وَكُرْهاً لَدَيكُم)، وایلێکردوە کە بوغزێنراو بێ و، ئەو شتەتان بدزێ، یانی: ناخۆشویستراو بێت لە لاتان.

(وَٱلْفُسُوقَ): (الخُرُوجُ مِن حَجْرِ الشَّرْعِ) (فسوق) بریتیە لە دەرچوون لە بازنەی شەریعەت، (فَسَقَ الرُّطَبُ: أَى خَرَجَ مِن قِشرِهِ)، هێشووە خورما لە توێکڵەکەی هاتە دەرێ.

(وَٱلْعِصْيَانَ): (عَصِيَ عِصْيَانَاً: خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ أَصْلُهُ أَن يَتَمَتَّعَ بعَصَاهُ)، (عَصِيَ عِصْيَانَاً)، واتە: لە فەرمانبەریی چووە دەرو، سەرپێچیی کرد، ئەصڵەکەشی ئەوەیە کە ئەو کەسە گۆچانی خۆی بە دەستەوە بێ و، نەچێتە ژێر باری کەس و یاخیی ببێ.

(ٱلرَّٰشِدُونَ): کۆی (رَاشِد)ە، (الرُّشْدُ وَالرَّشَدُ: خِلَافُ الغَيِّ، وَيُستَعمَلُ استِعْمَالَ الهِدَايَةِ)، (رُشد)و (رَشَد)، پێچەوانەو دژی (غَيٍّ)ە، (غَيٍّ) واتە: بە ئاوات نەگەیشتن، بێئاکام بوون، سەرگەردان بوون، کەواتە: (رُشد)و (رَشَد)، یانی: بە ئامانج گەیشتن و بە ئاکام گەیشتن، جاری واش هەیە (رُشد)و (رَشَد)، بە مانای هیدایەت بەکاردێن.

بەڵام من پێم وایەو جارانی دیکەش باسمان کردوە، ئەو دوو وشەیە: (ضَلَّ) و (غَوِيَ)، (ضَلال) و (غَوَايَة)، (ضَلال) واتە: گومڕا بوون و بەڕێ نەزانین، (غَوايَة)،

ئەنجامی گومڕاییە، واتە: بێمرادیی و بە ئاکام نەگەیشتن، دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆ بوون، وشەی (هُدَى) یان (هِدايَة)، واتە: بە ڕێ زانین، بەڵام (رُشد)و (رَشَد)، یانی: بە ئامانج گەیشتن، ئینسان کە بەهرەمەند بوو لە هیدایەت، بە ئامانجیش دەگات، بەڵام ئەگەر گیرۆدە بوو بە گومڕاییەوە، بێمرادیش دەبێ.

(بَغَتْ): (البَغي: طَلَبُ تَجاوُزِ الإقْتِصَادِ فِيمَا يُتَحَرَّى، وَبَغَى: تَكَبَّرَ وَبَغَتِ المَرأَةُ: فَجَرَت)، (بَغِي): بریتیە لە داواکردنی تێپەڕاندن لە حاڵەتی نێوەڕاست، لە شتێکدا کە خەفتانی تێدا بکرێ و، وشەی (بَغي) بە مانای خۆی بە زلگرت، هەروەها ئەگەر بۆ ئافرەت بەکاربێ، (وَبَغَتِ المَرأَةُ: فَجَرَت)، واتە: داوێن پیسیی کرد.

(فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا): واتە: ئاشتەواییان لە نێواندا بکەن، (الصَّلاحُ ضِدُّ الفَسَادِ، وَالصُّلحُ: يَخْتَصُّ بِإِزالَةِ نِفَارٍ بَيْنَ النَّاس)، (صَلَاح): چاکسازییە و پێچەوانەی خراپەکاریی و تێکدانە، (صلح) تایبەتە بە لابردنی ناکۆکیی و ناتەبایی لە نێوان خەڵکدا.

(بِٱلۡعَدۡلِ): (العَدْلُ وَالمُعَادَلَةُ، لَفْظٌ يَقتَضِي مَعنَى المُساواةِ، وَالعَدلُ وَالعِدلُ يَتقارَبانِ أَوَّلُهُما يُدرَكُ بِالبَصِيرَةِ وَالثَّانِي بِالبَصِرِ)، (عَدلُ ومُعادَلَةُ)، وشەیەکە مانای یەکسانیی دەگەیەنێ، (عَدْل) هەیەو (عِدل)، (عَدْل) واتە: دادگەریی، کە ئەمە بە بەصیرەت و بە عەقڵ دەزانرێ، بەڵام (عِدل) واتە: لابار، ئنجا باری وڵاخ هەردووک لایان پێیان دەگوترێ: (عِدْل)، چونکە بەرانبەری یەکدین، بەڵام بار بە چاوی سەر دەبینرێ.

(وَأَقۡسِطُوٓاْ): (القِسْطُ: النَّصِيبُ بِالعَدْل)، (قسط): بریتیە لە پشکێکی دادگەرانە، (كَالنَّصَفِ وَالنَّصَفَةِ)، وەک (نَصَف)و (نَصَفَة)، یانی: شتێک بە ئینصاف و بە ویژدان و بە دادگەریی دابەشکرا بێ بە یەکسانیی، (وَالقَسْطُ: أَخذُ قِسْطِ الغَيرِ، وَهُوَ جَورٌ، وَالإِقسَاطُ أَن يُعطِيَ قِسْطَ غَيرِهِ، وَذَلِكَ إِنْصَافٌ)، (قَسْط) هەیەو (إِقْسَاط) هەیە، (قَسْط): بریتیە لە وەرگرتنی بەشی ئەوی دیکە، کە ئەوە ستەمە، بەڵام (إِقساط): بریتیە لە پێدانی بەشی ئەوی دیکە کە ئەوە دادگەرییەو، وشەی

(قِسط) و (عَدْل)یش هەرچەندە زانایان بە هاو واتایان داناون، بەڵام لە ڕاستییدا (عَدْل) ماناو چەمكەكەی گشتییە، بۆ شتی ماددیی و بۆ شتی مەعنەویی، بەڵام (قِسطَ) زیاتر بۆ شتی ماددیی بەكاردێ، ئەگەر تەماشای ئەو سیاقانە بكەین كە وشەی (قِسط)یان لە قورئاندا تێدا هاتوە، بۆمان دەردەكەوێ كە زیاتر بۆ پشك و بەش و شتی ماددیی و بەرهەستە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمَۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ ﴾. ئەو ئایەتانە بە بۆنەی بەسەرهاتێكەوە هاتوونە خوارو، لەو بارەوە چەند ڕیوایەتێک هاتوون، ئێمە یەكێک لە ڕیوایەتەكان دێنین:

{عَنْ عَلْقَمَةَ بن ناجية رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَلِيدَ بْنَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ يُصَدِّقُ أَمْوَالَنَا، فَسَارَ حَتَّى إِذَا كَانَ قَرِيبًا مِنَّا، وَذَلِكَ بَعْدَ وَقْعَةِ الْمُرَيْسِيعِ، رَجَعَ فَرَكِبْنَا فِي أَثَرِهِ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَيْتُ قَوْمًا فِي جَاهِلِيَّتِهِمْ أَخَذُوا اللِّبَاسَ وَمَنَعُوا الصَّدَقَةَ، فَلَمْ يُغَيِّرْ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ .... ﴾الحجرات، وَأَتَى الْمُصْطَلِقُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَثَرَ الْوَلِيدِ بِطَائِفَةٍ مِنْ صَدَقَاتِهِمْ يَسُوقُونَها، وَنَفَقَاتٍ يَحْمِلُونَهَا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، وَأَنَّهُمْ خَرَجُوا يَطْلُبُونَ الْوَلِيدَ بِصَدَقَاتِهِمْ، فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَدَفَعُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كَانَ مَعَهُمْ وَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، بَلَغَنَا مَخْرَجُ رَسُولِكَ فَسُرِرْنَا بِذَلِكَ وَقُلْنَا: نَتَلَقَّاهُ،

فَبَلَغَنَا رَجْعَتُهُ، فَخِفْنَا أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ مِنْ سَخْطَةٍ عَلَيْنَا، وَعَرَضُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَشْتَرُوا مِنْهُ مَا بَقِيَ، فَقَبِلَ مِنْهُمُ الْفَرَائِضَ وَقَالَ: «ارْجِعُوا بِنَفَقَاتِكُمْ لَا نَبِيعُ شَيْئًا مِنَ الصَّدَقَاتِ حَتَّى نَقْبِضَهُ»، فَرَجَعُوا إِلَى أَهْلِيهِمْ وَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَنْ يَقْبِضُ بَقِيَّةَ صَدَقَاتِهِمْ}، (أَخرَجَهُ الطَّبَرانِي فِي الكَبِير: ٤، وَابنُ أَبِي عاصِم فِي الآحادِ وَالمَثَاني: ١، قُلنا وَهَذَا سَنَدٌ حَسَنٌ، قالَ الهَيثَمِي في مَجمَعِ الزَّوائِد: رَواهُ الطَّبَرانِي بِإسنادَينِ في أَحَدِهِما يَعقُوب بنُ عميد بنُ كاسِب وَثَّقَهُ بنُ حبَّان وَضَعَّفَهُ الجمهُور، قُلنا: المُتَقرِّرُ في حالِ يَعقُوب أَنَّهُ صَدُوقٌ مَا لَم يُخالَفْ، وَالحَديثُ ذَكَرَهُ السِيُوطِي في الدُرِّ المَنثور ج٧، الصَفحَة ٥٥٥، وَزادَ نِسبَتَهُ لابنِ مُردَوَيه)[1].

واتە: عەلقەمەی کوڕی ناجیە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیەطی ناردە لامان، کە زەکاتمان لێوەربگرێ، زەکاتی ماڵ و سامانمان هات، هەتا گەیشتە نیزیک ئێمە، ئەویش لە دوای ڕووداوی (المُرَیسِع)، دوایی گەڕایەوە، ئێمەش سواری وڵاخان بووین و بە دوای کەوتین، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چوومە لای کۆمەڵێک کە هەر لە سەردەمی نەفامیی خۆیاندا دەژین و، پۆشاکی جەنگیان لەبەر کردووەو ملیان نەداوە بۆ زەکات دان! بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەواڵە نەیگۆڕی، هەتا خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی دابەزاندن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ...﴾، دوایی (موستەڵەقییەکان) هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ بە دوای وەلیدا، کۆمەڵێک لە زەکات و صەدەقەکانیان لە ئاژەڵەکانیان کە لێیان دەخوڕین و، کۆمەڵێک لە پارەی نەقدینەش کە هەڵیان گرتبوو، هێنایان و، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، کە ئەوان چوونە دەرێ بە دوای وەلیددا تاکو زەکاتی ماڵەکانیانی تەسلیم بکەن، بەڵام وەلیدیان چنگ نەکەوت، ئیدی ئەوەی پێیان بوو تەسلیمی پێغەمبەریان کرد ﷺ و پێشیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! بیستوومانە نوێنەرەکەی تۆ دەرچووە بۆ لامان، ئێمەش دڵخۆش بووین و،

---

(١) الإستيعاب فـي بَيانِ الأسباب، ج٣، ص٢٧٤.

گومـان پێـی دەگەیـن، بـەڵام دوایی بیسـتمان کـە گەڕاوەتـەوە، ترسـاین ئـەوە بە هۆی تـووڕە بوونێکـەوە بێـت لەسـەر ئێمـە، دوایـی بـۆ پێغەمبەریـان ﷺ پێشـنیار کـرد کـە ئـەو زەکاتانـەی مـاون لـە جیـاتی ئـەوەی ئاژەڵەکانیـان بێنـن (حوشـترن، مـەڕو بزنـن یـان ڕەشـە وڵاخ)، پـارەی بدەنـێ لـە بەرانبـەردا، پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی هێنابوویـان (ئاژەڵەکانیـان) لـە زەکات لێـی وەرگرتـن و، پێـی فەرمـوون: بگەڕێنـەوە، سامانەکانتان بەرنـەوە، ئێمـە هیـچ بەشـێک لـە زەکات نافرۆشـین، تاکـو وەری نەگریـن (سـەرەتا شـتەکە چییـە وەک خـۆی وەری دەگریـن)، ئیـدی گەڕانـەوە بـۆ لای خـزم و کەسـیان و، ئـەوەی کـە مابـوو لـە زەکات و نەیاندابـوو، بـۆ پێغەمبەریـان نـارد ﷺ.

ئـەم بەسـەرهاتە، هـۆی هاتنـە خـواری ئـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـە بـووە، کـە پێشـتر هێنامانـن.

٢- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾، لەو بارەشەوە ئێمە ئەم ڕیوایەتە دێنین:

{عَـنْ أَنَـسِ بـنِ مالـِكٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ، قَـالَ: قِيـلَ لِلنَّبِـيِّ صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: لَـوْ أَتَيْـتَ عَبْـدَ اللَّـهِ بْـنَ أُبَيٍّ، «فَانْطَلَـقَ إِلَيْـهِ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَرَكِـبَ حِـمَارًا، فَانْطَلَـقَ الْمُسْـلِمُونَ يَمْشُـونَ مَعَـهُ وَهِـيَ أَرْضٌ سَـبِخَةٌ»، فَلَـمَّا أَتَـاهُ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، فَقَـالَ: إِلَيْـكَ عَنِّـي، وَاللَّـهِ لَقَـدْ آذَانِي نَـتْنُ حِـمَارِكَ، فَقَـالَ رَجُـلٌ مِـنَ الأَنْصَـارِ مِنْهُـمْ: وَاللَّـهِ لَحِـمَارُ رَسُـولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَطْيَـبُ رِيحًـا مِنْـكَ، فَغَضِـبَ لِعَبْـدِ اللَّـهِ رَجُـلٌ مِـنْ قَوْمِـهِ، فَشَـتَمَهُ، فَغَضِـبَ لِـكُلِّ وَاحِـدٍ مِنْهُـمَا أَصْحَابُـهُ، فَكَانَ بَيْنَهُـمَا ضَرْبٌ بِالْجَرِيـدِ وَالأَيْـدِي وَالنِّعَـالِ، فَبَلَغَنَـا أَنَّهَـا أُنْزِلَـتْ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾، (أَخرَجَـهُ البُخَـاري: ٢٦٩١، وَمُسـلِم: ٤٧٩٩).

واتـە: ئەنـەسی کـوڕی مالیـک (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتـرا: ئەگـەر بچـی بـۆ لای عەبدوڵڵای کـوڕی ئوبەییەو سـەردانی بکـەی، پێغەمبەریـش ﷺ دەرچـوو بـەرەو لای و، سـواری کەرێـک بـوو، مسـوڵمانانیش لـە خزمەتیـدا دەرچـوون، بـەڵام شـوێنەکە زەوییەکـی سـوێر هەڵێـن بـوو، (دیـارە تـۆزو خۆڵـی لـێ هەڵسـاوە)، کاتێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەیشـتە لای، عەبدوڵـڵا گـوتی: خۆتـم لـێ دوور بگـرە، بـە خـوا بـۆنی کەرەکـەت ئـازاری دام! یەکێـک لـە پشـتیوانەکان گـوتی: بـە خـوا بـۆنی کـەری پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە بـۆنی تـۆ خۆشـترە، پیاوێکیـش لـە خزمـانی عەبدوڵـڵا لەسـەر ئـەو قسـەیە بـۆ عەبدوڵـڵا تـووڕە بـوو و، لەگـەڵ ئـەو پیـاوەی پشـتیوانان قسـەیان بـە یەکـدی گـوت، دوایـی بـۆ هـەر کامێـک لـەو دووانـە، کۆمەڵێـک هاوەڵیـان تـووڕە بـوون، سـەرەنجام بـە گـژی یەکـدا هاتـن و، لێدانیـان لـە بەینـدا دروسـت بـوو، بـە لقـە دارخورمـاو دەسـت و نەعـل، ئەنـەس خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێمان گەیشـتوە کـە لـەو بـارەوە ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـە دابەزیـوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

پێشـتریش گوتمـان: ئـەم پێنـج ئایەتـە موبارەکـە دوو بابـەتی گەورەیـان گرتوونـە خۆیـان، سێ ئایـەتی پێشـەوەیان بـاسی ئـەوە دەکـەن، کاتێـک مسـوڵمانان هەواڵێکیـان پێـدەگات، لـە کەسـێکەوە کـە جێـی متمانـە نیـە، لەبـەر ئـەوەی بابایەکـی لـە ڕێ دەرچوویـە، کەسـێکە زانـراوە گوناهبـارو لادەرە لـە ڕێـی شـەریعەت، چـۆن مامەڵـە بکـەن؟!

بابـەتی دووەمیشـیان لـە دوو ئایەتەکـەی دوایـی دا، بـاسی ئەوەیـە کـە کاتێـک دوو کۆمـەڵ لـە مسـوڵمانان دەمەقاڵێیـان دەبـێ و، بـە گـژ یەکـدا دێـن، پێویسـتە چـۆن مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـرێ؟ کـە دەبـێ پێـک بهێنرێنـەوەو دەسـتی بابـای سـتەمکار بگیـرێ..

خـوا ﷻ لـە بـارەی بابـەتی یەکەمیانـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ﴿ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾، ئەگـەر لاڕێیـەک، لادەرێـک هەواڵێکـی بـۆ هێنـان، ڕوون بکەنـەوە، یـانی: (فَتَبَيَّنُـوا النَّبَـأ)، هەواڵەکـە ڕوون بکەنـەوە، خوێندراویشـەتەوە: (فَتَثَبَّتُـوا)، واتـە: چەسـپاو بـن و بـە چەسـپاویی لەگـەڵ هەواڵەکـەدا مامەڵـە بکـەن، نـەک بـە هەڵەشـەیی و بـە پەلـە پـەل، بۆچـی؟ ﴿ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ ﴾، نەبـادا کۆمەڵێـک بـە نەزانیـی تـووشی زیـان و زەرەر بکـەن، زەبرێکیـان لـێ بـدەن و دەسـتێکیان لـێ بوەشـێنن، ﴿ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴾، دوایـی بەهـۆی ئـەوەوە کـە کردووتانـە، پەشـێمان ببنـەوە، تـووشی پەشـێمانیی بـبن، هـەر بۆیـە گوتـراوە: (العَجَلَـةُ مِـنَ الشَّـيْطَانِ)، پەلەکـردن لە شـەیتانەوەیە، یانی: هەمیشـە پەلەکـردن وا لـە مـرۆڤ دەکات، تـووشی خلیسـکان و هەڵـەو لادان و تـاوان ببـێ.

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ ﴾، بشزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوتاندایە، ئاشکرایە زانیویانە پێغەمبەریان ﷺ لە نێو دایە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوتاندا، بە نیعمەتێکی گەورەی خوا بزانن و هەوڵبدەن لە بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهرەمەندبن، یاخود لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لە نێوتاندایە، دەبێ وەک بۆلا گەڕاوە (مَرجِع)ێک بگەڕێنەوە بۆ لای و ڕاوێژی پێ بکەن، نەک هەر لەخۆوە هەڵبچن و شتێک بکەن مایەی پەشیمانی بێ، یاخود کە پێغەمبەری خواتان لە نێودایەو، پێغەمبەری خواش ﷺ:

أ- لە لایەکەوە وەحیی بۆ دێ.

ب- لە لایەکی دیکەوەش عەقڵ و هۆش و تێگەیشتنی لە هی ئێوە تەواوترە، کەواتە: هەڵیمەپێچن بۆ شتێک قەناعەتی پێی نەبێ، یان پەلەی پێ بکەن بۆ بڕیارێک، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ ﴾، ئەگەر لە زۆر کاراندا بە قسەتان بکات، ئێوە تووشی نارەحەتیی دەبن، (لَعَنِتُّم)، یانی: (لَوَقَعتُم في العَنَتِ)، تووشی نارەحەتیی و سەغڵەتیی و سەختیی دێن، یانی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بە قسەتان بکات و، هەندێ پێشنیارتان لێوەربگرێ و، پەلە بکات و بڕیارێک بدات، هەنگاوێک بنێ، کە لە جێی خۆیدا نەبێ، دوایی ئێوە باجەکەی دەدەن، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ ﴾، بەڵام خوا ﷻ چونکە بەس چاکەی بۆ ئێوە دەوێ، بۆیە ئیمانی لە لای ئێوە خۆشەویست کردوەو، لە دڵتاندا ڕازاندوویەتەوەو، بێبڕوایی و لادان و سەرپێچییشی لەلای ئێوە ناخۆشویستراو کردوەو، وای لێکردوون کە کەیفتان پێیان نەیەت و بتاندزێن[1]، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴾، ئا ئەوانەی بەوجۆرەن، ئیمان لە دڵیاندا خۆشویستراوو ڕازێنراوەو جوانەو، ڕقیان لە کوفرو لادان و سەرپێچییە، ئەوانە کەسانێکی سەر ڕاستن، کەسانێکن ڕێی ڕاست دەگرنە بەرو بە ڕێی ڕاستدا دەڕۆن.

﴿ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ ﴾، ئەوەش بەخششێکە لە خواوەو چاکەیەکە لە خواوە ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾، خواش زانای کارزانە.

---

(١) بتاندزێن: حەزیان پێ نەکەن، ئەو کارەم دەدزێ: ڕقم لێیەتی و حەز بە چارەی ناکەم.

ئنجا خـوای کاربەجـێ دێتـە سـەر بابـەتی دووەم، لەبـەر ئـەوەی زۆرجـاران لـە ئەنجامـی هەواڵـی ناڕاسـت و زانیاریـی ناتـەواودا، کێشـەو بێشـەو دەمەقاڵـێ و مشـتومڕ، پەیدادەبـێ.

بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ ﴾، هـەر کاتـێ دوو کۆمـەڵ لـە بـڕواداران بەشـەڕ هاتـن، بەگـژ یەکـدا هاتـن، دەمەقاڵەیـان بـوو، ﴿ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾، ئاشـتەواییان لـە نێوانـدا بکـەن، پێکیـان بێننـەوە، ﴿ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ ﴾، ئنجا ئەگـەر یەکێکیـان هـەر ستەمی، لەوی دیکەیـان کـردو دەسـتدرێژیی کـردو، وازی نەدەهێنـا، ﴿ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴾، ئێـوە ئـەو لایەنەیـان کـە چاوی لـە سـنوور شـکاندن و دەسـتدرێژییە، لـە دژی بجەنگـن و، دەسـتی بگـرن، تاکـو دەگەڕێتـەوە بـۆ لای فەرمـانی خـوا، ﴿ فَإِن فَآءَتْ ﴾، ئنجـا هـەر کاتـێ گەڕایـەوە، یـانی: پابەندبـوو بـە شـەریعەتەوەو، چیدیکـە چـاوی لـە زوڵـم و سـتەم و خۆسـەپاندن و دەسـتدرێژیی نەبـوو، وەک سـەردەمی نەفامیـی، ﴿ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ ﴾، ئێـوەش بـە دادگەرانـە ئاشـتەواییان لـە بەینـدا بکـەن، ﴿ وَأَقْسِطُوٓا۟ ﴾، لـە پێدانی پشـک و بەشـدا دادگەربـن، وەک دواییـش بـاسی دەکەیـن: (قِسْـط) و (عَـدْل)، جیاوازییەکەیـان ئەوەیـە کـە (عَـدل) چەمکەکـەی گشـتییە بـۆ شـتی مەعنەویـی و مادديـی، بـەڵام (قِسـط) چەمـک و واتایەکـەی تایبەتـە بـە شـتی مادديیـەوەو، بـە پشـک و بـەشی مادديـی دەگوتـرێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا ئەوانـەی خۆشـدەوێن کـە پشـک و بـەشی دادگەرانـە دەدەن بـە لایـەنی بەرانبەریـان.

لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾، بـە دڵنیایـی بـڕواداران بـران، واتـە: بـرای ڕاسـتەقینەی یەکـدی، تەنیـا بڕوادارانـن، ﴿ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ﴾، ئنجـا پێکهاتـن لـە نێـوانی دوو برایەکەتانـدا بکـەن، واتـە: ئەگـەر دوو کەسـیش بـن لـە بـڕواداران پێکـەوە، دەمەقاڵـێ و ناڕێکییـان بووبـێ، پێکیـان بێننـەوە، چ جـای دوو کۆمـەڵ! ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، پارێزیـش لـە خـوا بکـەن، بەڵکـو بەزەییتـان لەگەڵـدا بنوێـنرێ، واتـە: لـە پێکهاتنیـان و پێکهێنانەوەیانـدا پارێـزکار بـن، بـە لای

کەسدا دایمەشکێنن، لەبەر ناسیاوەتیی و، خزمایەتیی و لەبەر هەر هۆیەک لە هۆیەکان بێت، بەڵکو ڕێک دادگەریی چۆنەو، ئینساف چۆن دەخوازێ، با پێکهێنانەکە بەو شێوەیە بێ و، دادگەریی ئەو بەها بەرزە بێ، کە دەیکەنە بناغە بۆ هەر جۆرە صوڵح و پێکهێنانەوەیەکی دوو کەسی ناکۆک، یان دوو کۆمەڵی ناکۆک.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

پێویستە مسوڵمانان لە هەواڵی بابایەکی لادەرو متمانە پێنەکراو بکۆڵنەوە، تاکو بە هۆی بێ سێ و دوو وەرگرتنی هەواڵەکە، تووشی هەڵەو پەشێمانیی نەبن، بەهۆی ئەوەوە کە زیان بە کەسانێک دەگەیەنن لەسەر بنەمای ئەو هەواڵە نادروستە، هەبوونی پێغەمبەریش ﷺ لە نێویان دا مایەی بەهرە لێوەرگرتنیانە بۆی و، نابێ هەوڵی ئیقناع کردنی بدەن بۆ شتانێک کە خۆیان حەزیان لێیانە، ئەگەرنا دووچاری کێشە دێن، ئەوانەش کە ئیمان لە دڵیاندا خۆشویستراوو ڕازاوەیەو، ڕقیان لە کوفرو لادان و خراپەیە، سەر ڕاستن و خوای بەخشەر چاکەی لەگەڵدا کردوون:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەمە بانگکردنی خوای بەرزە بۆ بڕواداران، بۆ جاری سێیەم لەم سوورەتە موبارەکەداو، ئەم بانگهێشتنەی خواش ﷻ بۆ بڕواداران، بۆ ئەوەیە کە دەربارەی ئەدەبی مامەڵە لە نێو خۆیاندا، بە تایبەت لە بواری وەرگرتنی هەواڵ و، دەنگ و باسدا، ڕێنماییان بکات.

٢)- ﴿إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾، هەر كات لادەرێک هەواڵێكی بۆ هێنان، ڕوونی بكەنەوە، (إنْ)، (**شرطية**)یەو، ئەو مانایە دەگەیەنێ كە ئەوەی هەواڵی لە بارەوە دەدرێ، یان ئەوەی لە دواوەیەوە دێ و باس دەكرێ، بە دەگمەن ڕوو دەدات، ﴿إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ﴾، ئەگەر وا هاتە پێش (با بە دەگمەنیش بێت)، بابایەكی لادەر هەواڵێكی بۆ هێنان، (**فَتَبَيَّنُوا**)، ڕوونی بكەنەوە، خوێنراویشەتەوە: (**فَتَثَبَّتُوا**)، چەسپاو بن و پەلە مەكەن، یانی: (**لَا تَتَعَجَّلُوا، التَثَبُّتُ: التَّحرِّي وَتَطَلُّبُ الثَّبَاتِ وَهُوَ الصِّدْقُ**)، واتە: پەلە مەكەن و بە شێنەیی لێی بكۆڵنەوە، تاكو دەگەنە ڕاستییەكی چەسپاو، وشەی (**فَاسِق**) لێرەدا بەكوردیی لادەرە، هەر كەسێكە كارێک بكات شەرع قەدەغەی كردوە لە گوناهە گەورەكان، بەهۆی ئەوەوە بە لادەر لە شەریعەت دادەنرێ، هەڵبەتە لادانی بەشیی (الفسق الجزئي)، ئەگەرنا لادانی گشتیی، بریتیە لە كوفرو یەكجاریی دەرچوون لە بازنەی ئیمان و ئیسلام، چونكە ئەویش هەر وشەی (**فِسق**)ی بۆ بەكارهاتوە لە قوڕئاندا.

هەڵبەتە مەبەست لە: ﴿إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ﴾، ئەو فاسیقە، وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەكەدا باسمان كردو، دواتریش لەو بارەوە زیاتر قسە دەكەین، مەبەست پێی: (**الوَلِيد بنُ عُقبَةُ بنُ أَبِي المُعَيط**)، كە یەكێک بووە لە هاوەڵان، بەڵام زۆر دامەزراو نەبووە.

ئنجا وشەی: (**فَتَبَيَّنُوا**)، بە عەرەبیی یانی: (**تَعَرَّفُوا وَ وَضِّحوا**)، ڕوونی بكەنەوەو، چاک هەواڵەكە بناسن، (**التَّبَيُّن: تَطَلُّبُ البَيَانِ وَظُهُورُ الأَمرِ**)، (**تَبَيُّن**): بریتیە لە داواكردنی ڕوونكردنەوەو دەرخستنی هەواڵەكە، ئنجا وشەی (**تَبَيَّنَ الأَمرُ**)، هەم بە (لازم) هاتوە: (**تَبَيَّنَ الأَمرُ، أَي: اتَّضَحَ**)، واتە: كارەكە ڕوون بووەوە، هەروەها بە (**متعدي**)یش دێ، وەک (**تَبَيَّنتُ الأَمرَ، وَأَبَنتُهُ، وَاستَبَنتُهُ: أَوْضَحْتُهُ**)، (**تَبَيَّنتُ الأَمرَ، وَأَبَنتُهُ، وَاستَبَنتُهُ**)، هەر سێكیان واتە: ڕوونم كردنەوە، كەواتە: (**تَبَيَّنوا**)، لێرەدا بە تێپەڕكەر بۆ بەركار (**متعدّي إلى المفعول**)هاتوە، واتە: ڕوونی بكەنەوەو، ساغی بكەنەوە، ئەگەر (**تَثَبَّتوا**)ش بێ، واتە: پەلە مەكەن و پێ چەسپاو بن، لە كاتێكدا لە بابایەكی لادەرو گومان لێكراوەوە كە متمانەی پێ ناكرێ، هەواڵێكتان بۆ دێ، بۆچی؟

٣)- ﴿أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٍ﴾، نەبادا کۆمەڵێک بە نەزانیی تووشی زیان بکەن، واتە: (أَنْ لاَ تُصيبُوا قَوْمَاً بجَـهَالَة)، بۆ ئەوەی کۆمەڵێک بە نەزانیی تووشی زیان نەکەن، یاخود: (كَرَاهَةً أَن تُصيبُوا قَوْمَاً بجَهَالَة)، واتە: چونکە خراپە، کۆمەڵێک تووشی زیان بکەن بە نەزانیی.

ئنجا وشەی (بجَهَالَة)، دوو واتای هەن:

أ- (أَن تُصِبُوهُم بِضُرٍّ جَهلاً مِنْكُم بهِم)، تووشی زیانێکیان بکەن، بەهۆی ئەوەوە کە نایانناسن.

ب- (أَن تُصيبُوهُم بِفِعْلٍ مِن أَثَرِ الجَهَالَة)، تووشی کارێکیان بکەن بەهۆی کردەوەی نەزانییەوە.

کەواتـە: (جَهـل) دەگونجـێ بـە مانـای نەبـوونی زانیاریـی بـێ بـە شـتەکە، دەشـگونجێ (جَهـل) بـە مانـای کردەوەیەکـی نەفامانـە بـێ، نـەک نەبـوونی زانیاریـی.

٤)- ﴿فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾، سەرەنجام بەهۆی ئەوەوە کە کردووتانە، لە پەشێمانان بن.

(فَتُصبِحُـوا: أَي فَتصِـيروا)، واتـە: ئـەوە سـەر بکێشـێ بـۆ پەشـێمان بوونەوەتـان، (نَـدم)و (نَدَامَـة) هەردووکیـان بـە مانـای خەفـەت خواردنـن بەهـۆی ڕا گۆڕانـەوە لـە بـارەی شـتێکەوە کـە تێپەڕیـوە، شـتێک کـە تێپەڕیـوە، ئنجا ڕات لـە بارەیـەوە بگـۆڕێ، کـە تـازە لـە دەسـتت چـووە!، بـە زۆریـی وایـە نەزانیـی پەشـێمانیی بـۆ خاوەنەکـەی پەیـدا دەکات و پەلکێـش دەکات.

لێـرەدا کـە خـوا ﷻ هـەم وشـەی (فاسِـق) و هـەم وشـەی (نَبَـأ)ی بـە نەزانـراو (نکـرة) هێنـاون، لـە سـیاقێکدا کـە بـە (إِنْ)ی (شَرْطیـة) هاتـوە: ﴿إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ﴾، ئەمـە لێـرەدا واتـە: تێکـڕای فاسـیقەکان هـەر جـۆرە فیسـقێک بـێ، هـەر جـۆرە هەواڵێـک بێنـن، هەواڵـەکان بـە گشـتیی، یـانی: (فاسِـق)، کـە بـە (نکـرة)

هاتـوە، هەمـوو جـۆرە فاسـیق و لادەرەكان دەگرێتـەوەو، (نَبَأ)یـش، دیسـان هەمـوو جـۆرە هەواڵـەكان دەگرێتـەوە، واتـە: هـەر بابایەكـی لاڕێ، هـەر جـۆرە هەواڵێكـی بـۆ هێنـان، ئێـوە (تبـيَّن) و (تَثَبُّـت) بكـەن، (تبَـيُّن) بكـەن، ڕوونیبكەنـەوەو، (تَثَبُّـت) بكـەن، پەلـە مەكـەن، كـە دیـارە ئـەو دووەش پێكـەوە پەیوەسـتن، كەسـێك كـە پەلـە دەكات لـە شـت، بـۆی ڕوون نابێتـەوەو، ناتوانـێ ڕوون و سـاغی بكاتـەوەو، هەروەهـا كەسـێك كـە (تَثَبُّـت) دەكات و، پـێ دەچەسـپێنێ و پەلـە نـاكات، هەڵەشـە نابـێ، ئـەوە هـاوكاری دەبـێ كـە باشـتر ئـەو هەواڵـەی بـۆ ڕوون و سـاغ بێتـەوە.

٥)- ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾، بشزانن كە پێغەمبەری خواتان ﷺ لە نێودایە، شتێكی ئاشكرایە كە پێغەمبەری خوایان ﷺ لە نێودایە، كەواتە: مەبەست تەنیا مانا ڕواڵەتییەكەی نیە، بەڵكو زانایان چەند واتایەكیان بۆ لێكداونەوە:

١- مادام پێغەمبەری خواتان ﷺ لە نێودایە، لە هەبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهرەمەند بن و سوود لە بوونەكەی وەربگرن و، هەر لە خۆوە بڕیار مەدەن، لە خۆوە بە دوای قیل و قال و هەواڵ و دەنگ و باسی ناڕوون مەكەون.

٢- مادام پێغەمبەری خواتان ﷺ لە نێودایە، پارێز لەوە بكەن كە درۆ بكەن، یان شتێكی ناهەق بڵێن، چونكە دوایی خوا ﷻ هەواڵی پێدەدات.

٣- بزانن كە پێغەمبەری خواتان ﷺ لە نێودا هەیە، كەواتە: پێچەوانەی ڕێزو ئەدەب بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ نواندنە، كە ئەو تەشریفی لە نێوتاندابێ، كەچی ئێوە نەیكەنە بۆلا گەڕاوە (**مرجِع**)تان.

٦)- ﴿لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ﴾، ئەگەر لە زۆر شتاندا بە قسەتان بكات، تووشی گرفتاریی و ناڕەحەتیی دەبن.

(**لَعَنِتُّم، أَي: لَنَا لَكُم العَنتُ وَهُوَ المُشَقَّة وَالشِّدَّةُ**)، تـووشی (**عَنَتْ**) دەبـن، ئەویـش بریتیـە لـە زەحمەتیـی و ناڕەحەتیـی و گرفتاریـی، خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿فِي كَثِيرٖ مِّنَ

﴿ٱلۡأَمۡرِ﴾، لە زۆر کاران دا، نەک لە هەموو شتێکدا، چونکە هەندێک کار هەن، لە مەودای عەقڵی بەشەردان و، باوو زاندراون و، دەزانرێن، ئەوانە پێویست ناکات بگێڕدرێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە وردە شتدا، شتی خێزانیی، شتی کۆمەڵایەتیی، شتێک کە بە عەقڵ و زگماک زانراوەو، باوە خێری چۆنەو شەڕی چۆنە؟

٧)- ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾، بەڵام خوا ﷻ ئیمانی لە لاتان خۆشەویست کردوە.

٨)- ﴿وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾، هەروەها لە دڵیشتاندا ڕازاندوویەتەوە، کەواتە: مادام خوا ﷻ ئیمانی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵتاندا ڕازاندوویەتەوە، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، چونکە پێغەمبەری خوا دەتانگەیەنێ بە ئیمانێک کە خۆویستراوو ڕازێنراوەیە لە دڵتاندا، مادام خوا ﷻ ئیمانی لە دڵتاندا خۆشویستراوو ڕازێندراوە کردوە، کەواتە: شوێن ئەو ئیمانە خۆشەویست و ڕازێنراوەیە بکەون لە دڵتاندا، هەروەها ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێتان ڕادەگەیەنێ.

٩)- ﴿وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَ﴾، خوا ﷻ بێبڕوایی و لادان و سەرپێچیی لە لای ئێوە بوغزێنراو کردوە، ناخۆشویستراو و ناپەسند کردوە، یانی: (**جَعَلَ الكُفْرَ عِنْدَكُم مَكرُوهاً**)، بێبڕوایی لە لای ئێوە وای لێکردوە، کە ئێوە کوفرتان بدزێ و، ڕقتان لێی بێ و، کەیفتان پێی نەیەت، (**الفُسُوق: ما دُونَ الكُفرِ، وَالعِصيَانُ ما دُونَ الكَبائِر**)، لادان (**فُسُوق**)یش بریتیە لەوەی لە خوار کوفرەوە بێ و، لە گوناهە گەورەکان بێ، سەرپێچیی (**عِصيَان**) یش ئەوەیە کە لە خوار گوناهە گەروەکانەوە بێ، واتە: هەر کام لە بێبڕوایی کە گەورەترین گوناهە، پاشان گوناهە گەورەکان کە بەهۆیانەوە مرۆڤ بە لادەر دادەنرێ، دوای ئەوە گوناهەکانی دیکە، کە مرۆڤ بەهۆیانەوە بە سەرپێچییکار دادەنرێ، خوا لە لای ئێوەی ناخۆشویستراوی کردوون.

١٠)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾، ئەوانەن ڕێی ڕاستگرتووان.

١١)- ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗ﴾، ئەوەش بەخششەو چاكەیە لە لایەن خواوە.

١٢)- ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾، خواش زانای كاربەجێیە.

كەواتە: ئەوانەی ئیمانیان خۆشدەوێ و ئیمان لە دڵیاندا ڕازێنراوەیە، وەك ئەنجامێكی ئاسایی ڕقیان لە كوفرەو، لێی دوور دەكەونەوە، هەروەها ڕقیان لە گوناهە گەورەكانەو، ڕقیشیان لە كۆی سەرپێچییەكانە.

لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ﴾، ئەم بەڵام (**إستدراك**)ە، بۆ دڵدانەوەی بڕوادارانە، كە خوا ﷻ لێیان نەگەڕاوە، حەواڵەی خۆیانیان بكات، تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی ببن، بەڵكو ئیمانی لەلا خۆشەویست كردوون و ڕازاندوویەتەوەو، كوفرو لادان و سەرپێچییشی لەلا بوغزێنراو كردوون، ئەوانەش كەسانی سەر ڕاستن.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾، ئەوانەن ڕێی ڕاستگرتووان، یاخود مانایەكەی ئاوایە: بەڵام خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەرەكەی ناكات، مەگەر بە شتێك كە سەرەنجامی چاكی تێدایە، هەرچەندە ئەو شتەی خوا فەرمانی پێ بە پێغەمبەر ﷺ كردوە، بەپێی ئارەزووی پەلەی ئێوەش نەبێ، كە بریتیە: لەو حوكمە شەرعییانەی ئیمان دەیانخوازێ، هەرچەندە جاری وابێ لەگەڵ فیكرو سەلیقەو ئارەزووی ئێوەشدا تێك بگیرێ.

یاخود مەبەست لە ئیمان لێرەدا، ئیسلام و بنەمایەكانی ئیسلامە، واتە: بەڵام خوا پابەندیی بە ئیسلامی لە دڵی ئێوەدا خۆشەویست كردوەو ڕازاندوویەتەوە، بۆیەش وشەی: (حَبَّبَ) و (وَكَرَّهَ)، بە پیتی (إلى) بەركاریان خواستوە، تاكو مانای گەیاندی (بَلَّغَ)یان بخرێتە نێو، یانی: (**بَلَّغَ إِلَيكُمُ حُبَّ الإيمانِ، وَكَرَّهَ وَبَلَّغَ إِلَيكُم كَراهَةَ الكُفرِ وَالفُسُوقِ وَالعِصيانِ**)، واتە: خوا ﷻ گەیاندوویەتە لای دڵی ئێوە، خۆشویستنی ئیمان و ڕازێنراوەیی ئیمان، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: ڕق لێبوونەوەی كوفرو لادان و سەرپێچیی، پێتان گەیاندووە، بەڵام بۆ وشەی (زَيَّنَه)،

(إِلى)ی بەکارنەهێناوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾، بەڵکو هەر بۆ خۆی بەبێ پیتی دیکە بەرکاری خواستوە، چونکە جوانیی ئیمان لە دڵیاندا شتێکی ڕاستەوخۆ بووە، بەهۆی ئەوەوە کە فەرمانبەریی خوایان کردوە، لە خۆشویستنی ئیمان و ڕق لێبوونەوە لە کوفرو لادان و سەرپێچییدا، لە ئەنجامی ئەوەدا ڕازاوەیی ئیمان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیدابووە.

وشەی (**لكِنَّ**)، زانایان لە زمانی عەرەبییدا دەڵێن: پیتی ڕاستکردنەوەیە (**حَرفُ الإستِدرَاكِ**) و لە کوردیی دا دەبێتەوە (بەڵام).

ئنجا مانایەکی دیکەی (**لكنَّ**) لێرەدا ئاوایە: (**لكِنَّ اللهَ لَا يُقِرُّ نَبِيَّهُ عَلَى إِطَاعَتِكُم بَل يُسَدِّدُهُ بالوَحِي**)، بەڵام خوا ﷻ ناهێڵێ پێغەمبەرەکەی بە قسەی ئێوە بکات، لە شتێکدا کە تووشی ناڕەحەتیی بن، بەڵکو بەهۆی وەحییەوە سەر ڕاستی دەکات و، ڕاستە ڕێی دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗ﴾، وشەی (**فَضلاً**) و (**نِعمَةً**) هەردووکیان مەنصووبن، لەسەر حاڵەتی بەرکاری ڕەها (**مفعول مطلق**)، کە بۆ ڕوونکردنەوەی هەر کام لە کارەکانی: (**حَبَّبَ**) و (**كَرَّهَ**) و (**زَيَّنَه**)ن، چونکە ئەو لەلا خۆشەویست کردن و لەلا بوغزێنران و لەلا جوان کردنە، لە بەخشش و چاکەی خوای پەروەردگارە.

کەواتە: ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗ﴾، یانی: خوا ﷻ لەلایەکەوە ئیمانی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵتاندا ڕازاندوویەتەوەو، لە لایەکی دیکەوەش: کوفرو لادان و سەرپێچیی لە لای ئێوە بوغزێنراو کردوە، وەک بەخششێکی خۆی و چاکەیەکی خۆی.

جیاوازیی نێوان (**فَضل**) و (**نِعمَة**)ش ئەوەیە کە (**فَضل**) مانایەکەی گشتییەو، نیعمەت و غەیری نیعمەتیش دەگرێتەوە، بەڵام (**نِعمَة**) ئەوەیە کە بەندە پێویستیی پێی هەیە، بەڵام (**فَضل**) زیاد لە پێویستی بەندەشە، واتە: خوا ﷻ

هەم ئەوەی کە پێویستتان پێیەتی، پێتان دەبەخشێ، هەم زیاد لە پێویستیی خۆشتان، پێتان دەبەخشێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، یانی: بە دڵنیایی خوا زانایە، دەزانێ هەر کەسە چەند هەڵدەگرێ و چی پێ بدات! کاربەجێشە لە کارەکانی دا، خوا ﷻ لێزانانەو کارامانە، کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات.

بەرلەوەی ئەم مەسەلەی یەکەمە بەجێ بهێڵین و بچینە سەر مەسەلەی دووەم کورتە باسێك لەبارەی دادگەریی هاوەڵان (عدالة الصحابة)ەوە دەکەین:

## کورتە باسێک لە بارەی دادگەریی هاوەڵانەوە

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتانەدا کە خوا ﷻ تێیاندا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨ ﴾. ئەو کورتە باسە دەخەینە ڕوو: بەهۆی ئەو ڕستە قورئانییەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾، ئەگەر لادەرێک هەواڵێکی بۆ هێنان! ڕوونی بکەنەوە، یاخود پەلە مەکەن، تاکو تێیدا دەگەنە حوکمێکی چەسپاو، نەک یەکسەر بە هەڵەشەیی هەواڵەکە وەربگرن.

زانایان گوتوویانە: ئەو کەسە بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەکەی کە پێشتر باسمان کرد، لە عەلقەمەی کوڕی ناجییەوەو بەسەرهاتەکەیمان هێنا، کە **(الطبراني)** لە **(معجم الكبير)**دا، هێنا بووی و **(ابن أبي عاصم)** لە **(الآحاد وَالمَثاني)** و، جگە لەوانیش، هەروەها هەردوو نووسەری **(الإستِيعاب فـي بَيانِ الأَسباب)**یش، گوتوویانە: سەنەدەکەی حەسەنە، ئەو هەواڵەی وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی موعەیط بردی بۆ پێغەمبەر ﷺ کە هەواڵێکی ناڕاست بوو، بەپێی ئەو ڕیوایەتەی باسمان کرد، هەرچەندە لە فەرمایشتەکەدا نەهاتوە کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی وەلیدی کردبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەواڵێکی ناڕاستی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بردوە کە گوتوویەتی: ئەو خەڵکە **(بَنُو المُصطَلَق)** هەڵگەڕاونەوەو هاتوون لە دژم بجەنگن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دوایی هەندێ لە هاوەڵانی ناردن، هەواڵەکەیان ساغ کردەوەو بۆیان دەرکەوت، کە نەخێر وەلید ڕاستی نەکردوە.

جا لەو بارەوە زانایان گوتوویانە: کەواتە ئەو هاوەڵە درۆی کردوەو، خوای دادگەریش بە فاسیقی ناو هێناوە، لێرەوە ئەو مشت و مڕە پەیدا بووە: ئایا هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، هەموویان دادگەرن یان نا؟ بۆیە ڕاجیاییەک لە بارەی دادگەریی هاوەڵان لێرەوە سەری هەڵداوە.

سەرەتا هەندێک قسەی (**محمد الطاهر بن عاشور**) دێنین لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: {**وَاعْلَم أَنَّ جمهُورَ أَهل السُّنَّةِ عَلَى اعتِبارِ أَصحابِ النَّبِيِّ عدُولاً، وَإنَّ كُلَّ مَن رَأى النَّبيَّ ﷺ وأَمَنَ بِهِ، فَهُوَ مِن أَصحابِهِ، وَزادَ بَعضُهُم شَرطاً أَن يَروِيَ عَنهُ أَو يُلازِمَهُ وَمالَ إِلَيهِ المازَرِي قالَ: فِي أَمالِيهِ فِي أُصُولِ الفِقهِ: وَلَسْنَا نَريد بِأَصحابِ النَّبِيِّ ﷺ كُلَّ مَن رَآهُ أَو زارَهُ لِماماً، وَإِنَّما نُرِيدُ أَصحابَهُ الَّذِينَ لازَمُوهُ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ، وَأُلَئِكَ هُمُ المُفلِحُون، شَهِدَ اللهُ لَهُم بِالفَلاح**}.

واتە: بزانە کە زۆربەی ئەهلی سوننەت[2]، (واتە: زۆرینەو جەماوەری مسوڵمانان) پێیان وایە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ) هەموویان دادگەرن و، هاوەڵانیش هەر کەسێ پێغەمبەری خوای بینیبێ و بڕوای پێی هێنابێ، ئەوە لە هاوەڵەکانیەتی، بەڵام هەندێکیان ئەو مەرجەشیان بۆ زیاد کردوە کە دەبێ هەواڵیشی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕابێتەوە، یاخود زۆر لە خزمەتی دابووبێ و، (**المازري**) ئەو ڕایەی پەسند کردوە، لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (**الأمالي**)، لە (**أُصُولُ الفِقه**)دا، گوتوویەتی: مەبەستمان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێک نیە، پێغەمبەری بینیبێ ﷺ، یاخود بە کەمیی سەردانی کردبێ، بەڵکو مەبەستمان لە (هاوەڵان)ی ئەوانەن کە لەگەڵی بوون، پشتیان گرتوەو، هاوکاری بوون و،

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص٢٣٠.

(٢) واتە: زۆربەو جەماوەری مسوڵمانان، کە لە هەندێک لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە، وشەی (أَهلُ السُّنَّة)، یان (أَهلُ السُّنَّةِ وَالجَماعة)، ناوێکی مێژووییە، وەک ناوونیشانێک بۆ زۆرینەی مسوڵمانان بەکارهێنراوە، بەڵام باشتر وایە هەر بگوترێ: زۆرینەی مسوڵمانان، جەماوەری مسوڵمانان. بڕوانە: (مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا) کتێبی دووەم، هەروەها: مەوسووعەی: [بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن] کتێبی حەوتەم.

شوێن ئەو ڕووناكییە كەوتوون، كە لەگەڵی دابەزێنراوەو، ئەوانەش سەرفرازن، خوا شایەدیی سەرفرازیی و بە مراد گەیشتنی بۆ داون.

كەواتە: هەر لە نێو زۆربەی مسوڵمانانندا دوو ڕا هەن:

**أ-** ڕایەكیان دەڵێ: هەموو هاوەڵان دادگەرن.

**ب-** ڕایەكیان دەڵێ: نەخێر هەموویان دادگەر نین، چونكە هەموویان بە هاوەڵ لە قەڵەم نادرێن، بەڵكو تەنیا ئەوانە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە قەڵەم دەدرێن و ئەوانە دادگەرن، كە زۆر لە خزمەتی دابوون، پشتیان گرتوەو، هاوكاری بوون، لەگەڵی بوون و شوێن ئەو ڕۆشناییە كەوتوون كە لەگەڵیدا دابەزێنراوە.

شایانی باسە: ئەگەر تەماشای هۆی هاتنەوە خوارەوەكەش بكەین، هەر ئەو ڕایەی دووەم دەگەیەنێ، كە دوو ڕیوایەت هاتوون، ڕیوایەتێكیانمان پێشتر هێناو ئێستاش ئاماژەیەكی پێ دەدەین: {**عَنْ عَلْقَمَةَ بن ناجية رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَلِيدَ بْنَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ يُصَدِّقُ أَمْوَالَنَا، فَسَارَ حَتَّى إِذَا كَانَ قَرِيبًا مِنَّا، وَذَلِكَ بَعْدَ وَقْعَةِ الْمُرَيْسِيعِ رَجَعَ، فَرَكِبْنَا فِي أَثَرِهِ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَيْتُ قَوْمًا فِي جَاهِلِيَّتِهِمْ أَخَذُوا اللِّبَاسَ وَمَنَعُوا الصَّدَقَةَ، ....**}، (**أَخرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي الكَبِير: ٤، وَابنُ أَبِي عاصِم في الأَحَادِ وَالمَثَانِي: ١، قُلنا وَهَذَا سَنَدٌ حَسَنٌ، قالَ الهَيثَمِي فِي مَجمَعِ الزَّوائِد: رَواهُ الطَّبَرَانِي بِإِسنادَينِ فِي أَحَدِهِما يَعقُوب بنُ عَميد بنُ كاسِب وَثَّقَهُ بنُ حبَّان وَضَعَّفَهُ الجمهُور، قُلنا: المُتَقرِّرُ فِي حالِ يَعقُوب أَنَّهُ صَدُوقٌ مَا لَم يُخالَفْ، وَالحَديثُ ذَكَرَهُ السيُوطِي فِي الدُرِّ المَنثُو ج٧، الصَفحَة ٥٥٥، وَزادَ نِسبَتَهُ لِإبنِ مُردَوَيه**)[1].

واتە: عەلقەمەی كوڕی ناجیە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەلیدی كوڕی عوقبەی كوڕی ئەبی موعیەطی ناردە لامان، كە زەكاتی ماڵ و سامانمان لێوەربگرێ، هات، هەتا گەیشتە نیزیك ئێمە، ئەویش لە دوای ڕووداوی (المُرَيسِع)، دوایی گەڕایەوە، ئێمەش سواری وڵاخان بووین و بە دوای كەوتین،

---

(١) الإستيعاب في بَيانِ الأسباب، ج٣، ص٢٧٤.

ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چوومە لای کۆمەڵێک کە هەر لە سەردەمی نەفامیی خۆیاندا دەژین و، پۆشاکی جەنگیان لەبەر کردووەو ملیان نەداوە بۆ زەکات دان...

هەروەها ئەم ڕیوایەتەش هەیە: {عَن الحارِثِ بنِ ضُرارَةِ الخُزاعِي}[1]، کە دەقە عەرەبییەکەی ناهێنم، مانایە کوردییەکەی دێنم: (الحارِثِ بنِ ضُرارَةِ الخُزاعِي)، خوا لێی ڕازی بێ، گێڕاویەتەوە دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم بۆ ئیسلام، منیش چوومە نێو ئیسلامەوەو دانم پێدا هێناو، بانگی کردم بۆ زەکات، منیش دانم بە زەکاتداندا هێنا، دوایی گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دەگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکەکەم، بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام و بۆ زەکات دان، هەر کەسێک وەڵامی دامەوە، زەکاتەکەی کۆ دەکەمەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەرێکم دەنێرێتە لا، بۆ فڵان کات و فڵان کات، تاکو ئەو زەکاتەی کۆم کردۆتەوە بۆتی بێنم، دەڵێ: کاتێک کە (الحارِثِ بنِ ضُرارَةِ)، زەکاتەکە کۆ دەکاتەوەو، دەگاتە ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ نوێنەرەکەی بنێرێ، نوێنەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دیار نابێ و ناچێ بۆ لای، ئەویش چاوەڕێ دەکات و پێی وادەبێ لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ توورەییەک بەرانبەر وی پەیدابووە، بۆیە سەرانی خەڵکەکەی (ڕیش سپییانی خەڵکەکە) خۆی بانگ دەکات و پێیان دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێکی بۆ دیاریی کردبووم کە نوێنەرێک بنێرێ بۆ لام، بۆ ئەوەی ئەو زەکاتەی لە لامە لێم وەربگرێ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەرگیز گفت و بەڵێنی دوا ناکەوێ، بۆیە پێم وایە نەهاتنی نوێنەرەکەی بۆ لامان، لەبەر ئەوەیە لێمان توورە بووە، وەرن با بچین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ **(الوليد بن عقبة)** دەنێرێ بۆ لای **(حارِث)** تاکو ئەو زەکاتەی کۆی کردۆتەوە لێی وەربگرێ، وەلید

---

(١) قال محقق تفسير روح المعاني ج١٣، وجزء ٢٦، ص٤٠٤ و ٤٠٥: إِسنَادُهُ صَحِيحٌ، أَخرَجَهُ أَحمَد: ١٨٤٨٢، والطَّبَرانِي في الكَبِير: ٣٣٩٥، وَقالَ الهَيثَمي في المَجمَع: ج٩، ص١٠٩: رَواهُ أَحمَد وَالطَّبَراني وَرِجالُ أَحمَد ثِقاتٌ، ولكن قال مؤلِّفا الإِستِيعاب في بَيانِ الأَسباب: إسناده ضعيف.

دەڕوات تاکو دەگاتە هەندێک لە ڕێیەکە، دەترسێ و دەگەڕێتەوە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! (**حارث**) زەکاتەکەی نەدامێ و ویستیشی بمکوژێ، پێغەمبەریش ﷺ سوپایەک دەنێرێ بۆ لای (**حارث**)، بەڵام (**حارث**) خۆی و هاوەڵەکانی دێن و، ئەو سوپایەی پێغەمبەریش ناردوویەتی، وەک نوێنەر بۆ ساغ کردنەوەی هەواڵەکە، پێشوازیی لێ دەکات و، ئەو کاتەی ئەوان لە مەدینە جیا بوونەوە، (**حارث**)یش پێیان دەگات، ئنجا ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ ناردوونی، دەڵێن: ئەوە (**حارث**)ە، کاتێک پێکدەگەن، (**حارث**) پێیان دەڵێ: بۆ لای کێ نێردراون؟ دەڵێن: بۆ لای تۆ، دەڵێ: بۆچی؟ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ (**الوليد بن عقبة**)ی بۆ لای تۆ ناردوە، بەڵام گەڕاوەتەوە بۆ لای و گوتوویەتی: تۆ زەکاتەکەشت نەداوەتێ و ویستووشتە بیکوژی! (**حارث**)یش دەڵێ: سوێند بەو کەسەی موحەممەدی بە هەق ڕەوانە کردوە، نە وەلیدم بینیوەو نە هاتوە بۆ لاشم.

کاتێک (**حارث**) دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموێ: زەکاتەکەت نەداوەو، ویستووشتە نوێنەرەکەشم بکوژی! (**حارث**) دەڵێ: نەخێر سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوەو تۆی ڕەوانە کردوە، نە نوێنەری تۆم بینیوەو، نە هاتوە بۆ لاشم و، منیش نەهاتم مەگەر دوای ئەوەی نوێنەرەکەی تۆ دیار نەبووە بێ بۆ لام و، لەوە ترساوم کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لێم تووڕە بووبن، (**حارث**) دەڵێ: ئیدی لە بارەی منەوە ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (**الحجرات**) هاتنە خوار:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ ﴾.

ئنجا ئەم دوو گێڕراوەیەی هۆی هاتنە خوارەوە، هەردووکیان ئەوە دەگەیەنن کە (**الوليد بن عقبة بنُ أبي مُعَيط**)، چووە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ درۆی

کردوە، بۆیەش هەبووە لە زانایان گوتوویەتی: بەم بەڵگەیە، دەگونجێ هاوەڵان هەموویان بە دادگەرو ڕاستگۆ لە قەڵەم نەدرێن.

ئنجا با چەند قسەیەکی (**الآلوسي**) ببینین، کە بەڕاستیی تاکو ڕاددەیەکی باش تیشکی خستۆتە سەر ئەو مەسەلەیە، لە تەفسیرەکەی خۆی (**روح المعاني**)دا[1]، وردەکارییەکی باش دێنێ، دەڵێ:

{واستُدِلَّ بها على أن من الصحابة رضي الله تعالى عنهم من ليس بعدل، لأن الله تعالى أطلق الفاسق على الوليد بن عقبة فيها، فإن سبب النزول قطعي في دخوله تحت حكم الآية، وهو صحابي بالإتفاق، فَيُرَدّ بها على مَنْ قال: إنهم كلهم عدول ولا يبحث عن عدالتهم في رواية ولا شهادة، وهذا أحد الأقوال في المسألة، وقد ذهب إليه الأكثر من العلماء السلف والخلف. وثانيها أنهم كغيرهم، فيبحث عن العدالة فيهم في الرواية والشهادة، إلاّ من يكون ظاهرها أو مقطوعها كالشيخين. وثالثها أنهم عدول إلى قتل عثمان رضي الله تعالى عنه ويبحث عن عدالتهم من حيث قَتْلُهُ لوقوع الفتن من حينئذ، وفيهم الممسك عن خوضها. ورابعها أنهم عدول إلاّ مَنْ قاتل علياً كرَّم الله تعالى وجهه لفسقه بالخروج على الإمام الحق، وإلى هذا ذهبت المعتزلة.

والحق ما ذهب إليه الأكثرون وهم يقولون: إنَّ مَن طرأ له منهم قادح، ككذب أو سرقة أو زناً، عُمِل بمقتضاه في حقه، إلاّ أنه لا يُصِرُّ على ما يُخِلُّ بالعدالة، بناء على ما جاء في مدحهم من الآيات والأخبار وتواتر من محاسن الآثار، فلا يسوغ لنا الحكم على من ارتكب منهم مُفْسِقاً، بأنه مات على الفسق. ولا ننكر أن منهم من ارتكب في حياته مُفسِقاً لعدم القول بعصمتهم، وأنه كان يقال له قبل توبته فاسق، لكن لا يقال باستمرار هذا الوصف فيه، ثقةً ببركة صحبة النبي صلى الله عليه وسلم ومزيد ثناء الله عز وجل عليهم كقوله سبحانه: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ...﴿١٤٣﴾ ﴾البقرة، أي عُدُولاً، وَقَولِهِ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ...﴿١١٠﴾ ﴾ آل

---

(١) ج٢٦، ص٤٠٧.

**عمـران، إلى غـير ذلـك، وحينئـذ إن أريـد بقولـه: إن مـن الصحابـة مـن ليـس بعـدل، أَنَّ منهـم مـن ارتكـب في وقـت مـا، مـا ينـافي العدالـة، فدلالـة الآيـة عليـه مسلَّمة، لكـن ذلـك ليـس محـلَّ النـزاع، وإن أريـد بـه أنَّ منهـم مـن استمر عـلى مـا ينـافي العدالـة، فدلالـة الآيـة عليـه غـير مسلَّمة كـما لا يخفـى، فتدبَّـر فالمسـألة بَعْـدُ تتحمَّـلُ الـكلاَم، وربمـا تقبـل زيـادة قـول خامـس فيهـا).**

واتـە: ئەوانـەی گوتوویانـە: هـاوەڵان هەموویـان دادگەرنیـن، بەڵگەیـان بـەم ئایەتە هێناوەتـەوە: ﴿إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ﴾، چونکـە خـوای بـەرز وشـەی فاسـیقی بـۆ **(الوليـد بـن عُقبـة)**، لـە ئایەتەکـەدا بەکارهێنـاوەو، هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەش یەکلاکەرەوەیـە کـە **(الوليـد بـن عُقبـة)** دەچێتـە بـن حوکمـی ئـەو ئایەتـە، کـە بـە یەکدەنگیـی هەمـوو لایەکیـش یەکێـک بـووە لـە هـاوەڵان، بۆیـە بـەو بەڵگەیـە بەرپەرچـی قسـەی ئـەو کەسـە دەدرێتـەوە کـە گوتوویـەتی: هـاوەڵان هەموویـان دادگـەرن و لـە دادگەرییـان ناکۆڵرێتـەوە، نـە لـە ڕیوایەتـدا کـە لێیـان گێڕدراوەتـەوەو، نـە لـە شـایەدیی دانـدا کـە شـایەدیی بـدەن، (ئنجـا ئالووسـیی سـەرجەم چـوار ڕایـان دێنـێ):

**ڕای یەکـەم:** کـە ئەمـە ڕای یەکەمـە لـەو مەسـەلەیەدا: زۆربـەی زانایـان لـە پێشـین و پاشـین ڕایـان وابـووە، (واتـە: ڕای یەکـەم لـە بـارەی هاوەڵانـەوە ئەوەیـە) کـە هەموویـان دادگـەرن و، نابـێ بکۆڵرێتـەوەو بپشـکنرێ لـە بارەیانـەوە، چونکـە هەموویـان لـە ڕووی ڕیوایەتـەوە شتیان لـە پێغەمبـەر ﷺ گێڕاوەتەوەو، ڕاسـتگۆ بوون و، هەمووشـیان لـە بـارەی شـایەدیی لێوەرگیرانیشـەوەو شـایەدییان لێوەرگیـراوە.

(مانـای دادگەرییـش ئەوەیـە، ئـەو کەسـە گوناهێکـی وانـەکات، متمانـەی پـێ نەکرێ لـە هەڵسـوکەوتیدا، بـە تایبـەتی لـە هـەواڵ گێڕانـەوە و لـە شـایەدیی دانـدا).

**ڕای دووەم:** هاوەڵانیـش وەک غەیـری خۆیـان دەبـێ لـە دادگەرییـان بکۆڵرێتەوەو، هـەم لـە ڕووی قسـە گێڕانـەوەو، هـەم لـە ڕووی شـایەدیی دانیانـەوە، مەگـەر کەسـێک ڕواڵەتەکـەی زۆر ڕوون بـێ، وەک دوو گەورەکـە: ئەبـوو بەکـرو عومـەر

(خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، {ئالووسـیی تەنیـا ئـەو دووانـەی گوتـوون، لەبـەر ئـەوەی هیـچ کـەس لـە جەمـاوەری مسـوڵمانان مشـتومڕی لەسـەر ئـەوان نەبـووە، بـەڵام لـە بـارەی عوسـمانەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و لـە بـارەی عەلییـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دیـارە کـە دوایـی مشـتومڕ پەیدابـووە، هەڵبەتـە لـە لای مسـوڵمانان ئـەو چـوارە خەلیفـە ڕاشـیدەکانی پێغەمبـەرن ﷺ، بـەڵام لـە سـەردەمی خۆیانـدا عوسـمان و عەلـی مشـتومڕ لـە بارەیانـەوە هەبـووە}.

**ڕای سێیەم:** تێکـڕای هـاوەڵان بـە دادگەر لـە قەڵەم دراون، تاکو کوشـتنی عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـەڵام لـە دوای کـوژرانی عوسـمانەوە، دەبـێ لـە دادگەریـی هـاوەڵان بکۆڵرێتـەوە، چونکـە ئـاژاوەو کێشـە لـەو کاتـەوە لـە نێویانـدا پەیـدا بـووەو، هەشـبووە - لـە هـاوەڵان - کـە نەچۆتـە نێـو ئـەو کێشـەو ئاشـووبانەوە.

**ڕای چـوارەم:** هەموویـان دادگـەرن، جگـە لـەوەی کـە لـە دژی عەلیـی جەنگـی کـردوە، {ئـەو وشـەی (**كَـرَّمَ اللـهُ وَجهَـهُ**)ی بـۆ بەکارهێنـاوە}، خـوا ڕێـز لـە ڕووی بگـرێ، [ئـەم وشـەیە زۆرم لێکۆڵیتـەوەو هیـچ سـەرچاوەیەکم نەبینیـوە بـاسی بـکات، هەرچەنـدە زۆر لـە زانایـان بـۆ عەلـی بـەکاری دێنـن، بـەڵام پێـم وایـە بـاش و ڕاسـت وایـە وەک ئـەوانی دیکـە هـەر بگوتـرێ: خـوا لێـی ڕازی بـێ}، چونکـە لـە دژی عەلیـی ڕاپەڕیـون و سـەرپێچییان لـێ کـردوەو بەهـۆی ئـەوەوەش فاسـیق بـوون، چونکـە کەسـێک لـە فەرمانبەریـی حوکمڕانی هـەق دەربچـێ بـە فاسـیق و لادەر دادەنـرێ، (بـە یاخیـی دەژمێـررێ)، ئەمـەش ڕای موعتەزیلەیـە.

دوایـی دەڵـێ: بـەڵام هـەق و ڕاسـت ئەوەیـە کـە زۆربـەی مسـوڵمانان بـۆی چـوون و، ئـەوان دەڵێـن: هـەر کەسـێک لـە هـاوەڵان بریندارکەرێکـی بـۆ پەیدابووبـێ، (واتـە: سـیفەتێک کردارێـک کـە لـە دادگەریـی بشـۆرێنێ)، وەک درۆکـردن، دزیی کـردن، زینا کـردن، ئـەوە پێویسـتە لـە بـارەی ویـەوە کار بـە داخوازیـی ئـەو بریندراکـەرە بکـرێ، بـەڵام ناگونجـێ هیـچ کام لـە هـاوەڵان لەسـەر شـتێک بـەردەوام بـێ، کـە دادگەریـی

تێدا بفەوتێنێ، بە بەڵگەی ئەوە کە لە بارەیانەوە لە ئایەتاندا مەدحی زۆر هاتووەو بە تەواتورو شوێنەوارو ڕەوشتە جوانەکانیان بە ئێمە گەیشتوون، بۆیە بۆمان دروست نیە، بینا لەسەر ئەوەی یەکێکیان گوناهێکی کردوە پێی فاسق بووە، بۆ وی بە فاسیق دانەر بووە، بڵێین: لەسەر فیسق مردوە، نکووڵییش لەوە ناکەین کە هەیانبووە لە ژیانی خۆیدا فاسیقکەرێکی ئەنجام داوە، (گوناهێک و ڕەفتارێکی لێ پشکۆتۆتەوە کە پێی فاسیق بووەوبە لە ڕێ لادەر دانراوە)، چونکە ناگونجێ بڵێین: هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە هەڵە پارێزراو بوون، وەک پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام**) مەعصووم بوون، ئنجا ئەو کەسەی گوناهێکی کردوە کە پێی فاسیق بووە، پێش تەوبەکردنەکەی پێی دەگوترێ: فاسیق، بەڵام نابێ بگوترێ: بەردەوام ئەو وەسفەی هەر بۆ بەکاردەهێنرێ، لە بەرەکەتی هاوەڵایەتیی پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەموو ستایشەی خوا عزوجل لە بارەیانەوە، بۆ وێنە: کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ...﴿١٤٣﴾ ﴾**البقرة**، واتە: ئێوەمان کردوە بە کۆمەڵێکی میانجیی، یان باشترین کۆمەڵ، (**وَسَطًا: أَي عُدُولاً**)، واتە: دادگەرن، هەروەها کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ...﴿١١٠﴾ ﴾**آل عمران**، ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیداکراون، ئنجا لەو کاتەدا کە بگوترێ: لە هاوەڵان هەیە کە دادگەر نیە، ئەگەر مەبەست ئەوە بێ، هەیانە لە کاتێکدا گوناهێکی کردوە کە پێچەوانەی دادگەرییە، دەلالەتی ئایەتەکە بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ و، شتێکی سەلمێنراوە، بەڵام ئەمە شوێنی مشتومڕەکە نیە، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێ، لە هاوەڵاندا هەیە، بەردەوام بووە لەسەر شتێک کە پێچەوانەی دادگەرییە، ئەوە دەلالەتی ئایەتەکە نایگەیەنێ و، سەلمێنراو نیە و ئەوەش شێردراوە نیە، [دوایی ئالووسیی دەڵێ:] وردبەوەو ڕامێنە، چونکە مەسەلەکە دووبارە قسەی دیکەش هەڵدەگرێ و، ڕەنگە ڕایەکی دیکەی پێنجەمیش هەڵبگرێ، زیاد لەو چوار ڕایەی هێنران.

### ڕای بەندە لەو بارەوە:

پێم وایە ڕای ڕاست و هاوسەنگ لەو بارەوە، لە دوو شتدا خۆی دەنوێنێ:

**یەکەم:** پۆلێن کردنی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دەبێ هاوەڵان پۆلێن بکرێن، نەک هەموویان یەک حوکمیان بدرێ، ئەویش بە زۆر بەڵگان:

١- ئەوە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الحديد**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا...﴿١٠﴾﴾، واتە: ئەوانەتان کە لە پێش ئازادکردنی مەککەدا، ماڵی خۆیان بەخشیی و جەنگیان کرد، یەکسان نین لەگەڵ ئەوانەدا کە دوای ئازادکردنی مەککە جەنگیان کردو ماڵی خۆیان بەخشیی، ئەوانی پێشێ پاداشتیان مەزنترە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**التوبة**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ...﴿١٠٠﴾﴾، واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و لە پشتیوانان و، ئەوانەی بە چاکیی شوێنیان کەوتوون، ئەوانە خوا لێیان ڕازییەو خوا ڕازییان دەکات.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الفتح**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ...﴿١٨﴾﴾، **الفتح**، واتە: بە دڵنیایی خوا لەو بڕوادارانە ڕازیی بوو کە لە ژێر درەختەکەدا پەیمانیان پێدەدای... کەواتە: هاوەڵان ناگونجێ هەموویان یەک حوکمیان بدرێ، پێشتریش لەو بارەوە قسەمان کرد.

**دووەم:** هەر کەسێک لادان و تاوانی زلی لێ دەرکەوتبێ و لەسەریشی بەردەوام بووبێ، دەبێ هەڵبهاوێردرێ، بەڵام ئەوانی دیکە، حوکمە گشتییەکەیان دادگەر بوونە، بە تایبەت لە ڕیوایەتدا، بەڵێ ئێمە نازانین گوناهکارەکە خاتیمەی چۆن بووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە: ئەوەی ئایەتەکە دەیگەیەنێ، یەوەیە کە بە فاسیق لە قەڵەم دەدرێ، کەسێکیش بە فاسیق لە قەڵەم درا، ئەو کاتە ڕیوایەت و شایەدیی لێ وەرناگیرێ.

پێم وایە یەکەم: دەبێ هاوەڵان پۆلێن بکرێن، دووەم: هەر کەسێ گوناهێکی زەق و ڕوونی لێ دەرکەوتبێ، دەبێ جیا بکرێتەوەو هەڵبهاوێردرێ، ئەوانی دیکەش هەر لەسەر ئەصڵی حاڵەتی خۆیان کە خوا سبحانه وتعالى ئەو هەموو مەدحەی کردوون، لەسەر ئەو حاڵەتە دەمێننەوەو، هەموویان بە دادگەر لە قەڵەم دەدرێن.

مەسەلەی دووەم:

**ئەگەر دوو كۆمەڵ لە بڕواداران بە گژ یەكدا هاتن و شەڕیان بوو، لەسەر كۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامیی پێویستە پێكیان بێنێتەوەو، ئەگەر لایەكیان وازی نەهێنا، بە هێز ڕێی لێ بگیرێ، تاكو مل دەدات بۆ هەق و، ئەو كاتە دادگەرانە ئاشت بكرێنەوەو، بڕواداران برای ڕاستەقینەی یەكدین و، دەبێ ئاشتەوایی لە نێوان دوو كەسی ناكۆكیشدا بكرێ، چ جای دوو كۆمەڵ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾، ئەگەر دوو كۆمەڵ لە بڕواداران بەگژ یەكدا هاتن، ئاشتەواییان لە نێوان دابكەن و پێكیان بهێننەوە، (**إن: حَرفُ شَرْطٍ يُخَلِّصُ الماضِي بِالإستِقبالِ، فَيَكُونُ فِي قُوَّةِ المضَارِعِ**)، ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ ﴾، (**إِنْ**) پیتی مەرجە، كردارێك كە ڕابردوویە دەیكات بە داهاتوو، بۆیە ئەو كردارە كە بە ڕابردوو دێ، بە هۆی (**إِنْ**)ەوە كە بۆ مەرجە، هێزی كردارێكی ئێستایی پێ دەدات، كەواتە: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾، ئەگەر لە داهاتوودا كۆمەڵێك لە بڕواداران بەشەڕ هاتن و بە گژ یەكدا هاتن، یەكسەر پێكیان بێننەوە، (**الصُّلحُ**): بریتیە لە لابردنی ناتەبایی و نارێكیی و ناكۆكیی، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە زانایان گوتوویانە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ ﴾، پێشێ باسی دوو طائیفە دەكات، دوایی دەیكات بە كۆ، لەبەر ئەوەی كۆیەكە لە هەردوو كۆمەڵەكە پێكهاتوە، بۆیە ڕاناوی كۆی بۆ بەكارهێناوە، دەنا بە ڕواڵەت دەبوو بیفەرمووبایە: (**وَإِن طائِتانِ مِنَ المُؤمِنِينَ اقتَتَلَتَا**)، ئەگەر دوو كۆمەڵ لە بڕواداران پێكەوە بەشەڕ هاتن.

٢)- ﴿ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴾، ئنجا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژیی کردە سەر ئەوی دیکە، (**البَغيُ: الظُّلمُ وَالإعتِداءِ عَلَى حَقِّ الغَيرِ، وَهُوَ هُنا اسْتُعْمِلَ بِمَعْنَاهُ الْلُّغَوِي لاَ الفِقْهِي، وهي الطَّائِفَةُ الخَارِجَةُ عَنِ الحَقِّ**)، وشەی (**بَغي**) بە مانای ستەم و دەستدرێژیی کردن بۆ سەر مافی ئەوی دیکە دێ، لێرەدا بە مانا زمانەوانییەکەی بەکارهاتوە، کە بریتیە: لە ستەم و دەستدرێژیی و سنوور شکێنیی، نەک بە مانا فیقهییەکەی کە بریتیە لە (**أَهلُ البَغي**)، کە کۆمەڵێکن لە فەرمانی حوکمڕانێکی ڕەوا دەردەچن، ئنجا دەفەرموێ: ئەگەر یەکێک کە لەو دوو کۆمەڵەی بە شەڕ هاتوون، هەر سوور بوو لەسەر دەستدرێژیی کردنە سەر ئەوی دیکە.

٣)- ﴿ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِ ﴾، لە دژی ئەوەیان کە ستەم و دەستدرێژیی دەکات، بجەنگن، تاکو دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا.

لێرەدا: (**فَقَاتِلوا**)، فەرمانەو بۆ فەرزیشە، واتە: فەرزە ئێوە دەستی ئەو لایەنە بگرن کە چاوی لە سنوور شکێنیی و ستەمەو، بەهێز لە بەرانبەریدا بوەستن، تاکو دەیگێڕنەوەو ملی پێ کەچ دەکەن بۆ فەرمانی خوا، فەرمانی خواش بریتیە: لە دادگەریی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ ... ﴿٩٠﴾ ﴾**النحل**، هەروەها بریتیە لە هەق، ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ... ﴿٢٩﴾ ﴾**الكهف**.

٤)- ﴿ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ ﴾، ئەگەر گەڕایەوە (ئەو لایەنەی چاوی لە زوڵم و دەستدرێژیی بوو بۆ سەر لایەکەی دیکە)، دادگەرانە ئاشتەواییان لە نێواندا بکەن.

٥)- ﴿ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾، لە پێدانی پشک و بەشدا دادگەربن، بێگومان خوا ئەوانەی پشک و بەش بە دادگەریی دەبەخشن، خۆشیدەوێن، لە تەفسیرەکاندا کەمتر بینیومە جیاوازییان کرد بێ لە نێوان وشەی (**عَدل**) و (**قِسط**)دا، بەڵام بێگومان قورئان وشەی هاوواتا (**مُتَرادِف**)ی تێدا نین و، ئەو ڕایەی زانایان بەهێزترە لەو ڕایەی دیکە، کە دەڵێ: لە قورئاندا وشەی هاوواتا هەن، لە ڕاستییدا لە قورئاندا وشەی هاوواتا نین، چونکە هاوواتا بوونی دوو وشە، یان چەند وشەیەک، بریتیە لە دووبارە بوونەوەی

تەنیا، ئنجا ئەگەر لە هەموو سیاقەکاندا تەماشای وشەی (**قِسْط**) بکەین، دەبینین کە مەبەست پێی دادگەرییە لە دابەشکردنی شتی ماددیی (پشک و بەش)دا، بەڵام (**عَدل**) بریتیە لە دادگەریی بە واتای گشتیی دادگەریی، هەم بۆ شتی ماددیی، هەم بۆ شتی مەعنەویی، لێرەدا دوای ئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ﴾، ئەگەر ئەو کۆمەڵە کە دەست درێژیی دەکرد، گەڕایەوە، پێکیان بێننەوە بە دادگەرانە، بەڵام دوایی دەفەرموێ: (**وأَقسِطُوا**)، ئنجا ئەگەر (**أَقسِطُوا**) هەر بە مانای (**إعدِلُوا**) بێ، ئەوە دەکات دووبارە بوونەوە، نا، (**أَقْسِطُوا**)، واتە: ئەو خەڵکە کە پێکەوە شەڕیان کردوە، ئەگەر یەکدییان کوشتوە، ئەگەر سەرو گوێلاکی یەکدییان شکاندوە، ئەگەر مافی یەکدییان داگیر کردوە، ئێوە لە کاتێکدا مافەکانیان بۆ یەکدیی ڕەتدەکەنەوە، دادگەربن، لە پشک و بەش پێدان و لە ڕووە ماددییەکەیەوە، کە هەق و مافی هەر کامێک بۆ ئەوی دیکە ڕەتدەکەنەوە، یان لەوی دیکە دەستێنن بۆ ئەوی دیکە، دوای ئەوەی لە ڕووی مەعنەوییەوە پێکتان هێنانەوە دادگەرانە، ئنجا لە ڕووی ماددییەوەش دادگەرانە پێکیان بێننەوە.

٦)- ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ﴾، بە دڵنیایی تەنیا بڕواداران بران، واتە: برایەتیی ڕاستەقینە تەنیا لە نێوان بڕواداران دایە.

٧)- ﴿فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡ﴾، ئنجا دوو برا ناکۆکەکەتان پێک بێننەوە، ئاشتەواییان لە بەیندا بکەن، وشەی: (**أَخَوَيْكُم**)، خوێنراویشەتەوە: (**إِخْوَتِكُم**)، برایەکانتان کە بەینیان تێکچووە، پێکیان بێننەوە، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**إِخْوَانِكُم**)، ئنجا هەندێک لە زانایان گوتوویانە: وشەی (**إِخوان**)، ئەو برایەتییەیە کە لە ڕووی ڕەچەڵەک و نەسەبەوە یەک نەبن، بەڵام لە ڕووی دینییەوە برای یەکدی بن، بەڵام (**إِخْوَة**)، ئەوەیە کە لە ڕووی خوێن و ڕەچەڵەکەوە یەک بن و، بچنەوە سەر یەک بەرەباب، یان هەر لە باب و دایکێک بن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر تەنانەت دوو براش پێکەوە ناکۆک بوون، ئێوە ئاشتەواییان لە نێواندا بکەن، چ جای دوو کۆمەڵ، واتە: مەچن هیچ جۆرە ناکۆکییەک کە لە نێوان بڕواداراندا دەبێ، نادیدەی بگرن و بە کەمی بگرن، تەنانەت ئەگەر دوو

کەسیش بن، چونکە دوایی هەر بەهۆی ناکۆکیی ئەو دوو کەسەوە، هەندێک بەرگریی لە یەکیان دەکەن و، هەندێکی دیکە بەرگریی لە یەکی دیکە دەکەن و، دوایی دەبێتە هەراو کێشەی دوو کۆمەڵە خەڵکی زۆر، بەڵکو جار هەیە دەبێتە هی دوو نەتەوە، بەڵکو دوو ئۆممەت.

٨)- ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾، پارێزیش لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ، واتە: بەهۆی پارێز کردن لە خواوە، خوا بەزەییتان لەگەڵدا بەکاردێنێ، پارێز کردنیش لە خوا لێرەدا، بەپێی ئەم سیاقە، واتە: لە پێکهێنانەوەی بڕوادارانی ناکۆکدا، ئەهلی تەقوا بن و، بە ناهەق بە لای کەسدا دامەیشکێنن و، بەو شێوەی هەقەو دادگەریی و ئینصافە، مامەڵە بکەن.

## کورتە باسێک: وەرگرتنی

## هەشت حوکمی شەرعیی لەو پێنج ئایەتە (٦-١٠ای الحجرات)

لەبەر ڕۆشنایی کۆی ئەو پێنج ئایەتە موبارەکەدا، کە ئەم دوو مەسەلە گرنگەمان لێ هەڵهێنجان، بە باشی دەزانم ئەم کورتە باسە بکەین:

**١-** (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**فِي هذِهِ الآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى قَبُولِ خَبَرِ الواحِدِ إذَا كانَ عَدلاً، لإِنَّهُ إِنَّما أُمِرَ فِيها بِالتَّثَبُّتِ عِنْدَ نَقلِ خَبَرِ الفاسِقِ، وَمَن ثَبَتَ فِسقَهُ بَطَلَ قَولُهُ، فِي الإِخبَارِ إِجماعَاً، لأَنَّ الخَبَرَ أَمَانَةٌ وَالفِسقُ قَرِينَةٌ يُبْطِلُها**).

واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە هەواڵی تاک لە کەسێک وەردەگیرێ، ئەگەر دادگەر بوو، چونکە فەرمانکراوە بە ساغکردنەوەو پەلە نەکردن لە کاتی گواستنەوەی هەواڵی بابای لادەردا، کەواتە: کەسێک کە لادەریی و گوناهبارییەکەی دیار نەبێ، (چونکە ئەصڵ لە مسوڵمانان‌دا بریتیە لە دادگەربوون)، بۆیە ئەگەر یەک کەسیش هەواڵی هێنا، هەواڵەکەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام هەر کەسێک چەسپا کە فاسیقەو لادەرە، قسەکەشی لە هەواڵاندا بە یەکدەنگیی زانایان ڕەتدەکرێتەوە، چونکە هەواڵ ئەمانەتەو، بابای فاسیقیش فیسقەکەی دەبێتە نیشانەیەک بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو هەواڵە، کە خیانەتی لەو ئەمانەتەدا کردوە.

**٢-** هەر (القرطبي) لە هەمان سەرچاوەدا[2]، دەڵێ: (**وَفي الآية دليل على فساد قول من قال: إن المسلمين كلُّهم عدول حتى تثبَّت الجرحة، لأنَّ الله تعالى أمر بالتثبُّت قبل القبول، ولا معنى للتثبُّت بعد إنفاذ الحكم، فإنْ حَكَم الحاكم قبل التثبُّت، فقد أَصَابَ المحكوم عليه بجهالة**).

---

(١) الجَامع لأحكَامِ القُرآن: ج٢٦، ص٢٤٣.

(٢) الجَامع لأحكَامِ القُرآن: ج٢٦، ص٢٤٣.

ئـەم ڕایـەی (**القرطبـي**): (**المهـدوي**) کـە یەکێکـە لـە زانایـان هێناویـەتی، واتـە: لـەم ئایەتـەدا بەڵگـە هەیـە لەسـەر هەڵەیـی قسـەی کەسـێک کـە دەڵـێ: بـڕواداران (مسـوڵمانان) هەموویـان دادگـەرن، تاکـو تانـە دەچەسـپێ بـۆ کەسـێک کـە تانـەی لێ دەدرێ (لـە دادگەرییەکـەی)، چونکـە خـوا ﷻ فەرمـانی کـردوە بـە ڕوونکردنـەوەو، پەلـە نەکـردن بـەر لـە وەرگرتنـی هـەواڵ، (کـە دەبـێ ڕوونی بکەیـەوەو سـاغی بکەیـەوە)، هیـچ مانایەکیـش نیـە بـۆ سـاغکردنەوەی هەواڵێـک دوای ئـەوەی بڕیـار دەدرێ، بۆیـە ئەگـەر حوکمڕانێـک، یاخـود دادوەرێـک بڕیـار بـدات بـەر لـەوەی هەواڵەکـە سـاغ بکاتـەوە، ئـەوە ئـەو کەسـەی حوکمەکـەی بەسـەردا داوەو، بـە زیـانی بـووە، تـووشی زیـانی کـردوە بـە نەزانیـی.

هەڵبەتـە ئـەو ڕایـە هەیـە، کـە ئەصـڵ لـە مسـوڵمانان دا بریتـی نیـە لـە دادگـەر بـوون، بـەڵام ڕای دیکـەش هـەر هەیـە، کـە بناغـە ئەوەیـە بـڕواداران دادگـەرن.

بـەڵام مـن پێـم وایـە ئـەوە شـتێکی ڕێژەییـە، لـە کۆمەڵێکـەوە بـۆ کۆمەڵێـک و، لـە خەڵکێکـەوە بـۆ خەڵکێـک، حوکمەکـە دەگـۆڕێ، پێـم وایـە ئـەوە ڕای ڕاسـتە، چونکە دوو ڕای پێچەوانـە هـەن، هەندێـک دەڵێـن: بناغـە لـە مسـوڵمانان دا ئەوەیـە دادگـەر بـن و، هەندێـک دەڵێـن: نەخێـر دادگەریـی دەبـێ لێـی بکۆڵرێتـەوە، بـەڵام پێـم وایـە ئـەوە شـتێکی ڕێژەییـەو، لـە کاتێکـەوە بـۆ کاتێـک و، لـە خەڵکێکـەوە بـۆ خەڵکێـک دەگـۆڕێ.

٣- هەر (**القرطبي**) هێناویەتی، دەڵێ: (**فإن قضى بما يغلب على الظن، لم يكن ذلك عملاً بجهالة، كالقضاء بالشاهدين العدلين، وقبول قول العالم المجتهد، وإنما العمل بالجهالة قبول قول من لا يحصل غلبة الظن بقبوله**)، ئەم ڕایەشی لە (**القشيري**)یەوە هێناوە، دەڵێ: کاتێک بڕیار دەدرێ و حوکمێک دەکرێ بە گومانێکی زاڵ، ئەوە کارکردن نیە بە نەزانیی، بۆ وێنە: دادوەریی کردن بە بڕیاردان بە دوو شاهیدی دادگەر، هەروەها وەرگرتنی قسەی زانایەکی کۆششکەر (مجتهد)، ئەمانە پێیان ناگوترێ کارکردن بە نەزانیی، بەڵکو کارکردن بە نەزانیی بریتیە لە وەرگرتنی قسەی کەسێک کە گومانی زاڵی لێ بەرهەم نەیەت.

یانی: ئەگەر گومانی زاڵیش بەرهەم بێ، ئەویش دیسان (گومانی زاڵیش) جۆرێکە لە زانیاریی و، بە حوکم کردن بە نەزانیی لە قەڵەم نادرێ.

٤- **(محمد الطاهر بن عاشور)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: **(هَذِهِ الآيَةُ دَلِيلٌ عَلَى وُجُوبُ الْبَحْثِ عَنْ عَدَالَةِ مَنْ كَانَ مَجْهُولَ الْحَالِ فِي قَبُولِ الشَّهَادَةِ أَوِ الرِّوَايَةِ عِنْدَ الْقَاضِي وَعِنْدَ الرُّوَاةِ)**، واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر فەرز بوونی لێکۆڵینەوە لە دادگەریی کەسێک کە حاڵی نەزانراوە، لە کاتێکدا دەویسترێ شایەدیی لێ وەربگیرێ و ڕیوایەتی لێوەربگیرێ، لە لای دادوەرو لە لای ڕاوییەکان واتە: هەر کەسە لە بواری خۆیدا دەبێ لێ بکۆڵدرێتەوە، ئایا دادگەرە یان نا؟.

٥- هەر **(محمد الطاهر بن عاشور)** لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا، دەڵێ: **(دَلَّ قَوْلُهُ: ﴿فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾، أَنَّهُ تَحْذِيرٌ مِنَ الْوُقُوعِ فِيمَا يُوجِبُ النَّدَمَ شَرْعًا، أَيْ مَا يُوجِبُ التَّوْبَةَ مِنْ تِلْكَ الْإِصَابَةِ، فَكَانَ هَذَا كِنَايَةً عَنِ الْإِثْمِ فِي تِلْكَ الْإِصَابَةِ، فَحَذَّرَ وُلَاةَ الْأُمُورِ مِنْ أَنْ يُصِيبُوا أَحَدًا بِضُرٍّ أَوْ عِقَابٍ، أَوْ حَدٍّ، أَوْ غُرْمٍ، دُونَ تَبَيُّنٍ وَتَحَقُّقِ تَوَجُّهِ مَا يُوجِبُ تَسْلِيطَ تِلْكَ الْإِصَابَةِ عَلَيْهِ بِوَجْهٍ يُوجِبُ الْيَقِينَ أَوْ غَلَبَةَ الظَّنِّ وَمَا دُونَ ذَلِكَ، فَهُوَ تَقْصِيرٌ يُؤَاخَذُ عَلَيْهِ)**، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾، ئەمە هۆشداریی پێدانە لەوەی کارێک بکرێ، لە ڕووی شەرعییەوە پەشێمانیی بەدوادا بێ، واتە: گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوە لەو تووشی زیان کردنە، کە ئەمەش کنارەیە لە گوناهباریی، بەهۆی ئەو تووش کردنەوە، بۆیە خوا ﷻ لێرەدا سەرپەرشتیارانی کاروباری، هۆشداریی پێداون و ئاگادار کردوونەوە، کە هیچ کەس تووشی زیانێک نەکەن، یاخود سزا دانێک، یاخود سنوورێکی شەرعیی بەسەردا بچەسپێنن، یاخود پێ بژاردنێک، بەبێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە، یان ساغی بکەنەوە، ئایا ئەو شتەی پاڵدراوەتە لای ئەو کەسە، ڕاستە یان نا؟ چونکە ئەگەر وابکەن، ئەوە کەمتەرخەمییەکە، بەهۆیەوە گوناهبار دەبن و سزابار دەبن.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص٢٣٤ – ٢٣٣.

٦- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {قِتَالُ الْمُسْلِمِ كُفْرٌ} (أخرجه البُخاري: ٦٤٤ ومُسلِم: ٦٤)، واتە: جەنگ کردن لە دژی مسوڵمان کوفرە، مەبەست پێی مسوڵمانێکە کە یاخیی (باغي) نەبێ، ئەگەرنا بەپێی فەرمایشتی خوا: ﴿فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبۡغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِ﴾، هەروەها ئایەتی: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ...﴿١٠٤﴾﴾ آل عمران.

وەستان لە دژی یاخییان لە بەرانبەر کۆمەڵگاو قەوارەی سیاسیی مسوڵماناندا، نەک هەر ڕەوایە، بگرە فەرزیشە، (الشوكاني) لە تەفسیرەکەی (فتح القدير)دا[1]، ئەم قسە جوانە لە (ابن جرير)ەوە دێنێ، دەڵێ: (لَوْ كَانَ الْوَاجِبُ فِي كُلِّ اخْتِلَافٍ يَكُونُ بَيْنَ فَرِيقَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ الْهَرَبَ مِنْهُ وَلُزُومَ الْمَنَازِلِ، لَمَا أُقِيمَ حَقٌّ، وَلَا أُبْطِلَ بَاطِلٌ، وَلَوَجَدَ أَهْلُ النِّفَاقِ وَالْفُجُورِ سَبَبًا إِلَى اسْتِحْلَالِ كُلِّ مَا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ، وَسَبْيِ نِسَائِهِمْ، وَسَفْكِ دِمَائِهِمْ، بِأَنْ يَتَحَزَّبُوا عَلَيْهِمْ، وَلِكَفِّ الْمُسْلِمِينَ أَيْدِيَهُمْ عَنْهُمْ).

واتە: ئەگەر هەر کێشەو مشت و مڕێک لە نێوان دوو کۆمەڵ لە مسوڵماناندا پەیدادەبوو، ئەوە پێویست بووایە کە ڕابکەن و، هەر کەسە بچێتەوە ماڵی خۆی، ئەو کاتە هیچ هەقێک نەدەچەسپاو، هیچ ناهەقێک نەدەپووچێنرایەوەو، خەڵکی خاوەن نیفاق و تاوان هۆکارێکیان دەست دەکەوت بۆ ئەوەی هەرچی خوا ﷻ لێی قەدەغە کردوون، بۆ خۆیانی ڕەوا بکەن، لە ماڵی مسوڵمانان و، ئافرەتانیان بە دیل بگرن و، خوێنیان بڕێژن، بەوە کە کۆببنەوە لە دژیان و، مسوڵمانانیش دەستی خۆیان لێ بگێڕنەوە.

٧- یاخییان (البُغَاة) هەرچەندە دژی حوکمڕانێکی حوکم ڕەواو ڕەشید، گوناهبار دەبن، بەڵام بەوە کافر نابن، واتە: کۆمەڵێک لە مسوڵمانان کە لە دژی حوکمڕانێکی ڕەشیدو حوکم ڕەوا ڕادەپەڕن، گوناهبار دەبن، بەڵام پێی کافر نابن، چونکە خوا ﷻ

---

(١) ج٥، ص٧٧.

بە بڕوادار ناوی هێناون، چ لە کاتی بەشەڕ هاتن و، چ لە کاتی پێک هێنانەوەیاندا، ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا ﴾، ئەم دەقەش لەو بارەوە هەیە:

**{عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، قَالَ: سُئِلَ عَلِيٌّ رضي الله عنه، عَنْ أَهْلِ الْجَبَلِ، قَالَ: قِيلَ: أَمُشْرِكُونَ هُمْ؟ قَالَ: مِنَ الشِّرْكِ فَرُّوا، قِيلَ: أَمُنَافِقُونَ هُمْ؟ قَالَ: إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلاَّ قَلِيلاً، قِيلَ: فَمَا هُمْ؟ قَالَ: إِخْوَانُنَا بَغَوْا عَلَيْنَا} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٨٩١٨).**

واتە: ئەبوو بەختەریی دەڵێ: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە بارەی خەڵکی چیا (خەواریج) پرسیاری لێکرا، ئەوانە هاوبەشدانەرن؟ گوتی: نەخێر، ئەوانە لە شیرک ڕایان کردوە، گوترا: ئەدی مونافیقن؟ گوتی: نەخێر، چونکە مونافیقەکان بە کەمیی نەبێ یادی خوا ناکەن، (بەڵام ئەوان یەکێک لە ئێوە نوێژی خۆی لە چاو نوێژی ئەوان پێ کەمەو، ڕۆژوو گرتنی خۆی لە چاو ڕۆژوو گرتنی ئەوان پێ کەمە)، گوتیان: ئەدی چین؟ گوتی: ئەوانە برامانن، بەڵام ستەمیان لێکردووین.

٨- موعاوییەو هاوکارانی کە دژی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (خوا لێیان ڕازی بێ)، جەنگیان کرد، هەم بە پێی ئایەتەکەو، هەم بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە یاخییان **(بغاة)** دانراون، ئایەتەکە ئەوە دیارە: ﴿ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴾، بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **{تَقْتُلُ عَمَّارًا الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ} (أخرجه مُسلِم: ٢٩١٦، ، وَابنُ حِبَّان: ٦٧٣٦، وغيرهما عَن أُمِّ سَلَمَة رضي الله عنها)**، واتە: کۆمەڵی یاخییان عەممار دەکوژن.

دیارە عەممار کوڕی یاسریش لەگەڵ عەلی بوو (خوا لێی ڕازی بێ)و، لە شەڕی (صیففین)دا بە دەستی کۆمەڵی موعاوییە کوژراو، هیچ گومان لەوەدا نیە کە موعاوییەو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون بە یاخییان (بُغاة) دانراون و، لە قەڵەم دراون.

## كورتە باسێك: دە پایەی بنەڕەتیی برایەتیی ئیسلامیی[1]

### پایەی یەكەم: قووڵ و فراوان تێگەیشتن لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا:

بە دڵنیایی ئیسلام تەنیا ئەوەیە كە لە قورئان دایەو، پێغەمبەری خواش ﷺ لەمیانی ڕێبازو سوننەتی خۆیدا بەرجەستەو جێبەجێی كردوە، هەمیشە كەچفەهمیی و تەسك و سەركێڵ لە ئیسلام حاڵیی بوون، مایەی پەرتەوازەیی و بەش بەش بوونی مسوڵمانانەو، قووڵ تێگەیشتنیان لە ئیسلام، مایەی تەبایی و لێك تێگەیشتن و تەبایی و هاوكارییانە، با تەماشای ئەم دوو ئایەتە بكەین:

١- لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ ... ١٥٩﴾، واتە: ئەوانەی ئایینەكەی خۆیان بەش بەش كردوەو تێیدا بوونەتە تاقم تاقم، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە.

كە دەگونجێ ئەوە مەبەست پێی مسوڵمانان بێ، كە دواتر ئایینی خۆیان پارچە پارچەو بەش بەش دەكەن، دەشگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان و خاوەن كتێبەكان بێ.

٢- لە سووڕەتی (**الروم**)دا، كە بە تەئكید خوا ﷻ ڕوو لە بڕواداران دەكات و، دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٣١ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۢ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٣٢﴾، واتە: (ئەی مسوڵمانینە!) ئێوەش وەك هاوبەش بۆ خوا

---

(١) ئەم كورتە باسە لە: [مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا]، كتێبی پێنجەم، لاپەڕە: ٣٠٨ - ٣٢٤، چاپی یەكەم، وەرگیراوە .

دانەرەکان مەبن، ئەوانەی ئایینەکەی خۆیانیان پارچە پارچە کردو، تێیدا بوونە دەستە دەستە، هەر کۆمەڵێک بەوەی کە لەسەریەتی پێی دڵخۆشە (ئێوەش وەک ئەوان مەکەن).

بەڵام (سبحان الله) هەرچی خوا لە قورئاندا فەرموویەتی، وەک ئەوان مەکەن، بە زۆریی مسوڵمانان بە پێچەوانەکەیەوە جووڵاونەوە!، بۆ وێنە:

أ- لێرەدا (الروم - ٣١ و٣٢-دا) خوا ﷻ دەفەرموێ: وەک ئەو موشریکانە مەکەن، کە ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کردوەو بوونە تاقم تاقم.

کەچی مسوڵمانان وایان کردوە.

ب- لە سوورەتی (**الحشر**)دا خوا ﷻ لە بارەی جوولەکەکانەوە، دەفەرموێ: ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾﴾، واتە: پێتوایە (جوولەکەکان) پێکەوەن، کەچی دڵیان جۆراو جۆرە، چونکە کۆمەڵێکن نافامن.

ئنجا ئەمە بەسەر ئێمەش هاتوە!

ج- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**«لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ» قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «فمن؟** }، (**أخرجه أحمد: ١١٨١٧، والبخاري: ٣٢٦٩، ومسلم: ٢٦٦٩، وإبن حبان: ٦٧٠٣ واللفظ له، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه**).

واتە: بە دوایی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست و گەز بە گەز، (واتە: لە شتی بچووک و لە شتی گەورەدا)، شوێنیان دەکەون، هەتا ئەگەر چووبنە کونی بزمژێکەوە، بە دوایاندا دەچن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! مەبەستت پێ جوولەکەو نەصرانییەکانە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەدی مەبەستم کێیە؟

کەواتە: بنەڕەتی یەکەم بۆ برایەتیی مسوڵمانان، ئەوەیە کە مسوڵمانان باش لە قورئان و سوننەت تێبگەن، بە قووڵیی و بە فراوانیی، ئەو کاتە ئەگەر بە قووڵیی و بە فراوانیی تێگەیشتن، عەقڵ و دڵیشیان فراوان دەبێ، ئەخلاقیشیان گەورە دەبێ و، فراوان دەبێ، دەتوانن پێکەوە باشترین برایەتیی بکەن.

## پایەی دووەم: دڵ و دەروون ساغ و سەلامەت بوون:

پایەی دووەمی یەکڕیزیی و تەبایی و هاوکاریی و برایەتیی نێوان ئەهلی ئیسلام ئەوەیە، کە تاک تاکیان خاوەن دڵ و دەروونێکی ساغ و سەلیم بن، یەکەم لە بەرانبەر خوادا خاوەنی خوا بە یەکگرتن (**توحید**) بن و، لەگەڵ خەڵکیشدا بە گشتیی و، لەگەڵ ئەهلی ئیسلام بە تایبەتیی، خاوەنی دڵسۆزیی (**نُصح**) و ساغیی و بە تەنگەوە بوون و بە پەرۆش بوون بن، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴿٨٩﴾﴾ **الشعراء**، واتە: ئەو ڕۆژەی نە سامان و نە کوڕان دادی کەس نادەن، مەگەر کەسێک بە دڵێکی ساغ و سەلیمەوە هاتبێتە لای خوا ﷻ، ئینسان ئەگەر دڵەکەی ساغ و سەلیم بوو، بوغزو غەرەزی تێدا نەبوو، خۆ بەزلزانیی (**تكبُّر**)ی تێدا نەبوو، خۆ پەسندیی (**عُجب**)ی تێدا نەبوو، خەڵک بە کەم زانینی تێدا نەبوو، ئەو کاتە بابەتییانە لەگەڵ شتەکاندا مامەڵە دەکات و گوێ دەگرێ، چۆن پێی خۆشە خەڵک گوێی بۆ بگرێ، گوێشیان بۆ دەگرێ و، چۆن پێی خۆشە خەڵک هەقی لێوەربگرێ، هەقیشیان لێوەردەگرێ.

## پایەی سێیەم: بژارکران لە سیفەتە خراپەکان، (التَّحليَةُ مِنَ الرَّذَائِل):

ئەمیش بە تەئکید هۆکارێکی زۆر گەورەو گرنگی تەبایی و هاوکاریی و برایەتیی نێوان ئەهلی ئیسلامە، چونکە سیفەتە پەست و نزمە دەروونییەکان (**الرَّذَائِلُ النَّفسِيَّة**)، پشکی شێریان هەیە، لە ناتەبایی و ناکۆکیی و دوو بەرەکییدا، بە تایبەت سیفەتەکانی خۆ بە زلگریی و، خۆ پەسندیی و، ئیرەیی (**حسد**) و، ڕق لێبوونەوەو، ڕەش بینیی و، قسە ڕەقیی و، پەڕگیریی و، عەقڵ داخراویی و، دڵ گچکەیی.

## پایەی چوارەم: ڕازێنرانەوە بە سیفەتە پەسندەکان (التَّحلِيَةُ بِالفَضَائِل):

خۆ ڕازاندنەوەی ئەهلی ئیسلام بە تایبەت خەڵکی نێو تەوژمی ئیسلامیی، بە خەسڵەت و ئاکارە جوان و پەسندەکان، کاریگەریی زۆری هەیە بۆ یەکڕیزییان و، تەبایی و هاوکاریی نێوانیان، بە تایبەت سیفەتەکانی: بەزەیی و، خۆ بە کەمگریی و، لێزانیی و، بە ویژدان بوون و، دڵسۆز بوون و، هاوسەنگ بوون و، گەشبینیی و، عەقڵ کرانەوەو، زانست زۆریی و ئاسۆی بیر فراوانیی.

هەڵبەتە ئەوەش هەمووی لە ئەزموونی کردەییدا ئینسان پێیان دەگات، ئەگەر ئینسان لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەحم بێ، خۆ بە کەمگر بێ، گرفت بە زۆریی لە خۆ بەزلگریی پەیدا دەبن، هەروەها ئەگەر ئینسان لێزان بێ و، حیکمەت و دانایی هەبێ، بە ئینصاف بێ، دڵسۆز بێ، هاوسەنگ بێ و، پەڕگیر نەبێ و، تێنەپەڕێنێ، هەروەها ئەگەر گەشبین بێ و کراوە بێ بەرانبەر بە خەڵکی مسوڵمان و نامسوڵمان، ئەو کاتە ڕێی تەبایی و گونجاویی و هاوکاریی پێکەوە کردن و، دەستبار گرتن، تەخت و ئاچووغ دەبێ، خوای پەروەردگاریش کە دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ ﴾الشمس، واتە: بەڕاستیی سەرفراز ئەو کەسەیە، کە خۆی پاک و چاک دەکات، دیارە کاتێک مرۆڤ پاک و چاک دەبێ، واتە: لە سیفەتە خراپەکان بژار دەکرێ و، بە سیفەتە چاکەکان دەڕازێتەوەو، سەر فرازە، هەم لە دنیاداو هەم لە دواڕۆژدا.

## پایەی پێنجەم: عەیب و کەم و کوڕیی خۆ دیتن و، دانپێداهێنان بە چاکەو فەزڵی ئەوانی دیکەدا:

ئەمیش هۆکارێکی زۆر کاریگەرە، کە ئینسان عەیب و کەم و کوڕییەکانی خۆی ببینێ، پێشینانی خۆمان گوتوویانە: [ئەگەر پووشکەت لە چاوی خەڵکدا بینی، چیلکەش لە چاوی خۆتدا ببینە]، کە بێگومان نە پووشکە دەچێتە چاوی کەس

و نە چیلکەش، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە تۆ عەیبی گچکەت لە خەڵکدا بینی، هی گەورەش لەخۆتدا ببینەو، خاتری خۆت مەگرە، کە بێگومان ئەوەش دەبێتە هۆی برایەتیی و گونجاویی پێکەوەو، چاکەو فەزڵی خەڵک بینینیش دەبێتە هاندەرو ڕێخۆشکەر بۆ زیاتر خۆشویستنیان و، ڕێز لێگرتنیان، بەڵام کەسێك بەس خاڵە ڕەشەکانیان ببینێ و عادەتی مێشە ڕەشەی هەبێ، هەر بەسەر خاڵی ڕەشەوە بنیشێ، ئەو کاتە لە بەرانبەریاندا تووشی ڕەشبینی دەبێ.

## پایەی شەشەم: گونجاویی و کرانەوەو ئەرێنیی بوون:

وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**الْمُؤْمِنُ مُؤَلِّفٌ، وَلا خَيْرَ فِمَن لَا يَأْلَفُ وَلَا يُؤْلَف**}، (**أخرجه أحمد: ٩١٨٧، والحاكم: ٥٩، والبيهقي في شعب الإيمان: ٨١١٩، وَإِسنادُهُ حَسَن**)، واتە: ئیماندار پێکەوە گونجێنەرە (پێکەوە گرێدەرە)و، هەر کەسێک نەتوانێ خەڵک هۆگری خۆی بکات و، هۆگری خەڵکیش بێ، خێری پێوە نیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ كَانَ هَيِّنًا لَيِّنًا قَرِيبًا، حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ**} (**أخرجه البَيْهَقِي في الأَدَابِ: ١٩٢، والحاكم: ٤٣٥، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وقال الذهبي: صحيح على شرط مسلم**)، واتە: هەر کەسێک هێدیی و نەرم و ئاسان و نیزیک بێ، خوا لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەی دەکات.

## پایەی حەوتەم: لە بیانوو نەگەڕان و پاساو بۆ یەکدیی هێنانەوە:

ئەمیش هۆکارێکی گرنگی برایەتیی و تەبایی بەینی ئەهلی ئیمانە، با سەرنجی ئەم دەقەی سوننەت بدەین: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الْأَدْيَانِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: «الْحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ»**} (**أخرجه أحمد: ٢١٠٧، وصححه الألباني**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان

ڕازی بێ، دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: کام دینداریی خۆشەویستترە لە لای خوا ﷻ؟ فەرمووی: دینێکی پاکی لێبوردە.

لە ڕاستییدا لێبوردەیی و دڵفراوانیی و سینە سافیی، خەسڵەتێکی گەورەو گرنگی مسوڵمانانەو، هۆکارێکی یەکجار گەورەو کاریگەری تەبایی و یەکڕیزیی هاوکاریی پێکەوە کردنیانە.

## پایەی هەشتەم: ڕووگەشیی:

**{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ»} (أخرجه مُسلِم: ٢٦٢٦).**

واتە: ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێک لە چاکە بە کەم مەگرە، ئەگەر هەر ئەوەندەش بێ کە بە ڕووی خۆش بگەیە برایەکەی خۆت، (هەروەها خوشکی خۆشت).

وەک زۆر جار گوتوومانە: دیارە مەجلیسەکە مەجلیسی پیاوان بووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ باسی برای کردوە، بێگومان ڕووگەشیی کاریگەریی زۆر چاکی بۆ تەبایی و دۆستایەتیی هەیەو، زەردەخەنە لە ڕووی براو خوشکی مسوڵمانتداو، ڕوو خۆش بوون و کراوە بوون، کاریگەریی زۆری هەیە بۆ لابردنی زۆر غەورو چڵک و چەپەرو تەم و مژ، ئەگەر بە دڵی بەرانبەرەکەتەوە نیشتبێ.

## پایەی نۆیەم: زمان شیرینی:

خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ...﴿٨٣﴾﴾البقرة، واتە: قسەی باش بۆ خەڵک بکەن، یان لەگەڵ خەڵکدا بە گشتیی قسەتان چاک بێ، دیارە ئەگەر لەگەڵ خەڵکدا قسە باش بوون پێویست بێ، بە تەئکید لە نێو بازنەی

ئەهلی ئیماندا پێویستترە، وەک گوتراوە: (**الأَقرَبونَ أَولَى بِالمَعروف**)، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**الكَلِمَةُ الطَيِّبَةُ صَدَقَة**}، (**أخرجه البُخاري: ٢١٢٧، ومُسلِم: ١٠٠٩**)، واتە: قسەی خۆش چاکەو صەدەقەیە، پاداشتی هەیە.

ئینسانی ئیماندار دەبێ لەگەڵ هەموو کەسدا قسەی پەسندو شیرین و بە نەزاکەت بێ و، نەجیب و قسەی خۆش بێ و لە تەعبیرەکانی بخەفتێ.

## پایەی دەیەم و کۆتایی: خۆپاراستن لە زمان بە خراپە گەڕان:

خۆپاراستن لە زمان بە خراپە گەڕانیش، هۆکارێکی دیکەی زۆر گرنگە، بۆ پاراستنی تەبایی و، بەهێز کردنی برایەتیی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { **لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ**} (**أخرجه أحمد: ٣٨٣٩، والترمذي: ١٩٧٧، وابن حبان: ١٩٢، وصححه الألباني في صَحِيح الْجَامِع: ٥٣٨١**)، واتە: ئیماندار تانە لێدەرو لەعنەتکەرو قسەی ناشیرینکەرو زمان شڕ نیە.

ئیماندار نابێ ئەو ڕەفتارە ناشیرنانەی هەبن، بۆیەش ڕاستییەکەی کە دەبیستم بە تایبەت مامۆستایەک لەسەر مینبەر قسەی ناشیرین دەکات، شێوازی ناشیرین بەکاردێنێ، زۆر بەزەییم بەو مینەبەرو میحرابەدا دێتەوە، کە بە حیساب ئەو لە پێغەمبەری بە میرات گرتوون! لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر ﷺ هەموو فەرمایشتەکانی تەماشا بکە، وشەیەکی بریندارکەرو، وشەیەکی ناشیرینت چنگ ناکەوێ.

ئەمانە ئەو دە پایە بنەڕەتییە بوون، کە پێم وایە دەبنە بناغەیەکی باش بۆ برایەتییەکی مەحکەم لە نێوان ئەهلی ئیماندا، خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی هیدایەتمان بدات، کە دۆستایەتیی و برایەتیی چاک لەگەڵ ئەهلی ئیماندا بکەین و، خۆمان بەو خەسڵەتانە بڕازێنینەوە کە بناغەی برایەتییەکی مەحکەم پێک دێنن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە سێ ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (١١ - ١٣)، کە خوای زاناو کارزان بۆ جاری چوارەم و پێنجەم لەم سوورەتەدا، بانگی مسوڵمانان دەکات بە نازناوی ئیمان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، شەش خەسڵەت و خوو و خدەی خراپیان لە بواری هەڵسوکەوتی نێو خۆدا، لێ قەدەغە دەکات، سێیان ئاشکراو سێشیان پەنهان، کە ئەمانەن:

١- گاڵتە بە یەکدی کردن.

٢- ڕەخنە لە یەکدی گرتن و، عەیب لە یەکدی دیتنەوە.

٣- ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵدان.

**ئەو** سێیەیان ئاشکران و سێی پەنهانیش:

٤- گومانی خراپی بێ پاساو بە یەکدی بردن.

٥- سیخوڕیی بەسەر یەکدییەوە کردن.

٦- پاشملە بە خراپە باسی یەکدی کردن (غەیبەت).

ئەوە لە ئایەتەکانی: (١١ و ١٢)دا، ئەو شەش گوناهە دەخاتە ڕوو، لە ئایەتی سێزدە (١٣)هەمیشدا خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات و، پێنج ڕاستیی یەکجار گەورەو گرنگیان پێڕادەگەیەنێ، کە بریتین لەوانە:

١- خوا بەدیهێنەری هەموو لایەکیانە بەبێ جیاوازیی.

٢- ڕەچەڵەکی هەموویان یەکەو، لە باب و دایکێکەوە هاتوون.

٣- خوا ﷻ بۆ چەند نەتەوەو، هۆزێک دابەشکردوون.

٤- بە مەبەستی پێک ئاشنابوون و هاوکاریی پێکەوە کردن، بەو جۆرەی هەڵخستوون.

٥- ئەوەیان ڕێزی لە لای خوا ﷻ پترە کە پارێزکارترە، نەک دەوڵەمەندتر، یان بە خزم و کەستر، یان بە دەستەڵاتتر، یان .... یان هتد.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ١٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با کۆمەڵێکتان لە (پیاوان) گاڵتە بە کۆمەڵێکتان نەکات، ڕەنگە ئەوان (گاڵتە پێکراوەکان) لەوان (گاڵتە پێکەرەکان) باشتربن، هەروەها با ئافرەتانێکیش گاڵتە بە ئافرەتانێک نەکەن، لەوانەیە ئەوان (کە گەپیان پێدەکرێ) لەوان (گەپ پێکەرەکان) چاکتربن، هەروەها (بە ئاماژەی چاوو برۆ و لێو) لە عەیب و ناتەواوییتان مەخەفتێن و، ناوو ناتۆرانیش لە یەکدی هەڵمەدەن، (چونکە بە هەر کام لەوانە فاسیق دەبن و) خراپترین وەسف و ناویش پاش ئیمان، لادان (و لە ڕێی شەرع دەرچوون)ە‌و، هەر کەسێکیش نەگەڕێتەوە (لای خوا) ئا ئەوانەن ستەمکاران ﴿١١﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە زۆر گومانان دووربکەونەوە، بێگومان هەندێک گومان (کە هیچ ئەگەری پێکانی نیە) گوناهن و، سیخوڕییش (لەسەر کەس) مەکەن و، هەندێکیشتان پاش ملە باسی هەندێکتان مەکەن، ئایا یەکێکتان حەز دەکات بە مردوویی گۆشتی

برایەکەی بخوات! بە دڵنیایی دەتاندزێ (بۆیە) پارێز لە خوا بکەن، مسۆگەر خوا زۆر تەوبە وەرگری بە بەزەییە ﴿١٢﴾ ئەی خەڵکینە! بێگومان لە نێرو مێیەک (باب و دایکێک) دروستمان کردوون و، گێڕاومانن بۆ چەندان نەتەوەو هۆز تاکو پێک ئاشنابن، بە دڵنیایی ئەوانەتان لە لای خوا بەڕێزترن کە پارێزکارترن، بێگومان خواش زانای شارەزایە ﴿١٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ): با کۆمەڵێک گاڵتە بە کۆمەڵێک نەکەن، (سَخِرْتُ مِنْهُ وَاستَسْخَرْتُ لِلهُزءِ مِنهُ)، (سَخِرَ مِنهُ) یان (سَخِرَ بِهِ وَاستَسخَرَ)، ئەمە بۆ گاڵتە پێکردن و بە کەم تەماشاکردنە.

(وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ): عەیب لە خۆتان مەگرن، ناتەواویی لە خۆتاندا مەدۆزنەوە (اللَّمزُ: الإِغْتِيَابُ وَتَتَبُّعُ المعَاب)، (لَمْز): بریتیە لە بە خراپە لە پاش ملە باسی یەک کردن و، بە دوای عەیب و کەم و کوڕیی دا گەڕان.

(وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ): ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵمەدەن، (النَّبزُ: التَّلْقِيبُ، والنَّبَزُ: اللَّقَبُ، وَالجَمْعُ أَنْبَاز، نَبَزَهُ: أَي لَقَّبَهُ)، (نَبْز): بریتیە لە ناوو ناتۆرە لێ هەڵدان، (نَبَز): بریتیە لە لەقەب و ناتۆرە، کە بە (أَنباز) کۆدەکرێتەوە، (نَبَزَهُ: أَي لَقَّبَهُ)، واتە: ناتۆرەی وەدواخست و، نازناوێکی خراپی وەدواخست.

(ٱجْتَنِبُواْ): واتە: خۆتانی لێ دوور بگرن، (جانَبَهُ، وَتَجانَبَهُ، وَاجْتَنَبَهُ، كُلُّهُ بِمَعْنَىً)، ئەمانە هەر سێکیان: (جانَبَهُ، وَتَجانَبَهُ، وَاجتَنَبَهُ)، هەر سێکیان یانی: خۆی لێ دوور گرت، (وَجَنَّبَهُ شَيْئاً)، شتەکەی لێ دوور خستەوە، (وَاجتَنَبَ الشَّيْءَ)، خۆی لە شتەکە وەدوورکەوت.

(ٱلظَّنِّ ): (**الظَّـنُّ: إِسـمٌ لِـما يَحصُـلُ عَـن أَمـارَةٍ، وَمَتَـى قَوِيَـتْ أَدَّت إِلَى عِلـمٍ، وَمَتَـى ضَعُفَـت جِـدّاً لَـم يَتَجـاوَز حَـدَّ الوَهـمِ**)، (ظَـنّ) نـاوە بـۆ ئـەوە كـە لـە نیشـانەیەكەوە پەیدادەبـێ، ئەگـەر بەهێـز بـێ سـەر دەكێشـێ بـۆ زانیاریـی، بـەڵام ئەگـەر زۆر بێهێـز بـێ لـە سـنووری وەهـم ناچێتـە دەرێ، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: خۆتـان لـە زۆر گومانـان بپارێـزن، واتـە: ئـەو گومانانـەی ئەگـەری پێكانیـان كەمـەو، هیـچ نیشـانەو هیـچ هۆكارێـک نیـە، بـۆ ئـەوەی ئـەو گومانـە خراپـە لـە دڵتـدا پەیدابـێ.

(وَلَا تَجَسَّسُواْ): واتـە: سـیخوڕیی بەسـەر یەكدییـەوە مەكـەن، (**أَصْـلُ الجَـسِّ: مَـسُّ العِـرْقِ وَتَعَـرُّفُ نَبضِـهِ لِلحُكـمُ بِـهِ عَـلَى الصِّحَّـةِ وَالسُّـقمِ، وَهُـوَ أَخَـصُّ مِـنَ الحَـسِّ، وَهُـوَ مـا يَدرِكُـه الحِـسُّ**)، (جَـسّ): بریتیـە دەسـت لـە دەمـاردان و، دەسـتگرتن تاكـو بزانـرێ ئـەو كەسـە تەندروسـتە، یاخـود نەخۆشـە؟ ئنجـا (جَـسّ) لـە (حَـسّ) تایبەتـترە، (حَـسّ) هـەر شـتێكە بـە هەسـتەوەرەكان بزانـرێ، بـەڵام (جَـسّ) ماناكـەی تایبەتـترە، بریتیـە لـە وردتـر گـەڕان بـە دوای شـتێكدا.

(وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًا): هەندێكتـان بـە خراپـە بـاسی هەندێكتـان مەكـەن لـە پاشـملە، (**الغِيبَـةُ: أَن يَذْكُـرَ الإِنْسَـانُ غَـيرَهُ بِمـا فِيـهِ مِـن عَيـبٍ، مِـن غَـيرِ أَن يُحـوَجَ إِلَى ذِكـرِهِ**)، (غِيبَـة) ئەوەیـە كـە مـرۆڤ بـاسی غەیـری خـۆی بـكات بـە كـەم و كوڕییـەک كـە تێیدایـە بـاسی بـكات، بـێ ئـەوەی پێویسـتیی پێـی بـێ.

بێگومـان ئەمـە پێناسـەی شـەرعییە، ئەگەرنـا پێناسـە زمانەوانییەكـەی ئەوەیـە كـە: پاشـملە بـە خراپـە بـاسی كەسـێک بكـرێ، بـەڵام لـە ڕووی شـەرعییەوە كاتێـک قەدەغـە دەبـێ، كـە هۆكارێـک نەبـێ بـۆ ئـەو بـاس كردنـە، بـەڵام ئەگـەر هۆكارێـک و پاسـاوێک هەبـێ، وەک دوایـی بـاسی دەكەیـن، ئـەو كاتـە بـە گوناهــ لـە قەڵـەم نـادرێ.

(شُعُوبٗا): (**الشُّـعُوبُ: جَمـعُ شَـعب، القَبِيلَـةُ المُتَشَـعِّبَةُ مِـن حَـيٍّ واحِـدٍ، وَالشِّـعْبُ نَـوعٌ مِـنَ الـوَادِي**)، (**شُـعُوب**) كـۆی (**شَـعْب**)ە، (**شَـعب**)یش بریتیـە لـە هۆزێكـی لـە یـەک

کەسـەوە یـان لـە یـەک بەرەبابـەوە هاتـبن، بـەڵام (شِـعب) جۆرێکـە لـە دۆڵ و شـیو، ئەویـش ئەوەیـە کـە لایەکیـانی تەسـک بـێ و لایەکـەی دیکـەی کـراوە بـێ.

(﴿وَقَبَآئِلَ﴾): (قَبائِـل) کـۆی (قبیلة)یـە، ئەویـش بریتیـە لـە خەڵکێـک کـە کۆبوونەتەوەو هەندێکیـان ڕوو لـە هەندێکیـان دەکـەن، (**وَهِـيَ الجَماعَـةُ المُجتَمِعَـةُ الَّتِـي يُقبِـلُ بَعضُـهُ عَـلَى بَعـض**)، هەندێکیـان ڕوو لـە هەندێکیـان دەکـەن، بۆیـە پێیـان گوتـراوە: (قبیلـة)، (قبیلـة) بـە (قَبِيل)یـش و بـە (قَبائِل)یـش کۆدەکرێتـەوە.

(﴿لِتَعَارَفُوٓاْ﴾): (**تَعارَفُـوا: عَـرَفَ بَعْضُهُـم بَعْضـاً**)، هەندێکیـان هەندێکیـان ناسـی (پێـک ئاشـنا بـوون)، (**لِتَعارَفُوا**)، بـۆ ئـەوەی پێـک ئاشـنابن، ئنجا پێـک ئاشـنا بوونەکـەش بـۆ هاوکاریـی پێکـەوە کـردن و دەسـتبار بـۆ یەکدیـی گرتنـە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝١١﴾، ئەم ئایەتە موبارەکە ئەم ڕیوایەتەی لە بارەوە هاتوە:

{**عَـن أَبِي جُبَـيرَةَ بـنِ الضَّحَّـاك قَـالَ: فِينَـا نَزَلَـتِ الآيَـةُ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ ...﴾، **قَـدِمَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ المَدِينَـةَ، وَمَـا مِنَّـا رَجُـلٌ إِلاَّ لَـهُ اسـمَانِ أَو ثَلاَثَـةٌ، كَانَ إِذَا دَعَـا ﷺ الرَّجُـلَ بِالإِسـمِ، قُلْنَـا: يَـا رَسُـولَ اللـهِ! إِنَّـهُ يَغْضَـبُ مِـنْ هَـذَا، فَأُنزِلَـت:** ﴿وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ ...﴾} (**أَخرَجَـهُ أَبُـو داود: ٤٩٦٢، وَالتِرمُـذِي: ٣٢٦٨، وَالنَّسـائِي فِي التَّفسِـير: ٥٣٦، وَابـنُ ماجَـة: ٣٧٤١، وَأَحمَـد فِي المُسـنَد: (٤ج، ص ٢٦٠،٦٩)، وَالبُخـارى فِي الأَدَبُ المُفرَد: ٣٣٠، وَغَيرُهُـم، قـال مؤلِّفـا الإستيعاب: هَـذَا سَـنَدٌ صَحِيحٌ، ج٣، ص٢٧٢، ٢٨٣**).

واتـە: ئەبـوو جوبەیـرەی کـوڕی زەححـاک گوتوویـەتی: ئـەم ئایەتـە لـە بـارەی ئێمـەوە هاتـە خـوار، پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـە مەدینـە، هیـچ پیاوێـک لـە ئێمـە نەبـوو مەگـەر دوو نـاو، یـان سـێ نـاوی هەبـوون، ئنجـا کاتـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ پیاوێکـی بـە ناوێکیـانی بانـگ دەکـرد، دەمانگـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! ئـەو کەسـە لـەو نـاو هێنانـەی تـووڕە دەبـێ! {پێغەمبەریـش ﷺ نەیـدەزانی بـە کام ناوەیـان تـووڕە دەبـێ و، بـە کامەیـان تـووڕە نابـێ}، لـەو بـارەوە ئـەو ئایەتـە موبارەکـە هاتـە خـوار.

کـە هـەم گاڵتـە بـە یەکدیـی کـردنی چ پیـاوان و چ ئافرەتـان، هـەم عەیـب لـە یەکدیـی دیتنـەوەو ڕەخنـە لـە یەکدیـی گرتـن، بەبـێ بەڵگـەو پاسـاو، هـەم نـاوو ناتـۆرە لـە یەکدیـی هەڵـدان، هـەر سـێکیانی قەدەغـە کـردوون.

**٢-** لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوەش: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾، دوو گێڕدراوە دێنین، کە لە ڕووی سەنەدەوە پێمان ڕاستترن:

**أ- {عَن ابنِ أَبِي مَلِيكَةَ قالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ الفَتْحِ رَقَى بِلاَلٌ فَأَذَّنَ عَلَى الكَعبَةِ، فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: هَذَا العَبْدُ الأَسْوَدُ يُؤَذِّنُ عَلَى ظَهرِ الكَعبَةِ! وَقَالَ بَعْضُهُم: إِن يَسْخَطِ اللهَ هَذَا يُغَيِّرُهُ، فَنَزَلَت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾} (أَخرَجَهُ البَيهَقي في دَلائِلِ النُّبُوَّة ج٥، ص٧٩، بِسَنَدٍ صَحِيح إِلَى عَبدِ الرَّزاق، قُلنا: وَهَذا مُرسَلٌ صَحِيحُ الإسناد، وَذَكَرَهُ السِيُوطِي فِي الدّرّ المَنثُور: ج٧، ص٥٧٨، وَزادَ نِسبَتَهُ لابنِ المُنذِر وَابنِ أَبِي حاتَم، الإستِيعاب في بَيانِ الأَسباب: ج٣، ص٢٨٤و ٢٨٥).**

واتـە: ئیبنـو ئـەبی مەلیکـە دەڵـێ: لـە ڕۆژی سـەرکەوتنی مەککـەدا (ئازادکـرانی شـاری مەککـەدا)، لـە لایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ (لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچییـدا)، بیـلال چـووە سـەر کەعبـەو بانگـی لەسـەر کەعبـەدا، هەنـدێ خەڵـک گوتیـان: ئـەم کۆیلـە ڕەش پێسـتە لەسـەر پشـتی کەعبـە بانـگ دەدات! (واتـە: شـتێکی نەگونجـاوە)،

هەندێکیشیان گوتیان: ئەگەر خوا ﷻ ئەوەی پێ ناخۆش بێ، دەیگۆڕێ، ئیدی لەو بارەوە ئەو ئایەتە موبارەکە دابەزی.

**ب-** ڕیوایەتێکی دیکە، لە بارەی دابەزینی ئەو ئایەتە موبارەکەوە:

**{عَنِ الزُّهرِيِّ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَنِي بَياضَةَ أَن يُزَوِّجُوا أَبا هِنْدٍ امْرَأَةً مِنْهُم، فَقَالُوا! يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ! أَنُزَوِّجُ بَنَاتِنَا مَوَالِيَنَا؟ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلّ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾، قَالَ الزُّهرِيُّ: نَزَلَتْ فِي أَبِي هِنْدٍ خَاصَّة، وَكَانَ أَبُو هِنْدٍ حَجَّامَ النَّبِيِّ ﷺ}، (أَخرَجَه أَبُو داود فِي المَراسِيل: (١٩٥، ٢٣٠)، قُلنَا وَهذَا مُرسَلٌ صَحِيحُ الإِسنادِ ، وَزادَ السُّيُوطِيُّ فِي الدرِّ المَنثُورِ ج٧، ص٥٧٨، وزادَ نِسبَتَهُ لِابنِ المُنذِر وَابنِ جُرَيج، وَالبَيهَقي فِي سُنَنِهِ وَابنِ مُردَوَيهِ، الإِستِيعاب فِي بَيانِ الأَسباب ج٣، ٢٨٥).**

واتە: زوهریی (کە یەکێکە لە زانایانی جیلی تابیعین، شوێنکەوتووانی هاوەڵان خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە (**بَنِي بَياضَةَ**)، (هۆزێک بوون) کە ئافرەتێکیان بدەن بە ئەبا هیند، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا کچەکانمان بدەینە کۆیلە ئازاد کراوەکانمان؟ خوا (**عَزَّ وَجَلّ**) لەو بارەوە ئەو ئایەتەی دابەزاند، زوهریی دەڵێ: ئەم ئایەتە موبارەکە بە تایبەت لە بارەی ئەبی هیندەوە دابەزیی و، ئەبوو هیندیش کەڵەشاخ گری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ.

زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە، کە تایبەت بوونی هۆکاری دابەزین، ڕێ لە گشتگیر بوونی واتای ئایەتەکان ناگرێ، بەڵێ جاری وابووە ئایەتێک بە هۆی ڕووداوێکی تایبەتەوە دابەزیوەو، جاری واش هەبووە ئەو ئایەتە مەرج نیە بەو هۆیەوە دابەزیبێ، بەڵام چەمکی ئەو ئایەتە، ئەو ڕووداوەشی گرتۆتەوە، ئیدی هەندێک لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، وایانزانیوە لە بارەی فلان ڕووداوو فلان پێشهاتەوە دابەزیوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خــوا ﷻ لــەم ســوورەتە موبارەکــەدا، بــۆ جــاری چــوارەم و پێنجــەم بــە نازنــاوی ئیــمان، مســـوڵمانان دەدوێنـــێ، دوو جــاران بانگیــان دەکات: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، جــاری یەکەمیــان دەفەرمــوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ﴾، ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! بــا کۆمەڵێــک لــە پیــاوان گاڵتــە بــە کۆمەڵێــک نەکــەن، نیزیکــە لــەوان چاکــتر بــن، واتــە: گاڵتــە پێکــراوەکان چاکــتر بــن لــە گاڵتــە پێکــەرەکان، هەروەهــا بــا ئافرەتانێــک (کۆمەڵێــک لــە ئافرەتــان) گاڵتــە بــە کۆمەڵێکــی دیکــە لــە ئافرەتــان نەکــەن، ڕەنگــە (ئافرەتــە) گاڵتــە پێکــراوەکان، چاکــتر بــن لــە گاڵتــە پێکــەرەکان.

﴿ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ﴾، هەروەهــا عەیــب لــە خۆتــان مەگــرن، (**اللَّمـزُ: العَیـبُ**)، عەیــب لــە خۆتــان مەگــرن و، ڕەخنــە لــە خۆتــان مەگــرن، بۆچــی دەفەرمــوێ: لــە خۆتــان؟ هیــچ کەسێک نیــە عەیــب لــە خــۆی بدۆزێتــەوە مەگــەر بــە دەگمــەن، بــەڵام ئــەوە بــەو واتایەیــە کــە تــۆ ڕەخنــە لــە بــرای مســوڵمانت و لــە خوشــکی مســوڵمانت دەگــری، ڕەخنەیەکــی بێجــێ، یــان عەیبێکــی تێــدا دەدۆزیــەوە، ئنجــا چ عەیبەکــەی تێــدا هەبــێ، چ تێیــدا نەبــێ، بــەڵام تــۆ مەبەســتت ناشــیرین کردنیــەتی، ئــەوە وەک عەیبــت لــە خۆتــدا دۆزیبێتــەوە وایــە، چونکــە ئەویــش وەک تۆیــەو تــۆش وەک ئــەوی، ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ﴾، هەروەهــا نــاوو ناتــۆران لــە یەکــدی هەڵمــەدەن، خــوا فەرموویــەتی: ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا۟ ﴾، (**نَبَـز**) بــە مانــای ناتــۆرەو لەقەبــەو (**نَبْز**)یــش واتــە: نــاوو ناتــۆرە لــێ هەڵــدان، بــەڵام بۆیــە لەســەر کێشی (**تفاعـل**) هێناویــەتی، چونکــە بــە زۆریــی وایــە کــە کەسێک نــاوو ناتــۆرە لــە کەسێک هەڵــدەدات، ئــەوی دیکــەش نــاوو ناتۆرەیەکــی لــێ هەڵدەداتــەوە، بــۆ وێنــە: ئەگــەر کەسێک بــاڵای کــورت بــێ، ئــەوی دیکــە کــە کەڵەگەتــە، ڕەخنــەی لــێ بگــرێ، لەبــەر ئــەوەی بــاڵای کورتــەو بڵــێ:

تـۆ پیاوێکـی کورتـه بـاڵای، یـان خڕیلـەی، ئەویـش دەڵـێ: تـۆ پیاوێکـی قووچـی، یـان درێژیـی، ئەویـش بـە شـێوەیەک کەڵەگەتییەکـەی پێناسـە دەکات، کـە پێـی ناخـۆش بـێ، هەروەهـا لـە ڕووی بـەرگ و پۆشـاکەوە، ئەگـەر یەکێـک بـە یەکێـک بڵـێ: بـەرگ و پۆشـاکەکەت شـڕە، ئەویدیکـەش ئەگـەر کابـرا بـەرگ و پۆشـاکەکەی شـیک و نـوێ بـێ، دەڵـێ: ئـەوە چییـە هەمـوو دەمـێ دەڵێـی دەچـی بـۆ سـەر شـایی! ﴿بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِ﴾، خراپتریـن نـاوو وەسـف بریتیـە لـە فاسـیقێتیی لـە دوای ئیـمان هێنـان، دوای ئـەوەی مـرۆڤ ئیـمانی هێنـاوە، خراپتریـن نازنـاوو لەقـەب وەری بگـرێ، ئەوەیـە کـە فاسـیق بـێ، واتـە: لـە ڕێ دەربچـێ، لـە شـیرازەی شـەرع بچێتـەدەر، واتـە: بـە هـەر کام لـەو سـێ شـتانە کـە بـاس کـران:

أ- بە گاڵتە بە یەکدیی کردن.

ب- عەیب لە یەکدیی دیتنەوە.

ج- ناوو ناتۆە لە یەکدی هەڵدان، هەر کامێک لەوانە دەبێتە هۆی لەڕێ دەرچوونی مرۆڤ و، مانای وایە ئەو کەسە گوناهێکی کردوە لە ڕووی شەرعییەوە، بە لاڕێ و بە دەرچوو لە شیرازەی شەرع دادەنرێ و، سەرەنجام شاهێدیی لێ وەرناگیرێ و عەدالەت لە دەست دەدات، ئەو دادگەرییە لە دەست دەدات، کە پێویستە بۆ ئەوەی بە شایەد بچێ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، هەر کەسێکیش نەگەڕێتەوە، ئا ئەوانە ستەمکارانن، واتە: دەگونجێ مرۆڤ لە هەر کام لەو گوناهانە بگەڕێتەوە بۆ لای خواو، دەستبەرداریان بێ، هەڵبەتە تەوبە لە گوناهێکیش کە پەیوەندیی بە خەڵکەوە هەیە، وێڕای ئەوەی دەبێ ئەو کەسە: ١- دەست لە گوناهەکە هەڵبگرێ و، ٢- لێشی پەشێمان بێ و، ٣- بڕیاریش بدات نەگەڕێتەوە سەری، ٤- ئەگەر پەیوەندیی بە خەڵکەوە هەبێ، دەبێ مافیشیان بۆ ڕەت بکاتەوە، ئەگەر تەنیا بە داوای لێبوردن لێکردنیش بێ، مادام لەو جۆرە بێ کە ئەوەندەی بەس بێ.

پاشـان بـۆ جـاری پێنجـەم خـوا ﷻ لـەو سـوورەتەدا مسـوڵمانان بانـگ دەکات و، ئەگـەر ئەوانـەی پێشـێ سـێ گوناهـی ئاشـکرا بـوون، ئنجـا سـێ گوناهـی پەنهـان،

باس دەكات، كە بێگومان ئەو سێ گوناهە ئاشكرایە: گاڵتە بە یەكدی كردن و، عەیب لە یەكدی دیتنەوەو، ناوو ناتۆرە لە یەكدی هەڵدان، كاریگەرییەكی زۆر خراپیان هەیە لە تێكدانی برایەتییدا، هەر بۆیە خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (١٠) دا، دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، دوایی یەكسەر باسی ئەو سێ گوناهە ئاشكرایە دەكات، كە پێچەوانەی برایەتیین و تێكیدەدەن.

دوایی باسی سێ گوناهی دیكە دەكات، كە ئەوانە پەنهانن و، ئەوانیش دیسان هەر پێچەوانەی برایەتیین و، زیانی بێرەزای پێ دەگەیەنن، دەفەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە زۆر گومانان بپارێزن، واتە: گومانی خراپ، ﴿ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ﴾، چونكە هەندێك گومانی خراپ گوناهن، لەبەر ئەوەی هەندێكی گوناهە، خۆت لە زۆری بپارێزە، خوا ﷻ نەیفەرمووە: هەموو گومانێك گوناهە، بەڵكو فەرموویەتی: هەندێكی گوناهە، بەڵام تۆ خۆت لە زۆری دوور بگرە، بۆ ئەوەی تووشی ئەو هەندێكەش نەبی، ئەو هەندە گومانانەی خراپن و گوناهن، ئەوانەن كە هیچ پاساوێكیان نەبێ و، هیچ زەمینەیەكیان نەبێ و ئەگەری ڕاست دەرچوونیان نەبێ، یاخود زۆر بێهێز بن، ﴿ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ ﴾، سیخوڕیی مەكەن، واتە: سیخوڕیی بەسەر یەكدیەوە مەكەن، وەك دوایی باسی دەكەین، ئەگەرنا مسوڵمانان دەبێ هەست ڕاگرن و، هەست و خوستی دوژمنانیان بزانن، ئەوە نەك هەر حەڕام نیە، بەڵكو فەرزیشە، چونكە تۆ نەزانی بەرامبەرەكەت دەیەوێ چی بكات و چاودێریی نەكەی، لێی تووشی زیان دەبی.

﴿ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ﴾، هەروەها با هەندێكتان بە خراپە (پاشملە) باسی هەندێكتان نەكات، ﴿ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ﴾، ئایا یەكێكتان حەز دەكات گۆشتی برایەكەی بخوات بە مردوویی، بێگومان دزاوتانە، ﴿ فَكَرِهْتُمُوهُ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێوە ڕقتان لێی هەڵساو، پێتان ناخۆش بوو و

دزاتـان، خـواردنی گۆشـتی بـرای خۆتـان بـە مردوویـی، کەواتـە: وەک چـۆن ڕقتـان هەڵدەستێ لـە خـواردنی گۆشـتی مـردوو، بـە هەمـان شـێوە ڕقیشـتان لـە بـە خراپـە باسـکردنی پاشـملەی یەکدی ببێتـەوە، چونکـە وەک یەکن و لـە دوو تـای تەرازووێک دان، چونکـە کەسـێک کـە لێـرە نیـەو تـۆ بـە خراپـە بـاسی دەکـەی، ناتوانـێ بەرگریـی لـە خـۆی بـکات، وەک مـردوو بێـت وایـەو، کـە باسـیشی دەکـەی بـۆ ئـەوەی لێـی دابشـکێنی، وەک ئـەوە وایـە گۆشـت لـە جەسـتەی بپچڕی و بیخـۆی! ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾، پارێزیـش لـە خـوا بکـەن بە خۆ لـێ دوورگرتنـی ئـەو گوناهانـە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زۆر گـەڕاوەی میهرەبانـە، واتـە: ئەگـەر بەنـدە بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا ﷻ، خـواش دەگەڕێتـەوە بـۆ لای و، گەڕانەوەکـەی لـێ قبووڵ دەکات، زۆریـش بـە بەزەیـی و میهرەبانـە، ئنجـا وەک چـۆن تەعقیبـی ئایەتەکـەی پێشـێ کـە فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە بـە هـەر کام لـەو گوناهانـە، مـرۆڤ فاسـیق دەبـێ و، ئەگـەر نەگەڕێتـەوە وێـڕای فاسـیق بـوون ستەمکاریشـە، ئەمـەش - ئـەم تەعقیبـەش - ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەم سـێیەو سـێیەکەی پێشـێش، ئەگـەر کەسـێک بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـواو تۆبـە بـکات و، لێیـان پەشـێمان بێتـەوە، خـوا ﷻ تەوبـەی لـێ وەردەگـرێ، واتـە: ئـەو قسـەیەی کـە دەگوتـرێ: مـافی خەڵـک (**حَـقُّ النَّـاس**) بـە تەوبـەش لاناچـێ، ڕاسـت نیـە، وەک مـن لـە کتێبـی (گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا)[1]، هەروەهـا لـە کتێبـی (ڕێـگای صاڵـح بـوون و بـەرەو خـوا چـوون) دا[2]، لـە بـاسی تەوبـەدا باسـم کـردوە، کـە تەوبـەی ڕاسـت و سـاغ، هەمـوو شـتێک دەسـڕێتەوە، وەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {**إِنَّ الْإِسْلَامَ يَجُبُّ مَا كَانَ قَبْلَهُ**}، (**أخرجـه أحمـد: ١٧٨٦١، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده صحيـح علـى شرط مسـلم**)، واتـە: بێگومـان ئیسـلام پێـش خـۆی دەسـڕێتەوە، ئەگـەر کابـرا کافـر بووبـێ، مونافیـق بووبـێ، مولحیـد بووبـێ، وەختێـک دێتـە نێـو ئیسـلامەوە، گوناهـی پێشـێی هەمـوو لە کـۆڵ دەبێتـەوەو، خاوێـن دەبێتـەوە، تەوبـەش (گەڕانـەوە) بـۆ لای خـوا ﷻ، دیسـان

(١) چاپی شەشەم/ ٢٠٢١ز.
(٢) چاپی شەشەم/ ٢٠٢١ز.

پێش خۆی دەسڕێتەوە، مرۆڤی مسوڵمان هەرچەند گوناهبارو خەتابار بێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ و دەست هەڵدەگرێ و، مەرجەکانی تەوبە لە خۆیدا دێنێتە دی، ئەویش دیسان پاک دەبێتەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾، خوا ﷻ زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای بەندەکانی و، تەوبەیان لێ وەردەگرێ و گەڕانەوەکەیان قبووڵ دەکات و، لەگەڵیشیان بە بەزەییە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، ئەی خەڵکینە! (**النَّاس**) بە مانای کۆی مرۆڤەکانە، ئەی مرۆڤەکان! ئەی مرۆڤایەتیی! ﴿إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئێوەمان هێناوەتە دی، لە نێرێک و مێیەک، کە مەبەست ئادەم و حەووان (**عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلام**) کەواتە: مرۆڤ کە دروست دەبێ، لە هەردووکیان دروست دەبێ، وەک لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئێستا دەریان خستوە، چونکە پێشتر بیرو بۆچوونێکی وا هەبوو کە مرۆڤ تەنیا لە تۆوی پیاو دروست دەبێ، بەڵام ئەو تۆوە لەنێو منداڵدانی ئافرەتدا گەشە دەکات، بەڵام زانستیی کۆرپەلەناسیی ئێستا دەریخستوە، کە وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ﴾، لە ئاوی هەردووکیان مرۆڤەکە دروست دەبێ و، ژیانداری تۆو (حیمن)ی پیاوو، هێلکۆڵە (**بُوَيْضَة**)ی ئافرەت هەردووکیان یەک دەگرن و نوتفە پێک دێنن، ئەو نوتفەیەش ئەگەر خوا ﷻ ویستی لەسەر بێ دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەت و، لەوێدا گەشە دەکات و قۆناغەکانی گەشەکردنی نوتفە: (**عَلَقَة**) و (**مُضغَة**)، (**عظام**) و قۆناغەکانی دیکە دەگوزەرێنێ و دەبێتە کۆرپەلەو لە دایک دەبێ.

﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟﴾، ئێوەمان گێڕاوە بە چەند نەتەوەیەک و، بە چەند هۆزێک، تاکو پێک ئاشنابن و، یەکدی بناسن، پێکەوە هاوکاربن.

کەواتە: ئەوە خوایە ﷻ کە مرۆڤایەتیی دابەش کردوە بۆ چەند نەتەوەیەک، نەتەوەکان وەک نەتەوەی عەرەب، نەتەوەی کورد، نەتەوەی فارس، نەتەوەی

تـورک، نەتـەوەی ئەفغـان، نەتـەوەی ئینگلیـزو، نەتـەوەی فـڵان، هۆزەکانیـش بـۆ وێنە: لـە نێـو عەرەبـدا وەک: هـۆزی ڕەبیعـەو، هـۆزی مـوزەڕو، ئنجـا لـە نێـو مـوزەڕدا، قوڕەیـش و فـڵان فـڵان، لـە نێـو کوردیشـدا هـۆزەکان، وەک: هـۆزی جـاف و، هـۆزی خۆشـناوو، هـۆزی گەردیـی و، هـۆزی میرئاودەلیـی، هەمـوو ئـەو هۆزانـەی هـەن و، جـاری وایـە هۆزێکیـش دابـەش دەبێتـەوە بـۆ چەنـد تیرەیـەک، ئـەوە هەمـوو بـە ویسـتی خوایـەو، خـوا ﷻ ویسـتوویەتی مرۆڤایەتیـی بـەو شـێوەیە دابـەش بـێ، بـەڵام بۆچـی؟ ﴿لِتَعَارَفُوٓاْ﴾، تاکـو پێـک ئاشـنابن و، پێکـەوە هاوکاربـن، خـوا ﷻ ویسـتوویەتی مرۆڤایەتیـی جـۆراو جـۆر بـێ، لـە ڕووی ڕەنـگ، لـە ڕووی زمـان، لـە ڕووی هەڵسـوکەوت، لـە ڕووی نەریـت، پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾، بـە دڵنیایـی بەڕێزترتـان لـە لای خـوا پارێزکارترینتانـە، واتـە: کـێ پارێـزی زیاتـر بـێ و، کـێ زیاتـر خـۆی بپارێـزێ لـە گوناهـو هەڵـەو لادان، ئـەوە لـە لای خـوا حورمـەت و ڕێـزی زیاتـرە، کەواتـە: خۆتـان بـە ڕەچەڵـەک و نەسـەب و ڕەنـگ و زمان، ئەوانـەوە هەڵمەکێشـن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زانـای شـارەزایە، واتـە: بـا کەسیشـتان لافی ئـەوە لـێ نـەدا کـە لـەوی دیکە بـە تەقواتـرە، لە نێـو مسـوڵماناندا، چونکـە خـوا زانایـە بـە شـتەکان و، شـارەزایە بـە کەسـەکان، کەواتـە: بـەس خـۆی دەزانـێ: کـێ بـە تەقواتـرەو لـە لای خـوا بەڕێزتـرە، تەقـواش وەک پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا کـە سـێ جـار ئامـاژەی بـۆ سـینەی موبارەکـی کـردوە، فەرموویـەتی: {**التَّقْـوَى هَـا هُنَـا**}[1]، تەقـوا لێرەدایـە، واتـە: ڕیشـەو بناغـەو سـەرچاوەکەی لـە دڵ و دەروونی مـرۆڤ دایـە، بـەڵام دوایـی شـوێنەوارەکانی لەسـەر ئەندامـەکانی ئاشـکرا دەبـن و دەردەکـەون.

خـوای میهرەبـان هیدایەتمـان بـدات کـە مـافی برایەتیـی بـە جۆرێک لەگـەڵ یەکدی دا جێبەجـێ بکەیـن و، مـافی خوشـک و برایەتیـی لەگـەڵ ئافرەتەکانـدا جێبەجـێ بکەیـن، کـە خۆمـان لـە هەمـوو ئـەو هەڵـس و کـەوت و خـووو خـدەو ڕەفتارانـە

---

(١) متفق عليه.

بپارێزین، کە پێچەوانەی برایەتیی و دۆستایەتیی و پێچەوانەی یەکدی خۆشویستن و بۆ یەک دڵسۆز بوون و لەگەڵ یەکدا بە بەزەیی بوونن، هەڵبەتە هەم لە نێو بازنەی ئیمان و ئیسلامدا، هەم لە دەرەوەی بازنەی ئیمان و ئیسلامیش، مسوڵمان دەبێ لەگەڵ هەموو خەڵکدا بەو ڕەوشت و ئاکارە بەرزانە مامەڵە بکات، کە شایستەی مرۆڤی مسوڵمانن و، شایستەی ئەو بەیداغە مەزنەن کە لەسەر سەری خۆی بەرزی کردۆتەوە کە بەیداغی ئیسلامەو، بەیداغی تەوحیدو شایەتمانە، بە یەکتایی خوا لە پەرسترانداو، ڕەوانەکراوێتیی موحەممەد ﷺ لە لایەن خوای پەروەردگارەوە.

خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بە لوتف و کەرەمی خۆی، لە هەموو ئەو شتانەمان بپارێزێ کە لە ئیمانداران، لە مسوڵمانان، لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و لە بەندە بۆ خوا صوڵحاوەکان، ناوەشێنەوە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**دوو جـاران بانگكـردنی بـڕواداران لـە لایـەن خـوای بـەرزو مەزنـەوەو، لـێ قەدەغەكـردنی هـەر كام لـە گاڵتـە بـە یەكـدی كـردن و، عەیـب لـە یەكـدی گرتـن و، نـاوو ناتـۆرە لـە یەكـدی هەڵـدان و، گومـانی خراپـی بـێ جـێ بـە یەكـدی بـردن و سـیخوڕیی بەسـەر یەكدیـەوە كـردن و، بـە خراپـە پاشـملە بـاسی یەكـدی كـردن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە بۆ جاری چوارەمە لەم سوورەتەدا، خوا ﷻ بانگی مسوڵمانان دەكات بە نازناوی ئیمان، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، ئیمانەكەتان خوازیارو پاڵنەری ئەوەیە، كە ئێوە پابەند بن بە شەریعەتی خواوەو، ئەركەكانی سەرشانتان جێبەجێ بكەن، خۆشتان لە قەدەغەكراوەكان بپارێزن، ئنجا یەكسەر خوا ﷻ لەم دوو ئایەتەدا، وەك پێشتر باسمان كرد، شەش ڕەفتارو خوو و خدەی خراپ قەدەغە دەكات، لە مسوڵمانان و لە بڕواداران، كە نابێت توخنیان بكەون، دەبێ خۆیان لێ بپارێزن، دێتە سەر باسی یەكەمیان دەفەرموێ:

٢)- ﴿لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ﴾، با کۆمەڵێک گاڵتە بە کۆمەڵێک نەکەن، نیزیکە لەوان چاکتربن، کۆمەڵێک، واتە: کۆمەڵێک لە پیاوان، ئەگەرنا وشەی (قوم) پیاوان و ئافرەتان دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا بەوە دەزانین کە مەبەستی تەنیا پیاوانە، چونکە دوایی بە جیا باسی ئافرەتانیش دەکات، وشەی: ﴿يَسْخَرْ﴾، پێشتریش باسمان کرد، (السُّخْرِيَّةُ: الإِسْتِهْزَاءُ، وَسَخِرْتُ بِهِ، وَضَحِكْتُ بِهِ، وَ هَزَأْتُ بِهِ)، (سُخْرِيَّة): بریتیە لە گاڵتە پێکردن، دەگوترێ: (سَخِرتُ بِهِ)، هەروەها دەگوترێ: (ضَحِكتُ بِهِ)، (وَهَزَأْتُ بِهِ)، دیسان بۆ هەر سێکیشیان دەگوترێ: (سَخِرتُ مِنهُ وَضَحِكتُ مِنهُ وَ هَزَأْتُ مِنهُ)، واتە: گاڵتەم پێکردو، پێی پێکەنیم، گەپم پێکرد، واتە: وشەی (سَخِرَ) و (ضَحِكَ) و (هَزَأَ)، هەرسێکیان بە (ب)یش، بەرکار دەخوازن، هەروەها بە (مِن)یش.

٣)- ﴿وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ﴾، هەروەها با کۆمەڵێک لە ئافرەتان گاڵتە بە کۆمەڵێک لە ئافرەتان نەکەن، نیزیکە کە لەوان چاکتربن، واتە: نیزیکە ئافرەتە گاڵتە پێکراوەکان، لە گاڵتە پێکەرەکان چاکتربن.

٤)- ﴿وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾، عەیب لە خۆتان مەگرن، (اللَّمزُ: العَيْبُ، أَي لَا يَلْمِز بَعْضُكُم بَعْضَاً)، با هەندێکتان عەیب لە هەندێکتان نەگرن، (اللَّمزُ: ذِكْرُ ما يَعُدُّهُ الذَاكِرُ عَيْبَاً لأَحَدٍ مُوَاجَهَةً فَهُوَ المُبَاشَرَةُ بِالمَكرُوهِ، فَإِنْ كانَ بِحَقٍّ، فَهُوَ وَقَاحَةٌ وَاعتِداءٌ، وَإِنْ كَانَ بَاطِلاً، فَهُوَ وَقَاحَةٌ وَكَذِب)، زانایان لە بارەی (لَمز)و (هَمز)و (سُخرِيَّة)یەوە، زۆر قسەیان کردوە، دوایی کورتە باسێک لە بارەی ئەو شەش قەدەغە کراوەوە دەکەین و، زیاتر چەمک و واتایەکەیان ڕۆشن دەکەینەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە بارەی (لَمز)ەوە گوتراوە: بریتیە لە باسکردنی ئەوە، کە بابای باسکەر بە عەیب و کەم و کوڕیی دەزانێ بۆ کەسێک لە ڕوویدا، واتە: لە ڕوویدا شتی خراپی پێ بڵێ، ئنجا ئەگەر هەق بێ، ئەوە دەست درێژییەو ڕوو قایمییە، بەڵام ئەگەر ناهەق بێ، ڕوو قایمیی و بێ شەرمیی و درۆشە، یانی: هەر چۆن بێ بە خراپە، باسی خەڵک کردن، ڕووبەڕوو چ بە هەق بێ و چ بە ناهەق بێ، هەر گوناهو تاوانە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾، واتە: عەیب لە خۆتان مەگرن، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: عەیب لە خۆتان مەگرن؟ واتە: ئەو برا مسوڵمانەت

و، ئەو خوشکە مسوڵمانەت، کە تۆ عەیبی لێ دەگری و، عەیبی تێدا دەدۆزییەوەو بە خراپە باسی دەکەی، ڕووبەڕوو، ئەویش وەک تۆیەو تۆش وەک ئەوی، کەواتە: وەک عەیب و ڕەخنەت لە خۆتدا دۆزیبێتەوە، وایە، وەک لە سوورەتی (النور)دا، خوا ﷻ لە بەسەرهاتی بوختان پێکرانی دایکمان عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەفەرموێ: ﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ...﴿١٢﴾﴾، واتە: دەبووایە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار گومانی باشیان بە خۆیان بردبایە، واتە: کە گومانی خراپیان بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بردوە، شتێکی زۆر خراپیان کردوە، چونکە مسوڵمانان دەبێ پێغەمبەری خوایان ﷺ پێ لە خۆیان لە پێشتر بێ، ئنجا وەک چۆن گومانیان بەرانبەر بە خۆیان چاکە، دەبوایە گومانیان بەرانبەر بە پێغەمبەرو ﷺ هاوسەری پێغەمبەر چاکتریش بێ، ئەگەر شتی خراپ لە خۆیان ناوەشێننەوە، چاکتر دەبوایە لە پێغەمبەر ﷺو هاوسەری پێغەمبەری نەوەشێننەوە.

٥)- ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ﴾، ناوو ناتۆرەش لە یەکدی هەڵمەدەن، (**النَّبَزُ: اللَّقَبُ، وَالنَّبْزُ: التَّلقِيبُ**)، (نَبَز) بە مانای ناوو ناتۆرەیەو (نَبْز)یش بە مانای ناوو ناتۆرە لێ هەڵدانە، (**وَالتَّنابُزُ تَفاعُلٌ مِنهُ**)، (تَنابُز)یش لەسەر کێشتی (**تفاعل**)ە، واتە: ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵدان.

٦)- ﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ﴾، خراپتر ناو فیسقە لە دوای ئیمان، (**بِئسَ الإِسمُ: أَي بِئسَ الذِّكرُ، أَو بِئسَ المَوصُوفُ، أَن يُسَمَّى الرَّجُلُ فاسقاً أَو كافِراً، أَو زانِياً بَعدَ إِسلامِهِ وَتَوبَتِهِ**)، بۆ ئەم ڕستەیە سێ واتایان هێناون:

**یەکەم:** ﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ﴾، (**بِئسَ الإِسمُ: أَي بِئسَ الذِّكرُ**)، واتە: خراپترین ناو، یانی: خراپترین باسکردن، باسکردنی فاسیقێتییە لە دوای ئیمان، واتە: ئێوە بەو شتانە نازناوی فاسیقێتییتان دەچێتە سەر، دوای ئەوەی ئیماندار بوون، بە فاسیق باس بکرێن، باسکردنێکی خراپ، دەستەبەر دەکەن.

**دووەم:** (**بِئسَ الوَصفُ**)، واتە: دوای ئەوەی کەسێک ئیمانی هێناوە، خراپترین شتە کە بە فاسیقێتیی وەسف بکرێ، نەک باس بکرێ، بەڵکو وەسف بکرێ.

**سێیەم:** (**بِئسَ أَن يُسَمَّى الرَّجُلُ كافِراً أَو زانياً بَعدَ إسلامِه وَتوبَتِه**)، خراپترین شتە کە پیاوێک بە بێبڕوا، یان بە زیناکار، ناوببرێن، دوای ئەوەی مسوڵمان بووەو گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، واتە: دوای ئەوەی گەڕاوەتەوەو مسوڵمان بووە، کە پێشتر هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، یان کافر بووە، یاخود داوێن پیس بووە، هەر چۆن بووە، نابێ ئەو کوفرو گوناهو تاوانانەی پێشێی لێ باس بکرێن، بۆی بکرێنە ناوونیشان.

بەڵام پێم وایە ئەو مانایە لە هەموویان بەهێزترە کە مەبەست ئەوەیە، بە هەر کام لەو گوناهانە مرۆڤ فاسیق دەبێ و، دوای ئەوەی ئیماندار بووە، لە ڕێ دەربچێت و نازناوی فاسیقێتیی شایستە بێ، ئەوە خراپترین نازناوەو، خراپترین ناوەو، خراپترین دەنگ و باسە بۆ خۆی هێناویەتە سەر خۆی.

٧)- ﴿ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ ﴾، واتە: هەر کەسێک نەگەڕێتەوە و لەوەی خوا لێی قەدەغە کردوە، دەستبەرداری نەبێ.

٨)- ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، ئا ئەوانەن ستەمکاران، واتە: ئەوانەن کە ستەمیان لەو کەسە کردوە کە گاڵتەیان پێکردوەو، عەیبیان لێگرتوەو، ناوو ناتۆرەیان لێ هەڵداوە، هەروەها ستەمیان لە خۆیان کردوە، بەوە کە کارێکیان کردوە گوناهبار بن، هەروەها ستەمیان لە کۆمەڵگا کردوە کە گوناهیان تێدا بڵاوکردۆتەوە، ﴿ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، یانی: ستەمکارن بۆ بەرانبەرەکەیان، کە بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوەو، بۆ خۆیان، کە خۆیان گوناهبار کردوەو، بۆ کۆمەڵگاش کە قسەی خراپ و شتی خراپیان لە نێودا بڵاوکردۆتەوەو، تەشەنە پێداوە.

لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەو سێ گوناهە، کە بریتین لە: گاڵتە پێکردن و، عەیب لێگرتن و، ناوو ناتۆرە لێهەڵدان، فەرموویەتی: ﴿ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، ئەمە پێویستە چوار وردە سەرنجی لێ بدەین:

**یەک:** ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو سێ شتەی لێیان قەدەغە کراون، گوناهو شتی سەرزەنشتکراون، چونکە دەبنە هۆی لە ڕێ دەرچوون و، خواش ﷻ لەسەر ئەوانە مرۆڤ سزا دەدات، کە

بە هیچ شتێک لاناچن، مەگەر بە گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئنجا لێرەدا ئەمە هەمووی کورتکراوەتەوە، کە دوو ڕستە لە قسەکە قرتێنراون، چونکە ئەوەی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾، دەلالەت لەسەر ئەو دوو ڕستەیە دەکات.

هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە هەر کام لە گاڵتەپێکردن (**سخرية**) و (**لَمز**)، عەیب لە یەکدی گرتن و، (**نَبز**) ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵدان، هەر سێکیان دەرچوونن لە ڕێگای شەریعەت.

**دوو:** کە دەفەرموێ: ﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ﴾، بێژەی ناو (**إسم**) بەکارهێنراوە، ئەمە بۆ ترساندنە لەوەی باسی خەڵک بکرێ بە ناوێک کە پێیان ناخۆشە، چونکە لە قەب و نازناوەکانیش هەر ناون، هەروەها هۆشداریی پێدانە کە خراپترین ناو، ناوی فاسیقێتییە کە دێتە سەر ئێوە، کەواتە: خۆشتان لەناوبردنی خەڵک بە خراپە بپارێزن.

**سێ:** کە دەفەرموێ: ﴿بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ﴾، واتە: دوای ئەوەی مرۆڤ ئیمانی وەدەست هێناوە، ناگونجێ نازناوی فاسیقێتیی بۆ خۆی پەیدا بکات، چونکە گوناهو تاوانەکان شایستەی ئەهلی شیرک و کوفرن، ئەوانەن کە هیچ ڕێگرێکیان لەبەردەمدا نیە لە گوناهو تاوانیان، بیانپرینگێنێتەوە، بەڵام ئیمان خاوەنەکەی دەپرینگێنێتەوەو، دووری دەخاتەوە لە گوناهو تاوان و خراپە.

**چوار:** کە دەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾، ئەمە بۆ زیاتر دەرخستنیانە، کە حاڵەکەیان ناقۆڵاتر پێشان بدرێ، تاکو خەڵک ئاگادار بکرێتەوە کە بۆیە شایستەی ئەوە بوون، ستەم لەواندا کورتهەڵبێ، لەبەر ئەوەی ناوی فاسیقێتییان خستۆتە سەر خۆیان، بەهۆی ئەو هەڵس و کەوتە خراپانەوە، کە زیان بە بەرانبەرەکانیان دەگەیەنن، کە بریتین لە گاڵتە پێکردن و عەیب لێگرتن و ناوو ناتۆرە لێهەڵدان.

**٩)-** خوا ﷻ بۆ جاری پێنجەم لەم سوورەتە موبارەکەدا، بانگی بڕواداران دەکات بە نازناوی ئیمان: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە زۆر گومانان بپارێزن، بە تەئکید مەبەست لە زۆر گومان، واتە: زۆر گومانی

خراپ، ئەگەرنا گومانی چاک لێرەدا مەبەست نیە، (**الإجتِنابُ: إفتِعالٌ مِن جَنَّبَهُ وَأَجنَبَهُ: أَبعَدَهُ وَجَعَلَهُ جانِباً آخَرَ**)، (**إجتِناب**) (إفتعال)ە لە (**جَنَّبَهُ**) واتە: دووری خستەوە، (**وَأَجنَبَهُ**) واتە: (**أَبعَدَهُ**) دووری خستەوە، واتە: بردیە لایەک، لاتەنیشتێک، یان بردیە لاتەنیشتەکەی دیکە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە زۆر گومانان بپارێزن، واتە: زۆر خولیاو خەیاڵی خراپ کە بە دڵتاندا دێن، خۆتانیان لێ بپارێزن، بۆچی خۆمان لە زۆر خولیاو خەیاڵ و گومانی خراپ بپارێزین؟

١٠)- ﴿إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ﴾، چونکە هەندێک لە گومانان گوناهن، کە ئەویش بریتیە: لە گومانێک ئەگەری ڕاست دەرچوونی نەبێ و زەمینەی نەبێ، نەیفەرمووە: خۆتان لە هەمووی بپارێزن، چونکە ئەگەر هەندێک گومان گوناهـ بن، دیارە هەندێکیشیان گوناهـ نین، ئەوانیش ئەو گومانانەن کە لە جێی خۆیان دان و، زەمینەی ڕاست دەرچوونیان هەیە.

١١)- ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا۟﴾، سیخوڕیی مەکەن، هەست لە یەکدی ڕامەگرن، بۆ ئەوەی کەم و کوڕیی و عەیب و هەڵسوکەوتی یەکدی بزانن، (**التَّجَسُّسُ: البَحثُ بِوَسِيلَةٍ خَفِيَّةٍ، وَهُوَ مُشتَقٌّ مِنَ الجَسِّ، وَهُوَ مِن آثَارِ الظَّنِّ**)، (**تَجَسُّس**): بریتیە لە لێکۆڵینەوەو پشکنین بەهۆی ئامڕازێکی پەنهانەوە، کە لە وشەی (**جَسّ**)ەوە داتاشراوە، دەگوترێ: (**جَسُّ النَّبْضِ**)، دەمار گرتن، کە ئەویش هەر لە شوێنەوارەکانی گومانە.

١٢)- ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾، هەروەها با هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان نەکەن، واتە: پاشملە بە خراپە باسی یەکدی مەکەن، (**الإغتِيَابُ: إفتِعالٌ مِنْ (غابَ) المُتَعَدِّي إِذَا ذَكَرَه فِي غَيبِهِ بِما يَسُوءُهُ**)، (**إغتياب**): (إفتعال)ە لە (**غابَهُ**)، واتە: لە حاڵێکدا کە لەوێ نیە بە خراپە باسی کردو، بە شێوەیەک باسی کرد، پێی ناخۆش بێ.

١٣)- ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا﴾، ئایا یەکێک لە ئێوە حەز دەکات گۆشتی برایەکەی بە مردوویی بخوات؟ لێرەدا ئەو پرسیارکردنە (**الإستِفهامُ تَقرِيرِيٌّ لِتَحَقُّقِ المُستَفهَمِ مِنهُ**)، پرسیار کردنەکە پرسیارکردنی چەسپاندنە، لەبەر ئەوەی شتێکی چەسپاوە

ئەوەی لە بارەیەوە پرسیار دەکرێ، کە بریتیە: لە گۆشتی برای خۆ بە مردوویی خواردن، شتێکی خراپە، خاوەنی (التحرير والتنوير): (**مُحَمَّد الطاهر بن عاشُور**)، لە تەفسیرەکەیدا[1]، هەندێک شتی گرنگ لە بارەی غەیبەتەوە دەڵێ، دەڵێ:

(**الإغتِيـابُ: ذِكـرُ أَحَـدٍ غائِـبٍ بِمـا لَا يُحِـبُّ أَن يُذكَـرَ بِـهِ، والإِسـمُ الغِيبَـةُ، إِنَّمـا قـالَ: (وَلَا يَغتَـبْ) بَـدَلَ (اجْتَنِـبِ الغِيبَـة) لِقَصدِ التَوطِئَـةِ لِلتَمثِيـلِ الـوارِدِ:** ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا﴾، **إِذِ التَّمثِيـلُ مُحتَمِـلٌ لَفاعِـلٍ وَمَفعُـولٍ فَمَهَّـدَ بِـهِ بِمـا يَـدُلُّ عَلَيـهِ**)، (**إِغتِيـاب**): بریتیـە لـە باسـکردنی کەسێک کـە نادیـارە، بـە شـێوەیەک کـە حـەز نـەکات، بـاس بکـرێ، لەسـەر کێشی (**إِفتِعـال**)ە، ناوەکـە بریتیـە: لـە (**غِيبَـة**)، بۆیـەش فەرموویـەتی: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾، لــە جیــاتی بفەرمــوێ: (**إِجتَنِـبِ الغِيبَـة**)، تاکـو زەمینـە خـۆش بـکات بـۆ ئـەو وێنـە هێنانەوەیـەی دادێ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا﴾، چونکـە وێنـە هێنانەوەکـە بکەرێـک و بەرکارێـک دەگرێتـە خـۆی، بۆیـە بـەوەی دەیگەیەنـێ، زەمینـەی بـۆ خۆشـکردوە.

ئنجـا پرسـیارکردنی تەقریریـی دەکەوێتـە سـەر شـتێک کـە سـەلمێنراو بـێ، لـە لای دوێـنراو، لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا﴾، بێگومـان شـتێک کـە بابـای دوێنـدراو نکووڵیـی لـێ نـاکات، ئەوەیـە کـە حـەز نـاکات گۆشـتی برایەکـەی بـە مردوویـی بخـوات، کەواتـە: ئایـا ئێـوە حـەزی لـێ دەکـەن؟ بـە تەئکیـد حـەز ناکـەن، ئنجـا کـە حـەز ناکـەن، گۆشـتی بـرای خۆتـان بـە مردوویـی بخـۆن، بـە شـێوەیەکیش مامەڵـەی لەگەڵـدا مەکـەن، کـە وەک ئـەوە بـێ بـە مردوویی گۆشـتەکەی بخـۆن، ئەویـش ئەوەیـە: لـە کاتێکـدا لـەوێ نیـەو ئامـادە نیـە، بـە خراپـە بـاسی بکـەن، چونکـە ئەگـەر گۆشـت لـێ خـواردنی بـە مردوویـی و گۆشـت لێکردنـەوە لـە جەسـتەی، زیـان بـە جەسـتەی دەگەیەنـێ، بـە خراپـە بـاس کردنیـشی، زیـان بـە کەسـایەتیی دەگەیەنـێ، بـە ڕووح و جەسـتەیەوە، کـە لەڕاسـتییدا خراپـترە لـە گۆشـت لـێ خواردنەکـەی.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص٢٨٤.

١٤)- بۆیەش دەفەرموێ: ﴿فَكَرِهْتُمُوهُ﴾، پێتان ناخۆشە، ئەمە وەڵامی پرسیارکردنە چەسپێنەرەکەیە (الإِستِفهامُ التَّقريري)، دەشگونجێ: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ﴾، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە بێ و، ئەمەش وەڵامەکەی بێ، واتە: پێتان ناخۆشە، پێتان ناخۆش بوو، یاخود ئەمە پەیوەست بوونی شتێکە بە شتێکەوەو پەیداکراوێکە بە پەیداکەرێکەوە، وەک دەگوترێ: (جاءَ فُلانٌ ماشِياً فَتَعِبَ)، فڵانکەس بە پێیان هات، ماندوو بوو، واتە: ئێوەش ئەگەر گۆشتی برای خۆتان بە مردوویی بخۆن، پێتان ناخۆشە.

١٥)- ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾، پارێزیش لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا زۆر تۆبە وەرگری میهرەبان و بەبەزەییە، ئەمەش وەک پێشتر باسمان کرد، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە تەوبە هەم غەیبەت لادەبات، هەم تێکڕای مافەکانی خەڵک لادەبات، بەڵام گەڕانەوەی ساغ و تەوبەی بەڕاستیی، یەکێک لە مەرجەکانی تەوبەی ساغ و ڕاستیش، ئەوەیە کە مرۆڤ ئەگەر مافی خەڵکی کەوتبێتە سەر، بەپێی توانا مافەکانیان بۆ ڕەت بکاتەوە، ئەگەر خۆیان مابن، ئەگەر نەمابن، بۆ کەس و کاریان، یان بۆیان بکاتە خێر، مافی ماددیی بن، یان مافی مەعنەویی بن، بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان، دەبێ بەپێی توانا مافەکەیان بۆ ڕەت بکاتەوە، ئنجا تەوبەیەک بەو شێوەیە بێ، بە تەئکید خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى دەیکاتە مایەی پاک بوونەوەی خاوەنەکەی، لە هەموو ئەو گوناهانەی کردوونی.

## کورتە باسێک لە بارەی
## ئەو شەش قەدەغە کراوەوە، کە لە دوو ئایەتی (١١ و ١٢) دان

بەڕێـــــزان!

ئێمە ئەو کورتە باسە، لە سێ بڕگەدا دەخەینەڕوو:

### بڕگەی یەکەم:

خـوا (عَـزَّ وَجَـلَّ) دوو جـاران فەرموویـەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، لـە کاتی باسـکردنی ئـەو شـەش قەدەغـە کـراوەدا، کەواتـە: ئـەو شەشـە زۆر هەسـتیارو مەترسـییدارن، پێشـتریش گوتمـان: ئـەو شـەش گوناهـە سـێیان ئاشـکران و سێشـیان پەنهانـن: (گاڵتـە پێکـردن و، عەیـب لێگرتـن و، نـاوو ناتـۆرە لێهەڵـدان)، ئەوانـە ئاشـکران و بـە زۆریـی وایـە ڕوو بـەڕوو دەبـن، سـێیەکەی دیکـەش: (گومـانی خـراپ پێـبردن و، سـیخوڕیی بەسـەرەوە کـردن و، پاشـملە بـە خراپـە باسـکردن)یش، پەنهانـن، بـە زۆریـی لـە حاڵێکـدان، ئـەو کەسـەی ئـەو شـتانەی لـە بەرانبـەردا دەکرێـن لـەوێ نیـە.

### بڕگەی دووەم: سێی یەکەمیان کە بریتین لە: گاڵتە پێکردن و، عەیب لێگرتن و، ناوو ناتۆرە لێهـەڵدان، لە خـــراپترەوە بۆ خراپن، بەڵام سێی دووەمیان لە خراپەوە بۆ خراپترن:

١- گاڵتە پێکردن (**سُخرِيَّة**): ﴿ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ ﴾، بریتیە لە بەهیچ دانان و بە کەم سەیرکردنی بەرانبەر.

٢- بەڵام عەیب لێگرتن (**لَمْز**): ﴿ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ ﴾، بریتیە لە ڕەخنە لێگرتن، واتە: عەیبەکە بوونی هەیەو باس دەکرێ، دواییش چەمک و واتایەکەی ڕوون دەکەینەوە.

**٣-** ناوو ناتۆرەلێهەڵدان (نَبز): بریتیە لە نازناوو ناوو ناتۆرەی خراپ بۆ بەکارهێنان، کە ناوو ناتۆرەکە مەرج نیە عەیب بێ.

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین: سێیەمیان لە دووەمیان ئەهوەنترەو، دووەمیشیان لە یەکەمیان ئەهوەنترەو، یەکەمیان لە هەرسێکیان خراپترە، کەواتە: ئەم سێ گوناهەی یەکەم، کە گوناهە ئاشکرایەکانن، لە خراپترەوە بۆ خراپن.

بەڵام سێی دووەمیان لە خراپەوە بۆ خراپترن، بە پێچەوانەی سێیەکانی پێشەوەوە، چونکە ئەوان بریتین لە: گومانی خراپ بە یەکدی بردن و، سیخوڕیی کردن و، غەیبەت کردن:

**یەکەم:** گومانی خراپ بە یەکدیی بردن، هەندێک گومان خراپن، نەک هەموویان، کەواتە: هەندێک لە گومانان دەگونجێ خراپ نەبن و گوناهـ نەبن، گومانی خراپ بە خەڵک بردن هەندێک جاران گوناهـ نیە، بە دەقی ئایەتەکە، چونکە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە زۆر گومانان بپارێزن، زۆرێک لە گومانان گوناهن، کەواتە: هەندێکیان گوناهـ نین.

**دووەم:** سیخوڕیی، سیخوڕیی دەرەنجامی گومانی خراپەو، دەرهاویشتەی خراپیشی دەبن، واتە: سیخوڕیی لە گومانی خراپ بردن، خراپترە.

**سێیەم:** غەیبەت کردن، ئەم زۆر خراپترە لە سیخوڕیی کردنیش و لە گومانی خراپ بردنیش، وەک چۆن شوێنەواری سیخوڕیی کردن، خراپترە لە شوێنەواری گومانی خراپ بردن، شوێنەواری خراپی غەیبەت کردنیش، زۆر زیاترن و بەدترن لە شوێنەواری سیخوڕیی و گومانی خراپ بردن.

## بڕگەی سێیەم: تیشك خستنه سەر هەر كام لەو شەش گوناهە:

### ١)- بە نسبەت گاڵتە كردن (سُخريَّة)ەوە:

**(الطبري)** لە بارەی گاڵتە پێکردنەوە، دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆرو هێنانی چەند شوێنەوارێک دەڵێ: **(وَالصَّوَابُ مِنَ القَولِ فِي ذَلِكَ عِنْدَنا أَن يُقَالَ: إِنَّ اللهَ عَنى بِنَهيِهِ المُؤمِنِينَ عَن أَن يسخَرَ بَعضُهُم مِن بَعضٍ جَمِيعُ مَعانِي السُّخرِيَّةِ، فَلا يَحِلُّ لِمُسلِمٍ أَن يَسخَرَ مِنَ المُؤمِنِ لا لِفَقرِهِ، وَلا لِذَنبٍ رَكِبَهُ، وَلا لِغَيرِ ذَلِكَ)**[1].

واتە: قسەی ڕاست لەو بارەوە لە لای ئێمە، ئەوەیە کە بگوترێ: لێرەدا خوا ﷻ بە گشتیی بڕوادارانی قەدەغە کردوە کە هەندێکیان گاڵتە بە هەندێکیان بکەن، بە هەموو مانایەکانی گاڵتە پێکردن، کەواتە: ڕەوا نیە بۆ مسوڵمان گاڵتە بە بڕوادارێک بکات، لەبەر ئەوەی هەژارە، یان لەبەر ئەوەی گوناهێکی کردوە، یان لەبەر جگە لە ئەوە.

چونکە هەندێک شوێنەواران دێنێ، زانایان هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە کە گاڵتە بە یەکدیی بکەن، وەک ئەوەی لە سەردەمی نەفامییدا کردوویانە، هەندێکیش گوتوویانە: لەبەر ئەوەیە کە کابرا هەژارەو، هەندێک گوتوویانە: لەبەر ئەوەیە کە نەخۆشە، **(الطبري)** دەڵێ: چەمکی (گاڵتە پێکردن)، هەموو شێوەکان دەگرێتەوە، بە هەر شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکرێ کە پێی ناخۆش بێ و، بە سووک تەماشا کردنی تێدابێ، چەمکی **(سخرية)** دەیگرێتەوە.

### ٢)- بە نسبەت عەیب لێگرتن (اللَّمز)ەوە:

**(القُرطُبي)**، دەڵێ: **(وَفِي قَولِهِ ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾، تَنبِيهٌ عَلَى أَنَّ العَاقِلَ لَا يَعِيبُ نَفسَهُ، فَلَا يَنبَغِي أَن يَعِيبَ غَيرَهُ، لأَنَّهُ كَنَفسِهِ، كَمَا قَالَ الرَّسُولُ ﷺ: {المُؤمِنُونَ**

---

(١) جامع البيان: ج٢٦، ص١٣٥.

**كَجَسَدٍ وَاحِدٍ إِنِ اشتَكَى عُضوٌ مِنهُ تَدَاعَى لَهُ سائِرُ الجَسَدِ بِالسَّهرِ وَالحُمَّى}، (أخرجه البُخاري: ٦٠١١، وَمُسلِم: ٢٥٨٦، وَغَيرُهُما)**، واتە: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾، ئەمە ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەوە کە بابای عاقڵ عەیب لە خۆی ناگرێ و خۆی ناشیرین ناکات، بۆیە پێویستە عەیب لە غەیری خۆشی نەگرێ، چونکە ئەویش وەک خۆیەتی، وەک فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (بڕوادارن وەک یەک جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی هەبوو، هەموو جەستە لێی دەگێڕێتەوە بە شەو نخوونیی و بە تا لێهاتن).

بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ﴾، ﴿وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ﴾؟، چونکە بە زۆریی گاڵتە پێکردن لە نێو پیاوان دا، حاڵەتی بە کۆمەڵ بە خۆوە دەگرێ، هەروەها لە نێو ژنانیشدا ئەوە زۆرە، بۆیە خوا ﷻ بە جیاش باسی ئافرەتانی کردوە، ئەگەرنا وشەی (قوم) پیاوان و ئافرەتان دەگرێتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ﴾، ﴿عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّ﴾، (**جمال الدين القاسمي**) لە (**محاسن التأويل**)[1] **دا**، لە (أبو السعود)ی خواستۆتەوە، دەڵێ: **(فَإِنَّ مَناط السُّخرِيَّةِ فِي الفَرِيقَينِ لَيسَ ما يَظهَرُ لِلنَّاسِ مِنَ الصُّوَرِ وَالأَشكالِ وَالأَوضاعِ وَالأَطوار الَّتي عَلَيهَا يَدُورُ أَمرُ السُّخرِيَّةِ غَالِباً، بَل إِنَّمَا هُوَ الأُمُورُ الكَامِنَةُ فِي القُلُوبِ، فَلا يَجتَرِئ أَحَدٌ عَلَى استِحقارِ أَحَدٍ فَلَعَلَّهُ أَجمَعُ مِنهُ).**

واتە: لە ڕاستییدا گاڵتە بە یەکدیی کردنی ئەو دوو کۆمەڵە (یانی: کۆمەڵی پیاوان گاڵتە بە پیاوان بکەن و، کۆمەڵی ئافرەتان گاڵتە بە ئافرەتان بکەن)، هەڵیە هۆکارەکەی ئەوە بێ کە بۆ خەڵک دەر دەکەوێ، لە دیمەن و شێوەکان و لە حاڵەت و هەڵسوکەوتەکان، کە بە زۆریی گاڵتە بەهۆی ئەوەوەیە، چونکە بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵك دەبێ ئەو ڕاستییانە بکرێنە پێوەر کە لە دڵەکاندا

---

(١) ج٢٦، ص١٢٤.

جێگیـرن، ئەویـش هیـچ کەسـێک ناتوانـێ یەکێکـی دیکـە بـەو هۆیـەوە بـە کـەم بگـرێ، چونکـە بـەس خـوا ﷻ دەزانـێ ئـەو چـی لـە دڵـدا هەیـەو، ڕەنگـە زۆر لـەو کەسـەی گاڵتـەی پـێ دەکات (باشـتر بـێ و) کـۆ کەرەوەتـر بـێ بـۆ چاکـەکان.

**٣)- بە نسبەت ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵدان: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ەوە:**

**١-** لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد، کە ئەو هاوەڵە گوتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، هیچ کام لە ئێمە نەبوو، دوو ناو یان سێ ناوی نەبن، ئنجا دیارە هەبووە کە هەندێک لە ناوەکانی پێ ناخۆش بووە، پێیان بانگ بکرێ، پێغەمبەریش ﷺ نەیزانیوە کام ناوەی پێ خۆشەو، کام ناوەی پێ ناخۆشە! ئنجا کە بەناوێک بانگی یەکێکیانی کردوە گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بەو ناوە بانگی مەکە پێی ناخۆشە، بۆیە خوا ﷻ ئەو ئایەتەی ناردە خوار، کە ناوو ناتۆرە لە یەکدیی هەڵمەدەن.

**٢-** هەر لەو بارەوە پێویستە ئەوەش بڵێین کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَن قَالَ لأَخِيهِ يا كافِر ! فَقَد باءَ بِهَا أَحَدُهُما، إن كانَ كَما قَالَ، وإلاَّ رَجَعَت عَلَيهِ**} (**أخرجه البُخاري: ٦١٠٤، وَمُسلِم: ٦٠، وَغَيرُهُما**)، واتە: (هەر کەسێک بە برایەکەی خۆی بڵێ: ئەی کافر! ئەوە یەکێکیان گوناهەکەی خستۆتە ئەستۆ، ئەگەر وابێ (بابای بەرانبەری کافر بێ)، ئەگەرنا گوناهەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە (بۆ بابای بێژەر).

**٣-** (**القرطبي**) لە بارەی ئەوەوە کە چ شتێک پێناسەی ئەوە دەکات و، ئەو چوار چێوەیە دیاریی دەکات کە ناوو ناتۆرەو عەیب گرتن بگرێتە خۆی؟ دەڵێ: (**وَالَّذِي يضبِطُ هَذَا كُلَّهُ أَن كُلَّ ما يَكرَهُ الإنسانُ إِذَا نُودِيَ بِهِ، فَلا يَجُوزُ لأَجلِ الأَذِيَّةِ**)[1]، واتە: ئەوەی ئەوە هەمووی کۆنترۆڵ دەکات، ئەوەیە هەر ناوێک کەسێک پێی ناخۆش بێت، پێی بانگ بکرێ، نابێ پێی بانگ بکرێ و حەرامە، چونکە پێی تووشی ئازار دەبێ.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦، ص٢٥٧.

٤- (القرطبي) لێرەدا هەڵاواردنێک دێنێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: (**وَقَعَ مِنْ ذَلِكَ مُستَثنَىً: مَنْ غَلَبَ عَلَيهِ الإستِعْمَالُ كَالأَعْرَجِ وَالأَحدبِ، وَلَم يَكُن لَهُ فِيهِ كَسبٌ ولايَجِد فِي نَفسِهِ مِنهُ عَلَيهِ، فَجَوَّزَتهُ الأُمَّةُ وَاتفقَت عَلَى قَولِهِ أَهلُ المِلَّةِ، كَما قالَ الرَّسُولُ ﷺ**: (**ما يَقُولُ ذُو اليَدَيْنِ؟ أخرجه البُخاري: ٧٣١**).

واتە: لێرەدا هەڵاواردنێک هەیە، ئەویش ئەوەیە کەسێک نازناوێکی زۆر بۆ بەکاربێ، وەک شەل و پشت کوڕ، بۆ خۆشی وای لەخۆی نەکردبێ، دڵیشی پێی نارەحەت نەبێ، ئەوە ئۆممەت و ئەهلی میللەت، (واتە: میللەتی ئیسلام)، ئەوەیان بە ڕەوا زانیوە، وەک چۆن پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: { **ما يَقُولُ ذُو اليَدَيْنِ**} خاوەنی دوو دەستەکان چی دەڵێ؟ هەموو کەس دوو دەستی هەن، بەڵام دیارە ئەو دەستی درێژتر بوون، پێشی ناخۆش نەبووە کە بەو نازناوە بانگ بکرێ، واتە: کەسێک کە بەو نازناوە نەبێ نەناسرێ و، پێشی ناخۆش نەبێ، زانایان لەبەر ناچاریی بە ڕەوایان داناوە.

## ٤)- بە نسبەت گومانی بەد بردن (سُوء الظَّن)ەوە:

لەو بارەوە سەرەتا دوو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

١- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللهِ حَرَّمَ مِنَ الْمُؤْمِنِ ثَلَاثاً: دَمَهُ، وَمَالَهُ، وَأَنَ يُظَنَّ بِهِ ظَنُّ السَّوْءِ**} (**أَخرَجَهُ البيهقي فـي شعب الإيمان: ٦٧٠٦**)، واتە: بێگومان خوا سێ شتی بڕواداری قەدەغە کردوون: خوێنی و، ماڵ و سامانی و، ئەوە کە گومانی خراپی پێ ببردرێ.

٢- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلَا تَحَسَّسُوا، وَلَا تَجَسَّسُوا، وَلَا تَنَافَسُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا**} (**أخرجه البُخاري: ٤٨٤٩، وَمُسلِم: ٦٧٠١**).

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٦، ص٢٥٦.

واتـه: خۆتـان لـه گومـان بپارێـزن، چونکـه گومانی خـراپ درۆترین قسـەیەو، هەسـت لـه یەکـدی ڕامەگـرن و، سـیخوڕیی لەسـەر یەکـدی مەکـەن، لـه مامەڵـەدا فێـڵ لـه یەکـدی مەکـەن، (نرخـی زیـاد بخەنـه سـەر شـتێک نـەک بـه مەبەسـتی کڕیـن بەڵکـو بـه مەبەسـتی کڵاو لەسـەری خەڵـک نـان)و، حەسـوودیی بـه یەکـدی مەبـەن و، یەکـدی مەبوغزێنـن و، پشـت لـه یەکـدی مەکـەن و، بەنـدەی خـوا بـن و بـرای یەکـدی بـن.

لـه بـارەی گومـانی خـراپ بردنـەوە: **(القرطبـي)** قسـەیەکی جـوان دەکات لـه تەفسـیرەکەی خـۆی دا[١]، دەڵـێ: **(وللظـن حالتـان: حالـة تُعـرَف وتُقَـوَّى بوجـه مـن وجـوه الأدلـة، فيجـوز الحكـم بهـا، وأكـثر أحـكام الشريعـة مبنيَّـة عـلى غلبـة الظـن، والحالة الثانيـه: أن يقـع في النفـس شيء مـن غـير دلالـة، فـلا يكـون ذلـك أولى مـن ضـده، فهـذا هـو الشـك، فـلا يجـوز الحكـم بـه، وهـو المنهـيُّ عنـه)**.

واته: گومان دوو حاڵەتی هەیە:

**یەکەم:** حاڵەتێکیان کە دەزانرێ و، بە ڕوویێک لە ڕووەکانی بەڵگەکان بەهێز دەبێ، ئەمە دروستە بۆ حوکمدان بەکاربهێنرێ و، زۆربەی یاساکانی شەریعەت لەسەر گومانی زاڵ بنیات نراون.

**دووەم:** ئەوەیە کە شتێک بچێتە دڵی مرۆڤەوە بە بێ بەڵگەیەک و نیشانەیەک و، ئەوەی کەوتۆتە دڵ، لە پێشتر نەبێ لە دژو پێچەوانەکەی، ئەوەش بریتیە: لە (شک) دوو دڵیی، کە بە دڵنیایی ئەوە دروست نیە بۆ حوکمدان بەکاربهێنرێ و، شتێکی قەدەغەکراوە.

**(الزمخشري)** کـه **(جـمال الديـن القاسـمي)** لێـی خواسـتۆتەوە لـه **(محاسـن التأويـل)** دا[٢]، قسـەیەک لـه بـارەی گومـانی خراپـەوە دەکات، دەڵـێ: **(والـذي يميِّـز الظنـون التـي يجـب اجتنابهـا عـمّا سـواها، أنّ كل مـا لم تعـرف لـه أمـارة صحيحـة وسـبب ظاهـر: كان حرامًـا واجـب الإجتنـاب، وذلـك إذا كان المظنـون بـه، ممَّـن شـوهد منـه السـتر والصـلاح،**

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦، ص٢٥٩.

(٢) ج٩، ص١٢٠.

**وأونسـت منـه الأمانـة في الظاهـر، فَظَـنُّ الفسـاد والخيانـة بـه محـرَّم، بخـلاف مـن اشـتهر بـين النـاس بتعاطـي الرِّيـب والمجاهـرة بالخبائـث).**

واتـە: ئـەوەی ئـەو گومانانـە جیا دەکاتـەوە کـە پێویسـتە خۆیـان لـێ دوور بگیـرێ، لـە گومانـەکانی دیکـە کـە پێویسـت نـەکات، دووریـان لـێ بگیـرێ، ئەوەیـە کـە هـەر گومانێـک نـە نیشـانەیەکی ڕاستی لەسـەر بـێ، نـە هۆکارێکـی ئاشـکرای هەبـێ، ئـەوە حەڕامـەو پێویسـتە دووریـی لـێ بگیـرێ، ئەویـش لـە حاڵێکـدا کـە بابـای گومـان پێبراو، کەسـێک بـێ چاکیـی و پاکیـی لـێ بینرابـێ و، ئەمانـەتی بـە ئاشـکرا لـێ زانـرا بـێ، ئەمـە گومـانی خـراپ پـێ بـردنی و گومـانی موخەننەتیـی پێبردنی، شـتێکی قەدەغەیـە، بـە پێچەوانـەی کەسـێکەوە، کـە لـە نێـو خەڵکـدا شـتی دیـاری گومـان لێکـراوی هەبـێ، یاخـود بـە ئاشـکرا شـتی پیـس و خـراپ ئەنجـام بـدات، (دیـارە بـۆ خـۆی وایکـردوە کـە گومـانی خراپـی پـێ ببردرێ و، ئـەو کاتـە گومـان خـراپ پێبردنی گوناهــ نیـە).

## ٥)- بە نسبەت سیخوڕیی کردن (التَّجَسُّس)ەوە:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ﴾، (**إبـن عبـاس**) لــە تەفسـیر کـردنی دا گوتوویـەتی: (**يَقُـولُ: وَلا يَتَتَبَّـع بَعضُـكُم عَـورَاتَ بَعـضٍ وَلا يَبحَـث عَـن سَرائِـرِه**)، (**أخرجـه: الطـبري: ٣١٨٠٥، عـن عبداللـه بـن عبـاس**).

واتـە: هەندێکتـان بـە دوای ناتەواویـی هەندێکتانـدا مەگەڕێـن و، بـا نەپشـکنێ بـۆ دۆزینـەوەی نهێنییەکانی.

واتـە: ئـەو نهێنـی و ئـەو پەنهانانـەی پێـی ناخۆشـە خەڵـک پێیـان بزانـێ، بـێ ئـەوەی زیانیـان بـۆ خەڵـک هەبـێ.

هەڵبەتـە دوایـی بـاسی ئـەوە دەکەیـن کـە (**تَجَسُّس**)، یـانی: هەسـت ڕاگرتـن و بـە دوای کـەم و کوڕییـدا گـەڕان، هەمـووی بـە ڕەهایـی قەدەغـە نیـە.

لەو بارەوەش با سەرەتا دوو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێنین:

**١-** یەکەمیان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّكَ إِنْ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ**}، (**رَواهُ: أَبُو داود: ٤٨٨٨، إبنُ حِبَّان: ٥٧٦٠، أَبُو يَعلَى: ٧٣٨٩، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، رضي الله عنهما، وصححه الألباني في «صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب»: ٢٣٤٢**).

(پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی یەکێک دەکات، کە دیارە جۆرێک لە بەرپرسیارێتیی و حوکمڕانیی بووە)، دەفەرموێ: تۆ ئەگەر بە دوای کەم و کوڕییەکانی خەڵکدا بگەڕێی تێکیان دەدەی، یان خەریکی تێکیان بدەی.

بەو واتایە: ئەگەر ئەوان بزانن تۆ پشکنین و خەفتان دەکەی بۆ پەی پێبردنی عەیب و کەم و کوڕییەکانیان، ئەوانیش حاڵیان تێکدەچێ، چونکە زۆر شت لە تۆ دەشارنەوە، یان ئەوانیش لە بەرانبەردا بە چاوی دوژمن تەماشات دەکەن، یان بوغزێکیان لە دڵدا پەیدادەبێ، گرنگ ئەوەیە دەبێتە هۆی تێکدانیان، پێغەمبەر ﷺ ڕوونی نەکردۆتەوە کە مەبەست لەو تێکدانە چییە، کە بەپێی ژینگەکان و بەپێی کۆمەڵگاکان ئەوە دەگۆڕێ.

**٢-** لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ، وَلَمْ يَدْخُلِ الْإِيمَانُ قَلْبَهُ! لَا تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ؛ فَإِنَّهُ مَنْ يَتَّبِعْ عَوْرَاتِهِمْ، يَتَّبِعِ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ يَتَّبِعِ اللهُ عَوْرَتَهُ، يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ**} (**أخرجه أَحمد: ١٩٧٧٦، وأَبُو داود: ٤٨٨، قال الألباني: حسن صحيح**).

واتە: ئەی ئەو کۆمەڵەی بە زمان بڕواتان هێناوە! بەڵام ئیمان نەچۆتە نێو دڵیان، غەیبەتی مسوڵمانان مەکەن و، بە دوای کەم و کوڕییەکانیاندا مەگەڕێن، چونکە هەر کەسێ بە دوای کەم و کوڕییاندا بگەڕێ، خواش ﷻ بە دوای کەم و کوڕیی ویدا دەچێ، هەر کەسیش خوا ﷻ بە دوای کەم و کوڕییدا بچێ، لە ماڵی خۆیدا پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێ و عەیبی دەردەخات و، ئابڕووی دەبات.

(محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: (**التَّجَسُّسِ مِنْ فُرُوعِ النَّهْيِ عَنِ الظَّنِّ، فَهُوَ مُقَيَّدٌ بِالتَّجَسُّسِ الَّذِي هُوَ إِثْمٌ أَوْ يُفْضِي إِلَى الْإِثْمِ، وَإِذَا عُلِمَ أَنَّهُ يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِ مَفْسَدَةٌ عَامَّةٌ، صَارَ التَّجَسُّسُ كَبِيرَةً، وَمِنْهُ التَّجَسُّسُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ لِمَنْ يَبْتَغِي الضُّرَّ بِهِمْ، فَالْمَنْهِيُّ عَنْهُ هُوَ التَّجَسُّسُ الَّذِي لَا يَنْجَرُّ مِنْهُ نَفَعٌ لِلْمُسْلِمِينَ أَوْ دَفْعُ ضُرٍّ عَنْهُمْ، فَلَا يَشْمَلُ التَّجَسُّسَ عَلَى الْأَعْدَاءِ، وَلَا تَجَسُّسَ الشُّرَطِ عَلَى الْجُنَاةِ وَاللُّصُوصِ**).

واتە: سیخوڕیی کردن (بەڵام ئەگەر بگوترێ: جاسووسیی کردن باشترە، هەرچەندە لە زمانی کوردییدا لە بری جاسووس، سیخوڕیان بەکارهێناوە، کە سیخوڕ ناوی ئاژەڵێکیشە گۆشتی دەخورێ)، جاسووسیی کردن لە لقەکانی قەدەغەکردنی گومانە، (گومانی خراپ)، بۆیە پەیوەستە بە جاسووسیی کردنێکەوە کە گوناه بێت، یاخود سەر بکێشێ بۆ گوناه، بەڵام ئەگەر بزانرێ کە خراپەیەکی گشتیی لەو جاسووسیی کردنە پەیدادەبێ، ئەو کاتە ئەو جاسووسیی کردنە دەبێتە گوناهێکی گەورە، کە ئەویش بریتیە لە جاسووسیی کردن بەسەر مسوڵمانانەوە، بۆ کەسێک کە بیەوێ زیانیان پێ بگەیەنێ.

کەواتە: ئەوەی کە قەدەغە کراوە، بریتیە لە جاسووسیی کردنێک کە سوودێکی بۆ مسوڵمانان تێدا نەبێ و، دوور خستنەوەی زیانێکی لێیان تێدا نەبێ، بۆیە ئەو جاسووسیی کردنەی کە قەدەغەیە، گشتگیر نیە بۆ جاسووسیی کردن لەسەر دوژمنان، هەروەها جاسووسیی کردنی شوڕتەو پۆلیس لەسەر تاوانباران و، لەسەر دزو ڕێگران ناگرێتەوە.

کە ئێستا لە ڕۆژگاری ئێمەدا پێی دەگوترێ: هەواڵگریی (**مُخابَرات**)، ئەوانەی کە هێمنیی و ئاساییشی کۆمەڵگا دەپارێزن، ئەوانە ئەگەر بێت و چاو ورد نەکەنەوەو نەپشکنن و، بە دوای ئەوانەدا نەگەڕێن کە خەریکی پیلان گێڕیی و تێکدانی هێمنیی و ئاساییشی خەڵکن، یاخود زیان پێگەیاندنیانن، یاخود دزیی

(١ التحرير والتنوير: ج١٠، ص٢٥٤.

لێكردنیانن، یان دەستدرێژیی كردنە سەر ژیان و نامووسیانن، ئەو كاتە تاوانباران ڕێیان بۆ تەخت و ئاچووغ دەبێ، كەواتە: ئەوەی قەدەغەیە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ﴾، واتە: جاسووسیی لەسەر یەكدی مەكەن، لە ڕووی زیان بە یەكدی گەیاندنەوە، بەڵام بۆ دوورخستنەوەی زیان، جاسووسیی كردن لەسەر دوژمنان، بێگومان ئەوە ناگرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگەكانیدا یەكێك لە هۆیەكانی سەركەوتنی، ئەوە بووە كە هەواڵگرییەكی بەهێزی هەبووەو، زانیاریی لەسەر دوژمن كۆكردۆتەوەو زانیویەتی دوژمن هێزی چەندە؟ بە تەمای چییە؟ چۆنە؟ كە ئەوەش هەمووی دەچێتەوە نێو بازنەی فراوانی جاسووسیی كردن یاخود هەواڵگرییەوە.

### ٦)- بە نسبەت غەیبەتكردن (إغتیاب)ەوە:

ئەمیان پێویستیی بە شیكردنەوەو وردەكاریی زیاتر دەكات، زانایان زۆریان قسە لە بارەیەوە كردوە، هەرچەندە كاتی خۆی ئێمە پێناسەی غەیبەتمان كرد، بەڵام دووبارەی دەكەینەوە.

### یەك: پێناسەی غەیبەت:

**(الإغتِیابُ: ذِكْرُ أَحَدِ غائِبٍ بِما لا یُحِبُّ أَن یُذكَرَ بِهِ، وَالإِسمُ مِنهُ الغِیبَةُ مِثلُ الغِیلَة، أو الغِیْبَةُ: ذِكرُ العَیبِ بِظَهْرِ الغَیبِ)**، ئەم دوو پێناسەیە كراون بۆ غەیبەت و، هەڵبەتە پێناسەی زیاتریش هەڵدەگرێ:

أ- **(إغتِیاب)**: بریتیە لەوەی كەسێك كە ئامادە نیە، بە شێوەیەك باسی بكرێ، پێی ناخۆش بێ، ئاوا باس بكرێ، ناوی **(إغتِیاب)** بریتیە لە **(غِیبَة)**، بە كوردیی هەر پێی دەڵێن: غەیبەت كردن، وەك **(الغِیلَة)**، واتە: پەنهانكوژیی، لە **(إغتِیال)**ەوە هاتوە، **(غِیبَة)**ش لە **(إغتِیاب)**ەوە هاتوە، واتە: پاشملە بە خراپ باس كردن.

ب- هەندێكیش **(غِیبَة)**یان ئاوا پێناسە كردوە: **(ذِكرُ العَیبِ بِظَهرِ الغَیبِ)**، بریتیە لە باسكردنی كەم و كوڕیی لە كاتی ئامادەنەبوونی بابای باسكراودا، واتە: پشتملە.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر باش پێناسەی (غِیبَة)ی بۆ کردووین، وەک لەو فەرمایشتەدا هاتوە: {عَن أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَتَدرُونَ مَا الغِيبَةُ؟ قَالُوا: أَللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ، قِيلَ: أَفَرَأَيتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُن فِيْهِ فَقَد بَهَّتَهُ} (أخرجه مُسلِم: ٢٥٨٩، وأَبو داود: ٤٨٧٤، والتِّرمُذِي: ١٩٣٤، والنَّسائِي في الكُبرى: ١١٥١٨، وَغَيرُهُم).

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک ڕووی لە هاوەڵانی کردوە، فەرموویەتی: دەزانن (غِیبَة) چییە؟ ئەوانیش گوتوویانە: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرموویەتی: بریتیە لە باسکردنی برایەکەت بە شێوەیەک کە پێی ناخۆش بێت، گوترا: ئایا ئەگەر ئەوەی دەیڵێم لە برایەکەمدا هەبێ؟ (واتە: هەر بە غەیبەت لە قەڵەم دەدرێ؟)، فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی لە برایەکەتدا هەبێ (کەم و کوڕییەک و عەیبێک)، ئەوە غەیبەتت کردوە، بەڵام ئەگەر ئەو کەم و کوڕییەی تێدا نەبێ، بوختانت پێ کردوە.

یانی: خراپتر لە غەیبەت، (بهتان) واتە: تۆمەتێک پاڵ بدەیە لای کەسێک کە بەریی بێت لەو شتە.

بە کوردیی دەڵێن: بوختان، بەڵام بوختانی داوێن پیسیی لە شەرعدا پێی دەگوترێ: (قَذف)، لە سووڕەتی (النور)دا، خوای پەروەردگار وشەی (رَمي) بەکارهێناوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ...﴿٤﴾ ﴾، (رَمي)، یانی: (قَذف)، بەڵام تۆمەتبارکردنی خەڵکی بە غەیری داوێنپیسیی، پێی دەگوترێ: بوهتان، کە لە کوردییدا وشەی بوختانی بۆ بەکاردێنن، هەر لە (بهتان)ی عەرەبییەوە هاتوە، واتە: تۆمەتبار کردنی کەسێک بە گوناهێک کە نەیکردبێ، یان بە کەم و کوڕییەک کە تێیدا نەبێ.

## دوو: خراپیی غەیبەت و سزای سەختی:

لـە بـارەی خراپیـی و سـزای سـەختی غەیبەتکردنـەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمایشـتێکی هەیـە: {عَـنْ أُبَيِّ بْـنِ كَعْـبٍ رضي الله عنـه، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ: لَـمَّا عُـرِجَ بِي، مَـرَرْتُ بِقَـوْمٍ لَهُـمْ أَظْفَـارٌ مِـنْ نُحَـاسٍ، يَخْمُشُـونَ وُجُوهَهُـمْ وَصُدُورَهُـمْ، فَقُلْـتُ: مَـنْ هَـؤُلَاءِ يَـا جِبْرِيـلُ؟ قَـالَ: هَـؤُلَاءِ الَّذِيـنَ يَأْكُلُـونَ لُحُـومَ النَّـاسِ وَيَقَعُـونَ فِي أَعْرَاضِهِـمْ} (أخرجـه أحمـد: ١٣٣٦٤، وأبـو داود: ٤٨٧٨، وَصَحَّحَـهُ الأَلْبـاني فِي صَحِيـحِ الجامِـع: ٥٢١٣).

واتـە: ئوبـەی کـوڕی کەعـب (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ئـەو کاتـەی بـەرز کرامـەوە (مەبەسـتی پێـی شـەوڕۆ و بەرزبوونەوەیـە)، بـە لای کۆمەڵێکـدا تێپەڕیـم، نینۆکـی ئاسـن و مسـیان هەبـوو، دەم و چـاوی خۆیـان پـێ دەڕنیـەوەو، سـینگی خۆیـان پـێ دەڕنیـەوە، گوتـم: ئـەی جیبریـل! ئەوانـە کێـن؟ فەرمـووی: ئەوانـە کەسـانێکن گۆشـتی خەڵـک دەخـۆن و، لـە سـومعەو کەڕامەتیـان دەدەن، (واتـە: دەیانـەوێ کەسـایەتییان لـە کـەدار بکـەن و بیانشـکێنن پاشـملە یاخود بـەرەو ڕوو).

## سێ: جۆرەکانی غەیبەت:

ئایا غەیبەت هەر یەک جۆرە؟

(القرطبـي) لـە تەفسـیرەکەی دا[1] ئـەم قسـەیە لـە حەسـەنی بەصرایيـەوە دێنـێ، دەڵـێ: (قَـالَ الحَسَـن: الغيبـة ثلاثـة أوجـه، كلهـا في كتـاب اللـه تعـالى: الغيبـة، والإفـك، والبهتـان، فأمّـا الغِيبـة: فهـي أن تقـول في أخيـك مـا هـو فيـه، وأمـا الإفـك: فـأن تقـول فيـه مـا بلغـك عنـه، وأمّـا البهتـان: فـأن تقـول فيـه مـا ليـس فيـه).

لـە ڕاسـتییدا حەسـەنی بەصرایـی زانایەکـی زۆر وردو بـاش تێگەیشـتوو بـووە لـە قورئـان و سـوننەت، بۆیـە هەندێـک لـە زانایـان بـە (سَـيِّدُ التَّابِعِـين)ی نـاو دەبـەن،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٦، ص(٢٦١، ٢٦٢).

واتە: گەورەی جیلی شوێنکەوتووان، دەڵێ: غەیبەت سێ جۆرە، هەر سێکیان لە کتێبی خوای بەرزدا هەن، کە بریتین: لە (**الغِيبَـةُ وَالإفك وَالبُهتان**)، واتە: غەیبەت کردن و، قسە بۆ هەڵبەستن و، تۆمەتبار کردن:

**أ- (غيبة)**: بریتیە لەوەی تۆ شتێک لە بارەی برایەکەتەوە بڵێی، ئەو سیفەتەی تێدا بێ، (بەڵام پێی ناخۆش بێ).

**ب- (إفك)**: ئەوەیە تۆ شتێکی لە بارەوە بڵێی، کە پێتگەیشتوە، (پێی هەڵبەستراوە، بە تۆ گەیشتوە، تۆش بیڵێی)، بێ ئەوەی ساغی بکەیەوە، داخۆ وایە یان نا؟.

**ج- (بُهْتَان)**: ئەوەیە تۆ شتێکی لە بارەوە بڵێی، ئەو سیفەتە خراپیش بێ و تێشی دانەبێ، عەیب و کەم و کوڕییەکی پاڵ بدەیە لا، کە تێیدا نەبێ.

### چوار: غەیبەت کردنی نامسوڵمانان:

ئایا غەیبەت کردنی نامسوڵمانانیش، وەک هی مسوڵمانان گوناهە؟

لەو بارەوە (**الآلوسي**) لە تەفسیرەکەی (**روح المعاني**)دا[1]، دەڵێ: (**وَأَمَّا الذِّمـيُّ فكالمسلم فيما يرجع إلى المنع عن الإيذاء، لأن الشرع عصم عِرْضه ودَمَه ومالَه، وَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَن سَمَّعَ يَهُودِيَّاً أَو نَصْرَانِيَّاً فَلَـهُ النَّارُ**[2]**. سَمَّعَهُ أَي: أَسمَعَهُ ما يُؤذِيهِ وَلا كَلام بَعدَ هَذا في الحرمَة**).

واتە: هاووڵاتیی نامسوڵمان، وەک مسوڵمان وایە لە شتێکدا کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگرتن لە ئازاردانی، چونکە شەرع هەم ئابڕووی و، هەم خوێنی و، هەم ماڵ و سامانی پاراستوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک قسەیەکی ئازاردەر بە جوولەکەیەک، یان بە نەصرانییەک ببیستێنێ، ئەوە سزای ئاگرە، ئالووسیی دەڵێ: واتە: قسەیەکی پێ ببیستێنێ کە ئازاری بدات، لە دوای ئەم

---

(١) ج٢٦، ص٤٢٧.

(٢) أخرجهُ ابنُ حِبَّان: ٤٨٨٠.

دەقەی سوننەتیشەوە، قسەی دەربارەی قەدەغەبوونی ئازاردانی نامسوڵمانان لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا ناکرێ، واتە: ئەوە قسەی کۆتاییە لەو بارەوە.

**پێنج: وێناکردنی غەیبەت بە گۆشتی مردوو خواردن و، پێنج جۆرە جەختکردنەوە:**

**(الزمخشري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا کە **(محاسن التأويل)** لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: ئەو وێنا کردنەی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾، چەند زێدەڕۆییەک و، چەند جەختکردنەوەیەکی جۆراو جۆری تێدان، کە ئەو پێنج جۆرە جەختکردنەوەی هێناون:

١- ئەوەیە کە پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی چەسپاندن **(الإستِفهامُ التَّقرِيرِي)**ە، ئەویش جەختکردنەوە دەگەیەنێ، لەو ڕووەوە کە ئەو جۆرە پرسیارکردنە، تەنیا لە بارەی شتێکەوە دەبێ کە سەلمێنراو بێ لەلای بابای دوێنراو (بیسەر).

٢- کە خوا ﷻ گۆشت خواردنی برای مسوڵمانی لە پێ ناخۆشییدا، پەیوەست کردۆتەوە بە خۆشویستن، واتە: ئایا یەکێک لە ئێوە حەز دەکات و پێی خۆشە، گۆشتی برایەکەی بخوات؟.

٣- کە ئەوەی پاڵداوەتە لای یەکێک: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ﴾، ئەمەش بۆ نیشاندانی ئەوەیە کە هیچ یەکێک لە یەکەکان، حەز لە شتی وا ناکات.

٤- کە تەنیا بەوەندە وازی نەهێناوە، غەیبەت کردن لەوەدا وێنا بکات کە گۆشتی مرۆڤ دەخورێ، تاکو ئەو مرۆڤەی کردوە بە برا: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا﴾، ﴿أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ﴾.

٥- هەر بەوەندەش وازی نەهێناوە کە ئەو گۆشت خواردنە، گۆشت خواردنی برا بێ، تاکو کردوویەتی بە مردوو **(أخيه ميتاً)**.

بە دڵنیایی خوا ﷻ لەو تەعبیرەدا کە ویستوویەتی غەیبەتکردن بۆ ئێمە بە شێوەیەکی زۆر قێزەون پێشان بدات، لەو دارشتن و لەو ڕەوانبێژییە کە خوا ﷻ بەکاری هێناوە، زیاتر نیەو گەیاندوویەتە ئەو پەڕی.

**شەش: غەیبەتکردن لە شەش حاڵان دا ڕەوایە:**

ئایا غەیبەتکردن لە هەموو حاڵاندا هەر حەرامە؟

(**الألوسي**) دەڵێ: (**وقد تجب الغيبة لغرض صحيح شرعيٍّ لا يُتوصَّل إليه إلاّ بها وتنحصر في ستة أسباب:**

**الأول: التظَّلم، والثاني: الإستعانة على تغيير المنكر، الثالث: الإستفتاء، والرابع: تحذير المسلمين من الشرِّ، كجرح الشهود والرواة، والخامس: أن يتجاهر بفسقه كالمُكاّسين وشَرَبة الخمر، والسادس: للتعريف بنحو لقب كالأعور، والأعمش**).

واتە: جاری وا هەیە غەیبەت بۆ مەبەستێکی شەرعیی ڕاست، واجب دەبێ بکرێ، کە لەڕێی غەیبەتەوە نەبێ ئەو مەبەستە شەرعییە ڕاستە ناهێنرێتە دی و دەستەبەر ناکرێ، ئەویش شەش حاڵەتی هەن، {دەڵێم: بە بۆچوونی من، ئەگەر گوتبای ڕەوا دەبێ، باشتر بوو، وەک نەوەویی ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی}:

**یەکەم:** (**التَّظَلُّم**): واتە: باسی ستەم لێکراویی خۆ کردن:

کەسێک دەچێ بۆ لای دادوەر یان بۆ ئەو شوێنەی کە سکاڵای خۆی لەلا دەکات، دەبێ باسی تەڕەفی بەرانبەر بکات، ئەگەر ماڵی لێ داگیر کردبێ، ئەگەر زوڵمی لێ کردبێ، ئەگەر لێی دابێ، ئەگەر غەدری لێکردبێ، دەبێ باسی بکات.

**دووەم:** (**الإستِعَانَةُ عَلَى تَغِيِيرِ المُنكَرِ**): یارمەتیی وەرگرتن بۆ گۆڕینی خراپەو ناشەرعییەک:

ئەگەر بتەوێ خەڵکێک قەناعەتت پێ بێنی کە لەگەڵت دا هاوکار بێ بۆ لابردنی ناشەرعییەک، دەبێ تێیان بگەیەنی ئەو ناشەرعییە کێ دەیکات و چۆنەو چۆن نیە؟.

**سێیەم: (الإستِفتاءُ)**: لە حاڵەتی داواکردنی فەتوادا:

کەسێک دەچێ بۆ لای مامۆستایەک، بۆ لای شارەزایەک لە شەریعەتدا، یان بۆ لای کەسێک کە دەیەوێ فەتوای لێوەربگرێ، دەبێ حاڵی خۆی بۆ بەیان بکات و بڵێ: ئاوایەو ئاوایە، لەو حاڵەتەشدا غەیبەت بەلای کەمدا ڕەوایە.

**چوارەم:** ئاگادار کردنەوەی مسوڵمانان لە خراپە، لە تووشی هەڵەو زیان بوون، ئەویش وەک بریندارکردنی شاهیدان و بریندارکردنی ڕاویان.

هەر بۆیە زانایانی ئیسلام زانستێکی سەربەخۆیان داناوە بەنای (**عِلمُ الجَّرح وَالتَّعدِيل**)، واتە: زانیاریی بریندارکردن و بە دادگەر دانان، چونکە ئەگەر وانەبووایە بەهۆی ئەو زانیارییەوە نەبووایە، هەرچی بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ دەگوترا، لە نێو مسوڵماناندا بە فەرمایشت دادەنراو، لە ئەنجامی ئەوەشدا شتی زۆر نارەواو ناهەق و ناڕاست دەهاتە نێو ئیسلامەوەو، بە ناوی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگوترا، ئەوەش زیانێکی گەورەی دەبوو، کە زانایان لەگەڵ دانانی ئەو زانستەشدا لەگەڵ پشکنین و لێکۆڵینەوەی زۆریشیاندا، ئێستاشی لەگەڵدابێ هەندێک شت هەر هاتۆتە نێو سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ تەنانەت لە نێو ئەو کتێبانەشدا کە هەن و باون، هەڵبەتە هەیە کەمترو هەیە زیاتر، هەرچەندە زانایان زۆر خەفتانیان کردووەو زۆر هەوڵیان داوە، کە دەقە ڕاستەکانی سوننەت، جا چ فەرمایشتەکانی پێغەمبەر بن ﷺ، چ کردەوەکانی بن، چ دانپێداهێنانەکانی بن، جیایان بکەنەوە، لەوەی کە ناڕاستەو هەڵبەستراوە، بەڵام ئێستاش لەگەڵدابێ شت هەر هەیە، بۆیە زانایان بەردەوام مشت و مڕیان هەیە لەو بارەوە، کە یەکێکیان دەقێکی سوننەت بەڕاست دەزانێ، یەکێکیان بەبێهێزی دەزانێ، یەکێکیان بە هەڵبەستراوی دەزانێ.

**پێنجەم:** ئەوەیە کە بابای تاوانبار بۆ خۆی بە ئاشکرا گوناهەکە بکات:

وەک گومرگ وەرگران (**المُكَّاسِين**) موککاس کەسێکە گومرگ وەربگرێ، بەڵام بە شێوەیەکی ناهەق، هەروەها ڕێگران و شەراب خۆران و مەیخۆران، کە بەبێ

شـەرمیی ئـەو کارانـە بـە ئاشـکرا دەکـەن، ئەوانـەش دیسـان باسـکردنیان گوناهــ نیـە، چونکـە ئـەو کەسـە بـۆ خـۆی بەبـێ شـەرمیی گوناهەکـەی خـۆی دەکات، ئنجـا ئەگەر زوڵـم کردنێکـە لـە ڕووی سیاسـیی و ئابوورییـەوە، گوناهـو تاوانێکـە کـە دەیـکات، کـە ئـەو نموونـەی بـە مەیخۆریـی هێناوەتـەوە.

**شەشەم:** بۆ ناساندن:

بـۆ وێنـە دەڵێـن: فڵانکـەسی یـەک چـاو، یـان فڵانکـەسی کوێـرە مـووش، یـان فڵانکـەسی شـەل، یـان فڵانکـەسی گـۆج، ئـەو کەسـە مـادام بـەو لـە قـەب و نازنـاوە نەبـێ نەنـاسرێ، بـۆ ناسـاندن دروسـتە ئـەو نـاوەی لێهەڵبـدرێ، هەرچەنـدە کـە پێـشی بگاتـەوە پێـی ناخۆشـە، بـەڵام چونکـە وا نەبـێ نانـاسرێتـەوەو دەبـێ بێنـی حیکایەتـێ بکـەی تاکـو کابـرای پـێ بناسـێنی! جـاری وا هەیـە کاتەکـەش هێنـدە نیـەو شـتەکە بـە پەلەیـە، دەگونجـێ یەکسـەر ئـەو نازنـاوەی کەسـەکە پێـی نـاسراوە، بـۆ وێنـە: فڵانکەسـە گـۆج، یـان فـڵان کەسـە شـەل، یـان فـڵان کەسـە گێـڕ، یـان فـڵان کـەسی پشـتی کـووڕ، دروسـتە ئـەوە بەکاربهێـنرێ، لەبـەر پێویسـتیی ناسـینەوە.

خـوا ﷻ کـە لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴾، پارێـز لە خوا بکـەن بـە دڵنیایـی خـوا زۆر تۆبـە وەرگـری میهرەبانە، ئەمـە دوو شـتان دەگەیەنێ:

١- هەر کەسێک دەست لەو شتانە هەڵنەگرێ و، لێیان پەشێمان نەبێتەوە، خوا ﷻ بەزەیی پێیدا نایەتەوەو، تووشی سزا دەبێ.

٢- هەروەها ئەو ڕستە موبارەکە ئەوەش دەگەیەنێ، کە هەر کەسێک تەوبە لەو شتانە بکات، کە مافی خەڵکن، خوا ﷻ بەزەیی پێیدا دێ و، گەڕانەوەکەشی لێوەردەگرێ، بەڵام وەک پێشتر گوتمان: بە مەرجێک گەڕانەوەکەی مەرجەکانی هەمووی تێدابن، کە ئێمە لە کتێبی (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا بە درێژیی باسمان کردوە، هەروەها لە کورتە باسێکدا لە سووڕەتی (النساء)دا هێناومانە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوو ئایەتەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ

ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ۝١٧ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ۝١٨ ﴾، لەوێ كورتە باسێكمان كردوە كە تەوبەی ساغ و ڕاست، دەبێ ئەو مەرجانەی تێدابن، ئەگەر پەیوەندیی بە گوناهێكەوە هەبێ كە ڕۆڤ لەنێوان خۆی و خوادا ئەنجامی داوە:

**یەكەم:** پەشێمان بوونەوە لەو گوناهە.

**دووەم:** دەست لێهەڵگرتنی ئەو گوناهە.

**سێیەم:** بڕیاردان بە نەگەڕانەوە سەر ئەو گوناهە.

یانی: (**النَّدمُ، وَالإقلاعُ، وَالعَزمُ عَلَى عَدَمِ العَودَة**)، بەڵام ئەگەر ئەو گوناهەی كراوە، پەیوەندیی بە خەڵكەوە هەبێ، ئنجا ئەگەر غەیبەت كردنە، ئەگەر بوختان پێكردنە، ئەگەر ماڵ لێ زەوتكردنە، ئەگەر قسە پێ گوتنە، هەرچی هەیە، دەبێ هەقی ئەو خاوەن هەقەش ڕەت بكاتەوە، ئەوەش مەرجی چوارەمیەتی، ئەگەر گوناهەكە پەیوەندیی بە خەڵكەوە هەبێ، دەبێ ماف بۆ خاوەن ماف ڕەت بكرێتەوە، ئنجا ئەو سێ مەرجەی دیكەشی تێدا هەبن، ئەوە مانای وایە خوا ﷻ لەو كەسە دەبووری و، بەزەیی بەو كەسەدا دێ، كە واز لەو گوناهانە دێنێ.

ئنجا جاری واش هەیە بابای كە هەقەكەی لەسەر بابای گوناهبارە، هەقەكە بەو جۆرە نیە، بتوانێ بۆی ڕەت بكاتەوە، ئەو كاتە دەبێ لە لای خۆیەوە زۆر بۆی داوای لێبوردن بكات لە خوای میهرەبان، یاخود هەوڵبدات چاكەی لەگەڵ بكات و سوودێكی پێ بگەیەنێ، بە ئەندازەی ئەو زیانەی لێیداوە، یان ئەگەر بزانێ نەیزانیوەو كە پێی بڵێتەوە، دڵی زۆر ئازار دەدرێ، دەبێ هەوڵبدات چاكەی لەگەڵ بكات، یان سوودێكی پێ بگەیەنێ، یاخود بە لای كەمەوە بۆی بپاڕێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو زیانەی پێی گەیاندوە، قەرەبووی بكاتەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**بانگـەوازی خـوا بـۆ مرۆڤایەتیـی کـە خـوا ﷻ هەموویـانی لـە نێـرو مێیـەک وە دیهێنـاون و، بـە ئامانجـی ئاشـنایی و هاوکاریـی نێوانیـان بـۆ چەنـد نەتـەوەو هۆزێـک دابـەشی کـردوون و، بەڕێزترینیـان لـە لای خـوا پارێزکارترینیانـە:**

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوە ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، [خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات و دەفەرموێ:] ئەی خەڵکینە! دوای ئەوەی خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا، پێنج جاران بانگی بڕواداراني کرد، هەر جارە بۆ جۆرێک لە ڕێنمایی و ئامۆژگاریی، ئەمجارە بانگی مرۆڤایەتیی دەکات بە تێکڕا، هەم بڕواداران و هەم بێبڕوایان هەموویان، ئەی خەڵکینە! ئەی مرۆڤەکان!.

**٢)-** ﴿ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئێوەمان هێناوەتە دی، کەواتە: ئێوە یەک تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنتان هەیە، ئەویش خوایە ﷻ لە چی هێناومانن دی؟

**٣)-** ﴿ مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ﴾، لە نێرێک و مێیەک، کە مەبەست پێی ئادەم و حەووان، صەڵات و سەلامی خوایان لێ بێ، یان مەبەست پێی دایک و بابی هەر کام لە مرۆڤەکانە، هەر کام لە مرۆڤەکان لە دایک و بابێک پەیدا بوون.

**٤)-** ﴿ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ﴾، گێڕاومانن بە چەند نەتەوەیەک و، چەند هۆزێک، تاکو پێک ئاشنابن، پێکەوە هاوکاربن.

وشـەی **(شُعُوب)** کـۆی (شَـعب)ە، بـە کوردیـی دەبێتـە نەتـەوە، گـەل، **(قَبائِـل)** یـش کـۆی (قَبِيلة)یـە، بـە کوردیـی دەبێتـە هـۆز، جـاری واش هەیـە لـە کوردیـی دا هـەر دەگوتـرێ: (عـەشرەت) یـان (عەشـیرەت)، لـە زمانـی عەرەبییـدا **(قبيلـة)** لـە

دوای (قبیلة) ئنجا (عشیرة) لە دوای عەشیرەت (فخذ)ە، لە زمانی کوردییشدا: هۆز و تیرەو تایفەو بەرەباب بەکاردێنین، هەتا دەگاتە بنەماڵە، کە ڕەنگە لە لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەیەک و، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە زمانی کوردیی دا، چەمکی ئەو وشانە بگۆڕێ، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوەمان دابەشکردوە، بۆ چەند نەتەوەیەک و بۆ چەند هۆزێک.

**٥)- ﴿لِتَعَارَفُوٓاْ﴾**، تاکو پێک ئاشنا بن، **(تَعارُف)** لەسەر کێشی **(تَفاعُل)**ە، بۆ ئەوەی پێک ئاشنابن، بەڵام بە تەئکید لێرەدا مەبەست هەر ئەوەندە نیە، پێک ئاشنابن، بەڵکو یانی: پێکەوە هاوکاربن، دەستبارگری یەکدی بن، ئەو مانایانەش دەگرێتە نێو خۆی، چونکە یەکدی ناسینەکە بۆ پێکەوە هاوکار بوون و دەستبار بۆ یەکدی گرتن و، پێکەوە تەبا بوون و پێکەوە ژیانە.

**٦)- ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾**، بە دڵنیایی بەڕێزترینتان لە لای خوا پارێزکارترینتانە، دەڵێ: **(الأَكرَمُ: الأَنفَسُ وَالأَشرَفُ)**، واتە: ئەوەی بە نرخترەو ئەوەی شەریفترە، **(وَالأَتْقَى: الأَفْضَلُ فِي التَّقْوَى، هُوَ اسمُ تَفضِيلٍ صِيغَ مِنَ (اتَّقَى) عَلَى غَيرِ قِياسٍ)**، **(أَتقَى)** واتە: باشتر لە پارێزکارییدا، کە ئەمە ناوی هەڵبژاردنە، لە **(إِتَّقَى)**دا تاشراوە، بەڵام بە غەیری قیاس، کەواتە: ئەوە لە لای خوا بەهادارترەو بەڕێزترەو شەریفترەو بە حورمەتترە، کە پارێزکاریی زیاترەو چاکترە.

**٧)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾**، بە دڵنیایی خوا زانای شارەزایە، ئەمە **(تَعلِيلٌ لِمَضمُون «إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ»، أَي: إِنَّ اللهَ عَلِيمٌ بالكَرَامَةِ الحَقِّ، لَكِنَّكُم جَعَلْتُم المَكارِمَ فيما دُونَ ذَلِكَ)**، ئەمە شیکردنەوەی نێوەڕۆکی: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾ەو، هۆکار دۆزییە بۆی، واتە: هەر خوا ﷻ دەزانێ ڕێزی ڕاستەقینە چییە، بەڵام ئێوە ڕێزو پلەو پێگەتان لە غەیری تەقوادا داناوە.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾، ئەمە تێکناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵک ڕێزلێگرتنی دیکەشیان هەبن، دوای پارێزکاریی، بۆ وێنە: کەسێک باش پەروەردە کرابێ، کەسێک ڕەچەڵەکەکەی پاک بێ، کەسێک لە بنەماڵەیەکی

باش بێ، کەسێک لە ڕووی زانستییەوە لە بنەماڵەیەکی زانستیی بێ، کەسێک کە لە هۆزو بنەماڵەیەک بێ، کە سومعەو ناوبانگی باش بێ، ئەوانەش هەموویان لەنێو کۆمەڵگادا جێی ئیعتیبارن، بەڵام ئەوەی بۆ لای خوا ﷻ سەنگی مەحەکە، بریتیە لە تەقوا، چونکە مرۆڤ بە دەست خۆی نیە، کە ئەگەر باب و دایکێکی نەبن، چاکیان پەروەردە کردبێ، یاخود ئەگەر ڕەچەڵەکەکەی زۆر پاک و چاک نەبێ، یاخود ئەگەر لە بنەماڵەیەکی زانستیی نەبێ، یاخود ئەگەر بنەماڵەکەی یان خزمەکانی سومعەو ناوبانگیان باش نەبێ، چی بکات؟ گرنگ ئەوەیە ئەو خۆی لە زاتی خۆیدا خۆی پاک و چاک بکات، بەوە لە لای خوا ڕێزو حورمەت پەیدا دەکات.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾، دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾، ئەوە ڕای خۆمە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، پێم وایە:

**یەکەم:** بۆ ئاگادارکردنەوەیانە، کە شانازیی بە خوا پەرستییەوە نەکەن، ئەو خوا پەرستییانەی کە هەر کەسێ تێیدا بیبزان، بە نیشانەی پارێزکاریی بۆی لە قەڵەم دەدرێن، شانازیی بەوەوە نەکەن، چونکە خوا زانایە، بە شتەکان و، شارەزایە بە کەسەکان.

**دووەم:** ئاگادارکردن و هۆشداریی پێدانیشیانە، بەوە کە دەروونی خۆیان چاکتر بکەن، نیازو مەبەستەکانیان باشتر بکەن، چونکە خوا ﷻ زاناشەو شارەزاشە.

ئەم ئایەتە موبارەکە شەش بنەمای گرنگی یەکڕیزیی و تەبایی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی بە گشتیی لێ هەڵدەهێنجرێن[1]، ئەو شەش بنەمایەش کە لەو ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێن بریتین لە:

---

(١) ئێمە لە چەند کتێبێکی خۆماندا ئەم ئایەتەمان زۆر شی کردۆتەوە، یەکێک لەوانە: (کتێبی سۆزی نەتەوایەتیی)، کە تاکو ئێستا چوار جار چاپ کراوە، هەروەها کتێبی: (نَظَراتٌ فاحِصة فِي قَضَايا شاخِصَة) کە کتێبێکی بەندەیەو، ساڵی پار واتە: (٢٠١٩م) لە میسر چاپ بووە، واتە: [سەرنجە پشکنەرەکان لە بارەی کێشە بەرجەستەکانەوە]، هەروەها (مَوسُوعَة: الإِسلام كَما يَتَجَلَّى فـي كِتابِ الله، الكِتابُ التَّاسِع: التَّصَوُّرات والقيم وَالمَوازِين).

**١-** تەنیا خوا بەدیهێنەری هەموو لایەکە، چونکە لە چەند بیرۆکەیەکی بتپەرستیی و نائیسلامیی دا، بڕوا بە چەند پەروەردگاریی هەیە، بە تایبەت بیرۆکەی (ثَنَويّة)، کە لە مەجووسییەتدا هەیە، بڕوا بە دووانەتیی هەیە: یەزدان بەدیهێنەری خێرو، ئەهریمەن بەدیهێنەری شەڕ، هەروەها لە ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، بیرۆکەی سەیرو سەمەرەیان هەن.

**٢-** مرۆڤەکان هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ نێرو مێیەک، بۆ دایک و بابێک، کەواتە: کەس بۆی نیە لە ڕووی ڕەچەڵەک و نەسەبەوە، خۆی بەسەر ئەوی دیکەدا هەڵکێشێ، چونکە هەموویان دەبنەوە بە خوشک و برای یەکدی.

**٣-** خوا ﷻ خەڵکی دابەشکردوە بۆ چەند نەتەوەیەک و چەند هۆزێک، کەواتە: دابەشکردنی خوای پەروەردگارەو ویستی خوا بووە، مرۆڤایەتیی ئاوا بێ، کەواتە: دەبێ نەتەوەکان وێک هەڵبکەن و، هۆزو تیرەکان وێک هەڵبکەن، چونکە خوا ﷻ وای داناوەو، نابێ هیچ نەتەوەیەک کەڵکەڵەی ئەوەی لە کەللەدا بێ کە نەتەوەیەکی دیکە بفەوتێنێ، یان لە خۆیدا بیتوێنێتەوە، وەک هیتلەرو مۆسۆلۆنیی کاتی خۆی دەیانکرد.

**٤-** خوا ﷻ مرۆڤایەتیی دابەشکردوە بۆ چەند نەتەوەیەک و، بۆ چەند هۆزێک، بە مەبەستی ئەوە کە پێک ئاشنابن و یەکدی بناسن و پێکەوە هاوکاربن.

**٥-** بەڕێزترینی مرۆڤەکان لە لای خوا، پارێزکارترینیانە، پارێزکارترینیانیش واتە: پابەندتر بە شەریعەتەوە، واتە: بۆ خوا سوڵحاوترو لەگەڵ خەڵکدا چاکتر، چونکە خوا پەرستیی و خەڵک دۆستیی، دوو ڕووی دینداریین، دینداریی دوو ڕووی هەیە، وەک دراوێک چۆن دوو ڕووی هەیە، ڕووێکیان بریتیە: لە خوا پەرستیی و، بەندایەتیی بۆ خوا کردن، ڕووێکیشیان بریتیە: لە خەڵک دۆستیی و چاکە لەگەڵ خەڵکدا کردن، هەر بۆیەش خوا ﷻ لە قورئاندا زۆر چەند تەعبیرێک دووبارە دەکاتەوە، کە ئەو دووانە (خوا پەرستیی و خەڵک دۆستیی) دەگەیەنن، وەک:

**أ-** تەقواو ئیحسان: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾النحل.

**ب-** ئیخلاص و ئیحسان: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء.

**ج-** پارێزکاریی و تەبایی و چاکسازیی: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ... ﴿١﴾ ﴾ الأنفال.

**د-** پارێزکاریی و چاکەکاریی: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ... ﴿٢﴾ ﴾ المائدة، (**برّ**): چاکەکاریی لەگەڵ خەڵک، (**تقوى**): پارێزکاریی لە خزمەت خوادا.

**هـ-** خوا پەرستیی و کردار چاکیی: ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾، الحج، پەروەردگارتان بپەرستن و چاکە بکەن، بەڵکو سەر فراز بن.

**٦-** بە دڵنیایی تەنیا خوا زانای شارەزایە، ئەمەش بۆ هۆشداریی پێدانە، کە هیچ کەس خۆی بەسەر کەسی دیکەدا هەڵنەکێشێ، کە دوو ڕکات نوێژی لەوی دیکە زیاترە، هەروەها بۆ ئەوەیە کە مرۆڤەکان بزانن، کە ئەم سەنگی مەحەک و ئەم پێوەرو تەرازووە، ڕاستە، نەک پێوەرو تەرازووکانی دیکەی، وەک ماڵ و سامان و زانست و شەهادەو، ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەک و ئەوانە، هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەوە کە دڵ و دەروونی خۆیان پاك و چاک بکەن و، گرنگ ئەوەیە ئینسان لە دەروونەوەو لە ناخەوە پاک و چاک و شایستە بێ.

لێرەشدا کۆتایی بەم دەرسەمان دێنین، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی وامان لێ بکات بەڕاستیی ئەهلی تەقوا بین، تاکو لە لای خوا خاوەنی ڕێزو حورمەتی زۆر بین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە دەرسی کۆتاییـە ئایەتـەکانی (١٤ - ١٨) دەگرێتـە خـۆی، ئـەم پێنـج ئایەتـەی کۆتایـی سـوورەتی (**الحجـرات**) لـە بـارەی یـەک بابەتـەوە دەدوێـن، کـە بریتیـە: لـە لاف لێـدان و خـۆ هەڵکێشـانی هەندێـک لـە (ئەعـراب)، بـەوەوە کـە گوایـە ئیمانیـان هێنـاوە، کـە لەڕاسـتییدا تەنیـا هاتبوونـە نێـو ئیسـلامەوەو، جـارێ ئیمانیـان لـە دڵـدا نەچەسـپا بـوو، ئنجـا خـوای کارزان و میهرەبـان ﷻ ناڕاسـتەوخۆ ئامۆژگاریـی کـردوون، کـە ئیـمانی ڕاسـتەقینە چییـە؟ چۆنـە؟

دوایـی گلەیـی و سەرزەنشـتیان ئاڕاسـتە دەکات، لەسـەر منـەت کردنیـان لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە گوایـە بڕوایـان هێنـاوە لـە حاڵێکـدا کـە قسـەکەیان ڕاسـت نەبـووەو، خـواش نهێنیـی و پەنهـانی ئاسـمانەکان و زەوی دەزانـێ و، هیچـی لـێ پەنهـان نیـە، بۆیـە نێـو دڵـی ئەوانیـش بـۆ خـوا ئاشـکرا بـووە، خـوا زانیویـەتی: جـارێ ئیـمان نەچۆتـە نێـو دڵیانـەوە.

﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ
وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ۖ
بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{عەرەبـە خێڵەکییـە (بیابانشـینە)کان گوتیـان: بڕوامـان هێنـاوە، بڵـێ: بڕواتـان نەهێنـاوە بەڵکـو بڵێـن: ملکـەچ (مسـوڵمان) بوویـن و، جـارێ بـڕوا نەچۆتـە نێـو دڵتانـەوەو، ئەگـەر فەرمانبەریـی خـواو پێەمبەرەکـەشی بکـەن، هیـچ شـتێک لـە (پاداشـتی) کردەوەکانتـان کـەم ناکاتـاوەو، بـە دڵنیایـی خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە ﴿١٤﴾ بـڕواداراتی (ڕاسـتەقینە) تەنیـا ئەوانـەن: بڕوایـان بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی هێنـاوە، ئنجـا دوو دڵیـش نەبـوون و، بـە سـامان و گیانیشـیان لەڕێـی خـوادا تێکۆشـاون (وفیداکارییـان کـردوە) بـەس ئەوانـە ڕاسـتانن (لـە بـڕوا هێنانیانـدا) ﴿١٥﴾ بڵـێ: ئایـا دینداریـی خۆتـان بـە خـوا دەزانێنـن (ڕادەگەیەنـن) لـە حاڵێکـدا هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەویدایـە دەیزانـێ و بـە هەمـوو شـتێک زانایـە؟ ﴿١٦﴾ منەتـت لەسـەر دەکـەن (ئـەی موحەممـەد!) کـە ملکەچ (و مسـوڵمان) بـوون! بڵـێ: ملکەچیی (مسـوڵمانەتیی)یەکەتانم لەسـەر مەکەنـە منـەت، بەڵکـو ئەگـەر ڕاسـت بکـەن خـوا منەتباریـی کـردوون کـە بـۆ بـڕوا (هێنـان) ڕێنمایـی کـردوون ﴿١٧﴾ بـە دڵنیایـی خـوا پەنهـانی ئاسـمانەکان و زەوی دەزانـێ و، خـوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿١٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْأَعْرَابُ): **(العَـرَبُ: وَلَـدُ إِسْـمَاعِيلُ، وَالأَعـرابُ جَمعُـهُ فـي الأَصـل، وَصـارَ ذَلِـكَ اسماً لِسُـكَّانِ البَادِيَـةِ، وَقِيـلَ فـي جَمـعِ الأَعْـرَابِ: أَعَارِيـب، وَالأَعـرابِيُّ فِي التَّعـارُفِ صـارَ اسـماً لِمَنسُـوبِينَ إِلَى سُـكَّانِ البَادِيَـة، وَالعَـرَبِيُّ: المُفْصِـح، والإِعْـرَابُ: البَيـان)**، عـەرەب لـە ڕۆڵـەی ئیسـماعیلن، ئیسـماعیلی کـوڕی ئیبراهیـم **(عَلَيْهِـما الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)**، عـەرەب بـە **(أعـراب)** کـۆ دەکرێتـەوە لـە ئەصڵـدا، بـەڵام دوایـی وشـەی **(أعـراب)** وەک عـورف

و باو کراوە بە ناو، بۆ ئەوانەی لە دەشت و سارادا نیشتەجێن، هەندێکیش گوتوویانە: (**أعراب**) بە (**أعاريب**) کۆدەکرێتەوە، (**أعرابي**) لە عورف و باودا، کراوە بە ناو بۆ کەسانێک کە پاڵ دەدرێنە لای دانیشتووانی بیابان، واتە: بیاباننشینەکان، عەرەبیی، واتە: کەسێک کە زمانێکی ڕوون و ڕاشکاوی هەیە، (**إعراب**)یش بە مانای ڕوونکردنەوەو ئاشکرا کردن دێت، هەر بۆیە لە ڕووی ڕێزمانییەوە دەگوترێ: ئیعرابی ئەو ڕستەیەم بۆ بکە، واتە: بۆم ڕوونبکەوە لە ڕووی پێکهاتەیەوە چۆنە؟ ڕستەکە چەند پێکهاتەی هەن و، کامیان کردارەو کامیان ناوەو کامیان حەرفە، پاشان چۆن پێکەوە لێکدراون و کامیان مەنصووبەو کامیان مەرفووعەو کامیان مەجرووڕەو کامیان مەجزوومەو ... هتد؟!

(ءَامَنَّا): واتە: بڕوامان هێنا، (**الإيمانُ: يُسْتَعْمَلُ تَارةً اسماً لِلشريعَةِ الَّتي جَاءَ بِها مُحَمَّد ﷺ.. وَتارَةً يُستَعمَلُ عَلَى سَبِيلِ المَدحِ، وَيُرادُ بِهِ إذعانُ النَّفس لِلحَقِّ عَلَى سَبِيلِ التَّصدِيقِ، وَذَلِكَ بِاجتِماعِ ثَلاَثَةِ أَشْيَاء: تَحقِيقٌ بِالقَلب، وَإقرارٌ بِاللِّسَانِ، وَعَمَلٌ بِحَسَبِ ذلِكَ بِالجَوَارِحِ**)، واتە: ئیمان جاری وایە بەکاردەهێنرێ وەک ناوێک بۆ ئەو شەریعەتەی موحەممەد ﷺ هێناویەتی، جاری واش هەیە وشەی ئیمان بەکاردەهێنرێ وەک ستاییشکردن، مەبەست پێی ملکەچکردنە بۆ حەق، بە شێوەیەک کە بەڕاستزانینی لەگەڵدابێ، ئەویش بە کۆبوونەوەی سێ شتان: ساغ کردنەوە بە دڵ، دان پێداهێنان بە زمان، کردەوەش بەپێی ئەوە بە ئەندامەکان، وەک زانایان لە پێناسەی ئیماندا گوتوویانە: (**الإيمانُ: هُوَ الإِيقَانُ بِالجَنَان، وَالإِقْرَارُ بِاللِّسَان، وَالعَمَلُ بِالأَرْكَان**)، واتە: ئیمان یانی: دڵنیایی بە دڵ و دەروون و، دان پێداهێنان بە زمان و، کردەوە بە ئەندامەکان.

(أَسْلَمْنَا): واتە: ملکەچ بووین، (**راغب الأصفهاني**)[1] دەڵێ: (**الإسْلامُ فِي الشَّرعِ عَلَى ضَربَينِ: أَحَدُهُمَا دُونَ الإِيْمَانِ وَهُوَ الإعْتِرَافُ بِاللِّسَانِ، وَبِهِ يُحقَنُ الدَّمُ حَصَلَ مَعَهُ**

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٢٤٠.

الإعْتِقَادُ، أَو لَـم يَحصُلْ، وَإيَّاهُ قُصِـدَ بِقَولِـهِ: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا﴾، وَالثَّانِي: فَـوقَ الإيْمَـانِ، وَهُـوَ أَن يَكُـونَ مَـعَ الإعْـتِرَافِ: إعتِقَـادٌ بِالقَلْـبِ وَوَفَـاءٌ بِالعَمَـلِ وَإستِسْـلامٌ لِلَّـهِ فِي جَمِيـعِ مـا قَـضَى وَقَـدَّر، كَـمَا ذُكِـرَ عَـن إبراهيـم: ﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٣١﴾ البقـرة).

واتــە:: وشــەی ئیســلام لــە زاراوەی شــەرعدا دوو جــۆرە، یەکێکیــان لــە خــوار ئیمانەوەیــە، کــە ئەویــش بریتیــە: لــە دان پێداهێنــانی بــە زمــان، کــە بــەوە خوێــن دەپارێــزرێ، ئنجـا ئیعتیقـادی نێـو دڵـی لەگەڵدابـێ، یـان لەگەڵیدانەبـێ، کـە خـوای بــەرزو مــەزن دەفەرمــوێ: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا﴾، (أسْـلَمْنَا)، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە، دووەمیـان: وشـەی ئیسـلام کـە بـەکاردێ، لەسـەرووی ئیـمان بـەکاردێ، ئەویـش بریتیـە: لـەوە کـە لەگـەڵ دان پێداهێنـانی بـە زمـان، ئیعتیقـادی بـە دڵ و جێبەجـێ کـردنی بـە کـردەوەو، ملکـەچ کـردن بـۆ خـوا لـە هەرچـی کـە بڕیـاری داوەو هەرچـی کـە دایناوە، هەمـووی هەبـێ، وەک خـوا لــە بــارەی ئیبراهیمــەوە ، فەرموویــەتی: ﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٣١﴾ البقرة، یـانی: ئـەو ئیسـلامەی ئیبراهیـم ، لەسـەرووی ئیمانەوەیـە، بـەڵام ئیسـلامی ئەعـراب لـە خـوار ئیمانەوەیـە.

(وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ): واتــە: جــارێ ئیــمان نەچۆتــە نێــو دڵتــان، (لَـمَّا يُسـتَعمَلُ عَـلَى وَجهَـينِ، أَحَدُهُـما: لِنَفـيِ المَـاضِي وَتَقرِيـبِ الفِعـلِ، نَحـو: ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ آل عمـران، وَالثَّـاني: عَلَـمٌ لِلظَّـرْفِ، نَحْـو: ﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ ٩٦﴾ يوسـف)، وشـەی (لَـمَّا) بـە دوو شـێوە بـەکاردێ، یەکێکیـان بـۆ لابـردنی ڕابـردوو و، نیزیـک خسـتنەوەی کردەوەکـە، وەک: ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ آل عمران، جـارێ خـوا بـۆی دەرنەکەتـوە ئەوانەتـان کـە تێکۆشـاون و، ئەوانەتـان کـە خۆڕاگـر بـوون، هـەروەک لێـرەش دەفەرمـوێ: ﴿وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ﴾، جـارێ ئیـمان نەچۆتـە نێـو دڵتـان، واتـە: چـاوەڕێ دەکـرێ بچـێ، ئەگـەر لەسـەر ئیسـلامەتییەکەتان بـەردەوام

بـن، دەگونجـێ وردە وردە ئیـمان بچێتـە نێـو دڵتـان، بەکارهێنـانی دووەمـی (لَـمَّا) ئەوەیـە کـە وەک نیشـانەیەک بـۆ کات (ظَـرف)، وەک دەفەرمـوێ: ﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ ﴿٩٦﴾﴾يوسف، کاتێـک کـە موژدەدەرەکـە هـات کراسـەکەی فڕێدایـە سـەر دەم و چاوی یەعقـووب ﷺ، ﴿فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗا ﴿٩٦﴾﴾يوسـف، یەکسـەر چـاوی چـاک بوونـەوە.

(لَا يَلِتۡكُم): واتـە: (لا يَنقُصُكُـم)، لێتـان کـەم ناکاتـەوە، (لاتَـهُ يَلِيتُـهُ عَـن كَـذَا: أَي صَرَفَـهُ عَنـهُ وَنَقَصَـهُ حَقّـاً لَـهُ.. وَلاتَ وَأَلاتَ بِمَعنَـى نَقَـصَ، وَأَصلُـهُ: رَدُّ اللِّيـتِ: وَهُـوَ صَفحـةُ العُنُـقِ)، (لاتَـهُ يَلِيتَـهُ عَـن كَـذَا)، واتـە: لایـدا لـەو شـتە، هەروەهـا (لاتَـهُ يَلِيتُـهُ: أَي نَقَصَـهُ حَقّـاً لَـهُ)، هەقەکـەی لـێ کـەم کـردەوە، (وَلاتَ وَأَلاتَ)، کـە لـە سـووڕتی (الطـور) دا، دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ...﴿٢١﴾﴾الطـور، لێـرە دەفەرمـوێ: ﴿لَا يَلِتۡكُم﴾، (لاتَ وَأَلاتَ)، هەردووکیـان یـەک واتایـان هەیـە، بـە مانـای کەمـی کـردەوە، ئەمـەش (ئـەم کـردارە)، (لاتَ) یـان (أَلاتَ)، لـە ئەصڵـدا لـە (رَدُّ اللِّيـت)ەوە هاتـوە، (رَدُّ اللِّيـت)، (لِيـت) یـانی: (صَفحـةُ العُنُـقِ)، لامـل، لـەوەوە هاتـوە، کەسـێک لا ملـی لـە کەسـێک بـکات، مانـای وایـە: مافەکـەی نادیـدە گرتـوەو هەقەکـەی کـەم کـردوە.

(لَمۡ يَرۡتَـابُواْ): (الرَّيـبُ: الشَّـكُّ، وَالإِسـمُ الرِّيبَـةُ)، (رَيـب) بـە مانـای دوو دڵییـەو، ئـەو نـاوەش کـە لـە (رَيـب)ەوە دروسـت دەکـرێ، بریتیـە لـە: (رِيبَـة)، واتـە: دوو دڵیـی، (الرِّيْبَـةُ: وَهِـيَ التُّهْمَـةُ وَالشَّـكُّ، يُقَـالُ رَابَنِـي فُـلانٌ، إِذَا رَأَيْـتَ مِنْـهُ مـا يَرِيبُـكَ وَتَكرَهُـهُ، وَارْتَـابَ مِنْـهُ، أَي: شَـكَّ)، وشـەی (رِيبَـة): بریتیـە لـە تۆمـەت و دوو دڵیـی، کـە تـۆ دەڵێـی: (رَابَنِـي فُـلانٌ) کاتـێ شـتێکی لـێ ببینـی بتخاتـە دوو دڵییـەوەو پێـت ناخـۆش بـێ (وَارتَـابَ مِنْـهُ، أَي: شَـكَّ)، واتـە: تێیـدا کەوتـە دوو دڵیـی.

(يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ): واتـە: منەتـت لەسـەر دەکـەن، (الْمُنَّـةُ: القُـوَّةُ، وَالمَـنُّ: القَطْـعُ، وَقِيـلَ النَّقـصُ، وَمَـنَّ عَلَيْـهِ: أَنْعَـمَ)، (مُنَّـة) بـە مانـای هێـز دێ و، (مَـنّ) بـە مانـای بڕیـن دێ، هەندێکیـش گوتوویانـە: بـە مانـای ناتەواویـی دێ، دەگوتـرێ: (مَـنَّ عَلَيـهِ: أَي أَنعَـمَ)،

کەواتە: (يَمُنُّونَ عَلَيْكَ) یانی: بە چاوت دادەنەوە کە چاکەیان لەگەڵ تۆدا کردوە، لە زمانی عەرەبییدا وەک پەند هاتوە: (المِنَّةُ تَقطَعُ الصَّنِيْعَة)، واتە: منەتکردن چاکە دەبڕێ، ئەو چاکەیەی کردووتە لەگەڵ کەسێک دا، کە منەتت لەسەر کرد وەک چاکەکەت بڕیبێ و لە بەینت بردبێ وایە.

(غَيْبَ): (الغَيبُ: مَا غَابَ عَنكَ، وَجَمْعُ الغَائِبِ: غُيَّب وُغُيَّاب وَغَيَب، وَغَيَابَةُ الجُبِّ: قَعرُهُ)، (غَيب): شتێکە لە تۆ نادیارو پەنهان بێ، کۆی (غَائِب): (غُيَّب)و (غُيَّاب)و (غَيَب)ە، بە هەرسێکیان، واتە: نادیارەکان، پەنهانەکان، ﴿غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ ۝١٥﴾یوسف، واتە: بنی بیرەکە،

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەو، کۆی ئەو ئایەتە موبارەکانەوە بە تایبەت ئایەتی: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ۝١٤﴾، کە ئایەتەکانی دیکەش هەر پەیوەستن بەوەوە، دوو ڕیوایەتان دێنین:

**یەکەم:** {عَنْ قَتَادَةَ، قَوْلَهُ: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا﴾**الحجرات: ١٤، وَلَعَمْرِي مَا عَمَّتْ هَذِهِ الْآيَةُ الْأَعْرَابَ، إِنَّ مِنَ الْأَعْرَابِ مَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَلَكِنْ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ فِي حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْأَعْرَابِ، امْتَنُّوا بِإِسْلَامِهِمْ عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: أَسْلَمْنَا، وَلَمْ نُقَاتِلْكَ، كَمَا قَاتَلَكَ بَنُو فُلَانٍ وَبَنُو فُلَانٍ، فَقَالَ اللَّهُ: لَا تَقُولُوا آمَنَّا، ﴿وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا﴾، حَتَّى بَلَغَ: (فِي قُلُوبِكُمْ)}**[1].

---

(١ ) أخرجه الطَّبَري: (٣١٨٥٣)، وَالإستيعاب في بَيانِ الأسباب ج٣، ص٢٨٦، قُلنا: وَهَذا مُرسَلٌ صَحيح الإسنادِ، وَزادَ السُّيوطي في (الدرِّ المَنثُور، ج٧، ص٥٨٣)، نِسبَتَهُ لِعَبدِ بنِ حُمَيد.

واتـه: قەتـادە لـه بـارەی قسـەی خـوای بـەرزەوە کـه دەفەرمـوێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا﴾، گوتوویـەتی: بـه دڵنیایـی ئەم ئایەتە مەبەسـتی لە هەمـوو عەرەبـه خێڵەکیـی و بیابانشـیەنەکان نیـە، چونکـه لـه عەرەبـه خێڵەکییـەکان کەسـانێک هەبـوون بڕوایـان بـه خـواو ڕۆژی دوایـی هەبـوو، (وەک لـه سـوورەتی (التوبـة)دا، خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ... ﴿٩٩﴾﴾) بەڵکـو ئـەم ئایەتـه لـه بـارەی هۆزێـک لـه هـۆزەکانی عەرەبانـەوە، (واتـە: عەرەبـه خێڵەکییەکانـەوە) دابـەزی، کـه منەتیـان بـه مسـوڵمانەتییەکەیان کـرد لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ و گوتیـان: ئێمـه مسـوڵمان بوویـن و، لـه دژت نەجەنگایـن، وەک فـڵان هـۆزو، فـڵان هـۆز لـه دژت جەنگیـان کـرد، خـوای بەرزیـش فەرمـووی: (لَا تَقُولُـوا آَمَنَّـا)، مەڵێـن بڕوامـان هێنـاوە، بەڵکـو بڵێـن: مسـوڵمان بوویـن، ملکـەچ بوویـن، هەتـا گەیشـتە ئـەو ئایەتـه کـه دەفەرمـوێ: ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ﴾.

**دووەم:** گێڕدراوەیەکی دیکەش دێنین: {**عَن مُجاهِدٍ رَحِمَهُ الله قَالَ: أَعرَابُ بَنِي أَسَد ابنُ خُزَيمَة**}[1].

واتـه: موجاهیـد گوتوویـەتی: مەبەسـت لـه (ئەعراب) لێـرەدا، عەرەبـه خێڵەکییەکانی بەنـوو ئەسـەدی کـوڕی خوزەیمـەن، واتـه: هۆزێکـی دیارییکـراون، نـەک تێکـڕای عەرەبـه خێڵەکییـەکان وابـن.

کەواتـه: کـه خـوا دەفەرمـوێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ﴾، ئـەو ئەلیـف و لامـەی سـەر ﴿ٱلْأَعْرَابُ﴾، بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام بۆ ناسـاندنی عەهدییـە، واتە: عەرەبـه خێڵەکییەکانی کـه زانـدراون و نـاسراون، بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ و بـۆ هـاوەڵان، ئـەو کاتـه زانیویانـه کێـن، ئـەوان وایـان گـوت.

---

(١) أخرجـه الطَّبَري: (٣١٨٤٧)، وَالإِسـتِيعاب فِي بَيَـانِ الأَسـباب ج٣، ص٢٨٦، قُلنـا: وَهَـذَا مُرسَـلٌ صَحِيـح الإِسـنَادِ، وَزادَ السُّـيُوطِي فِي (الـدرُّ المَنثُـور، ج٧، ص٥٨٢)، نِسـبَتَهُ لِعَبـدِ بـنِ حُمَيـد، وَابـنُ المُنـذِر.

**٢-** دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ بَنِي أَسَدٍ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَتَكَلَّمُوا فَقَالُوا: قَاتَلَتْكَ مُضَر وَلَسْنَا بِأَقَلِّهِم عَدَداً، وَلاَ أَكلِّهُم شَوْكَةً، وَصَلْنَا رَحِمَكَ، فَقَالَ ﷺ: لأَبِي بَكرٍ وَعُمَر: تَكَلَّمُوا هَكَذَا؟ قالُوا: لاَ، قَالَ: إنَّ فِقهَ هَؤُلاءِ قَلِيلٌ، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْطِقُ عَلَى أَلْسِنَتِهِمْ، قَالَ: عَطاءُ فِي حَدِيثِهِ، فَأَنْزَلَ عَزَّ وَجَلّ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾}[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویەتی: وەفدی شاندی بەنوو ئەسەد هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیان کرد، گوتیان: هۆزی موزەر لەگەڵ تۆدا (کە کۆمەڵێک تیرەی عەرەب دەگرێتەوە)، جەنگان، کە ئێمە ژمارەمان لەوان کەمتر نیەو، دڕکیشمان لەوان کولتر نیە، بەڵام ئێمە خزمایەتییمان لەگەڵ تۆدا گەیاند، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوو بەکرو عومەری (خوا لێیان ڕازی بێ)، فەرموو: ئایا ئاوا قسەیان کرد؟ {واتە: ئایا ئەو قسەیان ڕاستە؟}، گوتیان: نەخێر، {واتە: ئەو قسە کردن و منەتکردنە شتێکی ڕاست نیە}، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: تێگەیشتنی ئەوانە کەمەو، شەیتان لەسەر زمانی ئەوان قسە دەکات، (ئەو قسانە شەیتان فێریان دەکا)، (عَطَاء) لە قسەکەیدا گوتوویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلّ)، لەوبارەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾.

---

(١ ) أخرَجَهُ أَبُو يَعلَى فِي المُسنَد، وَمن طَرِيقِهِ الضِياءُ المَقدِسي فِي (الأَحادِيثِ المُختارَة: ٣٧٣٠)، وَالنَّسائِي فِي التَّفسِير:( ٥٣٩)، وَالطَّبَراني فِي الأَوسَط: (٨٠١٦)، وَالطَّبَري: (٣١٨٦٣)، الإِستِيعاب فِي بَيانِ الأَسباب (ج٣،ص٢٨٦، ٢٨٧)، قُلنا: وَهَذَا مُرسَلٌ صَحِيحُ الإِسنادِ رِجالُهُ رِجالُ الصَّحِيحَين.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ لـەم پێنـج ئایەتـەدا وەک لـە پێناسەکەشـیاندا گوتمـان: یـەک بابـەت دەخاتـە ڕوو، ئەویـش بریتیـە لـە باسـکردنی هەندێـک لـە عەرەبـە بیابانیشـینەکان، کـە منەتیـان لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـردوەو بانگەشـەی ئیـمان هێنانیـان کـردوە، لـە حاڵێکـدا کـە ئیـمان نەچۆتـە نێـو دڵیـان و، منەتیـان لەسـەر پێغەمبـەری خـوا کـردوە ﷺ کـە لـە دژی پێغەمبـەری خـواو هـاوەڵانی نەجەنـگاون، بەڵکـو بـە ئاشـتییانە مسـوڵمان بـوون، ئـەم پێنـج ئایەتـە لـەو بـارەوەن.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا﴾، عەرەبـە خێڵەکییـەکان گوتیـان: بڕوامـان هێنـاوە، هـۆی هاتنـە خـوارەوەکان کـە باسـمان کـردن، بۆمـان ڕوون دەکەنـەوە کـە (أل)ی سـەر (**الأعْرَابُ**)، بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام مەبەسـت پێـی جینـس نیـە، واتـە: هەمـوو عەرەبـە خێڵەکییـەکان وایـان نەگوتـوە، بەڵکـو عەرەبـە خێڵەکییـە زانـدراوەکان وایـان گوتـوەو، (أل) بـۆ (عهـد)ە، وەک پێشـتر گوتوومانـە: (أل)ی (عهـد) لـە زمـانی عەرەبییـدا دەچێتـە بەرانبـەر (کـە) لـە زمـانی کوردییـدا، ئەگـەر گوتـم: کتێبـم بـۆ بێنـە، نـازانی چ کتێبێـک! بـەڵام کـە گوتـم: کتێبەکـەم بـۆ بێنـە، دەزانی کام کتێبەیـە، کەواتـە: لێـرەدا یـانی: عەرەبـە خێڵەکییـەکان کـە زانـدراون، گوتیـان، کـە لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـدا، گوتمـان: هـۆزی بەنوو ئەسـەدی کـوڕی خوزەیمـە بـوون ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا﴾، گوتیان: ئیمانمـان هێنـاوە ﴿قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ﴾، بڵـێ: بڕواتـان نەهێنـاوە، ﴿وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا﴾، بـەڵام بڵێـن: ملکـەچ بوویـن، ﴿وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾، جـارێ ئیـمان نەچۆتـە نێـو دڵتـان، (لَمَّا) بـۆ لابـردنی شـتێکە لـە ڕابـردوودا، کـە جـارێ نەبـووە، بـەڵام ئەگـەری هەیـە لـە داهاتـوودا ببـێ، واتـە: جـارێ ئیـمان نەچۆتـە نێـو دڵتـان، بـەڵام دەگونجـێ لـە داهاتـوودا ئیـمان بچێتـە نێـو دڵتانـەوە، ئەمـە لەلایەکـەوە خـوا ﷻ بۆیـان ڕوون

دەكاتـەوە، كـە ئـەوان وایانزانیـوە هـەر بڵێـی: مسـوڵمان بـووم، ئـەوە تـازە مانـای وایـە بـە ئیمانـدار لـە قەڵـەم دەدرێـی، بـەڵام خـوا بـۆی ڕوونكردوونـەوە كـە نەخێـر، بەڵكـو كـە دەڵێـی: مسـوڵمان بـووم، ئـەوە بـە ڕواڵـەت دێیـە نێـو دینـی ئیسـلامەوە، بـەڵام ئیـمان چوونـە نێـو دڵ، ئەوەیـە ئـەو ڕاستییانەی ئیسـلام گوتـوونی: لـە دڵتـدا بچەسـپێن، نـەك هـەر بـە ڕواڵـەت، لەگـەڵ ئەهـلی ئیسـلامدا تەبـا بی و، پێـت وابـێ بـووی بـە بڕواداری پلـە یـەك! وانیـە، ﴿ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا ﴾، ئەگـەر فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەكـەشی بكـەن، هیـچ لـە پاداشـتی كردەوەكانتـان كـەم ناكاتـەوە، واتـە: ئەگـەر دەتانـەوێ بـەرەو ئیـمان بچـن و ئیـمان لـە دڵتانـدا بچەسـپێ، فەرمانبەریـی خـوا بكـەن و، فەرمانبەریـی پێغەمبـەر ﷺ بكـەن و كـردەوەی بـاش بكـەن، خـوا لـە پاداشـتی كردەوەكانتـان كـەم ناكاتـەوەو، وردە وردە ئیسـلامەكەتان و دینداریيەكەتـان لـە ئیسـلامێكی ڕووكەشیی و ڕواڵەتییـەوە، دەگـۆڕێ بـۆ ئیمانێكـی نێـو دڵ و دەروون و مسـوڵمانەتییەكی ئاشـكراش، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە، لێتـان دەبـوورێ كـە لافی ئیمانتـان لێـداوە بـێ ئـەوەی ئیمانتـان چووبێتـە نێـو دڵ، لەگەڵیشـتان بـە بەزەییـە، ئەگـەر بـەردەوام بـن لەسـەر فەرمانبەریـی خـواو پێەمبەرەكـەی ﷺ و كـردەوەی بـاش ئەنجـام بـدەن، لەگەڵتـان بـە بەزەییـە كـە وردە وردە بەهـۆی كـردەوە باشـەكانەوە، ئیـمان لـە دڵتانـدا سـەقامگیر ببـێ.

ئنجـا خـوا ﷻ بۆیـان پێناسـەی ئیـمان دەكات، بـۆ ئـەوەی بزانـن ئیـمان مانـای چـی؟ ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ ﴾، (**إِنَّمَا: أَدَاةُ الحَصر وَالإثبـات**)، (**إِنَّمَا**) ئامـڕازی كـورت هەڵێنـان و چەسـپاندنە، ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، بـڕواداران تەنیـا ئەوانـەن ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ ﴾، كـە بڕوایـان هێنـاوە بـە خـواو بـە پێغەمبەرەكـەی ﷺو، دواییـش دوو دڵ نەبـوون، دڵ لـە دڵدانیان نەبووە، هـەر ئەوەندە؟ نەخێـر ﴿ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بـە سـامان و بـە گیانیشـیان لـە ڕێـی خـوادا تێكۆشـاون و فیداكارییـان كـردوە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾، ئـا ئەوانـەن ڕاسـتان، ئـا ئەوانـەن كـە لـە ئیمانەكەیانـدا ڕاسـتیان كـردوە.

کەواتە: خوا ﷻ لێرەدا ئیمانـی کردوە بە دوو بەشی سەرەکیی:

أ- بەشێکیان بریتیە لەوە کە دەچێتە نێو دڵ و دەروونەوەو لە عەقڵ و دڵدا جێگیر دەبێ، ئیمان بە خوا، واتە: ئیمان بە تەنیا بەدیهێنەرایەتیی خوا، بە تەنیا پەروەردگارێتیی خواو، تەنیا خاوەنداریێتیی خوا، ئیمان بە تەنیا پەرستراوێتیی خوا، ئیمان بەوە کە ئەو ناوو سیفەتە هەرە بەرزو چاکانەی خوا هەیەتی، هیچ کام لە دروستکراوەکانی خوا نیانن، پاشان ئیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ واتە: ئیمان بەوە موحەممەد کە خوا وەحیی بۆ ناردوە، وەک ڕەوانەکراو ناردوویەتی بۆ لای مرۆڤەکان و، پەیامی خۆی پێدا ناردوە، دینی خۆی پێدا ناردوە، بەڕاستی بزانی و خۆشت بوێ و، شوێنی بکەوی، ئەوە بەشی یەکەمی پێکهاتەی ئیمان.

ب- بەشی دووەمی بریتیە لە کردەوە بەپێی ئەوە، لێرەدا خوا ﷻ لەبەر ئەوەی سیاقەکە وا دەخوازێ، دەفەرموێ: بە سامان و گیانیشیان لەڕێی خوادا تێکۆشاون، فیداکارییان کردوە، ئەمەش بریتیە لە بەرجەستە کردنی ئەو ئیمانەی لە دڵدا هەیە، دەبێ لە دنیای واقیعیشدا بەرجەستەی بکەی، ئنجا لێرە خوا ﷻ کردەوەیەکی باس کردوە کە زۆر شتان دەگرێتەوە نێو خۆی، کە بریتیە لە تێکۆشان لەڕێی خوادا بە سامان و گیان، هەر کەسێک دەستبەرداری ڕووح و ماڵ و سامانی بێ لە پێناوی خوادا، مانای وایە شتەکانی دیکەشی بۆ دەکرێن و کردوون، کەواتە: ئیمان تەنیا ئەوە نیە کە لە عەقڵ و دڵدا جێگیر دەبێ، بەڵکو دەبێ کردەوەشی لەگەڵدا هەبێ، ئنجا لە هەندێ شوێن بەپێی سیاق، باسی نوێژو زەکات دەکات، بەڵام لێرەدا باسی فیداکاریی و بەخشینی گیان و سامان دەکات، ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾، ئا ئەوانەن ڕاستان، یانی: ئەوەی وانەبێ، ڕاست ناکات لە لاف لێدانی ئیمان هێناندا.

ئنجا خـوا ﷻ بـە گلەیـی و سەرزەنشـتەوە ڕوو بـە عەرەبـە خێڵەکییـەکان، بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەو پرسـیارە ئاڕاسـتەی ئـەو عەرەبـە خێڵەکیانـە بکـە: ﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ﴾، بڵـێ: ئایـا ئێـوە دینداریـی خۆتان بە خـوا دەزانێنن؟

وادەکەن کە خوا دینداریتان بزانێ؟ بۆیە ئەو لافە لێدەدەن؟ ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، لەحاڵێکدا کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە دەیزانێ ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بگرە، نەک هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، دەیزانێ، بەڵکو هەرچی شتە خوا پێی زانایە، کەواتە: نێو دڵی ئێوەش دەزانێ چی تێدایەو، پێویست ناکات بۆ خۆتان لافی ئیمان هێنان لێبدەن، خوا دەزانێ چی لە دڵتاندا هەیە، ئەگەر ئەوان نەیانگوتبایە: (آمَنَّا)، خوا نەیدەفەرموو: ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوەو لێیان دەگەڕا، وەک مسوڵمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا، تاکو وردە وردە ئیمانەکەیان دەچەسپی، بەڵام کە ئەوان ئەو لافەیان لێداوە، خوا ﷻ هەم وەک هۆشداریی بۆ خۆیان کە بەوەندە واز نەهێنن گوتوویانەو، کردوویانە، کە بە ڕواڵەت هاتوونە نێو ئیسلامەوە، هەم تاکو خەڵکی دیکەش بزانێ کە هەرچی گوتی: مسوڵمانم مانای وا نیە ئیماندارەو ئیمان لە دڵیدا چەسپاوە.

﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟﴾، ئنجا خوا ﷻ بە شێوەی نادیار سەرزەنشتیان دەکات، ڕوو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات و، دەفەرموێ: منەتت لەسەر دەکەن و چاکەت بە چاودا دەدەنەوە، کە گوایە مسوڵمان بوون ﴿قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم﴾، بڵێ: ملکەچ بوونەکەی خۆتانم لەسەر مەکەنە منەت، بە چاومدا مەدەنەوە، واتە: ئەو جۆرە مسوڵمانەتییە کە ئێوە شانازیی پێوە دەکەن، مسوڵمانەتییەکی تایبەتی خۆتانە، نەک ئەو مسوڵمانەتییە ڕاستەقینەیەی خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوەو بەیانی کردوە ﴿بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، بەڵکو خوا چاکەی بەسەرتانەوە هەیە، کە ڕێنمایی کردوون بۆ ئیمان، ئەگەر ڕاست بکەن، لە ئیمان هێنانێدا، خوا چاکەی بەسەر ئێوەوە هەیەو ئێوە منەتباری خوان، نەک پێغەمبەری خوا ﷺ منەتباری ئێوەبێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بە دڵنیایی خوا نهێنیی و پەنهانی نێوان ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، خواش بینەری ئەوەیە

کە دەیکەن، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**وَاللهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعمَلُون**)، هەروەها خوا بینەری ئەوەیە، کە ئەوان دەیکەن.

لێرەدا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە بێگومان پێغەمبەری خوا پێی ناخۆش بووەو، دڵی ئازاری پێگەیشتوە کە ئەوانە بێن منەتی لەسەر بکەن و، شانازیی بەو مسوڵمانەتییە ڕووکەشەی خۆیانەوە بکەن، لە حاڵێکدا خوا ﷻ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ چاکەو منەتیان لەچاوی خەڵکدا هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامی خوای هێناوەو، ئەو هەموو نارەحەتییانەی تەحەممول کردوون، ئەو هەموو ئازارانەی چێشتوون، لە پێناوی گەیاندنی پەیامی خوادا بە مرۆڤەکان، کەچی ئەوان بێن منەتی لەسەر بکەن، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی لە دژی نەجەنگاون، ئنجا ئەوە کە لە دژی نەجەنگاون شتێکی باشیان کردوە بۆ خۆشیان باش بووەو، بۆ ئەهلی ئیسلامیش باش بووە، بەڵام نابێ بکرێتە منەت، چونکە ئەسڵ ئەوەیە پەیامی خوا کە دەنێردرێ، پەیامەکە وەربگیرێ و، سوپاس و ستایشی خوا بکرێ و، ڕێزیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگیرێ و، سوپاسیشی بکرێ، نەک منەتی لەسەر بکرێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ پێشتر ئیمانی لێ لابردوون، واتە: ئەگەر ڕاست بکەن کە ئیمانتان هێناوە کە ڕاست ناکەن، کە پێشتر فەرمووی، ئەوە چاکەو منەتی خوا لە چاوی ئێوەدا هەیە، واتە: ئەوەی خوای میهرەبان ئێوەی پێ منەتبار دەکات، بریتیە لە ئیمان، نەک ئەو مسوڵمانەتییە ڕووکەشییە کە هەر لە دنیادا خوێنتان دەپارێزێ و، بەس لە دنیادا بە مسوڵمان لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام بۆ دوارۆژتان کەڵکێ ناگرێ، ئەگەر ئیمانی لەگەڵدا نەبێ، بۆیەش هی ئەوە نیە کە خوای بەخشەر لەسەرتانی بکات بە منەت، بەڵام ئیمان ئەو نیعمەتەیە خوا ﷻ لەسەرتان دەکاتە منەت، بەڵام ئێوە لە ئیددیعای ئیمانەکەشدا ڕاستتان نەکردوە، لەمەودوا ئەگەر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، وردە وردە بەهۆی کردەوەی چاکەوە، ئیمان لە دڵتاندا پەیدا دەبێ و، ئەو کاتیش چاکەی خوا بەسەر ئێوەوە هەیە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، ئاگادار کردنەوەیان لەوە کە خوا نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، واتە: دەبووایە پێش ئەوەی ئەو قسەیە بکەن: بڕوامان هێناوە، بێ ئەوەی بڕواتان هێنابێ، حیسابی ئەوە بکەن کە خوا نێو دڵتان دەخوێنێتەوە، بەڵام دیارە ئەوانە ئیمانەکە نەچۆتە نێو دڵیان، بۆیەش وەک پێویست قەدری خوای پەروەردگاریان نەزانیوە، سیفەتەکانی خوایان وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، دەرک نەکردوون، بۆیە نەیانزانیوە خوا نێو دڵیشیان دەخوێنێتەوە، نەک تەنیا قسەی سەر زمانیان دەبیستێ، بەڵکو نێو دڵیشیان دەخوێنێتەوە، نەک هەر هی ئەوان، نێو دڵی هەموو مرۆڤەکان و هەموو دروستکراوەکان، بەڵکو هەرچی نهێنیی و پەنهان هەیە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا، خوا دەیزانێ و، هەرچی ڕەفتارو کردەوەش هەیە خوا دەیبینێ، کەواتە: بەڕاستیی ئەوە ئەدەب دادانێکی گرنگە، بۆ ئەوانیش کاتی خۆی و، بۆ هەر کەسێکیش کە خۆی بە مسوڵمان دادەنێ، کە بزانێ، خوا ﷻ نێو دڵی دەخوێنێتەوەو کردەوەکانی دەبینێ، چ ئەوانەی خەڵک دەیانبینێ، چ ئەوانەی خەڵک نایانبینێ، وەک لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ**} (**أخرجه مسلم: ٢٥٦٤**)، واتە: بە دڵنیایی خوا تەماشای ڕەنگ و دیمەن و، ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان و کردەوەکانتان دەکات.

ئەوەی جێی سەرنجی خوایە دەروون و ناخی مرۆڤە، کە لەوێوە هەموو شتێک سەرچاوە دەگرێ، دوای ئەوەی ڕاستییەکان لە عەقڵدا دەچەسپن و دڵ پەسندیان دەکات، ئنجا لەوێوە کردەوەکان و هەڵسوکەوتەکان چاک بن، یان خراپ، سەرچاوە دەگرن و پەیدادەبن، بۆیە جێی تەماشاو سەرنجی خواو تێڕامانی خواش ﷻ: یەکەم: دڵەکانن، دووەم: کردەوەکانن، نەک ڕەنگ و دیمەن و، نەک لاف لێدان و شتی ڕواڵەتییتان.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە پێـش دەرو ڕواڵەتمـان، دەروون و پەنهانمـان بـەو شـێوەیە لێبکەیـن، لـە لای خـوا پەسـندو چـاک بـێ و، خـوا بمانپارێـزێ لـەوەی شـتێک بڵێیـن، بـەو شـێوەیە نەبیـن، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی پەنهانمـان لـە ڕواڵەتمـان جوانـتر بـکات، ئـەوەی جێـی سـەرنجی خوایە، خـوا چاکـتری بـکات، لـەوەی جێـی سـەرنجی خەڵکـە، خـوا بمانپارێـزێ لـەوەی هیـچ جـۆرە منـەت و شـانازییەک بکەیـن بـە کردەوەیەکـی باشـمانەوە، کـە خـوا ئێمـەی بـۆ تەوفیـق داوەو، بـۆ ئێمـەی ئاسـان کـردوە، چونکـە دەبـێ خۆمـان بـە منەتبـاری خـوا بزانیـن، کـە کـردەوەی چاکـی لـە ئێمـەدا پەیـدا کـردوە، ئـەوە چاکـەو منـەتی خوایـە بەسـەر ئێمـەوە، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە هەمیشـە خۆیـان بـە منەتبـارو قـەرزداری خـوا ﷻ، پاشـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەزانـن، لـە هـەر چاکەیەکـدا کـە پێـی هەڵدەسـتن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**لاف لێدانی بەشێک لە عەڕەبە خێڵەکییە دەشتەکییەکان کە بڕوایان هێناوەو، بە درۆخستنەوەی خوا بۆیان و، ئاگادار کردنەوەیان، کە جارێ بەس ملکەچ بوون و، ئیمان نەچۆتە نێو دڵیانەوە، پاشان پێناسە کردنی بڕوادارانی ڕاستەقینە کە ئەوانەن: لە بڕوا بە خواو پێغەمبەر هێنانیاندا دڵنیان و، بە سەرو ماڵیش لەڕێی خوادا، فیداکارن، ئا ئەوانە ڕاست دەکەن لە ئیمانیاندا:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا﴾، عەڕەبە خێڵەکییەکان گوتیان: بڕوامان هێنا، پێشتر گوتمان: (**الأَعْرَاب**) کۆی (**عَرَب**)ە، یان هەر ناوە بۆ ئەو عەڕەبانەی بیابانشینن، خێڵەکیین و کۆچەریین، بەڵام لێرەدا کە دەفەرمووێ: (**الأَعْرَاب**)، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ئەم (أل) بۆ تێکڕا (جنس) نیە، کە تێکڕای عەڕەبە خێڵەکییەکان بگرێتەوە، بەڵکو بۆ (عهد)ە، واتە: ئەو عەڕەبە خێڵەکییانەی زاندراون، کە بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان بریتین لە هۆزی: (بەنو ئەسەد)، کەواتە: ئەم حوکمەی خوا ﷻ دەری دەخا، کە بریتیە لە بڕوا نەچوونە نێو دڵی عەڕەبە خێڵەکییەکان، گشتگیر نیە بۆ هەموویان، بەڵکو تایبەتە بە

کۆمەڵێکی دیارییکراویانەوە، کە هاتوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺو، لافی ئەوەیان لێداوە، بڕوایان هێناوەو، منەتیشیان لەسەر پێغەمبەری خوا کردوە ﷺ ، لێرەدا تەنیا مەبەست پێی ئەوانە.

٢)- ﴿ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا ﴾، بڵێ: بڕواتان نەهێناوە، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: ﷺ پێیان بڵێ: بڕواتان نەهێناوە، لێرەدا ئەم شێوازە: ﴿ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا ﴾، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لە شەریعەتی خوای دادگەردا خاترو خوایش و ڕوو دەربایسی تێدانیەو، لە ژێر لێوەوە قسەکردنی تێدانیە لەگەڵ کەس، چونکە (لَمْ)، ئامڕازی جەزمەو بۆ لابردنە، واتە: زۆر بە جەزمیی ئێوە بڕواتان نەهێناوە، بۆ ئەوەی:

١- لە خۆیان حاڵیی بن و، بەوەندەی هەیانە، کە تاکو ئێستا مسوڵمانەتییەکی ڕواڵەتییەو، تەنیا ملکەچ بوونە بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، لە خۆیان حاڵیی بن کە کارەکەیان لێرەدا تەواو نەبووە.

٢- هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە: بزانن کە پێغەمبەری خوایان ﷺ و، بڕوادارانیان بۆ فریو نەدراوە، کە بە خەیاڵی خۆیان پێیان وابێ و بڵێن: چووین و گوتمان: بڕوامان هێناوەو، پێغەمبەریش ﷺ بڕوای پێکردین، کەواتە: فێڵمان لێکرد، ئەوە لە حاڵێکدا کە زانییان ئەوەندە مسوڵمانەتییە ڕواڵەتییەی ئەنجامیان داوە، بریتی نیە لە ئیمان، بەڵام ئەگەر وا حاڵیی بووبن، کە هەر ئەوەندە ملکەچییە ڕواڵەتییەی پیشانیان داوە، بە ئیمانیش لە قەڵەم دەدرێ، ئەو کاتە ماناو مەبەستیان فێڵ کردن نەبووە، بەڵکو گرفتیان بە هەڵەدا چوون بووەو، پێیان وابووە ئەوە ئیمانە، بەڵام ئەگەر زانیبێتیان، هەتا ئەو مسوڵمانێتییە تێکەڵ بە دڵ و دەروونیان نەبێ و نەبێتە قەناعەتێکی ڕۆچوو، بە بڕوادار لە قەڵەم نادرێن، ئەو کاتە دیارە مەبەستیان فێڵ کردن بووە، ئەو لابردنەی ئیمان لێیان هەردوو ڕووەکەی هەن، یەکەم: لە خۆیان حاڵیی بن، دووەم: بشزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕوادارانیان بۆ فریو نادرێن، سێیەم: هەروەها ئەوەشی تێدایە کە ئەگەر تاکو ئێستاش بڕوایان نەبووبێ کە خوا ﷻ نێو دڵیان دەخوێنێتەوە، ئەمجار ئەو ڕاستییەیان

بۆ دەربکەوێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێی نەفەرموون: ﴿لَّمْ تُؤْمِنُواْ﴾، بەڵکو خوا پێی فەرمووە: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ﴾، بلێ: بڕواتان نەهێناوە.

٣)- ﴿وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا﴾، بەڵکو بڵێن: مسوڵمان بووین، ملکەچ بووین، واتە: بۆ ئەوەی قسەکەتان ڕاست بێ، تەنیا ئەوەندە بڵێن، ئەگەر بتانەوێ قسەکەتان بە درۆ لە قەڵەم نەدرێ، باسی ئیمان مەکەن، تەنیا بەڵکو باسی ئیسلام بکەن، ئنجا (**الإِيمانُ سِرٌّ وَالإِسلامُ عَلانِيَة**)، ئیمان پەنهانەو لە دڵ و دەروون دایە، یانی: ئەصڵەکەی لە دڵ و دەروون دایە، ئەگەرنا شوێنەوارەکانی لە ڕواڵەتیش دا دەردەکەون، بەڵام ئیسلام ڕواڵەتییەو بیندراوە، دیارە ئیسلام بە یەکێک لە دوو واتایەکانی، کە پێشتر باسمان کردن.

٤)- ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ﴾، جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە، (**لَمَّا: للنَّفي مَعَ تَّوَقُّع حُصُولِ المَنفِيِّ عَنهُ**)، (لَمَّا) بۆ لابردنە، بەڵام لەگەڵ چاوەڕێ کردنی پەیدابوونی ئەو شتەدا کە لابراوە، ئەگەر گوتمان: (**لَمَّا يَأتِي مُحَمَّدٌ**)، واتە: جارێ نەهاتوە، بەڵام چاوەڕێ دەکرێ بێ، ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ﴾، واتە: جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە، بەڵام ئەگەری هەیەو چاوەڕێ دەکرێ ئیمان بچێتە نێو دڵتانەوە، لێرەدا زانایانی شارەزایانی زمانی عەرەبیی و شارەزای ڕەوانبێژیی، زۆر قسەیان لەسەر ئەم ڕستەیە کردوە، بۆ وێنە: (**محمد الطاهر بن عاشور**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: (**لَم يَقُل: قُل لا تَقُل آمَنَّا وَلَكِن قُولُوا أَسلَمنا، وَاسْتُغْنِيَ بِقَوْلِهِ: لَمْ تُؤْمِنُوا عَنْ أَنْ يُقَالَ: لَا تَقُولُوا آمَنَّا، لِاسْتِهْجَانِ أَنْ يُخَاطَبُوا بِلَفْظٍ مُؤَدَّاهُ النَّهْيُ عَنِ الْإِعْلَانِ بِالْإِيمَانِ، لِأَنَّهُمْ مُطَالَبُونَ بِأَنْ يُؤْمِنُوا وَيَقُولُوا آمَنَّا، قَوْلًا صَادِقًا لَا كَاذِبًا، فَقِيل لَهُم لَمْ تُؤْمِنُوا، تَكْذِيبًا لَهُمْ مَعَ عَدَمِ التَّصْرِيحِ بِلَفْظِ التَّكْذِيبِ، وَلَكِنْ وَقَعَ التَّعْرِيضُ لَهُمْ بِذَلِكَ بَعْدُ فِي قَوْلِهِ:** ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ﴾، **وَعَدَلَ عَنْ أَنْ يُقَالَ: وَلَكِنْ أَسْلَمْتُمْ إِلَى: قُولُوا أَسْلَمْنا تَعْرِيضًا بِوُجُوبِ الصِّدْقِ فِي الْقَوْلِ لِيُطَابِقَ الْوَاقِعَ، فَهُمْ يَشْعُرُونَ بِأَنَّ كَذِبَهُمْ قَدْ ظَهَرَ**).

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص(٢٦٤، ٢٦٥).

واتـە: لێرەدا خـوا ﷻ نەیفەرمـوە: (قُل لا تقُولـوا أَمَنَّا)، بەڵکو فەرموویـەتی: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا﴾، چونکـە بـەوە کـە فەرموویـەتی: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا﴾، بڵـێ: بڕواتـان نەهێنـاوە، ئەمـەی کـردوە بـە جێگـرەوەی ئـەوە، کـە بفەرمـوێ: (لا تقُولـوا أَمَنَّا)، چونکـە شـتێکی نارێـک دەکـەوێ، بدوێنرێـن بـە بێژەیـەک کـە مانایەکـەی ڕێگریـی لێکردنیـان بـێ، لـەوەی ئیمانی خۆیـان ڕابگەیەنـن، ئەگـەر بفەرمـوێ: (قُـل لا تقُولـوا أَمَنَّـا)، مانـای وایـە ڕێیـان لێگیـراوە کـە ئیمانی خۆیـان ڕابگەیەنـن، لـە حاڵێکـدا ئـەوان داوا لێکـراون کـە بـڕوا بێنـن و بشـڵێن: بڕوامـان هێنـا، بـەڵام بـا بـە شـێوەیەکی ڕاسـت وا بڵێـن، نـەک بە شـێوەیەکی درۆ، بۆیـە خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری ﷺ فەرمـووە: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا﴾، ئەمـە بـۆ ئـەوەی لاف لێدانەکەیـان هەڵبوەشـێنێتەوە، بـەڵام بـە ڕاشـکاوییش نەفەرمـوێ: درۆتـان کـرد، بەڵکـو دوایـی بـە لەبـەر ڕاهاویشـتن (تعریض) ڕایگەیانـدوە ئـەو لاف لێدانەتـان ڕاسـت نەبـوو، کـە لـە ئایـەتی دوای ئـەودا دەردەکـەوێ، دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾، بـڕواداران تەنیـا ئەوانـەن کـە بڕوایـان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی هێنـاوە، دوایـی هیـچ دوو دڵییـان نەبـووەو، بـە سـامان و گیانیشـیان لـە پێنـاوی خـوادا تێکۆشـاون، ئـا ئەوانـە ڕاسـتانن.

کەواتـە: ئـەوەی وانەبـێ، ڕاسـت نـاکات کـە دەڵـێ: ئیمانـم هێنـاوە، هەروەهـا دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾، خـوا ﷻ نەیفەرمـوە: (وَلَكِـن أَسْـلَمْتُم)، بەڵکـو فەرموویـەتی: ﴿وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾، (بـە پێچەوانـەی ئـەوەی پێشـێ، ئـەوەی پێشـێ نەیفەرمـوە: (قُـل لا تقُولـوا أَمَنَّـا)، بەڵکـو فەرموویـەتی: ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا﴾، بڵـێ: بـە جەزمیـی ئیمانتـان نەهێنـاوە، بـەڵام هـی دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾)، ئەمـەش ئاماژەیـەو لەبـەر ڕاهاویشـتنە، بـۆ ئـەوە کـە پێویسـتە مـرۆڤ قسـەی ڕاسـت بـکات، ﴿وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾، واتـە: بـەڵام بڵێـن: مسـوڵمان بوویـن، ئەگـەر دەتانـەوێ قسـەکەتان ڕاسـت بـێ، مانـای وایـە ئـەو کاتـە لـە خۆیـان حاڵیـی دەبـن کـە لافی ئیـمان هێنانیـان لێـداوە، ڕاسـتیان نەکـردوەو درۆیەکەیـان دەرکەوتـوە.

٥)- ﴿وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا﴾، ئەگەر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەشی ﷺ بکەن، هیچ شتێک لە (پاداشتی) کردەوەکانتان لێتان کەم ناکاتەوەو داناشکێنێ.

﴿لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا﴾، (**لاَ يَنقُصُكُم، أَي: مِن ثَوابِ أَعْمَالِكُم**)، ئەگەر ئێوە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، خوا لە پاداشتی کردەوەکانتان هیچ ئەندازەیەک داناشکێنێ و کەم ناکاتەوە، دەشگونجێ: ﴿لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا﴾، وشەی (**ثَوابِ**)یش لێرەدا تەقدیر نەکرێ، یانی: هیچ کام لە کردەوەکانتان (هیچ ئەندازەیەک) لە کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە، بەڵکو کردەوە باشەکانتان چەند بن، خوای بەخشەر دەیانهێنێتەوە ڕێتان و، پاداشتتان لەسەریان دەداتەوە.

وشەی: (**يَلِتْكُم**)، خوێندراویشەتەوە: (**يَألِتْكُم**)، چونکە (**لاتَهُ وَ ألاتَهُ**) هەردووکیان بە مانای (**نَقَصَهُ**)، لێی کەم کردەوە، دێن، وەک لە سوورەتی (**الطور**)دا دەفەرموێ: ﴿...وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ..﴿٢١﴾﴾ الطور.

٦)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا﴾، ئەمە ڕێنمایی کردنیانە بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشییەی لە دڵیاندا هەیە، کە بریتیە لە بێهێزیی ئیمان، یاخود نەبوونی، واتە: لە ڕێی فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ ئیمان لە دڵتاندا، ئەگەر نەشبووبێ، پەیدادەبێ و، ئەگەر هەبێ و بێهێزیش بێ، مەحکەم دەبێ و بەهێز دەبێ.

کە دەشفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، ئەمە ئومێدەوار کردنیانە، بە لێبوردنی خوا، چونکە دەلوێ خوا لێیان ببوورێ، لەبەر ئەوەی لافێکی بۆشیان لێداوەو دەعوایەکی پووچیان کردوە، بۆیە پێویستییان بە لێبوردنی خوا هەیە، دیسان کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، ئەمە ئومێدەوار کردنیانە بەوە کە بەهۆی بەزەیی خوای پەروەردگارەوە، دینداریەکەیان کە تاکو ئێستا مسوڵمانەتییەکی

ڕواڵەتیی بووە، ئنجا ئیمانیشی دەچێتە گەڵێ و دینداریيەکەیان تەواو دەبێ، چونکە مسوڵمانەتیی و بەندایەتیی بۆ خوا، ئەوەیە کە دەرو دەروونی مرۆڤ دابگرێ و، هەم دڵی هەم جەستەی بگرێتەوە، چونکە ئیمان زیاتر پەیوەستە بە دڵ و دەروونەوە، هەرچەند شوێنەوارەکانی لەسەر جەستەش دەردەکەون، بەڵام ئیسلام (ملکەچیی ڕواڵەتیی) زیاتر پەیوەستە بە جەستەوە، هەرچەندە دەبێ لە دڵ و دەروونەوە مرۆڤ هاندەری هەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، بۆ ئەوەی بۆی بە خوا پەرستیی و بە چاکە لە قەڵەم بدرێ، ئەگەرنا کردەوە ڕواڵەتییەکان ئەگەر هاندەری دەروونییان نەبێ، خاوەنەکەیان بە تەئکید لێیان بەهرەمەند نابێ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى**}، (**أخرجه البخاري: ١**)، واتە: بە دڵنیایی کردەوەکان بەپێی نیازو مەبەستەکانن و، هەر مرۆڤێک بەپێی ئەوە کە نیەتی هێناوە، پاداشتی هەیە، هەڵبەتە کردەوەکان، واتە: کردەوە باشەکان، کردەوە باشەکان بەپێی نیازو مەبەستەکانن، ئەگەرنا کردەوەی خراپ هەر خراپە، با نیازو مەبەستی باشیشی لە پشتەوە بێ، چونکە نیەتی چاک، کردەوەی خراپ چاک ناکات، بەڵام کرداری باشیش، ئەگەر نیەتی باشی لە پشتەوە نەبێ، پاداشتی نابێ.

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی بڕوادارانی ڕاستەقینە دەکات، هەم بۆ ئەوانەی کاتی خۆی لافی ئیمانیان لێداوەو، بە هەڵەداچوون لە لاف لێدانەکەیانداو، هەم بۆ جگەلە ئەوانیش:

٧)- ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، بە دڵنیایی بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ.

وەک زۆرجار گوتوومانە: (**إِنَّمَا**)، (**أَداة الحصرِ وَالإِثبات**)، ئامرازی کورت هەڵێنان و چەسپاندنە، واتە: وەختێک (**إنَّما**)، دەچێتە سەر ڕستەیەک ئەو حوکمەی لەو ڕستەیەدا هاتوە، دەیچەسپێنێ بۆ ئەوەی بۆی باسکراوەو، لەویشدا کورتی

هەڵدێنێ، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، بە دڵنیاییی بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە، واتە: جگەی لەوانە کەس بڕوادار نیە.

٨)- ﴿ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟﴾، دواییش دوو دڵییان نەبووە، وشەی (ثُمَّ) لێرەدا:

أ- دەگونجێ بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەیی (**الترتيب الرُّتبيّ**) بێ، لەبەر ئەوەی نەکەوتنە دوو دڵییەوە لە ئیماندا، پلەکەی بەرزترە لە ئەصڵی ئیمان هێنان، ﴿ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟﴾، یانی: یەقینیشیان هەیە، دڵدامەزراویشن لە ئیمانەکەیاندا.

ب- دەشگونجێ (**ثُمَّ**)، بۆ ڕیزبەندیی کاتیی (**الترتيب الرُّتبيّ**) بێ، واتە: پێشێ بڕوایان هێناوە، دوایی بڕوایەکەیان مەحکەمترو بەهێزترو دامەزراوتر کردوە، کەواتە: (**ثُمَّ**)، هەم دەگونجێ بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەیی بێ، هەم دەگونجێ بۆ ڕیزبەندیی کاتیی بێ.

٩)- ﴿وَجَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، هەروەها {بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو، دوایی هیچ دوو دڵ نەبوون}، بە سامان و گیانیشیان لەڕێی خوادا تێکۆشاون.

(**جِهادو مُجاهَدَة**): (**بَذلُ أَقصَى ما في الوُسْعِ**)، بریتیە لە خەرجکردنی ئەوپەڕی توانا، بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانا، واتە: ئەوپەڕی توانایان بەکارهێناوە لە پێناوی خوادا، کە لێرەدا خوا ﷻ باسی بەخشینی سامانی کردوەو، هی گیانیش، کە لەڕاستییدا کەسێک بتوانێ سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا بەخت بکات، مانای وایە تێکۆشانێکی باشی لە پێناوی خوای پەروەردگاردا کردوە، ئنجا ئەو تێکۆشانە بە سامان و گیان لە پێناوی خوادا، زەقترین بەشی، بریتیە لە جەنگکردن (**القتال**) لە پێناوی خوادا، بەڵام مەرجیش نیە هەمیشە مرۆڤ سەنگەر بگرێ و چەکی بەشانەوە بێ، ئەوجار ڕێبازی خوا (**سَبيلُ الله**)، گیان و سامانی لێ بخوازێ، بەڵکو جاری واهەیە بە هۆی بانگەواز کردن و، قسەی هەق کردن و، کارکردن بۆ ئیسلام و مشوورخواردن بۆ مسوڵمانانیشەوە، بێ ئەوەی سەنگەر لە کەس

بگـری، ئـەو کارە ئیسـلامییەی ئەنجامـی دەدات، مـاڵ و سـامانی لـێ دەخـوازێ، بەڵکـو گیانیشـی لـێ دەخـوازێ، هەربۆیـەش پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {سَـيِّدُ الشُّـهَدَاءِ حَمْـزَةُ بـنُ عَبْـدِ الْمُطَّلِـبِ، وَرَجُـلٌ قَـامَ إِلَى إِمَـامٍ جَائِـرٍ، فَأَمَـرَهُ وَنَهَـاهُ، فَقَتَلَـهُ} (أخرجـه الحاكـم: ٤٨٨٤، والطـبراني في الصغـير: ٤٠٧٩، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني في صَحِيـح الْجَامِـع: ٣٦٧٥، عَـنْ جَابِـرِ بْـنِ عَبْـدِ اللـهِ رضي اللـه عنهـما)، واتـە: گـەورەی شـەهیدان حەمزەیـەو پیاوێکـە ڕاسـت دەبێتـەوە لـە حوکمڕانێکـی سـتەمکار، فەرمـانی پێـدەکات بـە چاکـەو، ڕێگریـی لێـدەکات لـە خراپـە، ئەویـش بـەو هۆیـەوە دەیکـوژێ.

هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: {أَفْضَـلُ الْجِهَـادِ كَلِمَـةُ عَـدْلٍ عِنْـدَ سُـلْطَانٍ جَائِـرٍ} (أخرجـه أبـو داود: ٤٣٤٤، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني)، گەورەتریـن تێکۆشـان بریتیـە لـە قسـەیەکی هـەق، قسـەیەکی دادگەرانـە لـە لای حوکمڕانێکـی سـتەمکار.

١٠)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾، ئا ئەوانەن ڕاستانن، بەس ئەوانە ڕاستانن، کەواتە: چەمکی پێچەوانەکەی ئەوەیە جگە لە ئەوانە ڕاست ناکات لەوەدا کە بڵێ: ئیمانم هێناوە، هەروەها ئەو ئایەتە موبارەکە لێی وەردەگیرێ، کە ئیمان بەبێ کردەوەی باش نایەتە دی، کردەوەی باشیش هەر کردەوەیەك لە کاتی خۆیداو، بە ئەندازەی خۆی و، بە مەرجەکانی خۆی، هەر بۆیە زۆربەی هەرەزۆری زانایان (زانایانی پێشین) لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە جینسی کردەوە، بەشێکە لە ئیمان، وەک لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) دا، هەروەها لە کتێبی (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی)دا، دیسان لە مەوسووعەی: (الإسلامُ كَما يَتَجَلَّى فِي كِتابِ الله)، لە کتێبی دووەمیداو، لە کتێبی (خواناسیی ئایین ئیمان)دا و، لە کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی (بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن)دا، باسمان کردوە، کە ئەوە ڕای زاڵی زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، کە جینسی کردەوەی باش، بەشێکە لە ئیمان، نەک هەموو کردەوەیەکی باش پێکهێنەری ئیمان بێ، وەک خەواریج و موعتەزیلە دەیانگوت، کە ئەگەر هەموو کردەوەیەکی باش بەشێک بێت لە ئیمان، مانای وایە هەر کەسێک واجبێک بچوێنێ، پێی کافر دەبێ و، هەر کەسێکیش قەدەغەیەک بشکێنێ، هەر پێی کافر دەبێ، هەروەها نەک وەک مورجیئەش دەیانگوت: کردەوە هیچ پەیوەندیی بە

ئیمانەوە نیەو، دەگونجێ کەسێ هیچ کردەوەیەکی باشی نەبێ و، ئیمانیشی زۆر دامەزراو بێ! کە بێگومان ئەوە ڕاست نیەو، کورت هێنانە، هەروەک ئەوەی خەواریج و موعتەزیلەش تێپەڕاندنە، بەڵام خەتی نێوەڕاست و، ڕای ڕاست و دروست و، بەڵگەدار ئەوەیە کە جینسی کردەوە، بەشێکە لە ئیمان، وەک زانایان ئاوا پێناسەی ئیمانیان کردوە: (**الإيمانُ: الإيقانُ بِالجَنَان، وَالإِقْرَارُ بِاللِّسَان، وَالعَمَلُ بِالأَرْكان**)، ئیمان بریتیە لە دڵنیایی بە دڵ و دەروون {واتە: بڕوا هێنان و دڵنیا بوون لە بڕوا هێناندا بە دڵ و دەروون}و، دان پێدا هێنان بە زمان و، کردەوەش بە ئەندامەکان.

پێشەوا بوخاری گوتوویەتی: زیاتر لە هەزار (١٠٠٠) لە زانایانی شارەکانی مەککەو مەدینەو کووفەو بەصرەو دیمەشق و کوێ و کوێم بیستوە (باس دەکات و ناوی شارەکان دێنێ)، کە گوتوویانە: (**الإيمانُ: قَولٌ وَعَمَل، قَولُ القَلبِ وَاللِّسان، وَعَمَلُ القَلبِ وَالجَوارِح**)، ئیمان بریتیە لە قسەو لە کردەوە، قسەی دڵ و زمان و، کردەوەی دڵ و ئەندامەکان، مەبەستیان لە قسەی دڵ، زانین و بەڕاست زانینی دڵ (**معرفة وتصديق القلب**) بووە، مەبەستیشیان لە قسەی زمان (**قول اللِّسان**) دان پێداهێنانی زمان بووە، مەبەستیشیان لە کردەوەی دڵ (**عمل القلب**) پەسند کردن و قبووڵ کردنی بە دڵ بووە، بۆ ئەو شتانەی ئیمانیان پێ دەهێنرێ، مەستیشیان لە کردەوەی ئەندامەکان (**عمل الجوارح**) جێبەجێ کردنی ئەوە بووە کە بە عەقڵ دەرک کراوەو، بە دڵ پەسند کراوەو، بە زمانیش دانی پێدا هێنراوە.

دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

**١١)-** ﴿ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ ﴾، {خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:} پێیان بڵێ: ئایا ئێوە دینداریی خۆتان بە خوا دەزانێنن؟ ئەم پرسیار کردنە، پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانەیە، مەبەستیش لە (**تعليم**) زێدەڕۆیی کردنە لە گەیاندنی زانیاریی دا، بۆ فێرکراو، واتە: ئایا ئێوە خوا ﷻ لە دینداریی خۆتان ئاگادار دەکەنەوە؟!

چونکـه لـه جیـاتی: ﴿أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ﴾، دەگونجـا بفەرمـوێ: (أَتُعَلِّمُـونَ اللـهَ دِيْنَكُـم)، ئایـا دینـی خۆتـان فێـری خـوا دەکـەن (دینداریـی خۆتـان)؟، بـەڵام بۆچـی بـە پیتـی (ب) بـەرکاری دووەمـی خواسـتوە؟ ﴿أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ﴾، چونکـە (تُعَلِّمُـونَ) دوو بـەرکاران دەخـوازێ، کـە یەکێکیـان (اللـهَ) ئـەوە بـەرکاری یەکەمـەو (دِينَكُم)یـش بـەرکاری دووەمـە، بۆیـە بـە (ب) بـەرکاری دووەم (مفعـول بـه الثـاني) خواسـتوە، چونکـە: {ضُمِّـنَ تُعَلِّمُـونَ مَعنَـى تُخـبِرُونَ}، (تُعَلِّمُـونَ) مانـای هـەواڵ پێـدان و ئـاگادار کردنـەوەی خراوەتـە نێـو، بۆیـە بـە (ب) بـەرکاری خواسـتوە، واتـە: ئێسـتا (تُعَلِّمُـونَ اللـهَ بِدِينُكُـم) دوو واتایـان دەگەیەنـێ لـە یـەک کاتـدا:

**یەک:** ئایا دینداریی خۆتان فێری خوا دەکەن؟

**دوو:** ئایا خوا ئاگادار دەکەنەوەو هەواڵی پێ دەدەن لە بارەی دینداریی خۆتانەوە؟

که ئەمە پرسیار کردنێکی سەرزەنشتکارانەیە، واتە: شتێکی زۆر بێجێ دەکەن.

**١٢)-** ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، خواش هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە دەیزانێ، واتە: ئێوە نازانن و نافامن و بێ ئاگان، ئەگەرنا خوا ﷻ نەک دینداریی ئێوە، بەڵکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە دەیزانێ.

**١٣)-** ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾، خواش بە هەموو شتێک زانایە.

یـانی: جگـە لـەوەش کـە لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە، هەمـوو شـتێکی دیکەش دەزانـێ، چونکـە هەرچـی هەیـە دروسـتکراوی خوایـەو، بـە دڵنیایـی بەدیهێنەریـش هەمـوو دروسـت کـراوەکانی خـۆی دەزانـێ و دەناسـێ و پێیـان ئـاگادارە.

**مەسەلەی دووەم:**

**منـەت کـردنی عەرەبـە بیاباننشینەکان کـە مسـوڵمان بـوون و، فەرمانکـردنی خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ کـە ڕێگریـی منەتکردنیـان لـێ بـکات، چونکـە هـەر خـوا مـافی منەتبـار کـردنی مرۆڤـەکانی هەیـە، لەسـەر ڕێنمایـی کردنیـان بـۆ ئیـمان، خـواش پەنهانـەکانی ئاسـمان و زەوی دەزانـێ و، کـردەوەی هەمـوو لایەکیـش دەبینـێ:**

وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم ۖ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ .

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

لێرەدا خوا ﷻ ڕاستەوخۆ پێغەمبەر ﷺ دەکات بە دوێنراوی خۆی، دەفەرموێ:

**١)-** ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا ﴾، ئەوانە منەتت لەسەر دەکەن کە مسوڵمان بوون و ملکەچ بوون.

(**المَـنُّ: ذِكـرُ النِّعمَـةِ وَالإحسـانِ لِمُراعِيَـةِ المُحْسَـنُ إِلَيـهِ لِلذّاكِـرِ**)، (مَـنّ) بریتیـە لـە باسـکردنی چاکـەو چاکـە لەگەڵـدا کـردن، تاکـو بابـای چاکـە لەگەڵـدا کـراو، بـۆ ئـەو کەسـەی بـاسی چاکەکـە دەکات، ڕەچـاوی بـکاو ئـاگای لێـی بـێ (کـە منەتباریـەتی و چاکـە لەگەڵـدا کراویـەتی).

**٢)-** ﴿ قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم ﴾، {ئەی موحەممەد ﷺ} پێیان بڵێ: ئیسلامەتییەکەی خۆتان بە چاوی من دامەدەنەوەو لەسەرم مەکەنە منەت.

پێشـێ گوتوویانـە: (آمَنَّـا)، خـوای پەنهانزانیـش ئـەوەی لـێ هەڵوەشـاندوونەوە، بـەڵام ئـەوەی ئـەوان منەتیـان پـێ لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ کـردووە، خـوا پاڵـی داوەتـە لای وان، ئیسـلامەتییەکی تایبـەت بـووە بەوانـەوە: ﴿ قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم ﴾،

نەیفەرموە: (قُـلْ لاَ تَمُنُّـوا عَـلَيَّ الإِسـلامَ)، (إِسْلاَمَكُم)، واتـە: ئـەو جـۆرە ملكەچییـەی ئێـوە کـە تایبەتـە بـە ئێـوەوە، کـە ملكەچییەکـی ڕواڵەتیـی و ڕووکەشـییە، لەسـەر منـی مەکەنـە منـەت و بـە چـاوی منـی دامەدەنـەوە.

٣)- ﴿ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ ﴾، بەڵكو خوا منەتتان لەسەر دەكات.

٤)- ﴿ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ ﴾، كە ئێوەی ڕێنمایی كردوە بۆ ئیمان، ئەمە ئاماژەیە بەوە كە خوا ﷻ لەمەودوا منەتباری خۆییان دەكات و چاكەیان لەگەڵدا دەكات، بەوە كە ئیمانیشیان بە قسمەت دەكات، واتە: ئیمان دەچێتە نێو دڵیانەوە.

٥)- ﴿ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستان بن، (لە لاف لێدانی هەبوونی ئیماندا)، ئەوە منەت و چاكەی خواو، بەخششی خوا بەسەر ئێوەوە هەیە، نەک ئێوە ئەوە بكەنە منەت لەسەر پێغەمبەرەكەی ﷺ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ ﴾، وشـەی (الإِيمـان) لەبـەر ئـەوەی (أل)ی ناسـادنی لەسـەرە، واتـە: ئیـمانی ڕاسـتەقینە، واتـە: ئـەو ئیمانـەی خـوا ﷻ دەیـەوێ، بـەڵام وشـەی ئیسـلام کـە پاڵدراوەتـە لای ئـەوان (إِسْلاَمَكُم)، ئـەوە ئـەو جـۆرە مسـوڵمانەتیەیە کـە تایبەتـە بـە عەرەبـە خێڵەکییەکانـەوە، کـە بریتیـە لـە ئیسـلامەتییەک ئیـمانی لەگەڵـدا نیـەو، ئیسـلامەتییەکی ڕووکەشـیی و ڕواڵەتییـە.

لە ئایەتی كۆتاییدا خوا دەفەرموێ:

٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بە دڵنیایی خوا پەنهانی ئاسمانەكان و زەوی دەزانێ، واتە: هەر شتێكی پەنهان و شێردراوە لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، خوا هەمووی دەزانێ، لێرەدا خوا ﷻ وشەی (إِنَّ)ی بەكارهێناوە، كە ئەم پیتە بۆ جەختكردنەوەیەو بۆ دڵنیاكردنەوەیە، تاكو ئەوان وا دابنرێن كە نكووڵییان كردوە و، وەک كەسێک وان كە نكووڵیی دەكات لەوەی خوا پەنهانی ئاسمانەكان و زەوی بزانێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: دڵنیابن بە جەختكردنەوەوە، خوا پەنهانی ئاسمانەكان و زەوی دەزانێ.

٧)- ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، خواش بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، ئەمە ئەگەر ڕووی دواندن هەر لە عەرەبە خێڵەکییەکان بێ، خوێنراویشەتەوە: (**يَعمَلُون**) واتە: خوا بینەری ئەوەیە کە ئەوان دەیکەن، کە لێرەدا ئەمە پێی دەگوترێ ئاوڕدانەوە (**إلتِفات**)، پێشێ هەمووی بریتیە لە دواندنی ئەوان، بەڵام دوایی خوا ﷻ ڕوو لەوان وەردەگێڕێ و لە شێوەی دواندنەکەدا، ڕوو دەکاتەوە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێ: خوا بینەری ئەوەیە کە ئەوان ئەنجامی دەدەن و دەیکەن، کە ئەمە لە زانیاریی ڕەوانبێژیی و ڕێزمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (**عَطْفُ الخَاصِّ عَلَى العَام**)، گێڕانەوەو بادانەوەی تایبەت بۆ سەر گشتیی، چونکە خوا ﷻ کە پێشێ دەفەرموێ: بە دڵنیایی خوا پەنهانی ئاسمان و زەوی دەزانێ، بێگومان لە نێو پەنهانەکانی ئاسمان و زەویدا کردەوەی مرۆڤەکان و هەڵسوکەوتەکانیشیان هەن، بەڵام دوایی کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، یان (**بِما يَعمَلُون**)، ئەمە شتێکی تایبەتە لە نێو شتە گشتییەکاندا، کە هەرچی پەنهانە خوا هەمووی دەزانێ، بەڵام بە تایبەت کردەوەکانیان کە ئەنجامیان دەدەن، خوا ﷻ دەشیانزانێ و بینەریشیانە، بەو شێوەیەی بۆ خوا ﷻ شایستەیە، واتە: کە دەڵێین: خوای بێ وێنە دەبیستێ و دەبینێ، بێگومان بیستن و بینینی خوا ﷻ، وەک هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوا، بەو شێوەیەن کە بۆ خوا شایستەیە ﷻ، وەک فەرموویەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ...﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەک وێنەی وی نیە، هەم لە زاتیداو هەم لە سیفەتەکانی دا.

لێرەدا دێینە کۆتایی ئەم دەرسەمان و، کۆتایی تەفسیری سووڕەتی (**الحجرات**).

لە خوای پەروەردگاریش دەپاڕێینەوە: خوایە! بە لوتف و کەرەمی خۆت، بە ناوە هەرە چاکەکانت و بە سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەکانت، بەتایبەتی بە فەرمایشتی بێ وێنەت کە قورئانی مەزن و بەڕێزە، لێت دەپاڕێینەوە، یارمەتییمان بدە زیاتر بە تۆ ئاشنا بین، تاکو بەهۆی ئیمان بە تۆ هێنانەوە، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، دەرگای لێ تێگەیشتن و ئاشنابوونی باشیشمان لە فەرمایشتەکەت بۆ بکرێتەوە، خوایە! تەوفیقمان بدە زیاتر شوێن پێغەمبەرەکەت (**محمد**) ﷺ،

بکەوین و، شارەزای ڕێبازو ڕێ و شوێنەکەی بین، کە بێگومان پێغەمبەری کۆتایی تۆ موحەممەد ﷺ کە سەروەری پێغەمبەرانە، وەک هەر کام لە پێغەمبەرانی برای (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)، ئەوەی کە تۆ فەرمووتەو بۆت سروش کردوون و بۆت ناردوون، ئەوانە لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆیاندا بەرجەستەیان کردوە.

خوایە! تەوفیقمان بدە زیاتر شوێن پێغەمبەری خاتەم بکەوین ﷺ ، کە تەواوکەری کاری هەموو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام) بۆ ئەوەی وێڕای ئەوە کە چاک لە فەرمایشتەکەت تێدەگەین، باشیش لە چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی فەرمایشتەکەت لەسەر ئەرزی واقیع، بەهرەمەند ببین، بەهۆی زیاتر ئاشنا بوونمان بە ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، زیاتر شوێن پێ هەڵگرتنمانەوە بۆی.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە ڕۆژی (١٠)ی (رجـب)ی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٣/٥)ی زاینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (ق).

## پێناسەی سوورەتی (ق) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی سـوورەتی قـاف (**سـورَةُ ق**)ە، لـەلای سـەرجەم زانایـان، بـەڵام (**السـیوطي**) لـە کتێبەکـەی خۆیـدا: (**الإتقـان فـي علـوم القـرآن**) گوتوویەتـی: (**سـورَةُ الباسقات**)یشـی پـێ دەگوتـرێ، بـەڵام ئـەو قسـەیە پشـت ڕاسـت نەکراوەتـەوە، بـە هیـچ بەڵگەیـەک.

هەڵبەتـە ناولێنرانـی سـوورەتەکانیش زیاتـر تەوفیقییـە، نـەک تەوقیفیـی، واتـە: لەلایـەن خـواو پێغەمبـەری خـواوە ﷺ ئـەو ناوانـە دیاریـی نەکـراون، بەڵکـو هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، جـاری واش هەیـە ڕەنگـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ هەندێـک لـە سـوورەتەکان ناوێکـی بەکارهێنابـێ، بـەڵام ئـەوە نەبـووە کـە لـە ڕووی شـەرعییەوە مسـوڵمانان پابەنـد بکرێـن بـە ناوێکـی دیارییکـراوەوە، بەڵکـو ئـەوە وەک عـورف و بـاوی نێـو خۆیـان، هـەر بۆیـە سـوورەتی وا هەیـە سـێ نـاوی هەیـە، چـوار نـاوی هەیـە، بـەڵام زۆربەیـان بـە ناوێـک زیاتـر نـاسراون.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە ئەم سوورەتە (**سورةُ قاف**)ی پێ دەگوترێ، لەو بارەوە زۆرن، ئێمە لەو بارەوە سێ دەق دێنین:

**یەکەمیان:** {عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ بِ ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ وَكَانَ صَلاَتُهُ بَعْدُ تَخْفِيفًا} (**أخرجه أحمد: ٢١٠٤١، ومسلم: ١٠٥٥، الترمذي: ٣٠٦، وابن خزيمة: ٥٢٦**).

واتە: جابیری کوڕی سەمووره (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا (سوورەتی): ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ی دەخوێند، ڕکاتی دواتر نوێژەکەی سووک دەکردەوە.

**دەقی دووەم:** {عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ رَحِمَهُ الله، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِيدِ بـ ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ و ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ١﴾} (**أخرجه أحمد: ٢١٨٩٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح**).

واتە: ئەبو واقیدی لەیثیی (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەژندا سوورەتی قاف و سوورەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ١﴾، کە بە سوورەتی (**القمر**) ناسراوە، دەخوێندن.

سوورەتی (ق) لە ڕکاتی یەکەمداو، سوورەتی (**القمر**) لە ڕکاتی دووەمدا، واتە: نوێژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان.

**دەقی سێیەم:** {عَنْ أُمِّ هِشَامٍ بِنْتِ حَارِثَةَ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا أَخَذْتُ: ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، إِلَّا عَنْ لِسَانِ رَسُولِ ٱللَّهِ ﷺ يَقْرَؤُهَا كُلَّ جُمُعَةٍ عَلَى ٱلْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ ٱلنَّاسَ} (**أخرجه مسلم: ٨٧٣**).

واتە: ئوممو هیشامی کچی حاریثە (خوای لێی ڕازی بێ)، دەڵێ سوورەتی: ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾م، تەنیا لە زاری موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتوە، کە لە هەموو جومعەیەکدا لەسەر مینبەر کاتێ وتاری بۆ خەڵک دەدا، دەیخوێند.

هەڵبەتە کە دەڵێ: لە هەموو جومعەیەکدا، ئەمە عادەتی زمانی عەرەب و، عادەتی زۆر لە گەلان وایە، کە کەسێک شتێک لە جارێک زیاتر دووبارە بکاتەوە، پاڵیدەداتە لای هەموو جارەکان، ئەگەرنا لە زۆر دەقی دیکەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ تەنیا سوورەتی (ق)ی نەخوێندوە، بەڵام ئەمە جۆرێکە لە زێدەڕۆیی کردن لە قساندا، کە لە عورف و باوی میللەتاندا ڕەوایە، بۆ وێنە: کەسێک چوار جار چووە بۆ لای کەسێک دەڵێ: سەد جار هاتم بۆ لات!

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە مەککەییە، مادام لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارە (٣٤)ی هەبێ، وەک دوایی باسی دەکەین، کەواتە: وا دیارە لە میانی چوار پێنج ساڵی سەرەتای قۆناغی مەککەدا دابەزیبێ، دوای ساڵانی یەکەم و دووەم و سێیەم، پێم وایە لە ساڵانی چوارو پێنج و ئەو دەوروبەرەدا دابەزیوەو، کەسیش باسی نەکردوە کە لێک دابڕابێ، وادیارە هەمووی بەسەر یەکەوە دابەزیوە، چونکە هەمووی تێکهەڵکێشە، وەک دوایی باسی دەکەین، تەوەرە سەرەکییەکەی هەمووی باسی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەو سزاو پاداشتە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

لە موصحەفدا ژمارە (٥٠)یەو، لە دابەزیندا بە پێی قسەی (**جَابِر بن زَيد**) ژمارەکەی (٣٤)ە، پێش سوورەتی (**البلد**): ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ١﴾، لە دوای سوورەتی (**المرسلات**) دابەزیوە، واتە: لە پێش ئەم سوورەتە موبارەکە تەنیا (٣٣) سوورەتی دیکە دابەزیون، بۆیە بە مەزەندە، پێم وایە لە ساڵانی چوارو پێنج، تۆزێ پێشتر یان تۆزێ دواتر، لەو دەوروبەرە دابەزیبێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، ژمارەی ئایەتەکانی: (٤٥)ە، لەو بارەوە ڕاجیایی نەبووە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

هەرچەندە لە ئایەتی سەرەتا و ئایەتی کۆتاییدا، واتە: ئایەتی ژمارە (١)و، ئایەتی ژمارە (٤٥)دا، باسی قورئان و باسی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کراوە، هەروەها باسی ژمارەیەک لە نیشانەکانی خوا (**آياتُ الله**) کراوە، ئاماژەش بە هەشت لە گەل و کۆمەڵگا فەوتێنراوەکان کراوە، بەڵام سوڕگەی سەرەکیی ئەم سووڕەتە باسی ڕۆژی دواییە، بە تایبەت قیامەت و زیندوو کرانەوە، سزاو پاداشت، دۆزەخ و بەهەشت، باسی تۆمارکرانی قسەو کردەوەکانی مرۆڤان، حاڵەتی سەرە مەرگ، ئنجا هەر بەو بۆنەیەشەوە چەند ڕێنماییەک خراونەتە ڕوو بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لە بواری مامەڵەی لەگەڵ بێبڕوایاندا بە پێغەمبەرایەتیی و بە ڕۆژی دوایی، ئنجا کە باسی نیشانەکانی خواش کراوە، لە گەردووندا، لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەروەها کە باسی گەلە فەوتێنراوە یاخییەکان کراوە، باسی هەشت لە گەلەکان کراوە، ناویان هێنراوە، هەروەها کە باسی حاڵەتی سەرە مەرگ، یاخود تۆمارکرانی قسەو کردەوەکانی مرۆڤان کراوە، ئەوە هەمووی پەیوەستە بە تەوەرە سەرەکییەکەوە، وەک گوتمان: باسی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت و ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

هەر کام لە سووڕەتەکان ژمارەیەک تایبەتمەندییان هەن، کە جیایان دەکەنەوە لە سووڕەتەکانی دیکە:

١- تایبەتمەندیی یەکەمی ئەو سووڕەتە ئەوەیە، کە بە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایانەوە، ئەم سووڕەتە سەرەتای قورئانی (المُفَصَّل)ە، پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی (مُفَصَّل)ی بەکارهێناوە بۆ ژمارەیەک لە سووڕەتەکان کە لێرە، واتە: لە سووڕەتی پەنجایەمینەوە بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف و، لە سووڕەتی (٣٤)ەمینەوە بە پێی ڕیزبەندیی دابەزین بەرەو دوا، هەمووی بە (المُفَصَّل) لە قەڵەم دەدرێ، واتە: ئەو سووڕەتانەی لە چاو سووڕەتەکانی دیکە کورتترن و، مانایان تاڕاددەیەک ڕوونترە، لەو ڕووەوە کە ئەوانە سەرەتای فەرمایشتکردنی خوای کاربەجێ بوون لەگەڵ مرۆڤەکاندا، بە تایبەت لەگەڵ کۆمەڵگای یەکەمدا، بەڵێ هەندێ سووڕەتی مەدینەییان تێدان، بە تایبەت جوزئی (قَدْ سَمِعَ الله)، هەروەها سووڕەتی (الحديد)یش لە کۆتایی جوزئی (٢٧)ەمدا، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان سووڕەتە مەککەییەکانن، سووڕەتە مەدینەییەکانیش کە بە ڕیزبەندیی موصحەف ئاوا دانراون، ئەوانیش هەر لە ڕووی قەبارەوەو لە ڕووی کورتیی و درێژیی ئایەتەکانەوە، دەشوبهێنە ئەو سووڕەتە موبارەکە مەککەییانەی کە لەگەڵیاندا ڕیزکراون. هەڵبەتە هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: سەرەتای (المُفَصَّل) سووڕەتی (الحجرات)ە، بەڵام زۆربەیان گوتوویانە: سووڕەتی (ق)ە.

٢- ئەم سووڕەتە جگە لە ئایەتی (١) و (٤٥)، واتە: ئایەتی سەرەتاو کۆتایی، ئەویدیکە هەمووی بۆ باسی قیامەت و سزاو پاداشت و هەتا دوایی، تەرخانکراوە.

٣- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی دوو فریشتەی چاودێرو ئامادە بەسەر مرۆڤەوە کراوە، ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ١٨﴾، یان ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ١٧﴾.

٤- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی نزیکتربوونی خوا لە مرۆڤ لە ڕەگی ملی کراوە، ئایەتی ژمارە (١٦).

٥- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی: ﴿سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ کراوە، بێهۆشیی کاتی مەرگ لە ئایەتی ژمارە (١٩)دا.

٦- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی لادرانی پەردەو پۆشش لەسەر چاوی مرۆڤ کراوە، سەرجەم چاک دیتنی و تیژ بینینی، لە ئایەتی ژمارە (٢٢)دا.

٧- لە ئایەتی ژمارە (٣٠)دا، تەنیا لەم سووڕەتەدا باسی: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾ کراوە، ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾، بۆ دۆزەخ، ئایا چی دیکە زیادە هەیە بیهێنن؟

٨- چەند وشەیەک تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

١- ﴿أَمۡرٖ مَّرِيجٍ﴾، ئایەتی ژمارە (٥)، واتە: کارێکی تێکەڵ.

٢- ﴿زَوۡجِۢ بَهِيجٖ﴾، ئایەتی ژمارە (٧)، واتە: هەر جۆرێکی جوان و بە ڕەونەق.

٣- ﴿وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ﴾، ئایەتی ژمارە (٩)، واتە: دانەوێڵەیەک کە دەدروێتەوە، ڕەنێودەهێنرێ.

٤- ﴿بَاسِقَٰتٖ﴾، ئایەتی ژمارە (١٠)دا، یانی: (**طَویلات**) دارخورما درێژە بەرز هەڵچووەکان.

٥- ﴿طَلۡعٞ نَّضِيدٞ﴾، ئایەتی ژمارە (١٠)، ﴿طَلۡعٞ﴾ یانی: میوە، بەری دارخورما کە یەکەمجار دەریدەکات، ﴿نَّضِيدٞ﴾، واتە: ڕیز بەستوو، لەسەریەک ڕیزکراو.

٦- ﴿فِي لَبۡسٖ﴾، ئایەتی ژمارە (١٥)، لە حاڵەتی ئیشکال و تێکەڵ بوون.

٧- ﴿حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ﴾، ئایەتی ژمارە (١٦)، واتە: ڕەگی دڵ، یاخود ڕەگی گەردن.

٨- ﴿ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ﴾، واتە: دوو وەرگرەکان، دوو تۆمارکەرەکان، لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا کە مەبەست پێی دوو فریشتەکانن.

٩- ﴿قَعِيدٞ﴾، کە لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا هاتوە، واتە: دانیشتوو، کە مەبەست پێی هاونشینە.

١٠- ﴿عَتِيدٞ﴾، کە لە ئایەتی ژمارە (١٨)دا هاتوە، واتە: ئامادە، حازر.

١١- ﴿ فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ ﴾، واته: پۆشش و پەردەمان لەسەرت لادا، له ئایەتی ژماره (٢٢)دا.

١٢- ﴿ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴾، واته: ئەمڕۆ چاوت تیژه، واته: چاوت باش دەبینێ، له ئایەتی ژماره (٢٢)دا.

١٣- ﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: بڕیاری من ناگۆڕێ، ئەو فەرمایشتەی گوتوومە، له ئایەتی ژماره (٢٩)دا.

١٤- ﴿ فَنَقَّبُواْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴾، واته (فَتَّشُوا)، زۆر گەڕان و پشکنیان له وڵاتاندا، ﴿ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴾، ئایا هیچ شوێنی خۆتێدا پەنەنادان و دەربازبوون هەیه؟ ئایەتی ژماره (٣٦).

١٥- ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ﴾، له ئایەتی ژماره (٤٥)و کۆتایی دا، واته: تۆ بەرسەریانەوه جەبر لێکەر و تۆبزی لێکەرنی.

## حەوتەم: دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە ئەو (٤٥) ئایەتەی ئەم سوورەته موبارەکەمان، بۆ سێ دەرسان دابەش دەکەین، هەر دەرسی پازده ئایەت:

**دەرسی یەکەم:** له ئایەتەکانی: (١ - ١٥)ی سەرەتا، باسی قورئان و، باسی پێغەمبەری خوا ﷺو، بەرپەرچدانەوەی نکوولیکەران له زیندووکرانەوه، به بەڵگەی ڕێک و پێکیی لەگەردووندا، به سەروخواریەوەو، بەڵگەی فەوتێنرانی گەلانی یاخیی و، به درۆ دانەری پێغەمبەران، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر تێکڕای پێغەمبەران بێ، که وەک دوایی باسی دەکەین، زۆربەری زانایان تەفسیرەکەیاندا که من تەماشام کردن پێم وایه سەرکەوتوو نەبوون له چۆنیەتیی پێکەوه بەستنەوەی هەم باسی ژمارەیەک له نیشانەکانی خوا له گەردووندا، هەم له ئاماژەکردن به فەوتێنرانی هەشت له گەله یاخییەکان، که

چۆن پەیوەست دەكرێتەوە بە تەوەری سەرەكیی ئەم سوورەتە موبارەكەوە، كە باسی سزاو پاداشت و زیندووكرانەوەیە؟!

**دەرسی دووەم:** لە ئایەتەكانی: (١٦ - ٣٠)، واتە: پازدە (١٥) ئایەتی دووەمی ئەم سوورەتە موبارەكە، باسی نزیكیی خوا ﷻ لە مرۆڤ و، تۆماركردنی فریشتەكان بۆ قسە و رەفتاری مرۆڤ، باسی هاتنی مردن و هاتنی قیامەت و، شایەتیی لەسەردانی مرۆڤ و مشت و مڕ كردنی لەگەڵ (قرین) واتە: هاونشینە جندەكەیدا، كە مرۆڤەكە خەتای ئەو دەگرێ، ئەویش دەڵێ: نەخێر خەتای خۆت بوو، فەرمانكردنی خوا ﷻ بە بێ دەنگ بوونیان و مشتومڕ نەكردنیان لە خزمەت خوادا لەو ڕۆژەدا، چونكە ئەوە تێپەڕی و، فڕێدرانیانە نێو دۆزەخ، (هی بێبڕوایان)، داواكردنی دۆزەخ بۆ بێبڕوایان و تاوانباران بۆ پتر سزادانیان.

**دەرسی سێیەم:** لە ئایەتەكانی: (٣١ - ٤٥)، واتە: لە پازدە (١٥) ئایەتی كۆتایی ئەم سوورەتە موبارەكە پێك دێ، باسی بەهەشت و بەهەشتییان و، فەوتێنرانی گەلانی یاخیی و، سەرنجڕاكێشان بۆ گەردوون و، ڕێنماییكردنی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ كە خۆڕاگرو پشوو درێژ بێ و، خوا بە پاكگرو ستایشكار بێ و، پیشاندانی چەند دیمەنێكی قیامەت و، فەرمانكردنی خوا بە پێغەمبەری خوا ﷺ كە بە هۆی قورئانەوە هۆشداریی بداتە بێبڕوایان و، لە سزا و جەزرەبەی خوای بەرز بیانترسێنێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پـازدە (١٥) ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (ق)، ئایەتـەکانی: (١ - ١٥) پێـک دێ، سـەرەتا خـوا ﷻ سـوێندی بـە قورئانی شـکۆدار خواردوە، بـەڵام وەڵامی سـوێندەکە قرتێـنراوەو، سـیاق دەیگەیەنـێ، کـە بریتیـە لـەوەی زیندووەدەکرێنـەوەو سـزا و پاداشـت چاوەڕێتـان دەکات، وا پێدەچـێ وەڵامـی سـوێندەکە ئەوەبـێ و، باسـی سەرسـووڕمانی کافـرەکان لـە هاتنـی پێغەمبەرێکـی ترسـێنەرو هۆشـدارییدەرکراوە، کـە موحەممـەدە ﷺ.

پاشـان باسـی سەرسـووڕمانی کافـران لـە زینـدوو کرانـەوە کـراوە، خـوای پەروەردگاریـش بـەوە بەرپەرچـی داونـەوە کـە دەزانـێ چـی لـە جەسـتەیان کـەم دەبـێ و تێکـەڵ بـە خـاک دەبێتـەوەو، هەمـوو شـتێکیشی پاراسـتوە، گەردوونیشـی بـە سـەروو خواریـەوە بەوپـەڕی ڕێـک و پێکیـی دروسـتکردوە.

دوایـی خـوا ﷻ سـەرنجیان بـۆ مێـژووی گەلانـی فەوتـاو ڕادەکێشـێ، کـە لـە ئەنجامـی بـە درۆ دانانـی پێغەمبەرانـی خـوادا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)و بڕوانەکـردن بـە پەیامەکانـی خـوا، کـە شایسـتەی ئـەوە بـوون، خـوا سـزایان بـدات، فەوتێنـدراون، باسـی هەشـت لـە گەلـە فەوتێـنراوەکان دەکات.

پاشـان خـوا ﷻ بـە نکووڵییلێکردنـەوە دەپرسـێت: ئایـا لـە بەرانبـەر دروسـتکردنی یەکەمـدا، ئێمـە دەسـتە پاچـە بوویـن؟ تاکـو لـە بەرانبـەر دووبـارە کردنـەوەی دروسـتکردنەوەی ئەوانـدا پەکـمان بکـەوێ و دەسـتە پاچـە بیـن؟ بـەڵام ئـەوان ئەوەی کـە جێـی ئیشـکالە بۆیـان و مایـەی لـێ تێکـەڵ بوونـە بۆیـان، ئەوەیـە جارێکـی دیکـە لـە نـوێ دروسـت بکرێنـەوە، کـە ئەگـەر گوێیـان بـۆ عەقـڵ و لۆژیـک گرتبایـەو، هـەر تۆزێـک قیاسـێکی ڕاسـتەقینەیان کردبایـە، دەیانزانـی کـە کەسـێک، زاتێـک بتوانـێ

لە نەبوون پەیدایان بکات، دەشتوانێ دوای ئەوەی بوونەکەیان لە دەستداوە، جارێکی دیکە بوونیان بۆ بگەڕێنێتەوە:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ
عَجِيبٌ ٢ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ٣ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ
حَفِيظُۢ ٤ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ٥ أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ
كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ٦ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن
كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٧ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ٨ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا
بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ٩ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ١٠ رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ
بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ١١ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ
لُوطٖ ١٣ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ١٤ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي
لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٥﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، قاف سوێند بە قورئانی پایەدارو بەرێز (زیندووکرانەوەو پاداشت و سزا ڕاستن) ﴿١﴾ (ئەی موحەممەد! تۆ بە ناڕاست نازانن)، بەڵکو پێیان سەیر بوو کە ترسێنەرێکیان لە خۆیان بۆ هات و بێبڕوایەکان گوتیان: ئەمە شتێکی سەیرە ﴿٢﴾ ئایا ئەگەر مردین و بووینە خۆڵ (زیندوودەکرێینەوە؟) ئەوە گەڕانەوەیەکی دوورە ﴿٣﴾ بێگومان دەزانین زەوی چی لێ کەمکردوون و نووسراوێکی پارێزەریشمان لە لایە کە هەموو شتێکی تێدا تۆمارکراوە ﴿٤﴾ بەڵکو ئەوان کاتێک هەقیان بۆ هات، بە درۆیان دانا، بۆیە ئەوان گرفتاری (سەرگەردانیی و قسەی) تێکەڵ پێکەڵیی بوون ﴿٥﴾ ئایا تەماشای ئاسمانیان نەکردوە لە سەروویانەوە، چۆن بنیاتمان ناوە و ڕازاندوومانەتەوەو، هیچ کەلێن و کەم و کوڕیی نین ﴿٦﴾ زەویشمان پان و پۆڕ کردوە (و لێکمان کێشاوەتەوەو چیایە) چەسپاوەکانیشمان تێفڕێداون و لە هەموو جۆرە جووت (ڕووەکێک)ی دڵگیرمان تێدا ڕواندوە ﴿٧﴾ (ئەوە هەمووی) بەرچاو ڕوونیی و بیرخستنەوەیە بۆ هەر بەندەیەکی (لە ناخەوە) گەڕاوە (بۆ لای خوا) ﴿٨﴾ هەروەها لەسەرێوە ئاوێکی بە پیزمان دابەزاندوە، ئنجا چەندان باغ و بێستان و دانەوێڵەی درەو کراومان پێ ڕواندوە ﴿٩﴾ دیسان دارخورمایانی بەرز هەڵچوو کە هێشووی ڕیز بەستوویان هەن ﴿١٠﴾ (ئەو میوە و دانەوێڵەیە) بژیوە بۆ بەندەکان و (بەو ئاوە) زەوییەکی مردووشمان پێ ژیاندۆتەوە، هاتنە دەرەوە (ی مردووان و زیندوو کرانەوە)شیان هەر بەو شێوەیە ﴿١١﴾ پێش وانیش گەلی نووح و هاوەڵانی بیرەکەو (گەلی) ثەموود(یش قیامەتیان) بە درۆ دانا ﴿١٢﴾ هەروەها (گەلی) عاد و فیرعەون و برایەکانی لووط ﴿١٣﴾ دیسان هاوەڵانی درەختەکەو گەلی توببەعیش، هەر کامیان پێغەمبەرانی بە درۆ دانا، سەرنجام

هەڕەشەی من (بەسەریاندا) چەسپا ﴿١٤﴾ ئایا لە ئاست دروستکردنی یەکەم دا دەستە پاچە بووین؟ (نەخێر) بەڵام ئەوان لە بارەی دروستکردنەوەی تازەدا لە تێکەڵ پێکەڵیی (دوو دڵیی) دان ﴿١٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْمَجِيدِ): (المَجدُ: السَّعَةُ فِي الكرَمِ وَالجَلاَلِ، والمَجِيدُ، أَي: يُجْرِي السَّعَةَ فِي بَذْلِ الفَضْلِ المُختَصّ بِهِ)، (مَجْد): فراوانییە لە بەخشین و هەیبەتدا، (مَجِید) واتە: ئەو زاتەی کە بە فراوانیی دەبەخشێ و چاکە دەکات، چاکەو بەخشینێک کە تایبەتە بە خۆیەوە، وشەی (مَجِید) بە کوردیی دەبێتە بەخشەر، هەروەها دەبێتە شکۆدار، دیارە بۆ خوای پەروەردگار، واتە: بەخشەری بێ وێنەو شکۆداری بێ وێنە.

(عَجِيبٌ): (مَا لَم يُعْهَد مِثلُهُ) (عَجِیب) واتە: سەیر، سەرسوڕهێنەر، ئەوەیە کە وێنەی وی نەزانرابێ، یاخود وێنەی نەبووبێ پێشتر.

(رَجْعٌ): (الرَّجْعُ: الإِعَادَةُ، العَوْدُ إِلَى الدُّنيَا بَعْدَ المَمَات)، (رَجْع): چاوگە، واتە: گێڕانەوە، کە مەبەست پێی گەڕانەوەیە بۆ دنیا دوای مردن.

(مَّرِيجٍ): (أَصْلُ المَرْجِ: الخَلْطُ، وَالمَرَجُ: الإِخْتِلاَطُ، وَمَرِيج: مُخْتَلِط)، وشەی (مَرْج) لە ئەصڵدا بە مانای تێکەڵکردن دێ و، (مَرَج) بە مانای تێکەڵ بوون، (مَریج) بە مانای تێکەڵ بوو.

(فُرُوجٍ): (الفُروجُ: جَمعُ الفَرجِ، وَالفُرْجَةِ: الشَّقُّ بَيْنَ الشَّيئَينِ كَفُرجَةِ الحَائطِ، فُرُوج، أَي: شُقُوقٌ وَفُتُوقٌ وَصُدُوع)، (فُرُوج) کۆی (فَرْج) و (فَرجَة)یە، کە بە کەلێنی نێوان دوو شتان دەگوترێ، وەک کەلێنی کە لە دیواردا هەیە، (فُرُوج) بە (شُقُوق) و (فُتُوق) و (صُدُوع) واتا کراوە، واتە: کەلێنەکان، بۆشاییەکان،

درزەکان، داوێنی مرۆڤیش کە دەگوترێ: (**فَرج**) لەبەر ئەوەی دەکەوێتە نێوان هەردوو لاقەکانی.

(مَدَدْنَٰهَا): (**أَصْلُ المَدِّ: الجَرُّ، وَمَدَدناها: أَي بَسَطْنَاها**)، وشەی (**مَد**) لە ئەصڵدا ڕاکێشانە، (مَدَدْنَٰهَا) واتە: پانمان ڕاخستوە، کە دیارە ئەوە بۆ چاوی مرۆڤ وا دیارە، ئەگەرنا لە ئەصڵدا زەوی هێلکەییە، مەیلەو خڕە، بەڵام لەبەر ئەوەی پانتاییەکەی زۆرە، بۆیە مرۆڤ هەمووی هەر بە دەشت و، پان دێتە بەرچاو، ئەگەرنا وەختێ بۆ دوور دەڕوانێ، ئەگەر دنیا هەور بێ، تەماشا دەکات لەوسەر هەورەکان بە زەوییەوە نووساون، کە لە ڕاستییدا ئەوە باشترین بەڵگەیە لەسەر خڕێتیی زەوی، هەست دەکات لەلای خۆی هەورەکان لە زەوی دوورن، بەڵام لەولا هەورەکان بە زەوییەوە نووساون، کە دەچێ بۆ ئەوێش، تەماشا دەکات هەر دوورن، بەڵام لەبەر ئەوەی زەوی ئاوها هەڵکەوتوە، کەسێک کە لێرەوە تەماشا دەکات، وادەزانێ هەورەکان گەیشتوون بە زەوی، کە نەشگەیشتوون، بەڵام لەبەر ئەوەی زەوی کوڕبۆتەوە، چاوی وا دەبینێ، هەروەها ئەوانەی بە دەریادا سەفەریان کردبێ، ئەو کەشتیە کە لە دوورەوە دێتە پێشێ، لووتەکەی دیارە، قوتکەکەی دیارە، یان ئەگەر چارۆکەدار بێ، پێشی سەری چارۆکەکەی دیارە، دوایی ئەوی دیکەی دەردەکەوێ، چونکە دەریاش هەر کوڕ دەبێتەوە لەگەڵ هێزی ڕاکێشانی زەویدا.

(رَوَٰسِيَ): (**رَسَا الشَّيءُ، يَرسَو، رَسَّاً، أَي: ثَبَتَ وَأَرسَاهُ غَيرُهُ، وَ (رَوَاسِيَ) جَمعُ رَاسٍ، مِثلُ: فَوارِس وَعَواذِل عَلَى غَيرِ قِياسِ**). (**رَواسِيَ**) دەگوترێ: (**رَسَا الشَّيءُ، يَرسُو، رَسّاً**) واتە: شتەکە چەسپا، دەچەسپێ، چەسپان، (**وَ أَرسَاهُ غَيرُهُ**) واتە: غەیری خۆی شتەکەی چەسپاند، (**رَواسِيَ**) کۆی (**راسِ**)یە، بە ژێر، وەک (**فَوارِس**) کۆی (**فَارِس**) و (**عَواذِل**) کۆی (**عاذِل**)، (**فارِس**) واتە: سوارچاک، (**عاذِل**) واتە: لۆمەکەر، ڕەخنەگر، بەڵام ئەوە بەبێ قیاس، بەو شێوەیە کۆکراوەتەوە.

(زَوۡجِۭ ): (أَي: نَوع، وَصِنْف)، وشەی (زَوْج) لە قورئاندا هەم بە مانای جۆرو پۆل هاتوە، (مِن أَزوَاجٍ شَتَّى) واتە: (مِن أَصنَافٍ شَتَّى)، هەروەها (زَوْج) بە مانای نێر و مێ و، بە مانای جووتیش هاتوە.

(بَهِيجٍ ): (البَهْجَةُ: حُسْنُ اللَّوْنِ وَظُهُورُ السرورِ فِيهِ، بَهُجَ فَهُوَ بَهيج)، (بَهجَة): بە مانای جوانیی ڕەنگ و دەرکەوتنی شادمانیی تێیدا، دەگوترێ: (بَهُجَ فَهُوَ بَهِيج) واتە: جوان بوو، ئەو جوانە، یاخود: ڕەونەقی پەیداکرد، ئەو ڕەونەقدارە، دڵگیرە.

(تَبۡصِرَةً ): (التَّبْصِرةُ: مَصْدَرُ بَصَّرَهُ، وَأَصْلُ مَصدَرِهِ: التَّبصِيرُ، وَالتَّبصِيرُ: جَعْلُ المَرءِ مُبصِراً، وَهُوَ مَجَازٌ فِي إِدرَاكِ النَّفسِ إِدراكاً ظَاهِراً لِلأَمرِ الَّذِي كَانَ خَفِيَّاً)، (تَبْصِرَة) چاوگی (بَصَّرهُ)یە، (بَصَّرهُ) واتە: بینیی، ئەویش ئەصڵی چاوگەکە بریتیە لە (تَبصِير)، واتە: پێ بینین، دەڵێ: (التَّبصِيرُ: جَعلُ المَرءِ مُبصِراً)، (تَبصِير) بریتیە: لەوەی تۆ مرۆڤێک وا لێبکەی ببینێ، ئەمەش لێرەدا مەجازە بۆ دیتنی نەفس، بە دیتنێک بۆ شتێکی ئاشکرا کە لە ئەسڵدا پەنهان و شێردراوە بووە، بەڵام تۆ وا لەو کەسە بکەی، بە ئاشکرا و چاک بیبینێ.

(وَذِكۡرَىٰ ): (إِسمُ مَصْدَرِ: ذَكَّرَ، إِذا جَعَلَهُ يَذْكُرُ مَا نَسِيَهُ)، (ذِكْرَى): ناوی چاوگە بۆ (ذَكَّرَ)، واتە: وەبیری هێنایەوە، ئەگەر کەسێک شتێکی لە بیر چوو بێ و، کەسێکی دیکە وەبیری بێنێتەوە، دەگوترێ: (ذَكَّرَهُ) واتە: خستیەوە بیری، ئنجا (ذِكرَى) ناوی چاوگە لە (ذَكَّرَ).

(مُّبَٰرَكٗا ): (إِسمُ مَفعُولٍ، الَّذي جُعِلَ فِيهِ البَرَكَةَ)، (مُبَارَك): (اسم مفعول)ە، بۆ شتێک کە بەرەکەتی تێدا خراوە، بەرەکەتیش واتە: خێرێکی زۆر، واتە: پیرۆزدارکراوە.

(وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ): (حَب) بە مانای دانەوێڵە دێ، کە دیارە ناوی جینسە، تاکەکەی (حَبَّة)یە، ئنجا دەگوترێ: (حَبَّةُ الشَّعيرِ، حَبَّةُ الرُّزِ، حَبَةُ الحِنطَةِ، حَبَّةُ الذُّراةِ)، واتە: دەنکی جۆ، دەنکی برنج، دەنکی گەنم، دەنکی ذورات (حَصيد) یش (فَعيل)ی بە مانای (مَفعول)ە، (أَي: مَحصُود، أَي: حَبَّ الزَّرعِ المَحصُود، أَي:

**المَقطُوع مِن جُذُورِهِ لأَكْلِ حَبِّهِ**)، واتە: دانەوێڵەی کشتوکاڵێک کە دەدروێتەوە، واتە: لە ڕیشەوە دەبڕدرێ، بۆ ئەوەی دانەکەی بکەوێتە بەردەست، ئنجا ئەگەر گەنمە، جۆیە، نیسکە، نۆکە، برنجە، زوراتە، هەرچی هەیە.

(بَاسِقَاتٍ): (**أَي: طَوِيلَاتٍ، عَالِيَاتٍ**)، واتە: درێژو بەرزهەڵچوو، دەگوترێ: (**بَسَقَ فُلانٌ عَلَى أَصْحَابِهِ: أَي: عَلاهُم**) واتە: لەوان بڵندتر بوو، (**وَالباسِقُ هُوَ الذَّاهِبُ طُولاً مِن جِهَةِ ارتِفاعٍ**)، (**باسِق**) واتە: بەرزهەڵچوو، کە بە باری سەرەوەدا، بە باری لای سەرێدا بەرز هەڵچێ.

(طَلْعٌ): (**طَلْعُ النَّخْلِ: مَا طَلَعَ مِنْهَا**)، ئەوەیە کە لە دارخورمایەکە دێتە دەرێ، واتە: میوەو بەر، دەگوترێ: (**أَطْلَعَتِ النَّخْلُ أَوَّلَ ما يُظْهِرُ مِنْ ثَمَرِ التَّمْرِ، وَهُوَ فِي الكُفَّرَى، أَي: غِلَافِ العُنقُود**)، (طَلْعٌ): دەگوترێ: (**أَطْلَعَتِ النَّخْلُ**) دارخورمایەکە بەری دەرکرد، یەکەمین شتێک کە لە خورما دەردەچێ کە لە کیفەکەیدایە، پێی دەگوترێ: (**كُفَّرَى**)، واتە: کیفی هێشوەکە، پێش ئەوەی هێشوەکە کیفەکەی بقڵێشێ، لە شتێکدایە، پێی دەگوترێ: (**طَلْع**).

(نَّضِيدٌ): (**أَي: مَنضُود: مُصَفَّفٌ بَعْضُهَا عَلَى بَعْض، مَادَامَ فِي الكُفَّرَى**)، واتە: ڕیزکراو هەندێکی لەسەر هەندێکی هەتا لە کیفەکەدابێ پێی دەگوترێ: (**نَضِيد**)، بەڵام دوای ئەوەی دەردەچێ، هەر هێشوە بە لایەکدا دەچێ، مەرج نیە ئەو ڕیزبوونەی جارانی بمێنێ.

(أَفَعَيِينَا): ئایا ئێمە دەستە پاچە بووین؟ دەڵی: (**الإِعْيَاءُ: عَجْزٌ يَلْحَقُ البَدَنَ مِنَ المَشْيِ وَالعِيُّ: عَجْزٌ يَلْحَقُ مِن تَوَلِّ الأَمْرِ وَالكَلامِ**)، (**إعياء**): بریتیە لە بێ توانایییەک کە بەسەر جەستە دێ، لە ئەنجامی ڕۆیشتندا، کە پێی دەگوترێ: ماندوو بوون، شەکەتیی، بەڵام (**عِي**) بریتیە لە شەکەتیی و، یاخود دەستە پاچەییەک، بەسەر کەسێک دێ، کە کارێکی پێ سپێردراوە، کارێکی لە ئەستۆ گرتوە، یاخود قسەکردنی لە ئەستۆ گرتوە، نە کارەکەی بۆ دەکرێ و نە قسەکانی چاک بۆ دێن.

(لَبْسٍ): (أَصْلُ اللَّبسِ: سَتْرُ الشيَّءِ، ذلِكَ فِي المَعانِي، يُقالُ: لَبَسْتُ عَلَيْهِ أَمرَهُ، أَي: خَلَطَّتُ وَلابَسْتُ فُلَاَنَاً، أَي: خَالَطْتُهُ)، (لَبْس): لە ئەصڵدا، واتە: داپۆشینی شتێک، ئەمە هەر بۆ شتی بەرهەست بەکارنایەت، بەڵکو بۆ شتی مەعنەویش بەکاردێ، دەگوترێ: (لَبَستُ عَلَيهِ أَمرَهُ) واتە: کارەکەیم لێ تێکەڵ کرد، سەرم لێ تێکدا، دەگوترێ: (لابَستُ فُلاناً: أَي خالَطتُهُ) واتە: تێکەڵییم لەگەڵدا کرد.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم کارەم دەست پێدەکەم، دەست پێکردنی ئەم کارەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە، کاتێک مرۆڤ دەڵێ: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بەلای کەمەوە دەبێ چوار واتایان لە عەقڵ و دڵی خۆیدا ئامادە بکات:

١- ئەو کارە بە ناوی خواوە دەستی پێدەکەم.

٢- ئەو کارە بۆ خوا ئەنجامی دەدەم.

٣- ئەو کارە بەپێی بەرنامەی خوا ئەنجامی دەدەم.

٤- ئەو کارە بە ئاسانکاریی و تواناو وزەیەک کە خوا پێم دەداو، بۆم دەڕەخسێنێ، ئەنجامی دەدەم.

﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، سێ سوورەت لە قورئاندا بە یەک پیت دەست پێدەکەن، ئەمە یەکێکیانە، سوورەتی (ص)یش پێشتر ڕابردو، سوورەتی (القلم) یش کە بە (ن) دەست پێدەکات، دواتر دێ، واتە: لە قورئاندا تەنیا ئەم سێ سوورەتە بە یەک پیت دەست پێدەکەن، لە پیتە پچڕ پچڕەکان، ژمارەیەک لە سوورەتەکان بە دوو پیت دەست پێدەکەن، کە (حم)ەکانن، ژمارەیەکیان بە سێ

پیت دەست پێدەکەن (**ألم**)ەکان و (**ألر**)یەکان، (**طسم**)ەکان، هەندێکیشیان بە چوار پیت دەست پێدەکەن، تەنیا دووانیشیان بە پێنج پیت دەست پێدەکەن کە سوورەتی (**مريم**)ن، بە (**كهيعص**) و سوورەتی شوورا (**حم عسق**).

پێشتر زۆر لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە قسەمان کردوە، بە تایبەتی لە سەرەتای سوورەتی (**يونس**)دا، کە ئەو پیتە پچڕ پچڕانە لەسەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئان دا هاتوون، زانایان لە بارەی حیکمەتی هاتنی ئەو پیتانەوە زۆر قسەیان کردوە.

**أ-** هەندێکیان گوتوویانە: تەنیا بۆ ئاگادار کردنەوەیە.

**ب-** هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە نهێنییەک بووە لە نێوانی خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ.

**ج-** هەندێک گوتوویانە: ئەوە شتێکی زاندراو بووە لە زمانی عەرەبیدا کە بە پیتێک، یان بە چەند پیتێک نامەکانیان دەست پێ بکەن، هەر بۆیەش بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەیان لەوە نەگرتوە، دەبێ شتێکی زاندراوو باو بووبێ.

**د-** هەندێک گوتوویانە: هەر خوا دەزانێ مەبەست پێی چییە.

بەڵام باشترین مانایەک کە تێکناگیرێ لەگەڵ ئەو شتانەدا کە گوتران، ئەوەیە کە بڵێین، خوا ﷻ دەیەوێ بە ئێمەی مرۆڤ بفەرموێ: ئەو قورئانەی، ئەو فەرمایشتە کە لەبەر دەستی ئێوە دایە، کە لە (١١٤) سوورەت پێکهاتوەو، لە (٦٢٣٦) ئایەت پێکهاتوەو، لە (٧٧١٨٠) وشە پێکهاتوەو، لە (٣٢١٤٣٩) پیت پێکهاتوە، ئەو پیتانە، ئەو دەنگانە ئێوە ڕۆژانە قسەیان پێدەکەن و بەکاریان دێنن بۆ خوێندن و نووسینتان، بەوە ڕا بزانن کە ئەم فەرمایشتە هی خوایە ﷻ کە لەو پیت و دەنگانەی لەبەر دەستی ئێوەشدا، هەن وەک کەرەستەیەک، بەڵام قورئانێکی دەستەوسانکەری لێ دروست کردوون، کە ئێوە نەک هەر ناتوانن وێنەی قورئان بێنن، بەڵکو وێنەی دە (١٠) سوورەتی، یان سوورەتێکیشی

بێنن، کەواتە: بزانن ئەو فەرمایشتە فەرمایشتی خوایە ﷻ کە هەر لەو پیت و دەنگانەی لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن پێکی هێناوە.

﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، سوێند بە قورئانی بەخشندە، سوێند بە قورئانی خاوەن ئەوپەڕی کەرەم و بەخشش، خاوەن ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت، سوێند بە قورئانی شکۆدار (شکۆمەند)، پایە بەرز، وەڵامی سوێندەکە چیە؟

وەڵامی سوێند زۆرجار لە قورئاندا قرتێنراوە، بۆ ئەوەی زەینی مرۆڤ بۆ هەر شتێک بچێ، کە لەگەڵ ئەو سیاقەدا بگونجێ، یان جاری واهەیە ئاشکرایە، ئێستا ئەم سوورەتە هەمووی باسی زیندووبوونەوەو سزاو پاداشت و هاتنی ڕۆژی دواییە، کەواتە: سوێند بە قورئانی بەڕێز، خاوەن ڕێزو حورمەت و پایەدار، ئێوە زیندوودەکرێنەوەو لێتان دەپرسرێتەوەو سزاو پاداشت چاوەڕێتان دەکات، یاخود سوێند بە قورئانی پایەدارو خاوەن ئەوپەڕی کەرەم و بەخشش، ئەم قورئانە بێژەرەکەی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە.

﴿بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ﴾، بەڵکو سەریان سووڕما کاتێک هەر لە خۆیاندا ترسێنەرێکیان بۆ هات، ئەمە گواستنەوەیە لە قسەیەکەوە بۆ قسەیەکی دیکە، واتە: نەک هەر بڕوایان پێنەهێنا، بەڵکو سەریان سووڕما کە لە خۆیان وریا کەرەوەو ترسێنەرێکیان بۆ بێت، ﴿فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، وشەی ﴿ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: **(فَقالُوا هَذَا شَيءٌ عَجِيب)**، بەڵام بۆ ئەوەی بزانرێ کە ئەوانە بەهۆی کوفرو بێبڕواییەوە، بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم نەکردوە ﷺ، ئەوە کە لە خۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ بێت، وریایان بکاتەوەو ترسیان بداتە بەر، سەریان سوڕمێنێ، ئەوەی وایلێکردوون سەریان لە ئاست شتێکدا سووڕ بمێنێ، کە هەر ئەوە لە خوای کارزان و کاربەجێ چاوەڕێ دەکرێ، کە مرۆڤەکان بەندەکانی وێڵ نەکات و پشتگوێ نەخات، بەبێ ئاگادارکەرەوەو، بەبێ ترسێنەرو وریا کەرەوە،

ئـەوەی وای لێکـردوون سـەریان لـەو شـتە سـوورِ بمێنـێ کـە شـتێکی زۆر مەنتیقییـە، بێبڕواییەکەیـان بـووە.

﴿ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابًاۖ ﴾، ئەمـە بەپێـی سیاق دەزانـرێ کـە ئەمـە قسـەی کافرەکانـە، گوتیـان: ﴿ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابًاۖ ﴾، ئایـا کاتێـک کـە مردیـن و بووینـەوە خـۆڵ، بووینـەوە گڵ، ئـەوەش هـەر قرتێـنراوە، یـانی: (أَنُبْعَـثُ)، ئایـا زیندوودەکرێینـەوە؟ ﴿ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ﴾، ئـەوە گێڕانەوەیەکـی دوورە، واتـە: زۆر دوورە ئـەوە لـە عەقڵـەوە کـە ئێمـە دوای ئـەوەی بووینـەوە خـۆڵ، جارێکـی دیکـە زیندووبکرێینـەوە، نازانـن کـە کاتی خـۆی تەنانـەت خۆڵیـش نەبـوون و هـەر نەبـوون، وەک خـوای پـەروەردگار لـە سـوورەتی (الإنسـان)دا دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١ ﴾، واتـە: بـە تەئکیـد کاتێـک بەسـەر مرۆڤـدا هـات، کـە شـتێکی شـایانی بـاس نەبـوو، شـتێکی باسـکراو نەبـوو، نـاوی لـە کوولەکـەی تـەڕدا نەبـوو، خوایـەک کـە لـە نەبـوو، ئێـوەی هێناوەتـە دی، ئێسـتا دوای پەیدابـوونی بوونتـان، بـەڵام مردنتـان و جیابوونـەوەی ڕووحتـان لـە جەسـتەتان، جەسـتەکەتان دەچێتـەوە ئـەو شـوێنەی لێـی دروسـت بـووە، کـە خاکـە، ڕووحەکـەش دەچێتـەوە شـوێنێک کـە خـوا دەزانێـت، پێشـێ نـە ڕووح و نـە جەسـتە بـووە، ئێسـتا جەسـتەکەش هەیـە، بـەڵام لـە خـاک دایـە، ڕووحەکـەش هەیـە، بـەڵام لـە لای خوایـە، لـەو شـوێنەیە کـە خـوا دەیزانـێ، کاتـێ خـوا ئێـوەی دروسـت کـرد، نـە ڕووحتـان هەبـوو، نـە جەسـتەتان هەبوو، ئێسـتا هەردووکیانتـان هەیـە، بـەس لـە یـەک جیـان.

﴿ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمە زانیمان ئەوەی زەوی لـێ کـەم کردوونـەوە، کـە جەسـتەکە تێکـەڵ بـە خـاک دەبێتـەوە، خـوا دەزانـێ هەمـوو گـەردو گەردیلـەکانی جەسـتەی ئـەو مرۆڤـە چـۆن پـرژو بڵاودەبـن، چـۆن زەوی لێیـان کـەم دەکاتـەوە، دەیخـوات و دەیگۆڕێتـەوە بـۆ خـاک، ﴿ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴾، لـە لای ئێمـە نووسراوێکـی پارێـزەر هەیـە، خـوا ﷻ هەمـوو شـتێکی تێدا پاراسـتووەو تۆمارکـردوە، کـە مەبەسـت پێـی (اللَّـوح المَحفـوظ)ە، واتـە: تەختـی پارێـزراو، کـە بـە

(كِتابٍ مُبِين) بە (لَوحِ مَحفوظ)، بە (إمامٍ مُبِين)، بەهەمـوو ئـەو تەعبیرانـە هاتـوە، هەندێـک دەڵێـن: دروسـتکراوێکی خـوا خۆیـەتی، هەمـوو زانیارییـەکانی خـۆی لـە بـارەی دروسـتکراوەکانیەوە تێـدا تۆمـار کـردوون، هەندێکیـش دەڵێـن: ئـەوە ڕەمـزو هێـمای زانیاریـی بـێ سـنووری خوایـە، کـە مـن مانـای دووەمیانـم زیاتـر بـە دڵـەوە دەنووسـێ.

هەڵبەتـە ئەگـەر خـوا ﷻ زانیارییـەکانی خـۆی تۆمـار کردبـن، لـە دروسـتکراوێکی خۆیـدا، هیـچ شـتێک ڕێگـری لـەوەش نـاکات، گرنـگ ئەوەیـە خـوا ﷻ پێیـان دەفەرمـوێ: دەزانیـن زەوی چییـان لـێ کـەم دەکات، نووسراوێکـی پارێزەریشـمان لەلایـە، بۆیـە زیندووکرانەوەیـان لـەو جەسـتە خاکییـەی کـە پـرژو بڵاو بۆتـەوە، یـان سـووتاوە، بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان، ئـەو جەسـتەیە نەمـاوە، ئـەو ڕووحـەش کـە بۆیـان دروسـتکراوە، بـۆ خـوای پـەروەردگار ئاسـانە، ئەگـەر هـەر بـە عەقڵ و مەنتیق تەماشـای بکەیـن.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، واتـە: هـۆی بێبڕواییەکەیـان ئەوەیـە کـە بێبـڕوا بـوون بـە هـەق، دوایـی ئـەوەی بۆیـان هـات، ئـەو هەقـە بریتیـە: لـە قورئـان و: لـەو پەیامـەی خـوا بە پێغەمبـەری خاتەمـدا ناردوویـەتی ﷺ، ﴿ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴾، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ئـەوان تـووشی کارێکـی تێکـەڵ و پێکـەڵ بـوون، (مَرِيج: أَي مُضطَرِب، أَي مُختلط)، واتـە: لەسـەر حاڵەتێـک ڕاناوەسـتن، هـەر لە جووڵـە جووڵدان، هـەر لـە دڵ لـە دڵـدان، هـەر جـارە قسـەیەک دەکـەن لـە بـارەی قورئانـەوەو، لـە بارەی پێغەمبـەرەوە ﷺ جارێـک بـە قورئانیـان دەگـوت: جادوویـە، جارێک دەیانگوت: شـیعرە، جارێـک دەیانگـوت: کەهانەیـە، پێغەمبەریـان ﷺ جارێـک بـە جادووگـەر، جارێـک بـە شـاعیر، جارێـک بـە کاهیـن ناوزەنـد دەکـرد، جارێـک بـە شـێت!!

﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَـٰهَا وَزَيَّنَّـٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾، وەک پێشـتریش ئامـاژەم پێـدا لـە تەفسـیرەکاندا، نەمدیـوە ئـەم ئایەتانـەو ئایەتـەکانی

ئایەتەکانی دوایی، بە بۆچوونی من باش لەگەڵ ئایەتەکانی پێشێدا پەیوەست بکرێنەوە، بەڵام بێگومان قورئان هەموویان وەک ئاڵقەکانی زنجیر یەکدی دەبەستنەوە، بەڵام دیارە دەبێ باش سەرنج بدرێ: چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست بوونەوەی ئایەتەکان چۆنە؟ زۆرجار گەلێک نهێنیی و حیکمەت لە چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست کردنی ئایەتەکاندا دەردەکەون.

لێرەدا دوایی ئەوەی خوا ﷻ باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایانی کرد، لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺو، لە بارەی قورئانەوە، هەروەها لە بارەی زیندووکرانەوەوە، کە تەوەری سەرەکیی ئەم سوورەتە موبارەکەیە، هەروەها باسی نکووڵیلێکردنیانی کرد، کە زیندوونابنەوە، لەبەر ئەوەی دەبنەوە بە خاک و جەستەیان پرژ و بڵاودەبێتەوە بە زەویداو، گوتیان: ئەوە گێڕانەوەیەکی دوورە، دوای ئەوەی خوا ﷻ دوو بەڵگەی لەو بارەوە بۆ هێنانەوە:

**یەکەم:** ﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ﴾، زانیومانە زەوی چی لێ کەم کردوونەوە لە جەستەیان.

**دووەم:** ﴿ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌ ﴾، نووسراوێکی پارێزەریش لەلای ئێمە هەیە.

ئنجا هۆکاری ڕاستەقینەی بێبڕوایی ئەوانی خستەڕوو کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، هۆی نکووڵییکردنیان لە زیندووکرانەوە، ئەوەیە بڕوایان بەو هەقە نیە، کە بۆیان هاتوە، واتە: بەر لەوەی بێبڕوابن بە زیندووبوونەوەو زیندووکرانەوە، بێبڕوان بە وەحیی و پەیامی خوا، ئەگەر سەرنجی وەحیی و پەیامی خوایان دابایەو، سەرنجی پێغەمبەری خوایان دابایە ﷺ، ئەو کاتە حاڵیی دەبوون کە چۆن زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت، شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکراو بەڵگە نەویستە، شتێکی حەتمییە و دەبێ هەر ببێ، لە ئەنجامی بێبڕواییاندا بەو هەقەی بۆیان هاتوە، تووشی کارێکی تێکەڵ و پێکەڵ بوون، هەر جارەو قسەیەک دەکەن، ئنجا خوا ﷻ جارێک سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ گەردوون، بۆ

بوونـەوەرو دەوروبەریـان، کـە پـڕن لـە نیشـانەکانی خـوا و، ئـەوە دەگەیـەنـن، کـە خـوا ئـەم گەردوونـەی زۆر بـە ڕێـک و پێکـی دروسـتکردوە، کەواتـە: خوایـەک کـە ئـەم گەردوونـەی بەوپـەڕی ڕێـک و پێکیـی و یاسـاداریی و سیسـتماتیک دروسـت کـردوە، ناگونجـێ ژیـانی مـرۆڤ لـەو ڕێـک و پێکیـی و یاسـایە، بـەدەر بێـت، لـەو حاڵەتـە سیسـتماتیک و مونـەززەم و ڕێـک و پێکییـە، بـەدەر بێـت، ئەگـەر مـرۆڤ لەسـەر زەوی بژیـی و چاکـەکاران چاکەکاریـی بکـەن، خراپـەکاران خراپەکاریـی بکـەن، بـەڵام کـەس پاداشـتی چاکـەکان نەداتـەوە و کـەس سـزای خراپـەکان نـەدات، کەواتـە: ژیـانی مـرۆڤ ناڕێـک و پێکیـی و نایاسـایی و، ناسیسـتماتیکیی تێکـەوت، بـەڵام گـەردوون هەمـووی ڕێـک و پێکـە، کەواتـە: ژیـانی بەشـەریش دەبـێ ڕێـک و پێـک بـێ، ئنجـا کاتێـک ژیـانی بەشـەر ڕێـک و پێـک دەبـێ، ئـەم ژیانـە دنیاییـە قۆناغێکـی دیکـەی بەدوادابـێ و، سـزا هەبـێ بـۆ خراپـەکاران و پاداشـتیش بـۆ چاکـەکاران!

بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ئایـا سـەرنجی ئاسـمانیان نـەداوە لـە سـەرووی خۆیانـەوەو، چەنـد دیمەنێکیـان بـۆ دەخاتـە ڕوو، دواییـش جارێکـی دیکـە سـەرنجیان ڕادەکێشـێ بـۆ مێـژوو، دوای ئـەوەی سـەرنجیان ڕادەکێشـێ بـۆ کتێبـی گـەردوون، دوایـی سـەرنجیان ڕادەکێشـێ بـۆ کتێبـی مێـژوو، کـە ئەگـەر تەماشـای مێـژووش بکـەن، گەلـە فەوتـاوەکان کـە هەشـتیان لێـرەدا بـە نموونـە بـۆ دێنێتـەوە، بڕوایـان بـە پێغەمبـەرانی خـوا و بـە پەیامـی خـوا نەبـوو، خـوا سـزای دان.

کەواتـە: ئـەو دنیایـە شـاری بـێ خـاوەن نیـە، ئـەم ژیانـە خاوەنێکـی هەیـەو، سەرپەرشـتیارێکی هەیـە، ئەوەتـا کەسـانێک کـە ویسـتوویانە ئـەو ژیـانی دنیایـە تێکبـدەن، بەهـۆی بێبڕوایـی بـە پێغەمبـەرانی خـواو بـە پەیامـی خـوا، خـوا سـزای داون، کەواتـە: بزانـن کـە ئـەو ژیانـە دنیاییـە خاوەنێکـی هەیـەو، ئـەو ژیانـە دنیاییـە ژیانێکـی دیکـەی بـەدوادا دێ، کـە سـزاو پاداشـت بـۆ مرۆڤـەکان دێتـە ئـاراوە، لەسـەر بناغـەی شـێوەی ژیانیـان لـەم دنیایـەدا.

دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا ﴾، ئایا تەماشای ئاسمانیان نەکردوە لە سەروویانەوە، چۆنمان بەرز کردۆتەوەو چۆنمان بنیات ناوە؟ ﴿ وَزَيَّنَّٰهَا ﴾، چۆن ڕازاندوومانەتەوە، ﴿ وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾، هیچ کەلێن و کون و کەم و کوڕیی تێدانییە، ﴿ فُرُوجٍ ﴾، کۆی (فَرج)ە، وەک پێشتر گوتمان: بە مانای کەلێن و درزو تیک دێ، هیچ کەلێن و تیک و درزو ناڕێکیی تێدانییە.

﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا ﴾، هەروەها ئایا سەرنجی زەوییان نەداوە؟ یانی: (**أَفَلَم يَنْظُرُ إلى الأَرضِ**)، یان (**أَفَلَم يَتَأَمَّلُوا الأَرضَ**)، ئایا تەماشای زەوییان نەکردوە؟ چۆنمان لێکردوە؟ ﴿ مَدَدْنَٰهَا ﴾، یاخود (**الأَرضَ**) بۆیە حاڵەتی نەصبی وەرگرتوە، بە (**مَدَدنا**)، یانی: (**وَالأَرضَ مَدَدنَهَا مَدّاً**)، زەویشمان پان ڕاخستوەو، درێژمان کردۆتەوە لەبەر چاوی ئێوە، ﴿ وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ ﴾، چیا چەسپاوەکانمان تێدا تێفڕێداون، ﴿ رَوَٰسِىَ ﴾، وەک گوتمان: کۆی (**رَاسِ**)ە، وەک (**فَوارِس**) کۆی (**فارِس**)ە، ئنجا ﴿ رَوَٰسِىَ ﴾، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**وَأَلقَينا فِيها جِبالاً رَواسِيَ**)، چیایە چەسپاوەکانمان تێفڕێداون، بۆچی دەفەرموێ: تێمان فڕێداون؟ ئەوە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا تیشکی دەخەینە سەر، کاتی خۆی لە سوورەتی لوقمانیشدا باسمان کرد.

لە ڕاستییدا چیایەکان بۆیە خوا ﷻ وشەی (**أَلقَينا**)ی واتە: فڕێمان داونە زەوی، ئەو وشەیەی بەکار هێناوە، لەبەر ئەوەی چیایەکان لەو ئاگر پرژێنانە پەیدابوون، کە لە ناخی زەویدا ئاگر پرژێنەکان دەرقوڵیون، زۆر بەرزبوونەوەو دوایی هاتوونەوە، وەک ئێستاش هەر هەن، ئاگر پرژێنی وا هەیە ئێستاشی لەگەڵدابێ کە ناخیی زەوی لە چاو جاران زۆر ساردتر بۆتەوە، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدابێ ئاگر پرژێنی وا هەیە، چەند کیلۆمەترێک ئاگر فڕێ دەدات، ئاگرو ئاسن دوایی دێتەوە، ئەمەش ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە.

﴿ وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ ﴾، چیا چەسپاوەکانمان تێ فڕێداون، ﴿ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾، تێماندا ڕواندوە لە هەر جۆرە ڕووەکێکی دڵگیر، ﴿ بَهِيجٍ ﴾، واتە: جوان، بە ڕەونەق، ڕەونەقدار، دڵخۆشکەر.

﴿ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ ﴾، هەم بۆ بەرچاو ڕوونییە، هەم بۆ بیرخستنەوەیە، واتە: ئەوەی باسی دەکەین، یاخود ئەو ڕووەکە بە ڕەونەق و دڵگیرو جوانانە، ئنجا لە جۆرەکانی دارو درەخت و میوە، لە جۆرەکانی دانەوێڵە، لە جۆرەکانی تەرەکار، لە جۆرەکانی سەوزە، هەموو ئەوانە کە زۆر دیمەنێکی جوان و سەرنج ڕاکێشیان هەیەو، دیمەنێکی دڵخۆشکەریان هەیە، هەمووی بۆ بیرخستنەوەیە بۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ مرۆڤەکان، هەروەها بۆ بیرخستنەوەیانە، بۆ کێ؟ ﴿ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴾، بۆ هەر بەندەیەکی لە ناخەوە گەڕاوە بۆ لای خوا، (**مُنِيب**) یانی: (**الرَّاجِعُ إِلَى اللهِ مِن قَلْبِهِ**)، کە لە دڵەوە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە.

﴿ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا ﴾، لە سەرێوەش ئاوێکی بەپێزمان دابەزاندوە، هەمیشە لە قورئاندا خوا باسی (ماء) دەکات، جار جارێک ئەگەر باسی (**غَيْث**)، یان باسی (**وَدق**) یان باسی (**بَرَد**) بکات، بە زۆریی باسی (ماء) دەکات، لەبەر ئەوەی ئاو هەر سێ حاڵەتی شل و ڕەق و، مەیلەو لە نێوانی شل و ڕەقدا، کە بەفرە، دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ئاو، واتە: باران و بەفرو تەرزە، هەر سێ حاڵەتەکان دەگرێتەوە، هەر سێکیان ئاون، بەڵام هەرجارە لە شێوەیەکدا، لە شێوەی باران، لە شێوەی بەفرو، لە شێوەی تەرزەدا، بەڵکو ئاونگ و هەڵمی ئاویش هەر دەگرێتەوە، ﴿ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا ﴾، ئاوێکی بەپێز، (**مُبارَكاً**) بەرکار (**مَفعُولُ بِه**)یە، یانی: (**الَّذِي جُعِلَ فِيهِ البَرَكَة**)، ئاوێک کە پیت و پێزی تێخراوە، خێرێکی زۆری تێخراوە، بە بەڵگەی ئەوە کە هەر بەو ئاوە هەرچی ڕووەکە دەڕوێت و، هەر لە پنجە گیایەکەوە بگرە، هەتا هەموو جۆرەکانی سەوزە، هەموو جۆرەکانی تەرەکار، هەموو جۆرەکانی دانەوێڵەکان، هەموو جۆرەکانی دارو درەخت و میوەکان، هەموویان بەو ئاوە دەڕوێن، لەبەر ئەوەی ئاوێکی بە بەرەکەتە، ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ ﴾، پێمان ڕواندوە، بەو ئاوە بەپێزە، ﴿ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴾، هەموو جۆرە باغ و بێستانەکان، هەموو جۆرە دانەوێڵەکان کە دەدوورێنەوە، (**حَبّ**) بە مانای دانەوێڵەیە، ﴿ ٱلۡحَصِيدِ ﴾، لەسەر کێشی (**فَعِيل**)ە،

بەڵام بە مانای مەفعوولە، واتە: (**حَبَّ الزَّرعِ المَحصُود**)، یان (**مَقطُوع**)، دانەوێڵەی ئەو کشتووکاڵەی کە دەدوورێتەوە، کە دوایی هەم دانەکەی بۆ مرۆڤەکانە، هەم کایەکەشی و پووش و پەڵاشەکەشی، خۆراکە بۆ ئاژەڵەکانیان.

﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ ﴾، هەروەها پێمان ڕواندوە بەو ئاوە، دارخورما بەرز هەڵچووەکان، ﴿ بَاسِقَٰتٖ ﴾، کۆی (**باسِقة**)یە، واتە: بەرز هەڵچوو، (**النَّخلَةُ البَاسِقَة**)، (**وَالنَّخلُ البَاسِقَات**)، واتە: دارخورمایەک کە بەرز هەڵچووەو، دارخورماکان کە بەرز هەڵچوون، ﴿ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴾، بە ڕێکی ڕیز بەستوویان هەیە، (**طَلع**) بە بەرو میوەی دارو درەخت دەگوترێ، بەڵام بە نیسبەت خورماوە، یەکەم جار کە میوەکەی دەردەچێ پێی دەگوترێ: (**طَلع**)، کە لە ڕاستییدا کیفێکە هێشووەکانی دار خورمایەکەی لە نێو خۆوە گرتوون، (**کُفُرَّی**)ی پێ دەڵێن، ئنجا ئەو کیف و بەرگە، دوایی لە قۆناغێکی دیارییکراودا دەقڵیشێ و هێشووە خورمایەکان دێنە دەرێ، (**نَضِید**)یش بە مانای (**مَنضُود**)ە، یانی: (**متراکب**) لەسەر یەک کەڵەکە بوو، ڕیز بەستوو.

﴿ رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِ ﴾، هەمموو ئەوەمان بە ئاوە بەپێزە دەرهێناوە، کە هەمووی ببێتە بژێو بۆ بەندەکان و، بۆ مرۆڤەکان، خوا مشووری لە بەندەکانی خواردوە، ﴿ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗا ﴾، هەروەها بەو ئاوە بەپێزە زەوییەکی مردووشمان پێ ژیاندۆتەوە، ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ﴾، دەرچوونیشتان بە هەمان شێوەیە، واتە: جارێکی دیکەش دەرچوونتان لە زەویی و زیندووکرانەوەتان لە زەویدا، کە پێتان شتێکی زۆر دوورە، دەڵێن: ﴿ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ﴾، هەروەک ئەو دەرچوونەی ئەو کشتوکاڵ و دانەوێڵەو ئەو هەمموو دارو درەخت و میوەیە وایە، کە پێش ئەوەی ئەو ئاوە لە شێوەی باران و بەفرو تەزرەدا، بێتە سەر ڕووی زەوی، هیچ شتێک دیار نیە، لەو سەر پارچە زەوییە، بەڵام دوایی تەماشا دەکەی پڕ دەبێ لە گیاو گوڵ و سەوزەو میوەو تەڕەکارو دانەوێڵە، کەواتە: دەرچوونیشتان جارێکی دیکە و لە زەوی دەرهێنانتان هەر بەهەمان شێوەیە.

ئنجا خوا ﷻ سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ﴾، لە پێش ئەواندا واتە: پێش کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ گەلی نووح پێغەمبەری خوایان بە درۆ داناو، پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، پەیامی خوایان بە درۆ داناو، پێی بێبڕوا بوون، هەروەها خاوەنانی بیرەکە، یان خاوەنانی چاڵەکە یان شیوەکە، هەروەها گەلی سەموود کە پێغەمبەرەکەیان صاڵح بوو (عَلَيْهِ السَّلام) و، گەلی عاد کە پێغەمبەرەکەیان هوود بوو (عَلَيْهِ السَّلام) و، فیرعەون و دەست و دایەرەکەی کە مووسا (عَلَيْهِ السَّلام) و هاڕوونی برای (عَلَيْهِ السَّلام) بۆ لایان ڕەوان کرابوون و، برایەکانی (لووط)یش کە مەبەست پێی گەلی لووطە، لەبەر ئەوەی زۆر هاوەڵ و هاودەمی بوون، ئەگەرنا لووط عیبرانیی بووە، بەڵام ئەوان کەنعانیی بوون و، لووط بۆ لایان ڕەوانکراوە، بە تایبەت هەردوو شاری سەدووم و عەمووڕە، ئەوانیش پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ دانان.

﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ﴾، هەروەها خاوەنانی درەختە چڕ و پڕەکە، یاخود خاوەنانی باخە چڕو پڕەکە، کە گەلی شوعەیبن، ﴿وَقَوْمُ تُبَّعٍ﴾، هەروەها خەڵکی توببەع کە دیارە ئاگادارکەرەوەکەیان دەبێ ناوی توببەع بووبێ، پێشتر باسمان کرد لە تەفسیری سووڕەتی (الدخان)دا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قسە بە توببەع مەڵێن، لەبەر ئەوەی خواناس و بڕوادار بووە، بەڵام خەڵکەکەی بێبڕواو خراپەکار بوون، ئەم هەشت گەلە: ١-گەلی نووح و ٢-خاوەنانی بیرەکە و ٣-گەلی سەموودو ٤-گەلی عادو ٥-فیرعەون و، ٦-گەلی لووط، ٧-هەروەها خاوەنانی درەختەکەو ٨-گەلی توببەع، ئەو هەشتە، ﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ﴾، هەر کامێکیان پێغەمبەرانی بە درۆ دانا، هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، ئنجا هەر کامێکیان تەنیا پێغەمبەری خۆی بە درۆ داناوە، بەڵام هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، پێغەمبەرانی پێش خۆی و دوایی بە ڕاست داناوە، کەواتە: هەر کەسێک بڕوای بە یەکێک لە پێغەمبەران نەبوو بێ صەڵات و سەلامی خوایان

لەسەر بێ، لەبەر ئەوەی پەیامی پێغەمبەران هەمووی یەک بووە، لە هێڵە گشتییەکان و لە جەوهەرو نێوەڕۆکیشدا، هەر کەسێ بڕوای بە هەر کامیان نەبێ، وەک ئەوە وایە بڕوای بە هیچیان نەبووبێ، ﴿فَحَقَّ وَعِيدِ﴾، بۆیە هەڕەشەی من لەسەریان پێویست بوە، یانی: (فَحَـقَّ وَعِيـدِي)، بەڵام (ي)ەکە قرتێنراوەو بە ژێر (کسرة) ئیکتیفا کراوە لە زۆر شوێنی قورئاندا، وا هاتوە، واتە: سزای من و هەڕەشەی من، لەسەریان چەسپا.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ﴾، ئایا ئێمە دەستەپاچە بووین لە بەرانبەر دروستکردنی یەکەمدا؟ واتە: ئایا ئێمە لە بەرانبەر دروستکردنی یەکەمدا بێ تواناو دەستە پاچە بووین؟ تاکو لە بەرانبەر دروستکردنی دووەمدا، یاخود دووبارە گێڕانەوەیاندا بێ توانا بین؟ ﴿بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾، بەڵکو ئەوان لە تێکەڵییدان، لە ئیشکال دان، لە دروستکردنەوەی تازە، واتە: شتەکەیان زۆر نامەنتیقییە، دروستکردنی یەکەم بە زەحمەتە، ئەگەر زەحمەت بێ و، هی دووەم ئاسانە، کەچی ئەوان لە ئاسانەکەدا کەوتوونە ئیشکالەوە، دان بە هی یەکەمدا دێنن، کە خوا دروستیکردوون، بەڵام پێیان وایە کە خوا ناتوانێ دوای ئەوەی دەمرن زیندوویان بکاتەوە، کە ئەوە شتێکی زۆر نامەنتیقییە، ئەگەر هەر تۆزێ گوێیان بۆ عەقڵ و ویژدان گرتبایەو، بە مەنتیق لەگەڵ ئەو بابەتەدا مامەڵەیان کردبایە، دەبوو بزانن : کەسێک بتوانێ شتێک لە نەبوون پەیدا بکات، دوای ئەوەی ئەو شتە لە بەین دەچێ، دەتوانێ بیگێڕێتەوە، هەروەک زۆرجار گوتوومانە: بابایەکی گۆزەکەر، کە گۆزە دروست دەکات، (وَلِلَّـهُ المَثَـلُ الأَعـلَى)، دوای ئەوەی گۆزەکەی لێ دەشکێ، دەتوانێ چاکتر لە جاران دروستی بکاتەوە، هەر ئەو سواڵەتانە، لەتکەکانی بهاڕێ و بیانکاتەوە قوڕ و، گۆزەی چاکتر لە جارانیشیان لێ دروست بکاتەوە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە قورئانی شکۆداری بەپێز، کە زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت هەقن و، سەرسوورمانی کافران کە لە خۆیان ترسێنەرو وریاکەرەوەیەکیان بۆ بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ٢﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، (پیتی) قاف، سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆ، خاوەن ئەوپەڕی بەخشش.

پیتی (ق) وەک گوتمان: یەک پیتە، بەڵام وەک وشەیەک گۆ دەکرێ، هەروەک (ص)یش، یەک پیتە، (صاد) و (قاف) و (نون)، بەڵام وەک وشە گۆ دەکرێن، دەگوترێ: (قاف) (صاد) (نوون)، ئەم سێ سوورەتە لە قورئاندا بە یەک پیت هاتوون لەسەرەتایانەوە، بەڵام (٢٦) سوورەتەکەی دیکە هەموویان یان بە دوو پیت، یان بە سێ، یان بە چوار، یان بە پێنج هاتوون.

﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، (و)ەکە بۆ سوێندە، سوێند بە قورئانی مەجید، قورئان واتە: خوێندراوە، ناوی عەلەمی ئەو فەرمایشتەیە، کە خوا بە پێغەمبەری کۆتایی خۆیدا ناردوویەتی، کە هەم بە قورئان ناوی هێناوە، هەم بە (کتاب)، بە قورئان ناوی هێناوە لەبەر ئەوەی دەخوێنرێتەوە، بە زمانان دەخوێنرێتەوە، بە کیتاب ناوی

هێنراوە لەبەر ئەوەی دەنووسرێتەوە، واتە: ئەم قورئانە، هەم بە شێوەی خوێندنەوە بە ئێمە گەیشتوە، هەم بە شێوەی نووسراویش، ئێستاش لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، هەم بە خوێنراویی و هەم بە نووسراویی، ﴿ٱلۡمَجِيدِ﴾، خوا کردوویەتی بە وەسف بۆ قورئان، وەڵامی سوێندەکە چییە؟ وەڵامی سوێندەکە قرتێنراوە (**جَوابُ القَسَمِ مَحذُوفٌ لِتَذهَبَ نَفسُ السَّامِعِ كُلَّ مَذهَب**)، بۆ ئەوەی زەینی بابای بیسەر بۆ هەموو شوێنێک بچێت، بۆ هەر شتێک کە لەگەڵی بگونجێت، بۆ وێنە:

أ- سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆی بەرز، یان پیت و پێزی هەرە زۆر، تۆ پێغەمبەری خوای، ئەی موحەممەد ﷺ.

ب- یاخود سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆو پیت و پێزی هەرە زۆر، زیندووکرانەوە هەقە.

ج- یاخود سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆو پایە بەرز، ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایە، هەروەها هەر مانایەکی دیکە کە لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا بگونجێ، ئەگەر خوا ﷻ دیارییکردبایە، کە لە هەندێک شوێنان وەڵامی سوێندەکە دیارییکراوە، بەڵام ئەگەر دیارییکرابایە تەنیا یەک مانای دەگەیاند، بەڵام کە دیاریی نەکراوە، من ئەو سێ مانایەم بۆ هێنان و، دەگونجێ مانای دیکەش بهێنرێ.

٢)- ﴿بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ﴾ بەڵکو سەریان سوڕما کە لەخۆیان وریاکەرەوەیان بۆهات وشەی ﴿بَلۡ﴾، لە کوردییدا دەبێتەوە (بەڵکو) یان (بەڵام)، لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (**بل لِلإِضراب**)، واتە: (بَل) بۆ گواستنەوەیە، واتە: واز لەوە بێنەو بچۆ بۆ بابەتێکی دیکە، ئنجا لێرە زانایان بۆ ئەم (بَل)ی گواستنەوە، لەم باسە کە دەکرێ بۆ باسێکی دیکە، سێ حاڵەتیان بۆ داناون:

أ- ئەبوو سعوود دەڵێ: (**إضرابٌ عَمَّا يُنْبِيءُ عنْهُ جَوَابُ القَسَمِ المحْذُوفِ، كَأَنَّهُ قِيْلَ وَالقُرْآنِ الْمَجِيدِ، أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُنْذِرَ بِهِ النَّاسَ، بلْ جعلُوا كُلاًّ منَ المنذِرِ والمنذَرِ بِهِ عُرضةً للنكيرِ والتعجيبِ**).

واتە: لێرەدا ئەمە گواستنەوەیە لەوە کە وەڵامە قرتێنراوەکەی، سوێندەکە دەیگەیەنێ، واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێ وریابکەیەوە،

کەچی بڕوایان پێ نەهێنا، بەڵکو وریا کەرەوەو پێ وریاکراوەکەیان (پێ وریاکراوەکە قورئانەو وریاکەرەوەکەش پێغەمبەرە ﷺ) کردیاننە مایەی نکووڵیی لێکردن و سەرسوڕمان .

**ب-** **(وَالقُرْآنِ المجيدِ إِنَّكَ لمنذِرٌ، ثمَّ قيلَ بعدَهُ: إنَّهم شكُّوا فيهِ، ثمَّ أُضربَ عنْهُ، وقيلَ بلْ عجبُوا، أيْ: لم يكتفُوا بالشكِّ والردِّ، بلْ جزمُوا بالخلافِ حتَّى جعلُوا ذلكَ منَ الأمورِ العجيبةِ).**

واتە: سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆ و خاوەن ئەوپەڕی پێزو بەرەکەت، (ئەی موحەممەد!) تۆ وریاکەرەوەو ترسێنەری، دوایی گوترا: ئەوان دوو دڵ بوون، بەڵکو سەریان سوڕما، واتە: بەوە وازیان نەهێنا کە تێیدا دوو دڵ و لە گومان بن، بەڵکو لەوە تێیانپەڕاندو زۆر بە جەختکردنەوە بێبڕوابییەکەی خۆیان ڕاگەیاند، تاکو ناردنی تۆیان وەک وریاکەرەوە لە کارە سەرسوڕهێنەرەکان دانا.

**ج-** (**إضرابٌ عَمَّا يُفهم منْ وصفِ القرآنِ بالمجيدِ، كَأَنَّهُ قِيْلَ لَيْسَ سَبَبُ امْتِنَاعِهِم مِنَ الإِيْمَانِ بالقُرْآنِ، أنَّه لا مجدَ لهُ، ولكنْ لجهلِهم**)، واتە: ئەمە گواستنەوەیە، لەوەی دەفامرێتەوە لە وەسفکردنی قورئان بە (مەجید)، وەک ئەوەی گوترابێ: هۆی بڕوا نەهێنانیان بە قورئان، ئەوە نیە کە خاوەنی مەجدو شکۆو پێت و پێز نەبێ، بەڵکو لەبەر نەزانییانە، چونکە بە زۆریی وایە ئینسان لە بەرانبەر شتێکدا سەری سوڕ دەمێنێ، کە نەیزانیبێ و نەیبیستبێ، واتە: بەهۆی نەزانیی خۆیانەوە، بڕوایان بە قورئان نەهێنا، نەک لەبەر ئەوەی قورئان خاوەنی شکۆو پایەی بەرزو پێت و پێزی هەرە زۆر نەبێ.

**٣)-** ﴿ فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ﴾، ئنجا بێبڕوایەکان گوتیان: ئەمە شتێکی سەیرە! پێشتر دەفەرموێ: ﴿ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾، بەڵکو سەریان سووڕما، (**أَي: حَصَلَ لَهُمُ العَجَبُ، وَهُوَ الأَمرُ غَيرُ المألُوف**)، (عجب): بریتیە لە شتێك پێشتر نەبوو بێ، حاڵەتی سەرسوڕمانیان بۆ دروست بوو، ﴿ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾، کە لە خۆیان وریا کەرەوەیەکیان بۆ هات، واتە: لە جینسی خۆیان بۆیان هات، نەک لە جینسی فریشتان، یان لە جینسی جند، کە سەرسوڕهاتنەکەیان زیاتر بە شتێکی نالۆژیکیی دادەنرێ، چونکە

ئەگەر لە غەیری خۆیان بۆیان هاتبایە، بۆیان هەبوو بڵێن، ئێمە مرۆڤین چۆن دەبێ فریشتەمان بۆ بێ؟! یان ئێمە مرۆڤین چۆن دەبێ جندمان بۆ بێ؟ یاخود مەخلووقێکی دیکە، بەڵام ئێستا کە وریاکەرەوەکەیان لە خۆیانە، شتەکەیان زۆر پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە، ﴿فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، ئەمە بۆ شیکردنەوەو هۆکار دۆزییە، یانی: هۆکارەکەی چی بوو کە وایانگوت؟ ئەوانە بێبڕوابوون، بۆیە گوتیان: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، واتە: هۆی سەرسوڕمانەکەیان و هۆی ئەو هەڵوێستەیان، بریتیی بوو لە بێبڕواییەکەیان.

**مەسەلەی دووەم:**

**نکوولّییکردنی بێبڕوایان لەوەی: لە دوای مردن و بوونەوە بە خاک و خۆڵ، زیندووبینەوەو، بەرپەرچدانەوەی خوای مەزن بۆیان، بەوە کە دەزانێ خاک چەند لە جەستەیان دەخوات، نووسراوێکی پارێزەریشی لەلایە، بەلاّم هۆکارەکەی بە درۆ دانانی هەقە، کە لەبارەیەوە تووشی قسەی تێکەڵ و پێکەڵ و ناهاوسەنگ بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ ﴿٤﴾ بَلْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ فَهُمْ فِي أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ﴾، ئایا کە مردین و بووینەوە بە خۆڵ (بە گڵ)، هەڵبەتە لێرەدا خوا نەیفەرموە: **(قالوا)**، چونکە پێشێ فەرموویەتی: ﴿ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ ﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، کە دیارە مەبەستیان ئەوە بووە کە پێغەمبەرێک لە خۆیان بۆیان بێ و وریایان بکاتەوە، شتێکی سەرسوڕهێنەرە، کەواتە ئەوان هەر لەسەر قسەکەی خۆیان بەردەوامن، گوتیان: ﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ﴾، بێبڕواکان گوتیان: ئایا کە مردین و بووینەوە بە خۆڵ (بە گڵ)، **(الإستِفهامُ مُستعمَلٌ في التَّعَجُّب والإبْطَال)**، پرسیارکردنەکە بەکارهێنراوە لە سەرسوڕمان و لە هەڵوەشاندنەوەدا، واتە: ئەوە ناگونجێ.

**٢)-** ﴿ ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴾، ئا ئەوە، (ئەو مردن و زیندوو کرانەوەیە دوای ئەوەی مردووین و بووین بە خاک و خۆڵ)، گەڕانەوەیەکی دوورە، **(رَجْع: مَصْدَرُ رَجَعَ، أَيَ : الرُجُوعُ إِلَى الحَيَاةِ)**، **(رَجع)**، چاوگی **(رَجَعَ)**یە، **(رَجَعَ)**، گەڕایەوە، **(رَجْع)**، واتە: گەڕایەوە، واتە: گەڕایەوە بۆ ژیانی دنیا، یان بۆ ژیان، ئەوە گەڕانەوەیەکی دوورە، کە دەڵێن: **(بَعِید)**، واتە: دوورە لە عەقڵ و تێگەیشتنەوەو، شتێکی نالۆژیکییە.

خواش ﷻ چەند وەڵامێکیان دەداتەوە، دەفەرموێ:

٣)- ﴿ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیومانە، زەوی چەندی لێ کەم کردوون، واتە: جەستەی هەر کامێکیان کە شی دەبێتەوە و دەبێتەوە بە خاک، ئێمە دەزانین جەستەیان لە چەند گەردیلە پێک هاتوە، کە زانستی ئێستا دەریخستوە کە بەشێوەیەکی هاوکۆیی (معدل) جەستەی هەر مرۆڤێک لە (سەد ترلیۆن) خانە پێک دێ، هەر خانەیەکیش بەشێویەکی هاوکۆیی لە سەد تریلیۆن(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێک دێ، ئنجا خوا دەزانێ جەستەیان لە چەند خانە پێک هاتوەو، هەر خانەیەک لە چەند گەردیلە پێکهاتوە! ﴿ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡ ﴾، زانیومانە زەوی چەندی لێ کەم کردوونەوە لە جەستەیان.

٤)- ﴿ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴾، لە لای ئێمە کتێبێکی پارێزەرو نووسراوێکی پارێزەریش هەیە، ﴿ حَفِيظُۢ ﴾، دەگونجێ (فَعِيل)ی بە مانای (فاعل) بێ، واتە: پارێزەر، دەشگونجێ (فَعِيل)ی بە مانای (مفعول) بێ، لەسەرکێشی (فَعِيل)، بەڵام بە مانای (مفعول) واتە: پارێزراو (نووسراوێکی پارێزراو)، ئەمەش واپێدەچێ وێنا کردن بێ بۆ زانیاریی خوا، بە حاڵی کەسێک کە ئەگەر شتەکەی خۆی لە نووسراوێک نووسیبێ، بە تەئکید ئەو شتە کە نوسیوویەتی تۆمارییکردوە، لێی تێکناچێ، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: بە دڵنیایی خوا ﷻ هەموو زانیارییەکانی خۆی لە دروستکراوێکی خۆیدا تۆمار کردوون، کە هەم بە:

أ- **(لوح محفوظ)**

ب- هەم بە **(إمام مبين)**

ج- هەم بە **(كتاب مبين)**،

د- لێرەش بە ﴿ كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴾، تەعبیری لێکردوە.

٥)- ﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، بەڵکو (هۆی بێبڕواییان ئەوە بووە)، کە بە هەق بێبڕوا بوون و هەقیان بە درۆ دانا، دوای ئەوەی بۆیان هات، هۆی بێبڕواییەکەیان ئەوەیە.

٦)- ﴿فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ﴾، بۆیە سەرنجام ئەوان کەوتوونە نێو کارێکی تێکەڵەوە[1]، واتە: کەوتوونەتە حاڵەتێکی تێکەڵ و پێکەڵییەوە، هەر جارە قسەیەک دەکەن، (مَرِيج: **يَعْني المُضطَرِب المُختَلِط، أَي: لا قَرارَ في أَنفُسِهِم فـي هَذَا التَّكْذِيبِ إِضْطَرَبَ فِيهَا أَقْوَالهُم**)، لەو بە درۆ دانانەیاندا، حاڵەتێکی چەسپاویان نیە، بەڵکو هەرجارە شتێک دەڵێن و، لە بارەی قورئانەوە هەرجارە شتێک دەڵێن، لە بارەی پێغەمبەرەوەش ﷺ هەرجارەی شتێک دەڵێن، چونکە هەمیشە هەق چەسپاوە، بەڵام ناهەق گۆڕاوەو، حەق یەکێکە، بەڵام ناحەق جۆراو جۆرە، (٢ + ٢) ئەنجامە ڕاستەکەی بەس (٤)ە، بەڵام بڵێی: (٥)، بڵێی: (٦)، بڵێی: (٣)، بڵێی هەرچەند، هەر هەڵەیە، هەمیشە حەق چەسپاویشەو یەک شتیشە، بەڵام ناهەق گۆڕاوەو جۆراو جۆرە، لە بارەی وشەی (**مَرِيج**)ەوە، فەرمایشتێکی پێغەمبەر هاتوە ﷺ بۆ ڕوونکردنەوەی واتای (مريج) دەیهێنین:

**{عَنِ الْحَسَنِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ أَنْتَ إِذَا بَقِيتَ فِي حُثَالَةٍ مِنْ النَّاسِ؟ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: إِذَا مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَأَمَانَاتُهُمْ، وَكَانُوا هَكَذَا، وَشَبَّكَ يُونُسُ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، يَصِفُ ذَاكَ قَالَ قُلْتُ مَا أَصْنَعُ عِنْدَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ اتَّقِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَخُذْ مَا تَعْرِفُ وَدَعْ مَا تُنْكِرُ وَعَلَيْكَ بِخَاصَّتِكَ وَإِيَّاكَ وَعَوَامَّهُمْ} (أخرجه أحمد: ٦٥٠٨، تعليق شعيب الأرنؤوط : صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين).**

واتە: حەسەنی بەصرایی دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: چی دەکەی کاتێک کەوتیە نێو کۆمەڵە خەڵکێکەوە کە پەیمان و سپاردەکانیان تێکەڵ بوون، لە نێو خۆیاندا ناکۆک بوون، بەو شێوەیان لێهات (پەنجەکانی ئاوا تێکەڵ کردن)، واتە: لەسەر بارێکی ڕاست نەمان......

کەواتە: (مريج) یانی: تێکەڵپێکەڵ و ئاڵۆز.

---

(١) وشەی (أمر) لێرەدا بە ناوێکی نەزانراو (إسم مبهم) دانراوەو هەرشتێك دەگرێتەوە.

لە بارەی ئەوەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ﴾، دەزانین زەوی چی لێ کەم کردوونەوە، فەرمایشتێکی پێغەمبەر هەیە ﷺ چەند جارێکی دیکەش هێناومانە، دەفەرموێ: {**كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ، إِلَّا عَجْبُ الذَّنَبِ، مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ**} (**أخرجه مسلم: ٢٩٥٥، وأبو داود: ٤٧٤٣، والنسائي: ٢٠٧٧**).

واتە: هەموو شتێکی ڕۆڵەی ئادەم، زەوی دەیخوات جگە لە ئێسکی کلێنجە، (هەڵبەتە ئەویش مەرج نیە، ئێسکەکە هەمووی یانی: بەشێکی بچووکی کە بە چاو نابینرێ) لەوێوە دروست بووەو، هەر لەوێشەوە دروست دەبێتەوە.

ئەوەش وەک پێشتر لە سەرەتای سوورەتی (**المؤمنون**)دا باسێکمان لەو بارەوە کرد، لە بارەی دروستکردنی مرۆڤەوە، زانست ئێستا بەوە گەیشتوە، یەکەم جار مرۆڤ کە دروست دەبێ، لەوێوە دروست دەبێ و، دیارە ئەو بەشەشی کە لێی دروست بووە، دەپارێزرێ و لەبەین ناچێ، بەڵکو جارێکی دیکە لەوە دروست دەبێتەوە، بەپێی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## مەسەلەی سێیەم:

**سەرنجراکێشانی خوا ﷻ بۆ بێبڕوایان بەتایبەت و، بۆ خەڵک بە گشتیی، بۆ بیناکرانی ئاسمان و ڕازێندرانەوەی و، پان ڕاخستنی زەوی و، تێدا ڕوێنرانی ڕووەکە دڵگیر و جوان و بەرچاوەکان و، دابەزێندرانی ئاو لەسەرێوە (بەشێوەی بەفرو باران و تەرزە) و پێڕوێنرانی باغ و بێستان و دانەوێڵەو دار خورمای بەرز هەڵچوو، تاکو ببێتە بژیو بۆ خەڵک و، زیندوو کرانەوەی مردووانیش هەروەک دەرهێنرانی ڕووەکە جۆراو جۆرەکانە لە زەوی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ۝٦ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ۝٧ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ۝٨ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ۝٩ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ۝١٠ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ۝١١﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ﴾، ئایا سەرنجی ئاسمانیان نەداوە لە سەرروویانەوە؟ کە دەفەرمووێ: ﴿فَوْقَهُمْ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە لەسەرروویانەوەیە، یانی: (**فَوقَهُم**)، حاڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئاسمان، ئایا سەرنجی ئاسمانیان نەداوە لە حاڵێکدا ئاسمان لە سەرروویانەوەیە، هەر سەر هەڵبڕن، دەیبینن، پرسیارکردن لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوە، تەماشایان نەکردوە بۆ ئاسمان؟ نەیانڕوانیوەتە ئاسمان لەسەرروویانەوە؟ ئەم پرسیارکردنە دەگونجێ پرسیار کردنی نکووڵییلێکردن بێ، ئەگەر مەبەست لە تەماشا کردن، تەماشا کردنی عەقڵ و دڵ بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست تەماشا کردنی ڕواڵەتیی بێ، تەماشا کردنی چاو، پرسیارکردنی چەسپاندنە، واتە: بە تەئکید تەماشایان کردوە، بە چاوی سەر تەماشایان کردوە، بەڵام ئەگەر مەبەست سەرنجدان و

تێوەڕامانی عەقڵ و دڵ بێ، بە دڵنیایی ئەوان باش لە ئاسمان و گەردوون ورد نەبوونەوە، بۆیە خوا ﷻ بە نکووڵییلێکردنەوە ئەو پرسیارە دەكات.

**٢)-** ﴿كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا﴾، (ئایا سەرنجیان نەداوەتە ئاسمان لەسەروویانەوە)، چۆن بنیاتمان ناوە، دروستمان كردوە و بەرزمانكردۆتەوە، چۆنیش ڕازاندوومانەتەوە، خوای بەرزی مەزن، دوو سیفەتان لە ئاسمان هەڵدەدات:

**یەكەم:** بنیاتنرانی و بەرزكرانەوەی.

**دووەم:** ڕازێنرانەوەی:

هەڵبەتە مەبەست لە ئاسمان ئەو گومبەزە شینەیە كە دەیبینین، بە ڕۆژ دەیبینین بە تایبەت خۆر بە دەرەوە بێ، بە دڵنیایی ئەوە بە ڕۆژ زۆر جوان دیارە، بە شەویش ئەگەر ئەستێرەكان و مانگ بە دەرەوە دەبن، ئەوەندەی چاو بڕ دەكات، خوای پەروەردگار مەبەستی پێ ئەوەیە، ئەوە ئەگەر مەبەست پێی بینینی چاو بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی بینینی عەقڵ و دڵ بێ، واتە: ئەو گەردوونە هەمووی ئەوەی بە چاو دەیبینن و، ئەوەی بە چاو نایبینن، دەزانن ئەو ئاسمانە زۆر بەرزە، ئەو گەردوونە یەكجار فراوان و زەبەلاحە.

ڕازێندرانەوەكەشی دیارە لەڕۆژێدا بە خۆر دەڕازێتەوەو، لە شەوێشدا بە مانگ و ئەستێرەكان، وشەی (**زَيَّنَّاها**) جوانمان كردوەو ڕازاندوومانەتەوە، (**التزيينُ: جَعلُ الشَّيء زَيْناً أَي حَسَناً**)، واتە: (**تزيين**) بریتیە لەوەی شتێك جوان بكەی و ڕازاوەی بكەی، كە فیعلەن ئاسمان چ لە ڕۆژێدا لێی بڕوانی، چ لە شەوێدا لێی بڕوانی، دیمەنێكی یەكجار جوان و سەرنجڕاكێشی هەیە.

**٣)-** ﴿وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ﴾، ئاسمان هیچ كوت و كەلێنی تێدانین، هیچ كەم و كوڕیی تێدا نین، ﴿فُرُوجٖ﴾، كۆی (**فَرج**)ە، (**وَهُوَ الخَرقُ**)، بریتیە: لە كون و كەلێن، توێژەرەوانی قوڕئان (**فُروج**)یان بە (**شُقُوق**) و، (**صُدُوع**) و (**فُتُوق**) لێكداوەتەوە، (**شُقُوق**) كۆی (**شَقّ**)

ە، (صُدُوع) کۆی (صَدع)ە، (فُتُوق) کۆی (فَتق)ە، واتە: لەت بوون و، درزو تیک و کەلێن، ئەو واتایانە دەگەیەنن.

ئەم ئایەتە موبارەکە وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (الملك) وایە کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِی خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِی خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَیۡنِ یَنقَلِبۡ إِلَیۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِیرٞ ﴿٤﴾﴾، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکانی حەوت چین لەسەر یەک دروست کردوون، تۆ لە دروستکراوی خوای خاوەن بەزەییدا ناڕێکیی نابینی، جار لە دوای جار چاو بگێڕەو وردبەوە، بزانە هیچ کەلێن و کون و ناڕێکیی دەبینی؟ (دوایی دەفەرموێ:) دوایی دوو جاری دیکە، (یانی: چەندان جار لە دوای جار) سەرنجبدە، سەرنجام چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات بە دەرکراویی، واتە: بێ ئەوەی بە ئامانج گەیشتبێ و کەم و کوڕیی و ناڕێکییەک لە ئاسماندا (واتە: لە گەردووندا) بدۆزێتەوە.

ئنجا دوای ئاسمان، دوای گەردوون بە گشتیی کە دیارە زەویش هەر بەشێکە لەو گەردوونە، ئنجا بە تایبەتی باسی زەوی دەکات:

٤- ﴿وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا﴾، واتە: زەویشمان پان ڕاخستوە، (مَدّ) بە مانای (جَرُّ الشَّيء)، شتێک کە ڕاکێشی، بەڵام بە مانای ڕاخستن (بَسط)یش هەر هاتوە، واتە: شتێک پان ڕابخرێ، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی پان ڕاخستنی زەوییە، ئنجا وەنەبێ زەوی خڕ بووبێ و، دوایی خوا پانی ڕاخستبێ، یان هەڵوێزنەراو بووبێ و، دوایی پانی ڕاخستبێ، واتە: زەویمان بە پان ڕاخراوی هێناوەتە دی، ﴿وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا﴾ش دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕستەی: ﴿أَفَلَمۡ یَنظُرُوٓاْ﴾، واتە: هەروەها ئایا سەرنجی زەوییان نەداوە، چۆن پانمان ڕاخستوە؟

٥)- ﴿وَأَلۡقَیۡنَا فِیهَا رَوَٰسِیَ﴾، چیایەکانیشمان تێفرێداون، (الإلقاءُ: رَمِي الشَّيء مِنَ اليَدِ إلَى الأَرضِ)، (إلقاء) بریتیە: لەو شتەی کە بە دەستتەوە بێ و فڕێیدەیە زەوی، (رَواسي) کۆی (رَاسِي)یە، وەک (فَوارِس) کۆی (فارِس)ە و، (عَواذِل) کۆی (عاذِل)ە،

(الرُسوُّ: الثَّبَاتُ وَالإِستِقرَارُ)، (رُسُوا) بە مانای چەسپاویی و سەقامگیریی دێ، (رَواسي) سیفەتێ وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانێ: چیایە چەسپاوەکان، بۆیەش وشەی (إلقاء)ی بۆ بەکارهێناون وەک لە تەفسیری سووڕەتی (لوقمان)یشدا کاتێ خۆی باسمان کرد، کە ئەو تەعبیرە لەوێش هەر هاتوە، بەڵکو لە شوێنانی دیکەش دا هاتوە، واپێدەچێ مەبەست ئەوەبێ کە چیایەکان لە ئەنجامی ئەو ئاگر پرژێنانەی کە لە ناخی زەویدا دەردەقوڵێن و، ئاسن و کانزای تواوە فڕێ دەدەن، چەند کیلۆمەتر بەرزی دەکەنەوە، ئنجا دوایێ لەسەرڕا دێتەوە خوار و، دوای ئەوەی سارد دەبێتەوەو دەمەیێ، چیایەکان بەپێی ئەوەی زانایانی جیۆلۆجیا دەڵێن: ئاوا دروست بوون، کەواتە: لەسەرێوە فڕێدراونە نێو زەوی، چونکە کەرەستەی لێ دروستبوونی چیایەکان پێشێ لە ناخی زەوی دەرقوڵیوە، دوای گەڕاوەتەوەو وەك سینگ و گوڵمیخ تێیدا داکوتراون.

٦)- ﴿وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾، هەروەها لە زەویدا ڕواندوومانە، هەر جۆرێکی جوان و بە دەو، بە دڵنیایی ڕواندن بۆ ڕووەکە، واتە: هەر جۆرە ڕووەکێک، هەر جۆرە سەوزایی و دارو درەختێکی دیمەن جوان و دڵبزوێن و دڵگیرمان لەوێدا ڕواندوە، وشەی: ﴿بَهِيجٖ﴾، دەگوترێ: (بَهُجَ الشَّيء أَي: حَسُنَ)، کەواتە: (بَهِيج: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالفِعْل)، یان سیفەتێکە چوێنراوە بە کردارەوە، چونکە (بَهُجَ) بە مانای (حَسُنَ) جوانە، جوان بوو، یاخود (بَهِيج: فَعِيلٌ بِمَعنَى المَفعُول)، واتە: (مُنبَهِجٌ بِهِ، أَي: يَسُرُّ بِهِ النَّاظِرُ)، واتە: دیمەنێکی دڵگیر سەرنج ڕاکێش، کە مرۆڤ پێی شادمان و دڵخۆش دەبێ، کاتێ سەرنجی دەدات.

هەڵبەتە: ﴿مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾، وشەی (زَوج) بە مانای پۆڵ (صنف)ە، بە مانای جۆر (نوع)ە، دەشگونجێ بە مانای جووتیش بێ، چونکە زانستی ڕووەک ناسیی دەریخستوە، هەموو ڕووەکەکان نێرو مێیان تێدایە، ئەوە بەس دار خورما نیە، نێر و مێی هەبێ، کە تۆوی نێرەکەی دەبەن بۆ مێیەکەی، بەڵکو هەموو ڕووەکەکان نێرو مێیان هەیە، وەک کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (الرعد)دا باسمان کرد، ئنجا هەیانە نێرو مێیەکەی، جیان وەک دار خورما، نێرەکەی لە شوێنێکە و، مێیەکەی لە شوێنێک و، دەبێ تۆوی نێرەکە بۆ مێیەکە بگوازرێتەوە،

هەشیانە لەنێو خۆیدایە نێرو مێیەکە، ئنجا ئەوانەی کە گژو گیاو، بەڵکو زۆر لە چرۆی درەختانیش بەهۆی پەپوولەو بەهۆی مێش هەنگوینەو، بەهۆی تەیرو تواڵەوە کە بە پێیەکانیان لەسەر ئەو دەنیشن لەسەر ئەوێ دەنیشن، تۆوی هەندێکیان بۆ هەندێکیان دەبەن و لە ئەنجامی ئەوەدا موتووربە دەبن، ئەوەی کە نێرو مێیەکەی جیابێ، ئەوەی دیکەش کە لەنێو خۆیدا بێ، لە نێو خۆیدا موتوربە دەبێ، کەواتە: دەگونجێ مەبەست لە (**زَوج**) جووت بێ، دەشگونجێ مەبەست لە (**زَوج**) جۆر بێ؟

٧)- ﴿ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ ﴾، واتە: هەم بەرچاو ڕوونیی، هەم بیر خستنەوەیە.

٨)- ﴿ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴾، بۆ هەر بەندەیەکی لە ناخەوە گەڕاوە (بەرەو خوا ﷻ).

(**التَّبـصِرَةُ: مَصْـدَرُ بَـصَّرَهُ، وَأَصْـلُ مَصْـدَرِهِ التَّبصِيـرُ، وَهُـوَ جَعْـلُ المَـرءِ مُبْـصِراً**)، ( تَبۡصِرَةٗ ) چاوگە و لە (**بَـصَّرَهُ**)ەوە هاتوە، واتە: وایکرد کە ببینێ، چاوگەکە لە ئەصڵدا (**تَبصِیر**)ە، واتە: پێ بینین، (**جَعـلُ المَـرءِ مُبـصِراً**) وا لە مرۆڤەکە بکەی ببینێ، کەواتە: ( تَبۡصِرَةٗ ) واتە: پێ بینەر، یان بەرچاو ڕوونکەرەوە.

(**ذِكـرَى: إِسـمُ مَصـدَرِ ذَكَّـرَ إِذَا جَعَلَـهُ يَذكُـرُ مـا نَسِـيَهُ**)، (**ذِكـرَى**)ش ناوی چاوگی (**ذَكَّـرَ**)ەیە، (**ذَكَّـرَهُ**) واتە: شتێک کە دەیزانی، بەڵام لە بیری چوبۆوە، ئەو بیری خستەوە، لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: پێبینەرە و بیرخەرەوەیە بۆ هەر بەندەیەکی بۆ لای خوا گەڕاوە، دەگونجێ تەنیا بۆ زەویی و پان ڕاخرانی زەویی و تێدا داکوترانی چیایە چەسپاوەکان و ڕوێنرانی هەر جۆرە ڕووەکێکی جوان و بەرچاو و سەرنج ڕاکێش بچێتەوە، دەشگونجێ وێڕای ئەوە بۆ ئاسمانیش بچێتەوە، واش پێدەچێ گشتگیر بێ بۆ هەمووی، چونکە هەموو ئەوانە بەرچاو ڕوونیین و، مانای بیرخستنەوەشن، بەرچاو ڕوونیین بۆ ئەوەی مرۆڤ کاتێ تەماشای ئاسمان دەکات، بەو شێوەیەو، تەماشای زەوی دەکات، ئەو هەموو نازو نیعمەتانە بەو هەموو وردەکارییە، دەزانێ کە ئەوە پەروەردگارێک، مشوورخۆرێک، سەرپەرشتیارێک ئەوەی بۆ ڕەخساندوە،

ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو بەرچاو ڕوونییەی بۆ پەیدا دەبێت و دێتەوە بیری و پەند وەردەگرێ، دێتەوە بیری کە: ئەگەر ئەم گەردوونە بەسەرو خواریەوە، کارسازێک و سەرپەرشتیارێک و مشوورخۆرێکی لەپشتەوە بێ، بە دڵنیاییی منیش کە لە نێو ئەو گەردوونەدا، دەژیم و هەموو شتەکان بۆ من دەستەمۆ کراون، لە پێشترە کە سەرپەرشتیارو مشوورخۆرێکم هەبێ، یانی دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ پێگەی خۆی لە ئیعرابی بووندا زیاتر بزانێ و، لە خۆی حاڵیی بێ، کە هەر لەخۆوە نەهاتوە بۆ ئێرەو، بێ حیکمەت نەخوڵقێندراوەو، هەم ڕابردووی خۆی بزانێ و، ئێستای خۆی بزانێ و، حیکمەتی بوونی خۆی بزانێ و، داهاتووی خۆیشی بزانێ، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ﴾، بۆ هەر بەندەیەکی گەڕاوە، مرۆڤ ئەگەر لە ناخەوەو، لە دەروونەوە نەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و، بیر نەکاتەوە، بێگومان نە لە ئاسمان پەند وەردەگرێ و هیچی تێدا دەبینێ، نە لە زەوی، بەڵکو وەک مێشە ڕەشە، وەک لە (مەوسووعەی ئیمان و ئیلحاد)دا باسم کردوە، کە هەر بەسەر خاڵی ڕەشەوە دەنیشێ، ئەویش تەماشا دەکات لە گەردووندا بزانێ، چ شتێکی دەکەوێتە بەر چاو، یان لە جەستەی خۆیدا یان لە دەورو بەریدا، چ شتێکی دەکەوێتە بەرچاو ناڕێک بێ، کە ناڕێکییەکەش خراپ دیتنی خۆی یان چاک تێنگەیشتنی پەیدای دەکات، ئەگەرنا کاتێک خوا دەفەرموێ: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ ... ٨٨﴾ النمل، واتە: دروستکراوی خوا کە هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێک و پێکیی دروست کردوە، یان کە دەفەرموێ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ ... ٣﴾ الملك، واتە: لە دروستکراوانی خوای خاوەن بەزەییی دا ناڕێکیی نابینی، یان دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤﴾ التين، واتە: بەدڵنیاییی ئینسانمان لە باشترین پێکهاتەدا خوڵقاندوە.

کاتێ خوا وا دەفەرموێ، شتەکەی بڕیوەتەوە، کەواتە:

أ- هەر ناڕێکیی و کەم و کوڕییەک ئێمە دەیبینین، لە ڕاستییدا بەهۆی ئەوەوەیە کە خۆمان باش سەرنج نادەین.

**ب-** هەندێک شتیش کە خوا ﷻ لە ژیانی بەشەردا دایناوە، بۆ وێنە: خوا ﷻ مارو دوو پشک و جۆرەها میکرۆب و ڤایرۆس و زیانبەخەشن، خوڵقاندوونی، چونکە ژیانی دنیا کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، وا پێویست دەکات.

**ج-** ئەو شتانەش هەرچەندە ئێمە پێمان کەم و کوڕیی و ناڕێکیین، بەڵام لە ئەصڵدا کە تەماشای دیمەنەکە هەمووی بکەی و تەماشای حیکمەتی ژیانی دنیا بکەی، کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، ئەوانەش هەمووی حیکمەت و هەمووی هۆکاری خۆیانیان هەیە.

٩)- ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا ﴾، لە ئاسمانەوە، ئاوێکی بە پێزمان دابەزاندوە، واتە: لە سەرووتانەوە (سَماء) بە مانای سەرووش دێ، لە سەرووتانەوە ئاوێکی بەپێزمان دابەزاندوە، (**المُبَارَكُ: إِسمُ مَفعولٍ لِلَّذِي جُعِلَت فِيهِ البَرَكَةُ أَي: الخَيرِ الكَثِير**)، ئاوێکی پێزدار، ئاوێکی بەرهەمدارمان دابەزاندوە، (مبارک) ناوی بەرکارە بۆ شتێک کە بەرەکەتی تێخراوە، واتە: خێری زۆری تێخراوە.

١٠)- ﴿ فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴾، [بەو ئاوە کە لەسەرووتانەوە دامانبەزاندوە]، چەندان باغ و بێستانمان پێ ڕواندوە، هەروەها چەندان دانەوێڵە کە دەدوورێتەوە، (**جَنَّات**) کۆی (**جَنَّة**)یە، بریتیە لەوەی درەختی ترێ و، درەختەکانی میوەکان، هەروەها دارخورمای تێدا بن، ئنجا پێی دەگوترێ: (**جَنَّة**)، (**حَبّ**) بە مانای دانەوێڵە دێ، (**هُوَ مَا يَنبُتُ من الزَّرعِ الَّذِي يُخْرِجُ السَّنابِلَ تَحْوِيَ حُبُوبَاً**)، (**حَبّ**): بریتیە لە دانەوێڵە، کە بریتیە لەو کشتوکاڵەی گوڵان دەردەکات، ئەگەر جۆیە، گەنمە، هەرزنە، مەرەزەیە (کە برنج دەردەکات)، وشەی (**حَبّ**) زیاتر بۆ ئەوانە بەکاردێ، هەروەها بۆ ماش، چ ماشی سپی و چ ماشی ڕەش، هەروەها بۆ نیسک و نۆک، هەموو ئەوانە دانەوێڵەیان پێ دەگوترێ.

وشەی (**حَصِيد**) لەسەر کێشی (**فَعِيل**)ە، بەڵام بە مانای (مفعول)ە واتە: (**مَحصُود**)، (**الزَّرعِ المَحصُود**)، (**مَحصُود**)یش یانی: (**مَقطُوع**)، ئەوەی کە لە ڕیشەوە دەبڕدرێ، بۆ ئەوەی دوایی دانەکەی لە کایەکەی جیا بکرێتەوە، مرۆڤەکان دانەکەی دەخۆن (دانەوێڵەکەی)و، ئاژەڵەکانیشیان پووش و گیا و کایەکەی دەخۆن، ئەویش بە زایە ناچێت.

کەواتـە: ﴿وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ﴾، یـانی: دانەوێڵـەی درواو، دانەوێڵەیـەک کـە ئـەوەی دانەوێڵەکـەی تێدایـە دەدوورێتـەوە، ئنجـا گەنمـە، جۆیـە، نیسـکە، نۆکـە، ماشـە، برنجـە، تـا دوایـی.

١١)- ﴿وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ﴾، دارخورمایانی بەرز هەڵچووش، ئەمە (**عطف**) دەبێتەوە بۆ سەر ڕستەی پێشێ، یانی: (**وَأَنبَتنا بِهِ النَّخلَ باسِقاتٍ**)، دارخورماکانیشمان کە لەحاڵێکدا بەرز هەڵچوون (درێژن)، ئەوانیشمان پێ ڕوواندوە، چونکە (**باسِقات: أَي طَويلات**)، (**باسِقة**) بە مانای (**طَويلة**) دێ، (**باسِقَ**) یانی: (**الطَّويلَ**)، بەڵام درێژییەک کە بە باری بەرزییدا بەرەو سەرێ هەڵچووبێ، ﴿وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ﴾، (**نَخل**) ناوی جینسە، ناوی کۆیە، تاکەکەی بریتیە لە (**نَخلَة**)، یانی: یەک دارخورما، بەڵام (نخل) یانی: دارخورمایەکان.

١٢)- ﴿لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ﴾، بەرێکی ڕیزکراوی هەیە، (**طَلع**) وەک پێشتر باسمان کرد، (**الطَّلعُ أَوَّلُ ما يَظهَرُ من ثَمَرِ التَّمرِ، وَهُوَ فِي الكُفَّرى، أَي: غِلافِ العُنقُود**)، (**طَلع**): بریتیە لە یەکەم شت کە لە دار خورما دەردەکەوێ، لە میوەکەی کە کیفێکە، پێی دەگوترێ: (**كُفَّرى**)، کە کیفێکە هێشووەکانی تێدان، دوایی ئەو کیفە لە کاتێکی دیارییکراودا دەدڕدرێ و، هێشووەدار خورمایەکان دەردەکەون، ئنجا هەتا لە نێو کیفەکەدا بێ پێی دەگوترێ: (**مَنضود**)، ڕیز بوو، بەڵام دوای ئەوەی دێنە دەرێ، هێشووەکان هەریەکەی بە لایەکدا دەچێت، ئەو کاتە ئەو حاڵەتی ڕیزبوونەی نامێنێ، بەڵام دەنکە خورمایەکان خۆیان لە هێشووەکەدا ڕیز بوون، چونکە (**مَنضود**)، مەرجیش نیە بەس بۆ یەک شتیان بچێتەوە، پێشێ هێشووەکان لە نێو کیفەدا ڕیز بوون، دوایی کە هێشووەکان دێنە دەر، بڵاودەبنەوە، بۆ ئەوەی زیاتر گەشە بکەن، وەک چۆن کۆرپە لە منداڵدانی دایکی دێتە دەرێ بۆ ئەوەی دوایی زیاتر گەشە بکات، ئەوەندەی پێویست بووە گەشەی کردوە کە لەگەڵ وێدا گونجاوە، دوایی دەبێ بێتە دەرێ گەشەی دیکە بکات، خورماش بەهەمان شێوە هەتا لە نێو کیفەکەی دایە، جۆرێک گەشەی هەیە، بەڵام دوایی دەبێ ئەو کیفە بدڕێ بۆ ئەوەی بێتە دەرو گەشەی زیاتر بکات، ئەو کاتە هێشووەکانی بڵاودەبن،

(النَّضِيد: أَي المَنضُود، أَي المُصَفَّف بَعضُهُ فَوقَ بَعضٍ مادامَ في الكُفُّرى)، لەنێو کیفەکەدا دێ، وەک گوێمان هێشووەکان ڕیزن، بەڵام دوای ئەوەی دێنە دەرێ بڵاودەبن، بەڵام ئەو کاتە دەنکە خورمایەکان پێکەوە لە هەر کام لە هێشووەکاندا ڕیز دەبن.

١٣)- ﴿رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ﴾، بژیوە بۆ بەندەکان، ئەم ﴿رِّزْقًا﴾، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە دەبێتە بەرکاری پێناو (مَفعُولٌ لأَجلِهِ)، کە لە ئەصڵدا چاوگە، بۆ ئەوە بژیوی بەندەکان بدەین، ﴿رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ﴾، واتە: هەموو ئەوەمان کردوە لە پێناوی ئەوەدا کە بژیوێک بڕەخسێنین بۆ بەندەکان.

١٤)- ﴿وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾، [هەروەها هەر بەو ئاوە کە دامان بەزاندوە، لەسەرێوە] زەوییەکی مردووشمان پێ ژیاندۆتەوە، (البَلْدَةُ: القِطْعَةُ مِنَ الأَرْض)، (بَلْدَةُ) پارچەیەک لە زەوی، بۆچی دەفەرموێ: (مَيْتاً) بۆ نافەرموێ: (مَيتَةً)؟ لەبەر ئەوەی مانای (مكان) ی لێگیراوە، یاخود مانای (بَلَد)ی لێگیراوە، بۆیە کە دەفەرموێ: (مَيتاً) واتە: شوێنێکی مردوو، یاخود سەر زەمینێکی مردوو.

١٥)- ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ﴾، هەر بەو شێوەیە هاتنە دەر، واتە: وەک چۆن زەوی دوای ئەوەی مردووە و، هیچ شوێنەواری ژیانی لێ نەبووە، نە ڕووەک و، نە زیندەوەرو نە هیچ شتێک، قاقڕو دێمەکار، بەڵام دوای ئەوەی ئاومان دابەزاندۆتە سەر، جموجۆڵ و ژیانی لێ پەیدابووە، لە ڕووەک، پاشان بەهۆی ڕووەکەکانە مێش و مەگەزو، ئنجا پەپوولە و هەنگ و، ئنجا تەیرو تواڵ و ئەوانە، چونکە ئەوانە هەموویان لە ڕووەک و لە شیناورد دەهاڵێن، ژیان و پێداویستیی خۆیان لەسەر ڕووەک پەیدا دەکەن، ئنجا وەک چۆن ئەو سەر زەمینە وشکە مردووەمان، زیندوو کردەوە، ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ﴾، هاتنە دەرەوەش بەهەمان شێوەیە، هاتنە دەرەوەی ئێوەش جارێکی دیکە لە زەوی، بە هەمان شێوەیە.

وشەی: ﴿الْخُرُوجُ﴾، (أل)ەكەی، بۆ ناساندنە، بەڵام ناساندنەكە بۆ (عهد)ە، واتە: دەرچوونەكەی خەڵكیش لە زەوی لە ڕۆژی كۆكرانەوەدا، بەهەمان شێوەیە، یاخود (أل)ەكە بۆ ناساندنە و، قەرەبووی پاڵوەلادراو (**مضافُ إِلَيه**)یە، یانی: (**كَذَلِكَ خُرُوجُ النَّاسِ**)، دەرچوونی خەڵكیش لە زەویی و زیندوو كرانەوەیان، بە هەمان شێوەیە.

## مەسەلەی چوارەم:

**خستنەڕووی بە درۆ دانانی کۆمەڵگا پێشووەکانی وەک گەلی (نووح)و، هاوەڵانی بیر و، گەلی ئەموودو، گەلی عادو فیرعەون و، گەلەکەی و، گەلی لووط و، هاوەڵانی درەختەکە (واتە: گەلی شوعەیب)، یان خاوەنانی باخە چڕو پڕەکە، کە لە دوورەوە وەک درەختێک دەهاتە بەرچاو، کە پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆ دانا، سەرنجام هەڕەشەی خوایان بەسەردا چەسپا، ئنجا مادام خوا بە دروستکردنی یەکەم جاریشەوە بێ توانا، دەستەپاچە نەبووە، بێگومان بە دروستکردنەوەی دووەم جاریشیان، بە دووبارە زیندوو کردنەوەشیان، دانامێنێ و، لە لای ئاسانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

پێش ئەوە دەڵێین: دوای ئەوەی خوا ﷻ لە ئایەتەکانی پێشێ کە لە مەسەلەی دووەمدا، ئایەتەکانی: (٣، ٤، ٥)، کە بێبڕوایەکان دەیانگوت: کە ئایا ئەگەر مردین و بووینەوە خاک و خۆڵ، زیندوو دەکرێینەوە؟ ئەوە گێڕانەوەیەکی دوورە، خوا ﷻ بەرپەرچی دانەوە کە ئێمە دەزانین زەوی چەند لە جەستەیان کەم دەکات و، پاشان تۆمارو نووسراوی پارێزەریشمان، یان پارێزراویشمان لەلایە، بەڵام ئەوان بەهۆی ئەوەوە کە بڕوایان بە حەق نەهێناوە، دوای ئەوەی بۆیان هاتوە، بۆیە کەوتوونە نێو کارێکی تێکەڵ و پێکەڵەوە، خۆشیان نازانن، هەر جارە شتێک دەڵێن، هەم لە بارەی قورئانەوە، هەم لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ هەر جارە شتێک دەڵێن، لە ئەنجامی ڕەتکرنەوەی هەقدا، بۆیە ئەوەیان لە لا دروست بووە، کە زیندوو ناکرێنەوە، خواش ﷻ وێڕای ئەو دوو بەڵگەیە کە پێشتر

خرانە ڕوو، خستنەڕووی هۆکاری بێبڕواییشیان بە ڕۆژی دوایی کە بریتیە: لە ڕەتکردنەوەی حەق لە لایەنی ئەوانەوە، دوای ئەوە سەرەتا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ گەردوون، بە ئاسمان و زەوییەوە، پاشان سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ گەردوون کە تەماشای دەورو بەرو گەردوون بکەن، هەمووی بەوپەڕی ڕێک و پێکیی دروستکراوە، هەموو بەوپەڕی حیکمەت دروستکراوەو، ناڕێکیی نیە، هیچ کەلێن و کونێک نابینی لە دروستکراوی خوای پەروەردگاردا، تەماشای هەر شتێکی زەوی بکەی، هەر لە چیایەکانی، هەر لە بەرگە هەواییەکەی، بەرگە ئاوییەکەی، ئەو هەموو ڕووەک و شیناوردەی خوای پەروەردگار تێیدا دەڕوێنێ، چ ئاوی شیرین کە بەهۆی بارانەوە دەستتان دەکەوێ و، خوا لە ناخیی زەویدا بۆتان دەپارێزێ و بۆتان هەڵدەگرێ، تەماشای هەر شتێکی زەوی بکەن، کە لەسەر زەویەو، تەماشای ئاسمان بکەن، زەویی و ئاسمان بە زمانی حاڵ پێتان دەڵێن: ئێمە مشوور خۆرێک و سەرپەرشتیارێکمان لە پشتەوەیەو، ئەوپەڕی ڕێک و پێکییشمان تێدا ڕەچاو کراوە.

کەواتە: ژیانی مرۆڤیش نابێ ناڕێک و پێکیی تێدابێ، ئەگەر بێت و ژیانی مرۆڤ بەس ئەم ژیانە دنیاییە، کەم و کورتە بێ، کە تەنیا بەشی ئەوە دەکات تێیدا تاقی بکرێتەوە، ژیانی مرۆڤ وەک چیرۆکێکی بێ تام و ڕۆمانێکی بێ سەرنجام وایە، وەک شانۆگەرییەک وایە کە دەبێ لە چوار پێنج ئاڵقە پێک بێ، کەچی هەر لە دوو ئاڵقە پێکهاتوەو، بینەرەکان کە تەماشای دەکەن، دەزانن ناتەواوە، ژیانی دنیا ئەگەر ڕۆژی دوایی بەدوادا نەیەت، ئەم ژیانەی ئێستامان کە مردن سەرنجامەکەیەتی، ئەگەر زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشتی بەدوادا نەیەت، ناڕێک دێتە بەرچاو، بەڵام لە هەموو گەردوونی خوادا ناڕێکیی نیە، کەواتە: مرۆڤ کە شا گوڵی باغی گەردوونە، مرۆڤ کە جێنشینی خوایە، لەسەر زەوی، ناگونجێ ژیانەکەی ناڕێک و پێکی تێدابێ، بۆ سەرنجدانی مێژووش کە ئێستا باسی دەکەین، خوا هەشت لە گەلە فەوتێنراوەکان باس دەکات، کە تۆ ئەگەر تەماشای

مێـژووش بکـەی، وەک چـۆن کتێبـی گـەردوون پێـت دەڵـێ: مـن خاوەنێکـم هەیـەو سەرپەرشـتیارێکم هەیـە، بـە سیسـتمێک منـی داناوە بەڕێـوە دەچـم، ژیـانی بەشـەریش کۆمەڵـگاکانی بەشـەریش کـە لەسـەر زەوی ڕابـردوون، ئەگـەر تەماشـایان بکـەی و لێیـان وردبیـەوە، بـە تایبـەتی گەلـە فەوتێـنراوەکان، لێـت حاڵیـی دەبـێ کـە بەشـەر هـەر کاتـێ لایدابـێ لـە پەیامـی خـوا، پێغەمبـەرانی خـوای بـە درۆ دانابـێ، لـەو حیکمەتـە کـە خـوا بـۆی خوڵقانـدوە، دوور کەوتبێتـەوە، ئـەو حیکمەتـەی نادیـدە گرتبـێ، کـە بـۆ تاقیکرانـەوە لێـرە دانـدراوە، تـووشی سـزا بـووە، کەواتـە: ژیـانی مرڤیـش و مێـژووی مرۆڤیـش جارێکـی دیکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی زینـدوو بوونـەوەو سـزاو پاداشـت هەیـە، چۆنیەتیـی پێکـەوە پەیوەسـتکردنەوەی ئـەو ئایەتانـە لەگـەڵ ئەوانـەی پێشـێدا بـەو شـێوەیە کـە وەک پێشـتریش ئامـاژەم پێـدا لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوەو، ڕەنگـە هەشـبێت و نەکەوتبێتـە بەرچـاوی مـن، بـەڵام نەمبینیـوە ئـاوا بـەو شـێوەیە پێکـەوە پەیوەسـت کرابنـەوە، بێگومـان زۆر لـە حیکمـەت و نهێنییـەکانی قورئانیـش لـە ئەنجامی چۆنیەتیـی پێکـەوە پەیوەسـتکردنەوەی ئایەتەکانـەوە، بۆمـان دەردەکـەون.

خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

١)- ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ ﴾، لە پێش واندا گەلی نووح بە درۆیان دانا، چییان بە درۆ دانا؟ دوایی دەردەکەوێ، کە دەفەرموێ: ﴿ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ ﴾، هەر کامێکیان پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، یانی: (**كَذَّبَت قَبلَهُم قَومُ نُوحٍ نُوحاً**)، لەپێش واندا گەلی نووح، نووحیان بە درۆ دانا، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر نووح بێ، ئەو پەیامەی کە لە خواوە بۆی هێنابوون، ڕەفزیان کردو قبووڵیان نەبوو، نووحیشیان بە ناڕاست ئەژمار کردو، پەیامی خوا کە بۆی هێنابوون لێیان وەرنەگرت، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا، بە تەفصیلی باسی بەسەرهاتی (نوح عليه السلام)و گەلەکەیمان کردوە.

٢)- ﴿ وَأَصْحَـٰبُ ٱلرَّسِّ ﴾، هەروەها هاوەڵانی بیرەکەش ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَـٰبُ ٱلرَّسِّ ﴾، ﴿ ٱلرَّسِّ ﴾، (**البِئرُ غَيرُ المَطوِيَّة**)، بیرێکە هەڵنەبەسترابێ، دەبێ بیر دوای

ئەوەی چاڵەکە هەڵدەقەندرێ، دیوارەکانی هەڵبەسترێن، بەردی بە ڕیز لێدابنرێ تاکو دا نەڕووخێتەوە، دەشگونجێ: ﴿ٱلرَّسِّ﴾، بە مانای شیوێک بێت، یاخود بە مانای چاڵێک بێت، لە شێوەی بیرێکدا، بەڵام هەڵنەبەسترابێ، ئنجا بۆچی بەو ناوە ناو نراون؟ گوتراوە: ئەوانە پێغەمبەرێکیان بۆ هاتوە، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ، وەک لە تەفسیری سوورەتی (الدخان)دا باسمان کرد، کە لەوێش باسی (**أَصحابُ الرَّسّ**) کراوە، کە ئەوانە پێغەمبەرێکیان بۆ هاتوە، هەندێک دەڵێن: هەندێک دەڵێن: ئەو پێغەمبەرەی بۆیان هاتوە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، ناوی (**حنظلة**) بووە، لە هەموو قورئاندا تەنیا لەو دوو شوێنەدا، باسی (**أَصحابُ الرَّسّ**) کراوە لێرە و لە سوورەتی (الفرقان)دا: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾﴾الفرقان، ﴿ٱلرَّسِّ﴾، چ ناوی بیرەکە بێ (بیرێکی چاک نەکراو)، چ ناوی دۆڵ و شیوێک بێ، ئەوە مێژوونووسان دەیڵێن و لە قورئاندا باس نەکراوە، بەڵام بێگومان خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: هاوەڵانی بیر، وەک چۆن لە سوورەتی (**البروج**)دا دەفەرموێ: (**أَصحابُ الأُخدود**)، ئەوانەی خەندەکەکەیان لێدابوو، خاوەنانی بیرەکەش، دەبێ موناسەبەتێکی وای هەبێ، کە دەڵێن: ئەوان ئەو پێغەمبەرەی خۆیان کە ناوی (**حنظلة**) بووە، کوشتوویانە، یان بە زیندوویی خستوویانەتە نێو بیرەکەوەو بیرەکەیان داپۆشیتەوە، یان خستوویانەتە نێو شیوێکی قووڵەوەو کوشتوویانە، وشەی (**رَسَّهُ: أَي دَفَنَهُ**)، (**رَسّ**) بە مانای ناشتن و خستنە نێو زەوی دێ، کەواتە: لێرەدا ئەمە (**إِضافَةُ الشَّيء إلى مَوطِنِهِ**) پاڵدانی شتێکە بۆ لای شوێنەکەی، (**أَصحابُ الرَّسّ**) هاوەڵانی بیرەکە، ئەو بیرەی ئەو پێغەمبەرەی خۆیانیان تێدا کوشتوە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ.

**٣)**- ﴿وَثَمُودُ﴾، هەروەها گەلی سەموودیش (پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا)، پێغەمبەرەکەیان ناوی صاڵح عليه السلام بوو، و ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**الحجر**)دا بەسەرهاتی صاڵح عليه السلامو، گەلەکەی گەلی سەموودمان بە درێژیی باس کردوە.

٤)- ﴿ وَعَادٌ ﴾، هەروەها گەلی عاددیش (کە پێغەمبەرەکەیان ناوی هوود عليه السلام بوو)، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی هوود دا بەسەرهاتی (هوود) عليه السلام و گەلەکەی گەلی عاددمان بە تەفصیلْ باس کردوە.

٥)- ﴿ وَفِرْعَوْنُ ﴾، هەروەها فیرعەونیش (لە پێش واندا پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ دانان). فیرعەون دوو لە پێغەمبەرانی خوای بە درۆ دانان مووساو هارِوون صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە ئێمە هەم لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی **(الشعراء)** دا، هەم لە سوورەتی **(الأعراف)**دا بەسەرهاتی مووساو هارِوون **(عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلام)**و، گەلەکەیان و، لە بەرانبەریشیاندا فیرعەون و قارِوون و هامان و دارو دەستەکەیان بە تەفصیلْ باسمان کردوە.

٦)- ﴿ وَإِخْوَانُ لُوطٍ ﴾، هەروەها برایەکانی (لوط)یش.

لـووط عليه السلام کـە بـرازای ئیبراهیمـە خـوای پـەروەردگار نـاوی لـە گەلەکەیـان نـاوە، برایەکانـی لـووط، بەهـۆی ئـەوەوە کـە هـەر لەگەڵیـان بـووە، ئەگەرنـا لـەوان نەبـووە، لـووط عیبرانیـی بـووە، بـەڵام ئـەو خەڵکـە کـە (لووط)یـان بـۆ لا نێـردراوە، خەڵکـی (سـەدووم) و (عەمـوورە)و ...هتـد، ئەوانـە کەنعانیـی بـوون، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی کەسـێک زۆر لەگـەڵ شـتێک بـێ، دەگوتـرێ: **(أَخـو فُـلانٍ)**، لەبـەر ئـەوەی زۆری لەگەڵدایـە و، بـراش زۆر پێکـەوە دەبـن، ئێمـە بەسـەرهاتی (لوط)یشـمان عليه السلام لەگـەڵ گەلەکـەی هـەر لـە تەفسـیری سـوورەتی (هـوود)دا خسـتۆتە ڕوو.

٧)- ﴿ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْأَيْكَةِ ﴾، هاوەڵانی یاخود خاوەنانی درەختەکەش، کە بە (ئەهلی مەدیەن) یش ناو هاتوون، پێغەمبەرەکەیان شوعەیب عليه السلام بووە، بەسەرهاتی ئەوانیشمان دیسان لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (هود)دا خستۆتە ڕوو، وشەی **(أَيكَة)**، واتە: درەختە چڕو پڕەکان، بەڵام هەندێک لە زانایان دەڵێن: یەک درەخت بووە و، زۆر گەورە بووە، هەندێکیش دەڵێن: باغێکی گەورەو چڕوپڕ بووە، بەڵام لە دوورەوە کە تەماشات دەکرد، وا پێکدا چوو و چڕو پڕ بووە، وەک درەختێک دیار بووە.

کەواتــە: (**أَيكَــة**)، دەگونجــێ بڵێیــن: باغێکــی چــڕو پــڕ، دەشــگونجێ بڵێیــن: درەختێــک، ئـەو خەڵکـەش هـەم بـە (مەدیـەن) ناوبـراون لـە قوڕئانـدا، هـەم بـە (**أَصْحَـابُ الأَيْكَـة**) خاوەنـانی درەختەکـە، یاخـود باخەکـە.

هەندێـک لـە زانایانیـش گوتوویانـە: تاکـە پێغەمبەرێـک ، بـۆ دوو کۆمەڵـە خەڵـکان نێردرابـێ، بـۆ دوو قەومـان، شـوعەیب بـووە، کـە هـەم بـۆ (**أَصحابُ الأَيكَة**) نێـردراوە، هـەم بـۆ گـەلی مەدیەنیـش، بـەڵام واپێدەچـێ کـە گـەلی مەدیەنیـش هـەر خاوەنـانی بـاخ و درەختەکـە بـن.

٨)- ﴿وَقَوْمُ تُبَّعٍ﴾، گەلی توببەعیش، کە لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (الدخان)دا باسی گەلی (توببەع)مان کرد، کورتە باسێکمان لە بارەوە کردوە، کە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ توببەع ئینسانێکی باش بووە، دەبێ پیاوێکی ساڵح بوو بێ، گوتراویشە: یەکێک لە پێغەمبەران بووە، بەڵام دیارە خەڵکەکەی، گەلەکەی لەگەڵی نەبوون، بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا زەمی قەومی توببەع دەکات و، زەمی توببەع خۆی ناکات، لە حەدیسدا هاتوە: قسە بە توببەع مەڵێن، خەڵکەکەی خراپ بووە.

٩)- ﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾، هەر کامێک لەوانە پێغەمبەرانی بە درۆ دانا، بۆیە هەڕەشە پێویست بوو، واتە: ئەوەی هەڕەشەی پێکرابوو (سزایەکە)، ئەو سزایەی لەسەر چەسپا، هەر کامێکیان جۆرە سزایەک، گەلی نووح بە تۆفان خنکێنراون، (**أَصحابُ الرَّسّ**) خوا باسی سزایەکەیانی نەکردوە، گەلی سەموود بە چریکەیەک، گەلی عاد بە با، گەلی فیرعەون لە دەریای سووردا خنکێنراون، گەلی لووط بە هەڵگێڕدرانەوەی شوێنەکانیان، گەلی شوعەیب خوا ﷻ بە هارژن و بروسکەیەک، کە لە ئاسمانەوە لێی داون، گەلی توببەعیش سزایەکەیان دیار نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: هەڕەشە لەسەریان پێویست بوو، واتە: ئەوەی هەڕەشەی پێکرابوو.

﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ﴾، (**كلٌّ**): تەنوینەکـەی (**عِـوَضٌ عَـنِ المُضَـافِ إلَيـهِ**)، قەرەبـووی پاڵـوەلادراو، واتـە: (**كُلُّ أُولَئِـكَ كَـذَّبَ الرُّسُـلَ**)، هـەرکام لەوانـە پێغەمبەرانـی بـەدرۆ

دانان، (وَعِيد) بە مانای هەڕەشەیە، واتە: هەڕەشە لێکران بە سزا، ئنجا ئەگەر هەڕەشە لێکران بە سزا چەسپا بێ، مانای وایە سزایەکەیان بەسەردا چەسپاوە.

کە لێرەدا خوا ﷻ باسی ئەو هەشت گەلە دەکات، دەگونجێ مەبەست پێی دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺو، هەڕەشە کردن لە کافران بێ، دەشگونجێ وەک باسمان کرد، بەڵگەیەکی دیکە بێ لەسەر زیندووکرانەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەها تەماشای ئەو گەلانە بکەن! هەر کامێکیان کە لایداوە تووشی سزا وجەزرەبەی خوا بووە، کەواتە: ئێوەش پەند لەوان وەربگرن، بشزانن کە مادام خوا ﷻ بەسەر ئەوانەدا ڕانەبردووەو، لەسەر لادان سزای داون، کەواتە: ژیانی مرۆڤ هەر ئێستا نیە، ئەم ژیانە قۆناغی دیکەی بە دوادا دێن، بە بەڵگەی ئەوە کە هەر کەسێک لابدات، خوا ﷻ سزای دەدات، ئنجا بە دڵنیایی دەبێ ژیانێکی دیکە هەبێت کە لەوێ سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی بەندەکان بدرێتەوە.

**١٠)-** ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ﴾، ئایا ئێمە لە بەرانبەر دروستکردنی یەکەمدا، دەستەپاچە و بێ توانا بووین؟

**١١)-** ﴿بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ﴾، بەڵکو ئەوان لە تێکەڵییدان لە دروستکرانەوەی تازە، واتە: دان بەوەدا دێنن کە خوا دروستی کردوون و بە دیهێناون و، بێ توانا نەبووە، بەڵام پێیان وایە کە لەوەدا ئیشکالیان بۆ دروست بووە، کە لە دووبارە دروستکرانەوەیاندا، خوا ﷻ بێ توانا بێ! کە دەفەرموێ: ﴿لَبۡسٖ﴾، بە نەزانراو (نكرة) هاتووەو مانای (جۆر) دەگەیەنێ، لە تێکەڵیەکیی زۆر سەرسوڕهێنەردان، لە بارەی دروستکردنەوەی تازەوە. (**خَلقٍ جَدِيد**: **الجَدِيدُ الشَّيءُ الَّذِي فِي أَوَّلِ زَمانِ وُجُودِهِ**)، (**جَدِيد**): هەر شتێکە لە سەرەتای بوونیەوەبێ، لێرەدا مەبەست لە (**لَبس**) لە تێکەڵیی، خاوەنی (**التحرير والتنوير**) لەوبارەوە گوتوویەتی:

(**اشْتِباهُ المَأْلُوفِ المُعْتادِ الَّذِي لا يَعْرِفُونَ غَيْرَهُ، بِالواجِبِ العَقْلِيِّ الَّذِي لا يَجُوزُ انْتِفاؤُهُ، فَإِنَّهُمُ اشْتَبَهَ عَلَيْهِمْ إِحْياءُ المَوْتى وهو مُمْكِنٌ عَقْلًا، بِالأَمْرِ المُسْتَحِيلِ فِي**

**العَقْلِ، فَجَزَمُوا بِنَفْيِ إمْكانِهِ فَنَفَوْهُ، وتَرَكُوا القِياسَ بِأنَّهُ مَن قَدَرَ عَلى إنْشاءِ ما لَمْ يَكُنْ مَوْجُودًا، فهو عَلى إعادَتِهِ قدير).**

واتە: لێرەدا ئەوانە شتێک کە خوویان پێوە گرتووەو، بۆ ئەوان شتێکی زانراو بووە و، هەر ئەوەشیان زانیوە، ئەوەیان لێ تێکەڵ بووە، لەگەڵ شتێکدا کە بە عەقڵ پێویستە ببێ، ئەوان زیندووکرانەوەی مردوان، کە لە ڕووی عەقڵییەوە شتێکی گونجاوە، لێیان تێکەڵ بووە، لەگەڵ شتێکدا کە لەگەڵ عەقڵدا موستەحیل بێ، پێیان وایە ئەویش لەو جۆرەیە، بۆیە حوکمیان کردوە، بەوەی موستەحیلە خوا مردوان زیندوو بکاتەوە، بەڵام وازیان لە قیاس هێناوە، کە کەسێک بتوانێ شتێک لە سەرەتاوە دروست بکات، دواییش دەتوانێ دووبارەی بکاتەوە.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ﴾، یانی: (**أَفَعَجَزنا في الخَلقِ الأَوَّلِ حَتَّى نَعجِزَ عَنِ الثَّاني**)، ئایا لە بەرانبەر دروستکردنی یەکەمدا، دەستە پاچە و، بێ توانا بووین، تاکو لە بەرانبەر هی دووەمدا (کە زیندوو کرانەوەیە)، بێ توانا بین؟ دەگوترێ: (**أَعيَاهُ: السَّيرُ أَي: أَعجَزَهُ**)، واتە: ڕۆیشتن ماندووی کردو، شەکەتی کرد، (**يَعْيَا: أَعيِيَ الرَّجُلُ وَأَعيَا البَعِيرُ أَي: تَعِبَ تَعْبَاً شَدِيداً**)، واتە: زۆر ماندوو بوو، بەڵام (**عَيَّ**) ئنجا (**عَيِّىَ**)، چ بە یەک (ي)، بێ و، چ بە دوو (ي) بێ، هەردووکیان مەبەست پێیان نەتوانینە کە مرۆڤ شتێک دروست بکات، یاخود نەتوانینە لە بەرانبەر ئەوەدا کە قسەیەک بکات، یان کارێک بکات کە پێی سپێردراوە، بەڵام (**إعياء**) بە مانای ماندوو بوونە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ مەبەستی پێ ماندوو بوون نیە، بەڵکو مەبەستی پێ بێ توانایيە، ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ﴾، ئایا لە بەرانبەر دروستکرانی یەکەمدا بێ توانا و دەستە پاچە بووین؟ تاکو لە بەرانبەر دروستکردنەوەی دووەمدا کە بریتیە لە زیندووکردنەوەی، بێ توانا بین؟ ﴿بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ﴾، بەڵکو ئەوانە خۆیان تووشی تێکەڵ و پێکەڵیی کردوە لە بەرانبەر دروستکردنەوەی تازەدا، کە لەڕاستییدا گەر عەقڵیان بەکارهێنابایە، دەیانزانی: کەسێک بتوانێ لە سەرەتاوە شتێک بێنێتە دی، دواییش دەتوانێ بیگێڕێتەوە.

## كورتە باسێك

## لە بارەی حیكمەتی خواوە لە دروستكردنی ڕووەك و دارو درەختدا

خوا شتیوان بێ، ئێمە شازدە (١٦) حیكمەت لەوبارەوە دەخەینەڕوو، چونكە لەو ئایەتانەدا كە پێشتر تەفسیرمان كردن، خوا ﷻ زۆر باسی دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە، پاشان ڕواندنی باغ و بێستان و دانەوێڵە، هەروەها دارخورماو، هەموو ئەو شتانەی كە ژیانی مرۆڤ پێویستی پێیانە، لەسەر زەوی، خوا ﷻ زۆری باسكردن، چەند ئایەتێكی بۆ تەرخانكردن، بە باشم زانی كە ئەو كورتە باسە بخەینەڕوو لەوبارەوە، هەرچەندە كاتی خۆی لە سەرەتای تەفسیركردنی سووڕەتی **(الشعراء)**یشدا لەوێشدا كورتە باسێكمان لەو بارەی ڕووەكەوە هێناوە، لێرەشدا ئەو كورتە باسە دێنین كە ڕاستەوخۆ لە تەفسیری **(الجواهر في تفسير القرآن الكريم)**، هی تەنتاویی جەوهەریی لە جوزئی (٢٣)ی تەفسیرەكەی ئەو كە جوزئی (٢٦)ی تێدایە، لە لاپەڕە: (١٨ - ٢١)، دیارە بە تۆزێك ڕوونكردنەوەو بە دارشتنی خۆم لێی وەردەگرم، هەڵبەتە ئەو بیست (٢٠) حیكمەتی هێناون، بەڵام من شازدە (١٦)یانم لێ هێناون:

١- هەموو جۆرەكانی دانەوێڵە: چ جۆ، چ گەنم، چ برنج و ماش و هەرزن، دەبینین، كە خوا ﷻ ئەو دانەوێڵانەی خستوونە نێو چەند توورەكەیەكەوە، كە هەر كام لەو كیفانە، لەو توورەكانە سەرێكی هەیە، وەك ڕم وایە، كە بە كوردیی (داسووی)ی پێ دەڵێن، داسووی جۆ، داسووی گەنم، داسووی برنج، هەموویان تیژن بۆ ئەوە كە بەهۆی ئەو داسووانەوە باڵندەو چۆلەكەو پاسارییی نەتوانن ئەو دانەوێڵەیە بخۆن و، لە ڕاستییدا ئەگەر وانەبووایە دانەوێڵەكان، هیچیان نەدەمان بۆ مرۆڤان، باڵندەو چۆلەكەو پاسارییی هەموویان دەخوارد، بەڵام ئێستا وەك خوای بەرز ئەو دانەوێڵەی خستبێتە نێو قەڵایەكەوە و كەسێك بە شمشێرەوەو بە ڕمەوە پارێزگاریی لێ بكات.

٢- ئەگەر تەماشای درەخت و جۆرەكانی ڕووەك بكەین، دەبینین، ئەوانە خوا ﷻ بە جۆرێكی خوڵقاندوون، لەو شوێنەی كە تێیدان و چەسپاون، وەک ئاژەڵ و پەڕەووڕو باڵندەو چۆلەكەو .... هتد، ناتوانن بجووڵێن، لە شوێنی خۆیانن، بەڵام خوا ﷻ توانایەكی پێداون، هەر لە شوێنی خۆیان كە لێی هەن، ئەو زەوییە بمژن، وەک چۆن بێچووی ئاژەڵێک مەمكی دایكی دەمژێ، یان گوانی دایكی دەمژێ، ئەو ڕووەک و دارو درەختانەش لە شوێنی خۆیان، ئەوەی كە پێویستیانە لە خۆراک، لەو زەوییە دەیمژن، پاشان ئەو خۆراكە دابەش دەكەن بەسەر قەدو لق و پۆپ و گەڵاو میوەكاندا و، هەر كامیان ئەوەی پێویستی پێیەتی، لەگەڵیدا گونجاوە.

٣- ئەگەر تەماشای ڕەگ و ڕیشەی ڕووەكەكان بكەین، ڕووەک واتە: چ دارو درەخت، چ دانەوێڵەو شیناورد، چ سەوزایی و تەڕەكار، دەبینین، هەر كام لە ڕووەكەكان ڕەگ و ڕیشەكانی بڵاودەكاتەوە، بە زەویدا، وەک چۆن كەسێک كە چادرێک، خێوەتێک، ڕەشماڵێک هەڵدەدات، دوایی ئەو چادرو ڕەشماڵە لەملاولای پەت هەن، بە پەتەكان دەبەسترێتەوەو، سینگیان بۆ دادەكوترێ، دواییش ئەستوندەكێک وەبەر نێوقەدی چادرەكە، یان خێوەتەكە دەدرێ، بەهەمان شێوە قەدی درەختەكە، قەدی ڕووەكەكەش وەک ئەستوندەكەكە وایە، ڕەگ و ڕیشەكانیش وەک ئەو سینگانە وان، كە داكوتراون بە دەوریداو، ئەو پەتانەی كە بە سینگەكانەوە بەستراون، ڕەگ و ڕیشەكانیش بەهەمان شێوەن، كە ئەو درەختە یان ئەو ڕووەكە بە قەدەر قەبارەی خۆی كە لە دەرێیە و، بەپێی ئەوەوە، گونجاو لەگەڵ ئەو قەبارەیەدا، ڕەگ و ڕیشەكانی بڵاودەبنەوە، یانی: هەر درەختێک كە دەبینین قەبارەی سەرێی چەندە، دەبێ دڵنیابی كە قەبارەی خوارێشی لە قەدەر ئەوەندەیە، درەخت هەتا بەرزتر بێ، ڕەگەكانیشی قوڵترن، بۆ ئەوەی بتوانن ڕایبگرن، بەڵام ئەوەی قەبارەی دەرێی كەمتر بێ، تەماشا دەكەی ڕەگەكانیشی كەمترن، ڕەنگە تاكە ڕووەكێک كە لەو بنچینەیە هەڵاوێردرابێ بریتی بێ لە تەڕەكارو شووتیی و، خەیارو، ترۆزیی و، كاڵەک و ئەوانە، ئەوانە قەبارەی دەرێیان زۆرەو میوەشیان زۆرە، بەڵام ڕەگەكانیان لە قەدەر ئەو قەبارەی دەرێیان نیە و، لەو بنچینەیە هەڵاوێردراون.

٤- ئەگەر تەماشای گەڵای درەختەکان بکەین، هەر گەڵایەک دەبینی: دەماری پێدا بڵاوبوونەوە، سەرەتاش دەمارەکە ئەستوورە، دوایی وردە وردە، ئەو دەمارە باریك دەبن و چەند لقێکی دیکەیان لێ جیادەبنەوە، کە باریکترن و باریکترن، یانی: ئەگەر تەماشای گەڵای درەختێک بکەین، وەک چۆن شتێک دەچنرێ، خوا ﷻ چەند ڕەگ و دەمارێکی ئەستووری بە باری درێژیی و بە باری پانییدا بۆ کردوون، ئنجا هی بچووک بچووک، ئەمە بۆچی؟ ئەمەش هەمووی بۆ ڕاگرتنی ئەو گەڵایە، کە وەک پەیکەری ئێسکی وان و، پاشان وەک کەناڵێکیش وان و لە ڕێی ئەو دەمارانەوە خواردن دەچێ بۆ ئەو گەڵایانە.

٥- ئەگەر تەماشای نێوک و دەنکەکان بکەین، وەک نێوکی هەڵووژەو، قەیسیی و، خۆخ و، خورماو ئەوانە، دەنکەکانیش وەک دەنکی گەنم و، هەرزن و، ماش و، جۆو، برنج و، ئەوانە، دەبینین: چ نێوکەکان، چ دەنکەکان، خوای بەرز قایمی خوڵقاندوون، بۆ وێنە: نێوکە خورما (نواة التمر) زۆر بە زەحمەت دەشکێ، هەروەها نێوکی قەیسی و خۆخ و، هەڵووژەو ئەوانە، هەروەها جۆرە میوەکانی دیکەش کە ڕەنگە لە وڵاتی ئێمەدا نەبن، ئایا خوا ﷻ بۆچی ئەو نێوکانەی وا مەحکەم خوڵقاندوون؟ هەروەها دەنکەکانیش دەنکە گەنمێک، دەنکە برنجێک، دەنکە ماشێک، کە مەگەر ببرژێنرێ یاخود بکوڵێنرێ، ئەگەرنا ئاوا بە ئاسانیی ناخورێ و، ناشکێنرێ، لەبەر ئەوەی دوایی لەو دەنکە یان لەو نێوکە کۆپی دەکرێتەوەو جەوهەری ئەو ڕووەکە لە نێو ئەوێ دایە، بۆیە خوا ﷻ کیفێکی مەحکەمی بۆ خوڵقاندوە، بەڵام کاتێک دەچێتە نێو زەوی، هەر ئەو نێوکە مەحکەمە، ئەگەر نێوکە خورمایە، ئەگەر نێوکە قەیسییە، ئەگەر خۆخە، هەڵووژەیە، هەرچی هەیە، هەروەها ئەو دەنکە ئەگەر دەنکی، گەنمە، برنجە، نیسکە، نۆکە، ماشە ... هتد، دەبینین لە کاتی خۆیداو لە شوێنی خۆیدا، ئەو ڕەقە نەرم دەبێ و وردە وردە شی دەبێتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی ببێتە دوو بەش، بەشێکی بەرەو سەرێ وەک چرۆی نەمامێک و، بەشێکیشی بەرەو خوارێ وەک ڕەگ و ڕیشە لێی دەردەچێ.

٦- ئەگەر تەماشای هەر کام لە نێوکەکان (نوی) و دەنکەکان (حبوب) بکەین، دەبینین کاتێک دەچنە نێو زەوی، لەو کەشەداو، لەو کاتەدا، لەو ژینگەیەدا کە دەگونجێ تێیدا

بڕوێن، کیفەکەیان لێ لادەچێ، دوایی ئەوەی کە تێیدا داندراوە و، تێیدا پارێزراوە، وێنەی خۆی بە چەند بەرانبەر، جارێکی دیکە بەرهەم بهێنێتەوە، یانی: دەگونجێ دەنکێک کە دەڕوێ، چەندان گوڵ دەر بکات هەر گوڵێک چەندان دەنکی تێدابن، هەروەها دەنکە خورمایەک، دەبێتە نەمامی و دارخورمایەکی قەد بڵندی زۆر بێ ڕەزا، کە چەندان هێشووە خورما دەگرێ، هەر هێشووەی چەندان دەنکە خورمای تێدان.

٧- وەک باسمان کرد کاتێ کە ئەو نێوک و، ئەو دەنکانە دەچنە نێو زەوی و، ئاو دەدرێن، ژینگەی خۆیانیان بۆ دەڕەخسێ، هەرکامیان یەکسەر دەبێتە دوو بەش: بەشێکی دێتە دەرێ بەشێوەی چەکەرەیەك، یان بەشێوەی چرۆیەک، ئەگەر دانەوێڵە بێت، چەکەرەیەک دەدات و، ئەگەر درەخت بێ پێی دەگوترێ: نەمام و چرۆ دەردەکات، ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە ئەو چرۆیە، یان ئەو چەکەرەیە، گەورە دەبێ، بە ئەندازەی ئەوەش ڕەگ و ڕیشەکانیشی لە زەویدا گەورە دەبن، ڕەگ و ڕیشەکانی خۆراک دێنن، واتە: دیوە پەنهانەکەیەتی کە خۆراک دێنێ بۆ دیوە دیارو بەرچاوەکەی کە قەد و لق و پۆپ و گەڵایەکەیەتی، یاخود لاسکەکەیەتی و ئەو گوڵەیەتی کە لە لاسکەکە پەیدادەبێ بە نسبەت دانەوێڵەوە.

٨- بەر لەوەی میوەکان دەربچن لە درەختەکان، گەڵایەکان دەردەچن، ئەو گەڵایانەش دەبنە هۆی ئەوەی دوایی کە میوەکە دەرچوو، پارێزگاریی بکەن لەو میوەیە، ئنجا پارێزگاری تیشکی خۆری لێ بکەن، سەرما و گەرمای لێ بکەن و، پارێزگاریی زیندەوەرانی لێ بکەن و، پارێزگاریی تەیرو توالّی لێ بکەن، گرنگ ئەوەیە ئەو گەڵا و لق و پۆپانە دوایی پارێزگاریی دەکەن لەو تۆوەو لەو نێوکە، گەڵایەکان چڕ و پڕ دەبن و میوەکان لەنێو گەڵایەکاندا جۆرێک لە خۆ شاردنەوە، خۆیان پەنهان دەکەن.

٩- گەڵایەکان، کە میوەکان دەپارێزن، لە سەرماو گەرما، هەروەها لە باڵندەو چۆلەکەو پاساریی و لە زیندەوەران و مێش و مەگەز، بەڵام دیارە میوەکە پێویستیی بەوە هەیە، کە تیشکی خۆری لێ بدات، پێویستیی بە گەرمای خۆر هەیە، بۆ ئەوەی پێ بگات، هەر

بۆیه گەڵایەکان بە جۆرێک نین نەفەس بڕ بن و هیچ بوار نەدەن، نە هەوا هاتووچۆ بکات، نە تیشکی خۆر لە میوەکان بدات، بەڵکو کەلێن و بۆشایی، هەم بۆ جووڵانی هەواو، هەم بۆ چوونە نێوی تیشکی خۆر، هەروەک چۆن برژانگەکانی چاو ڕێگا دەگرن لەوەی تۆزو خۆڵ بێتە نێو چاو، بەڵام ڕێگای بینیی لێناگرن.

**١٠-** وەک چۆن کۆرپە لە منداڵدانی دایکیدا، یان لە بەچکەدانی ئاژەڵدا دەمێنێتەوە، هەتا دەگاتە ئەندازەیەک، کە دوایی دێتە دەرێ، بتوانێ بژی، واتە: تاکو بە کەڵکی ژیانی دەرێ دێ، لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە، میوەکانیش بە هەمان شێوە، هەر لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە و، تاکو نەگات بە زەحمەت لێ دەبێتەوە، یانی: کاتی نەهاتوە، میوەی نەگەیشتوو بە زەحمەت لە درەختەکەی دەبێتەوە، چونکە کاتی نەهاتوە، بەڵام دوای ئەوەی کاتی هات ئەگەر لێی نەکەیەوە جاری واهەیە، خۆی بەر دەبێتەوە و دەبێ ئەوێ بەجێ و بهێڵێ بچێتە قۆناغێکی دیکەوە، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان لێی بەهرەمەند بن.

**١١-** بۆ ئێمە جێی پەندو عیبرەتە، کە ئەو گەل و کۆمەڵگایانەی کە لە ڕووی هۆش و عەقڵەوە، لە ڕووی زانستەوە، لە ڕووی پێگەیشتنەوە، جارێ کامڵ نەبووبن، هەر لە حاڵەتی سەرەتایی دا وەک لە نێو قۆزاخەدا دەمێننەوە، گەل و کۆمەڵگا دەبێ بگاتە حاڵەتی گەیشتن و پێگەیشتن و بە کەڵک هاتن، ئنجا دەتوانێ بێتە دەر، زۆر گەلانی سەرەتایی هەن، ئێستاش لە هەندێک شوێن هەر لە شوێنی خۆیان، لە دارستەکانی خۆیاندا دەژین، لە شوێنە لاچەپەکانی خۆیاندا، دەژین، لە شوێنە دوورە دەستەکاندا دەژین، چونکە بایی ئەوەندە تێگەیشتن و پێگەیشتیان نیە، بێنە نێو خەڵکی دیکە، ئێمەش بە هەمان شێوە وەک ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ لە ئەصڵدا ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ مرۆڤایەتیی دروست کراوە: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ...﴿١١٠﴾﴾ آل عمران، بەڵام کەی دەتوانین بچینە نێو خەڵک و ڕووی چوونە نێو خەڵکمان هەبێ؟ کاتێک تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بین و، بتوانین سوودیان پێ بگەیەنین، بەڵام ئەگەر وابین نەک بەرەی ئەوانمان پێ لە ئاوێ نەهێتە دەرێ، بەرەی خۆشمان پێ لە ئاوێ نەهێتە دەر، دیارە هەر بەو شێوەیە دەمێنینەوە کە هەر لە شوێنی خۆماندا بین و هەر لە قۆزاخەی

خۆماندا بین، مەگەر ئەوان بەسەرماندا بدەن و وڵاتمان داگیر بکەن و خێرو بێرمان بەرن، وەک ئێستا دەیبینین!

**١٢-** ئەگەر تەماشای دەنکەکانی هەنار بکەین، هەنار دەنکەکانی هەموومان دەبینین، زۆر جوان ڕیز کراون، بەڵام هەر ئەوەندە نیە کە دەنکەکانی ڕیز کرابن، بەڵکو لەنێویدا دەنکەکانی هەر بەش بەش کراون و جۆرە ماددەیەکی سپی تێدایە، وەک گۆشت وایە، کە دەنکەکانی دابڕ دابڕ کردون و بۆ چەند بەشێک، ئنجا ئەو ماددەیە تامی تفت و مەیلەو تاڵە، کەچی ئەو هەنارە ئەگەر شیرینە، ئەگەر ترشە، ئەگەر مێخۆشە، هەرچی هەیە، دەبینین تامێکی زۆر خۆشی هەیە، لە حاڵێکدا کە ئەو گۆشتەی چ لە بەری توێکڵەکەیدا هەیە، چ لە نێو کەلێنەکانیدا هەیە، تفتە، بۆچی؟ بۆ پاراستنی دەنکەکان، هەروەها بۆ خۆراک پێگەیاندنی ئەو دەنکانەش، یانی: چ توێکڵی هەنارو چ گۆشتەکەی، کە پێی دەگوترێ: بەز (شەحم)، چ ئەوەی لەسەر توێکڵەکەیە، چ ئەوەی لەنێو دەنکەکاندا هەیە، وێڕای خواردن و خۆراک، و گەیاندن بە دەنکەکان، لەهەمان کاتدا، بەهۆی ئەو مەیلەو تاڵ و تفتییەوە کە هەیەتی، دەنکەکانیش دەپارێزێ لەوەی کە لەنێویدا بۆگەن بن و تێک بچن.

**١٣-** درەختی هەنار، چ درەختەکە خۆی، چ لقەکانی کە هەنارەکانیان پێوە هەن، کاتێک تەماشا دەکەی زۆر بەهێزن و، بە زەحمەت ئەو هەنارە لێ دەبێتەوە، چونکە هەنارەکان قورسن و، دەبێ هەم درەختی هەنارەکەو هەم لاسکەکانی لقەکانی، کە ئەو هەنارەکانیان پێ هەڵواسراون، زۆر مەحکەم بن، ئەگەر بە دڵنیایی ئەو هەنارە قورسانە ڕاناگرن.

**١٤-** تەڕەکار: لە شووتیی و کاڵەک و ترۆزیی و خەیارو هاووێنەکانیان، زۆر زۆریان پێویست بە ئاوی هەیە و، ئەو لاسکە باریکانە کە وەک بەلووعەی ئاو وان، دەبێ بەردەوام ئاویان پێدابچێ، بەڵام هەر ئاوی ڕووت نا، بەڵکو ئەگەر شووتییە جۆرە تامێک و ئاوێک، ئەگەر کاڵەکە، ئەگەر ترۆزییە، ئەگەر خەیارە، ئەگەر تەڕەکارەکانی دیکەن، بەردەوام دەبێ ئاویان پێدا بچێ، وەک جۆگەلەیەک، بۆیەش زیاتر پێویستییان بە ئاودان

هەیە، بەڵام حیکمەتێکی زۆر گەورەی خوا لەوەدا هەیە، کە بۆچی ئەو کاڵەک و شووتی و ترۆزیی و خەیارو تەڕەکارانە بە درەختەوە نین؟

خوا ﷻ ئەو تەڕەکارانەی وا لێکردوون بە زەویدا، پانڕابخرێن، شووتی وا هەیە کە چەندان کیلۆیە، کاڵەکی وا هەیە چەندان کیلۆیە، هەروەها بڕکە خەیارو ترۆزی هەن، یەك بار دەگرن، جاری وا هەیە نەک بەرێک، دوو سێ بەر دەردەکەن، بۆیە دەبێ بە زەویدا پان ڕابخرێن و ئەو لاسک و بڕکەی تەنیا ئیشی ئەوەیە، ئاوو خۆراک بگەیەنێ بەو تەڕەکارە، بۆ ئەوەی پێی گەشە بکات و پێی گەورە ببێ.

**١٥-** ئنجا حیکمەتێکی دیکە کە لە تەڕەکاردا هەیە، ئەگەر مرۆڤ دەستکاریی نەکات، تەماشا دەکەی: هەر میوەو هەر تەڕەکارە لە وەرزێکدا، کە جەستەی مرۆڤ پێویستیی پێیەتی لەوێدا پێدەگات، بۆ وێنە: شووتیی و کاڵەک و ترۆزیی و خەیارو تەماتە و باینجان و بامیە، زیاتر لە هاویناندا کە کەش و هەوا گەرمە و، جەستەی مرۆڤ ئەندازەیەکی زۆر لە تەڕایی و شێی خۆی لە دەست دەدات و، دەبێ بۆی قەرەبوو بکرێتەوە، بەو کاڵەک و شووتیی و ترۆزیی و خەیار و تەڕەکارە، کە ڕێژەی ئاویان تێدا زۆرە، بەڵام هەندێک جۆرە میوەی دیکە بۆ وێنە: پرتەقاڵ و لیمۆ نارنج و سندیی کە لە کەشی زستاندا زیاتر پێدەگەن، چونکە لە کەشی زستاندا جەستەی مرۆڤ زیاتر پێویستیی بە خۆپاراستن هەیە، لە و نەخۆشییانەی لە سەرما پەیدادەبن، ئەویش لەڕێی ڤیتامین سی (C) و ڤیتامینانەوەی لەو جۆرە میوانەدا هەن، کەواتە: خوا ﷻ هەر میوەیەکی لە کەشێکدا خوڵقاندوە، کە ئەو میوەیە بۆ جەستەی مرۆڤ، لەو کەشەداو لەو کاتەدا پێویستە، بەڵام ئێستا -لەم ڕۆژگارەدا- کە هەموو جۆرە میوەکان لە هەموو کەشەکاندا هەن، ئەوە زۆر سەر لە جەستە دەشێوێنێ و زۆر جار ڕەنگە هەندێک شت کە هی ئەو کەش و وەرزە نیە، بەپێی سیستمێ کە خوا دایناوە، لە وڵاتێکی دیکەوە، ئەو میوەیە بەرهەم دێ و دەنێردرێ بۆ وڵاتێکی دیکە، کە ڕەنگە ئەو وڵاتەی لێی بەرهەم هاتوە بۆ ئەوێ باش بێ،

بەڵام بۆ ئەو وڵاتەی دیکە کە بۆی دەچێت ڕەنگە باش نەبێت و، جەستەی مرۆڤ لەو کاتە پێویستیی بەوە نەبێت و تووشی زیانی بکات.

١٦- هەبوونی ڕووەک و سەوزایی و درەخت، یەکسانە بە هەبوونی ژیـــان، بە پێچەوانەوەشەوە: نەبوونی ڕووەک و سەوزایی و درەخت، یەکسانە بە نەبوونی ژیان، تەماشای هەر شوێنێک بکەی وەک گوتراوە: ئاوو ئاوەدانیی، لە هەر شوێنێک ئاو هەبێ، ئاوەدانییش هەیە، هەروەها لە هەر شوێنێکیش سەوزایی و دارو درەخت و کشتوکاڵ هەبێ، ژیان هەیە، چ ژیانی مرۆڤ، چ ژیانی ئاژەڵ و، چ ژیانی پەڕەندەو هەموو ژیاندارانی دیکە، کە مرۆڤیش بەبێ ژیاندارانی دیکە، ژیانی ناسووڕێ، ئەگەر ئاژەڵان نەبن، ئەگەر پەڕەوران نەبن، کە مرۆڤ بە خێویان دەکات، کۆتر و کەو و قاز و مریشك و مراویی و ئاژەڵانن، هەموو ئەوانە پێویستییان بە سەوزایی هەیە، پێویستییان بە دارو درەخت و بە تەڕەکارو پێویستیان بە شیناورد هەیە، هەروەها مرۆڤ خۆشی پێویستیی بە سەوزایی و دارو درەخت و میوەو ئەوانە هەیە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی: (١٦ - ٣٠) واتـە: پـازدە (١٥) ئایـەتی نێـوە ڕاسـتیی سـوورەتی (ق) دەگرێتـە خـۆی کـە لـەو پازدە (١٥) ئایەتـەدا، لـە سـێ ئایـەتی یەکەمدا: (١٦ و ١٧ و ١٨) بـاسی زانایـی خـوا ﷻ بـە بیـرو خولیـاکانی مـرۆڤ و، نیزیکـی خـوا لـە مـرۆڤ کـە لـە ڕەگـی مـلی لێـی نیزیکـترەو، تۆمارکـردنی دوو فریشـتەکان کـە بـۆ هـەر کەسێک دانـراون، بـۆ تێکـڕای قسـەو کـردەوەکانی، بـاسی ئـەوە کـراوە.

پاشـان لـە ئایەتـەکانی: (١٩ - ٢٧)، واتـە: لـە نـۆ (٩) ئایەتـدا، بـاسی حاڵـەتی مـردن و بـاسی قیامـەت و بـرانی بابـای تاوانبـار بـەرەو دۆزەخ و، شـایەدییدانی دانی فریشـتان لەسـەری و حاشـاکردنی هاونشـینە جندەکـەی (قەرینـە جندەکـەی) لێـی، لـەوەی ئـەو بووبێتـە هـۆی گومـڕا کـردنی، دەڵـێ: هـەر خـۆی گومـڕا بـووە، و لـە گومڕاییەکـی دووردا بـووە، ئەگەرنـا مـن وام لـێ نەکـردوە بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری خـۆی یاخیـی بێـت، ئنجـا بـێ دەنگکـردنی خـوای بـەرز بۆیـان، کـە مشـت و مـڕی زۆر دەکـەن و هـەر کامێکیـان ئـەوی دیکـە تاوانبـار دەکات.

لـە هـەر سـێ ئایـەتی کۆتایـی: (٢٨ و ٢٩ و ٣٠)دا، خـوای زانـا و توانـا بـە قەریـن و بـە مرۆڤـی بێبـڕوا دەفەرمـوێ: لـە لای مـن دەمەقاڵـێ مەکـەن، وەک پێشـتریش ئاماژەمـان پێـدا، پێشـتر ترسـاندبوومن، هەڕەشـەی خـۆم بـۆ ناردبـوون ئێسـتاش قسـەو بڕیـاری مـن ناگـۆڕێ، سـتەمیش لـە بەنـدەکان ناکـەم، لەبـەر ئـەوە بڕیارەکـە ناگـۆڕدرێ، چونکـە لەسـەر حیکمـەت بنیـات نـراوە، (حیکمـەتی بـێ سـنووری خـوا)، کاتێـک خـوا بـە دۆزەخیـش دەفەرمـوێ: ئـەرێ هـەر پـڕ نەبـووی؟ دەڵـێ: ئایـا زیـادە مـاوە بـێ؟ ئەمـە وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن، دوو جـۆرە واتـا هەڵدەگـرێ.

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ﴿٣٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیاییشەوە مرۆڤمان دروستکردووەو، ئەوەی دەروونی خوتخوتەی بۆ دەکات دەیزانین و، ئێمە لە ڕەگی (گەردنی) لێی نزیکترین ﴿١٦﴾ لە کاتێکدا کە دوو (فریشتە) وەرگرەکان (کردەوەکەی) وەردەگرن، لە لای ڕاست و چەپ دانیشتوون (ئامادەن) ﴿١٧﴾ هیچ قسەیەک نابێژێ، مەگەر (فریشتەیەکی) چاودێری ئامادەی لەلایە ﴿١٨﴾ بێهۆشیی (کاتی) مردنیش بە ڕاستیی هات (ئەی مرۆڤی بێبڕوا! ئەو مردنە) ئەوەبوو کە خۆت لێ لادەدا (نەتدەویست بیری لێ بکەیەوە) ﴿١٩﴾ فووش بە کەڕەنادا کرا، ئەوە ڕۆژی هەڕەشەو سزا(ی خوا)یە ﴿٢٠﴾ هەموو کەسێکیش هات، پێش خۆدەر (لێخوڕێک)و شایەدێکی لەگەڵدان ﴿٢١﴾ (پێی دەگوترێ:) بێگومان لە بارەی ئەم (حاڵ)ەوە بێئاگا بووی، ئنجا پەردە (پۆشەرە)کەمان لەسەر (چاو)ت لادا، بۆیە ئەمڕۆ چاوت تیژە (باش دەبینێ) ﴿٢٢﴾ هاونشینەکەی گوتی: ئەم (مرۆڤ)ە (خراپەکارە) لە لام ئامادەیە (بۆ چوونە نێو دۆزەخ) ﴿٢٣﴾ (خوا فەرمووی: ئەی دوو فریشتەکان!) بە هەردووکتان هەر زۆر بێبڕوایەکی ملهوڕ

فرێ بدەنە دۆزەخەوە ﴿٢٤﴾ (هەر کەسێکی) زۆر ڕێگر لە چاکە، سنوور شکێنی دوو دڵ ﴿٢٥﴾ کەسێک کە پەرستراوی دیکەی لەگەڵ خوادا داناوە، جا فڕێیبدەنە ئازارێکی سەختەوە ﴿٢٦﴾ هاونشینە (جندە)کەی گوتی: پەروەردگارم! من سەرکێش و یاخییم نەکرد! بەڵکو خۆی لە گومڕاییەکی دوور دابوو ﴿٢٧﴾ (خوا) فەرمووی: لە لای من مشتومڕ مەکەن لە حاڵێک دا کە پێشتر هەڕەشە (ی سزادان)م بۆ لاتان نارد بوو ﴿٢٨﴾ قسە (و بڕیار) لە لای من ناگۆڕێ و، منیش ستەمکاری بەندەکان نیم ﴿٢٩﴾ لە ڕۆژێکدا کە بە دۆزەخ دەفەرمووین: ئایا پڕ بووی؟ ئەویش دەڵێ: ئایا زێدە (لە بێبڕوایان) هەیە (بیخەنە نێوم!) ﴿٣٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(﴿تُوَسۡوِسُ﴾): واتە: خوتخوتەی بۆ دەکات، (**الوَسْوَسَةُ: الخَطْرَةُ الرَّدِيئَةُ، وَأَصْلُهُ مِنَ الوَسواسِ، وهو صَوتُ الحُليِّ، وَالهَمْسُ الخَفِيُّ**)، (**وسوسة**): بریتیە لە خولیایەکی خراپ، ڕیشەکەشی لە (**وسواس**)ەوە هاتوە، کە بە دەنگی خشڵ دەگوترێ، بە دەنگی نزم و کپ و بە چپە دەگوترێ.

(﴿حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ﴾): واتە: ڕەگی گەردن، (**الوَرِيدُ: عِرْقٌ يَتَّصِلُ بَالكَبِدِ وَالقَلبِ، وَفِيهِ مَجارِي الرُّوحِ وَالدَّمِ، وَالحَبلُ مَعرُوفٌ وَشُبِّهَ بِهِ مِن حَيثُ الهَيئَةِ حَبلُ الوَرِيدِ وَحَبلُ العاتِقِ**)، (**وريد**): دەمارێکە پەیوەستە بە جگەرەوەو بە دڵەوە، لەوێوە خوێن هاتووچۆ دەکات، (حبل) بە مانای پەت دێ، کە دەزانین چۆنە، لە ڕووی چۆنیەتییەکەیەوە ڕەگی گەردن و ڕەگی مل، چوێندراوە بەو پەتەوە.

(﴿ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ﴾): واتە: دوو وەرگرەکان، (**تَلَقَّاهُ كَذَا: لَقِيَهُ**)، واتە: پێی گەیشت، (**التَّلَقِّي أَخذُ الشَّيءِ من مُعطِيهِ**)، (**تَلَقِّي**) واتە: وەرگرتنی شتێک لە بەخشەرەکەی، (**وَاستُعِيرَ لِتَسجِيلِ الأَعمالِ**)، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ تۆمارکردنی کردەوەکان.

(قَعِيدٌ): (القُعُودُ: يُقابِلُ القِيَامَة، وَالقَعْدَةُ لِلمَرَّةِ وَالقِعْدَةُ للحالِ الَّتي يَكُونُ عَلَيهَا مِنَ القاعِدُ)، (قعود) لە بەرانبەر (قیام) دایە، (قعود) دانیشتنە (قیام) هەڵسانە، (قَعْدَة) بە جارێک دانیشتن دەگوترێ، (قِعْدَة) بە حاڵەتی بابای دانیشتوو دەگوترێ، بەس وەک دوایی باسی دەکەین، لێرەدا مەبەست لە دانیشتنی ڕواڵەتیی نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئامادەبوونە، لەبەر ئەوەی کەسێک لە شوێنێک دانیشتبێ، ئامادەیە لەوێ.

(مَّا يَلْفِظُ): واتە: دەرناهاوێژێ، یان نابێژێ، (اللَّفْظُ بِالكَلامِ مُسْتَعَارٌ مِنْ لَفظِ الشيء مِنَ الفَمِ، وَلَفظِ الرَّحى الدَّقِيقَ، وَمِنهُ سُمِّيَ الدِّيكُ الآفِظة لِطَرْحِهِ بَعْضَ مَا يَلتَقِطُهُ لِلدَّجاجَة)، (لَفظ): بە قسە خوازراوەتەوە لە فڕێدانی شتێک لە زار، دەستاڕ یان بەرداش، کە دەنکە گەنم دەهاوێ، کاتێک دەیهاڕێ و لەو لاو لای دەستاڕەکە دەردەچن، یان ئاردەکە فڕێ دەداتە ئەملاولا، هەروەها بۆیە بە کەڵەشێر (کەڵەباب) گوتراوە: (لافِظَة) چونکە جار جار ئەو دەنکانەی هەڵیان دەگرێتەوەو بۆ مریشکەکەیان فڕێ دەدات وەک هاوکارییەک.

(رَقِيبٌ): (الرَّقِيبُ: الحافِظ)، واتە: پارێزەر (إمَّا لِمُراعَاتِهِ رَقَبَةَ المَحْفُوظِ أَوِ لِرَفْعِ رَقَبَتِهِ)، یان لەبەر ئەوەی چاوی لە ملی ئەو کەسەیە کە دەیپارێزێ، یاخود لەبەر ئەوەی ملی خۆی بەرز دەکاتەوە تاکو زاڵ بێت بەسەر ئەو شتەدا کە تەماشای دەکات.

(عَتِيدٌ): (العَتادُ: إدِّخَارُ الشَّيء قَبْلَ الحَاجَة إلَيهِ لإعْدَادِ، وَالعَتِيدُ: المُعِدُّ والمُعَدُّ، وَالعَتِيدُ: الحَاضِر)، (عتید): چەند مانایەکی هەن: (عَتاد): بریتیە لە هەڵگرتنی شتێک پێش ئەوەی کە پێویستییت پێی بێ بۆ کاتی پێویستی، وەک (إعداد)، یانی: ئامادە کردن، (عَتِید) هەم بە مانای ئامادەکەر دێ، هەم بە مانای ئامادەکراویش دێ، (عَتِید) بە مانای ئامادەش دێ.

(سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ ): واتـە: بێهۆشـیی مـەرگ، (**السُّـكْرُ: حَالَـةٌ تَعْـرِضُ بَـيْنَ المَـرْءِ وَعَقْلِـهِ، وَمِنْـهُ سَـكَرَاتُ المَـوت**)، (**سُـكر**): حاڵەتێکـە دەکەوێتـە نێـوان مـرۆڤ و عەقڵیـەوە، واتـە: بێهۆشـیی، عەقڵـی لای خـۆی نامێنـێ، (**سَكَراتُ المَـوت**): بێهۆشـییەکانی مـەرگ، لـەوەوە هاتـوە.

(تَحِيدُ ): (**أَي: تَعدِلُ عَنهُ وَتَنفِرُ مِنهُ**)، واتە: لێت لادەدا و لێی دوور دەکەوتیەوە.

(سَآئِقٞ ): (**مَلَـكٌ يَسُـوقُهُ**)، فریشـتەیەک لێـی دەخوڕێ، پێـش خۆی دەدات، (**وَالسَّـوقُ: الجَلْـبُ وَالطَّـردُ، وَسُـقْتُ المَهْـرَ إِلَى المَـرأَةِ، لأَنَّ المَهْـرَ كَانَ مِـنَ الإِبـلِ، وَالإِبْـلُ تُسَـاق**)، (**سَـوق**): بـە مانـای هێنـان و دەرکـردن دێ، دەگوتـرێ: (**سُـقْتُ المَهْـرَ إِلَى المَـرأَةِ**)، لەبـەر ئـەوەی کاتی خـۆی مارەیـی بریتـی بـووە لـە حوشـتر، حوشـترەکانیان لێخوڕیـون بـەرەو ماڵـی ئـەو ئافرەتـە کـە مارەییەکـەی پـێ دەدرێ.

(وَشَهِيدٞ): چاودێـر، یـان شـایەدیدەر (**مَلَـكٌ يَشْـهَدُ عَلَيـهِ، وَلَـهُ**)، فریشـتەیەك شـایەتییت بـۆ دەداو شـایەدییت لەسـەر دەدات.

(غِطَآءَكَ ): (**الغِطَـاءُ: مَـا يُجْعَـلُ فَـوْقَ الـشَّيءِ مِـنْ طَبَـقٍ وَنَحْـوِهِ**)، (**غِطَـاء**): ئەوەیـە کـە لەسـەر شـتێکدا دادەنـرێ، وەک سـەر قاپێـک، یـان شـێوەی ئـەوە، وەک مەنجـەڵ، یـان قابلەمـە سـەرەکەی پێـی دەگوتـرێ: (**غِطَـاء**)، (**كَـمَا أَنَّ الغِشـاءَ مـا يَجعَـلُ فَـوقَ الـشَّيءِ مِـن لِبـاسٍ وَغَـيرِهِ**)، بـەڵام (**غِشـاء**) واتـە: پـەردە، ئەویـش بریتیـە لـەوەی لەسـەر شـتێک دادەنـرێ لـە پۆشـاک و جگـە لـە پۆشـاک.

(حَدِيدٞ): واتـە: تیـژ، (**حَـدَدْتُ السِّكِّيـنَ: رَقَقْـتُ حَـدَّهُ، ثُـمَّ يُقَـالُ لِكُلِّ مَا دُقَّ فِـي نَفْسِـهِ مِـن حَيْـثُ الخِلْقَـةِ وَمِـنْ حَيْـثُ المَعَنَـى، كَالبَـصَرِ وَالبَصِـيرَةِ: حَدِيـد**)، (**حَـدَدتُ السِّكِّينَ**) چەقۆیەکـە دەمەکەیـم تیـژ کـرد، دوایـی بـۆ هـەر شـتێک کـە لـە زاتی خۆیـدا، باریـک و، تیـژ بـێ، چ لـە ڕووی ڕواڵەتییـەوەو، چ لـە ڕووی مانـاوە، پێـی دەگوتـرێ: (**حديـد**) ، وەک (**بَـصَر**) چـاو کـە چـاک ببینـێ، (**بَصِـيرَة**) عەقـڵ کـە چـاک دەرک بـە شـت بـکات، هەردووکیـان وشـەی (**حديد**)یـان بـۆ بـەکاردێ.

(**قَرِينُهُۥ**): (**قَرِينُـهُ: الإِقْـتِرَانُ كَالإِزدوَاجِ فِـي كَـوْنِ إِجْتِـمَاعِ شَـيْئَيْنِ، أَو أَشْـيَاءَ فِـي مَعْنَـى مِـن المَعَـانِي، وَالجَمْـعُ: قُرَنَـاء**)، (**قَرِيـن**)، واتـە: هاونشـين، (**إِقـتِرَان**) وەک (**إِزدِواج**) وایـە، لـەوەدا کـە دوو شـت یـان چەنـد شـتێک پێکـەوە کۆببنـەوە، لـە واتایـەک لـە واتاکانـدا، بـۆ وێنـە: (**قَـرْن**) بۆیـە دەگوتـرێ، چونکـە خەڵکێـک لـەو کاتـەدا پێکـەوە دەژین، (**قَرِین**)یـش چونکـە وەک ئـەو لەگەڵیدایـە، چ مرۆڤێـک بـێ، هاوەڵـی بـێ، چ جیننیـی بـێ، کـە بـە (**قُرَنـاء**) کۆدەکرێتـەوە.

(**كَفَّارٍ**): واتـە: زۆر خەسـت لـە بێبڕواییـدا، بـە مانـای (**كَفُـور**) دێ، بـەڵام لـە (**كَفُور**)یـش ماناکـەی بەهێزتـرە.

(**عَنِيدٍ**): (**العَنِيـدُ: المُعْجَـبُ بِمَـا عِنْـدَهُ، وَالمُعانِـدُ بِمـا عِنـدَهُ**)، (**عنيـد**): کەسێکە سەرسام بێـت بـەوەی لـەلای خۆیـەتی، (**مَعانِد**)یش کەسێکە خۆی هەڵکێشـێ بـەوەی لەلایەتی، (**عَنِيـد: أَي القَـوِيُّ العِنـاد**)، کەسێکە زۆر کەللـەڕەق و نەسـەلمێن و خـۆ بەزلگـر بـێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەقـێ دەزانـێ، بـەڵام دانی پێـدا ناهێنـێ.

(**مُعْتَدٍ**): (**مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ**)، (**مُعْتَـد: مُتَجَـاوِزِ الطّـور**)، کەسـێک کـە لـە سـنووری خـۆی دەرچووبـێ، دەگوتـرێ: (**عَـدَى طـورَهُ**)، واتـە: لـە سـنووری خـۆی دەرچـووە، بـە بابـای سـتەمکارو سنوورشـکێنیش دەگوتـرێ.

(**مُّرِيبٍ**): دوو واتـای هـەن، **أ-** بـە مانـای دوو دڵ، (**شـاك**) دێ، **ب-** بـە مانـای وەدوودڵیخـەر (**مُشَـكِّك**) کەسـێک کـە خەڵـک دەخاتـە دوو دڵییـەوە.

(**مَآ أَطْغَيْتُهُۥ**): (**أَي: مـا جَعَلْـتُ طَاغِيَاً**)، مـن وام لێنەکـردوە یاخیـی بـێ، (**أَي: مـا أَمَرْتُـهُ بالطُّغْيَـانِ**)، مـن فەرمانـم پێنەکـردوە یاخیـی و سـەر کێـش بێ.

(**لَا تَخْتَصِمُواْ لَدَيَّ**): لـەلای مـن دەمەقاڵیـی و ناکۆکیـی مەکـەن، (**الإِختِصَـام: المُخَاصَمَةُ، وهُـوَ مَصْـدَرٌ بصيغـةِ الإفتِعـال**)، (**إِختِصَام**) بـە مانـای دەمەقاڵیـی و مشـتومڕ کـە چاوگە، بـەڵام لەسـەر شـێوەی ئیفتیعـال هاتوە.

(هَلۡ مِن مَّزِيدٍ): (المَزِيدُ: مَصدَرُ ميميٌّ، وَهُوَ الزِّيادَةُ مِثلُ المَجِيد وَالحَمِيد، وَيَجُوزُ أَن يَكُونَ اسْمَ مَفعُولٍ مِن زَادَ، أَي: هَل مِن جَماعَةٍ آخَرِين وَيُلقَونَ فِيَّ؟)، (مَزِيد): یان چاوگێکی میمییە بە مانای زیادە دێ، وەک مەجیدو حەمید، دەشگونجێ ناوی بەرکاربێ، لە (زاد)ەوە هاتوە، واتە: ئایا هیچ کۆمەڵێکی زیادە هەن، بخرێنە نێو منەوە؟ دیارە دۆزەخ وا دەڵێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە پازدە (١٥) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکەدا، وەک پێشتر تەفسیرمان کردن، کۆمەڵێک ڕاستیی مەزنی خستنەڕوو، سەرەتا لە بارەی قورئانەوە، سوێند خواردن بە قورئان لەسەر ئەوە کە پەیامی خوا ڕاستە، زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت ڕاستە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستە و لە لایەن خواوە ڕەوانە کراوە، وەک پێغەمبەری کۆتایی.

پاشان باسی نکووڵییکردنی کافرەکانی کرد لە زیندووکرانەوە، خوا ﷻ چەند بەڵگەیەکی بۆ هێنانەوە، هەم لە گەردوونداو، هەم ئاماژەیەکیش بە مێژووی هەشت لە گەلانی فەوتاو، کە بەهۆی نکوڵییکردنیان لە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) وەک خوا دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾، خوا سزای داون، کەواتە: ئەم گەردوونە کە نارێکیی تێدانیە، ژیانی بەشەریش ئەگەر بە وردیی سەرنجی بدەین، دەزانن کە سەرپەرشتیارێکی هەیە و، مرۆڤ بێ خاوەن نیە، سزاو پاداشتی تەنانەت لە ژیانی دنیاشدا بۆ لە ئارادا هەیە، کەواتە: ناگونجێ ئەم ژیانە دنیاییە، ژیانێکی دیکەی بەدوادا نەیەت.

لە دوای ئەوە خوا ﷻ دێتە سەر باسی مرۆڤ، کە خوا بە هەموو شتێکی مرۆڤ ئاگادارەو، هەموو شتێکی مرۆڤ تۆمار دەکرێ، قسەی، کردەوەی، هەڵس

و کەوتی، نیازو مەبەستی، پاشان باسی حاڵەتی سەرە مەرگ و، دوایی باسی ئەوە کە چۆن قەرینە جندەکەی، یان قەرینە فریشتەکەی دەڵێ: ئەوە لە لای من ئامادەیە، سەرنجام تاوانباران تووشی سزای خۆیان دەبن لە ڕۆژی دوایی دا.

سەرتا خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ﴾، بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان هێناوەتە دی و، دەشزانین چی دەروونی خوتخوتەی بۆ دەکات، یان ئەوەی لە دڵ و دەروونیدا دێ و دەچێ، لە خولیاو نیازو مەبەست، ئەوەش دەزانین: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾، ئێمە لە ڕەگی ملی، لە ڕەگی خوێنی لێی نیزیکترین، چونکە وشەی: ﴿حَبْلِ﴾، بە مانای پەت دێ، ﴿ٱلْوَرِيدِ﴾یش، دیارە دەماری خوێنە، کەواتە: یانی: لە پەتی دەماری خوێن لێی نیزیکترین، (ورید)یش بەو دوو شاڕەگەی لەو لاو لای گەردنی مرۆڤ هەن، کە هەر کاتێ مرۆڤ، یەکێک لەو دوو شادەماری پچڕا، دەمرێ، ئنجا خوا دەفەرمووێ: ئێمە لە شاڕەگی لاملی لێی نیزیکترین.

هەڵبەتە مەبەست لە (لێ نیزیک بوونی خوا ﷻ) واتە: بە دەسەڵات و زانیاریی و ئاگالێبوون، لێی نیزیکین، نەک بە زاتی خۆی، ئەم ئایەتەش وەک ئەو ئایەتەی سووڕەتی (**الحديد**) وایە کە دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ...﴾ الحدید ﴿٤﴾، واتە: لە هەر شوێنێک بن، ئەو (خوا) لەگەڵتانە، واتە: بە دەسەڵات و زانیاریی لەگەڵتانە، بە مشوورخۆریی و ئاگالێبوونی لەگەڵتانە، ئەگەرنا زاتی خوا ﷻ لەسەر عەرشی خۆیەتی، (**إِنَّ اللهَ مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ بائِنٌ عَن خَلقِهِ**)، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی لە سەرووی دروستکراوەکانیەوە [بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە].

ئنجا ئایا چۆنیەتیی لێ نیزیکتر بوونی خوا لە ڕەگی ملی مرۆڤ چۆنە؟ ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ﴾، لە کاتێکدا کە دوو وەرگرەکان وەردەگرن، چی وەردەگرن؟ هەموو هەڵس و کەوت و کردەوەکانی مرۆڤ وەردەگرن، بەڵکو نیازو خولیایەکانی

نێو دڵیشی وەردەگرن، بێژراوەکانیشی زمانیشی وەردەگرن، هەرچی قسەیەك کە دەیبێژێ، ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾، لەلای ڕاست و لای چەپ ئامادەن، ﴿قَعِيدٌ﴾، زانایان دەڵێن: لێرەدا بە مانای دانیشتوو (**جالس**) نیە، بەڵکو یانی: (**مُجالِس**) هاونشین، واتە: لەگەڵی هاونشینن، کەواتە: نیزیکییەکەی خوا ﷻ لە ڕەگی ملی زیاتر لە مرۆڤ، لە چیدا بەرجەستە دەبێ؟ لە نیزیکیی فریشتەکاندا، ئەو دوو فریشتانەی داینراون لە لای ڕاست و لای چەپی، هەمیشە ئامادەن، هاونشینی و لەگەڵیدان.

﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾، هیچ قسەیەک دەرناهاوێ، هیچ قسەیەک نابێژێ، مەگەر چاودێرێکی ئامادەی لەلایە، واتە: ئەو دوو فریشتانەی لەلاینی هەم چاودێرنی، پارێزەر نی و بەردەوام ئامادەشن و لێی خافڵ نابن، دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین، کە فریشتەکان کە خوا داینـاون کردەوەکانی مرۆڤ و قسەکانی تۆمار بکەن، لە ڕاستییدا نیازو مەبەستەکانی نێو دڵیشی دەزانن و ئەوانیش تۆمار دەکەن، بەپێچەوانەی لێ حاڵیبوونی، هەندێک لە زانایان وەك لە تەفسیرەکاندا باسیان کردوە، پێیان وابووە، فریشتەکان نێو دڵ نازانن و تەنیا خوا دەیزانێ! بەڵام بەپێی ئەوە کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ بە ڕاشکاویی و ئایەتەکانیش ئاماژەی پێدەکەن، ئایەتەکە ئاماژە دەکات، دەفەرموێ: دوو وەرگرەکان وەردەگرن، چی وەردەگرن؟ دیارە هەموو جموجۆڵ و چالاکییەکانی مرۆڤ وەردەگرن.

بەدڵنیاییش ئەوانە ئەگەر کردەوە ڕواڵەتییەکان بنووسن و، قسە بێژراوەکان بنووسن، لە پێشترە کە نیازو مەبەست و خولیا هاندەرەکانی بنووسن، کەواتە: چەمکی گشتیی: ﴿يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ﴾، نیازو مەبەستەکانیش دەگرێتەوە، وەک گوتم: فەرمایشتەکەی پێغەمبەریش ﷺ بە ڕوونیی و بە ڕاشکاویی باسی کردوە و دوایی دەیهێنین.

وا پێدەچێ هەندێک لە زانایان باش سەرنجی فەرمایشتەکەی پێغەمبەریان ﷺ، نەدابێ، یان لەبەر ئەوەی خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾﴾ آل عمران، واتە: بە دڵنیایی خوا زانایە بە نهێنییەکانی نێو سینەکان، وایانگوتوە! بەڵام ئەوە ڕێ ناگرێ لەوەی فریشتەکانیش کە خوا دایناون، بۆ تۆمارکردنی کردەوەکانی مرۆڤ و چالاکییەکانی، خوا ئەو توانایەی دابنێ، نێو دڵی مرۆڤیش بخوێننەوە.

﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾، بێ هۆشیی مردنیش هات بە هەق، بە ڕاستیی هات، بێ ئەوەی ناڕاستیی تێدا هەبێ، یان بە چەسپاوی هات، بەبێ ئەوە کە پووچیی تێدابێ، ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾، ئا ئەوە بوو کە تۆ لێت لادەدا، یان خۆت لێ گێل دەکرد، واتە: دەتویست کە لە بیرو زەینت دا نەبێ، وشەی: ﴿سَكۡرَةُ﴾، کە بە (**سَكَرات**) کۆدەبێتەوە، واتە: بێ هۆشیی، ئەو حاڵەتە کە مرۆڤ بێ هۆشیی بەسەردا دێ، لەبەر ئازارێک کە مردنی بە دوادا دێ، واتە: لە گیانەڵاو لە سەرە مەرگدا، ئنجا چ بێ هۆشیی یەکجاریی، کە دوایی گیان دەسپێرێ، یاخود بێ هۆشی نێو بە نێو، کە بێ هۆش دەبێ و دێتەوە هۆش و بێ هۆش دەبێتەوە، تاکو یەکجاریی کاری دەکرێ و کۆتایی پێ دێ.

کە دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾، واتە: ئەوەی باسکرا، یان ئەوەی بە سیاق دەزانرێ ئەو حاڵ و وەزعە، ئەوە بوو کە تۆ خۆتت لێ لادەدا، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ تەنیا بۆ ژیانی دنیا دروست نەکراوە، بەڵکو دوای ئەوەی ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، ئەو مرۆڤە، دەچێتە قۆناغێکی دیکە، کە پێی دەگوترێ: قۆناغی بەرزەخ، وەک خوا دەفەرمووێ: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ المؤمنون، لە پشتیانەوە پەردەیەک هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندووەدەکرێنەوە، لە ڕۆژی زیندووکرانەوەش دا قۆناغێکی دیکە دەست پێدەکات، کە قۆناغی ڕۆژی دواییە.

﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ﴾، فـوو بـە کەڕەنـادا کـرا، نـاوی فووکـەر بـە کەڕەنـا (نافـخ الصـور) لـە قورئانـدا نەهاتـوە، بـەڵام لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا هاتـوە ﷺ کـە ئـەو فریشـتەیەی فـوو بـە کەڕەنـادا دەکات، نـاوی (ئیسـڕافیل)، یـان خاوەنـی کەڕەنـا (صاحـب القرن)یـە، ﴿ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴾، ئـەوە کـە فـوو بـە کەڕەنـادا دەکـرێ، ڕۆژی هەڕەشـەیە، واتـە: ئـەو ڕۆژەیـە کـە هەڕەشـەی خـوای تێـدا دێتـە دی، کـە بریتیـە: لـە سـزادانی بێبڕوایـانی تاوانبـار.

﴿ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴾، هەمـوو کەسـێک دێ، پێـش خـۆدەرو شـاهێدێکی بەسـەرەوەن، واتـە: دوو فریشـتەی لەگەڵـدان، یەکێکیـان پێش خـۆی دەدا و، ئـەوەی دیکەیـان شـایەدیی لەسـەر دەدات، یاخـود هەردووکیـان هـەم وەپێـش خۆشیانی دەدەن، وەک بابـای تاوانبـار کـە دەبـرێ بـۆ دادگا، یـان دەبرێ بـۆ بەندیخانە و، شـاهێدییشی لەسـەر دەدەن، ﴿ سَآئِقٌ ﴾، مـن بـە (پێشـخۆدەر)م هێنـا، ئەگەرنـا لـە ئەصڵـدا بـە مانـای (لێخـوڕ) دێ، خـوا ﷻ لێـرەدا لەبـەر ئـەوەی بـە سیاق دەزانیـن، کـە مەبەسـتی هـەر نەفسـێکی تاوانبـارو خراپـەکارە، بۆیـە وشـەی (سـائق)ی بـۆ بەکارهێنـاوە، وەک چـۆن ئـاژەڵ پێشـخۆ دەدرێـن، لێدەخوڕرێـن بـەرەو لـەوەڕگا، یـان بـەرەو ئاغـەڵ و شـوێنی پشـوودانیان، یـان بەیانیـان کـە دەردەچـن، یـان ئێـواران کـە دەردەچـن، کـە دەگێڕدرێنـەوە، لێدەخوڕدرێـن، ئەوانیـش بـەو شـێوەیە فریشـتەکان لێیـان دەخـوڕن، ئنجـا ئەگـەر بڕوادارانیـش بگرێتـەوە، مرۆڤـەکان بـە گشـتیی، دەبـێ بڵێیـن: پێشـخۆدەر و، وشـەی لێخـوڕ بەکارناهێنیـن، وەک ڕێزگرتـن لـەو مرۆڤانـەی خـوا ڕێزیـان لـێ دەگـرێ لـە ڕۆژی دوایـی دا کـە بڕوادارانـن، وەک لـە سـووڕەتی (مەڕیـەم)دا خـوا ﷻ چۆنیەتیـی بەڕێکـرانی بـڕوادارن و بێبڕوایـان لێـک جیادەکاتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾مریـم، واتـە: تاوانبـاران بـە تینوێتیـی بـەرەو دۆزەخ لێدەخوڕیـن، بـەڵام بـە نسـبەت پارێزکارانـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ ﴾مریـم، ئـەو ڕۆژە پارێـزکاران کۆدەکەینـەوە، بـەرەو خـوای خـاوەن بەزەیـی بـە شـێوەی شـاند، بـە شـێوەی میـوان و شـاند کـە دەچـن و ڕێزیـان لـێ دەگیـرێ.

﴿ لَقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، وەک شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبیی دەڵێن: ئەمە (مَقُولُ قَولٍ)، ئەمە گوتراوی قسەیەکە واتە: (يُقَالُ لَهُم)، یان (قَالَ اللهُ لَهُم)، پێیان دەگوترێ، یان خوا پێی فەرمووە (قال الله له) بەو مرۆڤە، ﴿ لَقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەمە لە بێ ئاگاییدا بووی، واتە: لەم حاڵەی ئێستا دەیبینی، ﴿ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، یانی: لەم وەزعەی ئێستا دەیبینی تۆ لە بێ ئاگاییدا بووی، ﴿ فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ ﴾، پەردەکەمان لەسەرت لادا، پۆشاکتمان لەسەرت لادا، (غِطاء): هەر شتێکە شتێک داپۆشێ، ئەو مرۆڤە بێئاگاییەکەی وەک قۆزاخەیەک و کیفێک وابووە، کە چۆتە نێوی، ئیدی دنیای دەرەوەی نەبینیوە، خوا دەفەرمویٚ: بەهۆی مەرگ و مردنەوە، ئێمە ئەو پەردەو پۆشاکەمان لەسەرت لادا، ڕووح دوای ئەوەی لە کیفی جەستە دێتە دەرێ، ئنجا چاک دەبینێ، هەڵبەتە دەگونجێ هەر لە کیفی جەستەشدا بەهۆی ئیمانەوە چاوی دڵی بکرێتەوە و، گوێی دڵی بکرێتەوەو، زۆر شت کە بە شێوەی ئاسایی نابیسترێ و نابینرێ، ببیستێ و ببینێ، بەڵام مرۆڤ دەشتوانێ ئەو جەستەیە لە خۆی بکاتە کیف و قۆزاغەیەک کە جگە لەوەی بە چاوی سەر دەیبینێ و، بە گوێی سەر دەیبیستێ، هیچی دیکە نەبیستێ و نەبینێ، دەشتوانێ بەهۆی ئیمانەوە چاوی مەعنەویی، چاوی دڵ و بەصیرەتی خۆی بکاتەوە، هەروەها گوێی دڵی بکاتەوە، بانگەوازی هەق ببیستێ و، ڕاستییە مەعنەوییەکان ببینێ، ئنجا کەسێك لە دنیادا بە ویستی خۆی، عەقڵ و دڵ و چاوی مەعنەویی خۆی نەکاتەوە، لە ڕۆژی دواییدا، خوا ﷻ پەردەی لەسەر چاوی لادەبات، ﴿ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴾، ئەمڕۆ چاوت تیژە، واتە: باش دەبینێ، هەموو شتێکت بۆ عەیانەو ئاشکرایە.

﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴾، هاونشینەکەشی گوتی: ئەمە لە لای من ئامادە بوو، ئەمەیە لە لای من ئامادەیە، ئامادەم کردوە، هەندێک لە زانایان دەڵێن: مەبەست لە (قرین)، لێرەدا قەرینە جندەکەیەتی، واتە: ئەمەم ئاوا گومڕا کردوە، یان ئەوە بەرهەمی منە، فەرموون ئامادەم کردوە بۆ دۆزەخ! هەندێکیش دەڵێن:

مەبەست پێی هاونشینە فریشتەکەیەتی، کە مەرجیش نیە، یەکێک بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە هاونشینەکەی فریشتەیەو بەردەوام لەگەڵی دابووە، ئەوە لە لای من ئامادەیە، فەرموون بە هەموو شتێکەوە تەسلیمتان بکەم، ئەوە کردەوەو چالاکییەکانیشی کە لە سەری تۆمار کراون.

﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾، هەردووکتان فرێبدەنە نێو دۆزەخەوە، هەر زۆر بێبڕوایەکی زۆر کەللە ڕەق، خۆ بەزلگرو نەسەلمێن، بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿أَلْقِيَا﴾، هەردووکتان فڕێبدەن؟

أ- هەندێک دەڵێن: مەبەستی لە دوو فریشتەکانە.

ب- هەندێکیشیان دەڵێن: خوا ﷻ: ﴿أَلْقِيَا﴾ی بەکارهێناوە با مەبەستیشی یەک فریشتە بێ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا ئەو شێوازەش هەیە، کە یەکیش بێ، بەڵام بە دووان بدوێنرێ.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿أَلْقِيَا﴾، واتە: جار لە دوای جار فڕێ بدەنە نێو دۆزەخەوە، هەر زۆر بێبڕوایەک، ﴿كَفَّارٍ﴾، ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (**كافِر**)، (**كافِر**)، یانی: بێبڕوا، داپۆشەری هەق، ﴿كَفَّارٍ﴾، یانی: زۆر بێبڕوا، ﴿عَنِيدٍ﴾، واتە: کەسێک کە هەق دەزانێت، بەڵام پێی لێنانێ، دانی پێداناهێنێ، سەرەخەرو کەللەڕەق و نەسەلمێن.

﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ﴾، زۆر ڕێگری چاکە، زۆر سنوور بەزێن، هەروەها زۆر دوو دڵ، یاخود: خەڵک خەرە دوودڵیی و گومان.

﴿الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾، ئەو کەسەی لەگەڵ خوادا پەرستراوێکیی دیکەی داناوە، ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾، ئنجا هەردووکتان فڕێی بدەنە نێو ئازاری سەخت و توندەوە.

﴿قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ﴾، هاونشینەکەی گوتی: (هاونشینە جندەکەی)، چونکە فریشتە کەس گومڕا ناکەن، هاونشینە جندەکەی گوتی: پەروەردگارم! من

وام لێ نەکردبوو کە یاخیی بێ، من یاخییم نەکرد بوو، سەرکێشم نەکرد بوو، ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلٍ بَعِيدٍ﴾، بەڵکو هەر بۆ خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بوو، واتە: خەتای خۆی بوو، کە خۆی تووشی ئەم حاڵە کردوە، نەک من وام لێ کردبێ، هەر بۆ خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بوو، منیش هاوکاری بووم، ﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ﴾، (خوا) فەرمووی: لای من ناکۆکیی و دەمەقاڵیی مەکەن، وادیارە کە ئەو وا دەڵێ و، ئەویش وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: نەخێر خەتای تۆ بوو، هەروەها ئەویش وەڵام دەداتەوەو ....هتد.

بۆیە خواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ﴾، لە لای من دەمەقاڵەو ناکۆکیی و مشت و مڕ مەکەن، ﴿وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ﴾، بە دڵنیایی من هەڕەشەی خۆمم پێشتر بۆ ناردبوون، واتە: هەڕەشەی خۆمم بۆ ناردبوون، کە ئەگەر لەسەر کوفرو خراپە بڕۆن، ئەوە سزایەکەتانە.

﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ﴾، قسە لە لای من ناگۆڕدرێ، بڕیاری من ناگۆڕدرێ، ئەوەی کاتی خۆی بۆم ناردوون، کە ئەگەر وابکەن ئەوە حاڵتانە، ئەگەر لە ڕێی و کوفرو تاوان و خراپەوە، بڕۆن، تووشی ئەو سزایە دەبن، ئەو هەڕەشەیەم بۆ ناردبوون، ئێستاش قسەو بڕیاری من ناگۆڕێ، ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾، من ستەمکاریش نیم، بەرانبەر بە بەندەکان، واتە: ستەمکار نیم بەرانبەر بە بەندەکان، بۆیە پێشتر هەڕەشەم بۆ ناردبوون و ئاگادارم کردبوونەوە و ترساندبوومن لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە ڕێی کتێب و پەیامەکانمەوە، ئنجا ئەگەر ئاگادارم نەکردبانەوەو سزاشم دابان، ئەوە ستەم بوو، بەڵام ئەوە لە من ناوەشێتەوە بەڕەهایی، بۆچی خوا ﷻ صیغەی (ظَلَّام)ی بەکارهێناوە؟

أ- هەندێک دەڵێن: (ظَلَّام)یش هەر بە مانای (ظَالِم)ە، بەڵام ئەوە ناگونجێ، چونکە (ظَالِم) یانی: ستەمکار، بەڵام (ظَلَّام) واتە: زۆر ستەمکار.

ب- هەندێك گوتوویانە: بۆیە خوا وا دەفەرموێ: چونکە ئەگەر گریمان خوا بەبێ ئاگادارکردنەوەی مرۆڤەکان، سزای دابان، مانای وایە زۆری ستەم لێ کردبوون.

ج- تەئویلی سییەم: یاخود سیفەتەکانی خوا هەموویان لە لووتکەدان و، ئەگەر گریمان زوڵم سیفەتی خوا بایە، دەبووایە خوا (ظَلاَّم) بووایە.

د- تەئویلی چوارەم: خوا ﷻ ئەگەر ستەم لە هەر کام لە بەندەکان بکات و، لە هەموو بەندەکانی ستەم بکات، مادام وایە زۆری ستەم کردووەو دەبێتە (ظَلاَّم).

لە کۆتاییی دا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ﴾، ئەو ڕۆژە کە بە دۆزەخ دەڵێین: ئەرێ پڕ بووی؟ ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾، ئەویش دەڵێ: ئەرێ زیادە هەیە؟ ئەمە دوو واتای هەن:

أ- خوا ﷻ دەفەرموێ: هەر پڕ نەبووی ئەو هەموو خەڵکەت تێکرا؟ ئەویش دەڵێ: ئەگەر زیادەش ماوە، با بێ ئێستاش جێم هەیە.

ب- خوا ﷻ لە دۆزەخ دەپرسێ: پڕ نەبووی؟ تاکو ئیدیکەشت بۆ بێنین؟ دۆزەخیش دەڵێ: ئایا زیادە ماوە؟ واتە: پڕ بووم و جێی کەسی دیکە نابێ، هەردوو واتایەکە هەڵدەگرێ.

بە هەردوو واتایەکان ئەوە دەگەیەنێ کە خوا ﷻ دەیەوێ بێبڕوایان تەما بڕاو بکات، لەوەی دڵی خۆیان بەوە خۆشبکەن، ڕەنگە جێی ئێمە نەبێتەوە لە دۆزەخدا، نەخێر دۆزەخ ئەوەندە فراوانە جێی هەموو کەسی تێدا دەبێتەوە، تاکو خوا ﷻ بە دەسەڵاتی بێ وێنەی خۆی و بە سیفەتی جەلال و هەیبەتی خۆی، دۆزەخ پڕ دەکات، ئەگەرنا بەهیچ شتێک پڕ نابێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا مرۆڤی دروستکردوەو هەست و خولیای نێو دڵی دەزانێ و، لە ڕەگی گەردنی لێی نیزیکترە، لە کاتێکدا دوو فریشتەکان کە لە لای ڕاست و چەپینی، کردەوەو قسەکانی تۆمار دەکەن و، هەردەم لە لای چاودێرو ئامادەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ
ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ
﴿١٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان هێناوەتە دی، لێرەدا بە تەئکید وشەی: ﴿ٱلْإِنسَٰنَ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ جینسە، واتە: تێکڕای مرۆڤەکانمان هێناوتە دی، بەڵام لێرە بەپێی سیاق دەزانین کە مەبەست پێی مرۆڤە بێبڕوایەکانن، چونکە قسە لەبارەی ئەوانەوەیە، ئەگەرنا ئەصڵی وشەکە هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە.

٢)- ﴿وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ﴾، ئێمە دەشزانین ئەوەی دەروونی خوتخوتەی بۆ دەکات، ﴿مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ﴾، واتە: ئەوەی نەفسی پێی دەدوێ ئێمە دەیزانین، بەڵام وشەی: ﴿بِهِۦ﴾، بۆ زیاتر پەیوەستکردنی خوتخوتەیە بە نەفسەوەو جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوە، (**عَبَّرَ عَن عِلمِهِ بالوَسوَسَةِ بالمُضارِعِ لِإحضارِهِ وَلِأَنَّها مُتَجَدِّدَةٌ**)، بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ﴾؟ بە (**فعل المضارع**) هێناویەتی؟ بۆ ئەوەی وەک ئامادەکردن بیهێنێتە بەر چاو، هەروەها لەبەر ئەوەی خوتخوتەو دنەدانێك کە لە مرۆڤدا دەبێ، بەردەوام تازە دەبێتەوە.

﴿ مَا تُوَسْوِسُ ﴾، (الوَسوَسَـةُ: صَـوتُ الحُـلِيِّ، وَالصَّـوْتُ الخَفِـيُّ وَالهَمْـسُ)، (وَسْوَسَـة): لـە ئەصڵـدا بـە دەنگـی خشـڵ و بـە دەنگـی کـپ و بـە چپـە دەگوتـرێ، لێـرەدا بـە دڵنیایـی مەبەسـت لـە وەسوەسـە نیـازو مەبەسـتی خـراپ و خولیـا و دنـەدانی خراپـە.

٣)- ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾، ئێمە لە ڕەگی خوێنی لێی نیزیکترین، (الحَبلُ: وَاحِدُ الحِبالِ وَهِيَ المَعرُوفُ)، پەت تاکی پەتەکان، کە دەزانین چین، ئنجا ئایا مەبەست لێرەدا چییە؟

نزیکـەی هەمـوو توێـژەرەوانی قوڕئـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە ﴿ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾، (حَبـل) و (وَريـد) هەردووکیـان یـەک شـتن، (حَبـل) تاکـی (حِبـال)ە، کـە مەبەسـت ئـەو دەمـارە گەورانـەن، کـە لـە پزیشـککەرییدا بـە (شَرَايـين) نـاسراون و یەکێکیـان پێـی دەگوتـرێ: (شِرْيَـان)، یـان (شَرْيَـان)، (حَبل)یـش کـە پاڵدراوەتـە لای (وَريـد) بـۆ ڕوونکردنەوەیـە، واتـە: ئـەو پەتـەی بریتیـە لـە (وَريـد)، دەشـتوانین بڵێیـن: ڕەگـی خوێـن، چونکـە پاڵـدانی شـتێکی گشـتیی بـۆ لای شـتێکی تایبـەت، مانـای پاڵدانی ڕوونکردنەوەیـە، وەک دەگوتـرێ: (شَـجَرُ الأَرَاك)، (أَرَاك)یـش هـەر درەختـە، (شَـجَر)یش یـانی: درەخـت، درەختـی ئـەڕاک بـۆ ڕوونکردنەوەیـە، ﴿ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾، دەمـار و پـەتی وەریـد، کـە خوێنـی پێـدا دێ و دەچـێ.

٤)- ﴿ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴾، [ئێمە لێی نیزیکترین لە ڕەگی خوێن پێداهاتن و چوونی، ڕەگی گەردنی]، لە کاتێکدا کە دوو وەرگرەکان وەردەگرن، (تَلَقِّي) واتە: وەرگرتن، (التَلَقِّي أَخذُ الشَّيء مِن يَدِ مُعطِيهِ وَاستُعِيرَ لِتَسجِيلِ الأَقوالِ وَالأَعمالِ، وَتَعرِيفُ «المُتَلَقِّيانِ» لِلعَهدِ، أَو تَعرِيف الجِنسِ وَالتثنِيةِ فِيهَا لِلإِشارَةِ إِلى أَنَّ هَذَا الجِنسَ مُقَسَّمٌ اثنَين اثنَين)، وشەی (تَلَقِّي) بریتیە لە وەرگرتنی شتێک لە دەستی کەسێک کە دەیبەخشێ، لێرەش خوازراوەتەوە بۆ تۆمارکردنی قسەو کردەوان، ﴿ ٱلْمُتَلَقِّيَانِ ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، یان بۆ (عهد)ە، واتە: دوو وەرگرەکان، یاخود بۆ جینسە، هەموو ئەو دوو فریشتانەی وەردەگرن، کە بە دووان هاتوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو جینسە، واتە: ئەو جینسە لە فریشتەکان دووان دووانن، بۆ هەر مرۆڤێک دووان دانراون.

٥)- ﴿عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾، لە لای ڕاست و لای چەپ دانیشتوون، وشەی ﴿قَعِيدٌ﴾، لێرەدا بە مانای دانیشتن نیە، ئەو دانیشتنەی دژەکەی بریتیە لە هەڵسان، ﴿قَعِيدٌ﴾، (**المُقاعِد: مِثْلُ الجَلِيسِ لِلمُجالِس**)، وەک چۆن وشەی (**جَلیس**) بەکاردەهێنرێ بۆ (**مُجالِس**)، کەسێک لەگەڵ کەسێک دانیشتوە، یان هاونشینیەتی، (**قَعِید**)یش لێرەدا بە مانای (مُقاعد) ە واتە: هاونشین، کە هەمیشە لەگەڵدا بوو، (**قَعِيد: المُلازِمُ الثَّابتُ لا ضِدُّ القائِمِ**)، (**قَعِيد**) کەسێک کە پەیوەستەو چەسپاوە، نەک مەبەست پێچەوانەی ڕاوەستاو بێت، کە بریتیە لە دانیشتوو، بەڵام وشەی (**قَعِيد**) خوازراوەتەوە بۆ کەسێک کە لە کەسێک جیا نابێتەوە، واتە: ئەو دوو فریشتەیەی لای ڕاست و لای چەپی، لێی جیا نابنەوە.

٦)- ﴿مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾، هیچ قسەیەک نابێژێ و دەرناهاوێ، مەگەر چاودێرێکی ئامادەی لەلایە، (**لَفَظَ: أَيْ أَخْرَجَ**)، یانی: دەریهاویشت، هیچ قسەیەک دەرناکات و نابێژێ، مەگەر چاودێرێکی ئامادەی لەلایە، (**رقيب**) یانی: پارێزەرێك کە دەیپارێزێ و چاودێریی دەکات، (**عتيد**) یانی: (**مُعَدّ**) واتە: ئامادە، (**حاضِر**)، کە هەمیشە ئامادەیە، ئنجا مەرج نیە وەک هەندێک لە توێژەرەوان گوتوویانە: یانی: یەکێکیان ڕەقیبەو یەکێکیان عەتیدە، نا، بەڵکو یانی: ئەو دوو فریشتەوە هەر کامێکیان چاودێریشەو، ئامادەشە، هەروەها کە باسی لای ڕاست و چەپ دەکات، مەرج نیە یەکێکیان لە لای ڕاست و، ئەوی دیکەشیان لە لای چەپ بێ، بەڵکو یانی: هەر چوار دەوری مرۆڤیان گرتوە و ئاگاداری هەموو لایەکانین و، لە هەموو لایەکەوە ئاگایان لێیەتی و چاودێریی دەکەن.

## خستنە ڕووی شەش وردەکاریی لە ئایەتەکانی (١٦ و ١٧ و ١٨) دا:

**١-** کە دەفەرمویّ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ﴾، (**تَلَقَّى**) وەریگرت، ﴿يَتَلَقَّى﴾، وەردەگریّ، چی وەردەگریّ؟ بەرکار (**مَفعُولٌ بِه**)ەکەی قرتیّنراوە، یانی: (**إذ يَتَلَقَّى الأقوال والأعمال**)، کاتیّک دوو وەرگرەکان قسەکان و کردەوەکان وەردەگرن، یانی تۆماریان دەکەن.

**٢-** کە دەفەرمویّ: ﴿حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾، (**وريد**) تاکی (أوردة)یەو لە زاراوەی ئەمڕۆدا پیّیان دەگوتریّ: (شرايين)، بەڵام لە زاراوەی تەندروستیی و پزیشکگەرییدا (وريد) و (شريان) ئیّستا واتایەکی دیکەیان هەیە و (شريان) خویّنهیّنەرە بۆ جەستەو (وريد) خویّنبەرەوەیە بۆ دڵ، بەڵام لە بەکارهیّنانی قورئان و، لە بەکارهیّنانی زمانی عەرەبییدا کاتی خۆی کە قورئانی پیّ دابەزیوە، یانی: ئەو ڕەگانەی کە خویّنیان پیّدا دیّ و دەچیّت، بیّ ئەوەی ئەوە لەبەرچاو بگیریّ، کامیان خویّن لە دڵەوە دەبات بۆ جەستەو، کامیان خویّن لە جەستەوە دیّنیّتەوە بۆ دڵ، (**وريد**)یش ناوەکانی بەپیّی ئەو شویّنانەی لە جەستەدا هەن، دەگۆڕیّن، بۆ ویّنە:

**١-** لە گەردندا پیّی دەگوتریّ: (وريد).

**٢-** بەڵام لە دڵدا پیّی دەگوتریّ: (**الوَتِين**)، ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾﴾الحاقة.

**٣-** لە پشتدا پیّی دەگوتریّ: (**أَظهَر**) لە زمانی عەرەبییدا، .

**٤-** هەروەها لە قۆڵدا پیّی دەگوتریّ: (**أَكحُل**).

**٥-** هی ڕانیش پیّی دەگوتریّ: (**نَسَا**).

**٦-** لە پەنجە گچکەکاندا پیّی دەگوتریّ: (**أَسلَم**)، کەواتە: هەر ئەو دەمارەی خویّنی پیّدا دیّ و دەچیّ، بەپیّی جیاوازیی شویّنەکانی لە جەستەدا، ناوەکەشی دەگۆڕیّ.

**٣-** لە زاراوەی پزیشکگەریی هاوچەرخماندا، ئەو دووانە (**وريد وشريان**) لیّک جیاکراونەوە: (**الشريان: الذَّاهبُ بالدم النظِيف إِلَى الجِسمِ وَالقَلب**)، (**شَرْيَان**) یان (**شِرْيَان**): ئەوەیە کە

خوێنی پاک لە دڵەوە دەبات بۆ جەستە، واتە: خوێنێک کە پاکەو، پڕ لە خۆراکە، لە دڵەوە دابەشی دەکاتەوە بەسەر هەموو خانەکانی جەستەدا.

**(الوَرِيدُ: العائِدُ بالدم إلى القَلب مِنَ الجِسْم)**، **(وريد)**: ئەوەیە کە لە جەستەوە خوێن دێنێتەوە بۆ دڵ، واتە: خوێنێک کە سەرفکراوە و، پاشەڕۆکی هەڵگرتوە، دەیهێنێتەوە بۆ دڵ، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە پاک بکرێتەوە، ئەوەی کە لە زاراوەی پزیشکیی ئێستادا هەیە، ئەمە زاراوەیەکی زانراو و باوە، بەڵام ئەوەی لە قورئاندا خوای پەروەردگار بەکاریهێناوە، ئەو (ورید)ە مەبەست پێی شیریانە بە پلەی یەکەم، ئەوەی خوێن دەبات بۆ جەستە.

**٤-** نیزیکیی خوا ﷻ، نیزیکیی زانیاریی و توانایە، نەک نیزیکیی خود، ئەمە وەک ئەو ئایەتەی سووڕەتی **(الحديد)** وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ... ﴿٤﴾ ﴾الحديد، واتە: خوا لەگەڵتانە، لە هەر شوێنێک بن، کە هەموو زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەو ئایەتە دەبێ تەئویل بکرێ، واتە: ڕواڵەتەکەی وەرناگیرێ، کە: خوا بە زاتی خۆی لە هەر شوێنێک بن، لەگەڵتان بێ، بۆچی؟ چونکە ئەوە دژ دەوەستێ لەگەڵ ئایەتی: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ... ﴿١١﴾ ﴾الشورى دا، واتە: هیچ شتێک وەک خوا نیە، کەواتە: لەگەڵبوونی خواش بۆ ئێمە وەک لەگەڵبوونی شتەکانی دیکە نیە، هەروەها دژ دەوەستێ لەگەڵ هەموو ئەو ئایەتانەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ... ﴿٣﴾ ﴾یونس، ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ... ﴿٨٤﴾ ﴾الزخرف، هەروەها لەگەڵ ئەوەدا کە زانایان دەڵێن: **(إِنَّ اللهَ مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ، بائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ)**، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستکراوەکانیەتی، بەڵام مەبەست پێی هەمان شتە کە لەم ئایەتانەدایە: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾الواقعة، واتە: دەبووایە کاتێک دەگەیشتە گەروو، (واتە: ڕووح کە دەگاتە گەروو، لە جەستە دێتە دەرێ و دەگاتە قوڕقوڕاگە)، ئێوەش لەو کاتەدا تەماشا دەکەن، ئێمە لە ئێوە لێی نزیکترین، بەڵام نابینن، (لێرەدا مەبەست پێی فریشتەکانە)، دەبووایە ئەگەر ئێوە

ملکەچ نین، [لە ژێر هەیمەنەو دەسەڵاتی خوادا نین]، بیگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن، کە دەفەرمووێ: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾الواقعة، ئێمە لە ئێوە لێی نیزیکترین، بەڵام ئێوە نابینن، یانی: ئێوە ڕەنگە لەملاولای دابنیشن، کاتێک ئەو مرۆڤە دەکەوێتە سەرە مەرگ، بەڵام فریشتەکان زۆر لێی نزیکن، بەڵام ئێوە نایانبینن، لێرەدا دیارە مەبەست پێی فریشتەکانە، بەڵام ئەوەی ئێرە [سوورەتی (ق)]، دیارە کە مەبەست پێی نیزیکی خوای پەروەردگارە بە زانیاریی و بە دەسەڵاتی خۆیی و بە سیفەتەکانی، نەک بە زاتی.

٥- ئەوەیە کە خوا دەفەرمووێ: ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾، (أل)ی سەر: ﴿ٱلْيَمِينِ﴾ و ﴿ٱلشِّمَالِ﴾، بۆ ناساندنە، بۆ (عهد)ە، واتە: لای ڕاست و چەپی، ڕاست و چەپەی ئەو مرۆڤە، یاخود ئەمە (أل)ی قەرەبوویە بۆ پاڵوێدان، (**عِوَضَ عِنِ الإِضافَة**)، واتە: لای ڕاست و چەپی ئەو مرۆڤە، یان لای ڕاست و چەپەکان کە زانراون، .

لەو بارەوە (**الطبری**) بە ژمارە (٣١٩٣٠) ئەم شوێنەوارەی هێناوە: (**عَنْ مُجَاهِد قالَ: عَنِ اليَمِينِ الَّذِي يَكْتُبُ الحَسَنات، وَعَنِ الشِّمالِ الَّذِي يَكْتُبُ السَّيِّئات**) موجاهید گوتوویەتی: ئەوە لەلای ڕاستە، ئەو فریشتەیە کە چاکەکان دەنووسێ و، ئەوەی لە لای چەپە، ئەوەیە کە خراپەکان دەنووسێ.

(**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆی[1] دا دەڵێ: (**قَالَ الْحَسَنُ وَمُجَاهِدٌ وَقَتَادَةُ: (الْمُتَلَقِّيانِ) مَلَكَانِ يَتَلَقَّيَانِ عَمَلَكَ: أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِكَ يَكْتُبُ حَسَنَاتِكَ، وَالْآخَرُ عَنْ شِمَالِكَ يَكْتُبُ سَيِّئَاتِكَ، قَالَ الْحَسَنُ: حَتَّى إِذَا مِتَّ طُوِيَتْ صَحِيفَةُ عَمَلِكَ وَقِيلَ لَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ:** ﴿ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾﴾الإسراء).

واتە: هەر کام لە حەسەنی بەصریی و موجاهیدو قەتادە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) گوتوویانە: ﴿ٱلْمُتَلَقِّيَانِ﴾، ئەو دوو فریشتانەن کە کردەوەکانت، چالاکییەکانت تۆمار دەکەن، یەکێکیان لە لای ڕاستە، چاکەکانت تۆمار دەکات و، ئەوی دیکە لای

---

(١ ) الجامع الأحكام القرآن، ج١٧، ص٩.

چەپتەو خراپەکانت تۆمار دەکات، حەسەنی بەصرایی گوتوویەتی: هەتا کاتێک کە مردی لاپەڕەکەت (دەفتەرەکەت) دەپێچرێتەوە، (هی کردەوەکانت) و لە ڕۆژی قیامەتیدا پێت دەگوترێ: ﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾الإسراء، نووسراوەکەت بخوێنەوە ئەمڕۆ هەر خۆت بەسی لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بکەی.

٦- کۆتایی ئەم مەسەلەیە بە دوو فەرمایشتی پێغەمبەر دێنین ﷺ کە ئەوە دەگەیەنن وەک پێشتریش گوتمان، کە دەگوترێ: کردەوەکانی مرۆڤ تۆمار دەکرێن، مەبەست پێی نیەتەکانی نێو دڵ و، خولیایەکانی مێشک، هەروەها بێژراوەکانی زمان، هەروەها ئەنجامدراوەکانی بە ئەندامەکانەوە،، هەموویان دەگرێتەوە، هەر چوار جۆرەکەی دەگرێتەوە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوە:

أ- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{إِذَا هَمَّ الْعَبْدُ بِالْحَسَنَةِ كُتِبَت لَهُ حَسَنَةٌ، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَت لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَاذَا هَمَ بِالْسَّيِّئَةِ لَمْ تُكْتَب عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَت لَهُ سَيِّئَةٌ وَاحِدَةٌ، وَإِنْ تَرَكَهَا للهِ كُتِبَت لَهُ حَسَنَةٌ} (أخرجه البخاري: ٢٤٣٥، ومسلم: ٢٠٧).**

واتە: هەر کاتێک بەندە ویستی چاکەیەک بکات، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، ئەگەر ئەنجامیدا، دە چاکەی بۆ دەنووسرێن، بەڵام هەر کاتێ بەندە ویستی خراپەیەک بکات، بۆی نانوسرێ، کاتێک ئەنجامیدا، خراپەیەکی بۆ دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر لەبەر خوا وازی لێ هێنا(و، لێی پەشیمان بۆوە)، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ.

کەواتە: (**إِذَا هَمَّ**)، ئەگەر ویستی، مانای وایە فریشتەکان نیازو مەبەستی نێو دڵیش دەزانن.

ب- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{إِنَّ اللَّهَ غَفَرَ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسُهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ، أَوْ تَكَلَّمْ} (أخرجه البخاري: ٦٦٦٤، ومسلم: ١١٦).**

واتە: بە دڵنیایی خوا بۆ ئەم ئۆممەتە(ی پێغەمبەر ﷺ ) لێبوردەیە لە هەر شتێک لە دڵییدا دێ و دەچێت، (واتە: خولیایەکانی نێو دڵی و نیازو مەبەستەکان)، مادام کاری پێ نەکات، یاخود قسە نەکات.

بەڵام ئەگەر قسەی کرد، لە قەدەر قسەکەی سزا هەیەو پاداشت هەیە، بەپێی جۆری قسەکەی، هەروەها ئەگەر کردەوەشی کرد، بەهەمان شێوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**هاتنی بێهۆشیی مردن کە مرۆڤی بێبڕوا، هەر خۆی لەو مردنە لادەداو، فووکران بە کەڕەنادا لەلایەن ئیسرافیلەوەو، هاتنی هەر کەسێک لەگەڵ پێشخۆدەر و شایەدێکدا و، پەردە لەسەر چاو لادرانی و چاک بینینی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ﴾، بێهۆشیی مردن بە ڕاستیی هات، یان: بە چەسپاویی هات، یان: بە شێوەیەکی پڕ حیکمەت کە هەر شایستەی خوایە هات، (**السَّكرَةُ: إسمٌ لِما يَعتَرِي الإنسانَ من ألمٍ أَو اختِلالٍ فـي المِزاجِ يَحْجُبُ مِنْ إدْرَاكِ العَقْلِ، فَيَختَلُّ الإدراكُ وَيَعترِي العَقلَ غَيبُوبَة، وَهَوَ مُشتَقٌّ مِنَ السَّكرِ وَهُوَ الغَلقُ**)، (**سَكرَة**): ناوە بۆ ئەوەی بەسەر ئینسان دێ، بەهۆی ئازارێکەوە، یان بەهۆی تێکچوونی سرووشتییەوە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی عەقڵ بپۆشێ لەوە کە تێبگات و، عەقڵ جۆرێک لە بێئاگایی بەسەردا دێ، (**سَكرَة**) لە (**سَكر**)ەوە هاتوە، بە مانای (**غَلق**)، واتە: داخستن، پێوەدان.

**٢)-** ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾، [ئەمەش گوتراوی بێژەرێکە بێژەرێک پێی دەبێژێ بەو مرۆڤە، یاخود بە زمانی حاڵ دەگوترێ:] ئا ئەوە بوو کە تۆ خۆتت لێ لادەدا، ﴿تَحِيدُ﴾، (**حَادَ يَحِيدُ حَيداً، أَي: هَرَبَ يَهرُبُ هرُوباً**)، یان (**مالَ يَمِيلُ مَيلاً**)، (**حَيْد**) بە مانای ڕاکردن و خۆ لێ لادان دێ: (**تَحِيد، أَي: تَفِرُّ وَتَهْرُبُ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ لِلْكَرَاهِيَّةِ، أَو لِتَجَنُّبِ أَسْبَابِ المَوْتِ**)، (**تَحِيد**) واتە: هەڵدەهاتی، خۆت لادەدا، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ پێناخۆش بوون و، خۆ دوورگرتن لە هۆکارەکانی مردن، یان بیرکردنەوە لە مردن.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین:

**{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ الله عَنْهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، كَانَتْ تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ «أَوْ عُلْبَةٌ فِيهَا مَاءٌ»، فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي المَاءِ، فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ، وَيَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ» ثُمَّ نَصَبَ يَدَهُ فَجَعَلَ يَقُولُ: «فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى» حَتَّى قُبِضَ وَمَالَتْ يَدُهُ} (أخرجه البخاري: ٤١٨٤).**

واتە: عائیشە (خوا لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دۆڵچە ئاوێک، یاخود قاپە ئاوێکی لەلا بوو، [ئاوەکە دەبێ سارد بووبێ]، دەستی تێدەخست و دەم و چاوی خۆی پێ دەسڕی، [بێگومان گەرمای بووە، یاخود بۆ ئەوەی ئارەقەکە بسڕێ]، دەیفەرموو: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، مردن بێهۆشیی هەن، ئنجا دوایی پێغەمبەر ﷺ دەستی چەقاند و فەرمووی: بۆ لای هاوەڵانی بەرز، هاوەڵانی سەرێ، هەتا گیانی کێشراو دەستی لار بۆوە.

کەواتە: مردن بۆ هەموو کەس حاڵەتێکی ناخۆشەو، جۆرێک لە ئازاری هەر هەیە، تەنانەت بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ، بۆ ئەوەی بزانرێ پێغەمبەریش ﷺ لە هەموو ڕووەکانی دیکەی، کە هی مرۆڤانن، ئەویش مرۆڤ بووە، بە مردن ئازاری پێگەیشتوە، بەڵام بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مردنەکەیدا زانیویەتی کە سەفەرەو بۆ خزمەت خوای پەروەردگار، ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، ڕووحەکەی دەچێتە لای هاوەڵانی سەرێ، لای فریشتەکان، خزمەت خوای پەروەردگارو، فریشتەکان و، جەستەکەشی دەخرێتەوە نێو خاک.

٣)- ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ﴾، فوو بە کەڕەنادا کرا، ئەم فووە بێگومان فووی دووەمە، چونکە دەفەرمویٔ:

٤)- ﴿ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴾، ئەوە ڕۆژی هەڕەشەیە، **(أَي: يَوْمُ حُصُولِ الوَعِيدِ الَّذِي كانُوا تُوَعَّدُوا بِهِ)**، ڕۆژی هاتنە دی ئەو هەڕەشەیە، کە هەڕەشەیان پێی لێکراوە، لێرەدا هەمووی

مەبەست قسە کردنە لە ئینسانی بێبڕوا، چونکە بۆ بێبڕوایان ئەو ڕۆژی دوایی قیامەت و زیندوو کرانەوە، ڕۆژی هەڕەشەیەو ڕۆژی پەیدابوونی مەترسیی و ئازارو سزایە.

٥)- ﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾، هەموو کەسێک هات، پێشخۆدەرێک و شایەدێکی لەگەڵدان، لێرەدا دەگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفۡسٖ﴾، هەموو کەسێک بێت لە مرۆڤان، ئەو کاتە دەبێ بڵێین: ئەو دوو فریشتانەی پێشخۆی دەدەن، شایەدییشی لەسەر دەدەن، ئەگەر مەبەستیش لە ﴿كُلُّ نَفۡسٖ﴾، (**كُلُّ نَفْسٍ مُجْرِمَةٍ**)، هەموو نەفسێکی تاوانبار بێبڕواو خراپەکار بێ، کە ئەمەیان زیاتر پێدەچێ، بەچەند بەڵگەیەك:

١- سیاقەکە باس باسی مرۆڤی بێبڕوایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾، بەدڵنیایی بابای بێبڕوایە کە خۆی بەسەر مردنەوە نابات و پێی خۆشە باسی مردنی بۆ نەکرێ و باسی دوای مردنی بۆ نەکرێ و خۆی لێ لادەدات، بەڵام ئینسانی بڕوادار یادی مردن دەکات و مردن وەک سەفەرێک و، دەروازەیەک کە لێیەوە دەچێ بۆ جیهانی بەرزەخ و بۆ خزمەت خوای پەروەردگارو بۆ لای ئەو پاداشتەی کە بۆی دانراوە، تەماشا دەکات.

٢- پاشان بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ:

﴿مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾، ﴿سَآئِقٞ﴾، واتە: لێخوڕ، پێشخۆدەر، کە ئەم تەعبیرە خوا ﷻ وەک باسمان کرد، پێشتر لە سوورەتی (مریم)دا باسمان کرد، خوا ئەم جۆرە تەعبیرەی بۆ بێبڕوایان و خراپەکاران بەکارهێناوە، بەڵام بۆ بڕواداران تەعبیرێکی دیکەی بەکارهێناوە، وەک دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ٨٥ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ٨٦﴾مریم، واتە: ئەو ڕۆژەی پارێزکاران بە شێوەی میوان و شاندی ڕێز لێگیراو، بە ڕێ دەکەین بۆ لای خوای بە بەزەیی، بەڵام تاوانباران بە تینوێتیی لێدەخوڕین، وەک چۆن ئاژەڵێکی تینوو بەرەو ئاو لێدەخوڕدرێ، ئاوا لێیان دەخوڕین.

کەواتە: ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە کە لێرەدا: ﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ﴾، یانی: هەر کەسێکی بێبڕواو تاوانبارو خراپەکار.

٣- هەروەها بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ:

٧)- ﴿ لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا ﴾، تۆ بێئاگابووی لەمە، کێ بێ ئاگایە لە جیهانی بەرزەخ و لە مردن و لەوەی کە لە دوای مردن دێ؟ ئینسانی بێبڕوا.

٤- هەروەها بە بەڵگەیەکی دیکەی چوارەم کە دەفەرموێ:

٨)- ﴿ فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ ﴾، پەردەکەمان لەسەر چاوت لادا، چونکە ئەوە کەسانی بێبڕوان کە هەتا نەمرن، پەردەی بێئاگایی لەسەر چاویان لاناچێ، بەڵام ئینسانی بڕوادار هەر لە دنیادا، ئەو پەردەیەی دڕاندوەو لایداوە، بەهۆی ئەو بووناسیی و ئیمان و عەقیدەو خوا پەرستییەوە، کە لە خۆیدا دەیهێنێتە دی، ئەم پەردەی بێئاگاییە لادەچێ لەبەرچاوی، ڕاستییەکان دەبینێ، بە چاوی عەقڵ و دڵ دەیانبینێ، هەر وەک عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: (لَو كُشِفَ الغِطاءُ مَا زدَدْتُ يَقِيناً)، ئەگەر پەردە لابچێ دڵنیایم زیاد ناکات، بۆچی؟ چونکە ئەگەر پەردە لابچێ بە چاوی سەر بەهەشت و دۆزەخ و فریشتەکان ببینێ، دەگونجێ چاوی سەر بەهەڵەدا بچێ، بەڵام شتێک کە خوا ﷻ لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بە تۆی ڕادەگەیەنێ، تۆ دڵنیایی و یەقینێکت بۆ پەیدا دەبێ، زیاتر لەوەی کە بە چاوی سەر ببینی!

کە دەفەرموێ: ﴿ مَعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴾، دەڵێ: (السَّائِقُ: الَّذِي يَجعَلُ غَيْرَهُ أَمَامَهُ يُزجِيهِ فِي السَّيرِ لِيَكُونَ بِمَرأَى مِنهُ)، (سَائِق): کەسێکە جگە لە خۆی پێش خۆی دەداو، لێی دەخوڕێ، تاکو هەر لەبەر چاوی بێت و لێی ون نەبێ، بەو لاولادا نەچێ، وەک گوتمان: ئەو تەعبیرە خوا ﷻ زیاتر بۆ خەڵکی بێبڕوای بەکارهێناوە، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ۝٦ ﴾الأنفال، وەک بەرەو مەرگ لێبخوڕدرێن و مەرگەکەشیان لەبەر چاو بێ، هێندە دەترسان.

﴿ لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەمە لە بێ ئاگایی دابووی، ئەمە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، یانی: دەگوترێ، یاخود: بە هەر کام لە تاوانباران

دەڵێین: تۆ لەمە لە بێ ئاگایی دابووی، (**الغَفلَةُ: الذُّهُولُ عَمَّا شَأنَهُ أَن يُعلَمَ، وَأُطلِقَت هُنا مَعَ الإِنكارِ وَالجَحْدِ عَلَى سَبيلِ التَهَكُّم**).

﴿غَفۡلَةٖ﴾، بریتیە: لە بێ ئاگایی لە شتێک کە دەبێ بزانرێ، بەڵام لێرە بە مانای نکووڵییکردن و دان پێدا نەهێنان هێنراوە، لەسەر شێوەی گاڵتە پێکردن.

﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ﴾، پەردەکەمان لەسەر چاوت لادا، پۆشاکەکەمان لەسەر چاوت لادا، (**غِطاء**)، شتێکە وەک سەر قاپ شتێکی پێدا بپۆشرێ، هەروەک (**غِشاء**)، کە شتێکە شتێکی پێدا بپۆشرێ، بەڵام (**غِطاء**) بە زۆری بە سەری قابڵەمەو مەنجەڵ و دەفر دەگوترێ، بەڵام (**غِشاء**) بە پۆشاک دەگوترێ، (**كَشْفُ الغِطَاءِ، تَمْثِيلٌ لِحصُولِ اليَقينِ بالشيء بَعدَ إنكارِ وقُوعِهِ**)، سەر قاپ لەسەر لادان، یان پەردە لەسەر لادان، وێنا کردنە بۆ پەیدابوونی دڵنیایی لە بارەی شتێکەوە، دوای ئەوەی نکووڵیی لە هەبوونی کراوە، ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ﴾، ئەو مرۆڤە کە ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوە، وێنا کراوە بە کەسێک کە پەردەیەکی لەبەر چاوەو، پەردەکە لادەدرێ، یان لە کیف و قۆزاخەیەکدایەو، لەوێ دەهێندرێتە دەرێ.

٩)- ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾، [ئەم (ف)ە بۆ بەدوا داهاتن (تعقيب)ە]، دوای ئەوە تۆ یەکسەر ئەمڕۆ چاوت تیژە، یان (ف)ی تەفریعە، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە پەردەکەمان لاداوە لەبەر چاوت، ئەمڕۆ چاوت تیژە و، واتە: باش دەبینێ، (**حِدَّةُ البَصَرِ: قُوَّةُ نَفاذِهِ فِي المَرئِي وَحِدَّةُ كُلُّ شَيء قُوَّةُ مَفعُولِهِ، وَمِنهُ حِدَّةُ الذِهنِ وَالمَعنَى: شاهَدتَ البَعثَ وَالحَشرَ وَالجَزاء..**)، (**حِدَّة البَصَرِ**): بریتیە لە هێزی چاو لە بیندراوەکەدا، باش پێی دەبینێ، ئنجا حیددەتی هەر شتێک و، تیژی هەر شتێک بریتیە: لە ئەوەی زۆر کارا بێ، دەگوترێ: زەینی زۆر تیژ، کەواتە: مەبەست ئەوەیە تۆ ئەمڕۆ لێپرسرانەوەو کۆکرانەوەو سزاو پاداشت زۆر چاک دەبینی و، کەوتوویە حاڵەتێک کە هەرچی تەم و مژی گومان و دوودڵییە هەمووی ڕەویوەتەوەو، ئێستا کەوتوویە نێو واقیعێک کە پێشتر نکووڵییت لێ دەکرد.

کە دەفەرموێ: ﴿سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾، زانایان بە چەند واتایەک لێکیان داوەتەوە:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: دوو فریشتەن، یەكێكیان بابای تاوانبار لێ دەخوڕێ و، ئەویدیكەیان شایەدە لەسەری.

ب- هەندێكی دیكە گوتوویانە: هەر یەک فریشتەیە لێشی دەخوڕێ و شایەدیشە لەسەری.

ج- ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕزی بێ) گوتوویەتی: **(السَّائِقُ المَلَكُ، والشَّهِيدُ مِن أَنفُسِهِم الأيدي والأَرجُل)**، (سائق) فریشتەكەیە، ئەوەی كە لێی دەخوڕێ پێش خۆی دەدا، بەڵام شایەدەكە لەخۆیانە، دەستەكانیان و پێیەكانیان.

د- ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: **(السَّائِقُ الْمَلَكُ وَالشَّهِيدُ الْعَمَلُ)**، لێخوڕەكە فریشتەكەیە و، شایەدەكەش كردەوەكەیە.

هـ- حەسەنی بەصرایی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویەتی: **(سَائِقٌ يَسُوقُهَا وَشَاهِدٌ يَشْهَدُ عَلَيْهَا بِعَمَلِهَا)**، لێخوڕیک لێی دەخوڕێ و، شایەدێک شایەدیی لەسەر دەدات بە كردەوەكەی.

و- هەندێكیش گوتوویانە: **(السَّائِقُ: القَرِينُ الجِنِّي)** لێخوڕەكە ئەو قەرینە جندەیەكە لەگەڵیدایە.

ز- منیش وای تێدەگەم كە: ﴿سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ﴾، واتە: ئەو دوو فریشتانەی لەگەڵیدا بوون و، كاتی خۆی كردەوەكانیان تۆمار كردوون، هەر ئەو دووانەن، ﴿سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ﴾، هەر كامێكیان پێش خۆشی دەدات و، شایەدیشە لەسەری، هیچ ڕێگرییەک لەو مانایەش نیە!!!!!!!!!!!!

بەڵكو پێم وایە ئەو مانایە لەوانی دیكە باشترە، واتە: هەر ئەو دوو فریشتەیەی كە كاتی خۆی لەگەڵی بوون، ئەوانن (**سائق وشهید**) چونكە ئەگەر ئەو فریشتانەی كردەوەكانیان تۆمار كردوون، ئەوان نەبن و فریشتەیەكی دیكە بێ، دەڵێ: تۆ كردەوەی منت ئاگا لێ نەبوون، بەڵام ئەو فریشتانەی كردەوەكانیان

تۆمار کردوون، ئەگەر هەر ئەو دوو فریشتانە پێش خۆشی بدەن و، شایەدیش بن لەسەری، زیاتر دەبنە بەڵگە بەسەریەوە، دەڵێن: ئایا ئێمە لەگەڵت نەبووین کە فڵان شتەت کرد؟ کە جاری دیکەش گوتوومانە، دەگونجێ ئەو فریشتانە بە باشترین شێوەی تۆمار کردن، هەموو نیەتەکانی نێو دڵیشی و، خولیایەکانی نێو بیرو زەینیشی، هەروەها قسەو تەعبیرەکانی و، کردەوەو هەڵوێستەکانی هەموویان تۆمار بکەن، بە شێوەیەک بە دەنگ و وێنە بیخەنەوە بەر چاوی.

بۆیە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام وای تێدەگەم کە ئەگەر بگوترێ: ﴿سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ﴾، واتە: هەر کام لەو دوو فریشتانەی کە کاتی خۆی کردەوەکانییان تۆمار کردوون، ئێستا هەر کامێکیان پێش خۆشی دەدا و، شایەدییشی لەسەر دەدا، نەک یەکێکیان پێش خۆی بدات و، یەکێکیشیان شایەد بێ لەسەری، هەر کامێکیان سائیقیشەو شەهیدیشە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**لە ڕۆژی قیامەتدا قەرینە جندەکەی بابای کافر، بە شانازییەوە دەڵێ: ئەمەم ساز کردوە، واتە: بۆ سزادان، خواش فەرمان بە دوو فریشتەکان دەکات، هەر بێبڕوایەکی نەسەلمێنی ڕێگر لە چاکەی دوو دڵ، کە هاوبەشی بۆ خوا داناوە، فڕێ بدەنە نێو ئازاری سەختی دۆزەخەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ ﴾، هاونشینەکەشی گوتی، لە حاڵێکدا پێی دەگوترێ: لەم حاڵە بێئاگابووی، پەردەکەمان لەسەر چاو لاداوی، چاوت تیژ دەبینێ، ئەویش دەڵێ:

٢)- ﴿ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴾، ئەمە لە لای من ئامادەیە، ئنجا زانایان گوتوویانە: (**قَرِين**)یانی فریشتەکە، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: یانی: (**قَرِين**)ە جندەکەی، کە بە تەئکید ئەو مانایە بەهێزترە.

هەندێکیشیان گوتوویانە: هاونشینەکەی لە مرۆڤان، بەڵام بێگومان ئەوەی دووەمیان بەهێزترە، چونکە وشەی (**قَرِين**)، لە قورئاندا کە بەکارهاتوە زیاتر بۆ جندێک کە لەگەڵ مرۆڤ دایەو، هانی دەدات بۆ خراپە، بەکارهاتوە، ﴿ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴾، ئەمە لەلای من ئامادەیە، (**عَتِيد**) بە مانای (**مُعَدّ**)، ئامادەکراو، یاخود (**حاضِر**) ئامادە، هەردوو واتایەکەش لێک نزیکن.

٣)- ﴿ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴾، هەردووکتان فڕێ بدەنە نێو دۆزەخەوە، هەر زۆر بێبڕوایەکی پشت لە هەقکەرو، ناکۆک لەگەڵ هەق، نەسەلمێن بۆ هەق.

بۆچـی دەفەرمـوێ: هەردووکتـان فـڕێ بـدەن؟ وەک پێشـتریش گوتمـان، ئەمـە چـوار مانایـان هەڵدەگـرێ:

١- ئەمە فەرمانە بە دوو فریشتەکان! واتە: ئەی دوو فریشتەکان فڕێ بدەنە دۆزەخەوە.

٢- یاخود: خوا ﷻ لەگەڵ یەک فریشتەیەتی، بەڵام دواندنەکە بەپێی عورفی عەرەبان، کە جاری وا هەبووە یەک کەسیان دواندوە، بەڵام ڕاناوی دووانیان بۆ بەکارهێناوە.

٣- واتای سێیەمی ئەوەیە: (**تَثنِيَةُ الفاعِل نُزِّلَت مَنزِلَة تَثنِيَةَ الفِعلِ، أَي: أَلقِ أَلقِ**)، کە بکەرەکە کراوە بە دووان، ئەمە وەک ئەوە وایە خودی کردەوەکە کرابێ بە دووان، واتە: فڕێ بدە، فڕێ بدە.

٤- بەڵام من پێم وایە هەر ئەو دوو فریشتانەی کە لە دنیادا چاودێر بوون بەسەریەوە، خوا فەرمان بە هەردووکیان دەکات کە ئەو کەسەی بێبڕوایەکی بێڕەزا بووە و کەللەڕەق و سەرسەخت بووە لە کوفردا، (**عَنِيد: أَي: المُعانِدُ المُعرِضُ عَنِ الحَقِّ، عَنَدَ يَعنِدُ عُنُوداً، أَي: خالَفَ وَرَدَّ الحَقَّ وَهُوَ يَعلَمُ، وَالجَمعُ عُنُد، مِثلُ رَغِيفٌ ورُغُف**)، (**عَنِيد**) بە مانای (**مُعانِد**) دێ، واتە: کەسێک کە پشت لە هەق دەکات و، دەشزانێ حەقە، بەڵام ڕەتی دەکاتەوە، (**عَنِيد**) بە (**عُنُد**) کۆ دەکرێتەوە، وەک چۆن (**رَغِيف**) بە (**رُغُف**) کۆدەکرێتەوە، (**رَغِيف**) واتە: نانێک، (**رُغُف**) واتە: نانەکان.

خـوای زانـاو شـارەزا ئـەو کەسـە چەنـد سـیفەتێکی زۆر خراپـی لـێ هەڵـدەدات، ﴿كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾، هـەر زۆر بێبڕوایەکـی، زۆر نەسـەلمێن و کەللـەڕەق.

٤)- ﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ﴾، زۆر ڕێگرە لە چاکە، هەموو جۆرەکانی چاکە.

٥)- ﴿مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ﴾، (معتد) دەستدرێژکارو سنوورشکێن، ﴿مُّرِيبٍ﴾، بە دوو واتایان دێ:

أ- بە واتای خۆی دوو دڵ (**مُرتاب**) بووە.

ب- بە مانای (**المُدخِلُ فِي الرَّيبِ**)، خەڵک کەوێنە نێو دوو دڵیی و گومانەوە.

٦)- ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾، ئەو کەسەی لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکەی داناوە، (الذي) کە (**إسم مَوصُول**)ە، بەدەلە بۆ ئەوەی پێشێ، دەشگونجێ نیهاد بێ و، دوایەکەی گوزارەیە، ئەمە حەوت سیفەت.

٧)- ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾، دەجا هەردووکتان فڕێی بدەنە نێو سزایەکی هەرە سەخت و دژوارەوە، ئەمەش جەختکردنەوەی فەرمانی یەکەمە، کە فەرمووی: ﴿أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ﴾، پێشێ فەرمووی: ﴿أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ﴾، لێرەش دەفەرموێ: ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾، کەواتە: ئەو دۆزەخە سزایەکی زۆر سەخت و بێ ڕەزای تێدایە.

## مەسەلەی چوارەم:

**پاکانە بۆ خۆ کردنی قەرینە جندەکە، کە بابای کافر هەر خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بووەو ئەو یاخیی نەکردوە، ڕێگرتنی خواش ﷻ لە دەمەقاڵێ و مشتومڕیان لەلای، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێشتر هەڕەشەی سزای پێگەیاندوون، ئێستاش بڕیاری خوا ناگۆڕێ و، ستەمیش لە بەندەکان ناکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ﴾، هاونشینەکەی گوتی: پەروەردگارمان! من یاخییم نەکردوە. (قرین) پێشتریش باسمان کرد، واتە: قەرینە جندەکەی، گوتی: ئەی پەروەردگارم! ﴿مَآ أَطْغَيْتُهُۥ﴾، من وام لێ نەکرد یاخیی بێ، (**أَي: ما جَعَلْتُهُ طَاغِيَاً**)، من وام لێ نەکرد یاخیی بێ و لە سنوور دەربچێ.

**٢)-** ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾، بەڵکو هەر خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بوو، لێرەدا دەردەکەوێ ئەو بێبڕوایە کە دەهێنرێ بۆ سزادان، دەیەوێ پاکانە بۆ خۆی بکات، ئەستۆ پاکیی خۆی ڕابگەیەنێ و، خەتایەکە لە ملی قەرینە جندەکە بکات، بۆیە ئەویش بەرگریی لە خۆی دەکات و، دەڵێ: بۆ خۆی لە گومڕاییدا بووەو، حەزی لە گومڕایی کردوە، ئەگەرنا ئەگەر بۆ خۆی حەزی لێ نەبووایەو بە قسەی نەکردبامایە، توانام نەبوو وای لێبکەم، لە تۆ یاخیی بێ و بکەوێتە حاڵەتی ملهوڕیی و سەرکێشییەوە.

بۆیەش دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾، بەڵام خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بووە، چونکە شتی دوور مرۆڤ بە زەحمەت دەیگاتێ، واتە: ئەو لە گومڕاییەک دابووە کە زۆر ڕۆیشتوە و، دوور کەوتۆتەوە لە حەق، ئەمە وەک ئەو

ئایەتـەی سـوورەتی (البقـرة) یـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾﴾ البقـرة، واتـە: یادبکـەوە! کاتێـک ئەوانـەی پەیڕەوییـان لێکـراوە، حاشـا دەکـەن لەوانـەی شـوێنیان کەوتـوون، سـزاو ئازاریـان دی و، هەمـوو پەیوەندییەکانیـان پچڕانـد.

لـەو ڕۆژەدا هـەر کەسـە خـوا خوایـەتی خـۆی دەربـاز بـکات، گوناهـو تـاوان لـە ئەسـتۆی بەرانبەرەکـەی بخـات و، ئەسـتۆ پاکیـی خـۆی ڕابگەیـەنی، بـەڵام بێگومـان هـەر خۆیـان فریـو دەدەن، چونکـە خـوا ﷻ هیـچ شـتێکی لـێ پەنهـان نابـێ.

٣)- ﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ﴾، (خوا) فەرمووی: لە لای من دەمەقاڵێ و ناکۆکیی مەکەن، (**الإختِصامُ: المُخَاصَمَةُ**)، (**إختِصام**) یانی: ناکۆکیی و دەمەقاڵی و مشت و مڕ.

٤)- ﴿وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ﴾، لە حاڵێکدا من پێشتر هەڕەشەم بۆ ناردبوون، واتە: هەڕەشەم بۆ ناردبوون، کە ئەگەر ئەهلی کوفرو تاوان و خراپە بن، سزاتان دەدەم، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە لە نێوان مرۆڤە بێبڕواو خراپەکارەکەو، قەرینە جندەکەیدا، مشتومڕ بووە، هەر کامێکیان هەوڵی داوە: خەتا لە ملی ئەوی دیکە بکات، بۆیە خوا ﷻ فەرمانیان پێدەکات کە بێ دەنگ بن، چی دیکە مشت و مڕ نەکەن، چونکە هیچ سوودی نیە، لە حاڵێکدا کە خوا پێشتر هەڕەشەی خۆی بۆ ناردوون، ﴿وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ﴾، (**أَي: قَدَّمْتُ إِلَيْكُمُ الوَعِيدَ قَبْلَ اليَوْمِ، وَالتَّقدِيمُ جَعلَ الشَّيء قُدَّامَ غَيرِهِ**)، واتە: پێش ئەمڕۆ من هەڕەشەم بۆ ناردبوون، (**تَقدِيم**): بریتیە لەوەی تۆ شتێک بخەیە پێش دەمی کەسێک.

٥)- ﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾، قسە لە لای من ناگۆڕێ، واتە: ئەو بڕیارەی بۆم داون، کە دەبێ بێبڕوایان سزا بدرێن و، چاکەکاران پاداشت بدرێنەوەو، بڕیاریش لەلای من ناگۆڕێ.

٦)- ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾، من ستەمکاریش نیم بۆ بەندەکان، واتە: سزاو ئازارێک کە خوا ﷻ بێبڕوایانی پێ سزا دەدات، یانی: ئەمە دادگەرییەکی ڕەهایەو، قسەکردن و

مشتومڕ کردن، لێرە سوودی نیە، چونکە بڕیاری خوا ﷻ کە لەسەر بناغەی حیکمەتی خوا و زانیاریی خوا دامەزراوە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، شتێک گۆڕانی بەسەردا دێت کە ناهەق بێ، بەڵام (٢ + ٢) لە دنیاو قیامەتدا هەر دەکاتە (٤)، شتی ڕاست چەسپاوە، ئەوە شتی ناهەقە کە گۆڕانی بەسەردا دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِالْوَعِيدِ﴾، ئەم (ب)ەی (بالوعید) وەک (ب)ی ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ ... ﴿٦﴾﴾المائدة، تەنیا بۆ جەختکردنەوەو زیاتر بەهێزکردنی واتایەکەیە، کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ﴾، (**أي: لَسْتُ مُبْطِلاً في الوَعِيدِ قَولاً وَالتَّعرِيفُ لِلعَهْدِ، وَما لَيْسَ بِبَاطِلٍ فَلا يُبَدَّل**).

کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ﴾، واتە: من لە هەڕەشە کردنەکەمدا لەسەر ناهەق نەبووم، چونکە هەڕەشە قسەیە، ﴿الْقَوْلُ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عهد)ە، واتە: لە قسەکەمدا، واتە: لە هەڕەشەکەمدا کە بە قسە ناردبووم، ناهەق نەبووم، هەر شتێکیش کە ناهەق نەبێ ناگۆڕدرێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە من ستەمکار نیم بۆ بەندەکانم، بۆیە پێشتر هەڕەشەم بۆ ناردوون و، ئاگادارم کردوونەوە، کەواتە: ئەگەر هەڕەشەم بۆ نەناردبانایە، ئەو کاتە ستەمێکی گەورە دەبوو لە منەوە بەرانبەر بە بەندەکانم.

پێشتریش گوتمان: وشەی (ظَلَّام) کە بەکارهاتوە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: هەر بە مانای زوڵمە، (**ما أَنَا بِظالِمٍ لِلْعَبِيد**)، بەڵام لە ڕاستیدا (**ظَلَّام**) ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**صیغة مبالغة**)یەو، ئەمە چەند واتایەکی هەن:

أ/ ئەگەر ستەمم لە بەندەکانم کردبایە، زۆر ستەمکار دەبووم.

**ب/** سیفەتەکانی خوا هەموویان لە لووتکەدان، کەواتە: ئەگەر ستەمکردن سیفەتێکی خوا بووایە، دەبووایە خوا (**ظَلاَّم**) بێت، واتە: زۆر ستەمکار بێت، بەڵام وانیە.

**ج/** لەبەر ئەوەی ستەمی خوا لە بەندەکان، لە هەموویان دەبێ، مانای وایە دەکاتە ستەمێکی زۆر، بۆیە بە (**ظَلاَّم**) هێناویەتی.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**لە ڕۆژی قیامەتدا خوا لە دۆزەخ دەپرسێ: ئایا پڕ بووی؟ ئەویش دەڵێ: زیادە ماوە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ﴾، ئەو ڕۆژە کە بە دۆزەخ دەڵێین، ﴿نَقُولُ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**يَقُولُ**)، واتە: ئەو ڕۆژە کە خوا بە دۆزەخ دەفەرموێ:

**٢)-** ﴿هَلِ ٱمْتَلَأْتِ﴾، ئایا پڕ بووی؟

**٣)-** ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾، ئەویش دەڵێ: ئایا زیادە هەیە؟.

زانایان لە بارەی ئەو پرسیار و وەڵامەوە، قسەی زۆریان کردوە:

**أ-** هەندێکیان گوتوویانە: ئەو پرسیارو وەڵامە ڕاستەقینەیە، واتە: خوا ﷻ لە دۆزەخ دەپرسێ و، دۆزەخیش ئاوا وەڵام دەداتەوە، ئەگەر یەکێک بڵێ: دۆزەخ شتێکی زیندوو نیە؟ دەگوترێ: خوا ﷻ کە ئەندامەکانی مرۆڤ: پێ و دەست و پێست و هتد دێنێتە دوان، وەک دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾﴾ النور، مانای وایە دۆزەخیش بێنێتە قسە بۆ خوای باڵادەست زۆر ئاساییە.

**ب-** هەندێک گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی مەجازە، واتە: دۆزەخ هێندە فراوانە، هەر تێی دەکرێ و پڕ نابێ، وەک خوا پێی بفەرموێ: ئەرێ پڕ بووی؟ ئەویش بە زمانی حاڵ بڵێ: کوا زیادە ماوە؟ کەواتە: لەبەر ئەوەی دۆزەخ زۆر فراوانە وەك ئەوە بڵێ وایە.

بەڵام پرسیار کردن و وەڵامدانەوەکە، چ ڕاستەقینە بێ، مەجازیی بێ مەبەست لێی دوو شتە:

١- یان مەبەست پێی فراوانی دۆزەخە، کە جێی هەمووانی تێدا دەبێتەوە.

٢- یاخود مەبەست پێ زۆریی ژمارەی ئەوانەیە کە دەخرێنە دۆزەخەوە، هێندەی دەخرێنە نێوی، وەك خوا ﷻ پێی بفەرموێ: پڕ بووی؟ یانی: ئەو هەموو خەڵکەت هاتۆتە نێو! ئەویش بڵێ: ئەگەر هی دیکەش ماون، بابێن.

لێرەدا کە دۆزەخ دەڵێ: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٍ﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: ((**مَزِيد) مَصدَرٌ مِيمِيٌّ بِمَعنَى الزِّيادَة، أَو اسمُ مَفعُولٍ مِن زَادَ، أَي: هَل مِن جَماعَةٍ آخَرِينَ يُلْقَونَ فِيَّ**)، (**مَزِيد**) یان چاوگی میمییە بە مانای زیادە، یان ناوی بەرکارە لە کرداری (**زاد**)، یانی: ئایا زیادە هەیە؟ یاخود زیادکراو هەیە؟ ئایا کۆمەڵی دیکەش هەن بخرێنە نێوم؟ ئەگەر (**مَزِيد**) چاوگی (**میمي**) بێ، بە مانای زیادە دێ، واتە: زیادە هەیە؟ بەڵام ئەگەر ناوی بەرکار بێ و، لە (**زادَ**)وە هاتبێ، یانی: ئایا خەڵکی دیکەی زیادکراو هەن، بخرێنە نێوم؟ ئنجا هەردوو واتایەکان، هەم فراوانیی دۆزەخ کە جێی هەمووانی تێدا دەبێتەوەو، هەم زۆریی ئەوانەی دەخرێنە دۆزەخەوە، ئەم تەعبیرە هەردووکیان دەگەیەنێ.

هەڵبەتە ئەم ئایەتە ئەوەش دەگەیەنێ کە دروستکراوەکانی خوا، ئەو ئەرکەی بۆیان دانراوە، زۆر تامەزرۆن ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن و، ڕستەی: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٍ﴾، ئایا زیادە هەیە؟ یاخود خەڵکی زیادکراو هەیە؟ بۆنی ئەوەی لێ دێ کە دۆزەخ زۆر ئارەزوومەند بێ، زۆر خۆزگە بخوازێ خەڵکی زیاتری بخرێتە نێو، وەک لە سوورەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِ ...﴿٨﴾﴾، (دۆزەخ) خەریکە لە ڕقان لێک بێتەوە، بپچڕێ، ئەوەندە ڕق داگرتوویەو ڕق داگیرساوە لە بێبڕوایان.

کۆتایی ئەم دەرسەش بە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخاتە سەر چەمک و واتای ئەو ئایەتە موبارەکە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

{لَا تَـزَالُ جَهَنَّـمُ يُلْقَـى فِيْهَـا وَتَقُـولُ: هَـلْ مِـنْ مَزِيـدٍ؟ حَتَّـى يَضَـعَ رَبُّ العِـزَّة قَدَمَـهُ، فَيَنـزوِي بَعْضُها إلى بَعْـضٍ وَتَقُـولُ: قَـدْ، قَـدْ، بِعِزَّتِـك وكَرَمِـكَ، وَلا يَـزَالُ فِي الجَنَّـة فَضْـلٌ حَتَّـى يُنْشِـئَ اللـهُ لَهَـا خَلْقَـاً فَيُسْكِنَهُمْ فَضْـلَ الجَنَّـةِ} (أخرجـه البخـاري: ٤٨٤٦، ومسـلم: ٢٨٤٨، والترمـذي: ٣٧٧٢، والنسـائي: ٧٧١٩).

واتـە: دۆزەخ هـەر خەڵکـی فـڕێ دەدرێتـە نێـو، ئەویـش هـەر دەڵـێ: ئایـا زێـدە هەیـە، بـێ؟ هەتـا پـەروەردگاری خـاوەنی باڵادەسـتیی و هەیبـەت، پێـی خـۆی دەخاتـە نێـو، ئنجـا دۆزەخ دێتـەوە یـەک و دەڵـێ: (قَـد قَـد) [ئـەو دەنگـەی لـێ دێ]، سـوێند بـە عیـززەت و کەڕەمـی تـۆ (تـەواو پـڕ بـووم)، بەهەشـتیش شـوێنی زیـادەی هـەر تێـدا دەمێنـێ، تاکـو خـوا ﷻ کەسـانێکی بـۆ دروسـت دەکات و لـە شـوێنە زیادەکـەی بەهەشـتدا نیشـتەجێیان دەکات.

کەواتـە: دۆزەخ بـە دەسـەڵاتی بـێ وێنـەی خـوا و، بـە قەهـرو غـەزەبی خـوا پـڕ ببـێ و، بێتـەوە یـەک، بەهەشـتیش مەگـەر خـوا خەڵکێکـی دیکـەی بـۆ دروسـت بـکات، ئەگەرنـا هیچیـان پـڕ نابـن.

هەڵبەتـە لێـرەدا کـە بـاسی (قَدَم) کـراوە، زانایـان زۆربـەی هـەرە زۆریـان ئەمەیـان تەئویـل کـردوە بـەو واتایـە کـە خـوا ﷻ بـە سـیفەتی جـەلال و هەیبـەتی خـۆی بـە دۆزەخ دەڵـێ: بێتـەوە یـەک، ئەمـە تەعبیـر کـراوەو وێناکـراوە بـەوەی کـە چـۆن کەسـێک پـێ لەسـەر شـتێک دادەنـێ و مـەرزەم و ملکەچـی دەکات، کـە مەسـەلە پـێ لەسـەر دانـان نیـە، مەبەسـت ئەوەیـە: خـوا ﷻ بـە قەهـرو جـەلال و هەیبـەتی خـۆی فەرمـان بـە دۆزەخ دەکات، بێتـەوە یـەک و پـڕ ببـێ، بەهەشـتیش هێنـدە فراوانـە، خـوا ﷻ دروسـتکراوانێکی دیکـەی تایبـەتی بـۆ دروسـت دەکات، کـە بەهەشـتیان پـێ پـڕ بـکات.

لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی وامـان لـێ بـکات، ئێمـە شایسـتەی بەهەشـت بیـن و، لـە بەهەشـتەکانی خـوادا نیشـتەجێ بیـن، خـوا

بمانپارێزێ لەو سیفەت و حاڵ و نیازو مەبەست و قسەو هەڵس و کەوتانەی، بەرەو دۆزەخمان دەبەن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە ڕۆژی دوایی دا، لە بەهەشتەکانیدا نیشتەجێ دەبن و بە دیداری شاد دەبن و، بە دیداری پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺو، سەرجەم پێغەمبەران (علیهم السلام) شاد دەبن، سەرنجاممان خێر بکات.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بە ئیسلامەوە بمانژیەنێ، بە ئیمانەوە بمانمرێنێ و، سەرنجامی دنیاو دوارۆژمان خێر بکات.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دەرسی سـێیەم و کۆتاییـە و، لـە پـازدە (١٥) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٣١ - ٤٥)، لـەو پـازدە (١٥) ئایەتـەدا:

أ- لە پێنج ئایەتی یەکەمدا ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٥)، باسی پاداشتی پارێزکاران کراوە، کە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتەو، هاو کات بە چەند سیفەتێکی گەورەو گرنگیش، ئەو پارێزکارە خوا پێداوانە پێناسە کراون.

ب- لە سێ ئایەتەکانی: (٣٦ و ٣٧ و ٣٨)دا، سەرنجێک لە مێژووی گەلانی فەوتاوو، سەرنجێکیش لە دروستکرانی گەردوون دراوە.

ج- لە کۆتایی دا لە ئایەتەکانی: (٣٩ - ٤٥)دا، چەند ڕێنماییەک بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ خراونە ڕوو، کە سەرجەم پێنج ڕێنمایین و، باسی قیامەتیشیان لەگەڵدا تێکەڵکێش کراوە.

﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ
بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ
﴿٣٥﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا
يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ
وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ
ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ

﴿سِرَاعًاۚ ذَٰلِكَ حَشۡرٌ عَلَيۡنَا يَسِيرٞ ﴿٤٤﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بەهەشتیش بۆ پارێزکاران نیزیک خرایەوە، (بۆ گەیشتنیان پێی) دوور نیە ﴿٣١﴾ ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە پێتان دەدرێ، بۆ هەر بۆ لای خوا گەڕاوەیەکی پارێزەر ﴿٣٢﴾ کەسێک کە بە پەنهانیی سام و هەیبەت لە خوای بە بەزەیی دەکات و، بە دڵێکی ساغی گەڕاوەوە هاتوە (بۆ خزمەت خوا) ﴿٣٣﴾ پێیان دەگوترێ: بە سەلامەتیی و بێ مزەرەتیی بچنە تێی، ئەوە ڕۆژی هەر مانەوەیە ﴿٣٤﴾ هەرچی بیانەوێ لەوێدا هەیانەو زێدەشمان لە لایە ﴿٣٥﴾ لەپێش وانیش (بێبڕوایەکان)دا گەلێک سەدەمان قڕ کردوون، کە زەبرو هێزیان لەوان توندتر بوو، لە وڵاتاندا پشکنینیان کرد (بۆ دۆزینەوەی پەناگەیەکی دەرباز بوون)، ئایا پەناگە هەبوو؟ ﴿٣٦﴾ بە دڵنیایی لەوەدا کە باسکرا، پەندو بیرخستنەوە هەیە بۆ هەر کەسێک، دڵ و عەقڵی هەبێ بۆ تێگەیشتن، یان لە حاڵێکدا کە ئامادەیە گوێ ڕادێرێ ﴿٣٧﴾ بە دڵنیاییشەوە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان لە شەش ڕۆژاندا (بە شەش قۆناغ) دروستکردوون و، ماندووییمان تووش نەبوو ﴿٣٨﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) لەسەر ئەوەی دەیڵێن (لە کوفرو قسەی خراپ) خۆڕاگربەو، بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرە، پێش خۆرهەڵاتن و پێش (خۆر) ئاوابوون ﴿٣٩﴾ هەروەها لە بەشێکی شەوگاریشدا بە پاکی بگرەو لە کۆتاییەکانی کڕنووش بردن(ەکان)یشدا ﴿٤٠﴾ ئەو ڕۆژەش کە بانگکەرێک لە شوێنێکی نیزیکەوە بانگ دەکات، گوێ هەڵبخە ﴿٤١﴾ ئەو ڕۆژە کە بەڕاستیی (خەڵک) هاڕژنەکە دەبیستن (لە ئەنجامی فووکردنی دووەم بە کەڕەنادا) ئەوەیە ڕۆژی دەرچوون (ی خەڵک لە گۆڕەکانیان) ﴿٤٢﴾ بێگومان ئێمە خۆمان

دەژیەنین و دەمرێنین و سەرنجامیش تەنیا بۆ لای ئێمەیە ﴿٤٣﴾ ئەو ڕۆژە کە زەوی لە ئاست (گۆڕەکان)یان دەقڵیشێ بەخێرایی (دەردەچن) ئەوە بۆ ئێمە کۆکردنەوەیەکی سێنایە ﴿٤٤﴾ ئێمە زاناترین بەوەی دەیڵێن و تۆش تۆبزییلێکەریان نی (بە زۆر بیانکەیە بڕوادار)، ئنجا هەر کەس لە هەڕەشەی من دەترسێ، بە هۆی قورئانەوە بیری بخەوە ﴿٤٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَأُزْلِفَتِ): یانی: (قُرِّبَت، أُدْنِيَت)، نیزیک خرایەوە، (الزُّلفَى: المَنزِلَةُ وَالحُظوَةُ)، (زُلْفَى): بە مانای پێگەو بەهرەی باش دێ، (المَزَالِفُ: المَرَاقِي)، (مَزالِف) یانی (مَرَاقِي)، واتە: ئەو هۆکارانەی مرۆڤ پێیان لە خوا نیزیک دەبێتەوە، یاخود پێیان بەرز دەبێتەوە، (أَزْلَفْتُهُ: جَعَلْتُ لَهُ زُلْفَى)، (أَزْلَفْتُهُ) واتە: نیزیکییم بۆ ڕەخساند (أُزْلِفَت: قُرِّبَت)، نیزیک خرایەوە.

(أَوَّابٍ): زۆر گەڕاوە، (الأَوبُ: ضَرْبٌ مِنَ الرُّجُوعِ إِذْ لاَ يُقَالُ الأَوْب إِلاَّ فِي الحَيَوَانِ الَّذِي لَهُ إِرادَةٌ، الأَوَّابُ: الرَّجَّاعُ)، (أَوب): جۆرێکە لە گەڕانەوە، چونکە وشەی (أَوب) تەنیا بۆ ژیاندارێکی خاوەنی هەست و ویست، بەکاردەهێنرێ، (الأَوَّابُ: الرَّجَّاع)، زۆر گەڕاوە.

(مُّنِيبٍ): (النَّوبُ: رجُوعُ الشَّيءِ مَرَّةً بَعْدَ أُخرَى)، (نَوْب): ئەوەیە شتێک جار لە دوای جار بگەڕێتەوە، (وَالإِنابَةُ إِلَى اللهِ: الرُّجُوعُ إِلَيهِ بِالتَّوبَةِ وَإِخْلاَصِ العَمَلِ)، (إِنابَة): بۆ لای خوا واتە: گەڕانەوە بۆ لای بە گەڕانەوەی کردەیی و بە ساغکردنەوەی کردەوەکانەوە.

(بِسَلَٰمٍ): (السَّلْمُ وَالسَّلاَمَةُ: التَّعَرِّي مِنَ الآفَاتِ الظَّاهِرَةِ وَالبَاطِنَةِ)، وشەی (سَلْم و سَلاَمَة): بریتیە لە پاکیی، لە گرفت و نارەحەتییە ڕواڵەتیی دەروونییەکان،

دەگوترێ: (سَلِمَ يَسْلَمُ سَلاَمَةً وَسَلاَماً)، واتە: سەلامەت بوو، سەلامەت دەبێ، سەلامەتیی، هەروەها سەلامیش بە مانای ئاشتیی و بێ بەلایی دێ.

(قَرْنٍ): (القَرْنُ: القَوْمُ المُقْتَرِنُونَ فـي زَمَنٍ وَاحِدٍ، والجَمعُ: قُرُون)، (قَرْن)، کۆمەڵە خەڵکێکن لە کاتێکدا بە یەکەوە ژیاون، (قَرن) بە (قُرُون) کۆدەکرێتەوە، لەو بارەشەوە کە ئایا (قَرْن) ماوەی چەند ساڵە؟ زۆربە بە سەدیان داناوەو هەندێکیشیان بە حەفتا ساڵیان داناوە، ئەوە بەپێی عورف و باوی کۆمەڵگاکان و ڕۆژگارەکان دەگۆڕێ.

(بَطْشًا): (البَطْشُ: تَناوُلُ الشَّيءِ بِصَولَةٍ)، (بَطش): بە کوردیی دەبێتە زەبر لێدان، پەلاماردان، چونکە بریتیە لە گرتنی شتێک بە بەهێز، بە پەلاماردانەوە.

(فَنَقَّبُواْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ): واتە: بە وڵاتاندا گەڕان، وڵاتانیان پشکنی، وڵاتانیان سۆراغ کردن، (النَّقْبُ: فـي الحَائِط وَالجِلْدِ، كَالثَّقْبِ فـي الخَشَبِ)، وشەی (نَقب) لە دیوارو لە پێست و چەرمدا، وەک وشەی (ثَقب)ە، لە تەختەدا، یانی: ئەگەر تەختەیەک کون بکەی پێی دەگوترێ: (ثَقَبَ الخَشَبَةَ)، بەڵام ئەگەر دیوار و پێست بێ (نَقَبَ الحائِطَ، نَقَبَ الجِلدَ) بۆ ئەوان (نَقب) بەکاردەهێنرێ، هەردووکیان بە مانای کونکردن دێن، (نَقَبَ القَومُ وَنَقَّبُوا، أَي: سارُوا)، (نَقَبَ وَنَقَّبَ)، واتە: هەم بە سیانیی (ثُلاثِي) و هەم بە چواریی (رباعي) هەردووکیان بە مانای ڕۆیشتن دێن، (النقِيبُ: الباحِثُ عَنِ القَومِ وَعَن أَحوالِهِم)، (نقيب): کەسێکە لە حاڵ و باڵی کۆمەڵێک دەکۆڵێتەوەو، مشووریان دەخوات.

(مَّحِيصٍ): (أَي: مَخْلَص، أَصْلُهُ مِنْ حَيْص بَيْص، وَهُوَ الشِدَّةُ، وَحَاصَ عَنِ الحَقِّ: حادَ عَنهُ إِلَى شِدَّةٍ وَمَكرُوهٍ)، (مَحِيْص): بە مانای (مَخْلَص) واتە: پەناگە، شوێنی لێ دەرباز بوون، ئەصڵی خۆی لە (حَيْص بَيْص)ەوە هاتوە، یانی: سەختیی و ناڕەحەتیی، دەگوترێ: (حاصَ عَنِ الحَقِّ)، واتە: لە حەقەکە لایدا بەرەو خراپەو سەختیی.

(وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ): واتە: هیچ ماندوو بوون و شەکەتییمان تووش نەبوو، (مَسَّ الشَّيءَ يَمَسُّهُ مَسّاً، أي: لَمَسَهُ بِيَدِهِ، وَمَسِسْتُ الشَّيء، مِستُهُ وَمَسْتُهُ بِمَعنَى)، (مَسَّ الشَّيء)، واتە: دەستی لە شتەکە دا بە دەست، دەستی گەیاندێ، دەگوترێ: (مَسِسْتُ شَيْئَاً وَمِسْتُهُ وَمَسْتُهُ)، (مَسِستُ وَمِستُ وَمَستُ) هەر سێکیان بە یەک واتان، واتە: دەستم لێدا.

(لُّغُوبٍ ): (لَغَبَ يَلْغَبُ: أي تَعِبَ وَأَعيَا فَهُوَ لاغِبٌ، أي: تَعِبٌ، وَجائَنَا سَاغِبَاً، لاغِباً، أي: جائِعَاً تَعِبَاً)، (لَغَبَ يَلْغَبُ) یانی: (تَعِبَ يَتعَبُ) ماندوو بوو، ماندوو دەبێ، (تَعِبَ) لەگەڵ (أعيَا) هەردووکیان مانایان لە (لَغَبَ)ەوە نیزیکە، (لاغِب) واتە: (تَعِبْ) ماندوو، دەگوترێ: (جَائَنَا سَاغِبَاً لاغِبَاً) واتە: ئەو نەفەرە هات بۆ لامان بە برسیەتیی و ماندوویەتی، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴾، واتە: هیچ جۆرە ماندووبوونێکمان نەگەیشتێ بە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییەوە، لە شەش ڕۆژاندا واتە: شەش قۆناغ، لە شەش ماوەی کاتییدا.

(وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ): (أَدْبَار) کۆی (دُبُر)ە، واتە: کۆتایی هەر شتێک، (سجُود) یش کۆی (سَجدَ)یە، واتە: کڕنووشەکان، کەواتە: کۆتاییەکانی کڕنووشەکان، زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (أَوَاخِرَ الصَّلَوات)، لە کۆتایی نوێژەکاندا.

(ٱلصَّيْحَةَ ): (رَفعُ الصَّوتِ)، (صَيحَة): بە مانای دەنگ بەرزکردنەوە، بە کوردیی بە (هاڕژن)م لێکداوەتەوە، هەندێکیش بە چریکە، بەڵام چریکە جاری وایە منداڵێکیش دەچریکێنێ، بەڵام هاڕژن واتە: دەنگێکی زۆر بێڕەزا، کە نەمبینیوە لە پێش مندا لە تەفسیرە کوردییەکاندا، ئەو وشەیان بەکارهێنابێ.

(تَشَقَّقُ ): (الشَّقُّ: الخَرْمُ الواقِعُ فِي الشَّيء)، (شَقّ): بریتیە لە کەلێن پەیدابوون لە شتێکدا، کە پێموایە ئەگەر بە کوردیی بگوترێ: قڵیش، ﴿تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ ﴾، واتە: زەوی دەقڵیشێ لە ڕاستیاندا، چونکە (شەق دەبێ)، هەر عەرەبییەکەیەو، کوردێندراوە، بەڵام کورد بۆ شەق بوونی شتێک، قڵیشاندنیان بەکارهێناوە، دارەکە قڵیشا، دیوارەکە قڵیشا، زەوییەکە قڵیشا.

(سِرَاعًا ): (سِراع) كۆی (سَرِيع)ە، (وَالسُّرعَةُ: ضِدُّ البُطء)، (سُرعة) واتە: خێرایی، پێچەوانە و دژی سستیی و لەسەرەخۆییە، دەگوترێ: (سَرُعَ فَهُوَ سَرِيعٌ، وَأَسرَعَ فَهُوَ مُسْرِعٌ)، (سَرُعَ): ئەمە بە سیانیی (ثُلاثِي)، (فَهُوَ سَرِيعٌ) ئەو خێرایە، خێرای كرد، ئەو خێرایەو، بە چواریی (رباعي)یش: هاتوە (أَسرَعَ فَهُوَ مُسرِعٌ)، هەر بە یەك واتان، واتە: خێرایی كرد، ئەو خێرایە، (وَالجَمعُ سِرَاعَ)، كۆی (سريع) (سِراعَ)ە، ئەمە بۆ نێرو مێ بەكاردێ، (سُرَّعاً) ئەویش هەر كۆی هەردووكیانە، واتە: ئەوانەی خێران، خێرایەكان.

(بِجَبَّارٍ ): واتە: زۆر لێكەر، تۆبزیی لێكەر، (جَبَرَ فُلاَنَاً عَلَى الأَمْرِ، قَهَرَهُ عَلَيْهِ، وَأَكْرَهَهُ، وَأَجْبَرَهُ، أَي: جَبَرَهُ)، (جَبَرَ فُلاَنَاً عَلَى الأَمرِ )، واتە: فلانكەسی ناچار كرد، زۆری لێكرد لەسەر فلانكارە، ئنجا وەك چۆن (جَبَرَ) هاتوە، (أَجْبَرَ)ش هەر هاتوە، ئەو كاتە ناوی بكەر (إسم فاعل)ی (جَبَرَ) دەبێتە (جَابر) و ناوی بكەر (إسم فاعل)ی (أَجبَرَ) دەبێتە (مُجبِر)، (جَبَّار)یش ڕێژگەی زێدەڕۆییە، لە (جَبر)ەوە هاتوە، بەڵام وشەی (جَبَّار) بە مانای (القاهِرُ العاتِي المُتَسَلِّط)یش هاتوە، واتە: مل پێ كەچكەری خۆ سەپێنی لە سنوور دەرچوو، كە بێگومان لەم ئایەتە موبارەكەدا ئەوە مەبەست نیە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە: تۆ زۆریان لێ ناكەی، ناچاریان ناكەی، تۆبزییان لێ ناكەی، كە بڕوا بێنن، بەڵكو تۆ تەنیا گەیاندنی پەیامی پەروەردگارت لەسەرە.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: ئەم پازدە (١٥) ئایەتە، سێ تەوەر دەگرنە خۆیان:

**تەوەری یەکەم:** لە پێنج (٥) ئایەتی سەرەتا پێک دێ، ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٥)، باسی پاداشتی پارێزکاران و، خەسڵەتە گەورەو سەرەکییەکانی پارێزکاران.

**تەوەری دووەم:** لە سێ ئایەتی (٣٦ و ٣٧ و ٣٨)دا، خوا ﷻ جارێکی دیکە، لە کۆتایی ئەم سووڕەتەدا سەرنجی هەموو لایەک ڕادەکێشێتەوە، بە تایبەتی هی بێبڕوایەکان، هەم بۆ مێژوو، هەم بۆ گەردوون، کە ئەگەر تەماشای مێژوو بکەی و تەماشای گەردوونیش بکەی، دەزانی کە دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، ئەم ژیانە دنیاییە، قۆناغێکی دیکەی بە دوادا دێ، کە تێیدا مرۆڤەکان سزاو پاداشت دەدرێنەوە.

**تەوەری سێیەم و کۆتایی:** لە حەوت (٧) ئایەتی کۆتایی پێک دێ، ئایەتەکانی: (٣٩ - ٤٥)، خستنە ڕووی چەند ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکی گەورەو گرنگ، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ کە چۆن مامەڵە بکات لەگەڵ بێبڕوایەکانداو، چۆن پەیوەندیی خۆی لەگەڵ خوادا مەحکەمتر بکات، چۆن چاوەڕێ بکات کەی ڕۆژی دوایی دێ؟ ئەو ڕۆژەی ئەوان ئێستا نکووڵیی لێدەکەن، بەڵام کە دێت، ئەو کاتە حاڵیی دەبن، کە وەختی خۆی حاڵیی نەبوو بوون.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾، بەهەشت بۆ پارێزکاران نیزیک خرایەوە، شوێنەکەی دوور نیە، (**أُزلِفَت**) واتە: نیزیک خرایەوە، ئەدی بۆچی دەفەرموێ: ﴿ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾؟ واتە: وانیە کە بۆی دەچن، بۆ ئەوان دوور بێ، ئنجا یان لەبەر ئەوەی بەهەشت بە کردار بۆیان نیزیک دەخرێتەوە، یان لەبەر

ئەوەی ئامرازو هۆکاری وایان بۆ دەرەخسێنرێ کە بە ئاسانیی بە بەهەشت بگەن، چونکە ئێستا ئێمە هەر وا بە ئاسانیی باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکەین، بەڵام بێگومان هەر کام لە بەهەشت و دۆزەخ، دوو جیهان و، دوو گەردوون و، دوو شوێنی یەکجار گەورەو فراوانن.

﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴾، ئەمە ئەوەیە کە گفتتان پێ دەدرێ، بەڵێنتان پێ دەدرێ، بۆ هەر زۆر گەڕاوەیەکی پارێزەر، واتە: بۆ هەر کەسێک کە زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ و پارێزەریشە، پارێزەرە بۆ پەیوەندیی نێوان خۆی و خوا و، پارێزەرە بۆ خۆی لە گوناهو تاوان و، پارێزەرە بۆ پەیام و بەرنامەی خوا و، پارێزەرە بۆ ئەو شەریعەتەی خوا بۆی ناردوە، کە لێی لانەدا.

﴿ مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ ﴾، کەسێک لە (خوای) بە بەزەیی دەترسێ بە پەنهانیی، واتە: لە کاتێکدا خۆی لە شوێنێکە لە کەس دیار نیە، یاخود لە کاتێکدا کە خوا ﷻ بۆ ئەو پەنهان و نادیارە، لێی دەترسێ، سام و هەیبەتی لێ دەکات، ﴿ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴾، بە دڵێکی زۆر بۆ لای خوا گەڕاوەشەوە، هاتۆتەوە خزمەت خوا، بە دڵێکەوە کە هەمیشە بۆ لای خوا زۆر دەگەڕێتەوە، چونکە ﴿ مُّنِيبٍ ﴾، (**مَن يَرْجِعُ مَرَّةً بَعْدَ أُخْرَى**)، (منیب) کەسێکە جار لەدوای جار دەگەڕێتەوە، وشەی نۆبەت و نۆرەش لەوەوە هاتوە، واتە: جار لە دوای جار دەگەڕێتەوە.

﴿ ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ﴾، واتە: پێیان دەگوترێ: بە سەلامەتیی و بێ بەڵایی بچنە نێو بەهەشتەوە، بگومان (ها)ی سەر ﴿ ادْخُلُوهَا ﴾، بە سیاق دەزانرێ کە مەبەست پێی بەهەشتە، چونکە پێشتر باسی بەهەشت کراوە، ﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾، ﴿ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ ﴾، پێیان دەگوترێ: ئەوە ڕۆژی هەمیشە مانەوەو، ڕۆژی هەر ماوبوونە، واتە: جارێکی دیکە مردن و لە نێو چوون بەسەرتاندا نایەت.

﴿ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا ﴾، هەرچی بیانەوێ، هەرچی بیخوازن بۆ ئەوان لەوێدا هەیە، وەک لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ

ٱلۡأَعۡيُنُ...﴿٧١﴾﴾الزخرف، واتە: هەرچی نەفسەكان بیخوازن و، چاوەكان چێژی لێوەربگرن، لەوێدا هەیە، ﴿وَلَدَيۡنَا مَزِيدٌ﴾، ئێمە زیادەشمان لە لایە، واتە: زیادە لەوەی خۆیان دەیخوازن، بگرە نیعمەتی وا لە بەهەشتێ هەن، كە ئێستا نازانین چین وەک لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: {قَالَ اللهُ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (أخرجه أحمد: ٨١٢٨، والبخاري: ٣٠٧٢، ومسلم: ٢٨٢٤، والترمذي: ٣١٩٧)، واتە: خوا فەرمووی: لە بەهەشتدا نیعمەتی وام ئامادەكردوە بۆ بەندە چاكەكانم: نە هیچ چاوێک بینیویەتی و، نە هیچ گوێیەک بیستوویەتی، نە بە خەیاڵ و ئەندێشەی هیچ كەسیشدا هاتوە.

﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ﴾، واتە: زۆر سەدەمان لە پێش ئەواندا قڕ كردن (فەوتاندمانن)، هیچ كەسیانمان لێ نەهێشتن، قڕە بڕ بوون، ﴿هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا﴾، ئەوان زەبریان توندتر بوو لەوان، واتە: ئەوانەی فەوتاندوومانن لە كافرانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد ﷺ! زەبریان توندتر بوو، بەهێزتر بوون، ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، زۆر بە وڵاتدا گەڕان و سۆراغ و پشكنینیان كرد، ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾، ئایا هیچ پەناگەیەک هەیە، خۆی تێبگرن، لە بەڵاو سزای خوا بیانپارێزێ؟ بەڵام بێ سوود بوو، یاخود: ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، واتە: زۆریان دنیا لە سەنگ و شووژن نا، زۆریان دنیا هەڵكۆڵی، زۆر سەر زەوییان دەستكاریی كرد، قەڵایان لێ دروست كردن، باغ و بێستانیان لێ ناشتن، ڕووبارو جۆگەیان لێ هەڵبەستن، شاریان لێ دروست كردن، بەڵام: ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾، ئایا هەموو ئەوەی دروستیان كردبوو، وابوو ببێتە هۆی پەنادانیان و دەرباز بوونیان، بۆیان ببێتە پەناگەیەک؟ بێگومان نەخێر، ئەمە پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانەیە، ئایا دەرباز بوون و شوێنی دەرباز بوونیان دەستكەوت؟ بێگومان نەخێر.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا كە باسكرا، بیرخستنەوە هەیە و، پەند وەرگرتن هەیە، بۆ هەر كەسێک دڵی هەبێت، دڵ لە

قورئاندا بە مانای عەقڵ بەکارهاتوە، واتە: عەقڵی هەبێ، زانستی پزیشکیگەریی ئێستا دەریخستوە، مێشک لە کەللەی سەر دایەو، پێی دەگوترێ: عەقڵ، تەنیا ئەوێ چەقی زانین و ئیدراک نیە، بەڵکو بەشێک لە زانین پەیوەندیی بە دڵیشەوە هەیە، کە دیارە دڵ، کە خوێن دەنێرێ بۆ مێشک و مێشکیش بەبێ دڵ کار ناکات، بەڵام جگە لەوەش ئێستا زانستیی دەریخستوە، کە بەشێک لە ئیدراک و زانین پەیوەندی بە دڵیشەوە هەیە، ﴿أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾، یاخود گوێ هەڵبخات لە حاڵێکدا کە ئامادەیە، واتە: بە گرنگیی پێدانەوەو، بە خاتر جەمییەوە، لە حاڵێکدا کە بە عەقڵ و دڵ و بە ئیرادە ئامادەیە، گوێ هەڵبخات، ﴿أَلْقَى ٱلسَّمْعَ﴾، واتە: گوێ فڕێ بدات، یانی: وا گوێی هەڵخستوە، گوێیەکە هی ئەو نەماوە و فڕێی داوە، بەس بۆ گوێگرتن.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە لە شەش ڕۆژان هێناومانە دی، واتە: بە شەش قۆناغ، ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾، هیچ جۆرە ماندووبوونێکیشمان تووش نەبوو، ئەمە وەک پێشتریش گوتمان: کە خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا، جارێکی دیکە، سەرەنجمان بۆ مێژوو و گەردوون ڕادەکێشێتەوە، بەڵام لێرەدا زۆر بە کورتی پێشتر هەم لە بارەی سەرنجدانی گەردوونەوە، کە لەوێ سەرنجدانی گەردوون پێشخرابوو، دوایی سەرنجدانی مێژوو، هاتبوو، بەڵام چ سەرنجدانی گەردوون، چ سەرنجدانی مێژوو، یەکی چەند ئایەتێکیان بۆ تەرخان کرابوون، سەرنجدانی گەردوون ئایەتەکانی: (٦ - ١١) واتە: شەش ئایەتی بۆ تەرخان کرابوون و، سەرنجدانی مێژووش سێ ئایەتەکانی: (١٢ و ١٣ و ١٤)ی بۆ تەرخان کرابوون.

بەڵام لێرەدا سەرنجدانی مێژوو یەک ئایەت و، سەرنجدانی گەردوونیش یەک ئایەتی بۆ تەرخانکراوە، واتە: ئەگەر تۆ تەماشای مێژوو بکەی، یان تەماشای گەردوون بکەی، هەم مێژوو پێت دەڵێ و، هەم گەردوون پێت دەڵێ، کە ئەم

ژیانە دنیاییە نابێ تاکە دەرفەتی تێدا ژیان بێ، بەڵکو قۆناغی دیکەی بەدوادا دێ، عەقڵ و لۆژیك وا دەخوازن، هەر کەسێک بە عەقڵ و دڵ و بە ویژدانەوە، سەرنجی مێژوو بدات، کە چۆن خوا ﷻ بەسەر گەلە یاخییەکانیدا پاز نەداوە، بەڵکو کاتێک لایانداوە، سزای داون، هەروەها کاتێک مرۆڤ بە عەقڵ و دڵەوە، سەرنجی گەردوون بدات، کە هیچ شتێک لە گەردووندا نییە، بەوپەڕی ڕێک و پێکیی دروست نەکرابێ، کۆی گەردوونیش بەهەمان شێوە، کاتێک سەرنجی ئەو دوو کتێبە دەدات، کتێبی مێژوو و کتێبی گەردوون، هەردووکیان بە زمانی حاڵ پێی دەڵێن: دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، ئەم ژیانە دنیاییە، ژیانی دیکەی بەدوادا دێ، کەواتە: زیندووکرانەوەو کۆکرانەوەو لێپرسرانەوەو سزاو پاداشت هەن، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾، ئاسمانەکان و زەوییمان بە شەش قۆناغ دروست کردوون، هیچ ماندوو بوونمان تووش نەبوو، ئەمە هەم بۆ پێشاندانی بێ سنووریی دەسەڵات و توانای خوای پەروەردگارە، هەم بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی جوولەکەکانیشە، کە ئێستاشی لەگەڵدابێ لە (پەیمانی کۆن)دا، دەڵێ: خوا ﷻ لە شەش ڕۆژەکانی هەفتەدا، هەموو شتەکانی خوڵقاندوون، دوایی لە ڕۆژی شەممەدا خوا پشوویدا و ئیسڕاحەتی کرد، کە بێگومان جوولەکە لە (پەیمانی کۆن)دا، لەو بوارەداو لە زۆر بواری دیکەشدا، خوای پەروەردگاریان وەک مرۆڤ تەماشا کردوە، قیاسیان کردۆتە سەر مرۆڤ، کە مرۆڤ بە ئیش و کارەوە ماندوو دەبێ، دەبێ ئیسڕاحەت بکاو پشوو بدات، وایانزانیوە خوای بێ وێنەش هەر وایە، کە بەدڵنیاییی ئەوە لادان بووە، لەوەی لە ئەسڵدا خوا ﷻ لە تەوراتدا فەرموویەتی: ئەو تەوراتە ئەصڵییەی خوا بۆ مووسای ناردوە، شتی وای تێدا نەبووە، بەڵام گۆڕدراوە، دەستکارییکراوە، ئنجا ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئەوەشە.

لە کۆتاییی دا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، واتە: لەبەر ئەوەی ئەو قسانە دەکەن، قسەی ناشایست و ناڕێک بەرانبەر بە خوا، بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ،

بەرانبەر بە قورئان، بەرانبەر بە زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت دەکەن، تۆ هاوسەنگی خۆت تێک مەدەو خۆڕاگربە و پشوو درێژ بە لەسەر بەرنامەکەی خۆت، ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾، بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرە، پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوا بوون، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشکی دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە.

﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾، هەروەها لە شەوگاریشدا پەروەردگارت بە پاک بگرەو، لە کۆتایی کڕنووشەکاندا، کە مەبەست پێی نوێژەکانە.

﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ﴾، هەروەها گوێ هەڵخە، گوێ ڕادێرە بە گرنگیی پێدانەوە، گوێ بگرە، ئەو ڕۆژەی بانگکەرێک لە شوێنێکی نیزیکەوە بانگ دەکات، واتە: ئەو بانگکەرە کە بانگ دەکات، هەموو کەس بانگەکەی دەبیستێ، وەک لە شوێنێکی نیزیکەوە بانگی کرد بێ، چونکە ئەگەر بانگێک لە شوێنێکی نیزیکەوە بێ، خەڵک هەمووی دەیبیستێ، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە خەڵکەکە هەمووی ئەو بانگەش دەبیستێ و ئەو بانگە بریتیە: لەو هاڕژنەی لە ئەنجامی فووی دووەمی ئیسڕافیلدا بە کەڕەنادا دێتە دی.

﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ﴾، ئەو ڕۆژەی گوێیان لە هاڕژنەکە (لە دەنگ و سەدا) گەورەکە دەبێ بە هەق، بە ڕاستیی گوێیان لێ دەبێ، ﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ﴾، ئەوە ڕۆژی دەرچوونە، ڕۆژی هاتنە دەرە، واتە: هاتنە دەری خەڵکە لە گۆڕەکانیان.

﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ﴾، ئێمە هەر خۆمان دەژێنین و دەمرێنین، سەرنجامیش تەنیا بۆ لای ئێمەیە.

﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا﴾، ئەو ڕۆژەی زەوی لە ئاستیاندا، دەقڵیشێ ئەوانیش بە خێرایی دێنە دەرێ، ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾، ئەوە کۆکردنەوەیەکە لەسەر ئێمە ئاسانە!

خـوای زانـاو شـارەزا بۆیـە وا دەفەرمـوێ: چونکـە زانیویـەتی: خەڵـک بیـر دەکاتەوە، بـۆ وێنـە: ئێسـتا نزیکـەی هەشـت ملیـار مـرۆڤ لەسـەر زەوی هەیـە، ئـەو هەشـت ملیـار مرۆڤـە، ئەوپەڕەکـەی دوای سـەد سـاڵ، ئەگـەر ئەوپەڕەکـەی ئەوپەڕەکـەی دابنێیـن، دوای (١٥٠) سـاڵی دیکـە هیچـی لەسـەر زەوی نامێنـێ، هەمـووی دەچێتـە ژێـر زەوی، ئنجـا هـەر خـوا دەزانـێ ئـەم زەوییـەی ئێمـە چەنـد ملیارێکیـی دیکـەی ئـاوا خسـتوونە نێـو هەنـاوی خـۆی و، چەنـد ملیاری دیکـەش دێنە سـەر زەوی و، دوای دەچنـەوە ژێـر زەوی، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: زەوی لـە ئاسـت هەموویانـدا دەقڵیشـێ، ئەوانـەی خراونـەوە ژێـر خاکـەوە، ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ﴾، ئا ئـەوە کۆکردنەوەیەکـە، ﴿عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾، لەسـەر ئێمـە ئاسـانە، بـۆ خـوا ئاسـانە کـە دەسـەڵاتێکی بـێ سـنووری هەیـە، ئەگەرنـا کۆکردنـەوەو خڕکردنـەوەو ڕەپێچەکـدانی ئـەو هەمـوو خەڵکـە، هـەر خـوا بزانـێ دەگەنـە چەنـد ملیـار، یـان دەگەنـە چەنـد تریلیـۆن، هـەر خـوا بـۆ خـۆی ژمارەیـان دەزانـێ، ئـەوە بـەس بـە خـوا دەکـرێ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ئـەوە بـۆ ئێمـە ئاسـانە.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾، ئێمـە زاناتریـن بـەوەی دەیڵێـن، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾، تـۆش تۆبزیـی لێکەریـان نـی و، ناچارکـەر نـی بەسـەریانەوە، واتـە: تۆمـان بـۆ ئـەوە نەنـاردوە، ناچاریـان بکـەی تۆبزییـان لێبکـەی بـڕوا بێنـن، ﴿فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾، ئـەوەی کـە لـە هەڕەشـەی مـن دەترسـێ، تـۆ بـە قورئـان بیـری بخـەوە و ئامۆژگاریـی بکـە، پەنـدی دابـدە، بێـداری بکـەوە، ئەرکـی تـۆ و کاری تـۆ لێـرەدا تـەواو دەبـێ، بـەڵام کـە تۆبزییـان لـێ بکـەی و ناچاریـان بکـەی، بڕوابێنـن، بێگومـان بڕواهێنـان بـە ناچاریـی هـەر نایەتـە دی، بەڵکـو کـە ناچاریـان دەکـەی، لەسـەر نیفـاق ناچاریـان دەکـەی، واتـە: ناچاریـان دەکـەی شـتێک بڵێـن پێچەوانـەی ئـەوە کـە لـە دڵیانـدا هەیـە، ئـەوەش نیفاقە، نیفاقیـش خوا ﷻ لـە کوفری پـێ ناخۆشـترە، لـە کوفـری ئاشـکرا، کوفـری پەنهـان لـە کوفـری ئاشـکرا خراپترە لـەلای

خـوا، بۆیـه خـوا ﷻ لـه سـوورەتی (النسـاء)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ النسـاء، واتـه: بـه دڵنیایـی دەغەڵـەکان لـه پلـەی خـوارەوەی ئاگـردان و، تـۆ هیـچ پشـتیوان و هاوکارێکـت بـۆ ئـەوان چنـگ ناکـەوێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**نیزیک خرانەوەی بەهەشت لە پارێزکارانێک کە زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو، پارێزەرن و سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیەو، دڵێکی ساغ و بێ خڵتەیان هەیە، پێیان دەگوترێ: بە سەلامەتیی بچنە بەهەشتەوە، هەرچی بیانەوێ تێیدایەو، زێدەشیان بۆ هەیە لە لایەن خواوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ (٣١) هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ (٣٢) مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ (٣٣) ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ (٣٤) لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ (٣٥) ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾، بەهەشتیش بۆ پارێزکاران نزیك خرایەوە، پێشێ خوا ﷻ باسی دۆزەخی کرد و فەرمووی: ﴿ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴾، ئەو ڕۆژە کە بە دۆزەخ دەڵێین: ئەرێ پڕ بووی؟ ئەویش دەڵێ: ئەرێ زیادە ماوە؟ کە ئەمە وەک پێشتر گوتمان: دوو واتای هەن:

أ- ئەگەر زیادەش ماون، با بێن جێم دەبێتەوە.

ب- زۆرم خەڵک خراوەتە نێو، بۆچی ئێستاش هەرماون؟ (و)یش بۆ گێڕانەوەی ئەم ڕستەیە، بۆ سەر ئەوێ، یانی: وەک چۆن ئەو پرسیارو وەڵامە لەگەڵ دۆزەخدا دەکرێ بۆ بێبڕوایان، بۆ پارێزکارانی بڕواداریش: ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾، بە هەشتیش نزیک خرایەوە بۆ پارێزکاران، (**الإِزلافُ: التَّقرِيبُ مُشتَقٌّ مِنَ الزَّلَفِ وَهُوَ القُربَةُ**)، (**إِزلاف**) بە مانای نزیک خستنەوەیە، کە لە وشەی (**زَلَف**)ەوە داتاشراوە، (**زَلَف**)یش بە مانای نزیکیی، بەڵام

(**زُلْفَى**)، (**المَنزِلَةُ والحُظْوَةُ**)، یانی: پێگەو بەهرە، بۆیەش وشەی (**أُزلِفَت**) بەکارهاتوەو خوا نەیفەرموە: (**وَقُرِّبَت الجَنَّةُ**)، یان (**وَأُدنِيَت الجَنَّةُ**)، بەڵکو وشەی (**أُزلِفَت**) بەکارهاتوە، واتە: بەهەشت بۆ پارێزکاران نیزیک خرایەوەو، کە لە هەمان کاتدا پێگەو پلەو پایەیەو، بەهرەی زۆری تێدایە بۆ پارێزکاران، کە ئەوە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، ئاماژەیان پێ کرد بێ، بەڵام بێگومان هەر وشەیەک لە قورئاندا کە بەکارهاتوە، لە جیاتی وشەیەکی دیکە، بێ حیکمەت نیە، کەواتە: بەهەشت نیزیک دەخرێتەوە، بە هەشتێک کە پلەو پایەو پێگەو بەهرەی زۆر گەورەی تێدایە، بۆ پارێزکاران.

**٢)- ﴿ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴾**، نەک دوور، (**غَيرَ: مَنصُوبٌ عَلَى الظرفِيَّةِ عَلَى اعتبارِ أَنَّهُ وَصفٌ لِظرفِ مَكانٍ مَحذُوفٍ**)، یانی: (**مَكانٍ غَيرَ بَعِيد**)، وشەی (**غَيرَ**) مەنصووبە لەسەر شوێنایەتیی (**ظرفية**)، کە لە زمانی عەرەبییدا ئەوە بنەمایەکە بەو ئیعتیبارەی (**غَيرَ**) وەسفە بۆ زەرفی شوێن، کە قرتێنراوە، یانی: (**مَكانٍ غَيرَ بَعِيد**)، شوێنێک کە دوور نیە.

ئنجا بۆچی ئەم تەعبیرە بەکارهاتوە؟

زانایـان گوتوویانـە: (**المَقصُـودُ أَنهـم يُحشَرُونَ إِلَى مَقرُبَـةٍ مِنها كَرَامَـةً لَهُـم عَـن كُلفَـةِ المَسِيرِ إِلَيهـا، أَوِ المَقصُـودُ تَيسِـير وُصُولِهـم إِلَيهـا بِوَسَـائِلَ غَـيرَ مَعرُوفَـة فِـي عـادَةَ أَهـلِ الدُّنيا**)، ئەمـە دوو واتـای هـەن:

أ- کۆ دەکرێنەوە بەرەو شوێنێکی نیزیک لە بەهەشت و، لێی وەنیزیک دەخرێن، وەک ڕێز لێگرتنێکیان بەوەی ناڕەحەت نەکرێن، کە خۆیان بۆ لای بەهەشت بچن.

ب- مەبەست ئاسانیی گەیشتنیانە بە بەهەشت، بە هۆکارو ئامڕازانێک کە بۆ ئێمە زاندراو نین، لە عادەتی خەڵکی دنیادا.

کـە دیـارە لـەوێ بـەس خـوا دەزانـێ، چ ئامـڕازو هۆکارانێکـی سـەر سـووڕهێنەر دەسـازێنێ، بـۆ ئەهـلی بەهەشـت.

**٣)- ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴾**، ئەمە ئەوەیە کە بەڵێنتان پێ دەدرێ بۆ هەر زۆر گەڕاوەیەکی پارێزەر، ئنجا خوا ﷻ دوای بەهەشت کە باسی دەکات، چۆن

نیزیک دەخرێتەوە بۆ پارێزکاران، ئنجا باسی کۆمەڵێک خەسڵەت و سیفەتی گرنگی ئەو پارێزکارانە دەکات، کە خوا ﷻ لە گۆترەو بە بەلاش ئەوانەی نەکردوە بە ئەهلی بەهەشت، دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ﴾، یەکەمین سیفەتیان ئەوەیە کە (**أَوَّاب**)ن، زۆر بۆ لای خوا گەڕاونەوە، (**الأَوَّابُ: الكَثِيرُ الأَوبِ**)، زۆر گەڕاوە، پێشتر گوتمان: وشەی (**أَوب**) بۆ گەڕانەوەی ژیاندارانی خاوەن ویست و هەست بەکاردەهێنرێ، کەواتە:

**سیفەتی یەکەمیان:** ئەوەیە کە ئەوان زۆر بۆ لای خوا گەڕاونەوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەم دڵ و دەروونی، هەم زمانی، هەم ئەندامەکانی واتە: هەم ڕواڵەتی، هەم دەروونی، خوا ﷻ وای خوڵقاندوە بتوانێ چاکە بکات و خراپە بکات، وەک چۆن فریشتە دەتوانێ خورپەو ئیلهامی خێر بخاتە دڵی مرۆڤەوە و، بەرەو خێر بیجووڵێنێ، شەیتانیش، دەتوانێ بەرەو خراپە بیجووڵێنێ، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: دڵی مرۆڤ لە نێوان دوو هاندەری خێرو شەڕ دایە، بۆیە هەمیشە مرۆڤ پێویستیی بەوە هەیە زوو زوو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

**سیفەتی دووەمیان:** (**حَفِيظ**) پارێزەرن، (**الحَفِيظ: كَثِيرُ الحِفظ لِدِينِهِ وَلِنَفسِهِ**)، کەسێک کە زۆر پارێزەرە، هەم دینی دەپارێزێ، هەم خۆی دەپارێزێ، (**حَفِيظ**) واتە: زۆر پارێزەر، چونکە (**حَفِيظ**) ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**حافِظ**)ە، (**حافِظ**) یانی: پارێزەر، بەڵام (**حَفِيظ**) یانی: زۆر پارێزەر، وەک (**عالِم**) و (**عَلِيم**)، واتە:

**١-** جەستەی خۆیان دەپارێزن لە گوناهو خراپە.

**٢-** دڵ و دەروونی خۆیان دەپارێزن لە خولیاو نیازو مەبەستی خراپ.

**٣-** بەرنامەکەی کە خوا بۆی ناردوون، دەیپارێزن لەوەی کە لێی لادەن.

**٤-** ئەو کتێبە دەپارێزن کە خوا بۆی دابەزاندوون، لەوەی بەرانبەری کەمتەرخەم بن و هەوڵ نەدەن باشی لێ تێبگەن و باشی پێوە پابەند بن.

٥- پێغەمبەر ﷺ دەپارێزن لەوەی سەرپێچیی لە فەرمانی بکەن.

٦- کۆمەڵگاو دەوروبەریان لەوە دەپارێزن، کە بە دڵ و دەست و زمان زیانیان پێ بگەیەنن.

٧- ئنجا ئەوانەی ئەرکیان لەسەر شانیانە، ئەرکی بەڕێوە بردنیان و مشوور لێخواردنیان، دەیانپارێزن لەوەی زایە بن، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: {**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ**} (**أخرجه أحمد: ٦٤٩٥، وأبو داود: ١٦٩٢، والحاكم: ١٥١٥، والبزار: ٢٤١٥، وابن حبان: ٤٢٤٠**). واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە کەسێک کە دەبێ بیژیەنی و سەرپەرشتیی بکات، زایەیان بکات، کەواتە: (پارێزەر) یانی: پارێزەرن بۆ هەموو ئەوانە.

٤)- ﴿ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، (ئەمەش سیفەتی سێیەمیانە)، کەسێک کە لە (خوای) بەبەزەیی بە پەنامەکیی دەترسێ، بۆچی وشەی: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنَ ﴾ی بەکارهێناوە؟ واتە: ئەو کەسە سام و هەیبەتی هەیە، بەرانبەر بە خوا و، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانێ خوا خاوەنی ئەوپەڕی بەزەییە، کەچی سام و هەیبەتی بەرانبەری هەیە و، بەزەییەکەی نەکردوە بە بیانوو و پاساوی ئەوەی لێی نەترسێ، هەروەها وشەی: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنَ ﴾، بۆیە بەکارهاتوە، ئەمە وەک پلار تێگرتنێکی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە (**تَعرِيضٌ بِالمُشرِكِين**)، لە پەنادا قسە بۆ تێوەشاندنیانە، کە ئەوان نکووڵییان دەکرد لەوەی خوا ناوی ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنَ ﴾ی هەبێ، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ﴿٦٠﴾ ﴾الفرقان، واتە: هەرکات پێیان گوترا: کڕنووش بەرن بۆ ڕەحمان، گوتیان: ڕەحمان چییە؟..... پێویستە بزانین کە وشەی (**خوف**) بە مانای ترس دێ، بەڵام (**خَشِيَة**): بریتیە لە ترسێک لەگەڵ بە مەزن گرتندا، یانی: (**الخَوفُ مَقرُوناً بالتَّعظِيم**)، بۆیە خوا ﷻ وشەی (**خَوف**) و (**خَشِيَة**)ی بەکارهێناون لە قورئاندا، بەڵام (**خَشِيَة**) زیاتر لە حاڵەتی مەدح بۆ زانایان، یاخود بۆ بڕوادارانی باش، بۆ وێنە: لێرە دەفەرموێ: ﴿ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ... ﴿٢٨﴾ ﴾فاطر، یان کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾الأنبياء.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾، هەندێـک گوتوویانـە: پیتـی (ب) کـە دەفەرمـوێ: ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾، لێـرەدا بـە مانـای (فـي)ە، (فِي الغَيـب)، یانـی: لـەو حاڵەتـەدا کـە ئـەوان کـەس ئـاگای لێنیـن، لـە حاڵـەتی پەنهانـدان، یاخـود ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾، واتـە: لـە حاڵێکـدا کـە خـوا ﷻ لێیـان پەنهانـە، بـەڵام ئـەوان سـام و هەیبەتیـان بەرانبـەری هـەر هەیـە.

٥)- ﴿وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ﴾، (ئەمەش سیفەتی چوارەمیانە، ئەو پارێزکارانەی ئەو بەهەشتەیان بۆ دانراوە)، هەر کامێکیان بە دڵێکی زۆر گەڕاوەوە هاتوە، ﴿بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ﴾، لە ئەصڵدا دڵ و دەروونی پاک و پڕ ئیمان دەبێتە هۆی ئەوەی بگەڕێتەوە، (القَلبُ سَبَبُ الإنابَةِ وَالبَاعثُ عَلَيهَا)، ئەدی بۆچی دەفەرموێ: ﴿بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ﴾؟ واتە: دڵەکە زۆر بۆ لای خوا گەڕاوەتەوە، ئنجا کە دڵ زۆر گەڕانەوە بۆ لای خوای تێدابوو، خاوەنەکەشی هەروا دەبێ و ئەو قەلبە، قالبەکەشی لەگەڵ خۆیدا بۆ لای خوا ﷻ دەگێڕێتەوە، کەواتە: ئەمە چوار سیفەتی زۆر گەورەو گرنگ، بۆ ئەو پارێزکارانەی خوا بەهەشتی بۆ داناون.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ٦- ﴿ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖ﴾، (پێیـان دەگوتـرێ، یـان پێیـان دەڵێیـن:) بـە سـەلامەتیی بچنـە تێـی، (واتـە: بچنـە بەهەشـتەوە)، پێشـتر گوتمـان: (السَّـلم وَالسَّـلامَةُ: التَّعَـرِّي مِـنَ الآفَـاتِ الظَّاهِـرَةِ وَالباطِنَـة)، وشـەی (سَـلْم) و (سَـلامَة) واتـە: پاکیـی و، دووریـی لـە دەردو بـەڵا دەروونیـی و ڕواڵەتییـەکان، لێرەشـدا وشـەی سـەلام دوو واتـا هەڵدەگـرێ:

یەکـەم: بـێ بەڵایـی لـە هـەر جـۆرە ئازارێـک، لـە ماندوویەتیـی و ناڕەحەتیـی و خەفـەت و ... هتـد.

دووەم: ﴿بِسَلَٰمٖ﴾، واتە: (بِتَسلِيمٍ مِنَ المَلائِكَة)، بە سڵاولێکردنی فریشتانەوە.

بەڵکـو دەگونجـێ مەبەسـت پێـی سـڵاوکردنی خـوا بـێ، وەک لـە سـوورەتی (یـس) دا دەفەرمـوێ: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ٥٨﴾یس، سـەلام قسـەیەکە دەبێـژرێ لـە لایـەن پـەروەردگاری میهرەبانـەوە.

٧)- ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەر مانەوەیە، وشەی ﴿ذَٰلِكَ﴾، (**إِشَارَةٌ إِلَى اليَومِ الَّذِي هُم فِيهِ، وَالإِشارَةُ لِلبَعِيدِ لِلتعظِيم**)، لە جیاتی بفەرمویْ: (**هَذَا يَومُ الخُلُود**)، وەک لە شوێنی دیکەدا وا هاتوە، سیاق لەویْ وایخواستوە، بەڵام لێرە: ﴿ذَٰلِكَ﴾، کە ئاماژە بۆ دوور، بۆ مەزنگرتنە و، بۆ بەرزکردنەوەیە، ئەگەرنا: ﴿ذَٰلِكَ﴾، هەر ئاماژەیە بەو ڕۆژەی ئەوانی تێدان، کە ئەو کاتەیە تێیدا دەچنە بەهەشتەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەمیشە مانەوەیە.

٨)- ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا﴾، بۆ ئەوان هەرچی بیخوازن تێیدایە، لە بەهەشتدا، وەک لە سوورەتی (الزخرف)دا دەفەرمویْ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ... ﴿٧١﴾﴾، واتە: بۆ ئەوان هەیە، هەرچی نەفسەکان بیخوازن و، هەرچی چاوەکان چێژی لێوەربگرن، ئنجا هەر ئەوەندە؟ نەخێر.

٩)- ﴿وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾، زیادە لەوەش کە نەفسیان بیخوازیْ تێیدا هەیە، (**أَي: زِيادَةٌ عَلَى ما يَشَاؤُنَ مِمَّا لَم يَخطُر بِبَالِهِم**)، زیادە لەوەی دەیانەویْ، شتێک کە ئەصڵەن بە خەیاڵ و ئەندێشەیاندا نەهاتوە، یاخود: (**المَزِيدُ: بِمَعنَى المَفعُولِ، أَي: ما نَزِيدُهُ عَلَى ما يَرجُون، وَما يَكُونُ مِمَّا يَشتَهُون**)، واتە: ئەوەی بۆیان زیاد دەکەین، لەوەی کە دەیانەویْ، ئەوەی لە زیادە پێیان دەدەین لەوەی ئارەزووی دەکەن، ئەمە وەک ئەو فەرمایشتەی خوایە ﷻ لە سوورەتی (یونس)دا لە ئایەتی (٢٦) کە دەفەرمویْ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ... ﴿٢٦﴾﴾، واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە پاداشتی هەرە چاک هەیەو، زیادە لەوەش، کە دیارە هەموو شتێک دەگرێتەوە.

لەوێدا زۆر لە زانایان ﴿وَزِيَادَةٞ﴾یان، بەوە لێکداوەتەوە کە بریتیە: لە گەیشتن بە دیداری خوا ﷻو، بینینی خوای بەرزو مەزن، ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، لەو بارەوە قسەمان کرد، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەرمان هێنان لێرەش کە دەفەرمویْ: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾، هەرچی

بیانەوێ بۆیان هەیە و زیادەشمان لەلا هەیە، بە باشم زانی فەرموودەیەك بێنم، **(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنێ، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ فِي كَفِّهِ مِرْآةٌ بَيْضَاءُ، فِيهَا نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فَقُلْتُ: يا جِبْرِيلُ ما هَذِهِ؟ قَالَ: هَذِهِ الجُمُعَةُ، قُلْتُ: فَمَا هَذِهِ النُّكْتَةُ السَّوْدَاءُ فِيهَا؟ قالَ: هِيَ السَّاعَةُ تَقُومُ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَهُوَ سَيِّدُ الأَيَّامِ عِنْدَنَا، وَنَحْنُ نَدْعُوهُ فِي الآخِرَةِ يَوْمَ الْمَزِيدِ، قُلْتُ: وَلِمَ تَدْعُونَ يَوْمَ المَزِيدِ قالَ: إِنَّ رَبَّكَ تَبارَكَ وَتَعالى اتَّخَذَ فِي الجَنَّةِ وَادِيا أَفْيَحَ مِنْ مِسْكٍ أَبْيَض، فإذَا كانَ يَوْمُ الجُمُعَةِ نزلَ مِنْ عِلِّيِّين عَلَى كُرْسِيِّهِ، ثُمَّ حَفَّ الكُرْسِيَّ بِمَنابِرَ مِنْ نُورٍ، ثُمَّ جاءَ النَّبِيُّونَ حتى يَجْلِسُوا عَلَيْها ثُمَّ تَجِيءُ أهلُ الجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسُوا عَلَى الكُثُبِ فَيَتَجَلَّى لَهُمْ رَبُّهُمْ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَنْظُرُوا إلى وَجْهِهِ وَهُوَ يَقُولُ: أَنَا الَّذِي صَدَقْتُكُم عِدَتِي، وأَتْمَمْتُ عَلَيْكُم نِعْمَتِي، فَهَذَا مَحلُّ كَرَامَتِي، فَسَلُونِي، فَيَسأَلُونهُ الرِّضَا، فَيَقُولُ: رِضَايَ أَحَلَّكُمْ دَارِي وأنالَكُم كَرَامَتِي، فَسَلُونِي، فَيَسأَلُونهُ حتى تَنْتَهِيَ رَغْبتهُم، فَيُفْتَحُ لَهُمْ عِنْدَ ذَلِكَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، إلى مِقْدَارِ مُنْصَرَفِ النَّاسِ مِنَ الجُمُعَة حتى يَصْعَدَ عَلَى كُرْسِيِّه فَيَصْعَدُ مَعَهُ الصدّيقُونَ والشُّهَدَاءُ، وَتَرْجِعُ أَهْلُ الجَنَّةِ إلى غُرَفِهِمْ دُرَّةً بَيْضَاءَ، لا نَظْمَ فِيها ولا فَصْمَ، أَوْ ياقُوتَةً حَمْرَاءَ، أَوْ زَبَرْجَدَةً خَضْرَاءَ، مِنْها غُرَفُها وأَبْوَابُها، فَلَيْسُوا إلى شَيْءٍ أَحْوَجَ مِنْهُمْ إلى يَوْمِ الجُمُعَةِ، لِيَزْدَادُوا مِنْهُ كَرَامَةً، وَلِيَزْدَادُوا نَظَراً إلى وَجْهِهِ، وَلِذَلِكَ دُعِيَ يَوْمَ المَزِيدِ}.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جیبریل هاتە لام لە دەستیدا ئاوێنەیەکی سپی هەبوو، کە خاڵێکی ڕەش لە نێو ئاوێنە سپییەکەدا هەبوو، منیش لێم پرسی ئەی جیبریل! ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەمە ڕۆژی جومعەیە، گوتم: ئەدی ئەو خاڵە ڕەشە چییە

(١ ) ج١٤، رقم: ٣٢٠٠١٠. ورواه الطبراني في الأوسط: برقم: ٦٦٧٠.

تێیدایـە؟ گـوتی: ئـەوە کاتەکـە (سـاعة)یە، ئـەو کاتـەی ڕۆژی قیامـەت دێ، ڕۆژی قیامـەت لـە ڕۆژی جومعـەدا دێ، کـە گـەورەی ڕۆژەکانـە لـە لای ئێمـە، [واتـە: گـەورەی ڕۆژەکانی حەفتەیـە]و، ئێمـە لـە ڕۆژی دوایـی دا، بـەو ڕۆژە دەڵێیـن: (**يَـوم المَزِيـد**) ڕۆژی زیـاد بـوون، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: گوتـم: بۆچـی پێـی دەڵێـن: (**يَـوم المَزِيـد**)؟ [جیبریـل بـۆی ڕوونکـردەوە] گـوتی: پەروەردگارمـان (تبـارک وتعـالی) شـیوێکی لـە بەهەشـتدا ڕەخسـاندوە، لـە میسـکی سـپیی (کـە بۆنێکـی یەکجـار خـۆشی هەیـە)، کـە ڕۆژی جومعـە هـات، خـوا ﷻ لـە (**عِلِّيِّـين**)ەوە، دێتـە سـەر کورسـییەکەی و، کورسـییەکەی خـوا بـە چەنـدان دوانگـەی نووریـن، دەورە دەدرێ، هەتـا پێغەمبـەران دێـن دادەنیشـن لەسـەر ئـەو دوانگانـە، دوایـی ئەهـلی بەهەشـتیش دێـن، ئەوانیـش لەسـەر بەرزاییـان [شـوێنی وەک قەنەفان دادەنیشـن]، پەروەردگاریان خۆییان پێشـان دەدات، هەتـا تەماشـای ڕووی خـوای پـەروەردگار دەکـەن، ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: منـم کـە بەڵێنـی خـۆم لەگـەڵ ڕاسـت بردنـە سـەرو، چاکـەی خـۆم لەسـەر تـەواو کـردن، ئێسـتاش ئـەم شـوێنە [واتـە: ئـەو بەهەشـتەش] شـوێنی شـوێنی بەخشـندەیی منـە، داوام لێبکـەن، ئەوانیـش داوای لێدەکـەن کـە لێیـان ڕازی بـێ، دەفەرمـوێ: مـادام هێناومـە ئـەو شـوێنەی بـۆم دانـاون (ئـەو مەنزڵگایـە)، ڕێـزم لێگرتـوون، کەواتـە: لێتـان ڕازی بـووم، شـتی دیکـەم داوام لێبکـەن ئەوانیـش داوای لـێ دەکـەن تاکـو هەرچـی ئارەزوویانـە داوای دەکـەن، دوای ئـەوە پەردەیـان بـۆ لادەدرێ، لەسـەر نـازو نیعمەتێـک کـە هیـچ چاوێـک نەیدیـوەو، هیـچ گوێیـەک نەیبیسـتوەو، بەسـەر دڵـی کەسیشـدا نەهاتـوە، ئـەوەش بـەردەوام دەبـێ بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە خەڵـک دەچـن بـۆ نوێـژی جومعـەو دەگەڕێنـەوە، دوایـی خـوا ﷻ لەسـەر کورسـییەکەی بـەرز دەبێتـەوەو صیددیقـان و شـەهیدانیش لەگەڵـی بەرزدەبنـەوە، ئنجـا ئەهـلی بەهەشـت دەگەڕێنـەوە بـۆ ژوورەکانی خۆیـان، (خانـووەکانی خۆیـان)، کـە یـان گەوهەرێکـی سـپییە، کـە هیچ کەلێـن و درزی تێدانیـە، یاخـود مرواریيەکـی سـوورە، یاخـود زوبەرجەدێکـی سـەوزە، هـەر کامێـک لەوانـە ژوورەکانی تێـدان و، دەرگایـان

هەن و، ڕووباریان پێدا دەڕۆن و میوەکان پێیاندا شۆڕ بوونەوە، هاوسەرەکانیشیان لەوێدا هەن، لەوێ لە هەموو شتێک زیاتر پێویستییان بە ڕۆژی جومعەیە کە بێت، تاکو خوا لە بەخشش و ڕێز لێگرتنی خۆی بۆیان زیاد بکات و، بۆ ئەوەی لە تەماشا کردنی ڕووی خوای پەروەردگار زیاد بکەن، بۆیە ئەو ڕۆژە پێی دەگوترێ: (**یَومُ المَزِید**)، ڕۆژی زیاد کردن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بە نسیب هەمووو لایەکمانی بکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرنجڕاکێشان بۆ قڕ کردنی زۆر کۆمەڵگایان، کە زەبریان توندتر بووە لە کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ، کە زۆر هەوڵی دۆزینەوەی پەناگەیاندا ڕابکەن و، خۆیان بشارنەوە و، حەشار بدەن، بەڵام بێ سوود بوو، کە لەوەدا پەندو ئامۆژگاریی هەبوو بۆ خاوەن عەقڵان و گوێگران، هەروەها دروستکردنی گەردوون لە ماوەی شەش قۆناغدا، بەبێ ماندوو بوون، ئەویش دیسان لە نیشانەکانی باڵادەستیی و، دەسەڵات ڕەهایی خوای پەروەرگارە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ﴾، لە پێش واندا زۆر سەدەمان فەوتاندن، خەڵکی زۆر سەدەمان قڕ کردن، وشەی: ﴿قَرْنٍ﴾، بەو کاتە دەگوترێ: کە خەڵکێک تێیدا دەژی، یان سەد ساڵە، یان حەفتایە، هەندێک کەمترو زیاتریشیان گوتوە، مەبەست ئەو خەڵکەیە کە لەو کاتەدا دەژین، بەڵام خوای پەروەردگار هەر بە وشەی: ﴿قَرْنٍ﴾، هێناویەتی، واتە: لە پێش واندا زۆر خەڵک و کۆمەڵگا کە لە کاتێکی دیارییکراودا پێکەوە ژیاون، فەوتاندووومانن.

**٢)-** ﴿هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا﴾، کە ئەوان لەوان، [واتە: ئەوانەی ڕابردوون لەوانەی ئێستا لە بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ ] زەبرو هێزیان توندتر بوو، (**البَطْشُ: تَنَاوُلٌ بِصَوْلَة**)، (بطش) پەلاماردانە بە هێز، واتە: زەبر (زەبر وەشاندن)، بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا﴾، ئەم دوو ڕاناوە ﴿هُمْ﴾، بۆ گەلە ڕابردووەکان دەگەڕێتەوە

کە فەوتێندراون، ﴿مِنۡهُم﴾یش بۆ کافران و بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێتەوە، ئەوانی ڕابردوو، لەوانی ئێستا بەهێزتر بوو.

٣)- ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، وڵاتیان زۆر پشکنین، (نَقَّبُوا) خوێندراویشەتەوە: (نَقَبُوا)، بەبێ گیرە، بە هەردووک شێوەکەی یەک واتای هەیە، واتە: زۆر بە وڵاتاندا گەڕان، زۆریان هەوڵدا خۆیان حەشار بدەن و، خۆیان پەنابدەن لە سزای خوا.

٤)- ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾، ئایا هیچ پەناگە هەبوون؟ (هَل مِن مَلجَإٍ وَمَخْلَص)، (محیص) چاوگێکی میمییە، یانی: هیچ پەناگەو حەشارگەیەك نەبوو خۆیانی تێبگرن، لە سزای خوا پارێزراو بن.

واتایەکی دیکەی: ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، (**نَقَّبُوا: مُشْتَقٌّ مِنَ النَّقْبِ بِسُكُونِ القَافِ بِمَعنَى الثَّقبِ، أَي: خَرَقُوا وَاستُعِيرَ لِمَعنَى: ذَلَّلُوا وَأَخضعوا، أَي: تَصَرَّفُوا فِي الأَرضِ بِالحَفرِ وَالغَرسِ وَالبناء...**)، وشەی: (نَقَّبُوا) یان (نَقَبُوا)، هەردووکیان لە وشەی (نَقب) ەوە هاتوون، (نَقب) بە مانای (کونکردن)، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هەڵکۆڵین و تەصەڕوف تێداکردنی زەوی و مل پێ کەچکردنی ڕووی زەوی، واتە: زۆریان ئیش تێدا کرد، خانوو بەرەیان تێدا دروستکرد، جۆگەو جۆباریان تێدا هەڵبەستن، قەڵایان تێدا بنیاتنان، ئاوەدانییان تێدا بەرپا کردن، بەڵام هەموو ئەوە دەربازی نەکردن لە سزای خوا، بۆیان نەبوو بە حەشارگە.

کەواتە: ئەم ڕستەیە: ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، دوو مانای هەن:

أ- (**فَتَّشُوا وَبحَثُوا عَن مَهرَبٍ لَكِنَّهُم لَم يَجِدُوهُ**)، سۆراخیان کرد و، پشکنییان و، هەوڵیاندا، پەناگەیەک و حەشارگەیەک بدۆزنەوە، بەڵام دەستیان نەکەوت.

ب- (**تَصَرَّفُوا فِي الأَرضِ وَتَقَلَّبُوا فِيها، لَكِنَّهُم لَم يَنجُوا مِنَ العَذَاب**)، لە زەوییدا هەڵس و کەوتیان کردو، زۆر تێیدا هاتن و چوون، بەڵام نەبووە هۆی ئەوەی لە سزاو ئازارێ کە خوا ﷻ بۆی بڕیار دابوون، دەرباز بن.

کە دەفەرموێ: ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾، (هل) بۆ پرسیارکردنە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی پرسیارکردنی نکوولّییلێکردنە، واتە: ئایا هیچ شوێنی دەرباز بوونیان هەبوو؟ بە دڵنیایی نەخێر، یان ئایا دەرباز بوونیان بۆ هەبوو؟ چونکە (مَحِيص) چاوگی (میمي)یە، بە مانای دەرباز بوون، دەشگونجێ ناوی شوێن بێ، واتە: شوێنی دەرباز بوون و حەشارگەو، شوێنی خۆ لێ قوتار کردن.

٥)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا پەند هەیە، بیرخستنەوە هەیە.

٦)- ﴿لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ﴾، بۆ هەر کەسێک دڵی هەبێ، یان خاوەنی عەقڵ و دڵ بی و تێبگات.

٧)- ﴿أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ﴾، یاخود گوێ هەڵبخات، گوێ بگرێ، بەئامادەیی گوێ بگرێ، واتە: کاتێک گوێ دەگرێ، ئامادە بێ و خاتر جەم بێ، فیکری خۆی کۆ کردبێتەوە بۆ ئەوەی باش حاڵیی بێ، ﴿أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ﴾، (**إلقاءُ السَّمْع: مُسْتَعَارٌ لِشِدَّةِ الإِصْغَاءِ لِلْقُرآنِ وَمَواعظ الرَّسُولِ ﷺ كَأَنَّ أَسماعَهُم طُرِحت فِي ذَلِكَ فَلا يُشغَلُها شَيء آخَر يَسْمَعُهُ**)، وشەی (**إِلقَاءُ السَّمع**) گوێ فڕێدان، خوازراوەتەوە بۆ چاک گوێ گرتن لە قورئان و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر ﷺ وەک گوێیەکانیان فڕێدرابن لەوێ و، بە هیچ شتێکی دیکەوە سەرگەرم نەبن، جگە لە گوێ هەڵخستن و گوێ گرتن.

کە دەفەرموێ: ﴿لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ﴾، بۆیە خوا دەفەرموێ: لەوەدا پەندو بیر خستنەوە هەیە، بۆ کەسێک خاوەنی دڵ بێ، یان گوێ هەڵبخات بە ئامادەیی، چونکە بابای پەندوەرگرو بابای وەبیر هاتووەوە، یان بەوە پەند وەردەگرێ و بەبیری دێتەوە، کە بەڵگە عەقڵییەکان دەیگەیەنن لە خودی خۆیدا، یاخود بەوە پەند وەردەگرێ، کە پێی دەگات لە هەواڵەکانی گەلانی ڕابردوو، واتە: ئەوەی لە مێژوودا ڕوویداوە.

کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ﴾، (أي: **مشاهِد، وصِيغةُ المُبالَغَةِ فِيهِ لِلدلالَةِ عَلَى قُوَّةِ المُشاهَدَةِ لِلمُذَكِّر، أَي: تَحدِيقِ العَيْنِ إِلَيهِ**)، (شهید): بە مانای (ئامادەبوو) دێ، بەڵام بۆیە بە ڕێژگەی زێدەڕۆیی هێناویەتی، تاکو بەهێزیی ئەو

واتایە بگەیەنی، واتە: باش ئامادە دەبێ و چاك تەماشای ئەو كەسە دەكات، كە ئامۆژگاریی دەكات و چاوی تێ دەبڕێ.

لە كۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٨)- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بە شەش ڕۆژان دروستمان كردن، واتە: بە شەش قۆناغ، لە شەش ڕۆژاندا واتە: بە شەش قۆناغ، كاتی خۆی لەوبارەوە زۆرمان باس كردوەو، ئەم تەعبیرە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، ئێمە لە سوورەتی (فصلت)دا، باسێكی سەربەخۆمان لە بارەی چۆنیەتیی دروستبوونی گەردوونەوە كردوە.

٩)- ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾، ئێمە هیچ ماندوویەتییەكمان تووش نەبوو، واتە: ئاسمانەكان و زەویمان بە شەش قۆناغ هێنانە دی، بێ ئەوەی هیچ ماندوویی و شەكەتییەكمان تووش ببێ، (**لَغَبَ يَلْغَبُ، أَي: تَعِبَ وَأَعِيا، «و» للحال، وَالمَسُّ: اللَّمسُ، وَهو أَقَلُّ الإصابَةِ**)، وشەی (**لَغَب**): بە مانای ماندووبوونە، هیچ ماندوویەتییەكمان تووش نەبوو، كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾، (و)ەكە بۆ حاڵە، لە حاڵێكدا ئاسمانەكان و زەوییمان بە شەش ڕۆژان، لە شەش قۆناغدا دروستكردن، كە هیچ ماندوویەتییەكمان تووش نەبوو، (**مَسّ**)یش، یانی: (**لَمس**): كە بریتیە لە كەمترین تووشبوون، (**ما مَسَّنِيَ التَّعَب**)، یانی: نەک هەر ماندوو نەبووم، بگرە یەک تۆز ماندوو بوونم تووش نەبوو، خوا ﷻ لێرەدا باسی مێژوو دەكات و دەفەرموێ: ئێمە زۆر سەدەمان فەوتاندوون لە پێش واندا، كە هێزو توانایان لەو هێزو توانای كافرانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ زیاتر بوو، لە وڵاتیشدا زۆر هەڵسوكەوتیان كرد، زۆر خانوو بەرەیان دروست كردن، جادەو ڕێگاوبانیان دروستكردن، جۆو جۆباریان هەڵبەستن، یاخود كاتێک كە زانیان سزای خوایان بۆ دێ، زۆر گەڕان و سووڕان و پشكنینیان، حەشارگەیەک و پەناگەیەک پەیدا بكەن، بەڵام شوێنی دەرباز بوون نەبوو، دوایی خوا ﷻ باسی دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی دەكات، بە شەش قۆناغ، بێ ئەوەی ماندوویەتیی تووش بێ، لێرەدا ئەو دووانە

(مێژوو و گەردوون) هەردووکیان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە خوایەك ﷻ توانیبی گەلە یاخییەکان بفەوتێنێ، بێ ئەوەی توانای دەرباز بوونیان هەبێ، پاشان ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان، لە شەش قۆناغدا هێنابنە دی، بەبێ ئەوەی ماندوو ببێ، کەواتە: دەشتوانێ زیندوویان بکاتەوە، وەک پێشتریش گوتمان: ئەم سوورەتە هەرچی تێیدایە تەوەرە سەرەکییەکەی و سوورگەکەی کە تێیدا دەسووڕێتەوە، بریتیە لە ڕاستیی زیندوو بوونەوەو سزاو پاداشت.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴾، هیچ ماندووبوونمان تووش نەبوو، ئەمە بەرپەرچدانەوەی جوولەکەکانە، کە لە (پەیمانی کۆن)دا هەیە، لە تەورات لە (سفر التكوين)دا دوای ئەوەی باسی ئەوە دەکات، خوا چۆن ئاسمانەکان و زەوی و هەموو شتەکانی دروستکردن، لە هەموو ڕۆژەکانی، حەفتەدا دەیهێنێ، لە یەک شەممەوە دەست پێ دەکات، گوایە لە ڕۆژی جومعەدا، خوا هەموو شتەکان تەواو دەکات و لە ڕۆژی شەممەدا پشوو دەدات، دەڵێ: (**فَاستَرَاحَ مِن جَمِيعِ عَمَلِهِ**)(١)، خوا پشوویدا لە هەموو کارەکەی خۆی!

بەڵام بێگومان ئەو قسەیەی تەورات گۆڕدراوە، چونکە خوا ﷻ سنوورێک نیە، بۆ دەسەڵات و بۆ توانایی، تاکو بە شتەوە ماندوو ببێ، دەشگونجێ تەنیا بەرپەرچدانەوە نەبێ بۆ جوولەکە، بەڵکو هەر باسی ڕەهایی و بێ سنووریی دەسەڵات و توانای خوای پەروەردگار بێ.

وەک پێشتریش گوتم: نێوەرۆکی ئەم سێ ئایەتە: (٣٦ و ٣٧ و ٣٨) دیسان سەرنجڕاکێشانی خوایە ﷻ بۆ مێژوو و، بۆ گەردوون، بەڵام ئەمجارە زۆر بە کورتیی، ئایەتەکانی: (٦ - ١٤)ش، بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکرابوون، بەڵام ئەم جارە تەنیا سێ ئایەت، پێشتریش باسی گەردوون پێش خرابوو، بەڵام ئەمجارە باسی مێژوو، ئەمەش هەمووی وەک بەڵگە لەسەر زیندوو کرانەوەو هەبوونی سزاو پاداشت.

---

(١) التفسير الطتبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم سفر التكوين الإصحاح: ٢، ص٩.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**چەند ڕێنماییەکەک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی مامەڵەی لەگەڵ بێبڕوایانی کەللە ڕەقدا، کە لە خۆڕاگریی پێغەمبەر ﷺ و خواپەرستیی و، چاوەڕێکردنی قیامەت و، بیرخستنەوەو ئامۆژگارییکردن بە قورئاندا، بەرجەستە دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ۚ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، دەجا خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، (ف)ی ﴿فَٱصْبِرْ﴾، **(فاءُ تَفرِيعٍ عَلَى ما تَقَدَّمَ كُلُّهُ مِن قَولِهِ (بَل عَجِبُوا وَالضَّمِيرُ لِلمُشرِكِين)**، فاء بۆ لق لێکردنەوەی قسەکانی پێشەوەیە و، بینا کردنە لەسەر قسەی پێشێ، هەر لەو شوێنەی کە فەرمووی: ﴿بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ﴾، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، ڕاناوەکەی بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دەچێتەوە، خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، زۆر گوێی پێ مەدە و خۆتی پێوە سەغڵەت مەکە.

**٢)-** ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾، بە ستایشکردنی پەروەردگارتەوە بە پاکی بگرە، واتە: بڵێ: **(سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمدُ لِلَّهِ)**، یان **(سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)**، هەم خوا بە پاک بگرە، کە هیچ کەم و کوڕیی و هەڵەو پەڵەو، لە کەیەک لە خوای پەروەردگاردا نیە، ستایشیشی بکە لەسەر ئەو هەموو سیفەتە بەرزو بێ وێنانەی هەیەتی، کە تەنیا خوای تاك و پاك خاوەنی ئەوناوە هەرە بەرزو، ئەو سیفەتە هەرە پەسندو چاکانەیە.

٣)- ﴿ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴾، پێش خۆرهەڵاتن و پێش ئاوابوون، واتە: پێش خۆرهەڵاتن پەروەردگارت بە پاک بگرەو ستایشی بکە، هەروەها پێش خۆرئاوابوونیش، ئەمە وەک ئەو ئایەتە موبارەکەی خوای پەروەردگارە لە ئایەتی ژمارە (٤٥) لە سوورەتی (البقرة)دا کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ...﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: یارمەتیی وەربگرن لە خۆڕاگریی و نوێژ، لێرەش دەفەرمویٚ: ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴾، واتە: خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، بەهێندی مەگرە و، نادیدەی بگرەو، پشووت درێژ بێ و حەوسەڵەت زۆر بێ و پەروەردگاریشت بە ستاییشکردنەوە بە پاک بگرە، پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون.

هەروەها ئەم ئایەتە موبارەکە وەک ئەو سێ ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (**الحجر**) وایە، ئایەتەکانی: (٩٧، ٩٨، ٩٩) کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە دەزانین تۆ سینەت تەنگ دەبێ، بەهۆی ئەوەوە کە دەیڵێن،[قسەی بێجێ و ناماقووڵ دەکەن، بە تایبەت بەرانبەر بە خوا ﷻ، هەروەها بەرانبەر بە کتێبی خواو بەرامبەر پێغەمبەر خوا ﷺ]، لە بەرانبەر ئەو قسانەی ئەواندا، تۆ پەروەردگارت بە ستایشکردن بە پاک بگرەو، لە کڕنووش بەران بە، (نوێژ بکە) و،پەروەردگارت بپەرستە، تاکو یەقینت بۆ دێ، دڵنیایی واتە: شتێک کە هیچ گومان و دوو دڵیی تێدا نیە، کە بریتیە لە مردن.

٤)- ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴾، بە شەوگاریش دیسان پەروەردگارت بە پاک بگرە.

٥)- ﴿ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴾، هەروەها لە دوای کڕنووش بردنەکانیشەوە، واتە: لە دوای نوێژانیشەوە پەروەردگارت بە پاک بگرە.

(**أَودبَار**) خوێندراویشەتەوە: (**وَإِدبَارَ السُّجُود**)، (**أَدبَار**) کۆی (**دُبُر**)ە، واتە: لەپشت نوێژەکانەوە، بەڵام (**إِدبَار**) چاوگە، واتە: لە دوای تەواوبوونی نوێژەکانیش پەروەردگارت بە پاک بگرەو ستایشی بکە، دوای ئەوەی نوێژت تەواو کرد، هەر

بەردەوام بە لەسەر بە پاكگرتنی خواو، ستایشكردنی و، یاد كردنی، ئەمەش بە ڕوون و ڕاشكاویی ئەوە دەگەیەنێ كە لە دوای نوێژە فەڕزەكان، هەروەها دوای نوێژە غەیرە فەڕزەكانیش بە لای كەمەوە، ئەگەر فەڕزیش نەبێ، پەسندە، یادی خوا بكرێ و ستایشی بكرێ و، خوا بە پاك بگیرێ.

شایەنی باسە: ئەم فەرمانكردنەی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ كە لە بەرانبەر ئەوەدا كە بێبڕوایەكان دەیڵێن و ئەو لەسەر دڵی قورسەو پێی نارەحەتەو پێی ناخۆشە، پەنابەرێتە بەر خوا و، پەنابەرێتە بەر بە پاكگرتنی خواو ستایشكردنی و یاد كردنی و، پەرستنی، لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- لە كۆتایی سوورەتی (**الحجر**)دا هاتوە، ئایەتەكانی: (٩٧ و ٩٨ و ٩٩)، كە پێشتر هێنامانن.

٢- هەروەها لە پێش (**الحجر**)یش، لە سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوە، ئایەتەكانی: (٢٠٥ و ٢٠٦) كە دەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾﴾ الأعراف.

٣- دیسان لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی ژمارە (١٢٣)دا: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ هود.

٤- هەروەها لە سوورەتی (طه)دا، ئایەتەكانی: (١٣٠، ١٣١، ١٣٢).

٥- هەروەها لە سوورەتی (النمل) ئایەتەكانی: (٩١، ٩٢، ٩٣).

٦- دیسان لە سوورەتی (**الإنسان**)دا، ئایەتەكانی: (٢٤ - ٢٧).

هەموو ئەو سوورەتانەدا، دوای ئەوەی خوا ﷻ كۆمەڵێك ڕاستیی گەورەو گرنگ، یان كۆمەڵێك ئەرك بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەخاتە ڕوو، لە كۆتاییەكەیدا فەرمانی پێدەكات بە زیاتر پەرستنی خواو، زیاتر یاد كردنی و بە پاكگرتنی و ستایشكردنی.

٧- هەروەها لە کۆتایی سوورەتی (**الشرح**)یشدا، دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾﴾الشرح، ئەگەر لێبوویەوە، (لە کاری نێو خەڵک، لە جموجۆڵ و چالاکیی نێو خەڵک، بانگ کردنیان و فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەو فێرکردن و ... هتد تەواو بووی)، ﴿فَٱنصَبْ﴾، واتە: پێ بچەقێنە بۆ خوا پەرستیی، ﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾﴾الشرح، زیاتر ئارەزوومەند بە بۆ لای پەروەردگارت، کە زیاتر لێی نزیک ببیەوە.

پاشان خوا ﷻ هەر لەسەر ڕێنماییەکانی خۆی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ:

٦- ﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ﴾، گوێ هەڵخە، گوێ بگرە بە گرنگیی پێدانەوە، ئەو ڕۆژە کە بانگکەرێک بانگ دەکات، لەو شوێنێکی نیزیکەوە، لە شوێنی نزیکەوە مەبەست ئەوەیە هەموو کەس گوێی لێ دەبێ، چونکە ئەگەر لە شوێنی نیزیکەوە خەڵک بانگ بکرێ، گوێیان لێ دەبێ، بەڵام لە شوێنی دوورەوە، ڕەنگە گوێیان لێ نەبێ.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ﴾، گوێ بگرە ئەو ڕۆژە کە بانگکەرێک بانگ دەکات:

١- دەگونجێ مەبەست پێی گوێگرتنی ڕواڵەتیی و دەشگونجێ مەبەست پێ گوێگرتن بێ بۆ هەواڵی ئەو بانگکەرە.

٢- دەشگونجێ مەبەست پێی گوێ گرتن بۆ ئەو هاڕژن و چریکەیە بێ، کە لە ڕۆژی دواییدا، دوای فووی دووەم ڕوو دەدات، کە بە دڵنیایی ئەو کاتە گوێگرتنەکە، مەبەست پێی ئەوەیە: چاوەڕێ بە کە فووی دووەم بە کەڕەنادا بکرێ و، ڕۆژی دوایی بێتە دی، زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت بێتە گۆڕێ، دەگونجێ مەبەست پێ ئەوە بێ چاوەڕێبە، تاکو ئەو ڕۆژە دێ.

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ : گوێ بگرە بۆ ئەوەی خوا ﷻ لەوبارەوە پێت ڕادەگەیەنێ، ئەگەرنا لەو کاتەدا گوێگرتنی پێغەمبەر و ﷺ خەڵکی دیکە، هەمووی یەکسانە و هەموویان گوێیان لێدەبێ، کەواتە: هیچ تایبەتمەندییەکی پێغەمبەری تێدا نیە ﷺ بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە گوێ بگرە بۆ ئەوەی خوا لەو بارەوە هەواڵت پێ دەدات.

٤- یان مەبەست پێی چاوەڕێکردنە و ئەمە هەڕەشەیەکە لە بێبڕوایەکان واتە: چاوەڕێبە کە ئەو ڕۆژە دێ، بزانە تووشی چ دەردێک دەبن!!

٧)- ﴿ يَوۡمَ يَسۡمَعُونَ ٱلصَّيۡحَةَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، ئەو ڕۆژەی گوێیان لەو هاڕژن و چریکەیە دەبێ، بە حەق و بەڕاستیی گوێیان لێدەبێ، بە چەسپاویی.

٨)- ﴿ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژی دەرچوونە، واتە: کە ئەو شتە دەقەومێ، ڕۆژی دەرچوونە، ڕۆژی هاتنە دەری خەڵکە لە زەوی، ئەو زەوییەی تێیدا نێژراون و جەستەیان تێدا بۆتەوە بە خاک، لەوێ دێنەوە دەر.

٩)- ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هەر خۆمان دەژێنین و دەمرێنین، واتە: ژیاندن و مراندن کاری تایبەتیی ئێمەیە، کەسی دیکە ناتوانێ ژیان بڕەخسێنێ و، ژیان لە کەسێک وەربگرێتەوە، مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

١٠)- ﴿ وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ ﴾، سەرنجامیش تەنیا بۆ لای ئێمەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ ﴾، کە ﴿ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرە (أل)ەکە بۆ (عهد)ە، یانی: سەرنجامەکە بۆ لای ئێمەیە، یاخود: (أل) بۆ جینسە، واتە: هەرچی سەرنجامن، هەموویان بۆ لای ئێمە دێنەوە، واتە: سەرنجامەکە کە قسەی لەبارەوە کراوە، بۆ لای ئێمەیە، یاخود هەموو سەرنجامەکان بۆ لای ئێمەن.

١١)- ﴿ يَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلۡأَرۡضُ عَنۡهُمۡ سِرَاعٗا ﴾، ئەو ڕۆژەی زەویان لە ئاستدا دەقڵیشێ بە خێرایی، واتە: بە خێرایی دێنە دەر، وشەی: ﴿ تَشَقَّقُ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (تَشَّقُّ)، لە ئەسڵدا (تَتَشَقَّقُ)یە، (سِراع: **جَمعُ سَرِيع، أَي: مُسْرِعِينَ فـي الخُرُوجِ، أَو فـي المَشي الَّذِي**

**یَعقُبُهُ إلى مَحَلِّ الحِساب**)، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی لە ئاستیاندا دەقڵیشێ، هەر کەسە جەستەکەی لە کوێ بۆتەوە خاک، لە ئاست ئەودا دەقڵیشێ و، لەت دەبێ و، دێتە دەرێ، بەخێرایی دەڕۆن، بەرەو ئەو شوێنەی کە بۆیان دیارییکراوە، واتە: بەخێرایی دێنە دەر، یاخود بەخێرایی دەڕۆن.

١٢)- ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾، ئەوە کۆکردنەوەیەکە لەسەر ئێمە ئاسانە، وەک پێشتریش ئاماژەم پێدا، بێگومان ئەوە عەقڵ بە زەحمەت دەتوانێ ئیستیعابی بکات و لە خەیاڵ و ئەندێشەدا، بە زەحمەت دەحەجمێ و جێی دەبێتەوە، ئێستاکە دەوری هەشت ملیار مرۆڤ لەسەر زەوی هەن، ئەو هەشت ملیارەی ئێستا، هەر خواش دەزانێ چەند ملیاری دیکە ڕابردوون و، چوونەوە ژێر ئەو خاکە و، هەر خواش دەزانێ چەند ملیاری دیکەش تاکو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێ دێ، دێن و دەبنەوە بە خاک، هەموو ئەو ملیار ملیارانە کە بەس خوا ﷻ خۆی ژمارەیان دەزانێ، هەموو ئەوانە کۆبکرێنەوە، شتێکی ئاسان نیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾، ئەو کۆکردنەوە، کۆکردنەوەیەکە لەسەر ئێمە ئاسانە، واتە: بۆ خوا ﷻ ئاسانە، چونکە وشەی ئاسان و زەحمەت لە فەرهەنگی ئێمەدا هەیە، ئەگەرنا بۆ خوای توانا و زانا زەحمەت و ئاسان نیە، هەموو شتێک ئاسانە لەلای خوا ﷻ.

١٣)- ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی ئەوان دەیڵێن، ئەوەی ئەوان دەیڵێن: بریتیە لە قسە بۆ خوا هەڵبەستن، گوایە هاوبەشی هەیە، ڕۆڵەی هەیە، هەروەها بە درۆ دانانی نیشانەو ئایەتەکانی، هەروەها نکووڵییکردن لە دەسەڵاتی خوا، کە بتوانێ خەڵک زیندوو بکاتەوە، ئێمە بەو قسانەیان زاناترین.

١٤)- ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾، تۆ بەسەریانەوە تۆبزییکەر نی، (**أَي: ما أَنْتَ بِمُسَلَّطٍ عَلَيهِم**)، تۆ خوا توانەیەکی پێ نەداویت کە بە زۆر مسوڵمانیان بکەی و، بە زۆر بیانکەیە بڕوادار، (**أَي: لَمْ تُبْعَثْ لِتُجْبِرَهُم عَلَى الإِسلامِ، إِنَّما بُعِثْتَ مُذَكِّراً**)، تۆ نەنێردراوی ناچاریان بکەی لەسەر مسوڵمانکردن، بەڵکو تۆ تەنیا کارت ئەوەیە بیریان بخەیەوە.

وشەی: ﴿ جَبَّار ﴾، (**مُشتَقٌّ مِن جَبَرَهُ عَلَى الأَمرِ: أَكرَهَهُ أي: مُجبِرٌ مِثلُ: دَرَّاك: بِمَعنَى مُدرِك، سَرَّاع بِمَعنَى مُسْرِعْ، وبَكَّاء بِمَعنَى مُبكٍ**)، لێرەدا وشەی (**جَبَّار**) داتاشراوە لە (**جَبَرَهُ عَلَى الأَمرِ**)، واتە: ناچاری کرد ئەو کارە بکات، (**أَي: أَكْرَهَهُ**) کەواتە: (**جَبَّار**) لێرەدا بە مانای (**مُجبِر**)ە، واتە: تۆبزییکەر و ناچارکەر، وەک (**دَرَّاك**) بە مانای (**مُدْرِك**)، واتە: کەسێک کە شتێک دەزانێ، یان (**سَرَّاع**) بە مانای (**مُسْرِع**)، واتە: خێراکەر، (**بَكَّاء**) بە مانای (**مُبكٍ**)، واتە: گریێنەر، بەڵام لێرەدا وشەی (**جَبَّار**) بەو مانایە نیە، کە خوا ﷻ لە قورئاندا زەمی دەکات، کە بریتیە لە کەسێک کە خۆ بەسەر خەڵکدا فەرز دەکات و، ناچاریان دەکات لەسەر شتێک کە پێیان ناخۆشە و ملیان پێ کەچ دەکات، نا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە تۆ تۆبزییلێکەر و ناچارکەریان نی، وایان لێبکەی ناچاربن بڕوا بێنن، ئەوە بەس بە خوا دەکرێ، خوا دەتوانێ خەڵک وا لێ بکات، بڕوابێنێ، بەڵام تۆ هەر دەتوانی ڕێیان پێشاندەی، وەک لە سوورەتی (**القصص**)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ ... ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: تۆ ناتوانی ئەوەی خۆشت دەوێ، بیخەیە سەر ڕاستە ڕێ، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات، ئنجا ئەم هیدایەتە تایبەتە، کە بریتیە لە ڕاستە ڕێ کردن، تەنیا بەدەست خوایە، ئەدی بۆچی خوا ﷻ لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى، واتە: تۆ هیدایەت دەکەی بۆ ڕێی ڕاست؟ لێرەدا ئەو هیدایەتە بە مانای ڕێ پێشاندانە، پێغەمبەری خوا ﷺ توانیویەتی ڕێی پێشانی خەڵک بدات، ڕێی ڕاست، بەڵام نەیتوانیوە وایان لێبکات، ڕێی ڕاست بگرن، ئەوە بەس بە خوا ﷻ دەکرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖ ﴾، تۆ تۆبزیی لێکەریان نی.

**١٥)**- ﴿ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾، ئنجا تۆ بە قورئان بیریان بخەوە، هەر کەسێک لە هەڕەشەی من دەترسێ، ﴿ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**وَعِيدِي**)، واتە تەنیا ئەو کەسەی لە هەڕەشەی خوا دەترسێ، لە سزای خوا دەترسێ، تۆ بەس دەتوانی

ئەو کەسە وا لێ بکەی، بیری بکەوێتەوەو ئامۆژگاری بکەی، بەڵام ناتوانی خەڵک ناچار بکەی و زۆریان لێ بکەی.

لێرەدا لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا و، لە کۆتایی تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەکانەدا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر دێنین ﷺ لە بارەی بینینی خواوە ﷻ:

**{عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً «يَعْنِي الْبَدْرَ»، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ، كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا» ثُمَّ قَرَأَ: {وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ}ق: ٣٩]}، (أخرجه أحمد: ١٩٢١٣، والبخاري: ٥٢٩، ومسلم: ٦٣٣، وأبو داود: ٤٧٢٩، والترمذي: ٢٥٥١، وابن ماجه: ١٧٧، وابن حبان: ٧٤٤٢).**

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە شەوێکی بەدر لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، تەماشای مانگی کرد، فەرمووی: ئێوە پەروەردگارتان دەبینن، وەک چۆن ئەم مانگە دەبینن (یانی مانگی چواردە)، هیچ هەورو تەم و مژ نایەتە بەرچاوتان لە بینینی خوادا، بۆیە ئەگەر توانیتان نوێژێک پێش خۆرهەڵاتن و نوێژێکیش پێش خۆرئاوا بوون بکەن، با ئەو دوو نوێژەتان نەچن.

واتە: گرنگیی زیاتریان پێ بدەن، کە مەبەست پێیان نوێژی بەیانی و نوێژی عەسرە، هەڵبەتە مەبەست ئەوە نیە، نوێژەکانی دیکەش، گرنگ نین، مەبەست ئەوەیە ئەو دوو نوێژە زیاتر لێیان بخەفتێن، لەبەر ئەوەی کاتی نوێژی بەیانی، لە دوای خەوتن دێ، نوێژی عەسریش بە دوای ئیش و کارو سەرقاڵییدا دێ، ئاگاتان لێ بێ لەو دووانە، بە شێوەی تایبەت.

هەروەها فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین، هەر لە بارەی بە پاکگرتنی خواو ستایش کردنیەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنْ إِنْسَانٍ**

**يَكُونُ فِي مَجْلِسٍ فَيَقُولُ حِينَ يُرِيدُ أَنْ يَقُومَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ}، (أخرجه أحمد: ١٥٧٦٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح).**

واتە: هەر کەسێک لە کۆڕو مەجلیسێک هەڵسێ، کاتێک هەڵدەستێ بڵێ: (ئەم زیکرە بخوێنێ) (**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**)، ئەی خوایە! تۆ بە پاک دەگرم و ستایشت دەکەم، بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێک نیە، داوای لێبوردنت لێ دەکەم و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، (هەر کەسێک کە لە مەجلیس هەڵدەستێ، ئەم قسەیە بکات)، هەرچی لەو مەجلیسەدا بووبێ، [گوێ گرتن لە قسەیەکی خراپ و، وشەیەکی خراپی بەسەر دەمدا هاتبێ].

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾، زانایان زۆر قسەیان کردوە، بۆ وێنە:

**یەکەم:** (الشوكاني) دەڵێ: (**نَزِّهِ اللهَ عَمَّا لايَلِيقُ بِجَنابِهِ العالِي مُتَلَبِّساً بحَمدِه وَقْتَ الفَجرِ، وَوَقْتَ العَصرِ، وَقِيلَ المُرادُ صَلاةُ الفَجرِ، وَصَلاةُ العَصرِ، وَقِيلَ الصَّلَوات الخَمس، وَقِيلَ صَلِّ الرَّكعَتَينِ قَبلَ طُلُوعِ الشَّمسِ، ورَكعَتَينِ قَبلَ غُرُوبِها، وَمِنَ الَّيلِ فَسَبِّحهُ «مِنْ» للتبعيضِ «أَدبارَ السُّجُود» أَعقابَ الصَّلَوات**)[1].

واتە: خوا بە پاک بگرە لەوەی لە مەقامی بەرزی ناوەشێتەوە، لە حاڵێکدا کە تۆ ستایشیشی دەکەی، کاتی بەرەبەیان و کاتی نوێژی عەسر، هەندێکیش گوتوویانە: ئەمە مەبەست پێی نوێژی بەیانی و نوێژی عەسرەو، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی پێنج فەرزەکانن و، هەندێکیش گوتوویانە: یانی: دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی بکە، دوو ڕکاتیش پێش ئاوابوونی بکە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ﴾، واتە: لە شەوگاریشدا، (مِن) بۆ هەندێکە، واتە: لە هەندێک بەشی

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٩٨.

شەوگاریشدا خوا پەرستیی بکە، ﴿وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾، واتە: لە کۆتایی نوێژە فەرزەکانیش.

**دووەم:** (الشنقيطي) لە (أضواء البَيان)ەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: **(وَأَمْرُهُ لَهُ بِالتَّسْبِيحِ بَعْدَ أَمْرِهِ لَهُ بِالصَّبْرِ عَلَى أَذَى الْكُفَّارِ، فِيهِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ التَّسْبِيحَ يُعِينُهُ اللَّهُ بِهِ عَلَى الصَّبْرِ الْمَأْمُورِ بِهِ، وَالصَّلاةُ دَاخِلَةٌ فِي التَّسْبِيحِ الْمَذْكُورِ)**.

واتە: فەرمان کردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە بەپاک گرتنی خوا ﷻ دوای ئەوەی فەرمانی پێکردوە کە خۆڕاگربێ لەسەر ئازارو قسەی نارێکی بێبڕوایەکان، بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوە، کە خوا بە پاکگرتن هاوکاریی خوای بۆ دەڕەخسێنێ لەسەر خۆڕاگرتن لەسەر ئەوەی فەرمانی پێکراوەو، نوێژیش دەچێتەوە نێو بە پاکگرتنی خواوە کە باسکراوە، [لەبەر ئەوەی نوێژیش هەمووی بریتیە لە یادی خواو بە پاکگرتن و ستایشکردنی خوا].

**سێیەم:** **(ابْنُ عَطِيَّة)**[2] دەڵێ: **(أَجْمَعَ المُتَأَمِّلُونَ عَلَى أَنْ التَّسْبِيْحَ هُنَا: الصَّلاة، قُلْتُ: وَلِذَلِكَ صَارَ فعَل التَّسْبِيح مُنْزَّلاً مَنْزِلَة اللازِم لأَنَّهُ فـي مَعْنَى: صَلِّ)**.

واتە: تێکڕای ئەوانەی لە قورئانەوە ڕاماون گوتوویانە: تەسبیح لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ﴾، مەبەست پێی نوێژە، ئیبنو عاشووریش پشتگیری دەکات و، دەڵێ: هەر بۆیەش وشەی **(تسبيح)** لێرەدا وەک **(لازم)** هاتوە، نەک **(متعدِّي)**، چونکە بە مانای: (نوێژ بکە)یە.

هەڵبەتە هەر **(ابن عاشور)** دەڵێ: هەندێکیش گوتوویانە: ئەوەی کە لێرەدا باسکراوە، هەموو ئەو یادکردنی خواو، بە پاکگرتنی و ستایشکردنی، هەمووی مەبەست پێی نوێژە سوننەتەکانە.

---

(١) ج٧، ص٤٣٢.

(٢) ج١٠، ص٣٢٧.

بـەڵام مـن ڕام وایـە وەک (**الشـنقيطي**) گوتوویـەتی: مەبەسـت پێـی یادکـردنی خوایـەو، بـە پاکگرتنیـەتی و ستایشـکردنیەتی و کڕنـووش بـۆ بردنیـەتی، کـە ئەمـە هـەم نوێژیـش دەگرێتـەوە، هـەم جگـە لـە نوێژیـش دەگرێتـەوەو، بێگومانیـش مـرۆڤ تاکـو دڵـی بـە خـواوە پەیوەسـتتر بـێ و، دڵـی بـە یـادی خـوا ئاوەدانـتر بـێ، عەقـڵ و دڵـی ڕۆشـنتر بـێ بـە نـووری ئیـمان، خۆڕاگرتـر دەبـێ لەسـەر ئـازارو ناڕەحەتیـی و مەینەتییـەکان.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ، کـە لـەو ناڕەحەتیـی و گرفتارییانـەی ژیـانی دنیـادا، بەهـۆی زیاتـر یـاد کـردنی خـواو، زیاتـر پەیوەندیـی تونـدو تـۆڵ بـوون و گـەرم و گـوڕ بوونـەوە لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا خۆڕاگـر بیـن، خۆڕاگـر بیـن بـەو واتایـە لانەدەیـن، بـە لای ڕاسـت و چەپـدا و پاشەکشـە نەکەیـن، تەسـلیمی حاڵێـک نەبیـن کـە بـە ناشـەرعیی دەزانـرێ، بەڵکـو بـەردەوام و خۆڕاگـر بیـن لـە پاکسـازیی و چاکسـازیی و گۆڕانکاریـی و ڕاسـتکردنەوەی، ئـەوەی بـە لاری دەزانیـن.

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیری سووڕەتی (ق).

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێك

بەڕێـــــــزان!

ئەمـڕۆ کـە ڕۆژی (١٦)ی (رجـب)ی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (١١/ ٣/ ٢٠٢٠)ی زایینـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (**الذاريـات**)، سـوورەتی (**الذاريـات**) بەشـێکی دەکەوێتـە کۆتایـی جوزئـی (٢٦) و بەشێکیشـی دەکەوێتـە سـەرەتای جوزئـی (٢٧)، وەك عـادەتی خۆمـان سـەرەتا پێناسـەو نێـوەڕۆکی (**الذاريـات**) دەکەیـن، ئەویـش لـە حـەوت بڕگـەدا دەیخەینـە ڕوو.

## پێناسەی سوورەتی (الذاريات) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ئـەم سـوورەتی (**الذاريات**)یـان، بـە (**سـورةُ الذاريـات**) ناوبـردوە، بـەڵام هەندێـك بـە (**سـورة والذاريات**)یـان ناوهێنـاوە، واتـە: (**و**)ەکـەی لەگەڵدایـە، هۆکارەکەشـی ئاشـکرایە، وشـەی (**ذاريـات**) یـان (**والذاريـات**)، تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوە، زۆر لـە سـوورەتەکان بـە هـۆی وشـەی سـەرەتایان، یـان وشـەیەکی نـاوازە کـە لـە نێویانـدا هاتبـێ، ناونـراون.

### دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە سـوورەتێکی مەککەییـە، بـە یەکدەنگیـی هەمـوو زانایـان، وا پێدەچـێ لـە نێـوان سـاڵانی (٧ تاکـو ٩)ی پێغەمبەرایەتیـی دابەزیبـێ، لەبـەر ئـەوەی

وەك دوایی باسی دەكەین، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ژمارە (٦٦)ە، واتە: لە پێش ئەم سوورەتەدا (٦٥)ی دیكە دابەزیون، لەو (١١٤) سوورەتەی كە هەموو قورئان پێكدێنن و، لەو (٨٦) سوورەتەی كە لە مەككە دابەزیوون.

كەواتە: وا پێدەچێ دابەزینی ئەم سوورەتە لە ڕووی كاتەوە، كەوتبێتە نیوەی دووەمی ڕۆژگارێ كە پێغەمبەر ﷺ گوزەراندوویەتی، كە پێی دەگوترێ: **(البِعْثَة)** واتە: پێش ئەوەی كە لە مەككەوە كۆچ بكات بۆ مەدینە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

ئەمیش بە ڕای تێكڕای ژمێرەرانی ئایەتەكانی قورئان، ژمارەی ئایەتەكانی: (٦٠)ە، پێشتریش گوتوومانە: هەندێك لە سوورەتەكان كە زانایەك ژمارەیەكی كەمتر گوتوە، یەكێك ژمارەیەكی زیاتری گوتوە، كەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەكان دەگەڕێتەوە بۆ كورتیی و درێژیی ڕستەكانی قورئان، ئەگەرنا هیچ دوو زانایەك لەسەر هیچ وشەیەكی قورئان، بەڵكو لەسەر پیتێكیش ڕاجیاییان نەبووە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و موصحەفدا:

لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ئەم سوورەتە (٦٦)مین سوورەتە دابەزیوەو، لە موصحەفیشدا ژمارە (٥١)ە، واتە: كە لە سوورەتی **(الفاتحة)**وە پێ دادێین، لە ژمارە (٥١) دەگەینە سوورەتی **(الذاريات)**، بەڵام لە ڕووی دابەزینەوە (٦٦)مین سوورەت بووە دابەزیوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئەم سوورەتەش هەمان سروشتی قورئانی مەككەیی هەیە، باسی هەر سێ پایە سەرەكییەكەی مسوڵمانەتیی و دەكات:

١- خوا بە یەكگرتن و تەنیا خواپەرستیی ﷻو، باسی تەنها بەدیهێنەرایەتیی خواو، تەنیا پەروەردگارێتیی خواو، تەنیا خاوەندارێتیی خواو، ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەكانی خوا.

٢- ڕۆژی دوایی، ئەویش چ كاتەكە (**ساعة**)، چ قیامەت و زیندووكرانەوە، پاشان باسی سزاو پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ.

٣- باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، ئاماژەكردن بە وەحیەك كە خوا بۆ پێغەمبەرانی دادەبەزێنێ و، ئاماژەكردن بە بەسەرهاتی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**)و، ئاماژەكردن بە كتێبەكانی خوا، بە تایبەت قورئان.

ئـەم سـێ تـەوەرە سـێ تـەوەری كۆكـەرەوەن بـۆ قورئـانی مەككەیـی، ئـەم سـوورەتەش، هـەر لـەو سـێ سـودگەیەدا دەسـوورێ، بـەڵام لـەم سـوورەتەدا (٢٣) ئایـەت بـۆ بەسـەرهاتی شـەش لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامَ**) تەرخانكراون، ئایەتـەكانی: (٢٤ - ٤٦)، كـە هـەر كام لـە: ئیبراهیـم، لـووط، مووسـا، هـوود، صاڵـح، نـووح (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامَ**)ن، بـەڵام تـەوەری سـەرەكیی ئـەم سـوورەتەش، وەك سـوورەتی (ق) بـۆ باسـكردنی ڕۆژی دوایـی و بەهەشـت و دۆزەخ، بـە تایبـەت قیامـەت تەرخانكـراوە، تەنانـەت ئاماژەكـردن بـە ژمارەیـەك لـە نیشـانەكانی خـواش ﷻ، هەروەهـا ئاماژەكـردن و گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی ژمارەیـەك لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامَ**) و گەلـە یاخییەكانیشـیان و، لەبەینچـوونی گەلـە یاخیـی و سەركەشـەكانیان، ئـەوەش كـە باسـكراوە، هـەر پەیوەسـت دەبێتـەوە بە بابـەتی ڕۆژی دواییـەوە وەك دوایـی باسـی دەكەیـن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

١- ئەم سوورەتە یەكەمین سوورەتێكە، لە موصحەفدا هەتا ئێستا هاتبێ و، چوار سوێندی بە دوای یەكدای تێداهاتبن و، سوێندێكی دیكەی پێنجەمیش بە دوای ئەو چوار سوێندەدا، دوای نێوانێك كە كەوتبێتە بەینیانەوە، چونكە سوورەتی (**الصافات**) وەك پێشتر باسمانكرد،

یەکەمین سووڕەتێك بوو کە لە سەرەتای سووڕەتەکەوە سوێند خورا بێ، سێ سوێند بە دوای یەکدا، ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ① فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرًا ② فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ③ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ④﴾، بەڵام ئەمە یەکەمین سووڕەتێکە کە چوار سوێندی تێداخورابن، وەك گوتم: سوێندێکی دیکەی پێنجەمیش، دوای ئەوەی کەلێنێك کەوتۆتە بەینیان.

**٢-** خوا لەم سووڕەتە موبارەکەدا، حیکمەت و ئامانجی دروستکرانی مرۆڤ و جندی خستۆتەڕوو، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خواو خواپەرستن، کە لە ئایەتی ژمارە (٥٦) دایە: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾، لەو بارەوەش زانایان مشتومڕیی زۆریان بووە، ئێمەش دوایی قسەی لێ دەکەین، ئایا دەگونجێ بڵێین: خوا ﷻ ئامانجێکی هێناوەتە دی بە دروستکردنی مرۆڤ و جند، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجامدان؟! لەوبارەوە زانایان مشتومڕی زۆریان بووە، هەر بۆیەش زۆربەیان کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾، مرۆڤ و جندم دروست نەکردوون، مەگەر بۆ ئەوەی بەندایەتییم بۆ بکەن، بە جۆرێك مانایان کردوە کە دووری بخەنەوە لەوەی خوا ﷻ ئامانج و مەبەستێکی ڕەچاو کردبێ لە دروستکردنی مرۆڤ و جنددا، بەڵام وەك دوایی پێی دەگەین، پێمان وایە پێویست بەو تەئویلکردنە ناکات، چونکە ئامانج و مەبەستێك کە خوا ڕەچاوی دەکات، پەیوەندیی بە خودی دروستکراوەکانەوە هەیە، نەك بەخۆیەوە، تاکو ئەوەی لێ بفامرێتەوە، کە خوا ﷻ پێویستی بە جگەلە خۆی بووە، بۆیە ئەو شتەی بە ئامانج گرتوە!

**٣-** تایبەتمەندی سێیەم، کە ئەم سووڕەتە جیادەکاتەوە لە سووڕەتەکانی دیکە، ئەوەیە چەند وشەیەك لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون، کە تایبەتن بەم سووڕەتەوە:

**١-** وشەی ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ﴾، بەڵکو ڕستەی ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾ تایبەتە بەم سووڕەتە موبارەکەوە، کە لە ئایەتی ژمارە (١)دا هاتوە.

**٢-** وشەی ﴿ٱلۡحُبُكِ﴾ کە لە ئایەتی ژمارە (٧)دا هاتوە، ﴿ٱلۡحُبُكِ﴾ واتە: ڕێك و پێك، یاخود چنین، یاخود ڕێیەکان ﴿ٱلۡحُبُكِ﴾ دەگونجێ وەك چۆن (**كُتب**) کۆی (**كِتَاب**)ە،

﴿ٱلْحُبُكِ﴾یش بەم شێوەیە بێ، یاخود وەك چۆن (**طُرُقٌ**) كۆی (**طَرِيْقة**)یە، ﴿ٱلْحُبُكِ﴾یش كۆی (**حَبِيكَة**)بێ، بە مانای ڕێیەكان.

٣- ڕستەی: ﴿إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: قورئان یان زیندووكرانەوە هەقە، وەك چۆن ئێوە قسە دەكەن و دەئاخڤن، ئەمیش تەنیا لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوە.

٤- وشەی: ﴿بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: گۆلكێكی قەڵەو.

٥- وشەی: ﴿يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾﴾، یانی: (**يَنَامُون**) دەخەون.

٦- وشەی: ﴿فَصَكَّتْ وَجْهَهَا﴾ لە ئایەتی ژمارە (٢٩)، واتە: لە دەم و چاوی خۆیدا، ئەمە كە عادەتی ئافرەتانە، وەختێك هەواڵێكی سەرسوڕهێنەر دەبیستن، دەستێك بە خۆیان دادەدەن.

٧- تەعبیرێكی دیكە كە تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ﴾ ئایەتی ژمارە (٣٩)، واتە: فیرعەون پشتی هەڵكرد، بەهۆی هێزو دەسەڵاتەكەیەوە، یاخود بەشان و شەپیلكیەوە خۆی بادا.

٨- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٥٠)دا، ئەم تەعبیرەش تەنیا لێرەدا هاتوە: ﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ڕابكەن بەرەو لای خوا.

٩- وشەی ﴿ذَنُوبِ﴾ یش تەنیا لێرەدا هاتوە، ﴿ذَنُوبِ﴾ بە مانای (**نَصِيْب**)ە، واتە: پشك و بەش، لە ئەصڵدا ﴿ذَنُوبِ﴾ یانی: دۆڵچە ئەوەی ئاویان پێ لە بیر هەڵێنجاوە، ئنجا لەبەر ئەوەی كاتی خۆی لە هەندێ جێیان ئاو كەم بووە، كاتێ ئاویان لە بیر هەڵهێنجاوە، بەو دۆلكە یان دۆڵچەیە ئاویان دەرهێناوە كە لە زمانی عەرەبیی دا (دلو)ی پێدەڵێن.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

ئێمـە کـۆی ئـەو (٦٠) ئایەتـە، بەپێـی نێوەڕۆکیـان و، دوای تێوەڕامـانی زۆرو سـەرنجدانی زۆر لـە نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتە، بـۆ سـێ دەرسـان دابەشـمان کـردوون:

**دەرسـی یەکـەم:** ئایەتـەکانی: (١ - ٢٣)ی سـەرەتا، کـە تێیانـدا خـوا ﷻ سـوێند بـە چـوار جـۆرە شـتان دەخـوات، لەسـەر ڕاسـتیی بەڵێنـی خـوا، پاشـان سـوێند بە ئاسـمانی خـاوەن ڕێـك و پێکیـی، یاخـود خـاوەن ڕێ و بـان، خـوراوە، لەسـەر تێکـەڵ و پێکەڵیـی قسـەو بیـرو ڕای بێبڕوایـان، دوایـی باسـی سـزای بێبڕوایـان کـراوە، پاشـان پاداشـتی پارێـزکاران و، وەسـفکردنیان بـە چەنـد خەسـڵەتێکی زۆر بـەرزو نـاوازە، باسـکراوەوە دوایـی ئاماژەکـراوە بـە نیشـانەکانی خـوا لـە زەویـداو لـە خـودی مرۆڤیشـداو، بـەوە کـە بەڵێنـی خـوا ڕاسـتەو هەقـە، وەك چـۆن قسـەکردن و ئاخاوتنـی مرۆڤـان ڕاسـتەو شـتێکی سـەلمێنراوە.

**دەرسـی دووەم:** ئایەتـەکانی: (٢٤ - ٤٩)، کـە (٢٦) ئایەتـن، تێیانـدا ئامـاژە بـە بەسـەرهاتی هـەر کام لـە ئیبراهیـم و لـووط (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)، ئنجـا دوای ئـەوان بەسـەرهاتی مووسـاو، دوایـی باسـی گـەلی عـاد و گـەلـی ثەمـوود و گـەلـی نـووح کـراوە، ئـەو سـێ گەلـەش کـە باسـکراون، مانـای وایـە هـوود کـە پێغەمبـەری گـەلی عـاد بـووە و، صاڵـح کـە پێغەمبـەری گـەلی ثمـود بـووە و، نووحیـش کـە پێغەمبـەری گەلەکـەی خـۆی بـووە (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)، باسـکراون، پاشـان جارێـکی دیکـە باسـی نیشـانەکانی پەروەردگارێتیـی خـوا هێنراوەتـەوە پێـش و، باسـی هـەر کام لـە ئاسـمان و فراوانکـردنی ئاسـمان یـان بەفراوانیـی دروسـتکردنی ئاسـمان واتە: گـەردوون، یاخـود بـەردەوام فراوانکـردنی کـراوەو، پـان ڕاخسـتنی زەوی و، دیـاردەی جووتیـەتی زەوجیـەت، کـە بنچینـەی گشـتیی خوایـە لـە دروسـتکراوەکاندا، باسـکراوە.

**دەرسـی سـێیەم:** کـە یـازدە ئایەتـەکانی: (٥٠ - ٦٠) دەگرێتـە خـۆی، خـوای بـەرزی مـەزن فەرمـان بـە پێغەمبـەر دەکات، کـە بە خەڵـك بفەرموێ: بـەرەو لای خـوا ڕابکەن

و، تەنیا خوا بپەرستن، پاشان خوا دڵی پێغەمبەری داوەتەوە کە گەلانی پێشووش، کۆمەڵگا پێشووەکانیش، هەر پێغەمبەرێکیان بۆ هاتبێ هەروا بە جادووگەر یان بە شێت تۆمەتباریان کردوە، واتە: هەندێکیان گوتوویانە: جادووگەرە و، هەندێکیان گوتوویانە شێتە، ئەگەرنا ناگونجێ کەسێك جادووگەر بێ شێت بێ، هەروەها شێتیش ناگونجێ جادووگەربێ، واتە: هەندێکیان گوتوویانە: جادووگەرە و، هەندێکیان گوتوویانە: شێتە.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ چەند ڕێنماییەکی پێغەمبەر دەکاو، چەند ڕاستییەکی یەکجار مەزن ڕادەگەیەنێ، لە نێویاندا ئەو ڕاستییە هەرە مەزنەیە، کە بریتیە لەوەی خوا حیکمەتی دروستکردنی بۆ مرۆڤ و جند ڕادەگەیەنێ کە بریتیە لەوەی بەندایەتیی بۆ بکەن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

دەرسی یەكەممان لە (٢٣) ئایەتی سەرەتای (**الذاریات**) پێك دێ، ئایەتەكانی: (١ - ٢٣)، كە سەرەتا خوای كارزانی میهرەبان ﷻ سوێند بە چوار شتان دەخوات، لەسەر ڕاستیی بەڵێنی خواو، هاتنی سزاو پاداشت.

دواتر سوێند بە ئاسمانی ڕێك و پێك و سیستماتیك، یاخود ئاسمانی خاوەن ڕێگەو بان دەخوات، لەسەر ئەوە كە قسەو بیروڕای بیبڕوایەكان دژیەك و پێكەوە ناكۆكە، دواتر هەڕەشەیان لێدەكات بە ناوونیشانی درۆزنانی بێ ئاگا لەسەر بێبڕواییان بە ڕۆژی دوایی و، پەلەكردنیان لە هاتنی ڕۆژی دوایی، یاخود هاتنی سزا.

پاشان خوا باسی پارێزكارانی كردوە، كە لە چ نازو نیعمەتێكی خۆشدا دەبن و، بە چوار سیفەتی گەورەو گرنگیشیان پێناسەیان دەكات، كە بەهۆی ئەو سیفەتانەیانەوە، تووشی ئەو سەرەنجامە پڕخێرو خۆشییە بوون، چوار سیفەتەكانیش:

١- چاكەكاریی، چاكەكاریی هەم بە مانای چاك خواپەرستن، هەم بە مانای لەگەڵ خەڵكدا چاكەكاربوون، دێ.

٢- كەم خەوتن لەشەوداو شەو بێداریی و، خواپەرستیی.

٣- داوای لێبوردنكردن لە خوا، لە كاتی پێش بەرەبەیاندا لە سەحەر، واتە: پێش ئەوەی شەبەقی بەیانی بدات.

٤- ماڵ و سامان بەخشین بە خەڵكی سواڵكەر كە داوا دەكات و، بە خەڵكی بێ بەش كە شەرم بە خۆیەو داوا ناكات.

دواییش خوا ﷻ باسی نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی خۆی و، نیشانەو بەڵگەکانی ڕاستیی هەبوونی زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت دەکات، هەم لە زەمینداو، هەم لە خودی مرۆڤاندا، هەروەها باسی ئەو ڕاستییەش کراوە کە بژیوی مرۆڤ لە ئاسمانەوە دابین دەکرێ.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ سوێند دەخوات بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی، کە ئەوەی بەڵێنیان پێ دەدرێ، یاخود هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێ، ڕاستە، هەروەك چۆن قسەو ئاخاوتنی ئەوان، شتێکی ڕاست و سەلمێنراوو نکووڵیی لێ نەکراوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا
تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ
مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ
هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ
وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ
﴿١٧﴾ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ
﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ
لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سوێند بە بایە پڕژو بڵاوکەرەوەکان بە بڵاوکردنەوە ﴿١﴾ ئنجا سوێند بە (هەورە) قورسایی هەڵگرەکان ﴿٢﴾ ئنجا سوێند بە (کەشتییە) بە ئاسانیی ڕۆییشتووەکان بە دەریادا ﴿٣﴾ ئنجا سوێند بە (فریشتە) کار دابەشکەرەکان ﴿٤﴾ بە دڵنیایی ئەوەی گفتتان پێدەدرێ ڕاستە ﴿٥﴾ هەروەها سزاو پاداشت (لە ڕۆژی دوایی دا) دێتە دی ﴿٦﴾ سوێندیش بە ئاسمانی خاوەن ڕێیەکان ﴿٧﴾ بێگومان ئێوە (ئەی بێبڕواینە!) لە قسەیەکی ناکۆك و دژیەك دان ﴿٨﴾ کەسێك کە (لە هەق) لادرابێ لێی (لە بڕواهێنان بە ڕۆژی سزاو پاداشت) لادەدرێ ﴿٩﴾ لە گۆترە درۆکەران بە کوشت بچن ﴿١٠﴾ ئەوانەی لە (باتڵاغی) بێ ئاگاییدا (نغرۆ)ن ﴿١١﴾ (بە نکووڵیلێکردنەوە) دەپرسن: ڕۆژی سزاو پاداشت کەنگێیە؟ ﴿١٢﴾ ئەو ڕۆژە کە لەسەر ئاگر سزا دەدرێن (دەسووتێنرێن) ﴿١٣﴾ (پێیان دەگوترێ:) ئازارەکەتان بچێژن! ئەمە بوو کە پەلەتان لێدەکرد ﴿١٤﴾ بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخ و بێستان و کانیی و سەرچاوان دان ﴿١٥﴾ وەرگری ئەوەن کە پەروەردگاریان پێیداون (لە سۆنگەی ئەوەوە کە) بە دڵنیایی ئەوان پێش ئەوە چاکەکار بوون ﴿١٦﴾ تەنیا کەمێك لە شەوگار دەنووستن ﴿١٧﴾ (دوای بەسەربردنی شەوگار بە خواپەرستی،ی) بەرە بەیانانیش داوای لێبوردنیان (لە خوا) دەکرد ﴿١٨﴾ لە ماڵ و سامانەکەنیشیاندا ماف هەبوو بۆ (هەژاری) داواکەرو (ئاتاجی) بێبەش ﴿١٩﴾ لە زەویشدا بەڵگەو نیشانە هەن (لەسەر ڕاستیی ڕۆژی دوایی) بۆ دڵنیایان (لە بڕوایاندا) ﴿٢٠﴾ هەروەها لە خودی خۆشتاندا ئایا نابینن؟ ﴿٢١﴾ بژیویشتان لە ئاسمانییەو، ئەوەش کە بەڵێنتان پێدەدرێ ﴿٢٢﴾ (سوێند) بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی، ئەوە (بەڵێنی خوا بە هاتنی ڕۆژی قیامەت) ڕاست و چەسپاوە وەك چۆن ئێوە دەدوێن ﴿٢٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلذَّٰرِيَٰتِ)، کۆی (ذَارِيَةً)یە، (ذَارِيَة) واتە: بڵاوکەرەوەو ڕامالْکەرو پەرژو بڵاوکەر، (ذَرَتْهُ الرِّيحُ تَذْرُوهُ، وَتَذْرِيهِ)، واتە: با بڵاویکردەوەو، بڵاوی دەکاتەوە (تَذْرُوهُ وَتَذْرِيهِ) هەردووکیان هاتوون واتە: پەرژو بڵاویکرد (ذَرَتِ الرِّيحِ التُّرَابَ وَغَيْرَهُ: سَفَتْهُ، ذَرَوْتُ الشَّيءَ: طَيَّرْتُهُ وَأَذْهَبْتُهُ)، بایەکە گڵەکەی، یاخود غەیری گڵەکەی پەرژو بڵاوکردەوە ڕا یماڵی (سَفَتْهُ الرِّيحُ) واتە: بایەکە ڕایماڵی پەرژو بڵاویکردەوە (وَذَرَوْتُ الشَّيءَ)، واتە: شتەکەم فڕاندو لامبردو بڵاومکردەوە.

(وِقْرًا): (الوِقْرُ: الحِمْلُ للحِمَارِ وَالبَغْلِ، كَالْوَسْقِ لِلبَعِيْرِ) وشەی (وِقْر): بۆ گوێدرێژو بۆ ئێستر دەگوترێ (وِقْر) واتە: قورساییەك بارێکی قورس، هەروەك بۆ حوشتر دەگوترێ: (وَسْق): لە زمانی عەرەبییدا بە باری حوشتر دەگوترێ: (وَسْق)، بەڵام بە باری کەرو ئێستر دەگوترێ: (وِقْر) هەردووکیشیان بە مانای باری قورس دێن.

(يُسْرًا)، (اليُسْرُ: ضِدُّ العُسْرِ، وَتَيَسَّرَ وَاسْتَيْسَرَ كَذَا: تَسَهَّلَ)، (يُسْر) پێچەوانەی (عَسر)ە، (عُسر) یانی: قورس، (يُسْر)، یانی: ئاسان، دەگوترێ: (تَيَسَّرَ وَاسْتَيْسَرَ كَذَا) واتە: ئەو شتە ئاسان بوو، سێنابوو.

(ٱلدِّينَ)، (الدِّيْنُ: الجَزَاءُ، غَيْرَ مَدِيْنِيْن: غَيْرَ مَجْزِيِّين)، وشەی (دِيْن) بە مانای سزاو پاداشتە، کەواتە: کە لە سوورەتی (الواقعة)دا کە دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ٨٦﴾، (أي: غَيْرَ مَجْزِيين)، واتە: ئەگەر ئێوە سزاو پاداشت نادرێنەو، دەشگونجێ لەوێدا (مَدِيْنِيْن) بە مانای (خَاضِعِيْن)، ئەگەر ئێوە ملپێکەچکراونین، فەرموون ڕووحەکە بگێڕنەوە بۆ جەستە، کاتێك خوا دەیەوێ ئەو ڕووحە لەو جەستەیە بێنێتە دەر.

(لَوَٰقِعٌ)، واتــە: ڕوودەدا، (الوُقُــوعُ: ثُبُـوتُ الـشَّيءِ وَسُـقُوطُه)، (وقــوع): بریتیــە لــە چەسپانی شتێك و، بەربوونـەوەی شتێك، (الوَاقِعَـةُ: لَا تُقَـالُ إلاَّ فــي الشِـدَّةِ وَالمَكْـرُوه)، (وَاقِعَـة): تەنیـا بـۆ شـتێك کـە سـەختبێ و، شـتێکی ناخۆشـبێ، بەکاردەهێـنرێ، واتـە: ڕووداوێـك کـە ڕوودەدات.

(ذَاتِ ٱلْحُبُكِ)، یـانی: (ذَاتِ الطَّرَائِـق)، خـاوەن ڕێیـەکان، دەگوتـرێ: (بَعِـيْرٌ مَحْبُـوك القَـرى، أي: الظَّهْـر) بـە حوشـترێك کـە پشـتی پتـەوو قاییـم بـێ وای پـێ دەگوتـرێ، (قَـرَى) بــە مانــای (ظَهْـر) دێ، (وَالإِحْتِبَـاكُ: شَـدُّ الإِزَار)، (احْتِبَـاك): بـەوە دەگوتـرێ کەسـێك پشـتێنەکەی چـاك ببەسـتێ، یاخـود تونـدو تۆڵـکردن.

(مُّخْتَلِفٍ)، (الخِـلاَفُ أَعَـمّ مِـنَ الضِـدِّ، لأَنَّ كُلَّ ضدَّيْـنِ مُخْتَلِفَـانِ، وَلَيْـسَ العَكْـسَ، ثُـمَّ اسْـتُعِيرَ لِلْمُنَازَعَـةِ)، وشـەی (خِـلاَف) گشـتیترە لـە (ضِـدّ) یـانی: دژ، هەمـوو دوو شـتی پێکـەوە دژ، لێـك جیـان، بـەڵام مـەرج نیـە هەمـوو دوو شـتی لێـك جیـا، دژی یەکدیـی بـن، بـۆ وێنـە: شـیرو ماسـت لێـك جیـان، بـەڵام دژی یەکـدی نیـن، بـەڵام ڕەش و سـپیی دژی یەکدیـن، تاریکیـی و ڕووناکیـی دژی یەکدیـن، دوایـی وشـەی (خِـلاَف) خوازراوەتـەوە بـۆ ناکۆکیـی، لێرەدا (مُخْتَلِفَ) یـانی: جیـا و جـۆراو جـۆر، یـان دژیـەك.

(يُؤْفَكُ عَنْهُ)، واتــە: لێــی لا دەدرێ، (الإِفْـكُ: كُلُّ مَـصْرُوفٍ عَـنْ وَجْهِـهِ الَّـذِي يحِـقُّ أَنْ يَكُـونُ عَلَيْـهِ)، (إِفْـك): بریتیـە لـە هـەر شـتێك کـە لـەو ڕووەی پێویسـت بـێ لەسـەریبێ، لێـی لابـدرێ، (المأفُـوكُ: مَـصْرُوفٌ عَـنِ الحَـقِ إلى الباطِـلِ)، (مَأْفُـوك) واتـە: شـتێك کـە لـە هـەق بـەرەو ناهـەق لادرابـێ.

(قُتِلَ)، یـانی: بەکوشـت بچـێ، دەڵـێ: (لَفْـظُ قُتِـلَ: دُعَـاءٌ عَلَيْهِـمْ، وَمِـنَ اللـهِ إِيْجَـادُ ذَلِـك)، (قُتِـلَ) یـانی: بـە کوشـت بچـێ، هەندێکیـش گوتوویانـە: یانـی: (لُعِـنَ) نەفرینـی لـێ بکـرێ، یـان (طُـرِدَ) دوور بخرێتـەوە، هەرچـۆن بـێ لێرەدا (قُتِـلَ) بـە مانـای نـزاو تووکـە لێیـان کـراوە، بـەڵام کـە خـوا تـووك لـە کەسـێك بـکات، یـانی: ئـەو شـتە دێنێتـە دی، ئێمـە داوا لـە خـوا دەکەیـن، ئـەو شـتەمان بـۆ بێنێتـە دی، بـەڵام کـە خـوای

باڵادەست شتێك بە شێوەی تووك و نزا بفەرموێ، مانای وایە شتەكە دێنێتە دی، خوا كەس نیە داوای لێ بكات.

(ٱلْخَرَّٰصُونَ)، (الخَرصُ: حَرْزُ الثَّمَرَةِ، وَقِيْلَ: الخَرصُ: الكَذِبُ)، (خَرْصُ) بە كوردیی دەڵێین: قرساندن، بریتیە لەوەی میوەی ئەو درەختە، یان ئەو باخە بخەمڵێنرێ چەندە؟ هەندێكیش گوتوویانە: (خَرْص) بە مانای درۆ دێ، بە كوردیی دەڵێین: لە گۆترە، لە گۆترە قسەكردن، بۆیەش من (ٱلْخَرَّٰصُونَ)م، بە گۆترەكەران مانا كردوە.

(غَمْرَةٍ)، (الغَمْرُ: إزَالَةُ أَثَرِ الشَّيءِ، وَالغَمْرُ: المَاءُ الكَثِيْر، وَالغَمْرَةُ: الشِّدَّةَ، وَغَمَرَهُ المَاءُ: عَلَاهُ)، (غَمْرَة) لە (غَمْر)وە هاتوە (غَمْر): بریتیە لە لابردنی شوێنەواری شتێك، كە ئاوی بەسەر وەربكەی، هەروەها (غَمْر) بە مانای ئاوی زۆر دێ، (غَمْرَة) بە مانای سەختیی و نارەحەتیی دێ، دەگوترێ: (غَمَرَه المَاءُ)، واتە: ئاوی چۆسەرێ، ئاوەكە وەسەری گەڕا (فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ)، لە باتڵاغی نەفامیی و، بێ ئاگایی دان.

(سَاهُونَ)، (السَّهُو: خَطَأٌ عَنْ غَفْلَةٍ)، (سَهُو): بریتیە لە بەهەڵەداچوون، بەڵام بەهۆی بێئاگاییەوە.

(أَيَّانَ)، (عِبَارَةٌ عَنْ وَقْتِ الشَّيءِ وَيُقَارِن مَعْنَى: مَتَى)، (أَيَّانَ): بریتیە لە كاتی شتێك، بۆیە ماناكەی نیزیكە لە (مَتَى)وە، واتە: كەنگێ ئەوشتە دەبێ، كەی دەبێ؟

(يُفْتَنُونَ)، (أَصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَهَبِ النَّارَ لِتَظْهَر جَوْدَتَه مِنْ رَدَائَتِه وَاسْتُعْمِلَ فِي إدْخَالِ النَّاسِ النَّارَ)، وشەی (فَتْن): لە ئەصڵدا بە مانای ئەوەیە زێڕ بخرێتە نێو ئاگرەوە تاكو زێڕی ساغ، كانزایەكی بە نرخ، لەوەی كە لەگەڵی تێكەڵكراوە لە كانزای دیكە، مس و ئاسن و ئەوانە دەربكەوێ، بۆیە كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (زێڕی سوور، یان زێڕی ساغ لە ئاگر ناترسێ)، زێڕ هەرچەند بیسوتێنی

مـادام زێـڕی سـاغبێ کـەم نـاکات، بـەڵام ئەگـەر شـتی دیکـەی لەگـەڵ تێکەڵکرابـێ، کانزایـەکانی دیکـە لێـی جیادەبنـەوە، بـەڵام دوایـی وشـەی (فَـتْن) بەکارهێـنراوە بـۆ خسـتنە نێـو ئاگـری خەڵکـەوە، کەواتـە: ﴿يُفْتَنُونَ﴾ یـانی: (يُعَذَّبُـوْن) یـان (يُحْرَقُـون)، دەسـووتێنرێن و سـزا دەدرێـن.

﴿يَهْجَعُونَ﴾، (الهُجُـوعُ: النَّـوْمُ لَيْـلاً) (هُجُـوع): بـە مانـای خەوتنـە بـە شـەو، (وَالتَّهْجَـاعُ: النَّوْمَـةُ الخَفِيْفَـة) (تَهْجَـاع): بریتیـە لـە نوسـتنێکی کـەم، سـەرخەو شـکاندن.

﴿وَبِالْأَسْحَارِ﴾، (جَمْـعُ سَـحَرْ، قُبـلَ الصُّبْـحِ)، (أَسْـحَار): کـۆی (سَـحَر)ە، پێـش بەرەبەیـان واتـە: پێـش ئـەوەی کـە نوێـژی بەیـانی ببـێ، پێـش دەرکەوتنـی سـپێدەی بەیـانی.

﴿وَالْمَحْرُومِ﴾، واتـە: بـێ بەشـکراو، (حَرَمَـهُ الـشَّيءَ: لَـمْ يُعْطِيـهِ، يَحْرِمُـهُ، حُرْمَـاً، وَحِرْمَـاً، وَحِرْمَـةً، وَحَرِيْمَـةً، وَحِرْمَانَـاً)، (حَرَمَـهُ الـشَّيءَ) واتـە: شـتەکەی نەدایـە بـێ بەشـیکرد، ئنجـا دەگوتـرێ: (يَحْرِمُـهُ حِرْمَـاً)، بـێ بەشـی دەکات، بـێ بەشـکردن، هەروەهـا (حَرْمَـاً وحِرْمة)یـش دەگوتـرێ: (رْمَـةً وَحَرِيْمَـةً وَحِرْمَانَـاً)، هەمـووی ئەوانـە چاوگـن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

مانای گشتیی ئەو بیست و سێ (٢٣) ئایەتە موبارەکە، خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا، سەرەتا بە ناوی خوا هێنان دەست پێدەکات و، دەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کە هەمیشە گوتوومانەو دووبارەی دەکەینەوە، واتە: ئەو کارەم دەست پێدەکەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کە دەڵێی ئەو کارە بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە دەست پێدەکەم، دەبێ چوار واتا لە عەقڵ دڵی خۆتدا ئامادە بکەی:

١- ئەو کارە بە ناوی خواوە دەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی هەر کەسێکی دیکە.

٢- ئەو کارە بۆ ڕازییکردنی خوا دەکەم، نەك بۆ هێنانە دی هەر ئامانجێکی دیکە.

٣- ئەو کارە بەپێی بەرنامەی خوا ﷻ دەکەم.

٤- ئەو کارە بە ئاسانکاریی خواو، بە توانایەك کە خوا بۆم دەڕەخسێنێ دەیکەم، نەك بە شان و شەوکەت و توانای خۆم یان کەسێکی دیکە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ٤﴾، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شیی دەکەینەوە، زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەن بە گشتیی:

أ- هەندێکیان دەڵێن: ئەم چوارە کە خوا سوێندی پێخواردوون، چوار شتی جیان.

ب- بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: هەر چواریان یەك شتن، ئەوانەی دەڵێن: چوار شتی جیان، من، زیاتر ئەو ڕایەم گرتوە، ئاوا لێکیان داونەوە:

﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾، سوێند بەوانەی بڵاودەکەنەوە بە بڵاوکردن، کە مەبەست پێی بایەکانە، ئەو بایانەی بڵاودەکەنەوە.

﴿ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴾، ئەوانـەی کـە قورسـایی هەڵدەگـرن، کـە مەبەسـت پێـی هەورەکانـە، واتـە: سـوێند بەقورسـایی هەڵگـرەکان.

﴿ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴾، سـوێند بـە ڕۆیشـتووەکان بـە ئاسـانیی، واتـە: ڕۆیشـتووەکان بـە دەریـادا بـە ئاسـانیی، کـە مەبەسـت پێـی کەشـتییەکانە.

﴿ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ﴾، سوێند بە دابەشکەرەکانی کار، کە فریشتەکانن.

هەندێکیشـیان گوتوویانـە: هـەر چواریـان مەبەسـت پێیـان بایەکانـە: سـوێند بـەو بایانـەی شـت پـرژو بـڵاو دەکەنـەوە، بـە تایبـەت هەڵمـی ئـاو پـرژو بڵاودەکـەن و، دوایـی ڕایاندەماڵـن هەوریـان لـێ دروسـت دەکـەن، ﴿ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴾، سـوێند بـەو بایانـەی هـەورە قورسـەکان هەڵدەگـرن، ﴿ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴾، سـوێند بـەو بایانـەی هـەورەکان دەڕۆێنـن، بـە نەرمیـی دەڕۆن، ﴿ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ﴾، سـوێند بـەو بایانـەی دوایـی هـەورەکان دەبەنـە شـوێنەکان و لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەزرەدا، ئـاو دادەبارێنـن بەسـەر زەویـدا، سـوێند بـەو چـوار شـتانە.

﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوەی بەڵێنتـان پـێ دەدرێ، ڕاسـتە، (**تُوعَـدُونَ**) دەشـگونجێ بـە مانـای گفـت و بەڵێـن نەبـێ، بەڵکـو بـە مانـای هەڕەشـەکردن بـێ، لـە (**أوعـد**)وە هاتبـێ، واتـە: ئـەوەی هەڕەشـەتان پـێ لـێ دەکـرێ ڕاسـتە، یـانی: چەسـپاوەو دێتـە دی.

﴿ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ﴾، سزاو پاداشتیش دەچەسپێ و دێتە دی.

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡحُبُكِ ﴾، سـوێند بـە ئاسـمانی خـاوەن ڕێ و بـان، یاخـود: سـوێند بـە ئاسـمان کـە ڕێ و بانـەکانی هـەن، یاخـود: سـوێند بـە ئاسـمانی خـاوەن ڕێك و پێکیـی، یان: سـوێند بـە ئاسـمانی جـوان چـنراو، هەمـوو ئـەو مانایانـەی هـەن، سـوێند بـەو ئاسـمانە.

﴿ إِنَّكُمۡ لَفِي قَوۡلٖ مُّخۡتَلِفٖ ﴾، ئێـوە ئـەی بێبڕوایـیـەکان! لـە قسـەیەکی دژیەکـدان، لـە قسـەیەکی تێکـەڵ و پێکەڵـدان.

﴿ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴾، لادەدرێ لـە بڕواهێنـان بـە ڕۆژی دوایـی، ئـەو کەسـەی لادرابـێ، واتـە: ئـەو کەسـەی لادرابـێ لـە ئیمانیـان بـە ڕۆژی دوایـی، ئـا ئـەوە بـە ڕاستیی لادراوە، هەندێکیـش وایـان لێکداوەتـەوە، لـەو قسـە تێکەڵ پێکەڵـە لا دەدرێ و، بـڕوا بـە ڕۆژی دوایـی دێنـێ و بـڕوا بـە هەقـی چەسـپاو دێنـێ، کەسـێك خـوا لوتفـی لەگەڵـدا کردبـێ و، لـە ڕێـی ناهەقـی لادابـێ و، هێنابێتیـە سـەر ڕێـی ڕاسـت.

﴿ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴾، بە کوشتچن ئەوانەی لە گۆترە درۆ دەکەن.

﴿ الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴾، ئەوانـەی لـە باتڵاغـی نەزانیـی و بێئاگاییـدا، بێئـاگا و سەراسـیمەن.

﴿ يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ ﴾، دەپرسـن بـە نکوولّیلێکردنـەوە دەپرسـن، ڕۆژی سـزاو پاداشـت کەنگێیـە؟

﴿ يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ ﴾، ئەو ڕۆژەی لەسەر ئاگر دەسووتێنرێن و سزا دەدرێن.

﴿ ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾، پێیـان دەگوتـرێ: ئازارەکەتـان بچێـژن ئـەوە بـوو کـە پەلەتـان لـێ دەکـرد.

ئنجا دوای ئەوان خوا ﷻ باسی پارێزکاران دەکات.

﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴾، بـە دڵنیایـی پارێـزکاران لـە نێـو بـاغ و، بێسـتانەکان و، لـە نێـو کانیـی و سـەرچاوان دان، ئەوانـەی پێشـێ لـە نێـو ئاگـردا، دەسـووتێنرێن و سـزا دەدرێـن، ئـەو ئاگـرەی پەلـەی لـێ دەکـەن لـە دنیـادا، لـە ڕۆژی قیامەتـدا یەخەیـان دەگـرێ، بـەڵام پارێـزکاران لـە نێـو بـاغ و بێسـتان و گـوڵ و گوڵـزارو کانیـی و سـەرچاوەی زۆردان، ﴿ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ ﴾، ئـەوەی پەروەردگاریـان پێیـداون وەری دەگـرن، واتـە: دەبێتـە موڵکیـان، یاخـود لێـی ڕازییـن لـەوەی پەروەردگاریـان پێیـان دەدات.

﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بـە دڵنیایـی ئـەوان لـەوەو پێـش چاکەکاربـوون، واتـە: چاکەکاربـوون لـە خواپەرستییانداو چاکەکاربـوون لەگـەڵ خەڵکـدا.

﴿ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴾، عادەتیـان وابـوو بـە شـەوێ کـەم دەخەوتـن، واتـە: شـەو بێداربـوون، بەڵـێ بـەڕۆژێ خەریـکی کار بـوون، بەشـەوێش بێداربـوون کەمێـکی نەبـێ، کـە پشـوویان تیـدا دەدا.

﴿ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾، لەبـەرە بەیانیانیشـدا، واتـە: پێـش ئـەوەی بەیـان ببـێ، پێـش ئـەوەی شـەبەقی بەیـانی بـدات، داوای لێبوردنیـان لـە خـوا دەکـرد، نـەك لەبـەر ئـەوەی چـوار ڕکات نوێـژی شـەو نوێژیانکـردوە، پێـی لـە خۆیـان بایـی بـن، بەڵکـو داوای لێبوردنیـان لـە خـوا دەکـرد، دەیانگـوت: خوایـە! ئـەوەی کردوومانـە شایسـتەی تـۆ نیـە، بـەڵام ئێمـە ئەوەنـدە لـە توانامانـدا هەیـە.

﴿ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴾، لـە مـاڵ و سامانیشـیاندا مـاف هەبـوو بـۆ سـواڵکەرو بـۆ بێبەشـیش، سـواڵکەر ئەوەیـە داوا دەکات، بێبـەش ئەوەیـە بـۆ خـۆی داوا نـاکات، ڕووی نایـەت، بـەڵام دەبـێ مـرۆڤ فکـرت پـێ بشـکێ.

﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴾، لـە زەویـدا نیشـانە هـەن بـۆ کەسـانێك کـە دڵنیـان لـە ئیمانیانـدا، نیشـانە هـەن لەسـەر ئـەوەی ئـەم دنیایـە بـێ خـاوەن نیـەو، ئـەم ژیانـە ژیـانی دیکـەی بـەدوادا دێ، زینـدوو بوونـەوە هەیـە، سـزاو پاداشـت هەیـە.

﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾، لـە خۆشـتاندا ئایـا نابینـن؟ لـە خۆشـتاندا نیشـانە هـەن، لەسـەر ئـەوەی دنیـا شـاری بـێ خـاوەن نیـە، لەسـەر ئـەوە کـە زینـدوو کرانـەوەو سـزاو پاداشـت هەیـە، ﴿ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ ﴾، بژیـوی ئێـوەش لە ئاسـمانێوەیە.

﴿ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾، ئـەوەش کـە بەڵێنتـان پـێ دەدرێ، یـان هەڕەشـەتان پـێ لـێ دەکـرێ، ئەویـش لـە ئاسـمانەوەیە، ئەگـەر بەهەشـتەیان دۆزەخـە، ئـەو بژیـوەش کـە لـە ئاسـمانەوە دێ، ئـەو ئاوەیـە کـە دادەبـارێ و، ئـەو جـۆرە تیشـکانەن کـە دێـن.

لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾، ئـەوەی کـە بەڵێنتـان پێـدەدرێ یـان هەڕەشـەتان پـێ لـێ دەکـرێ.

﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ﴾، سـوێند بـە پـەروەردگاری ئاسـمان و زەوی هەقـە، دەگونجـێ، ﴿ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾، نیهـاد (مُبْتَـدأ) بـێ، ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ﴾، گـوزارە (خَبَر)کـەی بـێ، دەشـگونجێ بفەرمـوێ: بژیـوی ئێـوە لـە ئاسـمانە و ئـەوەش کـە بەڵێنتـان پێـدەدرێ، یـان هەڕەشـەتان پێـی لـێ دەکـرێ، ئەویـش هـەر لـە ئاسـمانە.

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، سـوێند بـە پـەروەردگاری ئاسـمان و زەوی، ﴿ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ﴾، ئـەم قورئانـە هەقـە، یـان زینـدوو کرانـەوەو سـزاو پاداشـت هەقـە، ﴿ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴾، وەك چـۆن ئێـوە قسـە دەكـەن، واتـە: وەك چـۆن قسـەکردنی ئێـوە شـتێکە چەسـپاوەو نکووڵیـی لـێ نەکـراوە، بـە هەمـان شـێوەش سـزاو پاداشـتی خـواش ﷻ هەقـەو دێ و، شـتێکی چەسـپاوە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە پرژو بڵاوکەرەوەکان و، قورسایی هەڵگرەکان و، بەسێنایی ڕۆیشتووەکان و، کاردابەشکەرەکان، لەسەر ڕاستبوونی بەڵێنی هاتنی قیامەت و هاتنە دی، سزاو پاداشت بۆ مرۆڤەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ٤ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ٥ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ٦﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾، (و) لێرەدا (واو القَسَمْ)ە، بۆ سوێندە، واتە: سوێند بە پرژو بڵاوکەرەوەکان بە پرژو بڵاوکردنەوە، (ذَرۡوٗا ) لێرەدا دەبێتە چاوگ، یاخود دەبێتە بەرکاری ڕەها (**مَفْعُول مُطْلَق**)، یانی: (**وَالذَّارِيَاتِ الَّتِي تَذْرُوا ذَرْوًا**)، سوێند بەو پرژو بڵاوکرانەی کە شت پرژو بڵاودەکەنەوە بە پرژو بڵاوکردنەوەیەکی جێی سەرنج، یان سەرنجڕاکێش، دیارە پێشتریش باسمان کرد، زانایان لە بارەی ئەم چوار سوێندەوە: (**الذَّارِيَات، الحَامِلات، الجَارِيَات، المُقَسِّمَات**)، دوو ڕایان هەن بە گشتیی، کە دوایی دەیانخەینە ڕوو، بەڵام (**ذَارِيَات**)، زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە مەبەست پێ بایەکانە، ئەو بایانەی شت ڕادەماڵن و پرژو بڵاودەکەنەوە، (**الرِّيَاحُ الَّتِي تَنْشُرَ التُّرَابَ وَالأَشْيَاءَ**)، ئەو بایانەی کە گڵ و خۆڵ و شتی دیکەش پرژو بڵاودەکەنەوە، وشەی (**ذَارِيَات**)، کۆی (**ذَارِيَة**) یە، بەڵام وشەی (**رِيح**) کە بە (**رِيَاح**) کۆدەبێتەوە (**مُؤَنَث**)ە، ئنجا (**الرِّيْحُ الذَّارِيَة**)، ئەو

بایەی پرژو بڵاودەکاتەوە، (**الرِّيَاحُ الذَّارِيَات**)، ئەو بایانەی بڵاودەکەنەوە، کەواتە: هەم (**ذَارِيَات**)، هەم (**حَامِلات**)، هەم (**جَارِيَات**)، هەم (**مُقَسِّمَات**)، هەر چواریان ئاوەڵناوی وەسفکراوێکی قرتێنراون، ئنجا ئایا ئەو وەسفکراوە چییە؟ وەك گوتمان: دوو ڕا هەن:

**یەکەم:** ڕایەکیان دەڵێ: ئەوانە هەر کامیان شتێکی سەربەخۆن: (وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ) سوێند بە بایە پرژو بڵاوکەرەوەکان.

**٢)-** ﴿ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴾، هەروەها سوێند بە هەڵگرانی بارە قورسەکان، ئەوانەی باری قورس هەڵدەگرن، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێیان هەورەکانە، ئەو هەورانەی بە ملیۆنان تەن ئاو هەڵدەگرن.

**٣)-** ﴿ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴾، هەروەها سوێند بە ڕۆیشتووەکان بە ئاسانیی، ﴿ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴾، (**جَارِيَات**)یش کۆی (**جَارِيَة**)یە، وەك چۆن (**حَامِلات**) کۆی (**حَامِلَة**)یە، (**جَارِيَة**) ئەوەی دەڕوا، (يُسۡرٗا)، واتە: بە ئاسانیی، زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی کەشتییەکانە، (**الجَارِيَةُ: السّفن الَّتِي تَسِيْرُ فِي البَحْرِ بِيُسْرٍ**)، ئەو کەشتییانەی بە ئاسانیی بە دەریادا دەڕۆن.

**٤)-** ﴿ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ﴾، سوێند بە دابەشکەرەکانی کاروبار، یانی: (**المَلائِكَةُ المُوَزِّعَةُ للأمُوْر**)، سوێند بەو فریشتانەی کە کاروبار دابەش دەکەن، زۆربەی زانایان ڕایان وایە، کە ئەم ڕایە ڕاسترە.

**دووەم:** هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: ئەم چوارە هەر چواریان بریتین لە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراو واتە: یەك شت، کە بریتیە لە بایەکان وبەمجۆرە تەفسیری ئایەتەکان دەکەن: ﴿ وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ﴾، سوێند بەو بایانەی پرژو بڵاو دەکەنەوە، یانی: بەشەکانی هەڵمی ئاو بڵاودەکەنەوە، یاخود ئەو بایانەی بە گشتیی شت پرژو بڵاو دەکەنەوە، ﴿ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴾، سوێند بەو بایانەی باری قورس هەڵدەگرن، کە بریتین

لە هەورەکان، چونکە هەورەکان بایەکان دەیانجوولێنن، ﴿ فَٱلْجَٰرِيَٰتِ يُسْرًا ﴾، هەروەها سوێند بەو بایانەی بە ئاسانیی دەڕۆن، ﴿ فَٱلْمُقَسِّمَٰتِ أَمْرًا ﴾، دیسان بەو بایانەی کاروبار دابەش دەکەن، کاروبارەکانیش، چ هەورەکان، کە دابەشیان دەکەن، چ تۆزو خۆڵ، یان درەختەکان و ڕووەکەکان کە موتووربەیان دەکەن، گرنگ ئەوەیە هەندێکیان گوتوویانە: ئەم سوێند پێخوراوانە، هەر چواریان یەك شتن، کە بایەکانن و چوار سیفەتی جیاوازیان هەن: هەم شت ڕادەماڵن، هەم باری قورس هەڵدەگرن، هەم بە ئاسانیی دەڕۆن، هەم دەبنە هۆی دابەشکردنی بژیوو کاروبارەکان، ئەوەی خوای پەروەردگار پێی سپاردوون.

بەڵام ڕای یەکەمیان بەهێزترە، کە مەبەست پێیان چوار شتی سەربەخۆ بێ: بایەکان و هەورەکان و کەشتییەکان و فریشتەکان سەلامی خوا لە فریشتەکان بێ.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ بڵێ: باشە ئەمانە کە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراون، بۆچی خوا ﷻ وەسفکراوەکەی ڕوون نەکردۆتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بۆ ئەوەی مانایەك زیاتر هەڵبگرێ، ئەگەر خوا فەرمووبای: (**وَالرِّيَاحِ الذَّارِيَاتِ ذَرْوًا**)، ئەو کاتە دەمانزانی کە بایەکانن، هەروەها هی هەورەکان و کەشتییەکان و فریشتەکانیش.

بەڵام کە خوا ﷻ وەسفکراوەکەی قرتاندوە و تەنیا سیفەتەکەی باسکردوە، ئەو کاتە بۆ وەسفکراوەکە زەین بە لای هەر شتێکی دیکەدا دەچێ و مانای ئایەتەکە فراوانتر دەبێ.

ئنجا ئەمانە هەر چواریان سوێند بوون و وشەی (ذَرْوًا) وەك گوتمان: یان چاوگە، یاخود بەرکاری ڕەهایە (**مَفْعُول المُطْلَق**)یە، بەڵام (وِقْرًا) دیارە کە بەرکارە (**مَفْعُول بِهِ**) و (يُسْرًا) یش حاڵە، واتە: (**فَالجَارِيَات الَّتِي تَسِيرُ يُسْرًا**)، ئەو ڕۆیشتووانەی بە ئاسانیی دەڕۆن، ﴿ فَٱلْمُقَسِّمَٰتِ أَمْرًا ﴾، (أَمْرًا)یش دیسان دەبێتە

بەرکار (**مَفْعُول بە**)، ئەو فریشتانەی یان ئەو بایانەی کە کاروبارەکان دابەش دەکەن، وەڵامی ئەو چوار سوێندە چییە؟ ئەمانە هەموویان (**مُقْسَمٌ بِە**) سوێند پێخوراون، ئەدی سوێند لەسەر خوراو (**مُقْسَمٌ عَلَيْە**)ەکە چییە؟ لە ئایەتی پێنجەم دا دێ.

**٥)-** ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴾، ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ ڕاستە، سزاو پاداشت دادەکەوێ و دێتە دی، هەڵبەتە وشەی (تُوعَدُونَ) دەگونجێ بە مانای بەڵێن (**وَعَدَ**) بێ و لە (**وَعَدَ**)ەوە هاتبێ، واتە: ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ و گفتتان پێ دەدرێ، دەگونجێ لە (**وَعَدَ**)وە هاتبێ، دەشگونجێ لە (**أَوْعَدَ**)ەوە هاتبێ، واتە: ئەوەی کە هەڕەشەتان پێی لێدەکرێ، ئەی بێبڕوایەکان! ڕاستە، ئنجا ئەگەر (تُوعَدُونَ)، لە هەڕەشە (**وَعِيْد**)ەوە هاتبێ، ئەو کاتە دوێنراوەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکانن، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی گفت و بەڵێن بێ، دوێنراوەکان گشتیین و زیاتریش وا پێدەچێ کە مەبەست گشتیی بێ، بڕوادارو بێبڕوا، وشەی: (لَصَادِقٌ) لە ڕاستییدا یانی: ڕاستگۆ، بەڵام ئەمە وەك: ﴿ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۝٧ ﴾القارعة، کە ژیانەکە ڕازی نیە، یانی: ئەو ژیانەی خاوەنەکەی لێی ڕازییە، کەواتە: ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴾، ئەوەی هەڕەشەتان پێی لێدەکرێ، یان گفتتان پێ دەدرێ ڕاستە، واتە: گفت دراوەکە، یان هەڕەشە پێکراوەکە ڕاستەو دێتە دی، (إِنَّمَا) [١] دوو وشەیە (**إِنَّ**) لەگەڵ (**مَا**)، نەك یەك وشە بێ، (**إِنَّ**) بۆ جەختکردنەوەیە واتە: بە دڵنیایی، (**مَا**) یانی: (**الَّذِي**) یانی: ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، یاخود هەڕەشەتان پێی لێدەکرێ، ڕاستە.

**٦)-** ﴿ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴾، بەدڵنیاییش سزا و پاداشت دا کەوتووە.

---

(١) (إنما) لە موصحەف دا هەرچەندە ئاوا نووسراوە، بەڵام بەپێی ڕەوتەکان (سیاقات) دەزانین کام لە دوو مانایەکانی هەیە!

(دیـن) لـەم ڕەوتـە (سـیاق)ەدا یانـی: (جـزاء) کـە بەکوردیـی هـەردووك وشـەی: سـزا و پاداشـت، دێنـە بەرانبـەری (واقع)یـش لـە (وقـع)ەوە هاتـوە، یانـی: (حـدث وسـقط) ڕوویـدا و کـەوت، یانـی: سـزا و پاداشـت بـە پێـی سیسـتمی خـوا و بڕیـاری پێشـووی هاتـووە و دڵنیـا بـن دێ.

## مەسەلەی دووەم:

**سـوێند خـواردنی خـوا ﷻ بـە ئاسـمانی خـاوەن ڕێ و بـان، یـان ڕێـك و پێـك و سسـتماتیك، کـە بیرڕوایـان لـە چاڵـی قسـەو بیروڕایـەکی دژیـەك و جـۆراو جـۆردان و، کەسێکیش لـە بڕواهێنـانی بـە سزاو پاداشـت لاڕێ دەبێ، کـە لـە هـەق لادرابێ و، بـە لاڕێـدا برابـێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾، سوێند بە ئاسمانی خاوەن ڕێگەو بان، یاخود سوێند بە ئاسمانی ڕێك و پێك، یان سوێند بە ئاسمانی جوانچنراو.

٢)- ﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لە قسەیەکی دژیەك و ناکۆکدان، لە قسەیەکدان کە جۆراو جۆرەو لە نێو خۆیدا ناکۆك و دژیەك (متناقض)ە.

٣)- ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾، لێی لادەدرێ ئەوکەسەی لادرابێ، لە چی لا دەدرێ؟ (عَنْهُ) ڕاناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆچی زانایان؟! دوو ئەگەریان بۆ داناون:

أ- یان دەگەڕێتەوە بۆ بڕوا هێنان بە سزاو پاداشت، یان قورئان، یان پێغەمبەری کۆتایی، لا دەدرێ، (مَنْ أُفِكَ)، کەسێك کە لە هەق لادرابێ و، ئەو کەسەی بڕوا نەهێنێ بە ڕۆژی سزاو پاداشت، یان قورئان یان پێغەمبەری خوا، مانای وایە زۆر لاڕێ و سپڵەیەو، لادراوی ڕاستەقینە هەر ئەوە.

ب- یان دەگەڕێتەوە بۆ (قول مختلف)، یانی: لە ڕێی چەوت لادەدرێ کەسێك خوا لوطفی لەگەڵ کردبێ و پاراستنی لەلادان و سەرگەردانیی.

ئنجا با تەماشای هەندێك وردەکاریی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە بکەین:

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴾، (وَٱلسَّمَآءِ ) یانی: ئاسمان، (ذَاتِ ) یانی: خاوەن (صَاحِب، صَاحِبَة)، (ٱلْحُبُكِ ) یان (جَمْعُ حِباك)، مثل (كُتُبْ، كِتَاب)، (كُتُب) كتێبەكان، (كِتاب) كتێبێك، (حِبَاك)یش چنراو، (حُبُك) چنراوەكان، یاخود (حِبَاك) بە مانای ڕێ دێ، (حُبُك) بە مانای ڕێییەكان، دەشگونجێ (حُبُك) كۆی (حَبِكَة) بێ، وەك (طُرق) و (طَرِيْقَة)، (طرق) ڕێییەكان، (طَرِيْقَة) یەك ڕێگا، لە هەردوو حاڵاندا وشەی (حُبُك) لە (حَبْك)ەوە هاتوە، (الحَبْكُ: إجَادَةُ النَّسجِ وَإتْقَان صُنْعِ)، (حَبْك): بە مانای جوان چنین و جوان هۆنینەوەی شتێك و چاك دروستكردنی دێ.

كەواتە: زیاتر وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست لە: (ذَاتِ ٱلْحُبُكِ)، ئاسمانی خاوەن ڕێگاو بان بێ و، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الواقعة) وایە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: ڕاست نیە، [وەك ئێوە دەڵێن ئەی بێبڕوایەكان!]، سوێند دەخۆم بە ڕێگاو شوێنی ئەستێرەكان، بە دڵنیاییش ئەگەر ئێوە بزانن ئەوە سوێندێكی، دەشگونجێ (وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ)، ئاسمانێك كە جوان چنراوەو جوان هۆنراوەتەوە بێ، وەك چۆن قوماشێك و مەبەست پێی: تەونێك و فەڕشێك جوان دەچنرێ و هەر شتە لە شوێنی خۆی دایە، ئەو ئاسمانەش ئاوا چنراوە، وەك شتێك كە دەچنرێ و گوڵ گوڵ دەهۆنرێتەوە، لە هەردوو حاڵانیشدا (حُبُك) لە (حَبْك)ەوە هاتوە (حَبك)، واتە: چاك ڕێك و پێك دروستكردنی شتێك، یاخود چنینی شتێك، بۆچی خوا ﷻ لێرەدا سوێند دەخوات بە ئاسمانی خاوەن ڕێگاو بانەكان؟ تاكو بگونجێ و گونجاوە لەگەڵ ئەوەی دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لە قسەیەكی جۆراو جۆردان، واتە: لە قسەیەكی دژیەك و پێكەوە ناكۆك دان، كە هەندێكی پێچەوانەی هەندێكیەتی، هەندێكی هەندێكی هەڵدەوەشێنێتەوە، وەك چۆن ئاسمان ڕێ و بانی جۆراو جۆری تێدان، قسەكانی ئەوانیش جۆراو جۆرەو دژیەك و پێكەوە ناكۆكن، چ لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ كە جاێك دەیانگوت: جادووگەرە، جارێك دەیانگوت: شاعیرە، جارێك دەیانگوت: كاهینە، جارێك دەیانگوت: شێتە!

ئەو چوار قسانەش هەر چواریان دژی یەكدیین، چونكە ئەگەر شێت بێ ناگونجێ جادووگەربێ و، ئەگەر جادووگەربێ ناگونجێ شاعیر بێ و، ئەگەر شاعیر بێ ناگونجێ شێت بێ!!

هەروەها لە بارەی قورئانیشەوە، قورئانیشیان بە هەمان شێوە تۆمەتبار دەكرد كە هەڵبەستراوە، ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ ۝٤﴾ الفرقان، ئەمە بەس درۆیەكەو هەڵیبەستوە، دەیانگوت: هەڵبەستراوەو، دەیانگوت: جادوویە، دەیانگوت: شیعرەو، دەیانگوت: كەهانەیەو، دەیانگوت: قسەی شێتە، ئەوانەش هەموویان دژی یەكن و پێكەوە ناكۆكن، هەر كامێكیان ئەوەی دیكە هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمۡ لَفِي قَوۡلٖ مُّخۡتَلِفٖ﴾، واتە: ئەی بێبڕوایەكان! لە قسەیەكی دژ یەك دان، ئێوە ئەگەر هەر سەرنجی قسەكانی خۆتان بدەن، كۆی قسەكانی خۆتان بەڵگەیە لەسەر ناڕاستییان هەمیشەش شتی هەق و ڕاست یەكە، دوو كۆ دوو دەكاتە چوار (٢+٢=٤)، بەڵام یەك بڵێ: دەكاتە پێنج، یەك بڵێ دەكاتە شەش، یەك بڵێ دەكاتە سێ، یەك بڵێ دەكاتە هەزار، جۆراو جۆر بوونی ئەنجامەكان، بەڵگەیە لەسەر ناڕاست بوونیان، وەك گوتراوە: لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ، هەقیش ئەوەیە لەگەڵ واقیعدا پڕ بە پێستە، دوو سێوان بێنە لەگەڵ دوو سێوی دیكە كۆیان بكەوە، دەكاتە چوار، واتە: هەق لە واقیعیشدا دەچەسپێ، بەڵام ناهەق ئەوەیە كە میزاقیەتی نیەو لەسەر ئەرزی واقیع ناچەسپێ.

(**يُؤۡفَكُ**)، یانی: (**يُصْرَفُ**)، لێی لادەدرێ، (**الأَفْكُ: الصَّرْفُ وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ فِي الصَّرْفِ عَنِ الخَيْرِ**)، (**أَفْك**): بە مانای لادانەو بەزۆریی بەكاردەهێنرێ بۆ لادان لە خێر بەرەو ڕستەی (**يُؤۡفَكُ عَنۡهُ مَنۡ أُفِكَ**) دوو مانای سەرەكیی هەن:

**مانای یەكەم:** (**يُصْرَفُ عَنِ القُرْآنِ أو الرَّسُولِ مَنْ ثَبَتَ لَهُ الصَّرْفُ الحَقِيْقِي**)، لە ئیمان هێنان بە قورئان یان لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەر ﷺ لادەدرێ، كەسێك كە بە ڕاستیی لادانی بەسەردا لەسەر چەسپی بێ.

**مانـای دووەم:** (**يُـصْرَفُ عَـنْ هَـذَا القَـوْلِ المُخْتَلِـفِ، مَـنْ صُرِفَ فِـي عِلْـمِ اللـهِ تَعَـالَى، وَسَبَقَتْ لَـهُ العِنَايَـة**)، کەسێك لـەم قسـە دژیـەك و ناکۆکـە لادەدرێ، کـە لـە زانیاریـی خـوادا لادرابـێ و، خـوا ﷻ لوتفـی لەگـەڵ کردبـێ [و، لـەو قسـەی وا ناڕێـك و پێـك لایبـداو بیهێنـێ بـۆ ئیـمان هێنـان].

خـاوەنی (**البحـر المديـد فـي تفسـير كتـاب اللـه المجيـد**)[1]، (**إبـن عجيبـة**) لـە تەفسـیرەکەیدا دەڵـێ: (**وإنَّ الغَالِـبَ اسْـتِعْمَالُهُ فـي الـصَّرْفِ عَـنِ الخَـيْرِ إلى الـشَّرِّ، لَكِنَّـهُ عُـرْفِيٌّ، لا لُغَـوِيٌّ**)، وشـەی (**أَفْـك**) بـە زۆریـی بەکاردەهێـنرێ لـە لادان لـە خێـرەوە بـەرەو شـەڕ، [لـە چاکـەوە بـەرەو خراپـە]، بـەڵام ئـەوە بەکارهێنانێـکی عورفیـی و بـاوەو زمانیـی نیـە، تاکـو ڕێ لـە واتـای یەکەمیـش بگیـرێ، (**إبـن عاشـور**)یش لـە تەفسـیرەکەی خـۆی[2]دا هـەردوو ڕایـەکان دێنـێ، دەڵـێ:

(**قِيـلَ: (يُؤْفَـكُ عَنْـهُ)، ضَمِـيْرُ (عَنْـهُ) عَائِـدُ إلى قَـوْلٍ مُخْتَلِـف، فَتَكُـونُ عَـنْ للتَعْلِيْـلِ كَقَوْلِـه تَعَـالَى:** ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ ﴿٥٣﴾﴾هـود) واتـە: گوتـراوە: ڕانـاوی (**عَنْـهُ**)، دەچێتـەوە بـۆ (**قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ**)، واتـە: لـەو قسـە ناڕێـك و پێکـە لا دەدرێ، ئـەم کاتـە وشـەی پیتـی (**عَـنْ**) بـۆ هـۆکار دۆزییـە، وەك قسـەی خـوای بـەرز کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ ﴿٥٣﴾﴾هـود، گـەلی عـاد بـە هـوود پێغەمبـەری خۆیانیـان گـوت: ئێمـە بـە هـۆی قسـەی تـۆوە واز لـە پەرسـتکراوەکانی خۆمـان ناهێنیـن، کەواتـە: ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾﴾، واتـە: لـەو قسـە پێکـەوە دژیـەك و ناکۆکـە لادەدرێ، کەسـێك کـە لا درابـێ، واتـە: لادرابـێ لـە شـەڕ بـەرەو خێـرو، خـوا لوتفـی لەگەڵـدا کردبـێ.

هەروەهـا (**إبـن عاشـور**) دەڵـێ: بـۆ مانـای دووەم، دەڵـێ: (**وَقِيـلَ ضَمِـيرُ عَنْـهُ عَائِـدٌ إِلَى مَـا تُوعَـدُونَ، أَوْ إِلَى الدِّيـنَ، أوْ إِلَى الْقُـرْآنِ، أَوْ إِلَى الرَّسُـول**)، هەندێکیـش گوتوویانـە:

(١) ج٧، ص٢٠١.

(٢) محاسن التأويل: ج١١، ص٣٤٢.

ڕاناوی (عَنْهُ) واتە: (هـ)ی سەر (عَنْهُ)، (يُؤْفَكُ عَنْهُ)، دەگەڕێتەوە بۆ (تُوعَدُونَ)، واتە: ئەوەی کە هەڕەشەتان پێی لێدەکرێ، یاخود ئەوەی بەڵێنتان پێدەدرێ، لەوە لادەدرێ کەسێك کە لادرابێ، یان دەگەڕێتەوە بۆ دین ﴿ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٌ ۝٦ ﴾، واتە: بۆ سزاو پاداشت، یان دەگەڕێتەوە بۆ قورئان، کە لە سیاق دەزانرێ، لە قورئان لادەدرێ کەسێك کە بە ڕاستیی لادرابێ، یان دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کەواتە: لە هەموو حاڵاندا مەبەست لە (مَنْ أُفِكَ) ئەوەی لادرابێ، هاوبەشدانەرەکانن کە لە بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی، یان بە قورئان، یان بە پێغەمبەر ﷺ لادراون.

ئەو قسەیەی (جمال الدين القاسمي)[1] هێناویەتی، قسەیەکی بەجێیە کە دەڵێ: (**يُؤْفَكُ أي: يُصْرَفُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ أي: صُرِفَ عَنِ الحَقِّ الصَّرِيْحِ الصَّرْفَ التَّامَّ، إِذْ لاَ صَرْفَ أَشَدُّ مِنْهُ**)، واتە: لادەدرێ لە هەق، لە بڕواهێنان بە ڕۆژی سزاو پاداشت بەپێی سیاق، کەسێك کە لە هەقێکی ڕوون و ڕاشکاو لادرابێ، چونکە هیچ لادرانێك لەو لادانە بەهێزتر نیە، واتە: کەسێك لە بڕواهێنان بە ڕۆژی سزاو پاداشت لادرابێ، ئەوە بەڕاستیی لادەرەو لاڕێیەو، بەلاڕێدا براوە.

ئنجا با لە بارەی (ذَاتِ ٱلْحُبُكِ)ەوە، چەند قسەیەکی زانایان بێنین کە زیاتر تیشك دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەو وشەیە:

أ- (**الحسن البصري**)، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: (**الحبك: طَرَائِقُ المَجَرَّة الَّتِي تَبْدُوا لَيْلاً فِي القُرْبَةِ الجَوْ**)، (**حُبُك**): بریتیە لە ڕێیەکانی، کاکێشان کە شەو لە ئاسماندا دەردەکەوێ، [کاکێشانی خۆمان کە دەیبینین، چونکە بە چاو بەس ئەو کاکێشانەی خۆمان دەبینرێ].

ب- (**إبن عباس**) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: (ذَاتِ ٱلْحُبُكِ: **ذَاتِ خَلْقٍ حَسَنٍ**) (**أخرجه الطبري**: ٣٢١١٤، **وإسناده قوي**)، واتە: ئاسمانی خاوەن دروستکردنێکی ڕێك و پێك و چاك.

---

(١) ج٩، ص١٩٢.

**(مجاهد)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە بارەی (ٱلْحُبُكِ)ەوە، دەڵێ: **(المُتْقَنِ البُنْيَان)** **(أخرجه الطبري: ٣٢١٢٨)**، واتە: ڕێك و پێك و بەهێز دروستكراو.

لە بارەی ﴿إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ۝٨﴾ەوە، **(الطبري)** دوو ڕای هێناون:

**یەك:** (مُّخْتَلِفٍ: **مُصَدِّقٍ أَو مُكَذِّبٍ**) **(أخرجه الطبري: ٣٢١٣٤)**، واتە: هەتانە بە ڕاستیی دادەنێ (ڕۆژی سزاو پاداشت) و، هەشتانە بە درۆی دادەنێ.

**دوو:** (مُّخْتَلِفٍ: **مُتَنَاقِض**) **(أخرجه الطبري: ٣٢١٣٥)**، واتە: پێكەوە ناكۆك، پێكەوە دژ، وەك هەر كامێكیان ئەوی دیكە هەڵدەوەشێنێتەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەڕەشەکردن لەوانەی بە گۆترە درۆدەکەن و، لە گێژاوی بێئاگاییدان، نکووڵیی لە هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت دەکەن، ئەو ڕۆژە کە بە ئاگر سزا دەدرێن و، پێشیان دەگوترێ: بیچێژن! ئەوەی پەلەتان لێدەکرد ئەوەبوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ۝١٠ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ۝١١ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ۝١٢ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ۝١٣ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ۝١٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴾، واتە: درۆکەران بە کوشت بچن، (ٱلْخَرَّٰصُونَ): کۆی (**خَرَّاص**)ە، کە (**صِيغَة المُبَالَغة**)ی (**خَارِص**)ە، واتە: کەسێك شتێك مەزەندە دەکات، بە گۆترە شتێك دەڵێ، بە کوردییش پێی دەڵێن: قرساندن، (**الخَرْص**) یانی: قرساندن و، بە مەزەندە دانانی شتێك، ئەم وشەیە زانایان بە دوو واتا بەکاریان هێناوە.

**أ-** یان مەبەست پێ ئەوەیە کە لە گۆترە قسە دەکەن.

**ب-** یاخود بە درۆ قسە دەکەن، بێگومان زۆربەی ئەو کەسانەش کە لە گۆترە شتێك دەڵێن، زۆرجار ئەنجامەکەی ڕاست دەرناچێ.

(**الطبري**) سێ واتای بۆ (**خَرَّاصُونَ**) هێناون:

**یەکەم:** (**المُرْتَابُون**) ئەوانەی دوودڵن.

**دووەم:** (**المُتَكَهِّنُون**) ئەوانەی هەر لە گۆترە قسە دەکەن.

**سێیەم:** (**الكَذَّابُون**) ئەوانەی درۆ دەکەن.

(**قُتِلَ**)، (**دُعَاءٌ بِالْهَلَاكِ عَلَى أَصْحَابِ ذَلِكَ الْقَوْلِ الْمُخْتَلِفِ**)، ئەمە تووککردن و نزاکردنە لە خاوەنانی ئەو قسە پێکەوە دژە (کە پێشتر باسکرا) و، مەبەست لە کوشتنیان ئەوەیە خوا بیانفەوتێنێ.

زانایـان دەڵێـن: ئەگـەر جگەلە خـوا ﷻ چ فریشـتەکان، چ پێغەمبـەران، چ مرۆڤەکان، دوعـا بکـەن، ئـەوە داواکردنـە لـە خـوا، بـەڵام ئەگـەر خـوا ﷻ شـتێك بفەرمـوێ بـە شـێوەی دوعـا ئـەوە هێنانـە دی ئـەو شـتەیە، چونکـە خـوا داوا لـە کـەس نـاکات.

وشـەی (خَـرْص): لێـرەدا مەبەسـت پێـی ئـەو گومانەیـە، کـە خاوەنەکـەی بەڵگـەی هەیـە لەسـەری، یـان کەسـێکی شـارەزا جـاری وایـە شـتێك دەقرسـێنێ، ئـەوە زەمکـراو نیـە، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن.

٢)- ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي غَمۡرَةٖ سَاهُونَ﴾، ئەوانەی لە گێژاوی نەزانییدا بێئاگان، (**الْغَمْرَةُ: مِنَ الْغَمْرِ، وَهُوَ الشِدَّةُ والكَثْرَةُ وَالشُّغْلُ**)، (**غَمْرَة**): چاوگە لە (**غَمْر**)، کە بە مانای سەختیی و زۆریی و سەرقاڵییش دێ، واتە: ئەوانەی لە گۆمی بێ ئاگاییدا خافڵاون، یانی: لە نەزانییەکدان کە ئەو نەزانییە وەك ئاوێکی زۆر، چۆن کەسێك کە تێی دەکەوێ و، تێیدا نقووم دەبێ، ئەوانیش لە لە جڵیتاو و گۆماوی نەزانییدا نغرۆ بوون.

ئنجـا (سَـاهُونَ)، (**السَّـهْوُ: الْغَفْلَـةُ**)، (**سَـهْو**): بریتیـە لـە بێئاگایـی، کەواتـە: (سَـاهُونَ) یـانی: (**غَافِلـُون**)، واتـە: بێئـاگان.

٣)- ﴿يَسۡـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلدِّينِ﴾، دەپرسن: ڕۆژی سزاو پاداشت کەنگێیە، وشەی (أَيَّانَ)، ناوی پرسیارکردنە لە بارەی کاتی کرداری کردارێکەوە کە ڕوویداوە، ماناکەی لە (**مَتَى**)وە نیزیکە، (**مَتَى وُقُوعُ يَوْمِ الدِّينِ؟**)، کەنگێ ڕۆژی سزاو پاداشت دێ؟ خوا ﷻ دەفەرموێ:

٤)- ﴿يَوۡمَ هُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ يُفۡتَنُونَ﴾، ئەو ڕۆژەی ئەوان لەسەر ئاگر سزا دەدرێن، لەسەر ئاگر مرۆڤ چۆن سزا دەدرێ؟ بێگومان دەسووتێنرێن، کە ئەمە وەڵامێکی زۆر بەجێیە بۆ گاڵتەپێکردنی ئەوان، ئەوان بەگاڵتەوە گوتوویانە: ڕۆژی سزاو پاداشت کەنگێیە؟ خوای پەروەردگاریش وەڵامیان دەداتەوە و دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەیە کە ئێوە دەسووتێنرێن، چونکە وشەی (يُفۡتَنُونَ) یانی: (**يُحْرَقُون، يُعَذَّبُون**)، دەسوتێنرێن، سزا دەدرێن، (**الْفَتْنُ: التَّعْذِيبُ وَالتَّحْرِيقُ، وَأَصْلُ الْفَتْنِ الإِخْتِبارُ وَإِدْخَالُ الذَّهَبِ النَّارِ**)، وشەی (**فَتْن**): لێرەدا بە مانای سزادان و ئازاردان و سووتاندنە، بەڵام لە ئەصڵدا وشەی (**فَتْن**) بە مانای تاقیکردنەوە

دێ، پێش ئەوەش بە مانای ئەوە دێ کە زێڕ بخرێتە نێو ئاگر تاکو دەرکەوێ، ئایا زێڕێکی ساغە، یاخود کانزای دیکەی لەگەڵ تێکەڵکراون و فێڵی تێداکراوە؟

٥)- ﴿ ذُوقُواْ فِتۡنَتَكُمۡ ﴾، ئازارەکەتان، سزایەکەتان، سووتێنرانەکەتان بچێژن، ئەمە بە تەئکید گوتراوی قسەیەکە قرتێنراوە، بەڵام سیاقەکە دەیگەیەنێ، واتە: پێیان دەگوترێ: سزایەکەتان بچێژن.

٦)- ﴿هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴾، ئا ئەوەبوو کە ئێوە پەلەتان لێدەکرد، ئەوەی تاڵووکەتان لێدەکرد، (ذُوقُواْ فِتۡنَتَكُمۡ)، وشەی (ذَوْق) خوازراوەتەوە بۆ هەست پێکردنی بەهێز، چونکە زمان لە هەموو ئەندامەکان زیاتر هەست بە شت دەکات، بە تایبەتی بەتام و چێژەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي غَمۡرَةٖ سَاهُونَ ١١ ﴾، واتە: ئەوانەی وەك چۆن کەسێك لە شتێك بێئاگایە و پشتی لێ هەڵدەکات، ئەوانیش بەو شێوەیە بێئاگان، بەو شێوەیە لە گۆماوی نەزانیی خۆیاندا نغرۆ بوون، بەڵام لە ئەصڵدا بێئاگانین و ئاگادارکراونەوەو ترسێنراون، کە دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ١٤ ﴾، (هَٰذَا): ناوی ئاماژە (**اسْم إِشَارَة**)یە، بۆ شتێکی ئامادە کە لەبەر چاویانە، واتە: ئەوەی ئێوە پەلەتان لێدەکرد بێ، فەرموون ئەوە بۆتان هات! بێگومان ئەمەش مەبەست پێی سەرزەنشتکردنە، واتە: ئا ئەوەیە کە پەلەتان لێدەکرد زوو بۆتان بێ، دە بیچێژن.

### مەسەلەی قیرساندن :

لێرەدا (**إبن عاشور**) لە بارەی مەسەلەیەکی فیقهییەوە، کە بریتییە لە قرساندن، قرساندنی دانەوێڵە و میوەی دارو درەخت و، ڕەزو باخ و هەر شتێکی دیکە، هەندێك قسەی هێناون دەمەوێ بە پوختیی لێی بخوازمەوە[1]، دەڵێ:

[بزانە! کە قرساندن واتە: بە گۆترەو مەزەننە تەماشاکردنی شتێك لە بنچینەکانی ئیعتیقاددا، شتێکی ناڕەوایەو زەمکراوە، چونکە عەقیدە دەبێ لەسەر

---

(١) ج١٠، ص:(٣٤٣ - ٣٤٤).

دڵنیایـی بنیـات بـنرێ، لەبـەر ئـەوەی دەبێتـە بناغـە بـۆ هەمـوو شـتەکانی دیکـە، لێرەشـدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴿١٠﴾ ﴾، بـە کوشـت بچـن، یاخـود نەفرینیـان لـێ بکـرێ و دووربخرێنـەوە لـە بەزەیـی خـوا، ئەوانـەی لـە گۆتـرە قسـە دەکـەن و درۆ دەکـەن، مەبەسـت پێـی ئـەو جـۆرە کەسانەیە کـە هـەروا بـە گومـان و بۆچوونێـك کـە هیـچ نیشـانەو بەڵگەیـەکی لەپشـتەوە نیـە، قسـە دەکـەن، ئـەوە بـە نسـبەت کاروبـاری عەقیدەییـەوە.

بـەڵام قرسـاندن لـە هەڵسـوکەوتەکاندا، ئـەو هەڵسـوکەوتانەی لـە نێـوان خەڵکـدا دەبـن، بـەو شـێوەیە زەم ناکـرێ، ئەگـەر ئـەو قرسـاندنە ببێتـە جۆرێـك لـە قومارکـردن و زیانگەیانـدن بـە لایـەك، ئـەوە بێگومـان زەمکـراوە، بـەڵام هەندێـك جـار مۆڵـەت بـۆ هەندێـك لـە جـۆرەکانی قرسـاندن دراوە، کـە پێویسـت بـکات لەبـەر هێنانـە دی بەرژەوەندییـەك، وەك لـەم فەرموودەیـەدا هاتـوە: {**عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي اللـه عنـه، أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ رَخَّـصَ فِي بَيْـعِ الْعَرَايَـا بِخَرْصِهَـا**} (**أخرجـه مسـلم: ٣٩٧٣**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ مۆڵـەتی داوە ئـەو دارخورمایانـەی بـە هاوکاریـی بابایـەکی خـاوەن بـاخ دەیـدات بـە کەسـێکی دیکـە، مەزەنـدە بکرێـن (بەرەکەیـان چەنـدە؟).

دەڵـێ: ئـەو دارخورمایـە بـۆ تـۆ، یـان ئـەو دوو دارخورمایـە بـۆ تـۆ، میوەکەیـان بـۆ تـۆ، ئنجـا ئەگـەر دوایـی خـاوەن باخەکـە بیـەوێ ئـەو خورمایانـەی داونی بـەو کەسـە، لـە بەرانبـەر ئـەو خورمایانـە پـارەی بداتـێ، یاخـود خورمـای دیکـەی بداتـێ، لـەو کاتـەدا بـەر لـەوەی میوەکەیـان دەربکـەن و خورمایـەکان پێبگـەن، دەگونجـێ بقرسـێنرێن، واتـە: میـوەی ئـەو درەختانـەی بـە شـێوەی دیاریـی و هاوکاریـی بابـای خـاوەن بـاخ داونـی بـە کەسـێك وەك هاوکارییکـردن، بـۆ وێنـە: بـۆ مـاوەی سـاڵێکی دیارییکـراو، یـان بـۆ دوو سـاڵ، کـە ئەصـڵ وایـە لـە کاتی پێگەیشـتنی خورمایەکانـدا میـوەی خـۆی بچنـێ، بـەڵام ئەگـەر بابـای خـاوەن بـاخ بـۆی دەرکـەوت کـە ئـەو

میوەیەو، ئەو خورمایانەی بەخشیوونی، لە بابای پێبەخشراو بکڕێتەوە، بۆ ئەوەی بەبیانووی ئەو خورمایانەوە نەچێتە نێو باخەکەی و، زیانی پێ نەگەیەنێ، ئەوە دروستە ئەو میوەیە بەر لەوەی خورمایەکان پێبگەن، بیانقرسێنێ و بە ئەندازەی ئەوە خورمای بداتێ، یاخود بە ئەندازەی ئەوە پارەی بداتێ، گرنگ ئەوەیە قەرەبووی بداتێ، قرساندن لە کوردەواریی خۆشماندا هەر بەکاردەهێنرێ، یەکێک بە یەکێك دەڵێ: تۆ وەرە ئەم باخە، یان ئەم گەنمە بە چەند دەقرسێنێ، بە چەند عەربە، یان بە چەند تەنەکە، یان بە چەند تەن؟ دروستە، ئەو جۆرە سەودایانە بکرێن، بەڵام بە مەرجێك فێڵ و تەڵەکەی تێدانەبێ و، وانەبێ لایەك لایەکیان هەڵخەڵەتێنێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی پاداشتی پارێزکاران کە باخ و بێستان و کانیی و سەرچاوەکانن و، ستاییشکردنیان بە چوار خەسڵەتی گەورەو گرنگیان: چاکەکاریی و، شەو بێداریی و، داوای لێبوردن لە خوا کردن و، سامان و ماڵی خۆ بەخشین بە کەسانی سواڵکەرو داواکەرو، بە کەسانێکیش کە داوا ناکەن، بەڵام بێبەشن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

خوا ﷻ دوای ئەوەی کە باسی سەرەنجامی شوومیی بێبڕوایانی کرد، ئنجا باسی سەرەنجامی خێریی پارێزکاران دەکات، هاوکات باسی ئەو سیفەت و خەسڵەتە بەرزو مەزنانەشیان دەکات، کە بوونە هۆی ئەوەی ئەو سەرەنجامە خێرەیان بۆ دەستەبەر ببێ، دەفەرموێ:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴾ بە دڵنیایی پارێزکاران لە باخ و سەرچاوان دان، واتە: ئەو کەسانەی پێش هەموو شتێك خۆیان دەپارێزن لە شیرك و کوفرو، بێبڕوایی بە ڕۆژی دوایی، ئەوانە لە چییدان؟ ﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴾، (جَنَّٰتٖ)، کۆی (جَنَّةٌ)یە، واتە: باغ و بێستان، (وَعُيُونٍ)یش، کۆی (عَيْنٌ)ە، واتە: کانیی و سەرچاوە، واتە: لە نێو باغ و بێستانەکان و لە نێو کانیی و سەرچاوەکان دان، لە زۆر شوێنی قورئاندا ئەم تەعبیرە هاتوە، بۆ وێنە:

لە سووڕەتی (**الدخان**)دا: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: پارێزکاران لە جێگاو ڕێگایەکی پڕ هێمن و ئاساییش دان، لە نێو باغ و گوڵ و گوڵزارو کانیی و سەرچاوەکاندان، لە چەند شوێنی دیکەش خوای پەروەردگار هەر ئاوا باسی جێگاو ڕێگای پارێزکاران و ئیماندارانی کردوە لە ڕۆژی دوایی دا، بۆچی؟

چونکە ئەگەر تەماشا بکەین سرووشتی بەشەر کەیفی بە ئاو دێ و، کەیفی بە سەوزایی دێ و، کەیفی بە گوڵ و گوڵزار دێ و، بەو دیمەنانە دێ، واتە: ئەوەی خوا ﷻ دەزانێ سرووشتی مرۆڤ دەیخوازێ لە دنیاو لە ڕۆژی دوایی دا، خوای پەروەردگار ئەو بەهەشتەی وا هەڵخستوە، کە سرووشتی ساغی مرۆڤ دەیخوازێ، هیچ کەسێك نیە کە کەیفی بە کانیی و سەرچاوەو جۆگەو جۆبارو ڕووبارو، گوڵ و گوڵزارو دارو درەخت و سەوزایی نەیەت.

**٢)-** ﴿ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾، وەرگری ئەوەن کە پەروەردگاریان پێیداون، کە ئەمە چەمکەکەی گشتگیر و فراوانە و هەرچی خوای بەخشەر پێیان دەدات دەیگرێتەوە.

**(فخرالدين الرازي)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا **(التفسير الكبير)**[1]، دەڵێ: ئەم ئایەتە: ﴿ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾، سێ واتای هەن:

**یەکەم:** ئەوەی پەروەردگاریان پێیان دەدا، وردە وردە وەری دەگرن و هەمووی بەیەکجار وەرناگرن، چونکە مەحاڵە شتێك کە کۆتایی نەبێ، یەکسەر هەمووی وەربگیرێ، بۆیە دەفەرموێ: (ءَاخِذِينَ)، بە ناوی بکەر **(اسْمِ فَاعِل)**، هێناویەتی وەرگری ئەوەن کە پەروەردگاریان پێیان دەدا، ڕۆژ بۆ ڕۆژو، ساڵ بۆ ساڵ و، کات بۆ کات.

**دووەم:** بۆیە خوا وای فەرمووە، یانی: **(قَابِلِيْنَ قُبُولَ رَاضٍ)**، وەری دەگرن، وەرگرتنی بابایەکی ڕازیی لەوەی پێی دەدرێ.

**سێیەم:** وەرگری ئەوەن کە پەروەردگاریان پێیان دەدا، یانی: دەبنە خاوەنی، واتە: کە دەچنە ئەو بەهەشتانەوە و، خوا ئەو نازو نیعمەتەیان پێ دەدات، شتێك نیە وەك سپاردە وێیان بدرێ، بۆ کاتێکی دیاریکراو، بەڵکو دەبنە خاوەنی بۆیە دەفەرموێ: (ءَاخِذِينَ)، وەرگرن، یانی: **(مَالِكِيْن وَمُتَمَلِّكِيْن)**، دەبن بە خاوەنی ئەوەی خوای بەرزو مەزن پێیان دەدات.

---

(١) ج١٤، ص١٨٤.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات هۆكاری ئەوە چییە كە ئەوە پاداشتییانە؟ دەفەرموێ:

٣)- ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ﴾، بەدڵنیایی ئەوان لە پێش ئەوەدا چاكەكار بوون، ئەمە هۆكار دۆزییە، بۆچی خوا ﷻ پارێزكاران دەخاتە نێو باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزارەكان و كانیی و سەرچاوەكان و، ئەوەی پەروەردگاریان پێیان دەدات، دەبنە وەرگری؟ لەبەر ئەوەی ئەوانە پێشتر چاكەكار بوون، واتە: لە خواپەرستییان داو لە دینداریياندا، دینداریيەكی چاك و خواپەرستییەكی باشیان دەكرد.

هەروەها لەگەڵ خەڵكیشدا مامەڵەیەكی ڕاست و دروستیان دەكرد، لەگەڵ دۆستدا و لەگەڵ دوژمندا، لەگەڵ ماڵ و خێزان، لەگەڵ دەرو دراوسێ، لەگەڵ كۆمەڵگاو، لەگەڵ مرۆڤایەتییدا بە گشتیی.

ئەوە سیفەتی یەكەمیان لە چوار سیفەتەكانیان.

٤)- ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ﴾، ئەوانە بە شەوێ كەم دەخەوتن، (**وَالْهُجُوعُ: النَّوْمُ لَيْلاً**)، (**هُجُوع**): بریتیە لە خەوی شەو، واتە: بە شەوێ كەم دەخەوتن، ئەدی چییان دەكرد؟ شەو بێداردەبوون بۆ خواپەرستیی، بۆ جۆرەكانی خوا پەرستیی، مەرج نیە تەنیا نوێژ، قورئانیان دەخوێندو، یادی خوایان دەكردو، تاعەتیان بۆ خوا ئەنجام دەدا.

ئەوەش سیفەتی دووەمیان.

٥)- ﴿وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾، (سیفەتی سێیەمیان ئەوە بوو) لە دەمەو بەرەو بەیاندا، داوای لێبوردنیان دەكرد، (**أَسْحَار**)، كۆی (**سَحَر**)ە، كە بریتیە لە كۆتایی شەوگار و پێش بەرەبەیان، یانی: كە شەویان بە شەونوێژو شەو بێداریی و خواپەرستیی دەبردە سەر، ئەوە نەدەبووە هۆی ئەوەی پێی لە خۆبایی بن و، لە كەوڵی خۆیان دەربچن، بەڵكو پێش بەرەبەیانیش داوای لێبوردنیان لە پەروەردگاریان دەكرد، كە خوایە! ئەو تاعەتەی ئەنجامماندا، شایستەی تۆ نیە، بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان لە تواناداا هەیە، نەك بە دوو ڕكات نوێژ لە كەوڵی خۆیان دەربچن و پێی لە خۆیان بایی بن و، پێیان وابێ شتێكی زۆر گەورەیان كردوە!

٦)- ﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾، لە ماڵ و سامانیشیان دا ماف هەبوو، بۆ داواکەر و بێبەش، بابای سواڵکەر و بابای بێ بەشیان، بەخاوەن ماف دەزانی لە ماڵ و سامانیاندا.

(**السَّائِلُ: الْفَقِيرُ الْمُظْهِرُ فَقْرَهُ فَهُوَ يَسْأَلُ النَّاسَ**)، (**سائِل**): هەژارێکە، هەژاریی خۆی دەردەخات و داوا لە خەڵك دەکات.

(**الْمَحْرُومُ: الْفَقِيرُ الَّذِي لاَ يُعْطَى الصَّدَقَةَ لِظَنِّ النَّاسِ، أَنَّهُ غَيْرُ مُحْتَاجٍ مِنْ تَعَفُّفِهِ عَنْ إِظْهَارِ الْفَقْرِ**)، (**مَحْرُومُ**): هەژارێکە خێرو چاکەی پێنادرێ، لەبەر ئەوەی خەڵك گومانیان وایە ئاتاج نیە چونکە زۆر نەفس بەرزەو هەژاریی و نەداریی و کڕووزانەو لالانەوە دەرنابڕێ.

بۆچی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ١٦ ﴾، ئەوان لەپێش ئەوەدا چاکەکار بوون؟ ئەمە (**تَفْخِيمُ لِمَا أَعْطُوهُ: أَعْطُوا مَا أُعْطُوا بِسَبَبِ مَا فَعَلُوهُ مِنْ قَبْلُ**)، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ ﴾، کە ئەمە پێی دەگوترێ: (**إِطْنَاب**)، واتە: قسەکردن بە درێژیی و ئەمیش لە شوێنی خۆیدا پەسەندە، ئەگەرنا قورئان هەمووی لەوپەڕی کورتیی و پوختیی دایە، بەڵام جاری وایە خوا ﷻ شێوەی (**إِطْنَاب**)، بەکاردێنێ، لێرەدا ئەمە بۆ ئەوەیە کە ئەوەی پێیان دراوە، زۆر بە گەورە بگیرێ و، بە مەزن پێشان بدرێ، واتە: ئەوەی پێیاندراوە، بۆیە پێیاندراوە کە لەوە پێش، ئەو کارە گەورەو گرنگانەیان ئەنجام داون، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ ئەو بەندە چاکانەی بەهەشتەکانیان بە قسمەت دەکات، بە پێنج وەسف پێناسەی کردوون:

١- (**الْمُتَّقِيْن**): پارێزکاران.

٢- (**الْمُحْسِنِيْن**): چاکەکاران.

٣- ﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ١٧ ﴾، شەو بێداریی و کەمخەویی.

٤- داوای لێبوردن کردن لە خوا، پێش بەرەبەیان.

٥- ماڵ و سامانی خۆ، بە مافی سواڵکەرو هەژاران زانین.

## پێنج نوكتەی ڕەوانبێژیی و بەسەرهاتێكی سەرنجڕاكێش:

﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ ﴾، بۆچـی دەفەرمـوێ: (حَقٌّ)، واتـە: ئـەوان بـە مـافی ئـەو سـواڵكەرو نـەدارو هـەژارو بێبەشـانەی دەزانـن، نـەك منەتیـان لەسـەر بكـەن، بەڵكـو دەڵێـن: هەقـی خۆتانـە لـە ماڵـی ئێمـەدا، وەرن هەقەكەتـان بـەرن.

**یەكەم:** پێنج نوكتەی ڕەوانبێژیی، كە تەنیا لەم ڕستەیەدا هەن: ﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ۝١٧ ﴾:(١)

**١-** ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا ﴾، (كَانُوا)، چونكە كرداری (**كَوْن**) دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات كە (**خبر**)ی (**كَان**) هەواڵەكەی كە دێ، شتێكی چەسپاو بووە لە ژیانیاندا، واتە: عادەت و شتێكی چەسپاو بووە، عادەت و نەریتیان بووە و بەو شێوەیە بوون، شەوانە كەم خەوتوون.

**٢-** ئەوە كە دەفەرموێ: ﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ۝١٧ ﴾، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**كَانُوا يُقِيْمُون اللَّيْل**)، شەو بێدارییان دەكرد، ئەم تەعبیرەی خوای بەرزو مەزن بە كاریهێناوە، كە باسی (**هُجُوع**)ی تێدایە، ئەو حاڵەتەی نەفسی مرۆڤ زۆر ئارەزووی دەكات، كە بریتیە لە خەوو پشوودان، ئەوەی تێدایە، ئەگەر فەرمووبای: (**كَانُوا يُقِيْمُون اللَّيْل**)، هەر ئەوەندەمان دەزانی كە شەو بێداربوون، بەڵام كە دەفەرموێ: ﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ۝١٧ ﴾، عادەتیان وابوو كە كەمێك لە شەوێ دەخەوتن، باسی (**هُجُوع**) كە خەوی شەوە، ئەوەمان بۆ دەردەخات كە ئەوانە بەسەر ئارەزووی نەفسیاندا زاڵ بوون، كە نەفس كەیفی بە پشوودان و ئیسڕاحەت هەیە، ئەمە وەك ئایەتەكەی سووڕەتی (**السجدة**)، وایە كە دەفەرموێ: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ ۝١٦ ﴾، واتە: تەنیشتەكانیان بەرزدەبنەوە لەسەر جێیەكانیان.

---

(١) كـە ئەمـە هـەم خـاوەنی تەفسـیری (الكشّـاف) زەمەخشـەریی و هـەم ئیبنـو عاشـوورو توێـژەرەوەكانی دیكـەش ئاماژەیـان پێكـردوە.

٣- ئەوەیە كە بە ڕاشكاویی باسی شەو دەكات: ﴿ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ ﴿١٧﴾ ﴾، چونكە باسكردنی شەو، بیرخەرەوەی ئەوەیە كە ئەوانە وازیان لە خەوێ هێناوە، لە كاتێكدا شەو خوازیاری ئەوەیە مرۆڤ تێیدا پشوو بدات، واتە: مرۆڤ بە شەوێ حەز لە خەوو ئیسڕاحەت دەكات، ئنجا ئەمە دەرخەری ئەوەیە كە ئەوانە شەو كە بێدار بوون، لەشەودا كە نەفس پێی خۆشە تێیدا ئیسڕاحەت بكات، وازیان لە خەو هێناوە، ئەمەش وەك زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: قورئان هەمووی لە لووتكەی ڕەوانبێژیی دایە و، یەكێك لە ڕووەكانی ڕەوانبێژیی بریتیە لەوە كە شتێك پێویست بكات بە شێوازی (**إِطْنَابٌ**)، درێژە پێدان باس بكرێ، وا باسبكرێ ئێرەش یەكێكە لەو شوێنانە.

٤- ئەوەیە كە (**هُجُوع**): كە بریتیە لە خەو، بەنددار كراوە بە وشەی كەم (**قَلِيْل**)، واتە: خەوەكەیان لە شەوێدا ئەندازەیەكی كەم بووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە كە نەچوون خەوەكەیان بگەیەننە ئەوپەڕی ڕاددەكەی، بەڵكو بە ئەندازەیەكی كەم لە خەوی شەو ئیكتیفایان كردووە، ئەوەی دیكەیان تەرخانكردوە بۆ بێدار بوون.

٥- ئەوەیە تەنانەت ئەو كەمە خەوەشیان (مَا)ی چۆتە سەرێ، ﴿ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، ئەمەش دیسان جارێكە دیكە جەختكردنەوەی ئەوەیە، كە ئەو ئەندازە خەوەی لە شەویشدا خەوتوون، ئەندازەیەكی كەم بووە.

هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**السجدة**)دا، لە بارەی شەو نوێژەوە كورتە باسێكمان كردوە.

**دووەم:** بەسەرهاتێكی سەرنجڕاكێش:

(**الأصمَعي**) وەك (**القرطبي**) لە (**الجامع لأحكام القرآن**)دا، هەروەها زۆربەی تەفسیرەكانیش هێناویانە، بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، كە بە ڕاستیی جێی سەرنجە، من یەكسەر بە تەرجەمەكراویی دەیهێنم، لە تەفسیری (**القرطبي**)[1] یەوە:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج١٦، ص ٣٥-٣٦.

دەڵێ: ئەصمعیی گوتوویەتی: جارێك چوومە مزگەوتی بەصڕا دەشتەكییەكی وشك (واتە: كەسێكی ناحاڵیی و كەم سەلیقە) سواری حوشترێكی بوو، شمشێرەكەی بە شانیدا كردبوو، تیرو كەوانەكەی بە دەستیەوە گرتبوو، لێم وەنزیك كەوت و سەلامی كرد، گوتی: ئەی پیاو! تۆ خەڵكی كوێیی؟ منیش گوتم: لە بەنی ئەصمەع، گوتی: تۆی ئەصمەعیی، گوتم: بەڵێ، گوتی: لە كوێوە هاتووی؟ گوتم: لە شوێنێكەوە هاتووم كە فەرمایشتی خوای بە بەزەیی تێدا دەخوێنرێتەوە، گوتی: ئنجا خوای بە بەزەیی فەرمایشتێكی هەیە مرۆڤەكان بیخوێننەوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: دە هەندێكیم بەسەردا بخوێنەوە، منیش سوورەتی (**الذاريات**)م بەسەردا خوێندەوە، (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)، ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾﴾، تاكو گەیشتمە ئەو شوێنەی ﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾، بژیوی ئێوە لە ئاسمانەوەیە، دەڵێ گوتی: ئەی ئەصمەعیی! بەسە، دوایی هەڵسا حوشترەكەی سەربڕی و گۆشتەكەی بەش بەش كرد، دوایی گوتی: یارمەتییم بدە دابەشی بكەین بەسەر هەژاران و نەدارانـدا، كەسێك لەولا ڕا دەهات و پێكەوە گۆشتەكەیمان دابەشكرد، دوایی شمشێرەكەشی، هەروەها تیرو كەوانەكەشی هەردووكیان شكاندن و خستنیە ژێر بارەكەی و ڕۆیشتەوە بەرەو بیابان، بەرەو دەشت و سەحرایەك كە لەوێ نیشتەجێ بوون، ئنجا كە ڕۆیشت هەر لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾، بژیوی ئێوە لە ئاسمانەوەیە، هەروەها ئەوەی كە بەڵێنتان پێدەدرێ!

ئەصمەعیی دەڵێ: من خۆمم لە بەرانبەر ئەودا بە كەم هاتە بەرچاوو، سەركۆنەی خۆمم كرد، دوایی وای بەسەردا هات كە لەگەڵ هاروونە ڕەشیددا حەجم كرد، لە كاتێكدا تەوافم دەكرد، گوێم لە دەنگێكی نزم بوو، دەنگێكی كز، ئاوڕم دایەوە تەماشام كرد، كابرا دەشتەكییەكەیە لاواز بووە و ڕەنگی زەرد بووە، سڵاوی لێكردم و دەستی گرتم و گوتی: فەرمایشتی ڕەحمانم بەسەردا

بخوێنـەوەو لـە پشـت مەقامـەوە داینیشـتاندم، گـوتی: وەرە فەرمایشـتی خـوای بـە بەزەییـم بەسـەردا بخوێنـەوە چـی دیکەشـی هەیـە! دەڵـێ: منیـش سـوورەتی (**الذاريـات**)م، بەسـەردا خوێنـدەوە تاکـو ئـەو شـوێنەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، ئەعرابییەکـە گـوتی: ئـەوەی خـوای بـە بەزەیـی بەڵێنـی پێدابوویـن، بەڕاسـتمان بینـی، ئایا جگـە لـەوە چـی دیکـەی فەرمـووە؟ شـتی دیکـەی فەرمـووە؟ گوتـم: بەڵـێ، خـوا ﷻ دوای ئـەوە فەرموویـەتی: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، بـە پـەروەردگاری ئاسـمانەکان و زەوی ئـەوە هەقـە و ڕاسـتە، وەك چـۆن ئێـوە قسـە دەکـەن، کابـراش چریکەیـەکی لێـداو گـوتی: (**يَـا سُـبْحَانَ اللَّـهِ! مَـنِ الَّـذِي أَغْضَـبَ الْجَلِيـلَ حَتَّـى حَلَـفَ! أَلَـمْ يُصَدِّقُـوهُ فِي قَوْلِـهِ حَتَّـى أَلْجَئُـوهُ إِلَى الْيَمِـينِ؟**)، پاکیـی بـۆ خـوا، کـێ خـوای پایـە بـەرزی تـووڕە کـردوە، تاکـو سـوێندی پێخـواردوە، بڕوایـان پـێ نەکـردوە لـە فەرمایشـتەکەیدا تاکـو ناچاریـان کـردوە سـوێند بخـوات، سـێ جـاران وای گـوت، دوایـی یەکسـەر گیـانی سـپارد، واتـە: لەگـەڵ ئـەوەدا ڕووحیـی دەرچـوو!

ئێسـتاش بـە باشـی دەزانـم دوو کورتـە باسـان بخەینـەڕوو، چونکـە خـوای بـەرزی مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتـە: لـە زەویـدا نیشـانە هـەن، واتـە: نیشـانە هـەن لەسـەر بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگاریەتیـی و توانـاو دەسـتەڵاتی بـێ سـنووری خـوا، کـە دەتوانـێ مـردووان زینـدوو بکاتـەوە، هەروەهـا لـە خۆشـتاندا ئایـا نابینـن؟ ئنجـا ئێمـە دوو کورتـە باسـی پوخـت دەخەینـە ڕوو، کورتـە باسـێك دەربـارەی زەوی و، کورتـە باسـێکیش دەربـارەی خۆمـان (جەسـتەی مـرۆڤ) بـە تایبـەت.

## کورتە باسێک دەربارەی زەوی

بەڕێـــــــزان!

ئێمـە لـە یـازدە بڕگـەدا باسـی زەوی دەکەیـن، هەڵبەتـە کاتی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا باسـێکی سـەربەخۆمان لـە بـارەی گەردوونـەوە کـردوە، پاشـان لـە بـارەی خـۆرەوە و لـە بـارەی زەوییـەوە و لـە بـارەی مانگـەوە، بـەڵام لێـرەدا جارێـکی دیکـە لـەو یـازدە بڕگەیـەدا، بـاسی زەوی دەکەیـن، کـە ڕەنگـە لـە هەندێـك ڕووەوە، ئـەم باسـەی ئێـرە فراوانـتر بـێ لـەوەی ئـەوێ:

**یەکەم:** تیرە (**قطر**)ی زەوی (١٢٨٠٠)کم، واتە: لەم سەری زەوی تاکو ئەوسەری، ئەوە پێی دەگوترێ: تیرە، نیوە تیرەش ئەوەیە تاکو نیوە ڕاستێ بێ، تیرەی زەوی واتە: لەم سەری زەوی بۆ ئەو سەری زەوی.

**دووەم:** قەبارەی (**حجم**)ی زەوی، بریتیە لە یەك ملیۆن (١٠٠٠،٠٠٠کم³) کیلۆمەتر سێجا، واتە: قەبارەی زەوی هەمووی کە قەبارە دیارە ئەوەیە کە کۆی شتێك بە هەموو لایەکانیەوە (١٠٠٠،٠٠٠)کم³یە، دیارە بە نیزیك کراوەیی.

**سێیەم:** چڕیی (**كَثَافَة**)ی زەوی، دەوری (٥) گرام و لە (٥٢٪)ی گرامێکە بۆ هەریەك سانتیمەترێك سێجا، یانی: هەر یەك سانتیمەتر سێجایەك، چڕییەکەی (٥) گرام و لە (٥٢٪)ی گرامێکە، واتە: (٥،٥) پێنج و نیو گرام.

**چوارەم:** قورسایی (**كتلة**)ی زەوی (٦٠٠٠) شەش هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن، واتە: (٦)²¹ تەنە، ژمارە (٦)، (٢١) سفری هەبێ ئەوەندە تەن زەوی قورسە.

**پێنجەم:** پێکهاتەی زەوی ئێمە لە چوار بڕگەدا باسی پێکهاتەی زەوی دەکەین:

**١- نێـوکی زەوی:** نێوکـە ڕەقەکـەی زەوی کـە پێـی دەگوتـرێ: (**نَـوَاة صُلْبَـة**)، کـە لـە (٩٠٪)ی ئاسـنەو (٩٪)ی نیکلـەو، توخمـە سـووکەکانیش وەك، فۆسـفۆڕو کاربـۆن

و سلیکۆن (١٪)ە، پێکهاتەی نێوکی زەوی هەمان پێکهاتەی نەیزەکەکانە کە لە ئاسمان دێنە خوار، تیرەی نێوکی زەوی تیرەکەی (٢٤٠٢)کم ئاوەکەی، نیوەتیرەکەی لە چەقەکەیەوە لە نێوان (٦٣٧١ - ٥١٧٠)کم، دیارە لە ژێر ئاستی دەریاوە، ئەوە بە نسبەت چینی یەکەمی زەوی کە پێی دەگوترێ، دەشگونجێ بڵێین: زەوی حەوتەم، یاخود چینی حەوتەم.

**٢- نێوکی شلی زەوی:** کە دەگونجێ بڵێین: توێژی یاخود چینی شەشەم، کە دەوری نێوکە ڕەقەکەی زەوی داوە، بەڵام ماددەیەکی قاڵبووەوەیەو هەمان پێکهاتەی نێوکە ڕەقەکەشی هەیە، ئەویش تیرەکەی (٢٢٨٥)کم، لە قووڵایی لە (٢٨٨٥ - ٥١٧١)کم لە ژێر ئاستی دەریاوە.

**٣- توێژەکانی سێیەم و چوارەم و پێنجەم:** ئەمانە سێ چینن، تیرەکەیان هی هەموویان پێکەوە: (٢٧٦٥ - ٢٨٨٥)کم، واتە: تاکو قووڵایی (١٢٠)کم لە ژێر ئاستی دەریاوە.

**٤- توێژی شەشەم و حەوتەم:** کە چینی بەردینی پێدەڵێن: **(الطَّبَقَة الصَّخْرِيَّة)**، کە دەگونجێ بڵێین: زەوی دووەم و یەکەم، تیرەکەی (٦٥)کم لە ژێر دەریاکانەوەیە، بەڵام لە ژێر وشکانیی دا (١٢٠)کم، کە ئەمە توێکڵی زەوی پێك دێنێ و، لە ژێر دەریایەکانەوە (٥ - ٨)کم، بەڵام لە ژێر وشکانیەوە (٦٠ - ٨٠)کم ئەستوورە.

پاشان ئەم زەوییەی ئێمە چەند بەرگێکی هەن:

**بەرگی خاکی زەوی:**

یەکەمین بەرگی زەوی بەرگێکی خاکییە، ئەو بەرگە خاکییەش چیایەکان پێکی دێنن بە پلەی یەکەم، لەو شوێنانەی کە چیایان لێن، ئەگەرنا دیارە ئەوی دیکە بەستەڵەکە، بیابانە...هتد، چیاییەکان خوای پەروەردگار بە سینگ ناوی بردوون، ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ۝٧﴾ النبأ، هەر چیایەك چەندەی بەدەرەوەیە، دە، پازدە هێندەی لە زەوی دایە، بۆ وێنە: چیای هیمالایا - بەرزترین لووتکە چیای هیمالایا کە

بەرزترین چیاشە لە جیهاندا - پێی دەگوترێ: ئیڤریست (٨٨٦٤)م، واتە: (٨)کم و (٨٦٤)م، دەوری (٩)کم بەرزە، (١٣٠)کم ی لە زەویدایە، یانی: دە، پازدە هێندەی خۆی، ئەستوورایی ئەو بەرگە بەردییە، یان بەرگە خاکییەی زەوی (١٠٠ - ١٥٠)کم دەبێ، بەڵام دیارە قووڵترین دەریا دەوری (١١)کم، یان (١١٠٠٠)م و، بەرزترین چیاش (٩)کم و بە هەردووکیان (١١ و ٩) دەکاتە (٢٠)کم، بەس ئەوەندە دەریاو چیا دەیگرێتەوە، ئەوەی دیکە هەمووی هەر ئەو توێخە بەردییە پێکی دێنێ.

### بەرگی هەوای دەوری زەوی:

### أ- سوودەکانی بەرگە هەوا:

ئەو بەرگە هەوایە کە دەوری زەوی داوە، کە بەرزییەکەی هەزار (١٠٠٠)کم زیاترە سوودگەلێکی زۆری هەن:

**یەکەم:** ئێمە لە تیشك و تەنۆلکە بارگاوییە زیانبەخشەکان دەپارێزێ، کە لە خۆرو لە ئەستێرەکانی دیکەوە دێن.

**دووەم:** ئێمە لە پارچە نەیزەکەکان کە ڕۆژانە پتر لە ملیۆنێکیان لەسەر زەوی لێ دەبارێ، دەپارێزن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنبياء.

**سێیەم:** ئەو بەرگە هەوایە دەبێتە هۆی ئەوەی هەڵمی ئاو بپارێزێ لە نێو خۆیدا کە، ئەگەر هەڵمی ئاو نەبێ، دیارە هەوریش نابێ و بەفر و باران و تەرزەش نابن.

**چوارەم:** ئەو بەرگە هەوایە ڕێگە نادات تیشکی خۆر یەکسەر ون بێ، بەڵکو ماوەیەك دەمێنێتەوە، چونکە بەیانیان پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ئەو تیشکە شەبەق دەدات، هەروەها ئێوارانیش دوای ئەوەی خۆر ئاوا دەبێ، ماوەیەك دنیا هەر ڕووناك دەمێنێتەوە.

**پێنجەم:** ئەو بەرگە هەوایە سوودێکی دیکەی کەمکردنەوەی جیاوازیی نێوان شەوو ڕۆژە لە پلەی گەرمییدا، بۆ وێنە: لەسەر مانگ هەر لەگەڵ خۆر ئاوا دەبێ پلەی گەرمیی دەچێتە

(١٥٠) پلەی ژێر سفرو، لەگەڵ خۆر بە دەرەوە دەبێ یەکسەر پلەی گەرمیی دەگاتە (١٠٠) واتە: پلەی کوڵین، بەڵام لەسەر زەوی پلەی گەرمی، نە هی شەو هێندە ساردە، نە هی ڕۆژیش هێندە گەرمە، بە هۆی بەرگە هەواوە.

**ب- چینەکانی بەرگە هەوا:**

**چینی یەکەم:** کە (ترۆپۆسفیر)ی پێدەڵێن، (٢٠)کم تیرەکەیەتی، (٢٠)کم بەرزە و (٩) لەسەر (١٠)ی بارستایی بەرگە هەوا، ئەو چینەی یەکەم پێکی دێنێ.

**چینی دووەم:** (ستیڕاتۆسفیر) کە (٥٠) کم لە ئاستی زەوییەوە بەرزە، پلەی گەرمیی لەو چینەی دووەمدا (٦٠) پلە ژێر سفرە، زۆر زۆر ساردە.

**چینی سێیەم:** (میزوسفیر) (٨٠)کم بە دوو چینەکەی دیکەشەوە لە ئاستی زەوییەوە بەرزە، پلەی گەرمیی (١٠٠) پلە لە ژێر سفرەوەیە.

**چینی چوارەم:** (پیرمۆسفیر) کە (٤٥٠) کم بە سێ چینەکەی پێشووشیەوە لە ئاستی زەوییەوە بەرزەو، (٢٠٠٠) پلەی سەنتیگراد گەرمە، ئەوانەی کە پێشێ چەند سارد بوون، کەچی ئەم (٢٠٠٠) پلەی سەنتیگراد، کە لە (١٠٠) پلە ئاو دەکوڵێ، ئەدی دەبێ لە (٢٠٠٠) پلە چی لێ بێ؟ زۆر زۆر گەرمە.

**چینی پێنجەم:** (ئیکسۆسفیر)ی پێ دەڵێن، کە (٩٠٠)کم تاکو (١٠٠٠) کم لە ئاستی زەوییەوە بەرزە.

**ج- پێکهاتەکانی بەرگە هەوا:**

بەرگە هەوا لە (٧٨٪)ی گازی نایترۆجین پێکی دێنێ و، لە (٢١٪)ی ئۆکسجینە، لە (٠,٠٣٪)شی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و، هەندێك گازی دیکەیە.

## بەرگە ئاویی دەوری زەوی:

ئەنـدازەی (٧١٪)ی پانتایـی ڕووی زەوی، بەرگـە ئاویـی دایدەگـرێ، یـانی: زەوی ئێمـە ئەگـەر بیکـەی بـە چـوار بەشـەوە، سێ بـەش زیاتـری ئـاو داپۆشـیوە، قەبـارەو ڕێـژەی ئاویـش بـە هـەر سێك حاڵـەتی شـلیی و گازیـی و ڕەقییـەوە، شـلییەکە بارانـەو، گازییەکـەش هەڵمەو، ڕەقییەکەشـی بەفـرو تەزرەیـەو هەمـووی: (١,٣٣٧,٠٠٠,٠٠٠)[٣]کم، (ملیارێـك و سێ سـەدو سـی و حـەوت ملیـۆن کیلۆمەتـر سێجایە).

بەرگـە ئاویەکـە هەتـا قووڵایـی (٤)کـم گیانـداران لـە دەریاکانـدا دەژیـن، هەمووشـی هەتـا بنـی بنـەوە (١١)کـم، ئـەو بەرگـە ئاوییـەی دەوری زەوی داوە، مەگـەر کەمێـکی ئەگەرنـا هەمـووی سـوێرە، کـە ئـاوی ئۆقیانـووس و زەریایەکانـە، ئـەدی ئێمـە ئـاوی شـیرینمان لـە کـوێ دەبـێ؟ ئـاوی شـیرینمان لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە تیشـکی خـۆر لـە دەریایـەکان دەدات، هەڵمـی لـێ پەیـدادەکات، هەڵمەکـەش دەچـێ بـەرەو شـوێنە ساردەکان و خەسـت دەبێتـەوەو، موتووربـە دەبـێ، کـە هـەورە تریشـقەو برووسـکە نیشـانەی موتووربـە بـوونی هەورەکانـە، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا خوێیەکـە لـە دەریـادا بەجـێ دەمێنـێ و هەڵمەکـە کـە دێ، هیـچ ماددەی سـوێری پێـوە نیـە و، ئێمـەش ئـاوی شـیرینمان لـەوە دەسـت دەکـەوێ، وەك خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾الواقعة، واتـە: ئایـا ئـەو ئـاوە دەبینـن کـە دەیخۆنـەوە؟ ئایـا ئێـوە لـە هـەور باراندووتانـە یاخـود ئێمـە؟ ئەگـەر ویسـتبامان تـاڵ و سـوێرمان دەکـرد، ئایـا سوپاسـگوزاریی ناکـەن؟ ئاوەکـە خـۆی تـاڵ و سـوێرە، بـەڵام خـوا دەیپاڵێـوێ بـۆ ئێمـە.

## شەشەم: جووڵەکانی زەوی:

زەوی بـەلای کەمـەوە، پێنـج جـۆرە خوولانـەوەی هـەن، ئـەوەی تاکـو ئێسـتا بـۆ زانایـان دەرکەوتـوە:

١- جووڵەو سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا، بە خێرایی (٢٨) کم لە خولەکێکدا، واتە: (١٦٨٠)کم لە کاتژمێرێکدا، سووڕانەوەی زەوی، یان خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا، دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەوو ڕۆژ.

٢- جووڵەی دووەمی زەوی ئەوەیە کە بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، لە ماوەی ساڵێکدا، ئەو سووڕە تەواو دەکات بە خێرایی (٣٠)کم لە چرکەیەکداو، بەلاریی (٢٣,٥) پلە، واتە: بەم ڕێژەیە لە سورگەکەی خۆی لارە، بەهۆی ئەو لارییەوەش چوار کەشەکان، واتە: بەهارو هاوین و پایزو زستان پەیدا دەبن.

٣- جوڵەی سێیەمی زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا بە دەوری خڕۆکەی دانیشتوو، **(الكَوْكَب الجاثِي)**، هەندێکیش پێی دەڵێن: داڵی ڕاوەستاو، بە خێرایی (٢٠)کم لە چرکەیەکدا.

٤- جووڵەو سووڕانەوەی چوارەمی زەوی لەگەڵی داڵی وەستا، یاخود خڕۆکەی دانیشتوودا بە دەوری چەقی کەهکەشاندا، بە خێرایی (٢٤)کم لە چرکەیەکدا، واتە: (٧٤١٦٠٠)م لە کاتژمێرێکدا.

٥- جووڵەو سووڕانەوەی پێنجەمی زەوی، لەگەڵ کەهکەشاندا بە خێرایی (٩٨٠)کم لە چرکەیەکدا، یانی: (٣،٥٢٨،٠٠٠)کم لە کاتژمێرێکدا[1].

## حەوتەم: دووریی نێوان زەوی و مانگ:

ئەمیش دیسان کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر ژیانی ئێمە لەسەر زەوی:

١- هاوکۆ (معدل)ی دووریی مانگ و زەوی بە (٣٨٠,٠٠٠)کم، واتە: (٢٥٠,٠٠٠)میل مەزەندە دەکرێ، بۆیەش دەڵێین: هاوکۆی دووریی مانگ و زەوی، چونکە مانگ جاری وایە نزیکتر دەبێتەوە، جاری وایە دوورتر دەکەوێتەوە.

---

(١) دیارە من ئەم زانیارییانەم لە بارەی زەویەوە هێنان، زۆرەیان لە کتێبی (الأرض) هی (الكتور زغلول النجار)، هەروەها لە مەوسووعەکەی خۆم لە (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵی ئیلحاد)دا، هێناومن.

٢- مانگ بە (٢٧) ڕۆژو یەك لەسەر سێی ڕۆژێك بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، کە هەر کام لە بەرگە هەواو بەرگە ئاویی زەوی، بەو سووڕانەوەی مانگەوە بە دەوری زەویدا پەیوەستن، کە دەبێتە هۆی ئەوە هەم بەرگە ئاوییەکە بمێنێ و، بە دەوری زەوی، هەم بەرگە هەواییەکە.

٣- هێزی کێشندەی نێوان زەوی و مانگ، ئەگەر بمانەوێ بزانین چەندە؟ بە کێبلێکی پۆلایی کە تیرەکەی (٥٠)کم بێ مەزەندە کراوە.

٤- کێشکردنی زەوی بۆ مانگ و، ئەوەی کە لە نێوانیاندا هەیە، وێڕای کێشکردن (**جذب**)، حاڵەتی پاڵپێوەنان (**طرد**)یشی هەیە، کە ئەگەر وا نەبووایە و زەوی هەر مانگی کێشکردبایە، پێوەی دەنووسا، بەڵام هەموو حاڵەتێکی (**جذب**)، کێشکردن حاڵەتی (**طرد**) پاڵ پێوەنانیشی هەیە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە کێشی دەکات و، ئەویش ئەو پاڵی پێوە دەنێ لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو خولانەوەیە دروست دەبێ.

٥- کۆتا شت کە لە بارەی زەوییەوە باسی بکەین، بریتیە لە هاوکاریی نێوان ژیاندارو ڕووەك، شتێکی ئاشکرایە کە ژیانداران هەموویان مرۆڤ و هەرچی ژیاندارو زیندەوەرە، هەمووی ئۆکسجین هەڵدەمژێ و، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن فڕێ دەداتە دەرەوە، وەك زبڵێك و پاشەڕۆکێك، بەڵام خوا ﷻ تەگبیرێکی وای کردوە بۆ ژیانداران بە مرۆڤیشەوە، کە ئەو ئۆکسجینەی لە بەرگە هەوادا هەیە، تەواو نەبێ، چونکە ئەوان هەر هەڵیبمژن و بەکاری بێنن و، دوایی بیکەنە زبڵ و، لە شێوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆندا فڕێی بدەنەوە، کاتێك دێ کۆتایی پێ بێ، خوا ﷻ کارێکی وای کردوە ڕووەکەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، واتە: هەر لە پنجە گیایەکی بچووکەوە بگرە، تاکو درەختێك کە (٣٠)م بەرز دەبێتەوە، هەموویان بە پێچەوانەی ژیاندارانەوە، ئەوان دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەکاردێنن و، ئۆکسجین فڕێ دەدەنەوە، واتە: ئەوەی کە مرۆڤ و ژیانداران فڕێی دەدەن، وەك زبڵ و پاشەڕۆکێك لە سییەکانەوە فڕێی دەدەن، ئەوە دەبێتە خۆراك بۆ ڕووەك و دارو درەخت و شینا وردو، ئەوەی شینا وردو دارو درەخت فڕێی دەدەن

وەك پاشەڕۆكێك، ئەوەش كە ئۆكسجینە، دەبێتە خۆراك بۆ مرۆڤ و ژیانداران، بۆیەش هەبوونی سەوزایی و دارو درەخت لەسەر گۆی زەوی، زۆر خزمەت دەكات بە مرۆڤ و بە ژیانداران كە ئەندازەیەكی زیاتری ئۆكسجین بەرهەم بێنن، هەر بۆیەش لەو شوێنانەی دارو درەختی لێ نەبێ و، ئۆكسجینی كەمتری هەبێ، هەواو جەو كەمتر صاف دەبێ و ڕێژەی ئۆكسجینیش تێدا كەمتر دەبێ، كاتێكیش ڕێژەی ئۆكسجین كەم دەبێتەوە، مرۆڤ تووشی تەنگە نەفەسیی دێ، هەر بۆیە لەو شوێنانەی كە ئاگری لێیە، یان چڕە دووكەڵی لێیە، هەروەها لە چینەكانی سەرەوەی هەوادا، یان لەو شوێنانەی كە مرۆڤ بەرز دەبێتەوە و ڕێژەی ئۆكسجین كەم دەبێتەوە، مرۆڤ تووشی تەنگە نەفەسیی دەبێ، هەر بۆیەش شەریعەت ئەوەندە گرنگیی داوە بە پاراستنی ژینگە، بە تایبەت پاراستنی ژینگەی ڕووەكیی، لە زۆر لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ مسوڵمانان هاندراون بۆ ناشتنی نەمام و پاراستنی ژینگەو، بەكارنەهێنانی ڕووەك و دارو درەخت و نەشكاندنەوەیان، بەبێ هۆكارو پاساوێكی لۆژیكیی.

## کورتە باسێک لە بارەی جەستەی مرۆڤەوە

کورتــە باســێك دەربــارەی جەســتەی مــرۆڤ دەكەیــن، وەك زیاتــر هەڵوەســتە كــردن لــە بــەردەم ئــەو ڕســتە موبارەكــەی خــوای پــەروەردگاردا كــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، لــە خۆشــتاندا نیشــانە هــەن، ئایــا ســەرنج نــادەن، ئایــا ناڕوانــن ڕانامێنــن؟!

ئنجا بـۆ جێبەجێكـردنی فەرمـانی خـوا ﷻ، ئێمـە با سـەرنجێك لـە جەسـتەی خۆمان بدەیـن، شـایانی باسـە ئێمـە لـە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیـمان و پووچەڵیـی ئیلحـاد، لەبـەر ڕۆشـنایی زگـماك و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی)دا[1]، پانتاییەكـی باشـمان تەرخـان كـردوە بـۆ سـەرنجدان لـە جەسـتەی مـرۆڤ، بـەڵام بێگومـان ئـەوەی لـەوێ گوتـراوە پانتاییـەكی زۆری گرتـوە، ئێمـە باسـی ئـەوە ناكەیـن، بـەڵام بـۆ ئـەوە كـە كەسـێك بیـەوێ سـەرنجی وردتـر بـدات و، زانیاریـی زیاتـری هەبـێ، دەتوانـێ بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوێ بۆیـە باسـم كـرد، ئێسـتاش ئـەم كورتـە باسـە ڕاسـتەوخۆ لـە تەفسـیرەكەی (النابلسي)[2]، وەری دەگریـن، هەڵبەتـە بـە شـێوەی داڕشـتنی خۆمـان و، بـە تـۆزێ دەسـتكارییەوە لـە پـازدە (١٥) خاڵـدا، واتـە: ئـەوەی ئـەو گوتوویـەتی، ئێمـە لـە پـازدە (١٥) خاڵـدا كـورت و پوختـی دەكەینـەوە:

### ١- دەزگای بەرگرییكردن لە جەستەی مرۆڤ دا (جهاز المناعة):

ئـەو دەزگایـە لـە (٢٥,٠٠٠) خڕۆكـەی سپی پێـك دێ، بـە شـێوەی نزییككراوەیـی، بـەڵام كاتـێ كـە جەسـتە لەگـەڵ مەترسـییەكدا ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە، میكرۆبێـك، تەنێكـی نامـۆ (جسـم غریـب) مەترسـییەك ڕوو لـە جەسـتە دەكات، ئـەم ژمارەیـە دوو

---

(١) لە چاپی یەكەمیدا لە لاپەڕە: (٢٩٢ - ٤٦٣).

(٢) ج٩، ص: ٣٦-٤٢.

بەرانبەر دەبێتەوە، لەو کاتەدا خوا ﷻ وای کردوە ئەو (٢٥,٠٠٠) ببێتە (٥٠,٠٠٠)، ئەوەندەی دیکەش جەستە دروستی دەکات.

کاتێك میکڕۆبێك دەچێتە نێو خوێنەوە، یەکسەر ژمارەیەك لە خڕۆکە سپییەکان وەك دەستەی یەکەم دەچن، بزانن ئەو میکڕۆبە پێکهاتەکەی چۆنە؟ جفرە کیمیاییەکەی چییە؟ ئەوانە پێیان دەگوترێ: خانە پشکنەرەکان (**الخَلايا الإستطلاعيه**)، هیچ کاری دیکەیان نیە، کاریان نیە لەگەڵ ئەو میکڕۆبەدا بەشەڕ بێن، بەڵکو بەس دەچن تێیبگەن، دوای ئەوەی پێی ئاشنابوون، یەکسەر ئەو ڕەمزە کیمیاوییە دەدەنە گرێیە لیمفاوییەکان و، لە نێو گرێیە لیمفاوییەکاندا دژی ئەو ژەهرو میکڕۆبە دروست دەکرێ، ئنجا کە دژەکەی دروستکرا، نۆرەی ئەو خڕۆکانەی دیکەیە کە پێیان دەگوترێ: خانە جەنگاوەرەکان (**الخَلايا المقاتِلَة**) و بەو جفرە کیماییە کە وەریانگرتوە دەچن بە دژەکەی، شەڕ دەکەن لەگەڵ ئەو میکڕۆبەدا، کاتێك کە ئەوانە ئیشیان تەواو بوو، کە لە ئەنجامی ئەوەدا، هەم لە خڕۆکە سپییەکان لە بەین دەچن، هەم ئەو میکڕۆبانەش کە هاتوون، لەوانیش لە بەین دەچن، ئنجا جۆری سێیەمی خڕۆکە سپییەکان دێن، کە پێیان دەگوترێ: خانە قووتدەرەکان (**الخلايا اللاّقمة**)، ئەمانەش دەچن جەستەی خڕۆکە سپییەکان کە کەوتوون و هی میکڕۆبەکان کە کەوتوون، هەڵیان دەلووشن و قووتیان دەدەن، بۆ ئەوەی جەستە پاك بێتەوە لەو پاشەڕۆکە.

کەواتە: لە جیهازی بەرگریی (**جهاز المناعة**)، لە لاشەدا خڕۆکە سپییەکان هەن، لە حاڵەتی ئاساییدا بە (٢٥,٠٠٠) مەزەندە دەکرێن، لە حاڵەتی نائاساییدا دەبن بە دەوری (٥٠,٠٠٠) و ئەوانیش چوار جۆرن:

**جۆری یەکەم:** بەس دەچن ئەو میکڕۆبە، یان ئەو جیسمە نامۆیە کە هاتۆتە نێو جەستە، بزانن داخۆ چییە و جفرە کیماییەکەی وەردەگرن.

**جۆری دووەم:** دەچن دژی ئەوە دروست دەکەن، لە گرێیە لیمفاوییەکاندا.

**جـۆری سـێیەم:** کـە ئەوانـە زۆربـەن، ئەوانـەن کـە دەچـن دەجەنگـن لـە دژی ئـەو جیســمە نامۆیە.

**جـۆری چـوارەم:** ئەوانـەن کـە تەرمـی خڕۆکـە سـپییەکان، هەروەهـا هـی ئـەو دوژمنـەی هاتۆتـە نێـو جەسـتەوە، جەسـتەکەی هەڵدەلووشـن و قـووتی دەدەن، بـۆ ئـەوەی جەسـتەی لـێ پـاك بکەنـەوە.

یەکێـك لـەو نەخۆشـییانەی لـە ڕۆژگارەی ئێمـەدا هەیـە، پێـی دەگوتـرێ: نەخۆشـیی نەمـانی بەرگریـی (فقـدان المناعـة) لـە جەسـتەدا، ئەویـش (ئیـدز) یـان (ئایـدز)ی پـێ دەڵێـن، ڤایرۆسـەکەی بـەس ئیشـی لەگەڵ خڕۆکـە سـپییەکانە، دەچێ خڕۆکە سـپییەکان دەفەوتێنـێ و، کـە خڕۆکـە سـپییەکان لـە جەسـتەدا نەمـان، ئەوجـار جەسـتە وەك چـۆن قەڵایـەك دەروازەکـەی دەکرێتـەوە، هـەر کەسـێ ویسـتی دەتوانـێ خـۆی پێـدا بـکات.

کەواتـە: هـەرکات ئـەو خڕۆکـە سـپییانە لـە جەسـتەدا نەمـان، ئـەو کاتـە جەسـتە وەك باغێـکی بـێ پەرژیـن دەکەوێتـە گـۆڕێ، هـەر کەسـێ ویسـتی هـەر میکرۆبێـك، هـەر دژێـك خـۆی پێـدا دەکات، بۆیـە ئـەو جـۆرە کەسـانە بەرگـەی هیچ نەخۆشـییەك ناگرن.

## ٢- باسی خــڕۆکە سوورەکان:

لـە هـەر چرکەیەکـدا، لـە مرۆڤـدا دوو ملیـۆن و نیـو خڕۆکـەی سـوور پەیدادەبـن، لـە هـەر چرکەیەکیشـدا ئەنـدازەی ئـەوە واتـە: دوو ملیـۆن و نیـو خڕۆکـەی سـوور دەمـرن، ئنجـا ئایـا ئـەو خڕۆکـە سـوورانەی دەمـرن بـۆ کـوێ دەچـن؟ هەموویـان دەچـن بـۆ گۆڕسـتانی سـپڵ (**الطحـال**)، لەوێـدا (لـەو سـپڵەدا) ئـەو خڕۆکـە سـوورانە هەڵدەوەشـێنرێنەوە بـۆ هیمۆگلۆبیـن و ئاسـن، هیمۆگلۆبینەکـە دەچـێ بـۆ جگـەر لەوێشـەوە بـۆ زەرداو، کـە زەرداو بریتیـە لـە عەمبـاری خڕۆکـە سـوورە مـردووەکان، لـەوێ بـەڕێ دەکـرێ بـۆ نێـو کـڕۆکی ئێسـقان، تاکـو جارێـکی دیکـە لەوێـوە خڕۆکـە سـوورەکان دروسـت بکرێنـەوە.

### ٣- سپڵ (الطحال):

سپڵ بە گۆڕستانی خڕۆکە سوورەکان دادەنرێ، ئنجا ئەگەر خڕۆکە سپییەکان جیهازی بەرگریی جەستە پێك دێنن، خڕۆکە سوورەکانیش ئەوانەن کە خواردن و خۆراك بۆ هەموو خانەکان دەبەن، ئنجا ئەو خڕۆکە سوورانەی مردوون، دەچنە نێو سپڵەوە و، لەوێ سپڵ هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی ئەو خڕۆکە سوورانە، وەك گوتمان: ئاسن و هیمۆگلۆبینەکەی لێك جیادەکاتەوە، دوایی دەینێرێتەوە بۆ مۆخی ئێسقان، بۆ ئەوەی لەوێ دووبارە دروست بکرێتەوە، هەر بۆیە ئەوانەی سپڵیان نەخۆش دەبێ، چالاکیی جەستەیان کەم دەبێتەوە، چونکە خڕۆکە سوورەکان کەمتر شیی دەکرێنەوەو، دروست دەکرێنەوە، سەرەنجام بەرەو نەخۆشیی و مەرگ دەچێ.

### ٤- پەنکریاس:

ڕژێنێك دەر دەکات بە ناوی ئەنسۆلین، کە ئەنسۆلینە وادەکات شەکر بسووتێ، لە پلەی (٣٧)ی گەرمییدا، جەستەی مرۆڤ پلەی گەرمییەکەی (٣٧)ە، ئنجا دیارە شەکر لە پلەی (١٠٠)دا دەسووتێ، بەڵام بە هۆی ئەنسۆلینەوە کە پەنکریاس دەری دەکات، لە جەستەدا شەکر لە پلەی (٣٧)دا دەسووتێ، هەر بۆیە ئەوانەی پەنکریاسیان نەخۆش بێ، ماددەی ئەنسۆلینیان لە جەستەدا کەم دەبێ و شەکرەکەیان ناسووتێ و، سەرەنجام تووشی نەخۆشیی شەکرە دەبن.

هەڵبەتە هەموو کەس شەکر لە جەستەیدا هەیە، بەڵام ئەوانەی ساغ بن، پەنکریاسەکەیان ماددەی ئەنسۆلین دەردەکات و، ڕژێنی ئەنسۆلین شەکرەکەی جەستەیان دەسووتێنێ و دەیکات بە وزە، ئەوانی دیکەش شەکرەکەیان ناسووتێ و نابێتە وزەو کەڵەکە دەبێ و دەڵێن: تووشی نەخۆشیی شەکرە بووە.

### ٥- غودەی نوخامیی:

غودەی ژێر مێشکیشی پێ دەڵێن، کە کێشەکەی نیو گرامەو ، زۆر زۆر بچوکە، بەڵام دوازدە (١٢) هۆرمۆن دەردەکات، یەکێك لەو هۆرمۆنانەی دەریان دەکات،

ئەوەیە کاتێك مرۆڤ شتێکی مەترسییدار دەبینێ، دوژمنێك، یان دڕندەیەك، یان مارێك، یەکێك لەو هۆرمۆنانەی غودەی نوخامیی دەری دەکات لە کاتی شتێکی ترسناکدایەو، ئەو حاڵەتەی ترسە، یەکسەر تەبع دەگرێ و دەگوازرێتەوە بۆ مێشك، لە مێشکەوەش فەرمان دێ بۆ جیهازی هۆرمۆنیی بۆ غودەی نوخامی، ئەویش سەربازی لەبەر دەستدا هەن، یەکێك لە گرنگترین شوێنکەوتووانی و بەردەستەکانی بریتیە لە غودەی کەظەریی (الغدة الكَظَرِيَّةَ) کە لە پشتی هەردوو گورچیلەکانەوە هەیە، ئیدی فەرماندەکرێ بەو غودەیە و ئەویش چەند فەرمانێك دەردەکات:

**یەکەم:** ئەو غوددەیە فەرمان دەکات بە دڵ کە زیاتر لێ بدات، هەربۆیە بابای ترساو هەناسە بڕکە دەگرێ و، دڵ خێراتر لێدەدا جاری وایە دەگاتە (١٨٠) لێدان لە خولەکێکدا، لە جیاتی دەوری (٧٠) جار، بۆ ئەوەی خوێن زیاتر بۆ جەستە بچێ.

**دووەم:** فەرمان دەکات بە هەردوو سییەکان و، سییەکانیش زیاتر کاردەکەن بۆ ئەوەی ئۆکسجینی زیاتر وەربگرن.

**سێیەم:** فەرمان دەکات بە جگەر، تاکو ئەویش ئەندازەیەك شەکری زیاتر بۆ وزە فڕێ بداتە نێو جەستەوە.

**چوارەم:** فەرمان دەکات بە بۆرییەکانی خوێن، ئەوانیش تەسك دەبنەوە، بۆیە بابای ترساو ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ.

**پێنجەم:** فەرمان دەکات بە خوێن خەست بوونەوە (تجلّط)، بۆ ئەوەی خوێنەکەی ئەگەر برین و نەزیفێك بوو، یەکسەر هەمووی نە ڕژێ، بە ئاسانیی خوێنەکە بمەییەو بووەستێ، هەموو ئەوانەش لە کەمتر لە چرکەیەکدا ئەو فەرمانانە دەکرێن.

### ٦- هەندێك لە پێنج هەستەکان:

أ- بۆ وێنە: هەستی دیتن[1]. شتێك كە لە هەمووی گرنگترە ئەوەیە كە بەشێكی تۆڕی چاو لە دە (١٠) چین پێك دێ، لە هەر چینێكدا (١٣٠) ملیۆن خڕۆكەی درێژكۆڵەو مەیلەو خڕ هەن، ئەوانە هەموویان دەورو ڕۆڵیان هەیە، كە چۆن ئەو وێنەیە بگرن و دوایی بیگوازنەوە بۆ مێشك و، مێشك بزانێ ئەمە چییە و چۆنە؟

ب- لووت: لە لووتدا (٢٠) ملیۆن خانەی بۆنكردن هەیە، لە پانتاییەكدا كە بە (٢٥٠) ملیمەتر چوار گۆشە مەزەندە دەكرێ و، هەر كامێك لەو خانە بۆنكردنانە ڕیشوویان هەن، هەر كامێك لەوانە ماددەیەكی چەوری تێدایەو ماددەیەكی توێنەرەوەی تێدایە، كاتێك كە مرۆڤ بۆنێك دەكات، ئەو بۆنە دەتوێتەوە، كارلێكی كیمیایی لەگەڵدا دەكرێ، ئەوەش حاڵەتێ پەیدا دەكات و دەنێردرێ بۆ مێشك و، مێشك تێی دەگات چییە؟

ج- گوێ: با تۆزێك باسی گوێ بكەین: گوێ جگە لەوەی كە دەنگەكان دەبیستێ، هەمیشە گوێ كراوەیە لەبەر ئەوەی دەنگ دێ و دەڕوا، بەڵام دەگونجێ مرۆڤ چاو دابخات و بیكاتەوە چونكە دیمەنەكان دەمێننەوە، بەڵام دەنگەكان ئەگەر لەو لەحزەیەدا مرۆڤ گوێی داخرابێ، كە نەیبیست، دەنگەكە تێدەپەڕێ و دەڕوا، بەڵام دیمەنەكە دەگونجێ چاوبكاتەوە چاو دابخات و بیكاتەوە، ئنجا گوێ وێڕای ئەوەی دەنگەكان دەگوازێتەوە، كاریگەرییەكی زۆریشی هەیە لە هاوسەنگیی مرۆڤدا، هەر بۆیە ئەوانەی گوێیان تووشی نەخۆشیی دەبێ، بە تایبەتی گوێی نێوەوە، گوێی نێوەڕاست، حاڵەتی هاوسەنگییان تێكدەچێ، ناتوانن وەك پێویست بڕۆن.

**٧- هەموو ئەندامێك لە شوێنی شایستەی خۆیدا دانراوە:**

لە جەستەی مرۆڤدا هەتا ئەو ئەندامە گرنگتر بێ، خوای كارزان لە شوێنێكی مەحكەمترو قایمتردا دایناوە، بۆ وێنە: مێشك خوا خستوویەتە نێو جومجوومەوە، واتە: نێو كەللەی سەرەوە، كەللەی سەریش خەڵك وادەزانێ یەك ئێسقانە، بەڵام

---

(١) دیارە ئێمە لەو سەرچاوەیە ئاماژەمان پێدا، باسێكی تا ڕاددەییەك وردمان كردوە لە بارەی چاوو پێكهاتەكانی چاوەو، چەند بەشەو چەند پێكهاتەیە، ...هتد؟!

لـە چەنـد پارچـە ئێسـقان پێکهاتـوە، هـەر بۆیـە کاتێـك کە مرۆڤ سەریشـی دەشـکێ، نـەك هـەر بقرینجـێ، بەڵکـو ئێسـکی سەریشـی بشـکێ، تەنیـا ئـەو پارچەیـە دەشـکێ کـە دەشـکێ، ئنجـا ئەگـەر ئێسـکی سـەر هەمـووی یـەك بووایـە، وەك شووشـەیەك یـان گۆزەیـەك، چـۆن دەشـکێ هەمـووی پێکـەوە دەشـکێ هەمـووی پێکـەوە دەشـکا، ئنجـا خـوای پـەروەردگار مێشـکی خسـتۆتە نێـو کەللـەی سـەرەوە، هەروەهـا پەتکـە دڕك (**النخاعـي الشـوكي**)، خسـتووەتە نێـو بڕبڕاگەکانـەوە، هەروەهـا دڵـی خسـتۆتە نێـو قەفـەزی سـینگەوە، چـاوی خسـتۆتە نێـو مەحجـەرەوە واتـە: قوڵایـی چـاو کـە ئێسـقانە، منداڵـدانی خسـتۆتە نێـو ئێسـقەکانی حـەوزەوە بـە نسـبەت ئافرەتـەوە، کـە خـوای پـەروەردگار نـاوی لێنـاوە: ﴿فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾﴾ المؤمنون.

لـە مێشـکدا - کـە خـوای پـەروەردگار خسـتوویەتە ئـەو شـوێنە مەحکەمـەوە- (١٤٠) ملیـۆن خانـەی عەصەبیـی هەیـە، کـە تـا ئێسـتا زانسـت بـۆی دەرنەکەوتـوە کاریـان چییـە، هەروەهـا چـواردە (١٤) ملیـۆن خانـەی مێشـکیی هەیـە، کـە لـەو (١٤) ملیـۆن خانەیـەدا هەرچـی بیرکەوتنەوەیـە، بیرکردنەوەیـە، شـت خەزنکردنـە لـە مێشـکدا، دەرککـردنی شـتە، بیسـتنە، بۆنکردنـە، دیتنـە، هەمـوو ئەوانـە ئـەو چـواردە (١٤) ملیـۆن خانەیـە ئەنجامـی دەدەن.

### ٨- نوێبوونەوەی جەستەی مرۆڤ:

جەسـتەی مـرۆڤ زۆربـەی لـە مـاوەی چەنـد ڕۆژێکـدا، دەگـۆڕێ، مـەرج نیـە لـە مـاوەی چەنـد ڕۆژێکـدا هەمـوو خانـەکان بگۆڕێـن، بـەڵام جەسـتە بـە تـەواوی لـە مـاوەی پێنـج سـاڵاندا، هیچـی وەك خـۆی نامێنـێ، چونکـە درێژتریـن تەمـەنی خانەیـەك کـە لەجەسـتەدا هەبێ پێنج سـاڵە و، کورتتریـن تەمـەنی خانـەکانی جەسـتە بریتیـە لـە (٤٨) سـەعات، واتـە: هەیانـە تەنیـا (٤٨) سـەعات دەژی، دوو شـەوو دوو ڕۆژ، هەشـیانە پێنـج سـاڵان دەژی، خانەکانـی کـە لـە ڕیخۆڵـە وردەکانـدا هـەن، لـە هـەر (٤٨) سـەعاتدا جارێـك دەگۆڕێـن، جگـە لـە خانـەکانی مێشـك خانـەکانی مێشـك ناگۆڕێـن، هـەر خانەیەکیـان لـێ مـرد، تـازە نایەتـەوە جێگای و ئەگـەر هاتبـاو

خانـەكانی مێشـك گۆڕابانایـە بـۆ وێنـە: كەسـێك كـە دكتـۆرا دێنـێ لـە شـتێكدا، یـان دەبێتـە پزیشـك، یـان دەبێتـە ئەندازیـار، یـان دەبێتـە یاسـاناس، كـە خانەكانی مێشـكی دەگـۆڕان زانیارییەكانیشـی هەموویـان لەگەڵیـدا دەڕۆیشـتن و دەگـۆڕان.

## ٩- پەیكەریی ئێسكیی:

ئـەوەی وادەكات مـرۆڤ ئـەو قـەدو قیافەیـەی هەبـێ پەیكـەری ئێسـكییە، كـە خـوای پـەروەردگار ئێسـقانەكانی زۆر جـۆراو جـۆر دروسـتكردوون، ئێسـكی سـەر كەللـەی سـەر چەنـد بەشێكە، بـەڵام بەخـڕی دروسـت بـووە، بـەڵام ئێسـقانەكانی دیكـە، قەبـارە و شـێوەیان جیایـە بـۆ وێنـە: هـی دەسـت و پێیـەكان درێـژن، هـی بڕبـڕەكانی پشـت جۆرێكن، سـەرە پەنجـەكان جۆرێكـن، ئنجا ئێسـكەكانی دەم و چـاو جۆرێكـن، پەراسـووەكان جۆرێكی دیكـەن، هـەر كامێـك لـە جـۆری ئـەو ئێسـقانانەش كـە خـوای زانـا و توانـا جـۆراو جـۆری كـردوون، هـەر كامێكیـان چـۆن خـوا دروسـتی كـردوە، دەبووایـە هـەر وابـێ، بـۆ وێنـە: ئێسـكی پەراسـووەكان كـە مـرۆڤ (٢٤) پەراسـووی هـەن، هـەر لایـەی (١٢)، پەراسـووەكان كۆتاییەكەیـان بـە كـرۆژ كـرۆژە (غـضروف) دێ، بـۆ ئـەوەی تیـژ نەبـن و لـە گۆشـت هەڵچەقـن، هەروەهـا زۆربـەی ئێسـقانەكان كۆتاییەكەیـان ماددەیـەكی كـرۆژ كرۆژەییـە، بۆ ئـەوەی ئـەو ئێسـقە یەكسـەر بـە ڕەقیـی نەچێتـە نێـو گۆشـتەكەوە، كـرۆژ كـرۆژەش لـە نێـوان ئێسـقان و گۆشـت دایـە، ئنجـا ئـەو پەیكـەری ئێسـكییە كـە هەمـوو ئـەو ئێسـقە جـۆراو جۆرانـەن، حیكمەتەكـەی ئەوەیـە كەسـێ شـوێنێكی دەشـكێ، بـەڵام شـوێنەكانی دیكـەی سـەلامەتن، بـەڵام ئەگـەر هاتبـاو پەیكـەری ئێسـكیی هەمـووی پێكەوە پەیوەسـت بووایـە، لەهـەر شـوێنێكەوە شـكابایە، هەمـووی دەشـكا، وەك چـۆن شووشـەیەك دەشـكێ.

## ١٠- قورقــوڕاگـــــە:

ئەگـەر تەماشـای قوڕقوڕاگـە بكەیـن! خـوای كاربەجـێ پارچـە گۆشـتێكی دانـاوە پێـی دەگوتـرێ: زمانـە چكۆڵـە (لِسَـان المزمـار)، كـە وەك پۆلیسـی هاتووچـۆ وایـە، مـرۆڤ ئەگـەر تەمـەنی (٧٠) سـاڵە، (٨٠) سـاڵە، (١٠٠) سـاڵە، ئـەو زمانـە چكۆڵەیـە كـە لـە قوڕقوڕاگـە دایـە، لـەوێ پاسـەوانێكی زۆر گورجوگۆڵـە، چونكـە

ئـەو قورقوراگەیـە دوایـی دەبێـە دوو بـەش بەشـێك دەچـێ بـۆ سـییەكان بـۆ هـەوا، بەشـێكیش بـۆ خـواردن و خواردنـەوە دەچـێ بـۆ گـەدە، هەردووكیـان، هـەم هـەواو هـەم خـواردن و خواردنـەوە بـە یـەك شـوێندا دەچـن، ئنجـا ئـەو زمانـە چكۆڵەیـە لـە كاتێكـدا تـۆ خـواردن و خواردنـەوە دەخـۆی، لای هەناسـە دەگـرێ بـۆ ئـەوەی دڵۆپـە ئاوێـك و دەنكـە خواردنێـك نەچێتـە نێـو، سـییەكان و، كاتێـك هەناسـە هەڵدەمـژی لای گـەدە دەگـرێ، بـۆ ئـەوەی هـەوا نەچێتـە نێـو گـەدەوە، ئنجـا جـاری وا هەیـە ئینسـان بـە پەلـە پـەل شـت دەخـوات، یـان لـە كاتێـكی نائاسـاییدا شـتێك دەچێتـە نێـو هەناسـەیەوە و دەسـت دەكات بـە كۆخـە كـۆخ، بـێ ئـەوەی خـۆی بیـەوێ، بـە شـێوەیەكی ئۆتۆماتیكیـی تاكـو ئـەو تەنـە نامۆیـە كـە چۆتـە نێـو سـییەكانەوە، یـان چۆتـە نێـو بۆڕییـەكانی هـەواوە، فـڕێ بـدرێ، كـە بێگومـان هەمـووشی لـە مێشـكەوە فەرمـانی بـۆ دێ، بـێ ئـەوەی تـۆ بیـری لـێ بكەیـەوە، لـە كاتێكدا كـە ئێمـە خەوتووین ئـەو زمانـە چكۆڵەیـە بـۆ خـۆی هـەر لـە كار دایـە.

### ١١ـ فڕێدانەدەری پاشەڕۆك:

ئەگـەر تەماشـای جەسـتە بكەیـن لـەو ڕووەوە كـە خـوا ﷻ چەنـد ئەندامێـكی لـە جەسـتەدا خوڵقانـدوون بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ پاشـەڕۆكەكەی فـڕێ بداتـەدەر، چ لـە ڕێـی ئارەقـە كردنـەوە، چ لـە ڕێـی میـزو پیسـاییەوە، چ لەڕێـی تـف و بەڵغەمـەوە، ئـەو ماددانـەی مـرۆڤ لـە جەسـتەی فڕێیـان دەداتـەدەر، بـۆ ئـەوەی حیكمەتـی خـوا لـەو حاڵەتـەی جەسـتەو فڕێدانـی پاشـەڕۆكانی، بزانیـن، بـا وێنەیـەك بهێنینـە بـەر چاومـان: ئەگـەر فوودانـە (میزڵدان)ێـك بێنیـن و پـڕی بكەیـن لـە ئـاو دوایـی كونێـكی تێبكەیـن، ئاوەكـە هەمـووی دێتـە دەرێ تـا تـەواو دەبـێ، بـەڵام ئـەدی بۆچـی مـرۆڤ وانیـە؟ جەسـتەمان پـڕە لـە خوێـن، ئـاوی تێدایـە، هەروەهـا پاشـەڕۆكی تێدایـە، ئارەقـەی تێدایە، بـەڵام هیـچ كام لەوانـە لـە خـۆوە نایەنـە دەرێ، هەموویـان خـوای پـەروەردگار وای داناون دەبـێ لـە مێشـكەوە فەرمـانی بـۆ بـێ، ئەگەرنـا تـۆ مـرۆڤ هـەر لەخـۆوە میـزی هاتبایـە، یـان هـەر لەخـۆوە پاشـەڕۆكی هاتبایـە، یـان هـەر لەخـۆوە خوێـن هاتبایـە!

نەخێر هەمـووی خـوای کارزان زەبـت و کۆنترۆڵـی کـردوەو، لـە ڕێـی مێشـکەوە بـێ ئـەوەی مـرۆڤ بـۆ خـۆی فکـری پـێ بشـکێ، تەنیـا کاتێـك مـرۆڤ دەیـەوێ ئنجـا دەتوانـێ پاشـەڕۆکان لـە خـۆی جیابکاتـەوە، کـە هـەم دەبـێ لـە مێشـکەوە ئیعـازی بۆبـێ، جـاری وایـە مـرۆڤ ئەگـەر بـۆ خـۆی بشـیەوێ، ئەگـەر لـە مێشـکەوە ئیعـازو تەوجیهـی بـۆ نەهـات، ناتوانـێ ئـەو شـتە لـە خـۆی جیابکاتـەوە.

### ١٢- پـــرۆســـــتات:

بـا سـەرنجێکی پرۆسـتات بدەیـن (بەنسـبەت پیاوانـەوە، چونکـە تەنیـا پیـاوان پرۆسـتاتیان هەیـە)، پرۆسـتاتیش لوێـکی گچکەیـە دەکەوێتـە دووڕیـانی دوو گونـەکان و دوو گورچیلەکانــەوە، ئەمــە ئنجــا ئایــا پرۆســتات کاری چییــە؟ مــرۆڤ کاتێــك جووتبـوون ئەنجـام دەدات لـە ڕێـی گونەکانـەوە، تـۆو دێ، هەروەهـا کـە پرۆسـەی میزکـردن ئەنجـام دەدا لـە شـوێنی خۆیـەوە میزکـردن دێ، ئنجـا ئـەو پرۆسـتاتە کاتێـك مـرۆڤ میـز دەکات، ماددەیـەك دەردەکات بـۆ ئـەوەی ئـەو شـوێنەی میـزی پێـدا دێ، دوای ئـەوەی میـزی پێـدا هاتـوە، پـاك بکرێتـەوە، ئەگـەر تـۆو (مني)یـش بـێ دیسـان جـۆرە ماددەیـەکی دیکـە دەردەکات، لـە کاتێکـدا ئـەو ماددەیـەی پرۆسـتات دەری دەکات، هــەم پاککەرەوەیــە، هــەم بۆنخۆشــکەرەو، هــەم ماددەیــەکی خۆراکییشــە بـۆ ئـەو شـوێنەی پێیـدا دێ، ئنجـا کابـرا جـاری وایـە تەمـەنی (٨٠) سـاڵە یـان (٩٠) سـاڵە، ئـەو ڕژێنـە بچووکـە، خـوا ﷻ دایناوە هەرجارێ میـز دەکات، یاخـود حاڵـەتی جووتبـوون ئەنجـام دەدات دەبـێ بەپێـی ئـەو حاڵەتـەی دەبـێ، ئـەو پرۆسـتاتە بـۆ هـەر کامێکیـان ماددەیـەکی تایبـەت دەربـکات.

### ١٣- خـــۆراکی مـــــنداڵ :

منـداڵ کـە لـە دایـك دەبـێ، خـوا ﷻ بەپێـی تەمـەنی ئـەو منداڵـە خـۆراکی بـۆ سـاز دەکات لـە مەمـکی دایکیـدا، جـارێ هـەر یەکسـەر کـە لـە دایـك دەبـێ، ئـەو شـیرەی لــە مەمکــی دایکیــدا پەیدادەبــێ، لــە قــەدەر تەمــەنی ئــەو منداڵەیــە، ئەنــدازەی

خەستیی و ڕوونیی و ماددەکانی و پێکهاتەکانی، بەپێی تەمەنی ئەو منداڵەن، هەتا ئەو منداڵە زیاتر دەکەوێتە تەمەنەوە، ئەو شیرەش خەستتر دەبێ و، دەوڵەمەنتر دەبێ و، بە شێوەیەك دەبێ زیاتر پێداویستییەکانی ئەو منداڵە دابین بکات، هەر هەروەها مەسەلەی مژین، ئەو منداڵە چۆن دەزانێ مەمکی دایکی بمژێ؟

(**محمد راتب نابلسي**)، قسەیەکی خۆش دەکات، دەڵێ: ئەو منداڵە گچکە جارێ کە مەلۆتکەیەو گچکەیە، نەدەکرا بڵێین: ڕۆڵە! دەبێ ئاوا مەمکی دایکت بمژی! بەبێ ئەوەی تەمەن بیست (٢٠) ساڵ بێ، ڕاهێنان و مەشقی پێکرابێ، یەکسەر ئەو منداڵە دەزانێ چۆن مەمکی دایك بمژێ، کە ئینسانی گەورە ناتوانێ ئاوا شت بمژێ، ئنجا وەك گوتم: بە پێی قۆناغی تەمەنەکەشی، شێوەی شیرەکە دەگۆڕێ، پێکهاتەکانی دەگۆڕێن، چونکە ئەو شیرەی لە تەمەنی (٨ - ٩) مانگییدا خوای میهرەبان لە مەمکی دایکیدا، دروستی دەکات، ئەگەر لە کاتی لە دایك بوونیدا، بەو جۆرە بێ، گەردی ئەو منداڵە بۆی هەزم ناکرێ، بەڵام وردە وردە لەگەڵ هەڵکشینی تەمەنی دا، شیرەکەش خەستتر دەبێتەوە.

هەر لە بارەی ئەو شیرەوە کە منداڵ دەیمژێ، ئەو منداڵە کە یەکەم جار مەمکی دایکی دەمژێ، هەر دوای مژینی یەکەم ئەو شەکرەی لەو شیرەدا هەیە، چوار قات دەبێتەوە، ئنجا پێ بەپێ چەند قات دەبێتەوە، بەپێی هەڵکشینی تەمەنەکەی، ئنجا ئەو شیرەی ئەو منداڵە دەیمژێ، هەرچی هۆکاری ڕێگرتنە لە نەخۆشی و، لە میکرۆبەکان لەو شیرەدا هەیە، هەر بۆیە هیچ شیرێك کەلێنی شیری دایك ناگرێتەوە، چونکە شیرەکانی دیکە، ڕەنگە پرۆتین و چەوریی و ڤیتامینەکانی تێدابن، بەڵام مەناعەو ڕێگرتن لە نەخۆشیی و لە میکرۆبەکانی تێدانیە، ئنجا ئەو شیرەی خوا لە سینگی دایکدا دروستی دەکات، لە زستاندا مەیلەو گەرمەو، لە هاویندا مەیلەو ساردە و تەعقیم کراوە بە شێوەیەك کە ڕێگا بە هیچ میکرۆب و بەکتریایەك نادات بچێتە نێوی.

### ١٤- تێدا دانرانی غەریزەو هەستەکانی دیکە:

خـوا ﷻ لـە جەسـتەی مرۆڤـدا چەنـد شـتێکی دانـاون، بەبـێ ئـەوەی ئیـرادەی مرۆڤیـان تێدابـێ:

**یەکەم:** هەستکردن بە پێویستیی بە خواردن و خواردنەوە، بۆ ئەوەی ژیانی بەردەوام بێ، مرۆڤ بێ ئەوەی خۆی بیر بکاتەوە، جەستەی داوای خواردن دەکات، داوای خواردنەوە دەکات، بەڵکو زۆر جار جەستەی داوای ڤیتامینەکان دەکات، ئارەزووی بۆ شتی مزر دەچێ، مەیلی بۆ شتی ترش دەچێ، کەیفی بۆ شتی شیرین دەچێ، ئارەزووی شتی سوێر دەکات، چونکە جاری وایە مرۆڤ بۆ خۆی لە بیری دەچێتەوە، بەڵام جەستەکەی خوا وای خولقاندوە، چی پێویست بێ داوای دەکات.

**دووەم:** جەستەی مرۆڤ لە ڕووی جینسییەوە، دیسان داواکاریی هەیە، ژیانی مرۆڤ و وەچەی مرۆڤ بەردەوام بێ، ئەگەر وانەبووایە کە هێزی جینسی لە مرۆڤدا، غەریزەیەکی زۆر بەهێزە تاکو نەوەی مرۆڤ بەردەوام بێ، هەستی خواردن و خواردنەوە لە مرۆڤدا هەیە، تاکو خودی ئەو مرۆڤە ژیانەکەی بەردەوام بێ، پاشان هەستی جینسیی هەیە تاکو وەچەی مرۆڤ بەردەوام بێ.

**سێیەم:** هەستێکی دیکەش خوا دایناوە لە مرۆڤدا، کە لە هی یەکەم و دووەم کەمتر گرنگ نیە، هەرچەندە هەستێکی مەعنەوییە، ئەویش بریتیە لەوەی مرۆڤ هەست دەکات لە ڕووی مەعنەوییەوە ڕێز لێگیراوبێ، هەبێ، بەردەوام بێ، بە قەدرو حورمەت بێ، ئەمەش وادەکات مرۆڤ خاوەنی بوون و کەسایەتیی خۆی بێ، بەرگریی لە خۆی بکات، هەموو ئەو هەستانە خوای پەروەردگار لە مرۆڤدا دایناون، بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ بۆ خۆی دەستی تێیاندا هەبێ، بەڵکو خوا ﷻ بەو شێوەیەی دروستکردوە چونکە خوا ﷻ دەزانێ وانەبێ، ژیانی مرۆڤ بەردەوام نابێ.

کەواتـە: کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾، لـە خۆتانـدا نیشـانەی زۆر هـەن، ئایـا سـەرنج نـادەن؟ ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە پێویسـتە

سـەرنج لـە خۆمـان بدەیـن، ئنجـا لـە کۆتایـی ئـەو قسـانەی (**محمـد راتـب نابلسي**)دا کـە لێـمان خواسـتنەوە، باسـی سـێ شـتی دیکـەی جەسـتەش دەکـەم:

## ١٥- ددانەکان و مووەکان و پەنجە و نینۆکەکان:

### یەك: ددانـــــەکان:

ددانـەکان کـە لـە نێـو دوو شـەویلاگەی مرۆڤـدا هـەن، هەمـوو مرۆڤێـك سـی و دوو (٣٢) ددانی هەیـە، لـە حاڵـەتی ئاسـایی تەندروسـتییدا، ئـەو ددانانـەش، وێـڕای جوانییـەك کـە بـە دەم و چـاوی مرۆڤـی دەبەخشـن، کاتێـك مـرۆڤ دەکەوێتـە تەمەنـەوە ددانـەکانی نامێنـن، حاڵەتێـکی دیکـەی هەیـە، زۆر جیـا لـەوەی کـە زاری پڕ لـە ددانـە! ئنجـا بـا سـەرنجێکی وردتـر لـە ددانـان بدەیـن: هـەر کام لـەو ددانانـە هەمـووی زینـدوون و دەمـار و ڕیشـەی هەیـەو، خـۆراکی بـۆ دەچـێ و، هەمـووی گەشـەی هەیـە و... هتـد. ئـەو ددانانـەش خـوا دابەشـی کـردوون بـۆ سـێ جـۆر:

أ- بەشێکیان کە بڕەرەکان (قواطع)یان پێ دەڵێن، ئەوانەی پێشەوەن و شتیان پێ دەبڕرێ.

ب- بەشێکیان کەڵبەکان (نواجذ)یان پێ دەڵێن، ئەوانەی شتەکانیان پێ قڵت قڵت دەکرێن.

ج- بەشێکیان خرێنەکان (اضراس)یان پێ دەگوترێ، بۆ هاڕینی شتەکان، تۆ شتێك کە دەخۆی پێشێ دەبێ بیبڕی بە ددانەکانی پێشەوە، بەڵام ئەو بڕینە بە تەنیا کافیی نیە، کە دوایی بتوانی قووتی بدەی، بۆیە ئەوجار پێویستە بە پڕۆسەی دووەم دا بڕوا: قڵت قڵت کردنی، دوای ئەوەی بڕیت و پچڕیت، ئنجا قڵت قڵتی دەکەی، بەڵام دیسان جارێ بەس نیە کە قووت بدرێ و ئاسان بکرێ بۆ هەرسکران، بۆیە دەبێ بدری بە خرێنەکان بۆ ئەوەی بهاڕدرێ، ئنجا دوای هاڕینی، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی زمان قووتی دەدات، بێ ئەوەی تۆ بیری لێ بکەیەوە یەکسەر زمان حەواڵەی گەرووی دەکات.

## دوو: مـــــووەکان:

ئەگـەر ئینسـان تەماشـای مـووەکانی دەم و چـاوی بـکات، بـە نسـبەت پیـاوەوە مــووی ڕیــش و ســمێڵ جۆرێکــە، کــەم دەکات و زیــاد دەکات و، پێویســتیی بــە چاککـردن هەیـە، بـەڵام مـووی برۆیـەکان و برژانگـەکان جۆرێـکی دیکەیـە، مـووی برژانگـەکان کـەس نەیبینیـوە گەشـە بـکات، بـرۆ لەوانەیـە جـاری وایـە موویـەکی لـێ کـەم و زیـاد بـکات و پێویسـتیی بەچاککـردن بـکات، بـەڵام برژانگـەکان کـەس نەبـووە برژانگـی خـۆی دەسـتکاریی بـکات[1]، لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ برژانگـی زیـاد لـە پێویسـت درێـژ بـووە! هەروەهـا جـۆری مووەکانیـش جیایـە، جـۆری مـووی سـەر و سـمێڵ و ڕیـش و جـۆری مـووی بـرۆ و، جـۆری مـووی برژانگـەکان جیـاوازن.

## سێ: پەنجـــــەکان و نینۆکەکان:

ئەگـەر ئینسـان تەماشـای پەنجـەکان بـکات، پەنجـەکانی دەسـت وەك پێشـینان گوتوویانـە: «پەنجـەکانی دەسـت هەموویـان وەك یـەك نیـن»، خـوای پەروەردگاریـش جـۆراو جـۆری خوڵقانـدوون، پەنجـە گـەورەو بەجیـا ئـەو چوارانـەی دیکـە بـە ڕیـز بەجیـا، بـەڵام بەهەموویـان ئەوجـار ئـەو کارانـەی دەویسـترێ، ئەنجـام دەدرێـن، کۆتایـی پەنجەکانیـش بـە نینۆکـەکان هاتـوە، ئـەو نینۆکانـەش ئـەوە دیـارە جوانییـەك دەدەن بـە دەسـت و پەنجـە، بـەڵام لـەوەش گرنگـتر پەنجـەکان مەحکـەم دەکـەن، مـرۆڤ کاتێـك نینۆکێـکی نامێنـێ، ئنجـا هەسـت دەکات دەڵـێ ئـەو پەنجەیـەی چەنـد بـێ هێـز بـووە، جـۆری ئێسـقانی نینۆکەکانیـش، چ هـی پەنجەکانـی دەسـت، چ هـی پەنجـەکانی پێیـەکان، لەلایەکـەوە گەشـە دەکـەن، لەلایەکیشـەوە ئازاریـان نیـە، یـانی: نینـۆک گەشـە دەکات بـۆ ئـەوەی ئەگـەر نینۆکێـت شـکا، یـان پـەڕی، دروسـت بێتـەوە، بـەڵام واش نیـە ژانی تێـدا هەبـێ و هەسـتی تێـدا هەبـێ، کـە بڕیـت وەك

---

(١) لـەم ڕۆژگارەدا بەشـێك لـە ئافرەتـان کـە زێدەڕۆیـی دەکـەن لەسـەر گەرمبوون بەجەسـتەیاندا، دەسـتکاریی برژانگیشـیان دەکەن!!

چۆن گۆشت دەبڕی خوێنی لێ بێت! بەڵێ برژانگ و نینۆك و بڕۆو ددان، ئەو شتە وردانە، تاكو ئەندامە گەورەو گرنگ و سەرەكییەكانی جەستە، ئینسان هەر شتێك لێی ورد بێتەوە، هەتا سەرنجی بدات حیكمەت و نهێنیی زیاتری بۆ دەردەكەون، هەرچەندە زیاتریش وردبیەوە لە جەستەی خۆت، ئنجا فەرمانی خوا زیاتر جێبەجێ دەكەی، وەك دەفەرموێ: ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾، لە جەستەی خۆتاندا بۆچی نابینن، ئایا نابینن و سەرنج نادەن؟!

خوا بە لوتف و كەرەمی خۆی، ئێمە لەو كەسانە بگێڕێ كە سەرنج لە هەموو دروستكراوەكانی خوا دەدەن، پێش هەموو شتێك جەستەی خۆمان، ئنجا زەوی و ئاسمان، كە خوا ﷻ زۆر سەرنجی ئێمەی ڕاكێشاوە بۆ سەرنجدان لە دروستكراوەكانی خۆی، تاكو سیفەتەكانی خواو كاربەجێیی و میهرەبانیی و كەرەم و بەخشش و دەستەڵاتی بێ سنووری خوا، زیاتر ببینین. بێگومان ئێمە دوو كتێبمان لەبەر دەست دان بۆ ناسینی خوا: یەكەم: كتێبی خوێندراوەی خوا كە قوڕئانە، دووەم: كتێبی بینراوی خوا كە گەردوونە، هەتا لەو دوو كتێبانە شارەزاترو پێیان ئاشناتر بین، بە دڵنیایی هەم بێژەری قوڕئانەكە كە خوای ڕاستبێژەو، هەم بەدیهێنەری گەردوونەكە كە خوای بەدیهێنەوە، زیاتر دەناسین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە ئایەتـەکانی: (٢٤ - ٤٩) واتـە: بیسـت و شـەش (٢٦) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، لـەو (٢٦) ئایەتـەدا خـوای بـەرزی مـەزن، باسـی شـەش (٦) کـەس لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)و، گەلەکانیـانی کـردوە:

**یەکەم:** ئیبراهیم ﷺ.

**دووەم:** لووط ﷺ.

**سێیەم:** مووسا ﷺ لە بەرانبەریشیدا فیرعەون و گەلەکەی.

**چوارەم:** باسی گەلی عاد کراوە کە پێغەمبەرەکەیان هود ﷺ بووە.

**پێنجەم:** باسی گەلی ثەموود کراوە، کە پێغەمبەرەکەیان صاڵح ﷺ بووە، لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، ناوی ئەو دوو پێغەمبەرانە، واتە: هوود و صاڵح لەگەڵ عادو ثەموودا هاتوە.

**شەشەم:** باسی گەلی نووح ﷺ کراوە.

کـە لـەو سـیاقەدا باسـکراون، جگـە لـە ئیبراهیـم ﷺ کە - بۆنـەی مـوژدە پێدرانی و، بـە بۆنـەی ئاگادارکرانـەوەی لـە فەوتێـنرانی گـەلی لـووط، باسـکراوە - ئەگەرنـا ئەوانی دیکـە هەموویـان بـەو بۆنەیـەوەو، لـەو سـیاقەدا باسـیان کـراوە و، باسـی گەلەکانیـان کـراوە، کـە خـوای کارزان و دادگـەر بەهـۆی یاخیبوونیـان و، بـە درۆدانانیـان بـۆ پەیـام و پێغەمبـەرانی خـواوە (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**) سـزای داون و فەوتانـدوونی.

ئـەوە لە بیسـت و سـێ (٢٣) ئایەتی سـەرەتاداو، لە سـێ ئایـەتی کۆتاییـدا ئایەتەکانی: (٤٧ و ٤٨ و ٤٩)دا، باسـی سـێ دیـاردەی یەکجار گەورەو گرنگـی گەردوون کراوە:

**١-** ئاسمان و فراوانکردن و لێك کێشانەوەی.

٢- زەوی و پان ڕاخستن و ئامادەکردنی بۆ ژیانی مرۆڤ و جند.

٣- بە جووت (زوج) دروستکرانی هەموو شتێك.

﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ
مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ
مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ
عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾ ۞ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا
ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ
رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾
وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِى مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ
﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَـٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِى عَادٍ
إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِى ثَمُودَ
إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا
ٱسْتَطَـٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾
وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَـٰهَا بِأَيْي۟دٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَـٰهَا فَنِعْمَ ٱلْمَـٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ
خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئایا هەواڵی میوانە ڕێز لێگیراوەکانی ئیبراهیمت بۆ هاتوە؟ (ئەی موحەممەد!) ﴿٢٤﴾ کاتێك لێی وەژوورکەوتن، یەکسەر گوتیان: سەلامت لێ بێ، گوتی: سەلامێکی چەسپاوتان لێ بێ (لەبەر خۆیەوە گوتی: ئێوە) کۆمەڵێکی نەناسراون ﴿٢٥﴾ ئنجا بە پەنهانیی (بە جۆرێك میوانەکان هەستی پێ نەکەن) چووە لای خێزانی و گۆلکێکی قەڵەوی (بە برژێنراویی) (بۆیان) هێنا ﴿٢٦﴾ ئیدی لێی بردنە پێش (کاتێك دیتی ناخۆن) گوتی: ئەرێ ناخۆن؟ ﴿٢٧﴾ بەهۆیانەوە ترسی ڕێنیشت، گوتیان: مەترسەو موژدەی لاوێکی زاناشیان پێدا ﴿٢٨﴾ ئافرەتەکەی (کاتێك گوێبیستی ئەو موژدەیە بوو) بە قیژاندنەوە هات و، لە ڕووی خۆی داو گوتی: (چۆن منداڵم دەبێ لە کاتێکدا من) پیرەژنێکی نەزۆکم؟ ﴿٢٩﴾ (فریشتەکان) گوتیان: پەروەردگارت بەو شێوەیەی فەرمووە، بێگومان هەر ئەوە کارزانی زانا ﴿٣٠﴾ (ئیبراهیم) گوتی: کار(ە گرنگەکە)تان چییە، ئەی نێردراوان؟ ﴿٣١﴾ گوتیان: ئێمە بۆ لای کۆمەڵێك تاوانبار نێردراوین (تاکو سزایان بدەین) ﴿٣٢﴾ (نێردراوین) تاکو بەردی لە قوڕ (دروستکراو)یان بەسەردا بنێرین (ببارێنین) ﴿٣٣﴾ لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ زێدەڕۆیان نیشانەدار کراون ﴿٣٤﴾ ئنجا (ئاوەدانییەکە) هەر کەس لە بڕواداران تێیدا بوون دەرمانهێنان (دەربازمان کردن) ﴿٣٥﴾ کەچی جگە لە ماڵێك لە مسوڵمانانمان تێیدا لێ هەڵنەکەوت ﴿٣٦﴾ نیشانەیەکیشمان تێدا بەجێهێشت لە شوێنەوارەکەیان بۆ ئەوانەی لە ئازار(و سزا)ی بە ئێش دەترسن ﴿٣٧﴾ هەروەها لە (بەسەرهاتی) مووساشدا (بەڵگەو نیشانە هەن)، کاتێك بە بەڵگەیەکی ڕۆشنەوە ناردمانە لای فیرعەون ﴿٣٨﴾ کەچی بە هەموو هێزی پشتی هەڵکردو گوتی: (مووسا) جادووگەرە، یان شێتە ﴿٣٩﴾ ئێمەش یەکسەر خۆی و سەربازەکانیمان گرت، ئیدی لە حاڵێکدا ئەو (فیرعەون) سەرکۆنەکراو

بـوو، فرێماندانـه دەریـاوە ﴿٤٠﴾ هەروەهـا لـە (گـەلی) عادیشـدا (بەڵگـەو نیشـانە هەبـوون) کاتێـك بایـەکی بـێ خێـر(و بـێ بەرهەم)مـان نـاردە سـەریان ﴿٤١﴾ هـەر شـتێك بەسـەریدا هاتبایـە، هەتـا وردو خاشـی نەکردبایـە وازی لـێ نەدەهێنـا ﴿٤٢﴾ هەروەهـا لـە (گـەلی) ثەموودیشـدا (بەڵگـەو نیشـانە هەبـوون) کاتێـك پێیـان گوتـرا: هەتـا ماوەیـەك (ی کـەم) بەهرەمەندبـن، (بیگوزەرێنـن) ﴿٤٣﴾ کەچـی ئـەوان لـە فەرمانی پەروەردگاریـان یاخیـی بـوون، ئنجا لە سزای (ئـەوەدا) برووسـکە (و بڵێسـە) گرتنـی لـە حاڵێـکدا کـە تەماشـایان دەکـرد ﴿٤٤﴾ سـەرەنجام نـە توانـای هەڵسـانیان هەبـوو، نـە سـەریش خـران ﴿٤٥﴾ هەروەهـا گـەلی نووحیـش بـەر لـەوە (فەوتێـنران) چونکـە ئـەوان کۆمەڵێـکی لارێ بـوون ﴿٤٦﴾ ئاسمانیشـمان بەهێـز(ی تایبـەتی خۆمـان) بنیاتنـاوەو ئێمـە فراوانکەریشـین ﴿٤٧﴾ زەویشـمان ڕاخسـتوە، ئنجـا ئێمـە چاکتریـن ڕاخـەر (و ئامـادەکار)ی بوویـن (بـۆ ژیـانی مـرۆڤ و جنـد) ﴿٤٨﴾ لـە هەمـوو شـتێکیش جووتێـکمان دروسـتکردوە، بەڵکـو بیرتـان بکەوێتـەوە (و پەنـد وەربگـرن) ﴿٤٩﴾}

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(ضَيۡفِ): (أَصْلُ الضَيْفِ المَيْلُ، ضَيَّفْتُ إلى كَذَا، وَأَضَفْتُ كَذَا إلى كَذَا، وَالضَّيْفُ مَنْ مَالَ إِلَيْكِ نَازِلاً إلَيْكَ، وَالضَّيْفُ مَصْدَرُ، وَقَدْ يُجْمَعُ أضِيْفَان وَضُيُوف وَضيفان)، (ضَيْف): لە ئەصڵدا بە مانای لادان و مەیل كردنە، دەگوترێ: (ضيفت إلى كذا)، یان (أَضَفْتُ كَذَا إلى كَذَا)، فڵان شتەم، بۆ لای فڵان شتە برد، یاخود (ضَيَّفْتُ إلى كَذَا)، مەیلم بە لای فلانە شتدا كرد، (ضَيْف): كەسێكە كە بەلای تۆدا مەیلی كردوە، یان دابەزیوە بۆ لای تۆ، وشەی (ضَيْف)، چاوگە هەر بۆیە بۆ تاك و، بۆ دووان و، بۆ كۆ بەكاردێ، بەڵام جاری واش هەیە وشەی (ضَيْف)، كۆدەكرێتەوە و بەسێ جۆر: بە (أَضْيَاف)، كۆدەكرێتەوە و، بە (ضُيُوف)، كۆدەكرێتەوە و، بە (ضيفان)یش كۆدەكرێتەوە، واتە: میوانەكان.

(مُّنكَرُونَ): واتە: نەناسراوو نامۆن، (الإنْكَارُ: ضِدُّ العِرْفَان، مُنْكَرُوْن: مُجْهَوُلُون)، (إنْكَار): دژی (عِرْفَان)ە، (عِرْفَان)، واتە: ناسین، (إنْكَار)، واتە: نەناسین، (مُنْكَرُوْن)، واتە: نامۆ، نامۆیان و نەناسراوان.

(فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ): واتە: بە پەنهانیی چوو بۆ لای خێزانی، (الرَّوْغُ: المَيْلُ عَلَى سَبِيْل الإحْتِيَال)، (روغ): بریتیە لە جۆرێك لە لاربوونەوە بە شێوەی جۆرێك لە فێڵ، دەگوترێ: (طَرِيْق رَائِغ: غَيْرُ مُسْتَقِيْم)، ڕێیەك كە ناڕاست بێ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە ئیبراهیم ﷺ بە شێوەیەك چوو بۆ لای خێزانی بۆ ئەوەی خواردن بۆ میوانەكانی ساز بكات، كە ئەوان هەست پێ نەكەن، بۆ ئەوەی سەغڵەت نەبن، كە خانەخوێیەكە خۆییان بۆ عەزیەت دەدات.

(فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗ): واتە: بەهۆی ئەوانەوە ترسی ڕێنیشت، (الوَجْسُ: الصَّوْتُ الخَفِي، وَالتَوَجّسُ: التَسَمُّعُ، وُالإيْجَاسُ وُجُوُدُ ذَلِكَ فِي النَّفْسِ، الوَجْسُ بَعْدَ الهَاجِس)،

(وَجْس): بریتیه لـه دەنگێـکی پەنهـان، (تَوَجُّـس)، واتـه: گـوێ هەڵخسـتن، ئینسـان زیاتـر گـوێ بـۆ شـتێك هەڵدەخـات کـه دەنگەکـەی بـاش نایـەت، (إِيْجَـاس): بریتیـه لـەوە کـه ئینسـان لـه نەفسـی خۆیـدا هەسـت بـەو شـته بـکات، ئنجا (وَجْس): لـه دوای (هَاجِـس)ە، دەڵـێ: هاجیسـێکم بـۆ هـات، (وَجْس)، لـه دوای ئەویشـه، (فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً)، واتـه: ترسـێکی پەنهـانی چـۆوە دڵ.

(صَرَّةٍ): (الـصَّرَّة: الجَمَاعَـةُ المُنْضَـمُّ بَعْضُهَـا إِلى بَعْـض، وَالـصَّرَّةُ: الصَّيْحَـةُ)، (صَرَّة): چەنـد واتایـەکی هـەن: یەکیـان ئەوەیـه کۆمەڵێـك کـه پێکـەوە شـەتەك درابـن و، پێکـەوە پەیوەسـت بـن، هەروەهـا بـه دەنگـی چریکـه دێ، هەروەهـا (صَرَّة): بـه مانـای پرێسـکەیەکیش دێ کـه شـتێ تـێ دەپێچـرێ و تونـد دەکـرێ و گـرێ دەدرێ.

(فَصَكَّتْ وَجْهَهَا): یـانی: لـه دەم و چـاوی خـۆی دا، (صَكَّـهُ: ضَرَبَـهُ، الصَـكُّ: كِتَـابٌ وُهُـوَ فَـارِسِي مَعَـرَّب)، (صَـكّ) ئێسـتا پێـی دەگوتـرێ: چـەك، یـان شـیك، نووسراوێکـه لـه ئەصڵـدا فارسـییه، بـەڵام بـه عەرەبیـی کـراوە، کەواتـه: (فَصَكَّتْ وَجْهَهَا)، واتـه: لـه ڕووی خۆیـدا، ئافـرەت عادەتیـان وایـه کـه هەواڵێـکی سـەیرو سەرسـوڕهێنەر ببیسـتن، هـەم دەنگێکیـان لـێ بـەرز دەبێتـەوەو دەقیژێنـن و هـاوار دەکـەن، هـەم بـەدەم و چـاوی خۆیـان دادەدەن، ئافـرەت هـەر ئافرەتـه، بـا خێزانـی پێغەمبەرانیـش بـن (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، خـوا ئافـرەتی لەسـەر ئـەوە خوڵقانـدوە، ئـەو سرووشـتەی وی، ئـەو هەڵسـوکەوتانه لـه ئافرەتـدا پەیـدا دەکات.

(عَجُوزٌ عَقِيمٌ): (عَجُـوزٌ)، واتـه: پیـرەژن، (عَقِيْـمٌ)، واتـه: نـەزۆك، (عَجُـوز: المَـرْأَةُ الكَبِـيْرَة، وَلَا يُقَـال عَجُـوزَة، والعَقِيْـمُ: الـدَّاءُ الَّـذِي لَا يُـبْرَأُ، وَعَقِيْـم: مَـنْ لَا وَلَـدَ لَـهُ)، (عَجُـوز): بـه مانـای ئافـرەتی بـه تەمـەن دێ، ناگوتـرێ: (عجـوزة)، چونکـه وشـەی (عَجُـوزٌ)، تەنیـا بـۆ ئافـرەت بـەکاردێ، هەڵبەتـه بـۆ پیاویـش بـەکاردێ، بـەڵام بـه سـیاق دەزانـرێ، دەگوتـرێ: (إِمْـرَأَةٌ عَجُـوز وَرَجَـلٌ عَجُـوز)، (عَقِيْـم): بریتیـه لـه دەردێـك کـه چارەسـەر نەبـێ، هەروەهـا (عَقِيْـم): بـه کەسـێك دەگوتـرێ وەچـەی نەبـێ، چ پیـاو بـێ، چ ئافـرەت بـێ.

(خَطْبُكُمْ): (الخَطْبُ سَبَبُ الأمْرِ، مَا خَطْبُكَ؟ مَا أمْرُكَ، وَهَذَا خَطْبٌ جَلِيْل، وَالجَمْعُ خُطُوب)، (خَطْب): لە ئەصڵدا بریتیە لە هۆكاری كارێك، دەگوترێ: (مَا خَطْبُكَ؟)، واتە: هۆكاری كارەكەت چییە؟ یاخود (مَا خَطْبُكَ؟)، یانی: (مَا أمْرُكَ)، كارەكەت چییە؟ دەگوترێ: (هَذَا خَطْبٌ جَلِيْل)، ئەمە كارێكی گرنگە، بە (خُطُوب)، كۆدەكرێتەوە، بۆیەش بە كاری گرنگ گوتراوە: (خَطْب، لأنَّهُ يَكْثُرُ فِيْه التَّخَاطُب)، قسەی زۆر تێدا دەكرێ.

(مُّسَوَّمَةً): واتە: نیشانەدار كراو، (السَّومَة: العَلَامَةَ، وَتَسوَّم جَعَلَ لَهُ عَلَامَة، المسَوَّمَة: المُعَلَّمَة)، (سَوْمَة): بریتیە لە نیشانە، (تَسَوَّمَ)، واتە: نیشانەی بۆ خۆی پەیدا كرد، (مُسَوَّمَةً)، واتە: نیشانەدار كراو، مەبەست پێی ئەو بەردانەیە كە بە گەلی لووط دادراون، كە وەك دوایی باسی دەكەین، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: جۆرە بەردێكی تایبەت بوون بە گشتیی، یاخود هەر بەردێك ناوی ئەو كەسەی لەسەر نووسراوە كە پێی فەوتێنراوە، وەك هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن.

(فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ): واتە: بە هەموو هێزی خۆی پشتی هەڵكرد، یاخود بەهۆی هێزو تواناكەیەوە، پشتی هەڵكرد.

(رُكْنُ الشَّيءِ: جَانِبه الأقْوَى، يَأوِي إلى رُكْنِ شَدِيْد: إلى عِزٍّ وَمَنَعَة)، (رُكْن)ی هەر شتێك بریتیە لە لایە بەهێزترەكەی، (يَأوِي إلى رُكْنِ شَدِيْد)، پەنا دەباتە بەر هێزێك، پەنایەك كە لە سایەیدا پارێزراو بێ.

(فَنَبَذْنَٰهُمْ): واتە: فڕێماندان، وەك شتێكی بێ بایەخ، (النَّبْذُ: إلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ لِقلَّة الإعْتِدَادِ بِه)، (نَبْذ): بریتیە لە فڕێدانی شتێك بە هۆی كەم گرنگیی پێدانیەوە، دەگوترێ: (نَبَذْتُهُ نَبْذَ النَّعْلِ الخَلَق)، فڕێمدا وەك چۆن پێڵاوی شڕ فڕێ دەدرێ.

(مُلِيمٌ): (اللَّوْمُ: عَذْل الإنْسَانِ بِنِسْبَتِه إلى مَا فِيْه لَوْم)، (لَوم): بریتیە لە ڕەخنەگرتن و سەركۆنەكردنی كەسێك لەبەر ئەوەی كەم و كوڕییەكی تێدابووە، ئنجا (لُمْتُهُ فَهُوَ

ملـوم)، سـەرکۆنەم کـرد ئـەو سـەرکۆنە کـراوە، بـەڵام (**المُلِيْـمُ: جَاعِـلُ نَفْسِـهِ مَلومَـاً، يُقَـالُ: ألَامَ: اسْـتَحَقَّ اللَّـوم، أو جَعْـلَ نَفْسَـهُ مَلُومَـا، رُبَّ لَائِـمٍ مُلِيْـمَاً**)، (**مُلِيْـمٌ**)، بـە مانـای ڕەخنـە لێگیـراوو سـەرکۆنەکراو، دەگوتـرێ: (**ألَامَ**)، واتـە: شایسـتەی لۆمەکـردن بـوو، (**مُلِيْـمٌ**)، کەسێکە خـۆی وا لـێ بـکات، لۆمـەی بکـرێ، وەك گوتـراوە: (**رُبَّ لَائِـمٍ مُلِيْـمَاً**)، زۆرجـار کەسـێك سـەرکۆنەی کەسـێك دەکات، کەچـی خـۆی سـەرکۆنە بـۆ خـۆی پەیدا دەکات، کەواتـە: (وَهُوَ مُلِيمٌ)، واتـە: فڕێماندانـە دەریـاوە لـە کاتێکـدا کـە فیرعـەون وایکـرد بـوو، لۆمـەی بکـرێ و سـەرکۆنە بکـرێ.

(ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ): بایـەکی نـەزۆك، (**أَصْـلُ العَقْـمِ: اليُبْـسُ المَانِـعُ مِـن قُبُـول الأثـر، رِيْـحُ عَقِيْـم: فَاعِـلٌ: لا تُلْقِـحُ سَـحَابَاً، وَلا شَـجَرَاً، أو مَفْعُـول: لا تَقْبـل أثَـرَ الخَـيْرِ**)، (**عَقْـم**): لـە ئەصڵـدا وشـەیەکە وابـکات شـوێنەوار قبـووڵ نـەکات و کاری تێنەکـرێ، دەگوتـرێ: (**رِيْـحُ عَقِيْـم**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾﴾، واتـە: بایـەکی نـەزۆك و بـێ خێـر، ئنجـا (**عَقِيْـم**)، دەگونجـێ (**فَاعِـل**) بـێ، (**فَعِيْـل**)ی بـە مانـای (**فَاعِـل**) بـێ، واتـە: (**لا تُلْقِـحُ سَـحَابَاً، وَلا شَـجْرَاً**)، واتـە: هیـچ موتووربـە نـاکات، نـە هـەور و نـە درەختیـش، یاخـود (**عَقِيْـم**): (**فَعِيْـل**)ی بـە مانـای (**مَفْعُـول**)ە، واتـە: هیـچ کارتێکردنێـك قبـووڵ نـاکات.

(كَٱلرَّمِيمِ): (**الـرَّمُّ: الـشَّيءُ البَـالِي، وَالرُّمَّـةُ: العَظْـمُ البَـالِي، وَهُـوَ الرَّمِيْـم**)، (**رم**): بـە شـتێکی ڕزیـو دەگوتـرێ، (**رِمَّـة**)، بـە ئێسـقانی ڕزیـوو پرتـووکاو دەگوتـرێ و(**رَمِيْم**)یشـی پێدەگوتـرێ، (**رَمِيْـم**)، بـە شـتی وردو خاشـیش دەگوتـرێ.

(فَعَتَوْاْ): واتـە: فەرمـانی پەروەردگاریـان تێپەڕانـد، سنوورشـکێنیان کـرد، (**العَـاتِي: المُتَجَـاوِزُ فـي الحَـدِّ فـي الإسْـتِكْبَار**)، (**عَـاتِي**): کەسێکە کـە لـە خـۆ بەزلگرییدا سنووری تێپەڕاندبـێ، هەروەهـا (**عَـاتِي**)، بـە مانـای خۆسـەپێن و ملهوڕیـش دێ.

(ٱلصَّـٰعِقَةُ): (**الصَّاعِقَـة: نَـارٌ تَسْـقُطُ مِـنَ السَّـمَاءِ فـي رَعْـدٍ شَـدِيْدٍ**)، (**صَاعِقَـة**): ئاگرێکە لـە ئاسـمانەوەو لـە سـەرێوە دەکەوێتـە خـوار، لەگـەڵ هـەورە تریشـقەو دەنگێـکی

بەهێزدا، هەروەها (صَاعِقَة): بە مانای ئازارو سزاش دێ، دەگوترێ: (صاعِق): بە مانای لە هۆش خۆی چوو، (غَشِيَ عَلَيْهِ)، هەروەها دەگوترێ: (صَعِق)، بە مانای (مَات)، مرد، کەواتە: (صَاعِقَة): لە ئەصڵدا دەنگ و هاڕژن و ئاگرو بڵێسەیەکە، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کۆمەڵێك دەرهاویشتەی دەبن، وەك لە هۆش خۆ چوون، مردن، لە بەین چوون.

(بِأَيْيْدٍ): واتە: بەهێز، (آدَ الرَّجُلُ: قَوِيَ وَاشْتَدَّ، وَالآدُ مِنَ الأَيْدِ، أَيَّدَهُ: قَوَّاهُ، وَالأَيْدُ: القُوَّة)، دەگوترێ: (آدَ الرَّجُل)، واتە: پیاوەکە بەهێز بوو، پتەو بوو، (وَالآدُ مِنَ الأَيْدِ)، (آدَ): لە (أَيْد)ەوە هاتوە، (أَيَّدَهُ: قَوَّاه)، بەهێزی کرد، (وَالأَيْدُ: القُوَّة)، واتە: هێز، ئەویش لە ئەصڵدا (أَيْدي) کۆی (يَد)، بەڵام دوایی کۆی وشەکە خوازراوەتەوە، بۆ مانای هێزو توانا.

(لَمُوسِعُونَ): واتە: ئێمە فراوانمان کردوە، (وَسِعَ الشَّيءُ: اتَّسَعَ)، واتە: فراوان بوو، (أَوْسَعَ فُلاَنٌ: إِذَا كَانَ لَهُ الغِنَى)، ئەگەر مرۆڤ دەوڵەمەند بێ دەگوترێ: (أَوْسَع)، واتە: ماڵ و سامانەکەی فراوان بوو، دەگوترێ: (أَوْسَع إِذَا صَارَ ذَا سَعَةٍ)، ئەگەر بوو بە خاوەن فراوانیی، کەواتە: (وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ)، واتە: ئێمە ئاسمانمان دروستکردوەو فراوانیشی دەکەین، یاخود فراوانیشمان کردوە، هەردوو واتایەکەی هەن، هەردوو واتاکەش بەسەر واقیعی گەردووندا دەچەسپن، وەك دوایی باسی دەکەین.

(فَرَشْنَاهَا ): واتە: ڕامانخستوە، (الفَرْشُ: بَسْطُ الثياب، وَيُقَالُ للمَفْرُوُشِ: فَرْش وَفِرَاش، وَالفِراش جَمْعُه: فُرُش)، (فرش): پۆشاکێکە، بڵاوبکرێتەوە بە ڕایەخیش دەگوترێ: (فَرْش) و (فراش)، (فُرُش)، کۆی (فِراش)ە، واتە: ڕاخراوەکان و، ڕایەخەکان.

(ٱلْمَٰهِدُونَ ): (مَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيداً: هَيَّأْتُه وَسَوَّيْتُه)، واتە: ئامادەم کردو ڕێکمخست و سازمکرد، (المَاهِدُ: المُسَوِّي وَالمُهيِّء)، (مَاهِد): بە مانای ڕێکخەرو ئامادەکەرو سازکەر دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەماندا گوتمان: خوا ﷻ لەم بیست و شەش (٢٦) ئایەتەدا، لە بیست و سێ (٢٣) ئایەتیاندا، باسی شەش لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەكات، لە سێ ئایەتی كۆتایشییاندا باسی سێ لە دیاردەو دیمەنە سەرنجڕاكێشەكانی گەردوون دەكات، هەڵبەتە كە خوا ﷻ لێرەدا باسی ئەو شەش پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەكات، دوایی باسی ئەو سێ دیاردە گەردوونییانە دەكات، هەمووی لە سیاقی ئەوەدایە بەرپەرچی بێبڕوایان بداتەوە، كە نكووڵییان دەكرد لەوەی خوا ﷻ بتوانێ زیندوویان بكاتەوە و، نكووڵییان دەكرد لەوەی ڕۆژێك دابێ سزاو پاداشتی تێدا بچەسپێ، جگە لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ، وەك دوایی باسی دەكەین، كە بۆنەیەكی تایبەتیی هەیە، بەڵام ئەوانەی دیكە: هەم گەلی لووط ﷺ، هەروەها گەلەكەی مووسا ﷺ: فیرعەون و دارو دەستەكەی، پاشان گەلەكەی هوود كە (عاد)ن، گەلەكەی صاڵح كە (ثەموود)ن و، گەلی نووح، هەموو ئەوانە خوا بە هۆی لادانیان و، بە درۆ دانانی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، بڕوا نەكردنیان بەوەی ئەو ژیانە دنیاییە، ژیانێكی دیكەی بەدوادا دێ، لە سۆنگەی ئەوەوە سزادراون و فەوتێنراون.

كەواتە: ئەوە سەرنجڕاكێشانی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، دوای ئەویشە هەتا دنیا بە كۆتا دێ، كە ئێوە دەرس و عیبرەت وەربگرن، لەو گەلە یاخیی و سەركەشانە، كە بەهۆی بێبڕواییانەوە خوا سزای داون و فەوتاون.

هەروەها سێ دیمەنە گەردوونیەكەش، دیسان خوا ﷻ دەستەڵات و توانای بێ سنووری خۆی لە دوو توێی واندا دەخاتەڕوو، كە خوایەك ﷻ توانیبێتی ئەو ئاسمانە، بەو فراوانییە، (ئەو گەردوونە) دروست بكات و، ئەو زەوییە بەو

شـێوەیە ڕابخـات و، لـە هەمـوو شـتێك بـە جـووت دروسـت بـكات، خوایـەك ﷻ ئـەوە دەسـتەڵاتی بـێ، دیـارە دەسـتەڵات و، تواناشـی هەیـە، کـە ئێـوەش دوای مـردن زینـدوو بكاتـەوە، بـا سـەرنج بدەیـن:

سـەرەتا خـوا ﷻ ڕوو لـە پێغەمبەرەكـەی ﷺ دەكات، كـە لـە هەمـوو قورئانـدا مەگـەر چـۆن، ئەگەرنـا دوێـنراو هـەر پێغەمبـەر موحەممـەدە ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴾، ئایـا هەواڵـی میوانـە ڕێزلێگیـراوەكانی ئیبراهیمـت بـۆ هاتـوە؟ ﴿ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾، كاتێـك لێـی وەژووركەوتـن گوتیـان: سـەلام، سـەلامت لـێ بـێ، ئاشـتیی و خێـرو خۆشـییت لەسـەر بـێ، ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ ﴾، گـوتی: ئاشتیی و خێـرو خۆشـییەكی بـەردەوام و نەبڕاوەتـان لەسـەر بـێ، ﴿ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾، كۆمەڵێـك نامـۆن، ئـەم قسـەیە وەك دوایـی باسـی دەكەیـن، وا پێدەچـێ لەبـەر خۆیـەوە گوتبێتـی، چونكـە تـۆ میوانێكـت بـێ و، هـەر لەڕێـوە بڵێـی: ناتناسـم، یـان نامـۆی، یـان نائاشـنای، ڕەنگـە لەسـەر دڵـی قـورس بـێ، بۆیـە، ڕسـتەی: ﴿ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾، واتـە: ئێـوە كۆمەڵێـكی نەنـاسراون، لەبـەر خۆیـەوە، یـان لـە دڵـی خۆیـدا وای گوتـوە، بـەڵام خـوا ﷻ ئـەوەی لـە دڵـی ئیبراهیمیشـدا بـووە، بـۆی باسـكردووین، دەشـگونجێ فەرمـووی لێكردبـن و، فەرمووبێتـی: فەرمـوون: ناتاننـاسـم، ئـەوەش دەگونجـێ، بـەڵام زۆر لـە توێـژەرەوان و، منیـش ئـەو ڕایـەم زیاتـر بـە دڵـە، كـە لەبـەر خۆیـەوە وای گوتبـێ، ئنجـا وەك دوایـی باسـی دەكەیـن: ئەوانـە میـوان نەبـوون، ئـەی بۆچـی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: میوانـە ڕێـز لێگیـراوەكانی ئیبراهیـم؟ ئەوانـە فریشـتە بـوون؟ وەڵامەكـەی هـەر ئەوەیـە كـە زۆر پێویسـت بـە تەئویـل و پیـن و پـەڕۆ نـاكات، ئـەوان لـە شـێوەی میوانـدا چـوون، ئیبراهیمیـش عليه السلام ئەگـەر فریشـتەش بووبـن و، زانیباشـی فریشـتەن، ئـەوان وەك میـوان سڵاویان لێكـردوە و، نەیانگوتـوە: ئێمـە فریشـتەین و بـۆ كارێـكی وا هاتوویـن، ئنجـا كـە وەك میـوان چـوون، ئەویـش وەك میـوان مامەڵـەی لەگەڵـدا كـردوون.

﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴾، دیارە ئەم (ف)ەی سەر (فَرَاغَ)، یانی: دانیشتن قسەو باسیانکرد، بەخێربێن چاك و چۆنییان كردو حورمەتی لێگرتن، ئنجا ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ ﴾، نەك ئەوان بڵێن: سەلام، ئەویش بڵێ: (وعليكم السلام)، یەكسەر بچێ گۆلكیان بۆ سەربڕێ وانەبووە، بۆیە ئەم (ف)ە دەلالەت لەسەر ئەو شتانە دەكات كە باس نەكراون، و قرتێنراون و پێویست بە گێڕدرانەوە ناكات، واتە: دوای ئەو قسەو باسانە، یەكسەر ڕۆیشت بۆ لای خێزانەكەی، (أهل)، واتە: ژن و هاوسەر، بۆچی وشەی (راغ)ی بەكارهێناوە؟ واتە: بە پەنهانیی چوو، بە شێوەیەك چوو، ئەوان هەست پێ نەكەن، نەك بیكاتە گاڵەگاڵ و ئافرەت ئەو گۆلكەی سەربڕە، یان ئافرەت میوانمان هاتوون، فڵان خواردنمان بۆ ساز بكە، ئەوانیش بڵێن: بە خوا نابێ سازی بكەی و، تووشی سەغڵەتیی بین، نا، وەك هەندێ كەس بە نەزانیی ئاوا دەكات و دەیكاتە هەراو گاڵە، ئیبراهیم ﷺ بەبێ هەراوگاڵە چووە بە لە باریی گۆلكەكەی سەربڕیوە، ینجا ئایا خۆی سەری بڕیوە، یان خەڵكی دیكەیان لە ماڵدا هەبووە، وەك هاوكار؟ گرنگ ئەوەیە گۆلكەكە سەربڕدراوە، ﴿ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴾، گۆلكێكی قەڵەوی هێناو، دیسان ئیبراهیم گۆلكێكی قەڵەو بێنێتە مەجلیس، وانەبووە، بۆیە لە شوێنی دیكە خوا بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿ جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ ﴾هود، گۆلكێكی برژێنراوی هێنا، بەڵام ئەو گۆلكە لەوێ دەزانین كە بە شێوەی برژاندن سازی كردوە، نەك كوڵاندن لێرەش دەزانین كە گۆلكەكە قەڵەو بووە، واتە: خوا ﷻ دوو وشەی بەكارهێناون لەهەر سیاقەدا دوو وشەی جیای بەكارهێناون، بۆ ئەوەی بزانرێ ئەو گۆلكە: هەم قەڵەو بووە، هەم بە شێوەی برژاندنیش هێناویەتی، كە باشترین جۆرە سازكردنی گۆشتی سوورە، یان گۆشتی ڕەشە وڵاخە.

﴿ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ ﴾، لێیبردنە پێشێ و لێی وەنزیك خستن گۆشتی برژاوی گۆلكەكەی لێ وەنزیك خستن، ﴿ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، فەرمووی: ناخۆن، ئەمە دەگونجێ وەك چۆن تۆ بەمیوان دەڵێی: نافەرمووی، دەشگونجێ ئیبراهیم ﷺ

کـە تەماشـای کـردوە دەسـتی بـۆ نابـەن، وەك لـە جێـی دیکـەدا هاتـوە: ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ﴿٧٠﴾ ﴾هـود، کاتێـك دەسـتیانی دی، بـۆی درێـژ ناکـەن، بـە نامـۆ، یاخـود بـە نەنـاسراو، یـان بـە خـراپ هاتنـە بـەر چاوی و، ترسـیی بەهـۆی ئەوانـەوە ڕێنیشـت، لێـرەش فەرمـووی: ئایـا ناخـۆن؟

﴿ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ﴾، ترسـیی ڕێنیشـت بەهـۆی وانـەوە ترسـیی چـووە دڵ، ﴿ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ﴾، یەکسـەر گوتیـان: مەترسـێ، ﴿ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴾، مـوژدەی منداڵێـکی زانایـان پێـدا، مـوژدەی کوڕێـکی زانایـان پێـدا، کـە دوایـی بـاس دەکەیـن ئەمـە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴾، سـێ مـوژدەی تێـدان.

﴿ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ ﴾، هاوسـەرەکە (ژنەکـە)ی بـە قیژاندنـەوە، یـان بـە هـاوار کردنـەوە هـات، ڕووبەڕوویـان هـات، ﴿ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا ﴾، لـە ڕووی خۆیـدا، بـەو شـێوەیە لـە دەم و چـاوی خۆیـدا، کـە ئـەوە عـادەتی ئافرەتانـە، کـە شـتێك زۆر ورووژێنـەر بـێ، هـەم دەقیژێنـن و هـاوار دەکـەن، دەنـگ بـەرز دەکەنـەوە، بـە شـێوەیەکیش هەڵسـوکەوت دەکـەن، کـە بیانـەوێ سەرسـووڕمانی خۆیـان دەرببـڕن، بەچـی؟ بـەوە کـە لـە ڕووی خۆیـان دەدەن، بـە دەنـگ بەرزکردنـەوە، بـە لـە ڕووی خـۆدان، ﴿ وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴾، ئافرەتەکـەی گـوتی: ﴿ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴾، واتـە: (أَنَـا عَجُـوزٌ عَقِيْـمٌ)، بـەڵام ئـەوە پەڕێـنراوە لەبـەر ئـەوەی دەزانـرێ، واتـە: مـن پیرەژنێـکی نەزۆکـم، واتـە: چـۆن منداڵـم دەبـێ؟ وەك لـە سـووڕەتی (هـود)دا، ﴿ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ﴿٧٢﴾ ﴾، گـوتی: ئایـا مـن منداڵـم دەبـێ لـە حاڵێکـدا کـە پیرەژنـم و ئـەوەش مێردەکەمـە کـە پیـر بـووە، کەوتۆتـە تەمەنـەوە، کـە وەك لـە تەفسـیری سـووڕەتی (هـود)دا باسـمان کـردوە، هەندێـك لـە سـەرچاوە مێژووییـەکان دەڵێـن: ئـەو کاتـە سـارا خاتـوون، کـە دیـارە لێـرەدا مەبەسـت پـێ سـارا خاتوونـە، تەمـەنی (٨٠) سـاڵ بـووە، ئیبراهیمیـش (١٠٠) سـاڵ بـووە، هەندێکیـش دەڵێـن: سـارا خاتـوون تەمـەنی (١٠٠) سـاڵ بـووە، ئیبراهیمیـش تەمـەنی (١٢٠) سـاڵ بـووە، بۆیـە پێـی سـەیرو عەجایـب بـووە.

﴿ قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، فریشتەکان پێیان گوت: هەر بەو شێوەیە پەروەردگارت وایفەرمووە، بێگومان هەر ئەو زۆر کارزانی زانایە، واتە: خوا بۆ خۆی دەزانێ چی دەکات، زاناشەو هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ، لە سوورەتی (هود)دا تەعبیرەکە بەو شێوەیە هاتوە، ﴿ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾، گوتیان: ئایا سەرت لە کاری خوا سووڕدەمێنێ، بەزەیی خواو پێزی خوا بەسەرتاندا بڕژێ، ئەی خاوەنی ئەم ماڵە! بێگومان خوا ستاییشکراوی پایە بەرزە.

﴿ قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾، ئنجا ئیبراهیم ﷺ دوای ئەوەی ئەوە گوزەرا، لێی پرسین و گوتی: ئەو کارە گرنگەی ئێوە بۆی هاتوون، کارە گرنگەکەتان چییە، ئەی ڕەوانەکراوەکان؟

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ ﴾، گوتیان: ئێمە نێردراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار، لێرە باسی نەکردوە، بەڵام دیارە لە شوێنەکانی دیکە باسکراوە، کە بۆ لای گەلی لووط ﷺ نێردراون و، لەوێ تاوان و جەریمەکەشیان باسکراوە، کە یەکێك لە تاوانەکانیان بریتی بووە لە نێربازیی، یەکێکی دیکەیان بریتی بووە لە ڕێگریی (**وَتَقْطَعُون السَّبِيْل**)، یەکێکی دیکەیان بریتی بووە لە کاری دزێو و خراپ کردن لە کۆڕ و مەجلیسیان دا (**تَأْتُون فِي نَهديْكُم المُنْكَر**)، جگە لە ئەو تاوانە قێزەونە کە نێربازییە، بەڵام کە لە شوێنەکانی دیکەدا خوا ڕوونی کردۆتەوە لێرە بە کورتیی هێناویەتی.

﴿ لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ ﴾، بۆ ئەوەی بۆیان و بەسەریاندا بنێرین بەردێکی لە قوڕ، لە شوێنەکانی دیکە دەفەرموێ: ﴿ مِّن سِجِّيلٖ ﴿٨٢﴾ ﴾هود، (سِجِّيلِ)، کە لە سەنگی گڵەوە هاتوە، (سَنْج جِل) تێکدا دەغم کراوە، (سەنگی گڵ)یش بەردی قوڕ، لێرەش ﴿ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ ﴾، واتە: بەردێك کە لە ئەصڵدا قوڕ بووە و وشك بۆتەوە، وەك چۆن خشتی سوور هەر قوڕە، بەڵام سوور دەکرێتەوەو ڕەق دەبێ، ئەویش بەو شێوەیە بووە.

﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴾، نیشـانەدار کـراوە لـە لایـەن پەروەردگارتـەوە بـۆ زێدەڕۆییـان، ئـەو نیشـانەدار کردنـەش، یـان کـۆی بـەردەکان ڕەنگێـکی تایبەتییـان هەبـووە و، شـێوەیەکی تایبەتیـان هەبـووە، کـە بـەو شـێوەیەی خـوا باسـی دەکات، سـوورەوە کـراو بـوون، یـان هـەر بەردێـك بۆ هـەر کەسێك دیاریـی کرابێ بیفەوتێنێ، ناوونیشـانی ئـەو کەسـەی لەسـەر بـووە.

﴿ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئێمـەش هەرکەسـێك لـە بـڕواداران کـە لـە ئاوەدانیەکـەدا هەبـوو دەرمانکـرد، هـەر کەسـێك لـە بـڕواداران تێیـدا هەبـوو، هێنامانـنـەدەر و دەربازمانکـردن.

﴿ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾، تەنیا ماڵێکمان لە مسوڵمانان (لە ملکەچان بـۆ خـوا) تێـدا بینـی، ئەویـش ماڵـی لـووط عليه السلام بوو.

﴿ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴾، لەوێدا بەجێمان هێشـت نیشـانەیەك بـۆ ئەوانـەی لـە ئـازاری بـە ئێـش دەترسـێن، نیشـانەکەش دەریـای مـردوو (**بحـر الميّـت**)، شـوێنەوارەکانی دیکەیانـن، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، لێـرەدا بەسـەرهاتی ئیبراهیـم عليه السلام و گـەلی لـووط تـەواو.

﴿ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾، هەروەهـا لـە مووسـادا عليه السلام (لـە بەسـەرهاتی مووسـادا) نیشـانە هـەن، کاتێـك ناردمانـە لای فیرعـەون بـە بەڵگەیـەکی ڕوون و ئاشـکراوە، ئـەم (و)ە (و)ی گێڕانـەوە (**عاطفة**)یـەو، یـان ئـەم بەسـەرهاتە دەگێڕێتـەوە بـۆ سـەر ئـەوەی پێشـێ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً ﴾، واتـە: لـە بەسـەرهاتی مووساشـدا نیشـانەمان بەجـێ هێشـت، وەك چـۆن لـە دوای گـەلی لووطیـش نیشـانەو شـوێنەوارمان بەجێهێشـتوە یاخـود ئـەو (و)ە بەسـەرهاتی مووسـا عليه السلام دەگێڕێتـەوە بـۆ سـەر: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴾، واتـە: لـە بەسـەرهاتی مووساشـدا نیشـانە هـەن، بـۆ کەسـانێك کـە لـە ئیمانەکەیانـدا دڵنیابـن، مـن ئـەو ڕای دووەمـم پـێ ڕاسـترە، ئنجـا ئایـا فیرعـەون چـی کـرد؟ ﴿ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ ﴾، بـە

هەموو هێزو توانای خۆیەوە پشتی هەڵکرد، یاخود بەهۆی هێزو تواناکەیەوە (سوپایەکەیەوە) پشتی هەڵکرد.

﴿وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾، گوتی: جادووگەرە، یان شێتە، واتە: مووسا جادووگەرە، یان شێتە، ئەو دووانەش دژی یەکدین، واتە: هەندێك جار گوتوویەتی: جادووگەرە و، هەندێك جاریش گوتوویەتی: شێتە.

﴿فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾، خۆی و سەربازەکانیمان گرت و یەکسەر فڕێماندانە دەریاوە، لە حاڵێکدا کە ئەو وایکردبوو سەرکۆنە بکرێ، (مُلِيمٌ)، (مَنْ ألام نَفْسَه)، کەسێ وای کردبێ لۆمەی بکرێ و سەرکۆنە بکرێ.

ئنجا دێتە سەر باسی عاد: ﴿وَفِى عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ﴾، هەروەها لە بەسەرهاتی گەلی عاددا (کە پێغەمبەرەکەیان هودە ﷺ) نیشانە هەن لەسەر باڵادەستیی خوا و لەسەر هەمەکارە بوونی خوا لە کەون و کائیناتدا، ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ﴾، کاتێ بایەکی نەزۆك و بێ خێرمان نارده سەریان، ﴿مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ﴾، هەر شتێك بەسەریدا بڕۆیبایە، وازی لێ نەدەهێناو لێی نەدەگەڕا، مەگەر دەیکردە خۆڵەمێش، یان دەیکردە شتێکی ڕزیو، پڕتووکاوو، وردو خاشی دەکرد.

ئنجا دێتە سەر باسی گەلی ثەموود: ﴿وَفِى ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ﴾، هەروەها لە بەسەرهاتی گەلی ثەموودیشدا (کە پێغەمبەرەکەیان صالح بوو ﷺ) نیشانە هەن، کاتێك پێیان گوترا: بۆ ماوەیەك بەهرە وەربگرن لە ژیانی دنیادا، یاخود چاوەڕێ بکەن، چەند ڕۆژێکی دیکە، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾﴾، سێ ڕۆژان لە ماڵ و حاڵەکەی خۆتاندا چاوەڕێ بکەن، ئەوە بەڵێنێکە درۆی تێدانیە، ئەگەر هەر نەگەڕێنەوە، خوا ﷻ سزاتان بۆ دەنێرێ، ﴿فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ﴾، بەڵام

ئـەوان یاخیـی بـوون و، سنوورشـكێنییان كـرد لـە فەرمـانی پەروەردگاریـان، ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ﴾، هـەورە تریشـقەو بڵێسـەیەكی ئاگـر گرتنـی، لـە حاڵێكـدا كـە خۆیـان تەماشـایان دەكـردو، دەیانبینـی كـە سـزاكەیان بـۆ هـات، ﴿فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مِن قِيَامٖ وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ﴾، نەیانتـوانی هەڵسـتنە پـێ، هـەر ئەصڵـەن هەڵسـانە پێـی ئاسـایی، یاخـود ڕاوەسـتن و بەرگریـی لـە خۆیـان بكـەن، ﴿وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ﴾، هەروەهـا كەسـیش نەبـوو، پشـتیان بگـرێ و سـەریان بخـات.

ئنجا باسی گەلی نووحیش دەكات:

﴿وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُ﴾، هەروەهـا گـەلی نووحیـش لـەوە پێـش (پێـش ئـەوان)، ئەوانیشـمان فەوتانـد، ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانیـش كۆمەڵێـكی لاڕێ بـوون، هەندێكیـش خوێندویانەتـەوە (**وقـومِ نـوح**)، هەروەهـا گـەلی نووحیشـمان فەوتانـد، كـە ئەمـە دەگێڕدرێتـەوە بـۆ سـەر (وَفِي ثَمُودَ).

ئنجـا خـوا ﷻ لـە كۆتاییـدا باسـی سـێ لـە دیـاردە سەرنجڕاكێشـەكانی گـەردوون دەكات، ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾، ئاسمانـمـــان بەهێـز بینـا كـردووەو بەرزكردۆتـەوە و، ئێمـە فراوانكەریشـینی، واتـە: ئێسـتا فـراوانی دەكەیـن، یـان كـە دروسـتمانكردوە بـە فراوانیـی دروسـتمانكردوە، كـە هەردووكیشـیان وان، هـەم گـەردوون زۆر فراوانـە، وەك پێشـتر باسـمانكردوە، نوێتریـن بیـردۆزە ئەوەیـە دەڵـێ: تیـرەی گـەردوون لـەم سـەری بـۆ ئـەو سـەری، بـە مەزەنـدە (١٣) ملیـارو (٧٠٠)، یـان (٨٠٠) ملیـۆن سـاڵی تیشـكییە، زۆر زۆر فراوانـە، ئەویـش ئەوەنـدەی بـە دووربینـەكان كەشـف بـووە، هەروەهـا ئـەو بیردۆزەیـەش هەیـە كـە گـەردوون بـەردەوام لـە لێككشـان و فـراوان بـوون دایـە و، ئـەم ڕسـتە موبارەكـە ئـەوەش هـەر دەگرێتـەوە، ﴿وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾، زەویشـمان ڕاخسـتووە وەك چـۆن فەڕشـێك ڕادەخـەی، ئێمـە باشـترین ئامادەكاریـن و باشـترین سـازكەرین بـۆ زەوی، كـە مـرۆڤ

و جند بتوانن لەسەری بژین، ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، هەموو شتێکیشمان بە جووت دروستکردوە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن و وەبیرتان بێتەوە، کە ئەو خوایەی هەموو شتەکانی بە جووت دروستکردوون، خۆی تاکە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هاتنی چەند فریشتەیەك بۆ لای ئیبراهیم (عليه السلام) لە شێوەی میوانداو، پێکەوە سڵاوو چاك و چۆنی کردنیان و، هێنانی ئیبراهیم بۆ گۆلکێکی قەڵەوی برژێنراو و، ترس ڕێنیشتنی بەهۆی لێ نەخواردنیانەوەو، موژدەی کوڕێکی زانا پێدرانی و، هاوارکردنی ژنەکەی و، لە دەم و چاوی خۆدانی و، سەرسوڕمانی کە چۆن بە پیریی و بە نەزۆکیی منداڵی دەبێ و، دڵنیاکرانەوەی لە لایەن فریشتەکانەوە کە ئەوە بەڵێنی خوایەو، خواش کاربەجێ و زانایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا ۖ قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰ أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ﴾، ئایا هەواڵی میوانە ڕێزلێگیراوەکانی ئیبراهیمت بۆ هاتوە؟ پێشتر گوتمان: چۆنیەتیی پەیوەست بوونەوەی ئەم شەش بەسەرهاتە، کە خوا (سبحانه وتعالى) تێیاندا باسی شەش لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، یان گەلەکانیان و پێغەمبەران دەکات، بەوجۆرەیە کە تەوەرە سەرەکییەکەی ئەم سووڕەتە، بریتیە لە باسی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت، ئنجا ئەگەر تەماشای مێژووی بەشەرو

مێژووی گەلانی ڕابردوو بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە خوا ﷻ پشتیوانیی کردوە لە دۆستانی خۆی، بە تایبەت پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) و شوێنکەوتووانیان، هەروەها سزاو ئەشکەنجەی خوا، تۆڵەی خوا، لە بۆسەدا بووە بۆ گەلانێکی یاخیی و لادەر، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم ژیانە دنیاییە تاکە ژیان نیە، بەڵکو قۆناغێکە لە قۆناغەکانی ژیان و، ئێرە شوێنی تاقیکرانەوەیەو قۆناغێکی دیکە بە دوای ئەم ژیانەدا دێ، خوایەکیش ﷻ بەو شێوەیە پشتیوانیی لە هەموو پێغەمبەرانی خۆی بکات (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، بکات و توانیبێتی ئەو هەموو نیشانانە لە گەردووندا بڵاوبکاتەوە: ئاسمان و، زەوی و، دیاردەی جووتیەتیی لە هەموو دروستکراوەکاندا، ئەو خوا باڵادەستە، دەشتوانێ مردووانیش زیندوو بکاتەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾﴾، ئایا باسی میوانە ڕێزلێگیراوەکانی ئیبراهیمت بۆ هاتوە؟ ڕووی دواندن لە پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ و ئەمە بۆ تەشویق و زیاتر تامەزرۆکردنە، تاکو گوێی لەو هەواڵ و باس و خواس و بەسەرهاتە بێ، وشەی (**ضَيْف**)، لەبەر ئەوەی چاوگە، تاك و دووان و كۆ تێیدا یەکسانن، هەر بۆیەش وشەی (**ضَيْف**)، دوایی بە کۆ وەسفکراوە (**مُكْرَمِيْن**)، میوانە ڕێزلێگیراوەکان، ئنجا توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: سێ کەس بوون، هەندێك گوتوویانە: چوار کەس بوون، هەندێك گوتوویانە: حەوت کەس بوون .. هتد، بەڵام نە ئایەتەکە باسی کردوە، نە لە هیچ فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بۆیە دڵنیایین کە کۆبوون و لە دووان زیاتر بوون، بەڵام ئایا سێ بوون، پێنج بوون، حەوت بوون، دە بوون؟ نازانین.

٢)- ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا﴾، کاتێك لێی وەژوورکەوتن، گوتیان: سەلام.

هەڵبەتە لێی وەژوورکەوتن بەو واتایە نا، کە یەکسەر خۆیان بە ژووریّ دابکەن، بەڵام دیارە یان لە دەرگایان داوە، یان لە دوورەوە بانگیان کردوە، گرنگ ئەوەیە دوایی مۆڵەتیان وەرگرتوە، ئنجا چوونە ژووری ماڵەکەی، کە

چوونە ژوورێ، یەکسەر سڵاویان کردوە، (فَقَالُواْ سَلَٰمٗا )، یانی: (نُسَلِّم عَلَيْكَ سَلَامَاً)، سڵاوت لێ دەکەین، داوای ئاشتیی و سەلامەتیت بۆ دەکەین.

٣)- ﴿قَالَ سَلَٰمٞ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ﴾، (ئیبراهیمیش) فەرمووی: سەلامتان لێ بێ، ئێوە کۆمەڵێکی نامۆن، یانی: (عَلَيْكُم السَّلَام)، هی ئەوان گوتوویانە: (سَلَامَاً)، یانی: (نُسَلِّم عَلَيْكَ سَلَامَاً)، بەڵام هی ئیبراهیم عليه السلام بە ناو هێناویەتی (سَلَامٌ)، لە زمانی عەرەبییدا ڕستەی ناویی، دەلالەت لەسەر چەسپاویی و بەردەوامیی دەکات، بەڵام ڕستەی کرداریی دەلالەت لە سەر تازە بوونەوە دەکات، کەواتە: وەڵامەکەی ئیبراهیم عليه السلام لە سەلامەکەی ئەوان بەهێزتر بووە، واتە: سڵاوو سەلام و ئاشتیی و خێرو خۆشییەکی بەردەوام و چەسپاوتان لەسەر بێ.

﴿قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ﴾، (مُنْكَرُوْن: غُرَبَاء لاَ نَعْرِفُهُمْ)، واتە: ئێوە کۆمەڵێکی نامۆن، یانی: نائاشنان، ناتانناسین و نەناسراون، پێشتریش ئاماژەم پێدا، هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: ئیبراهیم عليه السلام لەبەر خۆیەوە وای گوتوە، یان لە دڵی خۆیدا، هەندێکیش دەڵێن: لە ڕووی خۆیاندا گوتوویەتی: ناتانناسم، یان نامۆن و نائاشنان، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ لەبەر خۆیەوەو لە دڵی خۆیدا وای گوتبێ، چونکە بۆ میوان ڕەنگە خۆش نەکەوێ بڵێی: ناتناسم، یان نائاشنای، یان غەریبی.

٤)- ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ﴾، بەشێوەیەکی پەنامەکیی چووە لای خێزانی، ئەم (ف)ە، پێی دەگوترێ: (فَاء الفَصِيْحَة)، یانی: (تُفْصِحُ عَمَّا قَبْلَهَا)، دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە لە پێشدا، بووە، چەند قسەیەك کراون، چەند شتێك بوون، واتە: دانیشتن سڵاویان کردو وەڵامی سڵاوەکەی دانەوە، بە چاکتر لە هی خۆیان، بەڵام نەیناسین و بۆی نامۆو نائاشنا بوون، دوایی قسەو باسکرا، ئنجا دوایی ئاوی پێداون، وەك چۆن ئێستا چایەك دەخورێتەوەو ئاوێك دەخورێتەوە، دوایی نان ساز دەکرێ، ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ﴾، بە شێوەیەکی پەنامەکیی کە ئەوان پێ نەحەسێن و هەست پێ نەکەن، چوو بۆ لای هاوسەرەکەی، (رَاغَ: مَالَ إِلَيْهِ سِرَّاً، وَكَذَلِكَ أَرَاغَ، وَالأَهْلُ: الزَّوْجَة، وَالرَّوَغَانُ: السَّيْرُ خُفْيَةً، يَرُوْغُ

رَوَغَانَ الثَّعْلَب)، (رَاغَ)، واتە: بە شێوەی پەنهانیی بۆ لای چوو، هەروەها (أَرَاغَ)ش هەمان واتای هەیە، (أَهْل)یش یانی: ژن و خێزان، (رَوَغَان)، بە ڕۆیشتنێکی پەنهان دەگوترێ، یان بە ڕۆیشتنێکی وا کە بە قۆرت و پێچ و بە جۆرێك کە بەرانبەرەکە هەست پێنەکات، بۆچی دەچی؟ هەر بۆیە بە ڕۆیشتنی ڕێوی واگوتراوە، ڕێوی قۆرت و پێچ دەکات، کاتێك دڕندەیەك ڕاوی دەنێ، ڕێوی قۆرتێ بەولادا لێ دەدات و، پێچێك دەکاتەوەو دڕندەکە تێدەکشێ، هەتا بۆ لای دێتەوە ئەو پشووێك دەدات، ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ ﴾، واتە: بە شێوەیەکی پەنامەکیی، کە ئەوان هەستی پێ نەکەن چوو بۆ لای ماڵ و خێزانی، تاکو ڕایانبسپێرێ، یاخود ئامادەسازیی بکات کە خواردنیان بۆ ساز بکرێ.

٥)- ﴿ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴾، ئنجا گۆلکێکی قەڵەوی هێنا ئەم (ف)ش دیسان (فصيحة) یە، واتە: گۆلکەکەی سەربڕی، یاخود بەوانەی کە لە ماڵەکەیاندا هەبوون، بەوانی گوت: سەری ببڕن، بەش بەشیانکرد، پارچە پارچەیان کرد، دوایی برژاندیان و ئامادەیان کرد، ئنجا: ﴿ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ ﴾، گۆلکێکی قەڵەوی بۆ هێنان، لە قورئاندا هەمیشە ئەو شتانەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، دەقرتێنرێن، یانی: ئەوە کە: چوو بە خێزانی گوت: بێنە ئەو گۆلکە سەرببڕن، ئنجا سەریان بڕی، دوایی کەوڵی کرد و پارچە پارچەی کرد، ئنجا شیشیان هێناو گۆشتیان پێوە کردو، ئاگریان کردەوەو، برژاندیان و، ئەو هەموو وردەکارییە هەمووی بەسەلیقەو عەقڵ دەزانرێ، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی هەموو قرتاندوە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ ﴾، چوو بۆ لای خێزانی، ﴿ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴾، گۆلکێکی قەڵەوی هێنا، گۆلکی قەڵەوی هێنا، واتە: گۆلکێکی قەڵەوی هێنا بە برژێندراویی، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: گۆلکێکی بۆ هێنان کە برژێندرابوو، (حَنِيْذٍ، أي: مَشْوِّي)، ئنجا لێرەدا دەزانین کە گۆلکەکە، وێڕای ئەوەی برژێندراوە، قەڵەویش بووە، نەك گۆلکێکی لەڕو لاواز بێنێ.

٦)- ﴿ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ ﴾، لێی وەنیزیك خستن، واتە: گۆشتی گۆلکەکەی بەبرژێندراویی، لێ وەنیزیك خستن، بردنیە پێش.

٧)- ﴿ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، گوتی: ئایا ناخۆن؟ ئەمە دەگونجێ پێشنیار بێ بۆ خواردنیان، واتە: نافەرموون، دەشگونجێ دوای ئەوەی دیتوویەتی دەستی بۆ نابەن، وەك لە سووڕەتی (**هود**)دا دەفەرمویێ: ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: کاتێ دەستیانی بینی بۆی درێژ ناکرێن، دەستەکان بۆ خواردنەکە ناچن، پرسیاری کرد، پرسیاری سەرسوڕمان، لەبەر ئەوەی عادەت لە نێو هەموو گەلاندا وایە، هەر کەسێ نان و نمەکت نەکات، وا تەفسیر دەکرێ، بە تەمای زیانێك بێ لێت بدات، لەبەر ئەوەی کەسێك نانت بخوات، دوایی ئەگەر زیانت لێ بدات، وەك دەڵێن: نمەك گیرت دەبێ، عەرەب گوتوویانە: (**مَنْ لَمْ يَأكُلْ طَعَامَكَ، لَمْ يَحْفَظْ ذِمَامَك**)، هەر کەسێ خواردنەکەت نە خوات، حورمەت و ڕێزیشت ناپارێزێ.

٨)- ﴿ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ﴾، بەهۆی وانەوە ترسی ڕێنیشت، (**فَأَوْجَسَ: أَضْمَرَ خَوْفاً، وَأَحَسَّ فِي نَفْسِهِ خَوْفاً**)، ترسی چۆ نێو دڵ بەهۆی ئەوانەوە، یاخود هەستی بە ترسێك کرد، ترسی ڕێنیشت، کە تەماشای کرد دەست بۆ خواردنەکە نابەن.

٩)- ﴿ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ﴾، پێیان گوت: مەترسێ، (**نَهَوْهُ عَنِ الخَوْفِ بِسَبَبِ عَدَمِ الأَكْلِ وَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ مَلَائِكَةٌ لِذَا لاَ يَأْكُلُون**)، ئەمە هەمووی ئەوە دەگەیەنێ، واتە: پێیانگوت: مەترسێ، بەهۆی ئەوەوە کە ناخۆین، هەواڵیان پێدا، کە ئێمە فریشتەین، فریشتەش خواردن ناخۆن، کەواتە: هۆکاری نەخواردنەکە ئەوەیە کە خواردن لەگەڵ واندا ناگونجێ و ئەوان فریشتەن، بەس خۆیان هێناوەتە سەر شێوەی مرۆڤ.

١٠)- ﴿ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴾، (دوای ئەوەی ترسیان لێ ڕەواندەوە)، موژدەشیان پێدا، موژدەیان پێدا بە کوڕێکی زانا.

گومانی تێدانیە، لێرەدا مەبەست لە (**أَهْلِه**) هاوسەرەکەی، سارا خاتوون بووە خوا لێی ڕازی بێ و، مەبەست لە کوڕێکی زاناش (**إسحاق**)ە، چونکە ئیسحاق لە سارا خاتوون بووە، بەڵام ئیسماعیل لە هاجەر بووە، دایکی ئیسحاقە (کە سارا خاتوونە) بۆتە پیرەژن و، تەمەنی زۆر بووە، پێش ئیسحاقیش هیچ منداڵی

دیکەی نەبووە، بۆیە (عَجُوزٌ عَقِيْم)، بەسەر ئەودا دەچەسپێ، بەڵام هاجەر گەنج بووە و، کچیش بووە کە دراوە بە ئیبراهیم عليه السلام، کەواتە: نە وشەی (عَجُوز)، نە وشەی (عَقِيْم)، بەسەر ئەودا ناچەسپێن.

کە لێرەدا دەفەرموێ: موژدەیان پێدا بە کوڕێکی زانا، ئەمە سێ گفت و بەڵێن و موژدەی تێدان:

**یەکەم:** ئەو منداڵەی دەیانبێ، نێرینەیە.

**دووەم:** ئەو منداڵە بە گچکەیی بە مەلۆتکەیی نامرێ، تاکو دەبێتە گەنج (غُلَام)، یانی: گەنج، یان مێرد منداڵ.

**سێیەم:** هاوکات لە داهاتووشدا دەبێتە زانا.

کەواتە: هەر ئەوەندە نیە بەڵێنیان پێدابێ و، موژدەیان پێدابێ کە منداڵێکتان دەبێ، بەڵکو ئەو منداڵە کوڕە، گەورەش دەبێ و، دەشبێتە زانا.

١١)- ﴿فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ﴾، ژنەکەی (سارا خاتوون) ڕووی تێکردن بەقیژاندن و بە هاوارکردنەوە.

١٢)- ﴿فَصَكَّتْ وَجْهَهَا﴾، لە دەم و چاوی خۆیدا، چەپۆکی لەدەم و چاوی خۆیدا، وەك سەرسوڕمان.

١٣)- ﴿وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾، گوتیشی (من) پیرەژنێکی نەزۆکم!! لێرەدا وشەی (أنا)ی لێ پەڕێنراوە، یانی: (أَنَا عَجُوزٌ عَقِيْمٌ)، من پیرەژنێکی نەزۆکم، لە سوورەتی (**هود**)دا ئاوا هاتوە: ﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾﴾، واتە: گوتی: ئەی هاوار بۆ من، ئایا منداڵم دەبێ لە حاڵێکدا من پیرەژنم و، ئەمەش مێردەکەمە پیرەو، کەوتۆتە تەمەنەوە، بە ڕاستیی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!!

لـە سـوورەتی (**هـود**)دا هاتـوە دەفەرمـوێ: ﴿ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾، موژدەمـان پێـدا (بـە ژنەکـەی، هاوسـەرەکەی) بـە ئیسـحاق و، لـەدوای ئیسـحاقیش بـە یەعقـووب، ئـەو کاتـە دەبێتـە چـوار مـوژدە، واتـە: ئیسـحاقیش وەچـەی دەبـێ و، یەکێـك لـە منداڵـەکانی بریتـی دەبـێ لـە یەعقـووب ﷺ، واتـە: هـەم مـوژدەی کوڕیـان پێـداو، هـەم مـوژدەی نەوەشـیان پێـدا.

ئنجا کە سارا خاتوون گوتی: من پیرەژنێکی نەزۆکم، فریشتەکان چییان گوت؟

**١٤)-** ﴿ قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ﴾، (فریشتەکان) گوتیان: هەر بەو شێوەیە پەروەردگارت وای فەرمووە، واتە: ئەوەی پەروەردگار فەرمووی، تەواوە و دێتە دی.

**١٥)-** ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەوە کارزانی زانا، لە سوورەتی (**هود**) دا ئاوا هاتوە: ﴿ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾، گوتیان: ئایا سەرت لە کاری خوا سوڕدەمێنێ! خوا هەر کارێکی بیەوێ دەیکات، بەزەیی خواو پێزەکانی خوا بەسەر ئێوەدا بڕژێن، ئەی ژنی ئەم ماڵە، بە ڕاستیی خوا ستاییشکراوی پایەدارو پایەبەرزە.

## مەسەلەی دووەم:

**پرسیارکردنی ئیبراهیم ﷺ لە فریشتەکان کە کاریان چییە؟ وەڵام دانەوەیان کە بۆ فەوتاندنی خەڵکێکی تاوانبار نێردراون کە کە گەلی لووطە، تاکو بەردی لە قوڕ دروستکراوی نیشانەکراویان بەسەردا ببارێنن، ئیدی هەرچی بڕوادار لە ئاوەدانییەکەدا بوو، وەدەریان ناو، بەڵام تەنیا ماڵێکی مسوڵمانی تێدابووە، نیشانەیەکیشیان تێدا بەجێ هێشتوە، بۆ کەسانی بیمدار لە سزای خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾، (ئیبراهیم ﷺ) گوتی: کارە گرنگەکەتان چییە، ئەی نێردراوان؟ (ف)ی، (فَمَا خَطْبُكُمْ)، (**فَصِيحَةٌ تُفْصِحُ عَنِ كَلامٍ مَحْذُوفٍ ناشِىءٍ عَنِ المُحاوَرَةِ الواقِعَةِ بَيْنَهُ وبَيْنَ ضَيْفِهِ**)، فائی (**فَاء الفَصِيحَةٌ**)ی پێ دەگوترێ، ئەو قسەیەی قرتێنراوە، ڕوونی دەکاتەوە، کە لە ئەنجامی وتوێژ لە نێوان ئەوو میوانەکانیدا پەیدابووە، ئەم (**ف**)ە دەلالەت لەسەر ئەو قسانە دەکات، وشەی (**خَطْبُ**)یش، بە کاری گرنگ دەگوترێ.

(**الخَطْبُ: الشَّأْنُ المُهِمُّ الَّذِي يَكْثُرُ فِيهِ التَّخَاطُب**)، کارێکی گرنگ کە قسەو باسی زۆر تێدا بکرێ، واتە: ئێوە ئەگەر لە لایەن خوای بەرزەوە نێردراون، ئەو کارە گرنگەی پێی ڕەوانکراون، چییە؟

هەڵبەتە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ، کە دوای ئەوەی فریشتەکان بە تەمابوو بڕۆن و خوا حافیزی بکەن، ئنجا لێی پرسیون: ئەدی کارە گرنگەکەتان چی بوو؟ ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە یەکێك لە ئەدەبەکانی میوانداریی ئەوەیە،

خانەخـوێ میـوان سـەغڵەت نـەکات بـە پرسـیاران، مەگـەر پرسـیارێکی زۆر پێویسـت بـێ و، پـەکی لەسـەر وەڵامەکـەی کەوتبـێ.

**چەند ئەدەبێکی گرنگی مامەڵەی خانەخۆێ لەگەڵ میوان دا:**

لـەم بەسـەرهاتەی ئیبراهیمـدا ﷷ کۆمەڵێـك ئـەدەب و ڕەوشـتی مامەڵەکـردنی خانـە خـوێ لەگـەڵ میوانـدا وەردەگیرێـن:

١- یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئینسان ڕێز لە میوانی خۆی بگرێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾﴾، میوانە ڕێز لێگیراوەکان، ئنجا ڕێزلێگرتنەکە بە پێشوازییکردن بێ، بەسەرو ڕووی خۆش پێشاندان دەبێ، بە گفت و لوتفی شیرین بێ.

٢- ئەوان سڵاویان کردوە، بەڵام سڵاوەکەی ئەو باشتر بووە لە هی وان، هی ئەوان بە ڕستەی کرداریی بووە: ﴿فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا﴾، (اسَلِّمُ عَلَيْكَ سَلَاماً)، بەڵام ئەو بە ڕستەی ناوی گوتوویەتی: (سَلَامٌ عَلَيْكُم)، یانی: سەلام و ئاشتییەکی چەسپاو لەسەر ئێوە بێ و بەردەوام، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ هەمیشە خانە خوێ لە میوان گەرم گوڕتر بێ و، سڵاوەکەی بە گەرمیی بستێنێتەوەو بە چاکتر لە خۆی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ...﴿٨٦﴾﴾.

٣- ئەدەبێکی دیکەی میوانداریی ئەوەیە: کاتێك خانەخوێ دەیەوێ خواردنێك ئامادە بکات بۆ میوانەکانی، بە شێوەیەکی پەنامە ئامادەی بکات، نەك بیکاتە هەراو گاڵەو میوانەکان دەستی بگرن و، سوێندی لێ بخۆن، نابێ خۆی ئەزیەت بدات، ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ﴾، بە شێوەیەکی پەنهان چووە لای خێزانی، ئەم تەعبیرە بۆیە لێرەدا بەکارهاتوە، بە شێوەیەکی پەنهان چووە و وا نەچووە میوانەکان هەست پێ بکەن.

٤- یەکێکی دیکە لە ئەدەبەکانی خانەخوێ لەگەڵ میواندا ئەوەیە، بە باشترین شتێك کە لەماڵەکەیدا هەیە، خزمەتی میوانەکەی بکات، ﴿فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ﴾، ماڵی ئیبراهیم ﷷ وادیارە پەڕەوەریشیان هەبووبێ و، دەیتوانی مریشکێك، یان چەند مریشکێك،

یان کەڵەشێرێك، بۆ میوانەکانی سەر ببڕێ، تەنانەت بەرخێك، یان کارێك، یان کاریلەیەك، بەڵام ئەو گۆلكێكی بۆ سەربڕیون، گۆلکەکەشی گۆلکێکی قەڵەو بووە، دواییش بە باشترین شێوەش بۆی سازکردوون، بەشێوە برژاندن.

٥- ئەدەبێکی دیکە ئەوەیە: ﴿ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، خواردنەکەی بۆ هێنانە پێش، زانایان دەڵێن: واباشە میوان ئەزیەت نەدرێ، گوازە گوازی پێ بکرێ، تاکو دوو پاروو نانی دەدرێنێ، لێرە هەستە بۆ ئەوێ، ئنجا وەرە بچین بۆ ئەوێ! بەڵکو خواردنەکەی بهێندرێتە پێش، هەڵبەتە ئەوە بەپێی عورف و کلتووری گەلان و کۆمەڵگایەکانیش دەگۆڕێ.

٦- ئەدەبێکی دیکە ئەوەیە: ﴿ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، بەشێوەیەکی زۆر نەجیبانە، فەرمووی کردن: ئایا نافەرموون، ناخۆن! ئەوانە شەش ئەدەبی میوانداریەتیین، کە لەم چەند ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێن.

ئێمە پێشتر باسێکی تایبەتمان کردوە دەربارەی ئەدەبەکانی میوانداریێتیی، کە باسی ئەم ئایەتانەشمان تێدا کردوە.

ئنجا کە ئیبراهیم دەپرسێ: ﴿ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، کارە گرنگەکەتان چییە؟ ئەی ڕەوانە کراوەکان؟ ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە:

٢)- ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴾، گوتیان: ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار، لێرە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، چونکە لە شوێنەکانی دیکە باسکراوە، کە ئەو کۆمەڵە تاوانبارە گەلی لووطن عليه السلام، بەڵام لێرە تەنیا بە سیفەتی تاوانباریی و کۆمەڵێکی تاوانبار باسکراون.

٣)- ﴿ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴾، تاکو بۆیان بنێرین، بەسەریاندا بنێرین، بەردێك کە لە قوڕ دروستکراوە، واتە: بەردەکە قوڕێکە وشککراوەتەوە و، بۆتە بەرد، لێرە وای فەرمووە، لە شوێنەکانی دیکە دەفەرموێ: ﴿ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ ﴾الحجر، (**سِجِّيل**)، لە ئەصڵدا وشەیەکی فارسییە، بە مانای سەنگی گڵ، سەنگ واتە: بەرد، گڵ یانی: قوڕ، یانی:

(**حَجَرٍ مِنْ طِيْنٍ**)، یانی: (**طِيْنٍ مُتَحَجِّر**)، وەك لە شوێنەكانی دیكە باسمان كردوە، كەواتە: (**سِجِّيْل**)، لە ئەصڵدا وشەیەكی فارسییە و (سەنگی گل)ە و چونكە پیتی (گ) لە زمانی عەرەبیی دا نیە هەردووك (گ)كان بوونە (ج) و وشەكە بۆتە (سنج جل) دواییش (ن)كە لابراوە و دوو (ج)كە تێكدا دەغم كراون و بۆتە (سجیل) یانی: بەردی قوڕ، لێرەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿حِجَارَةً مِّن طِينٍ ٣٣﴾.

٤)- ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾، نیشانەدار كراوە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ زێدەڕۆییكاران (**مُسَوَّمَةً: جُعِلَتْ عَلَيْهَا السُّومَةُ، أَيْ: العَلاَمَةُ**)، نیشانەی لەسەر دانراوە، كە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ و نیشانەدار كردنەكەی ئەوەیە: بەردێك لە قوڕ دروست بكرێ و ببێتە بەرد و سوور بكرێتەوە، وەك خشتی سوور، ئەوە نیشانەكەیەتی، یاخود: ڕەنگێكی تایبەتی هەبووە، یاخود: هەر كەسێك كە بەردێكی بۆ دانراوە، پێی بكەوێ، ناوونیشانی ئەو كەسەی لەسەر بووە، هەندێك لە زانایان وا دەڵێن، كە ئەوەش لەلای خوای پەروەردگار هەر ئاسانە، بەڵام ئایەتەكە ئەوە ناگەیەنێ، كە هەركەسێك بەردێكی تایبەتیی بووبێ، هەتا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ناوی سیانیی لەسەر بەردەكە نووسراوە، كێیە و چییە و چۆنە؟

بەڵام بە هەرحاڵ ئەمە ڕواڵەتی ئایەتەكە نایگەیەنێ، ئایەتەكە بەس دەفەرموێ: بەردەكان نیشانەدار بوون لەلایەن پەروەردگارتەوە، بۆ زێدەڕۆییكاران، بۆ تێپەڕێنەران و سنوورشكێنان.

٥)- ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، ئێمەش هەر كەسێ كە تێیدابوو لە بڕواداران دەربازمان كرد، (**فَأَخْرَجْنَا**)، (**ف**) دیسان (**فَصِيْحَة**)یە، واتە: چووین بۆ شارەكە و، تەماشامان كرد و قسەمان لەگەڵ لووطدا عليه السلام كرد و، سەرەنجام ئەوەی لە شارەكەدا هەبوو لە بڕواداران، وەدەرماننان و دەربازمانكردن.

٦)- ﴿فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾، جگە لە ماڵێك لە مسوڵمانانمان لەوێدا چنگ نەكەوت، (**ف**) بۆ (**تَفْرِيْع**)ە، واتە: دوای ئەوەی بڕیارماندا بڕوادارەكانی لێ وەدەر بنێین،

تەنیا یەك ماڵ لە مسوڵمانمان تێدا بینی، لێرەدا وشەی (فَمَا وَجَدْنَا)، (وَجَدْنَا)، بە مانای (عَلِمْنَا)یە، چونكە (وَجَدَ مِنْ أَخَواتِ ظَنَّ)، (وَجَدَ) لەدەستە خوشكەكانی (ظَنَّ)یەو دوو بەركار (مَفْعُول بە)ی دەوێن، بەركار (مَفْعُول)ی یەكەمیان بریتیە لە (مِنَ المُسْلِمِيْنَ)و، (مِن)، زیاد كراوە بۆ جەختكردنەوەی لابردنەكە تێماندا نەبینی و، تێیدا چنگان نەكەوت، جگەلە یەك ماڵ لە مسوڵمانان، بەركاری دووەمی بریتیە لە: (فِيْهَا)، كە لە شوێنی بەركاری دووەم دانیشتوە، (فَمَا وَجَدْنَا فِيْهَا)، یانی: (فَمَا عَلِمْنَا فِيْهَا)، تێماندا نەزانیی، لەوێدا چنگمان نەكەوت، جگە لە یەك ماڵ لە مسوڵمانان.

٧)- ﴿ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾، لەوێدا نیشانەیەكمان بەجێهێشت بۆ ئەوانەی لە ئازاری بە ئێش دەترسێن، لێرەدا كە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە (مُؤْمِن وَمُسْلِم)، یەكن واتە: ئەم دوو وشەیە هاوواتان، یان تێكەڵكێشن، چونكە خوا دەفەرموێ: هەر كەسێك لە بڕواداران لە شارەكەدا هەبوو وەدەرمانان، بەڵام تەنیا ماڵێك لە مسوڵمانانمان تێدا بینی، بەڵام باشتر وایە بڵێین: (**المُؤْمِنُ: المُصَدِّقُ بِما يجِبُ التَّصْدِيقُ بِهِ، والمُسْلِمُ: المُنْقادُ إلى مُقْتَضى الإيمانِ، متساويان**).

(مُؤْمِـنٌ)، واتـە: بـە ڕاسـتدانەری هەمـوو ئـەوەی پێویسـت دەكات بـە ڕاسـت دابـنرێ، (مُسْـلِمٌ)یش، واتـە: ملكەچبـوو بەپێـی داخـوازی ئیمانەكـە، واتـە: ئیـمان دیسـان دەبێتـەوە بـە حاڵەتێـكی پەنهـان و ئیسـلام دەبێتـەوە بـە حاڵەتێـكی ئاشـكرا، ئیـمان پەنهانـە، بـەڵام ئیسـلام ئاشـكرایە، پایـەكانی ئیـمان: بـڕوا بـە خـوا ﷻ، بـە فریشـتەكانی، بـە كتێبەكانـی، بـە پێغەمبەرانـی، بـە ڕۆژی دوایـی، بـە قـەدەر، ئـەوەش هەمـووی پەنهانـە لـە عەقـڵ و دڵدایـە، بـەڵام پایـەكانی ئیسـلام: شـایەتمان بـە تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا و، بەڕەوانـە كراویـی موحەممـەد ﷺو، بەرپـا كـردنی پێنـج نوێـژەكان، زەكات دان، ڕۆژووی مانگـی ڕەمـەزان گرتـن، حـەج و عومـرە كـردن، هـەر پێنجیـان ئاشـكران، لـە ڕاسـتییدا ئیـمان و ئیسـلام جـاری وایـە دەچنـەوە نێـو یـەك و، جـاری واش هەیـە جیـا دەبنـەوە، لێـرەدا چوونەتـە نێـو یـەك، بـەڵام لـە سـوورەتی

(**الحجـرات**)دا کـە دەفەرمـوێ: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ ﴿١٤﴾﴾!

لـەوێ لێـك جیابوونـەوە، لەبەرچـی؟ چونکـە لـەوێ ئیسـلام هـەروەك تەسـلیم بـوون و ملکەچبـوونی ڕواڵەتیـی هاتـوە، ئیمانیـش وەك ئـەو حەقیقەتانـەی دەچنـە نێـو دڵ و دەروونـەوە، ئنجـا ئیسـلامەتیی بـە مانـا تێـرو تەواوەکـەی، ئیمانیشـی تێدایـە، هـەر وەك ئیمانیـش بـە مانـا تێـرو تەواوەکـەی ئیسلامیشـی تێدایـە، بـەڵام جـاری واش هەیـە مسـوڵمانەتیی هەیـە، بـە شـێوەیەکی ڕووکەشـیی و ڕواڵەتیـی، وەك هـی عەڕەبـە خێڵەکییـەکان و، هـی مونافیقـەکان، بـەڵام ئیـمان نیـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٣٧﴾﴾، نیشـانەیەکمان لـە وێـدا بەجێهێشـت، بـۆ ئەوانـەی لـە ئـازاری بـە ئێـش دەترسـێن، (**فخرالدیـن الـرازي**)، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، کـە زۆرجـار وردەکاریـی زۆر بـاش لـە تەفسـیری ئایەتەکانـدا دەکات، دەڵـێ:

(**فـي الآيَـة خِـلَافٌ: أولاً: قِيْـلَ: مَـاءٌ أَسْوَدٌ مُنْتِنٌ انْشَـقَّتْ أَرْضُهُـمْ وَخَـرَجَ مِنْهَـا ذَلِـك، ثَانِيـاً: قِيْـلَ: حِجَـارَةٌ مَرْمِيَّـةٌ فـي دِيَارِهِـمْ وَهِـيَ بَيْنَ الشَّـامِ وَالحِجَـاز**).

واتـە: لـە بـارەی ئـەم نیشـانەوە ڕاجیایـی هەیـە: یەکـەم: گوتـراوە: مەبەسـت لـەو نیشـانەیەی خـوا بەجێـی هێشـتوە لـە شـوێنەواری گـەلی لـووط، ئـەو ئـاوە ڕەشـە بۆگەنەیـە کـە لـە زەوییەکەیـان دایـە، زەوییەکـە شـەق بـووە، قڵیشـاوەو، ئـەو ئـاوەی لـێ دەرچـووە، دووەمیـان: گوتـراوە: مەبەسـت لـە شـوێنەوارەکە ئـەو بەردانـەن کـە هاویشـتراون و لـە جێگـەو ڕێگـەو مـاڵ و حاڵەکانیانـدا بەجـێ مـاون، کـە دەکەونـە نێـوان شـام و حیجـازەوە.

بـەڵام بـە ڕای بەندە، مەبەسـت لـەو نیشـانە (**آية**) و شـوێنەوارە تێکڕای شـوێنەوارە بەجێـماوەکانی ئاوەدانییـەکانی گـەلی فەوتـاوی لووطـن، کـە هـەم دەریاچـەی مـردوو (**بَحْـر المَيْـت**) دەگرێتـەوە، هـەم خانووبەرەکانیـان کـە وەك کاتی خـۆی ئێمـە لـە

بەسەرهاتی گەلی لووطدا ﷺ کە لە سووڕەتی (هود)دا خستمانە ڕوو بە تەفصیلی باسمان کردوە، کە ئێستا شوێنەوار دۆزەکان (مُکْتَشفون) دۆزیویانەتەوە کە لە ژێرو بنەوەی دەریای مردوودا، شوێنەواری خانووبەرە هەیە و خانووبەرەکانیش هەڵگێردراوەن، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ﴿٧٠﴾﴾التوبة، خانووبەرە هەڵگێڕدراوەکان، واتە: بناغەکەیان لە سەرێیە و سەقفەکەیان لە خوارێیە، پاشان بەردیان تێدا دۆزیونەوە و ئێسقانی مردوویان تێدا دۆزیونەوە، کە وەك تێزابیان پێداکرابێ بەو شێوەیە سووتێنراون، ئەمە لەم ساڵانی دواییدا دۆزراوەتەوە.

کەواتە: لە ڕاستییدا هەم دەریاچەکە شوێنەوارێکە، هەم خانووبەرە هەڵگێردراوەکانیان کە لەبنی دەریاکەدا هەن، کە بە غەواسەی زۆر پێشکەوتوو چوونە بنی دەریاو تەماشایانکرد، ئەو خانووبەرانە لەوێدا هەن و، ئەو بەردانەشیان دۆزییەوە، پەیکەری ئێسقانیشیان دۆزییەوە، کە بەردی پێکەوتوە، وەك تێزاب کونی کردوە، دەریاچەی مردووش، ڕێژەی خوێی هێندە تێدا زۆرە هیچ زیندەوەرێك و هیچ ژیانداریێکی تێدا نیە، نە هی ڕووەکیی و نە هی ژیانداری دیکە!! ئەوانە هەموویان ئەو نیشانەیەن کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: لەوێدا بەجێمانهێشتوە ﴿لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾﴾، بۆ ئەوانەی لە ئازاری بە ئێش دەترسێن و سزای خواش بۆ هەموو گەلانی یاخیی لە بۆسەدایە.

خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەمیشە دەرس و پەندو عیبرەت وەردەگرن لە مێژوو و بەسەرهاتی ئەوانەی پێش خۆیان، خوا لەو کەسانە بمانگێڕێ کە زیاتر لە نهێنییەکانی قورئان دەکۆڵنەوەو شارەزا دەبن، بەرچاو ڕوون دەبن و، یارمەتییشمان بدات زانینەکەمان بگۆڕین بۆ توانین و حاڵییبوونەکەمان لە خۆماندا بکەینە حاڵ.

### مەسەلەی سێیەم:

**هەروەها لەبەسەرهاتی مووساشدا ﷺ، نیشانەی زۆر هەن، لەسەر باڵادەستیی خوا، بۆ هەر شتێك بیەوێ بیهێنێتەدی، بە تایبەت زیندووكردنەوەی مردووان، كاتێك خوا ﷻ مووسای بۆ لای فیرعەون نارد، كەچی فیرعەون بەهەموو هێزیەوە، یان بەهۆی هێزەكەیەوە، پشتی هەڵكردو، مووسای بە جادووگەر یاخود شێت تۆمەتباركرد، بۆیە سەرەنجام خوا خۆی و سەربازەكانی گرت و، فڕێ درانە دەریاوە، لە حاڵێكدا كە فیرعەون كارێكی كردبوو خۆی سەركۆنەی هێنایە سەرخۆی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿٤٠﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾، هەروەها نیشانە هەیە لە مووسادا كە بەبەڵگەی ڕوونەوە ناردمانە لای فیرعەون، (وَفي مُوسَى)، ئەم (و)ە، بەسەرهاتی مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە بۆ باسێكی پێشتر، كە هەندێك لە زانایان دەڵێن: دەیگێڕێتەوە بۆ ئایەتی نیزیك لە خۆی كە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، لە ئاوەدانیی و وڵاتێك كە گەلی لووطی تێدا دەژیا، كە خاپوورمان كرد، نیشانەیەكمان تێدا بەجێهێشت بۆ كەسانێك كە لە سزاو ئازاری بە ئێشی خوا دەترسێن، ئنجا دەڵێ: ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾، هەروەها نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی لە سزاو ئازاری بە ئێشی خوا دەترسێن، لە بەسەرهاتی مووسادا ﷺ، كاتێك ڕەوانمان كرد بۆ لای فیرعەون، بە بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكراوە.

ئەمە ڕایەكە.

ڕایەکی دیکەش، کە من ئەوەم پێ بەهێزترە ئەوەیە کە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئایەتەکەی پێشووتر، کە خوا ﷻ فەرموویی: ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ۝٢٠ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ۝٢١ ﴾، لە زەویدا نیشانە هەن بۆ ئەوانەی بڕوایەکی جێی دڵنیاییان هەیە، هەروەها لە خۆشتاندا بۆچی تەماشا ناکەن و سەرنج نادەن.

بە هەمان شێوە لە بەسەرهاتی مووساشدا نیشانە هەن، بۆ ئەوانەی خاوەنی دڵنیایین لە ئیمانیاندا، کاتێك ڕەوانمان کرد بۆ لای فیرعەون بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە.

هەروەها ڕایەکی دیکەی سێیەمیش - کە هی خۆمە- هەیە، ئەویش ئەوەیە کە گێڕانەوەکە بۆ هەردووکیان بێ، هی ئەیەتی ژمارە (٢٠)مان باسکردو باسی گەلی لووط ﷺ یش کە نیشانەیەکی تێدا بەجێهێڵراوە، نیزیکترە و هەر لەو سیاقەشدایە، کە بریتیە لە ئاماژەکردن بە بەسەرهاتی ئەو شەش پێغەمبەرە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، هەر لە سیاقی بەڵگە هێنانەوەدایە لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ تواناداره لەسەر زیندووکردنەوەی مردووان، ئەم ژیانە دنیاییە نابێ ژیانی مرۆڤی تێدا کورت هەڵاتبێ، بەڵکو دەبێ ژیانی دیکەی بەدوادابێ، قۆناغێکی دیکە کە سزاو پاداشتی تێدا ئەنجام بدرێ، خواش لەسەر ئەوە ﷻ بە توانایە، ئنجا خوا دەفەرموێ: لە بەسەرهاتی مووساشدا ﷺ کە ڕەوانمانکرد بۆ لای فیرعەون و بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە، بەڵگەو نیشانە زۆرن لەسەر باڵادەستیی خوا ﷻ، پاشان لەسەر ئەوە کە ئەم ژیانە دنیاییە نابێ تاکە ژیانێك بێ، بەڵکو دەبێ ژیانی دیکە هەبێ و قۆناغی دیکە هەبێ، کە مرۆڤ لەو قۆناغەی دیکەدا لەسەر چاکەکانی پاداشت دەدرێتەوە، لەسەر خراپەکانی سزا بدرێتەوە.

خواش ﷻ کە مووسای ﷺ نارد بۆ لای فیرعەون بۆ دوو ئامانج ناردی:

١- بۆ ئەوەی پەیامی خوا بگەیەنێ بە خۆی و بە گەلەکەی، چونکە مووسا ﷺ بەڵێ لە بەنوو ئیسرائیل بوو، یەکێك لە ئامانجەکانی کە چوو بۆ لای فیرعەون، ئەوەیە کە

دەفەرموێ: ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴿٤٧﴾ ﴾طه، وەچەی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرەو چیدی ئازارو ئەشکەنجەیان مەدە، سۆغرەو بێگاریان پێ مەکە، ئەوە ئامانجێکی بوو.

٢- ئامانجێکی دیکەشی ئەوە بوو کە پەیامی خوا بە فیرعەون و بە گەلی فیرعەون واتە: قیبتییەکانی میسرِ بگەیەنێ، هەردووك ئامانجەکەی هەبوون و، هەردووکیان لە قورئاندا باسکراون.

﴿ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە، خوا ﷻ ناوی لە بەڵگە ناوە (سُلْطَان)، چونکە بەڵگە دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵی مرۆڤدا، ئەگەر مرۆڤ بیەوێ لە هەقێ بگەڕێ و عەوداڵی هەق بێ، بەڵگە عەقڵ و دڵی دەخاتە ژێر کۆنتڕۆڵ و ڕکێفی خۆیەوە.

ئنجا ئایا ئەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایە چیی بووە؟ هەندێك گوتوویانە: گۆچانەکەی بووە، هەندێك گوتوویانە: دەستی بووە، چونکە خوای پەروەردگار بە یەکی هێناوە: ﴿ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە، هەندێك گوتوویانە: ئەو وتووێژو دیالۆگە بووە کە مووسا عليه السلام لەگەڵ فیرعەوندا کردوویەتی، قسەی زۆر بەڵگەدارو ڕوون و ئاشکرای بۆ هێناونەوە، بۆ وێنە: کە لە سووڕەتی (طه)دا فیرعەون دەپرسێ: ﴿ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، واتە: پەروەردگارتان کێیە! ئەی مووسا؟ پەروەردگاری تۆو هاڕوون، چونکە فیرعەون خۆی بە پەروەردگار زانیوە! مووساش عليه السلام وەڵامی دەداتەوە: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بە هەموو شتێك داوەو دوایش ڕێنمایی کردوە، واتە: بوونی بە هەموو شتێك داوەو هێناویەتە دی و ڕێکیشی خستوە، چۆن بەڕێوە بچێ، ئەمەش ئاماژەیە بە هەردوو بەڵگەی زۆر بەهێز کە لە یاسای هۆکاریی و، یاسای ڕێك و پێکیی وەردەگیرێن، یاسای هۆکاریی کە دەڵێ: (هەموو پەیداکراوێك پەیداکەرێکی هەیە)، یاسای ڕێك و پێکیی کە دەڵێ: (هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە).

بەڵام بە بۆچوونی من واباشترە بگوترێ: مەبەست لە: ﴿بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾، هەموو ئەو بەڵگەو موعجیزەو قسە مەنتیقییانە بوون کە مووسا عليه السلام پێی بوون بۆ لای فیرعەون، بەڵێ بە تاك هێناویەتی، بەڵام مەبەست پێی جینسی ئەو بەڵگەو دەلیلانەیە، ئنجا چ شتی بەرهەست بووبن، وەك گۆچانەکەی و دەستەکەی و شتەکانی دیکە، چ ئەو بەڵگەو دەلیلانە بووبن کە لە کاتی وتووێژدا بۆی هێناونەوە.

٢)- ﴿فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ﴾، بەهێز و توانایەکەیەوە پشتی هەڵکرد، (فَتَوَلَّى)، یانی: پشتی هەڵکرد، پشتی تێکرد، ڕووی وەرگێڕا، (بِرُكْنِه)، (ركن) هەم بە مانای لاتەنیشت دێ، (بِجَانِبِه)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۝٥١﴾ فصلت، مرۆڤ ئەگەر لاتەنیشت لە شتێ بکات، مانای وایە ڕووی لێ وەردەگێڕێ، (وَهُوَ عِبَارَةٌ عَنِ المُبَالَغَةِ فِي الإعْرَاضِ عَنِ الشَّي)، کە بریتیە لە زێدەڕۆییکردن لە پشتکردنە شتێك دا، ئەگەر کەسێك شتێك ڕەفز بکات، دەگوترێ: پشتی تێکرد، کە مەرج نیە بە کردەوە پشتی تێکردبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەر ئینسان پشتی لە شتێك کرد، نایبینێ، نادیدەی دەگرێ، بۆیە ئەو تەعبیرە بۆ ئەوە هێنراوەتەوە، هەرکام لە: (أَعْرَضَ بِجَانِبِه) و (نَئَا بِجَانِبِه)، هەردووکیان هاتوون لە قورئاندا، (نَئَا)، یانی: (أَبْعَد)، (أَعْرَضَ)، یانی: ڕووی لێوەرگێڕا، بەڵام بە لاتەنیشتەوە، چونکە بەر لەوەی ئینسان پشت بکاتە شتێك، پێشێ لاتەنیشتی تێ دەکات، تاکو خۆی وەردەسووڕێنێ.

یاخود: (رُكْنْ)، وەك پێشتر گوتمان: بە مانای قووەت و کۆمەڵ و هێزیش دێ، واتە: بەهێزەکەی و بە سوپایەکەی پشتی تێکرد.

یاخود ﴿فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ﴾، یانی: (فَتَوَلَّى بِكُلِّ مَا أُوتِيَ مِن قُوَّةٍ)، بە هەموو هێزی خۆیەوە پشتی تێکرد.

کەواتە: سێ واتای هەن:

١- بە مانای پشت تێکردن ڕوو لێوەرگێڕان.

٢- بە مانای بە هۆی هێزو سوپایەکەیەوە بانگەوازەکەی مووسای ڕەفز کرد.

٣- بە مانای بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە، پشتی لە مووسا کرد عليه السلام.

٤)- ﴿وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾، گوتیشی (مووسا) جادووگەرە یان شێتە، زانایان گوتوویانە: فیرعەون بەس یەکێکیانی گوتوە، یان گوتوویەتی: جادووگەرە، یان گوتوویەتی: شێتە، بۆیە هەندێك گوتوویانە: جارێك گوتوویەتی: جادووگەرە و جارێك گوتوویەتی: شێتە، یاخود هەردووکیانی گوتوە، بەڵام (أو) لێرەدا بە مانای (و)ە، یانی: گوتوویەتی: ﴿سَاحِرٌ مَجْنُونٌ﴾، جادووگەریشەو شێتیشە، بەڵام وا پێدەچێ ئەو مانایە ڕاستتر بێ کە جارێك بە جادووگەری ناوبردوە و، جارێك بە شێتی ناوبردوە، هەڵبەتە فیرعەون بۆ خۆی زۆر چاك مووسای ناسیوە عليه السلام و، هەمیشە ئەو دەستەڵاتدارانە لە خەڵکی دیکە هۆشیارتر بوون، ئەگەر ویستبایان هەق بدۆزنەوە، چاکتر هەقیان پەی پێبردوە، بەڵام ئەو قسانەی کردوون بۆ چەواشەکردنی خەڵك و، چاوپێچك خستنە سەر چاوی خەڵك و بۆ خۆڵکردنە چاویان، خۆناچێ بڵێ: مووسا پێغەمبەری خوایەو، ئەو بەڵگانەش کە دەیانهێنێتەوە هەقن و، موعجیزەکانیشی خوا پێیداون! دەبێ تۆمەتێکی بخاتە پاڵ، پاساوی ئەوە بێ بڕوای پێ نەهێنێ، واتە: کۆی دوو قسەکانی کردوە، هەر کامێکیان لە قۆناغ و حاڵی خۆیدا.

٥)- ﴿فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ﴾، ئێمەش خۆی و سەربازەکانیمان گرت، (جُنُود)، یانی: سوپا، خۆی و سوپاکەیمان گرت، گرتن لێرەدا بە مانای سزادانە، لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێ بیەوێ زەبر لە کەسێ بدات، پێشێ دەیگرێ، ئنجا زەبرەکەی لێ دەوەشێنێ، یان هەر خودی گرتنەکە، مەبەست پێی سزادانەکەیە.

٦)- ﴿فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ﴾، فڕێماندانە نێو دەریا، (فَنَبَذْنَاهُمْ: طَرَحْنَاهُمْ وَقَذَفْنَاهُمْ)، (يَمٌّ) یانی: (بَحْر)، فڕێماندان و هاویشتماننە نێو دەریاوە، وشەی (نَبذ): وەك پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا گوتمان: بریتیە لە فڕێدانی شتێك و هاویشتنی، بەڵام لە بە کەم بایەخیی و، بە کەم تەماشا کردنەوە، بە گرنگیی پێ نەدانەوە، وەك لە پەندی عەڕەبییدا هاتوە: (نَبَذْتُهُ نَبْذَ النَّعْلِ الخَلق)، واتە: فڕێمدا، وەك چۆن پێڵاوێکی شڕ فڕێ دەدرێ، لەبەر ئەوەی بە کەڵك نەماوە، (مَنْبُوذ)، یانی: فڕێدراو بەسروکیی و کەم بایەخیی.

٧)- ﴿وَهُوَ مُلِيمٌ﴾، لە حاڵێکدا ئەو گلەیی هێنا بووە سەرخۆی، (المُلِيْم: الّذِي جَعَلَ غَيْرُهُ لَائِماً لَهُ) لە: (مُلِيْم)، (أَلَامَ، يُلِيْمُ) واتە: گلەیی هێنایە سەر خۆی و خۆی وا لێکرد

کە لۆمە و سەر کۆنەی بکرێ، کەواتە: (مُلِیْم)، یانی: گلەیی هێنەرە سەر خۆ چونکە توێژەرەوان هەندێکیان گوتوویانە: (**الَّذِي جَعَلَ غَيْرَهُ لَائِماً لَهُ**)، ئەو کەسەی وای کردوە غەیری خۆی گلەیی لێ بکات و سەرکۆنەی بکات، هەندێکیش گوتوویانە: (**آتٍ بِمَايُلامُ عَلَيْهِ**)، شتێکی کردوە لەسەری سەرکۆنە بکرێ کە بریتی بوو لەوەی بانگەشەی ئەوەی کرد: پەروەردگاری خەڵکی میسرەو تاکە پەرستراویانە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد: هەرچی بیڵێ هەقەو، قسە دەبێ هەر قسەی ئەوبێ و، ڕێگەش نادات کەس قسەی دیکە بکات.

لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ زۆر بە کورتیی باسی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام و، فیرعەون و دارو دەستەکەی کردوە، بەڵام وەك جاری دیکەش گوتوومانە: ئێمە بەسەرهاتی مووسا عليه السلام و هارووني برای عليه السلام و، لە بەرانبەریشیاندا فیرعەون و دارو دەستەکەی، لە هەردوو سووڕەتی (**القصص**)و، سووڕەتی (**الأعراف**)دا، لە سووڕەتی (**القصص**)دا ئێمە لە ئایەتەکانی: (١ - ٤٢)، پێنج قۆناغی سەرەتای تەمەنی مووسامان عليه السلام شیکردوونەوە، لەوێدا، لە سووڕەتی (**الأعراف**)یش، لە دوو توێی (٦٩) ئایەتدا لەو ئایەتەوەکە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُواْ بِهَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٠٣﴾، تاکو ئایەتی (١٧١)، یانی: ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)، هەشت قۆناغەکەی دیکەی ژیان و بەسەرهاتی مووسامان عليه السلام خستوونە ڕوو، بەسەرهاتی مووسامان هەمووی کردوە بە سێزدە قۆناغ و پێنجی سەرەتای لە (٤٠) ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (**القصص**)داو، هەشتەکەی دیکەشی لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، خستوومانە ڕوو.

## مەسەلەی چوارەم:

**هەروەها لە بەسەرهاتی گەلی عاددیشدا نیشانەی زۆر هەن، کە خوا بایەکی بێ خێری ناردە سەریان و، هەر شتێك بەسەریدا هاتبایە، لێی نەدەگەڕاو، بەجێی نەدەهێشت تاکو وردو خاشی دەکرد:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَفِي عَادٍ ﴾، هەروەها لە (گەلی) عاددا (نیشانە هەن)، دیسان ئەم (و)ە، گێڕەرەوەو بادەرەوەی ئەم ڕستەیەیە، بەپێی ئەو ڕایەی ئێمە هەڵمانبژارد، بۆ سەر دوو ئایەتی موبارەکی: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: لە بەسەرهاتی عادیشدا نیشانە هەن، بۆ ئەوانەی خاوەنی دڵنیایین لە ئیمانیاندا.

بەسەرهاتی گەلی عادیش زۆر دەرس و پەندو عیبرەتی تێدان، کە پێغەمبەرەکەیان (هوود) بوو عَلَيْهِ السَّلَامُ و، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**هود**)دا بە درێژیی باسی بەسەرهاتی (هوود) عَلَيْهِ السَّلَامُو گەلەکەی عادمان کردوە.

**٢)-** ﴿ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴾، کاتێك بایەکی نەزۆکمان ناردە سەریان، وشەی (**عَقِيْم**)، لە (**عُقْم**)ەوە هاتوە، (**عُقْم**): بە مانای (**يُوبسة**) واتە: وشکییەك کەوا وا لەو شتە بکات هیچ حاڵەتی کارتێکراویی نەبێ، بەڵام دوایی وشەی (**عَقِيْم**)، ئەگەر بۆ مرۆڤ یاخود بۆ ئاژەڵ بێ بەمانای نەزۆك بەکارهێنراوە ئەگەر بۆ (با) بێ، یانی: بایەك هیچ خێری پێوە نیە، دەڵێ: (**والرِّيحُ الخَلِيَّةُ مِنَ المَنافِعِ الَّتِي تُرْجى لَهَا الخَيْر**)، بایەك کە خاڵیی بووبێ لەو سوودانەی خەڵك ئومێدیان لەسەر هەڵدەچنێ بۆ با، ئایا ئەو ئومێدە خێرانەی لەسەر با هەڵدەچنرێن چین؟

**یەکەم:** ئەوەیە کە فێنکایەتیی هەبێ، ئەگەر گەرما بێ پشووە بایەك بێ و فێنك بێتەوە.

**دووەم:** با هەورەکان دێنێ و موتووربەیان دەکات.

**سێیەم:** دەبێتە هۆی موتووربەکردنی میوەکان و، گوڵ و گوڵزارو دارو درەخت.

**چوارەم:** بەبێ هەواو بەبێ با، مرۆڤ ناتوانێ لە چەند خولەکێك زیاتر بژی.

**پێنجەم:** بەبێ هەوا دەنگ نەقڵ نابێ.

**شەشەم:** بەبێ هەواو با هیچ شتێک نابینرێ بەڵام ئەو بایەی خوا ناردوویەتی بۆ سەر گەلی عاد، بایەکی بێ خێر بووە و هیچ سوودێکی تێدا نەبووە.

٣)- ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴾، (ئەو بایە) وازی لە هیچ شتێك نەدەهێنا کە بەسەریدا هاتبایە، ئەو بایە، مەگەر وەك پووش و پەڵاشی لێ دەکرد، یان وەك شتێکی وردو خاشکراوی لێ دەکرد، یاخود (**والرَّميمُ: العَظْمُ الَّذي بَلِيَ**)، (رميم) ئەو ئێسقانەیە کە پڕتووکاوەو ڕزیوە، یانی: وەك ئێسقانی پڕتووکاوو ڕزیوی لێ دەکرد، دەگوترێ: (**رَمَّ العَظْمُ، إذا بَلِيَ، أيْ: فَأصْبَحَ مُفَتَّتًا**)، ئێسقانەکە رزیی، واتە: وردو و خاش بوو، پڕتووکا.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ ﴾، (**تَذَرُ: تَدَع**)، واتە: (**مَا تَذَرُ**)، (**مَا تَتْرُكُ**)، لێی نەدەگەڕا جێی نەدەهێشت، شتێك کە بەسەریدا هاتبا، لێی نەدەگەڕا بەجێی نەدەهێشت، ﴿ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴾، مەگەر وەك ئێسقی پڕتووکاوی لێکردبایە، یان وەك پووش و پەڵاشێك کە دەئەجنرێ و وردو خاش دەکرێ، واتە: ئەو بایە جەستەی گەلی عادی بەو شێوەیە لێکرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ ﴾، دیارە (**شَيْءٍ**)، لێرەدا لە مانای بەرکار (**مفعول**) دایە، یانی: (**مَا تَذَرُ شَيْئًا**)، بەڵام (**مِنْ**)ەکە، بۆ جەختکردنەوەی لابردنەکە (**لِتَأْكِيدِ النَّفيِ**) زیاد کراوە، کە مەبەست پێی نەفیکردنی جینسی ئەو شتانەیەوە کە بایەکە بەسەریاندا هاتوە، بەڵام بە عەقڵ ئەوە تایبەت دەکرێ بەو شتانە

کە با دەتوانێ لە بەینیان بەرێ، کە مەبەست پێی جەستەی گەلی عاد بووە، ئەگەرنا بۆ وێنە: ئەو بایە چیا لە بەین نابات، زەوی لە بەین نابات، دەریا لە بەین نابات.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴾، هیچ شتێکی بەجێ نەدەهێشت، بەسەریدا هاتبایە، مەگەر وەك پووش و پەڵاشی ئەنجندراوو تێکهاڕاوی لێدەکرد، واتە: ئەو شتانەی بایەکە بۆیان نێردراوە بەو شێوەیان لێ بکات، ئەمە پێی دەگوترێ: تایبەتکردنی چەمکی ئایەتەکان بە حوکمی عەقڵ، جاری وایە خوا سبحانه وتعالى حەواڵەی عەقڵی مرۆڤی دەکات و بە عەقڵ دیارە کە دەفەرموێ: هیچ شتێکی بەجێ نەدەهێشت، مەگەر وردو و خاشی دەکرد، مەبەستی لە هەموو شتێك نەبووە بە گشتیی، بەڵکو ئەو شتانەی بایەکە نێردراوە وردو خاشیان بکات.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**باسی گەلی ثەموود، کە پێغەمبەرەکەیان صالح عليه السلام بووە، هەروەها لە بەسەرهاتی گەلی ثەموودیشدا، نیشانە هەن، چونکە لە فەرمانی خوا یاخیی بوون و سنوورشکێنییان کرد، خواش بڵێسەی ئاگرو هاڕژنی نارده سەریان و قڕەبڕ بوون و تاقیان لێ نەما:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، ئەم (و)ە دیسان ئەم ڕستەیە، ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە بۆ سەر هی پێشێ، واتە: لە بەسەرهاتی گەلی ثەموودیشدا نیشانەی زۆر هەبوون و هەن، لەسەر باڵادەستیی خوا و، لەسەر ئەوە کە خوا سبحانه وتعالى لە مرۆڤان ناگەڕێ، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچن، بەڵکو دوای مردن زیندوویان دەکاتەوە بۆ ئەوەی سزاو پاداشتیان هەبێ، ﴿ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، کاتێ: پێیان گوترا: بۆ ماوەیەکی کەم بەهرە وەربگرن، ئایا ئەمە مەبەست پێی چییە؟ لە سوورەتی **(هود)**دا خوا سبحانه وتعالى ئەوەی لێرە بە کورتیی فەرموویەتی، لەوێ ڕوونی کردۆتەوە، کاتێك صالح عليه السلام دەچێ بۆ لای گەلی ثەموودو پەیامی خوایان پێ ڕادەگەیەنێ، ئەوانیش داوای موعجیزەیەکی لێ دەکەن، وەك لە تەفسیری سوورەتی **(الحجر)**دا، بە تەفصیل باسی بەسەرهاتی صالح عليه السلام و گەلەکەی ثەموودمان کردوە، داوای لێ دەکەن موعجیزەیەکیان بۆ بێنێ، ئەویش دەڵێ: موعجیزەکە چی بێ؟ شاخێکی گەورەی لێ دەبێ، دەڵێن: با لەو چیایە حوشترێکمان بۆ بێتە دەرێ هەر ئێستا، بەڵام بەچکەکەشی لەگەڵدابێ، ئەویش داوا لە خوای پەروەردگار دەکات، یەکسەر ئەو شاخە دەجووڵێ و حوشترێکی لێ دێتەدەر، حوشترێکی زۆر گەورەو

بەچکەکەشی بەدوایەوە دەبێ، دیارە هەندێکیان بڕوای پێ دێنن، بەڵام هەندێکیان بڕوای پێ ناهێنن و دەڵێن: ئەوە جادووە، ئیدی لە بەینی خۆیاندا دەبێتە کێشە، لەوێ بەسەرهاتەکەمان بە تەفصیلْ باس کردوە، سەرەنجام خوای پەروەردگار گەلی ثەموود لە بەین دەبات، جگە لەوانەی بڕوایان بە صالح ﷵ هێناوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قِيلَ لَهُمۡ تَمَتَّعُواْ حَتَّىٰ حِينٖ ٤٣ ﴾، کاتێ پێیان گوترا: تاکو ماوەیەکی کەم بیگوزەرێنن، ئەوە لە سووڕەتی (**هود**)دا ڕوونکراوەتەوە کە دوای ئەوەی ئەوان ڕەفزی پەیامەکەی صاڵحیان کرد ﷵ، صالح هۆشداریی پێدان: ﴿ فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ ﴾هود، واتە: (صالح ﷵ) پێیگوتن: بۆ ماوەی سێ ڕۆژان لە ماڵ و حاڵی خۆتاندا دەمێننەوە، ئەوە بەڵێنێکە درۆی تێدا نەکراوە، واتە: ئەگەر هەر لەسەر بێبڕوایی خۆتان بەردەوام بن، سێ ڕۆژی دیکە چاوەڕێ بن، بەڵاتان بۆ دێ، ئەوانیش هەر گاڵتەیان پێکردو، سەرەنجام:

**٢)**- ﴿ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ ﴾، ئەوان لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخیی بوون، (**العُتُوُّ: الكِبْرُ وَالشدَّة وَتَجَاوُزُ الحَدِّ**)، (عتو): بریتیە لە خۆ بە زلگریی و سەختیی و سنوورشکێنیی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ ﴾، (**وضُمِّنَ «عَتَوْا»: مَعْنى أعْرَضُوا، لِذا عُدِّيَ بـ «عَنْ»**)، (**عَتَى**)، بە مانای: (**تَكَبَّر**) یان (**تَجَاوَز الحَدَّ**)، بەڵام لێرە: ﴿ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ ﴾، وشەی (**عَتَى**)، مانای (**أعْرَضَ**)ی خراوەتە نێو، بۆیە بە (**عَنْ**) بەرکاری خواستوە، کەواتە: ﴿ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ ﴾، یانی: خۆیان بەزلگرت و سنوورشکێنییان کردو پشتیشیان کردە فەرمانی پەروەردگاریان، واتە: وشەی (**عَتَى**)، بە هۆی ئەوە وە کە بە (**عَنْ**) بەرکاری خواستوە، دوو واتای هەن، وێڕای واتا ئەصڵیەکەی خۆی کە بریتیە لە خۆبەزلگریی و سنوور شکێنیی، مانای پشت تێکردن و ڕوو وەرگێڕانیشی هەن.

﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴾، ئیدی بلێسەو هاڕژنێک گرتنی، چونکە (**صَاعِقَةِ**)، کە خوێندراویشەتەوە: (**فأخَذْتُهم الصَّعْقَةِ**)، هەردوو خوێندنەوەکەی

هەن بە (**النَّارُ المُحْرِقَة**)، ئاگرێکی سووتێنەر، ماناکراوە، هەندێکیش گوتوویانە: (**الصَّيحة**)، هاڕژن و دەنگێکی گەورە، هەندێکیش گوتوویانە: (**كُلُّ عَذَابٍ مُهْلِك**)، هەر ئازارێکی فەوتێنەر، بەڵام لە ئەصڵدا (**صاعِقَة**): بە ئاگرێك دەگوترێ لە ئاسمان بێتە خوار.

٣)- ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾، هەورە تریشقە و بلێسەیەك، هاڕژنێك گرتنی لە کاتێکدا تەماشایان دەکرد، لە ئاسمان ڕا هاتە خوار، ئنجا ئایا نەیزەکێك بووە خوا ﷻ بەو شوێنەی ئەوانی داداوە! هەر چۆن بووە گرنگ ئەوەیە بلێسەیەکی ئاگر بووەو، هاڕژنێکی زۆر گەورەی هەبووە، چونکە لە هەندێ شوێن دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ ﴿٤١﴾﴾ المؤمنون، (**صَيْحَة**)، هاڕژنێکی بێرەزاو دەنگێکی گەورە، ئەو بلێسە ئاگرەی لەو شوێنەی داوە، دیارە دەنگ و سەداو هاڕژنێکی گەورەشی لێ هاتوە.

٤)- ﴿فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ﴾، کاتێك ئەو بلێسە ئاگرەو ئەوە هاڕژنە گرتنی، نەیانتوانی هەڵسن، یانی: کە کەوتبوون، هەر نەیانتوانی هەڵسنەوەش، یاخود نەیانتوانی هەڵسن و هیچ جۆرە هەڵسانێکیان بۆ نەکرا، ﴿فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ﴾، چونکە خوا ﷻ نەیفەرموە: (**فَمَا قَاموا**)، یان (**فَمَا اسْتَطَاعُوا قِيَاماً**)، بەڵکو فەرموویەتی: (**فَمَا اسْتَطَاعُوا مِنْ قِيَام**)، واتە: هیچ جۆرە هەڵسانێکیان نەتوانی، ئەم (**من**)ە، بۆ تۆخکردنەوەو جەختکردنەوەی ئەوەیە کە هیچ جۆرە هەڵسانێکیان بۆ نەکراوە، هەر لە سەرەتای هەڵسان تاکو کۆتایی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە نەیانتوانی هەڵسنە سەر پێ، بۆ ئەوەی کە بەرگری لە خۆیان بکەن، واتە: دوو واتای هەیە، یان بە مانای ئەوە کە نەیانتوانی هەڵسنەوە کەوتبوون، یاخود نەیانتوانی ڕاست بنەوەو بەرگری لە خۆیان بکەن، ﴿وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾﴾، کەسیش یارمەتی نەدان، کەسیش سەری نەخستن، چونکە دەڵێ: وشەی (**مُنْتَصِرِينَ: انْتَصَرَ مُطاوِعُ نَصَرَ، أيْ: ما نَصَرَهم أحَدٌ**)، هیچ کەس یاریدەی نەدان و پشتی نەگرتن، واتە: نە بۆ خۆیان توانیان هەڵسنە

پـێ، چ بـۆ ڕاکـردن لـەو سـزایە، چ بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی و، نـە کەسـش هەبـوو یارمەتییـان بـدات و پشـتیان بگـرێ.

وەك پێشـتر باسـمان کـرد: لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الحجـر**)دا بەسـەرهاتی گـەلی ثەمـوودو پێغەمبەرەکەیـان صاڵـح عليه السلاممـان بـە تەفصیـڵ باسـکردوە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**باسی گەلی نووح ، هەروەها خوای کارزان و باڵا دەست، گەلی نووحیشی پێشتر فەوتاندوە، چونکە لادەر و لارێ بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ﴾، گەلی نووحیشمان پێشتر فەوتاندبوو، واتە: (**أَهْلَكْنَا قَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْل**)، وشەی (**قَوْمَ نوحٍ**) خوێندراویشەتەوە: (**وَقَوْمِ نُوحٍ**)، ئەگەر (**قَوْمَ**) بێ، واتە: (**أَهْلَكْنَا قَوْمَ نُوحٍ**)، (**قَوْمَ**): دەبێتە بەرکار بۆ کار و بکەر (**فِعْلُ وَفاَعِل**)ێکی قرتێنراو کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، ئەگەر (**قَوْمِ**)ی بێ، دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر ئەموود کە دەفەرموێ: ﴿ وَفِى ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ ﴾، ثەموود لەبەر دوو هۆکار کە (**عُجْمَة وعَلَمِيَّة**) ن، ئەگەرنا شوێنەکەی شوێنی (**جَرّ**)ە، واتە: لە گەلی نووحیشدا نیشانە هەن، کە پێشتر فەوتاندمانن، وەك چۆن لە گەلی ثەموودو گەلەکانی دیکەدا، نیشانە هەبوون لەسەر باڵادەستیی خواو، لەسەر ئەوە کە خوا  لە مرۆڤ دەپێچێتەوەو زیندووی دەکاتەوەو، سزاو پاداشت چاوەڕێی دەکات.

٢)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی لادەر و لارێ بوون، ئەمە پاساو هێنانەوەو، بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ئەوەی بۆچی خوا  گەلی نووحی فەوتاند؟ لەبەر ئەوەی لارێ و لادەر بوون.

بەسەرهاتی نووح  و گەلەکەیمان لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (هود)دا، بە تەفصیل باسکردوە.

## مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:

**خوا ئاسمانی بەهێزی بێ سنووری خۆی بنیات ناوەو، فراوانیشی دروست کردوە، یان فراوانیشی دەکات و، زەویشی باش پان ڕاخستوەو، لە هەر شتێکیش جووتی دروست کردوە، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان پەند وەربگرن و بیریان بێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾، ئاسمانیشمان بەهێز بنیات ناوەو بەرز کردۆتەوە، (**واسْتُعِيرَ البِنَاءِ لخَلْقِ السَّمَاءِ، كَالْقُبَّةِ فِي نَظْرِ الإنْسَانِ**)، وشەی (**بناء**): لێرەدا بەکارهێنراوە لە جیاتی (**خَلْق**) هێنانە دی، چونکە ئاسمان کە مرۆڤ تەماشای دەکات، وەك گومبەزێکی بەرزە بەسەر سەری دادراوە، وەك لە (الرحمن)دا فەرموویەتی: (والسماء رفعها) ئاسمانیشی بەرزکردۆتەوە واتە: هێناویەتە دی، بە بەرزیی، (**والأَيْدُ: القُوَّةُ، وأَصْلُهُ جَمْعُ يَدٍ، خَلَقْنَاهَا بِقُوّةٍ فَرِيْدَةٍ**)، وشەی (**أَيْد**) بە مانای (**قُوَّة**)ە، بەڵام لە ئەصڵدا کۆی (**يَدْ**)ە، کە بە (**أَيْدي**) کۆدەکرێتەوە، بەڵام لێرەدا (**أَيْد**) بە مانای هێزە، واتە: بە هێزێکی تایبەت بە خۆمان ئاسمانمان دروستکرد، وشەی ئاسمانیش کاتێك بە تەنیا بێ، مەبەستی کۆی گەردوونە، کە باسی زەوییش دەکرێ، دیارە زەوی شتێکی بچووکە لە نێو گەردووندا، بەڵام بۆ ئێمەی دانیشتووانی زەوی، زەوی گرنگترە لە ئاسمان، چونکە ئێمە لەسەر زەوی دەژین و ئاسمانیش بە سەر سەرمانەوەیە وەك سەقفێك تەماشای دەکەین، ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾﴾الأنبياء، ئەگەرنا وەك واقیع، زەوی ئێمە شتێکی زۆر بچووکە لە نێو گەردووندا، خواش ﷻ وشەی (**سَمَاء**)ی بۆ گەردوون، بەو چەمکە باوەی ئێستا ئێمە لەم ڕۆژگارەدا بەکاری دێنین، بەکاری دێنێ.

٢)- ﴿ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾، ئێمە توانای بێ سنوور و فراوانیشمان هەیە، یان ئێمە فراوانیشمان کردوە، چونکە (**والمُوسِعُ: اسْمُ فاعِلٍ مِن أوْسَعَ، إذا كانَ ذا وُسْعٍ، أيْ: قُدْرَةٍ**)، کەواتە: (﴿ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾، واتە: ئێمە دەسەڵاتی فراوانیشمان هەبوو، یاخود ئێمە ئاسمانمان فراوانیش کرد، یاخود: فراوانیشی دەکەین.

٣)- ﴿ وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ ﴾، زەوییشمان ڕاخستوە، ئێمە باشترین ئامادە کەرین، باشترین ڕاخەر بووین بۆ زەوی، (**والفَرْشُ: بَسْطُ الثَّوْبِ**)، (**فَرْش**): بریتیە لەوەی پۆشاکێك بڵاو بکرێتەوە، (وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا : **جَعَلْنَاهَا مَبْسُوطَةً**)، زەوییمان پان ڕاخستوە.

٤)- ﴿ فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ ﴾، ئێمە باشترین ئامادەکەر و ڕێکخەر بووین، بۆ زەوی، باشمان ڕێکخستوەو ئامادەمان کردوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لە سەری بژی، هەروەها جندیش لەگەڵ مرۆڤدا.

٥)- ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، لە هەموو شتێك جووتمان هێناوەتە دی، بەڵکو پەند وەربگرن.

ئێمە دواتر لە کورتە باسێکدا باسی ئەوە دەکەین، ئاسمان گەردوون چۆن لێك دەکشێ؟ هەروەها باسی جووتییەتیی دەکەین لە هەموو دروستکراوەکانی خوادا ﷻ، بۆیە لێرە بە کورتیی مانامان کردن، ئایەتە موبارەکەکانمان ماناکردن و، پێشتریش باسی زەوییمان کرد لە تەفسیری ئەو دوو ئایەتە موبارەکەدا: ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## کورتەباسێک لەبارەی

## لێککشانی ئاسمان (گەردوون)ەوە

لەبەرتیشکی ئەو ئایەتە موبارەکەی سووڕەتی (**الذّاريات**)دا: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئاسمانمان بەهێز هێناوەتە دی، [بنیاتمان ناوە و بەرزمان کردۆتەوە]و ئێمە فراوانکەریشینیی.

توێژەرەوانی پێشوو لە قوڕئان، ڕوونکەرەوانی ئایەتەکانی قوڕئان، بەس ئەو مانایەیان لێگرتوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئاسمانمان بەهێز دروستکردوەو بە فراوانییش دروستمان کردوە، یاخود: ئێمە خاوەن دەسەڵاتی فراوانیشین، بەڵام ئەم تەعبیرە (وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ)، کە (**مُوسِع**)، ناوی بکەر (**اسْمُ فَاعِل**) و خوا ﷻ بە کۆ هێناویەتی، هەروەك چۆن ئەو مانایە هەڵدەگرێ، ئێمە فراوانکەریشین، واتە: بە فراوانیی دروستمان کردوە، ئەوەش هەڵدەگرێ کە ئێمە بەردەوام فراوانیشی دەکەین، ئنجا ئەوە ئێستا مەیلەو بووەتە ڕاستییەکی زانستیی و، پێشتر بیردۆزەیەك بووە کە گەردوون لێك دەکشێ، وشەی (**سماء**)یش لە قوڕئاندا بە مانای گەردوونە بە زاراوەی ئێستا، لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی)دا، باسمان کردوە، کە (د. **زغلول النجار**)، لە کتێبی (**من آيات الإعجاز العلمي**)[1]، لە ژێر ناوونیشانی: (**بداية تعرّف الإنسان على ظاهرة توسع الكون**)، سەرەتایەکانی ئاشنابوونی مرۆڤ بە دیاردەی فراوانبوونی گەردوون، لە حەوت خاڵدا، ئەوەی ئەو گوتوویەتی، بە پوختیی و گوشراویی دەیخەمە ڕوو[2]:

---

(١) کە لە ساڵی (٢٠٠٥)ز دا لە (دار المعرفة)، (بيروت، لبنان)، چاپ کراوە.

(٢) هەروەها بڕوانە کتێبی (السماءُ في القرآن) ص (٨٤-٨٩) ط٣/ ٢٠٠٥م هەر هی (د. زغلول محمد النجار).

**یەکەم:** هەتا سەرەتای دەیەی دووەم لە سەدەی بیست، زانایانی گەردووناس پێیان وابووە کە گەردوون چەسپاوەو ناگۆڕێ، ئەوەشیان کردبوو بە دەستەگیرەو بەڵگەیەك لەسەر نکووڵیی کردن لە بەدیهێنەر، دەیان گوت: ئەم گەردوونە چەسپاوە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، هاتۆتە دی، نە سەرەتای هەیەو، نە کۆتایی هەیە و، پێویستیی بە بەدیهێنەر ناکات.

بەڵام دوایی لە سەرەتای سەدەی بیستدا زانایەکی نەمساویی بە ناوی (دوبلەر)، بیردۆزەیەکی پێشکەش کرد، بەو جۆرە کە گوتی: کاتێك شەمەندەفەرێك دیدە (صافرة) لێ دەدات، ئەگەر ئەو شەمەندەفەرە بەرەو ڕووت بێ دەنگەکەی جار بۆ جار بەهێز دەبێ، بەڵام کە لێت دوور دەکەوێتەوە، جار لە دوای جار بێ هێز دەبێ، دوایی ئەو بیردۆزەیەی هێنا چەسپاندی بەسەر شەپۆلەکانی تیشکیشدا، کە تیشکێك کە بەرەو ڕووی مرۆڤ دێ، ئەگەر بەرەو ڕووت بێ، وردە وردە بە لای شینی دادەشکێتەوە، واتە: بە لای تیشکی بەهێزدا، بەڵام ئەگەر لێت دووربکەوێتەوە، وردە وردە بەرەو سووریی دەچێت، کە ئەمە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (**الزَّحزحة الزرقاء، والزَّحزحة حمراء**)، یان (**الإنزياح نحو الأزرق، والإنزياح نحو الأحمر**)، واتە: شکانەوە بەرەو شینیی، یان شکانەوە بەرەو سووریی.

ئەمە سەرەتای ئەو بیردۆزەیە کە بریتیە لە فراوانبوونی گەردوون، کە ئێستا تا ڕاددەیەك بووەتە ڕاستیەکی زانستیی و، لە قۆناغی بیردۆزە هەڵبردوە.

**دووەم:** لە ساڵی (١٩١٤ز)دا زانای گەردووناسیی ئەمریکیی (سلایڤەر)، زانی کە دەگونجێ ئەوەی (دۆبلەر) گوتوویەتی، وەك بیردۆزەیەك، بیچەسپێنێ بەسەر تیشکی ئەو ئەستێرانەدا، کە بۆمان دێن، لە ژمارەیەك لە کەهکەشانە دوورەکانەوەو، بۆی دەرکەوت کە زۆربەی ئەو کەهکەشانانەی، ئەو بە دووربینەکەی لێمان دوور دەکەونەوە، دوایی لە ساڵی (١٩٢٥) زاییندا، هەر (سلایڤەر) توانی بیسەلمێنێ چل دانە لەو کەهکەشانانە کە ئەو توانیویەتی بە دووربینەکان بیانبینێ، بە خێراییەکی زۆر لە کەهکەشانەکەی ئێمە دوور دەکەونەوە[1].

---

(١) واتە: کەهکەشانی کاکێشان، (مجرة درب التبان)، کە فارس پێی دەڵێن: (ڕاهی شیری) و عەرەب پێی دەڵێن: (درب التبّان)، واتە: ڕێی کاکێشان و، کوردیش هەر دەڵێن: ڕێی کاکێشان و ئینگلیز پێی دەڵێن (Milk way)، ڕێی شیریی.

**سێیەم:** لە ساڵی (١٩٢٩ز)دا (ئیدوین هبل)، گەیشتە ئەنجامگیرییەكی ورد، كە بە عەرەبیی وەك یاسایەك تەعبیری لێكراوە: (**سرعة تَبَاعُدْ المجْرات عَنّا، تَتَنَاسُب تَنَاسُب طرديان مع بعد مسافتها عنا، وَالّذِي عُرِفَ وَبَعْد بِإِسم قَانُون هبل**)، واتە: خێرایی دوور كەوتنەوەی كەهكەشانەكان لە ئێمە، گونجاوە بەگونجاوێكی ڕاستەوانە، لەگەڵ ئەندازەی دوورییان لێمان، واتە: هەتا لێمان دوورتربن، خێراتر دووردەكەونەوە و، هەتا لێمان نیزیكتربن خێرایی دوور كەوتنەوەكەیان كەمترە، ئەمە دوایی بە قانوونی هەبڵ ناسرا.

سەرەنجام توانی بەهۆی ئەو یاسایەوە سی و دوو (٣٢) دانە لەو كەهكەشانانە كە لێمان دووردەكەونەوە، چەندە دوور دەكەونەوە، ئەوەش بپێوێ، دوایی زانایەكی دیكە بە ناوی (ملجن هۆماسۆن)، لە ویلایەتی كالیفۆرنیا لە باسێكدا لە ساڵی (١٩٣٤)، زاینیدا بڵاویكردەوە كە ئەوە شتێكی زانداروە و ڕاستیەكی ماتماتیكیی و گەردووناسییە، كە كەهكەشانەكان لێمان دوور دەكەونەوە.

**چوارەم:** لە ساڵی (١٩١٥ز) زاینیدا (ئەڵبرت ئەنیشتاین)، كە خاوەنی بیردۆزەی ڕێژەیی (**النّظرية النسبية**)یە، بیردۆزەكەی خۆی بیردۆزەی ڕێژەیی گشتیی باسكرد كە باسی سرووشتی هێزی كێشندە دەكات و، باسی ئەوەش دەكات كە ئەم گەردوونە چەسپاوە ناگۆڕێ و، گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام دوایی (ئەنیشتاین) زۆر تووشی داچڵەكان بوو، كاتێ تەماشای كرد، هەر هاوكێشەكانی خۆی ئاماژە بەوە دەكەن، كە ئەم گەردوونە بەردەوام دەكشێ و لە فراوانبوون دایە و پێكهاتەكانی لێك دوور دەكەونەوە، پێشتر كە (ئەنیشتاین) بیردۆزەیەكی دانا بە ناوی نەگۆڕی گەردوونیی (**الثابت الكوني**) كە گەردوون ناگۆڕێ و چەسپاوە، دوایی بۆ خۆی دانی پێداهێناو گوتی: گەورەترین هەڵەی زانستیی كە لە ژیانیدا كردوویەتی ئەوە بووە، وایزانیوە گەردوون چەسپاوەو گۆڕانی بەسەردا نایەت و لە شوێنی خۆیەتی.

دواتر زانای هۆڵەندیی (ویلیام دی سیتر) باسێكی لە ساڵی (١٩١٧ز)دا بڵاوكردەوەو تێیدا گەیشتە ئەو ئەنجامگیرییەی، كە گەردوون لێك دەكشێ، ئەوەشی هەر لە بیردۆزەی ڕێژەیی ئەنیشتاین خۆی هەڵهێنجا.

**پێنجەم:** لەو کاتەوە، (واتە: لەو کاتەوە کە ئەو زانایانە ئەو بیرۆکەیان وەك بیردۆزەیەك خستە بازاڕی زانستەوە)، ئیعتیقاد پەیداکردن بەوەی کە گەردوون لێك دەکشێ، وردە وردە لە نێوان زانایان بڵاوبۆوە، چونکە لە ساڵی (١٩١٤)دا سلایڤەر، ئەو بیردۆزەیەی بۆ یەکەمجار باسکرد، دوایی لە ساڵی (١٩١٧)دا (دی سیتر) باسیکرد، دوایی (هەبڵ) دوای (هیوماسیۆن) و، کۆمەڵێکی دیکە لە زانایان کە لە ڕووی فیزیاو لە ڕووی گەردووناسییەوە لێ دەکۆڵنەوەو، لە نێویشیاندا (ئەنیشتاین) دانیان بەو ڕاستیە داهێنا، کە گەردوون لێك دەکشێ و وەك پێشتر گوتبوویان: چەسپاو نیە، بەڵکو لە حاڵەتی لێك کشان دایەو، کەهکەشانەکان لێك دوور دەکەونەوە.

**شەشەم:** زانایان بۆیان دەرکەوت ئەو کەهکەشانانەی لێمان دوور دەکەونەوە، بە خێرایی (٦٠,٠٠٠)کم لە چرکەیەکدا، تاکو (٢٧٢,٠٠٠)کم لە چرکەیەکدا و لەو نێوانەدا، تیشك (٣٠٠,٠٠٠)کم لە چرکەیەکدا دەبڕێ، ئەو کەهکەشانانە هەیانە (٢٧٢,٠٠٠)کم لە چرکەیەکدا، لە کەهکەشانەکەی ئێمە دوور دەکەوێتەوە، ئەوەش هەمووی بە کێشان و پێوان و، بە هاوکێشە ماتماتیکیەکان ئەوەیان ئەندازەگیریی کرد.

**حەوتەم و کۆتایی:** سەلمێنرانی فراوانبوونی گەردوون، وایکرد مرۆڤایەتیی چاو بەو قەناعەتەی پێشێدا بگێڕێتەوە، کە پێی بوو گەردوون حاڵەتێکی چەسپاوی نەگۆڕاوی هەیەو، نەهاتۆتە دی و لە بەینیش ناچێ و، پێویستیشی بە بەدیهێنەر نیە! هەندێك لە مولحیدەکان ئەوەیان کرد بووە بەڵگە، بەڵام دەرکەوت کە بە پێچەوانەوە: گەردوون لێك دەکشێ و لێککشانی گەردوونیش پشتڕاستی بیردۆزەی تەقینەوەی گەورە (Big bang) دەکات، کە ئەوان وایان ناو لێناوە، هەرچەندە من لە مەوسووعەی (ئیمان و ئیلحاد)دا باسم کردوە، کە ئەوە تەعبیرێکی ڕاست نیە بۆ ئەو حاڵەتەی دروستبوونی گەردوون، کە دەڵێن: تۆو یان هێلکەی گەردوونیی شتێکی زۆر زۆر بچوك بووە، ئەوپەڕی گەرم و ئەوپەڕی قەبارە بچووك و لە ماوەیەکی ئەوپەڕی کەمدا تەقیوەتەوە، لە ئەنجامی تەقینەوەیدا، ئەم گەردوونەی ئێمە دروست بووە، ئەو بیردۆزەیە ئێستا لە ڕاستییەکی زانستیی

نیزیك بووەتەوە، زۆربەی فیزیكییەكان و گەردووناسەكان قەناعەتیان وایە، ئنجا ئەو بیردۆزەیە ڕێك تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەكەی سوورەتی (**الأنبياء**)، دەكات، ئایەتی ژمارە (٣٠): ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴿٣٠﴾ ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوان نابینن كە ئاسمانەكان و زەوی یەك بوون و، ئێمە لێكمان جیا كردنەوە، ئاسمانەكان یەك بوون (رَتْقاً) پێكەوە چەسپاو بوون و لێكمان جیاكردنەوە (ففتقناهما) بیردۆزەی (بیگ بانگ)یش دەڵێ: ئەو تاكی گەردوونییە كە بە ئینگلیزی (singularty) پێدەڵێن ئەو (singularty) سینگولارتییە، ئەو تاكی گەردوونیەو، ئەو هێلكەی گەردوونییە، ئەو تۆوی گەردوونییە، تەقیوەتەوەو سەرئەنجام ئەم گەردوونەی ئێمەی لێ دروستبووە.

كەواتە: ئێمە تاكو بەرەو دوا بێینەوە، گەردوون بچووك دەبێتەوە، هەتا كاتی پێ بچێ، گەردوون فراوانتر دەبێ، هەتا بۆ دواوەی بێنینەوە، گەردوون بچووكتر دەبێتەوەو، ئێستا زانایان دیارییان كردوە دەڵێن: سەرەتای دروستبوونی گەردوون دەگەڕێتەوە بۆ (١٣ ملیارو ٧٠٠ ملیۆن ساڵ) لەمەو پێش، یان (١٣ ملیارو ٨٠٠ ملیۆن ساڵ) لەمەو پێش لەو كاتەدا ئەو سینگولارتییە، كە خاوەنی ئەوپەڕی گەرمیی، كە ئەسڵەن وێنا ناكرێ لە مێشكدا، ئەوپەڕی قەبارە بچووكیی كە زۆر زۆر لە ئەلیكترۆنیش بچووكتر بووەو، لە ماوەیەكی زۆر زۆر كەمدا كە ئەسڵەن تەصەووڕ ناكرێ، تەقیوەتەوە، لەو كاتەوەش كە تەقیوەتەوە بەردەوام ئەو گەردوونەی ئێمە لێك دەكشێ، كەواتە: هەم ئایەتەكەی سوورەتی (**الأنبياء**) كە دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوابوون نابینن كە ئاسمانەكان و زەوی یەكبوون، لێكمان جیاكردنەوە، هەروەها ئەم ئایەتەی سوورەتی (**الذاريات**) كە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، ئێمە ئاسمانمان (یان گەردوونمان) بەهێز دروستكردوەو لێكیشی دەكێشینەوە.

هەڵبەتە ئێمە زانست ناکەین بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی قورئان، بەڵکو قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فڵان بیردۆزەی زانستیی ئایا ڕاست دەردەچێ، یان نا؟ بەڵام وەك بەرچاو ڕوونییەکیش باش هەڵوێستی گەردووناسیی بزانین و لەبەر ئەوەی ئێمە دڵنیاشین، هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێ، ڕاستییەکانی کە وەحیی خوا فەرمووونی، زیاتر دەردەکەون، وەك خوای بەرز لە سوورەتی **(فصلت)** دەفەرمویٚ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و لە خۆشیاندا، پێشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە قورئان هەقە، کەواتە: تاکو زانست بەرەو پێشێ بچێ حەقانیەتی قورئان زیاتر دەردەکەوێ.

## کورتە باسێک لە بارەی

## هەبوونی جووتیەتیی لە سەرجەم دروستکراوانی خوادا

ئنجا با بێینە سەر ئایەتەکەی دیکە، کە ئەویش ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، لە هەموو شتێك جووتێکمان دروستکردوە، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو، پەند وەربگرن، سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین: کە ئەم ڕاستییە لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا باسکراوە، بەپێی ئەوەی من سەرنجی ئایەتەکانمداوە، لە چوار شوێندا ئەم ڕاستییە باسکراوە:

**یەکەم:** لە سووڕەتی (**الرعد**)دا، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو زاتەیە زەوی پان ڕاخستوەو چیایەکان و ڕووبارەکانیشی تێدا داناون و، لە هەموو میوەکاندا جووتی خوڵقاندوون، هەموو میوەکانی بە جووت خوڵقاندوون...

کە کاتی خۆی ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**الرعد**)دا شتێکمان لەو بارەوە باسکردوە.

**دووەم:** لە سووڕەتی (**يس**)دا، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: پاکی بۆ ئەو زاتەی هەموو جووتەکانی هێناونە دی، لەوەی زەوی دەیڕوێنێ و، لە خۆیان و، لەوەش کە نایزانن، کە ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سوڕەتی (**يس**)دا، لەو بارەشەوە دیسان شتێکمان باسکردوە.

**سێیەم:** ئەم ئایەتی ژمارە (٤٩)ی سووڕەتی (**الذاريات**) کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: لە هەموو شتێك جووتمان هێناوەتە دی، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن.

**چوارەم:** لە سوورەتی **(الفجر)**دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَالْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ ﴿٥﴾﴾، ﴿وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾، سوێند بە جووت و بە تاك، تاکەکە خوایە ﷻ و جووتەکەش جگەلە خوایە و هەموو دروستکراوەکان جووتن.

هەڵبەتە هەر کەسە بە پێی زانیاریی و شارەزاییەك کە لە ڕۆژگاری ئەو دا هەیە، دەتوانێ قورئان تەفسیر بکات، هەر بۆیە توێژەرەوانی قورئان ئەوانەیان کە فەرهەنگ و ڕۆشنبیریی و زانستیی ڕۆژگاری خۆیان باشتر هەزم و ئیستیعاب کردوە، چاکتر توانیویانە هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان کە پەکیان لەسەر زانست کەوتوە بۆ ڕوونکردنەوەیان، تەفسیریان بکەن، بۆ وێنە: **(فخرالدين الرازي)** لەبەر ئەوەی پیاوێکی مەوسووعیی و شارەزا بووە لە بواری زانستەکانی ڕۆژگاری خۆیدا، دەبینن باشتر توانیویەتی لە هەندێك لە ئایەتەکان تێبگات و، هەندێك لە ڕاستییەکان کە قورئان ئاماژەیان پێ دەکات، ڕاستییە زانستییەکان، پەییان پێ بەرێ، هەروەها **(أبو حامد الغزالي)** **(ابن تيمية)** ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، بەڵام ئەوانەیان کە زۆر شارەزای زانست و نەبوون شارەزای فەلسەفەو حیکمەت نەبوون، شارەزای گەردووناسیی نەبوون، بە زانیارییەکانی ڕۆژگاری خۆیان شارەزا نەبوون، هەندێك لە ئایەتەکانیان بە جۆرێك تەفسیر کردوە، لەگەڵ زانستدا تێك بگیرێ.

هەڵبەتە خەتای ئایەتەکان نەبووە و، خەتای کەم تفاقیی ئەو توێژەرەوەی قورئان بووە، کە شارەزای زانست نەبووە لە ڕۆژگاری خۆیدا، چونکە زانست هەرچۆن بێ وردە وردە گەشە دەکات و فراوان دەبێ، ئەوانەش کە لە ڕۆژگاری خۆشیاندا فیکر و زانستی ڕۆژگاری خۆیان، باش وەخۆگرتوە، تواناداتر بوون، لە تێگەیشتنی هەندێك لە ئایەتەکان، کە پێویستییان بە عەقڵێکی زانستییانە هەیە، بۆ لێتێگەیشتن.

ئایا زانایانی پێشێ ئەم حاڵەتی جووتیەتیی لە هەموو شتێکدا، چۆن تەفسیریان کردوە؟ ئەوان - کە تەفسیرەکەشیان ڕاستە - گوتوویانە: هەموو دروستکراوەکان جووتن، ئاسمان و زەوی، دنیاو دوارۆژ، ڕووح و جەستە، ڕاست و چەپ، سەرو خوار، پاش و پێش، ساردو گەرم، هاوین و زستان، بەهەشت و دۆزەخ، هەروەها پیاو و ئافرەت، نێرو مێ لە ئاژەڵاندا، بێگومان ئەوە ڕاستیشە، کە هەموو دروستکراوەکان جووتن، هەموو دروستکراوەکان لە بەرانبەر یەکدییدان، بەڵام ئایا ئەوەی خوا دەفەرموێ: هەموو شتێکمان بە جووت دروست کردوە، هەر تەنیا ئەوەندە چەمك و واتایەی هەیە؟ بە دڵنیایی نەخێر، کاتی خۆی زانراوە کە مرۆڤ و ئاژەڵ نێرو مێیان هەیە، هەروەها مرۆڤ زانیویەتی کە دارخورما نێرەو مێیەی هەیەو، هەندێك لە ڕووەکەکان زانیویەتی نێرەو مێیەیان هەیە، هەروەها زانیویانە کە بەهۆی پەپوولەو مێش و مەگەزو هەنگ و ئەوانەوە، تۆوی نێرەکە بۆ مێیەکە دەچێت و مووتوربە دەبێ، هی دار خورما مرۆڤ بە خۆی تۆوی نێرەکەی بردوە بۆ مێیەکە، ئەوانە دیار بوون، بەڵام ئێستا زانست دەریخستوە ئەو ڕووەکانەش کە نێرو مێیان ئاشکرا نیە، ئەوانیش نێرو مێیان هەیە، هەیە نێرو مێیەکەی لە نێو خۆیدایە، هەندێك لە ڕووەکەکان هەیە نێرو مێیەکەی لە نێو خۆیدایە و لە نێو خۆیدا مووتوربە دەبێ، هەروەها ئێستا زانست دەریخستوە کە ماددەی بێ ژیانیش هەر جووتی هەیە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ ﴾، (وَمِن كُلِّ شَيْءٍ)، هەموو شتێك، دیارە خوا ﷻ بە خۆڕایی نەیفەرمووە، واتە: هەر شتێك کە هەیە، ژیاندارو بێ ژیان هەمووی بەجووت خوڵقاندوە.

هەروەها ئایەتەکەی سوورەتی (یس) کە دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: پاکیی بۆ ئەو زاتەی هەموو جووتەکانی هێناونە دی، لە خۆیان لەوەی زەوی سەوزی دەکات، لەوەش کە نایزانن، لەوەی نایزانن، دەگونجێ بڵێین: ئەو کاتە نەیانزانیوە

کــە مــاددەش کــە لــە گەردیلــە پێــك دێ، کــە گەردیلــەش لــە نێــو خۆیــدا موجیــب و ســالیبی هەیــە، پرۆتــۆن بارگەیــەکی موجیبــی هەیــە، ئەلیکتــرۆن بارگەیــەکی ســالیبی هەیــەو، نیوترۆنیــش بــێ بارگەیــە، ئنجــا پرۆتــۆن و نیوتــرۆن نێــوکی گەردیلــە پێــك دێنــن و، ئەلیکتــرۆن بارگــە ســالیبەکەیەتی کــە بــە دەوری نێوکەکــەدا دەخولێتــەوە.

کەواتــە: لــە گەردیلەشــدا کــە یەکەمیــن خشــتی ماددەیــە، ئەویــش دیســان جۆرێــك لــە جووتیەتیــی هەڵبەتــە هــەر ئەوەنــدەش نــا، مــادام خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، لــەوەش کــە نایزانــن ڕەنگــە لــە داهاتــوودا، زۆر شــتی دیکــەش کەشــف بــێ، کــە ئەوانیــش هــەر حاڵــەتی جووتیەتییــان تێــدا هەیــە، کــە جــارێ مــرۆڤ پێــی نەگەیشــتوە، چونکــە کــە دەفەرمــوێ: نایزانــن ئەمــە ڕێژەیــە بــە نســبەت ڕابــردووەوە، نەیانزانیــوە کــە گەردیلــەش ســالیب و موجیبــی هەیــە و، ئێمــە دەزانیــن، بــەڵام ئــەوان نەیانزانیــوە، بــەڵام ئەمــە دیســان ئێمــەش دەگرێتــەوە، ﴿ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، ئێســتا هەنــدێ شــتی دیکــەش هەیــە، کــە ئێمــە نازانیــن حاڵــەتی جووتیەتیــی هەیــە، بــەڵام لــە داهاتــوە دەردەکــەوێ، یاخــود دەریــش ناکــەوێ، کەواتــە: ئــەوەش بێگومــان ئیعجازێــکی زانســتیە لــەو ئایەتــە موبارەکــەدا.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە ئایەتـەکانی: (٥٠ - ٦٠)، واتـە: یـازدە (١١) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (الذاریـات) دەگرێتـە خـۆی، خـوا ﷻ لـەو یـازدە (١١) ئایەتـەدا، پێنـج بابـەتی گرنگـی خسـتوونە ڕوو:

١- خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ فەرمان بە خەڵك دەکات، کە بەرەو لای خوا ڕابکەن، واتە: زۆر بە خێرایی بەرەو خوا بچن، چونکە موحەممەد ﷺ ترسێنەرێکی ئاشکرایە، لە لای خواوەو تەنیا خوا بپەرستن بە ساغیی، بۆ ئەوەی لەو مەترسییەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە داهاتوودا، کە سزای خوایە، سەلامەت و دەرباز بن.

٢- ڕاگەیاندنی خوا ﷻ بۆ ئەو ڕاستییەکە: سەرجەم گەلانی پێشووش، وەك یەکدییان ڕاسپاردبێ و، ئامۆژگاریی یەکدییان کردبێ بە پێغەمبەرانی خۆیانیان گوتوە: جادووگەرن، یان شێتن، هۆکارەکەشی ئەوە نەبوو یەکدییان ڕاسپاردوە، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەبوو کە لە خوا یاخیی بوو بوون و، لە بەرانبەر خوادا سەرکەش بوون.

٣- فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی کە پشت بکاتە بێبڕوایەکان و، لەسەر ئەوەی پشتیان تێ دەکات و ئیهمالیان دەکات، سەرکۆنە ناکرێ، بەڵام با لەسەر بیر خستنەوەی خۆی بۆیان بەردەوام بێ، چونکە بڕواداران لە بیرخستنەوەی وی بەهرەمەند دەبن، کەواتە: پشت تێکردنەکەی، یانی: چی دیکە شەڕە قسەو دمبەدمەیان لەگەڵدا نەکات، بەڵام بە هێمنیی و بە ئارامیی وەك عادەتی خۆی، با لەسەر بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی خۆی بەردەوام بێ، چونکە هەر نەبێ بڕواداران لێی بەهرەمەند دەبن.

٤- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ جندو، مرۆڤی بەس بۆ پەرستنی خۆی هێناونە دی و، هیچ بژیوو خۆراکی لێیان نابێ و، هەر خۆی بژیو دەری خاوەن هێزی پتەوە.

٥- هەڕەشەکردن لە بێبڕوایانی ستەمکار، کە پشکی خۆیان لە سزاو جەزرەبەی خوادا هەیە، وەك هی هاوەڵە پێشووەکانیان لە گەلانی پێشوو، لەو ڕۆژەشدا هاوار بۆ وان لە چنگ ئەو هەڕەشەیەی کە لێیان دەکرێ.

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥٠ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ
مُّبِينٞ ٥١ كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ٥٢ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ
هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ٥٣ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ٥٤ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥
وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ٥٧ إِنَّ
ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ٥٨ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ ٥٩
فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ٦٠ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(کەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ:) دەجا بەرەو لای خوا ڕابکەن، بێگومان من لەلایەن ویەوە بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام ﴿٥٠﴾ لەگەڵ خواشدا پەرستراوی دیکە دامەنێن، بە دڵنیایی من لە لایەن ویەوە وریا کەرەوەیەکی ئاشکرام ﴿٥١﴾ (ئەی موحەممەد!) ئەوانەی پێش وانیش (پێش ئەو کۆمەڵگایەی تۆش) هەر بەو شێوەیە هیچ ڕەوانە کراوێکیان بۆ نەهاتوە، مەگەر گوتوویانە جادووگەرە یان شێتە ﴿٥٢﴾ ئایا بەو قسە و تۆمەتە یەکدییان پێ ڕاسپاردوە؟ نەخێر بەڵکو ئەوان تێکڕایان کۆمەڵێکی یاخیی و سەرکەشن ﴿٥٣﴾ دەجا پشتیان تێ بکە (مادام ئەرکی خۆت لەگەڵیاندا ئەنجامدا) تۆ سەرکۆنەکراو نیی ﴿٥٤﴾ (ئامۆژگارییان بکەو) بیریشیان بخەوە، چونکە بیرخستنەوە سوود بە بڕواداران دەگەیەنێ ﴿٥٥﴾ جندو مرۆڤیشم تەنیا بۆ ئەوە دروست کردوون، بم پەرستن ﴿٥٦﴾ هیچ بژیوێکم لێیان

ناوێ و، ناشمەوێ خۆراکم بدەنێ ﴿٥٧﴾ بێگومان بەس خوا بژیودەری خاوەن هێزی پتەوە ﴿٥٨﴾ ئنجا مسۆگەر بۆ ئەوانەی ستەمیان کردوە (بە هۆی بێبڕواییەوە) پشك و بەش (لە سزای خوا) هەیە، وەك پشك و بەشی هاوەڵانیان (لە بێبڕوایانی پێشوو) بۆیە با پەلەم لێ نەکەن (زوو سزایان بۆ بێنم) ﴿٥٩﴾ ئنجا سزای سەخت و هاوار بۆ بێبڕوایان لەو ڕۆژەیاندا کە هەڕەشەیان لێ دەکرێ ﴿٦٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(فَفِرُّوٓاْ): (فَرَّ: هَرَبَ، وَأَفَرَّهُ غَيْرُهُ، وَرَجُلٌ فَرٌّ وَفَارٌّ)، (فَفِرُّوا)، واتە: ڕابکەن (فَرَّ: هَرَبَ)، واتە: ڕایکردو هەڵات، ئەگەر بگوترێ: وایکرد کە ڕابکات، دەگوترێ: (أَفَرَّهُ غَيْرُهُ)، واتە: غەیری خۆی وایکرد ڕابکات، هەڵبێ، ئەگەر بویستری بگوترێ: پیاوێکی هەڵاتوو، دەگوترێ: (رَجُلٌ فَرٌّ وَرَجُلٌ فَارٌّ).

(أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ): واتە: ئایا یەکدییان پێ ڕاسپارد وە، ئامۆژگاریی یەکدییان پێ کردوە، (وَصّى إِلَيْهِ وَوَصَّىَ لَهُ بِشَيْءٍ: جَعَلَهُ لَهُ)، (وَصَّى إِلَيْهِ)، واتە: ڕایسپارد (وَوَصَّىَ لَهُ بِشَيْءٍ)، واتە: وایکرد ئەو شتە بۆ ئەو بێ، (وَوَصَّىَ فُلَانًا وَوَصّىَ إِلى فُلَان: عَهِدَ إِلَيْهِ)، واتە: ئاگاداری کردەوەو ڕایسپارد.

(طَاغُونَ): (طَغَى: تَجَاوَزَ الحَدَّ)، سنووری پەسندی بەزاند، (وَطَغَى فُلانٌ: تَجَبَّرَ وَأَسْرَفَ فِي الظُّلْم)، واتە: فلانکەس ستەمی کردو زێدەڕۆیی کرد لە ستەمداو لە خۆسەپاندندا.

(بِمَلُومٍ): (لَامَهُ عَلَى كَذَا: عَذَلَهُ)، (مَلُوم: مَنْ يُوَجَّهُ إِلَيْهِ اللَّوْم)، واتە: سەرکۆنەی کردو ڕەخنەی لێ گرت، (مَلُوم) کەسێکە لۆمەو سەرکۆنەی دەکرێ.

(ٱلْمَتِينُ): (مَتُنَ الشَّيءُ مَتَانَةً: صَلُبَ وَاشْتَدَّ وَقَوِي)، کەواتە: (مَتِين) یانی: پتەو بەهێز، دەگوترێ: (مَتُنَ الشَّيءُ مَتَانَة)، واتە: شتەکە بەهێز بوو، ڕەق بوو، پتەو بوو.

(ذَنُوبًا): (الذَّنُـوب: النَّصِيْـبُ)، (ذَنُوبَـاً)، بـە مانـای پشـك و بـەش دێ، بـە (أَذْنِبَـة وَذَنَائِـب)، کۆدەکرێتـەوە، واتـە: پشـکەکان و بەشـەکان، لـە ئەصڵیشـدا (ذَنُـوب)، بـەو دۆڵچەیـە دەگوتـرێ، کـە ئـاوی لـە بیـر پـێ هەڵدەهێنجـرێ.

(فَوَيْلٌ): (وَيْـلٌ: حُلُـولُ الـشَّرِّ وَوَيْـل كَلِمَـةُ العَـذَابِ، وَالوَيْـل فِـي وَادِ جَهَنَّـمْ)، (وَيْـل)، بـە چەنـد مانایـەك هێـنراوە، یەکـەم (وَيْـل)، واتـە: هاتنـی بـەڵا و خراپەیـە، یاخـود: وشـەیەکە بـۆ ئـازار و سـزا، یاخـود: شـیوێکە لـە دۆزەخ، یاخـود: بـە مانـای هـاوار بـۆ فڵانکـەس.

(يُوعَدُونَ): (وَعَـدَ فُـلَانٌ فُلَانَـاً)، واتـە: فڵانکـەس بەڵێنـی بـە فڵانکـەس دا، بـەڵام (أَوْعَـدَ فُـلَانٌ فُلَانَـاً)، واتـە: هەڕەشـەی لێکـرد، کەواتـە: (يُوعَـدُون)، واتـە: هەڕەشـەیان لـێ دەکـرێ، سـزاو هـاوار بـۆ ئەوانـەی لـەو ڕۆژەدا هەڕەشـەیان لـێ دەکـرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خــوا ﷻ لــە کۆتایــی ئــەم ســوڕەتە موبارەکــەدا، کــە وەك گوتمــان: تــەوەرە سـەرەکییەکە بریتیـە لـە بـاسی زیندووبوونـەوەو سـزاو پاداشـت و، کـە ئـەم ژیانـە دنیاییـە قۆناغێـکی دیکـەی ژیـانی بـە دوادا دێ، لەوێـدا مـرۆڤ لێـی دەپرسـێتەوەو، لەسـەر چاکـەکانی پاداشـت دەدرێتـەوەو، لەسـەر خراپـەکانی سـزا دەدرێ، لـە کۆتایـی ئـەوەدا، خـوا دەفەرمـوێ:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، ئنجـا بـەرەو خـوا ڕابکـەن، ﴿إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾، بـە دڵنیاییـەوە مـن لـە لایـەن ئـەوەوە بـۆ ئێـوە وریاکـەرەوەو ترسـێنەرێکی ئاشـکرام، کەواتـە: لێـرەدا خـوا ﷻ لەسـەر زمـانی پێغەمبـەر ﷺ گوتوویـەتی، یاخـود فەرموویـەتی: (قُلْ فَفِرُّوا إلى الله)، واتـە: مـادام حـاڵ بـەو شـێوەیە، کـە باسـکرا، کەواتـە: بڵـێ بەرەو خـوا ڕابکـەن، مـن لـە لایـەن خـوا بـۆ ئێـوە ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـەکی ئاشـکرام، یاخـود ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـەکی ڕوونکـەرەوەم، چـاك بۆتـان ڕوون دەکەمـەوە.

﴿وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، لەگـەڵ خـوادا هیـچ پەرسـتراوی دیکـە دامەنێـن، ﴿إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾، دووبـارەی دەکاتـەوە: مـن بـۆ ئێـوە لـە لایـەن ئـەوەوە ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـەکی ئاشـکرام، یاخـود ڕوونکـەرەوەم.

﴿كَذَٰلِكَ ﴾، واتـە: ئـەو بابەتـە بـەو شـێوەیە بـوو کـە باسـکرا، یاخـود: (كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِم من رسول)، هـەر بـەو شـێوەیە ئەوانـی پێـش وانیـش، هیـچ پێغەمبەرێـك بـۆ ئـەوانی پێـش وانیـش نەهاتـوە، ﴿إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴾، مەگـەر گوتوویانـە: جادووگـەرە، یـان شـێتە، واتـە: ئـەو دوو ئەگەرەیـان بـۆ دانـاون، یـان هەندێکیـان گوتوویانـە: جادووگـەرە و، هەندێکیـان گوتوویانـە: شـێتە.

﴿ أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ ﴾، ئایا یەكدییان پێ ڕاسپاردوە بەو قسەیە، یەكدییان پێ ئامۆژگاریی كردوەو وەسیەتیان بۆ یەكدیی كردوە، ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾، نەخێر، هیچ كامیان، ڕەنگە ئاگای لەوەی دیكە نەبوو بێ، بەڵكو هەموویان كۆمەڵێكی یاخیی و سەركەش و سنوور بەزێنن، بۆیە لە بەرانبەر خوادا یاخیی بوون، بۆیە پێغەمبەرانی خۆیانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە جادووگەرو شێت تۆمەتبار كردوە، كە پێغەمبەران لە لووتكەی عەقڵدا بوون، یانی: هەر پێغەمبەرێك، لە هەر ڕۆژژگارێكدا هاتبێ، لە هەموو خەڵكی ڕۆژگاری خۆی عاقڵتر بووەو، ڕەوشت بەرزتر بووەو، مەعدەن پاكتر بووە و دڵسۆزتر بووە و ڕازاوەتر بووە، بە ڕەوشتی بەرزو جوان، تەنانەت پێش پێغەمبەرایەتییش، چ جای دوای ئەوەی خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوە، كەواتە: پێغەمبەران لە هەموو كەس دوورتر بوون لە جادووگەریی و خەڵك تێكدان و كڵاو لەسەرنانیان و لە شێتیی و نەفامییش.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾، ئنجا پشتیان تێ بكەو ڕوویان لێ وەرگێڕە، ﴿ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ ﴾، تۆ سەركۆنەكراو نیی، واتە: كەس ناتوانێ سەركۆنەت بكات و لۆمەت بكات، دوای ئەوەی پەیامی خوات پێ ڕاگەیاندوون.

بەڵام: ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەسەر بیرخستنەوەش بەردەوام بە، چونكە بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی كردن سوود دەگەیەنێ بە بڕواداران.

كە دەفەرموێ: پشتیان تێبكە، واتە: لە شەڕە قسەو زۆر خۆ پێوە ماندووكردن و خەم پێوە خواردن، لەوە وازیان لێ بێنە، بەڵام لەسەر ئامۆژگاریی كردن و بیرخستنەوەی خۆت بەردەوام بە، چونكە بەلای كەمەوە، بیرخستنەوە سوود دەگەیەنێ بە بڕواداران.

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾، جندو مرۆڤیشم تەنیا بۆ ئەوە هێناونە دی، كە بمپەرستن، واتە: حیكمەتی دروستكرانیان بریتیە لە بەندایەتیی كردن بۆ خوا، چونكە بەوە مرۆڤەكان بەختەوەر دەبن، بەوە بەهرەمەند دەبن، بەوە

قازانج دەکەن، خوای پەروەردگاریش خێرو خۆشیی بۆ مرۆڤەکان، هەروەها بۆ جندەکانیش دەوێ.

دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ئەم بابەتە شیدەکەینەوە و، کورتە باسێکی لەسەر دەخەینەڕوو.

﴿ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ ﴾، من هیچ جۆرە بژیوێکم لە ئەوان ناوێ، هیچ ماڵ و سامانێك بژیوێکم لە ئەوان ناوێ، ﴿ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴾، ناشمەوێ خواردنم پێ بدەن، کە جندو مرۆڤم دروست کردوون، بمپەرستن، لەبەر ئەوەنیە حەوجێم بەوان هەیە، من نە ماڵ و سامان و بژیوو ئیمکانیەتم لێیان دەوێ و، نە خواردن پێدانیشم لێیان دەوێ.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾، بە دڵنیاییەوە خوا زۆر بژیو دەرە، زۆریش خاوەن هێزی پتەوە، ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ ﴾، بە دڵنیاییەوە بۆ ئەوانەی ستەمکارن، واتە: بەهۆی شیرك و کوفرەوە ستەمیان کردوە، پشك و بەش هەیە لە سزا، وەك پشك و بەشی هاوەڵەکانیان، گەلانی ڕابردوو کە خوادا سزای داون، ﴿ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ ﴾، ئنجا کەواتە با پەلەم لێ نەکەن، سزایان زوو بۆ بێنم.

﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴾، سزای سەخت و هاوار بۆ ئەوانەی بێبڕوان لەو ڕۆژەدا، کە هەڕەشەیان لێ دەکرێ، ئەو ڕۆژەی هەڕەشەیان لێ دەکرێ، لەو ڕۆژەدا بە خۆیان دەزانن، کە چ هەڵەیەکی گەورەیان کردوە، لەو ڕۆژەدا لێیان دەقەومێ.

کەواتە: با ئێستا پەلە نەکەن لە هاتنی سزا، چونکە لە کاتێکدا کە سزایان بۆ دێ، ئەو ڕۆژەی هەڕەشەیان تێیدا لێ دەکرێ، ئنجا چ لە دنیادا، چ لە دواڕۆژدا، دووچاری سزایەك دەبن کە پێویستییان بەوە هەیە، هاوار لە خەڵکی ببەستن، یاخود سزایەك کە زۆر سەخت و دژوارە، لەگەڵی دا دەستەو یەخە دەبن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەمیشە بە دوای پەیامی خوا دەکەون و، ڕێبازی پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**) دەگرن، بە تایبەت پێغەمبەری کۆتایی سەروەرو گەورەی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ تاکو هەم لە دنیادا سەربەرزو ڕوو سوور بین و، دووربین لە عەیبداریی و گوناهباریی، هەم لە دواڕۆژیشدا سەرفراز بین و ڕوومان بێ بڵێین: خوایە! ئێمە بەندەی تۆ بووین و، ئەو حیکمەتەی کە تۆ ئێمەت بۆ هێناوەتە دی، کە بەندایەتیی کردنە بۆ تۆ، ئەوەتا لە ژیانی خۆماندا بەرجەستەمان کردوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکـردن بـە ڕاکـردن بـەرەو لای خـواو، نەپەرسـتنی هیـچ پەرسـتراوێکی دیکـە لەگەڵیـدا، لەسـەر زمـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، وەك ترسـێنەرێکی ئاشـکرا بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی و وریاکەرەوەیـان بـە گشـتیی و، بـە تایبـەت بـۆ ئەوانـەی بێبڕوادەبـن و هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن و، لـە ڕاسـتە ڕێـی خـوا لادەدەن:**

خـوا دەفەرمـوی: ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ۝٥٠ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ۝٥١ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، ئنجا بەرەو لای خوا ڕابکەن، (**الفِرَارُ: الهُرُوبُ، أيْ: سُرْعَةُ مُفَارَقَةِ المَكَانِ تَجَنُّبَاً لِأذَىً يَلْحَقُهُ**)، (**فِرار**)، (**هُرُوبُ**)یشی پێ دەڵێن لە زمانی عەرەبییدا، بە کوردی دەڵێن: ڕاکردن، هەڵاتن، واتە: بە خێرایی ئەو شوێنەی لێیەتی بەجێی بهێڵی، تاکو خۆی دوور بگرێ لەوەی ئازارێکی تووش بێ.

کـە دەفەرمـوێ: (**فَفِـرُّوا**)، (**ف**)ی سـەر (**فِـرُّوا**)، (**المُفَرَّعَـةُ عَـمَّا سَـبَقَ مِـنَ الـكَلَامِ، وَلَيْـسَ عَـنْ فِـرُّوا**)، واتـە: ئـەم (**ف**)یـە (**فَفِـرُّوا**)، ئەصڵـی خـۆی (**فِـرُّوا**) بـووە، کـە کـرداری فەرمانـە، (**ف**)ی چۆتـە سـەرێ و پێـی دەگوترێ: (**تَفْرِيْعٌ عَمَّا سَبَق**)، واتـە: بینـا کـراوە لەسـەر قسـەیەکی پێشـتر و لـە قسـەیەکی پێشـترەوە هاتـوە، نـەك لـە خـودی (**فِـرُّوا**)ەوە.

ئنجا بێگومان (فِرُّوا: مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوفٍ، أي: قُلْ فَفِرُّوا)، (فِرُّوا)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، واتە: خوا فەرمانی بە پێغەمبەر کردوە، بفەرموو: ڕابکەن، کە ئەوان چوێنراون بە کەسێکەوە، کە مەترسییەك ڕووبەڕووی دێ، شتێکی ترسناك ڕووبەڕووی دێ، ئەویش ڕا دەکاو هەڵدێ بۆ ئەوەی ئەو مەترسییە نەیگاتێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: (فَفِرُّوا)، واتە: مادام حاڵ بەو شێوەیە کە لە ڕابردوودا باسکرا، کەواتە: بەرەو لای خوا ڕا بکەن، دیارە ڕاکردن بەرەو لای خوا، تەعبیرێکی مەجازییە، یانی: خێرایی بکەن لە بەرەو خوا چوونتاندا، لە نیزیك بوونەوەتان لە خوادا، مرۆڤ بەچی لە خوا نزیك دەبێتەوە و بەچی بەرەو خوا دەچێ؟ بێگومان بە بەندایەتیی، بە پابەندیی بە شەریعەتەوە، بە خۆ پاراستن لە قەدەغە کراوەکان و جێبەجێکردنی فەرمان پێکراوەکان.

٢)- ﴿إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾، بێگومان من لەوەوە بۆتان ترسێنەرێکی ڕوونم، ئەمە بەڵگەو پاساوی ڕستەی پێشێیە، یانی: ڕستەی پێشێ بەڵگەی بۆ دێنێتەوە و هۆکارەکەی دەخاتە ڕوو، بۆچی دەفەرموێ: بەرەو خوا ڕابکەن؟ چونکە من لەلایەن ئەوەوە بۆ ئێوە ترسێنەرو ورياکەرەوەیەکی ئاشکرام، یاخود ڕوونکەرەوەم، چونکە زۆرجار گوتوومانە: وشەی (مُبِيْن)، دەگونجێ لە (أبَانَ)ی کرداری (لازم) بێ، وەك (أبَانَ القَمَرُ)، مانگەکە دەرکەوت، ڕۆشن بوو، دەشگونجێ لە (أَبَان)ی کرداری (مُتَعدِّي) بێ، واتە: بەرکارخواز بێ، وەك (أبَان المُعَلِّم الدَّرْس)، مامۆستایەکە دەرسەکەی ڕوونکردەوە، ئنجا ئەگەر لە هی یەکەمیان بێ، واتە: من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم، هیچ پێچ و پەنام بەسەرەوە نیەو، هیچ تەم و مژم بەسەرەوە نیە، کە من ترسێنەرو ورياکەرەوەم بۆ ئێوە، ئەگەر لەهی تێپەڕکەر (مُتَعدِّي)ەوە بێ واتە: من ترسێنەرێکم و ئەو پەیامەی پێمدا نێردراوە، بۆتان ڕوون دەکەمەوە.

٣)- ﴿وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾، لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دامەنێن، دوای ئەوەی فەرمانی پێکردن بە خوا بەیەکگرتن: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾ ئنجا شیرکیان لێ قەدەغە

دەكات، ئەمەش بۆ زیاتر جەختكردنەوەی خراپیی دژەكەیە، واتە: كە تۆ بە كەسێك دەڵێی: خوا بپەرستە و هاوبەشی بۆ دامەنێ، واتە: بەس ئەو بپەرستە.

٤)- ﴿إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾، (دووبارەی دەكاتەوە)، بە دڵنیایی من لە لایەن ئەووەوە بۆ ئێوە، ترسێنەرو وریاكەرەوەیەكی ئاشكرام، یاخود ڕوونكەرەوەم، ئەمە جەختكردنەوەی ڕستەی پێشێیە، وەك (**فخرالدين الرازي**) گوتوویەتی: ئەم ڕستەیە: (**جَمَعَ الرَّسُولَ والمُرْسَلَ إِلَيْهِمْ والمُرْسِلَ**)، ئەم ڕستەیە هەم ڕەوانەكراو، هەم بۆ لا ڕەوانەكراوان و، هەم ڕەوانەكەریشی لە خۆیدا كۆكردوونەوە.

(**إِنِّي**)، من ئەمە ڕەوانەكراو (**رَسُولَ**)ە، (**لَكُم**)، ئەمە بۆ لاڕەوانكراوان (**مُرْسَل إِلَيْهِمْ**)ە، (**مِنْهُ**)، لە لایەن ویەوە، واتە: لە لایەن خواوە، ئەمەش ڕەوانەكار (**مُرْسِل**)ە، خوا پێغەمبەری ڕەوانەكردوە بۆ لای خەڵك، تاكو بیانترسێنێ و وریایان بكاتەوەو هۆشدارییان بداتێ، لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان، بۆ ئەوەی خۆیان تووشی زیان نەبن.

## مەسەلەی دووەم:

**کۆمەڵـگا پێشـووەکانیش وەك کۆمەڵگاکـەی تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ! هـەر پێغەمبەرێکیـان بـۆ هاتبـێ بـە جادووگەریـی یـان بـە شـێتیی تۆمەتباریـان کـردوە، وەك یەکدییـان ڕاسـپاردبێ و، ئامۆژگاریـی یەکدییـان کردبـێ، بۆیـە ئەگـەر پشـتیان تێبکـەی، لەمـەودوا کـە پەیامـی خـوات پـێ ڕاگەیانـدوون، سـەرکۆنە ناکرێـی، بـەڵام لەسـەر بیرخسـتنەوە بـەردەوام بـە، چونکـە بـڕواداران لـە بیرخسـتنەوەی تـۆ بـە مسـۆگەری بەهرەمەنـد دەبـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ﴾، بەوشێوەیە ئەوانەی پێشووشیان هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە، (كَذَٰلِكَ)، دوو حاڵەتی هەن: أ- یان هەر بۆ لێکجیاکردنەوەی قسانە، واتە: ئەوەی ڕابرد بەو شێوەیە بوو، (**كَلِمَةُ كَذَٰلِكَ: فَصْلُ الخِطابِ تَدُلُّ عَلَى إنْهَاءِ حَدِيثٍ والشُّرُوعِ فِي غَيْرِهِ**)، قسەیەك تەواو بووە، دەست بە قسەیەکی دیکە دەکرێ، وەك لە کوردییشدا دەڵێ: ئەوە وابوو، ئنجا دەست بە قسەیەکی دیکە دەکرێ.

یاخـود (كَذَٰلِـكَ)، واتـە: ئـەوەی بۆمـان باسـکردی، بـەو شـێوەیە بـوو، ئـەوەی باسـمانکرد بـەو شـێوەیە بـوو، ﴿مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ﴾، ئەوانیشـیان هیچ ڕەوانەکراوێکیـان بـۆ لا نەهاتـوە.

٢)- ﴿إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ﴾، مەگەر گوتوویانە: جادووگەرە یان شێتە، ئەمە واتایەکەی بەو شێوەیە، کە حاڵی بێبڕوایانی ڕۆژگاری تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! وەك حاڵی کۆمەڵگا

پێشووەکانە کە لە پێش واندا ڕابردوون، ئەوانیش هەر بەو شێوەیە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بە جادووگەریی و بە ی تۆمەتبار کردوون، هەندێکیان گوتوویانە: جادووگەرن و هەندێکیان گوتوویانە: شێتن، یاخود: لە قۆناغێکدا بە جادووگەر و لە قۆناغێکدا بە شێتیی تۆمەتباریان کردوە، واتە: تۆمەتبارکردن بە جادووگەریی و بەشێتیی، یان لە نێویاندا دابەش بووە، یاخود: هەموویان لە قۆناغێکدا بە جادووگەر و لە قۆناغێکدا بە شێتیی تۆمەتباریان کردوون، ڕەنگە لە سەرەتادا گوتبیان: جادووگەرە، دوایی کە هەر بەردەوام بووە لەسەر پەیام گەیاندنەکەی، گوتوویانە: شێتە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ گەل و کۆمەڵگایەك، ئەوانەی لە پێش گەل و کۆمەڵگای پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ڕابردوون، هیچیان خاڵیی نەبوون لەوە کە پێغەمبەرانی خۆیان بەو دوو تۆمەتە تۆمەتبار کردوون، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی لە هەندێ شوێنی دیکەدا خوای پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە پێغەمبەرانیان بە درۆزن لە قەڵەم داون و، لە هەندێك شوێندا بە کاهین لە قەڵەمیان داون و، لە هەندێك شوێن بە شاعیر لە قەڵەمیان داون؟! وەڵامەکەی ئەوەیە کە لێرەدا خوا ﷻ زەقترین دوو تۆمەتی کە ئاڕاستەی پێغەمبەران کراون (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بە گشتیی ئەو دووەی هێناون، کە تۆمەتبارکردنە بە جادووگەریی و بە شێتیی، بەڵام بۆ کاهین و شاعیر و، درۆکردن و ئەوانە، لەوانەیە تۆمەتی دەگمەن بووبن و، تایبەت بووبن بە هەندێك لە پێغەمبەرانەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بەڵام ئەو دووانە، لە هەموو کۆمەڵگاکاندا بوون، ئەو دوو تۆمەتە بۆ هەموو پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) کراون.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴾، دەڵێ: (**الإِسْتِثْنَاءُ فِي:** ﴿ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴾، **اسْتِثْنَاءٌ مِنْ أَحْوَالٍ مَحْذُوفَةٍ، والمَعْنى:** ﴿ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ ﴾، **فِي حَالٍ مِنْ أَحْوالِ أَقْوالِهِمْ، إِلاَّ فِي حَالِ قَوْلِهِمْ: سَاحِرٌ، أَوْ مَجْنُونٌ**)، واتە: لە پێش واندا هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە، لە حاڵێك لە حاڵەکانی قسەکانیاندا، مەگەر لە حاڵی ئەو قسەیاندا کە گوتوویانە: جادووگەرە، یان شێتە.

٣)- ﴿ أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ ﴾، ئایا یەکدییان پێ ڕاسپاردوە؟ ئەمە پرسیارە، چونکە هەمزە (أَ)، (هَمْزَة الإِسْتِفْهَام)ە و بۆ پرسیارکردنە، ﴿ أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ ﴾، ئایا یەکدییان پێ ڕاسپاردوە، یەکدییان پێ وەسیەت کردوە، وا هەموویان ئەو قسەیان دووبارە کردۆتەوە، ئەو پرسیارکردنەش مەبەست خودی پرسیارکردنەکە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەو پرسیارکردنەوە پەیدادەبێ، واتە: مەبەست لە لازیمەکەیەتی کە بریتیە لە سەرسوڕمان، واتە: شتێکی زۆر جێی سەرسوڕمانە، ئایا یەکدییان پێ ڕاسپاردوە بەو قسەیە، هەموویان وەك تووتی دووبارەیان کردۆتەوە؟!

٤)- ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکی یاخیین، کە دەفەرموێ: ﴿ أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ ﴾، (بـــه)، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئەو قسەیەی پێشتر کراوە، ئایا ئەو قسەیە یەکدییان پێ ڕاسپاردوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئەو کۆمەڵگایانە زۆربەیان ئاگایان لە یەکدیی نەبووە، بۆ وێنە: کە کۆمەڵگای عاد کە پێغەمبەرەکەیان هوود بووە، فەوتاوە، فریا نەکەوتوون کۆمەڵگای ثەموود کە پێغەمبەرەکەیان صاڵح بووە، ڕایسپێرن، هەروەها کۆمەڵگا شوعەیب عَلَيْهِ السَّلَامُ کە خەڵکی مەدیەن و (أَصْحَاب الأَيْكَة) بوون، ئەوانی دیکەیان ڕانەسپاردوون، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ۝٥٣ ﴾، واتە: یەکدییان ڕانەسپارد بوو، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکی یاخیین و لە سنوور دەرچوون، لە خوا یاخیی بوون و لە سنوور دەرچوونیان، سەرچاوەی ئەو قسەیەیانە، ئنجا لەبەر ئەوەی هەموویان یاخیی بوون، بۆیە بە وشەی (قَوْمٌ)، هێناویەتی (بَلْ هُمْ)، واتە: هەر کامێك لەوانە، کۆمەڵێکی یاخیی بووە و، یاخیی بوونەکەیان وای لێکردوون ئەو جۆرە قسەیە بکەن، نەك لەبەر ئەوەی یەکدییان پێ ڕاسپاردوە، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾ بۆچی نەیفەرمووە: (بَلْ هُمْ طَاغُون)؟ چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾، واتە: هەر کامێك لەو کۆمەڵگایانە، یاخیی بوون لە خواو، لە سنوور دەرچوون و، سەرکەشیان بەرانبەر بە خوا، ئەوەندە بۆتە سیفەتێکی ڕۆچوو تێیاندا، بۆتە هۆکار و ڕاگری بوونیان.

٥)- ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ ﴾، دەجا پشتیان لێ هەڵبکە، تۆ لۆمەکراو نی، پیتی (ف)یەکە، دەڵێ: (تَفْرِيعٌ عَمَّا سَبَقَ، أي: أَعْرِضْ عَنْ جِدَالِهِمْ)، واز لە مشتومڕو شەڕە قسە

لەگەڵی کردنیاندا بێنە، مەبەست ئەوەیە: واز لە شەڕە قسەو زۆر پێوەچوون لەگەڵیان بێنە، ﴿فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ﴾، تۆ سەرکۆنە کراونی، چونکە ئەوەی لەسەر شانت بووە جێبەجێت کردوە و، ئەرکی خۆت بەرانبەریان ئەنجام داوە، بۆیە ڕەخنەو سەرکۆنە نایەتە سەر تۆ.

٦)- ﴿وَذَكِّرْ﴾، بەڵام بیربخەرەوە، لەسەر ئامۆژگاریی و بیرخستەوەی خۆت بەردەوام بە.

٧)- ﴿فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، بە دڵنیایی بیرخستنەوە سوود دەگەیەنێ بە بڕواداران، بۆیە دوای ئەوەی فەرموویەتی: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ پشتیان تێبکەو وازیان لێ بێنە، ﴿فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ﴾، تۆ سەرکۆنە کراونی، دوای ئەوە یەکسەر دەفەرموێ: (وَذَكِّرْ) بیربخەوەو ئامۆژگاریی بکە، بۆ ئەوەی وا نەزانرێ کە دەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾، مانای وایە هەر یەکجاریی وازیان لێ بێنەو، سەری خۆت هەڵبگرەو بڕۆ، نا، یانی: واز لە شەڕە قسەکردن لەگەڵیان بێنە، واز بێنە لە سوور بوون لەسەر ئەوەی گوێت بۆ بگرن و، پەیامی خوات لێ وەربگرن، واز لەوە بێنە و زۆر خۆتیان پێوە سەغڵەت مەکە، لە چەند شوێنان لە قورئاندا ئەوە هاتوە، لە سەرەتای سوورەتی (**الكهف**)دا، لە سەرەتای سوورەتی (**الشعراء**)دا، ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ ﴿٦﴾﴾الكهف، ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ ﴿٣﴾﴾، (**بَاخِعٌ**)، یانی: (**مُهْلِك**)، تۆ ڕەنگە خۆت بفەوتێنی، ئەمەش مەدحێکی گەورەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خوا ﷻ پێویست بکات چەند جار هۆشداریی بداتێ، کە لێی بگرەوە و، خۆت زۆر ناڕەحەت مەکە! مانای وایە پێغەمبەر ﷺ جاری وا هەبووە تێپەڕاندوە لە خۆ ناڕەحەتکردن و دڵسۆزیی نواندن و خۆ ماندوو کردندا بەو خەڵکەوە، بۆیە پێویستیی بەوە کردوە خوا ﷻ ئاگاداری بکاتەوە کە ئەوەندەش خۆت ماندوو مەکە، ئەوەندە خەمیان پێوە هەڵمەگرە، چونکە ئەرکی سەرشانی خۆت جێبەجێ کردوە، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو تواناو وزەی خۆی بەکارهێناوە، نەوەك بە کەمتەرخەم لە قەڵەم بدرێ، بۆیە پێویست بووە، خوا ﷻ ئەو هۆشدارییەی بداتێ، تاکو خۆشی دڵنیابێ کە کەمتەرخەم نیە، بەرانبەرەکانیشی بزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو توانای خۆی لەگەڵدا بەکارهێناون و، هەموو دڵسۆزییەکی بۆ نواندوون.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥﴾، بـە دڵنیایـی بیرخسـتنەوە سـوود دەگەیەنێ بـە بـڕواداران، واتـە: ئەگـەر هـی ئەوانیـش لە ئەگـەرو نەگـەر دایە، ئـەو بیرخسـتەوەیەو ئامۆژگاریـی تـۆ، کـە لێـی بەهرەمەندبـن، بـەڵام بەهرەمەندبوونی بـڕواداران شـتێکی مسـۆگەرو جێـی دڵنیاییـە.

کـە خـوا ﷻ بـەو شـێوەیە دەفەرمـوێ: ﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ٥٤ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥﴾، ئەمـە گرنگیـی پێـدان بـە دوێـنراو دەگەیەنـێ کـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ، کـە خـوا زۆر بـە جەختکردنـەوە دڵنیـای دەکاتـەوە کـە سـەرکۆنە کراونیـە و لۆمـەی نایەتـە سـەر، چونکـە پەیامـی خـوای بـە تەواویـی پێگەیانـدوون و، ئـەرکی سـەر شـانی خـۆی لـە بەرانبەریانـدا بـە تەواویـی جێبەجـێ کـردوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوای کارزان و میهرەبان ﷻ، جندو مرۆڤی تەنیا بۆ پەرستنی خۆی خوڵقاندوون و، بژیوو خواردنیشی لێیان ناوێ، چونکە خۆی بژیو دەرێکی ڕەهاو خاوەن هێزی پتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴿٥٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾، من جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروستکردوون، کە بمپەرستن و، بەندایەتییم بۆ بکەن، واتە: حیکمەتی دروستکرانی جندو مرۆڤ، بریتیە لە پەرستنی خواو بەندایەتییکردن بۆ خوا، هەڵبەتە ڕوونکردنەوەی چەمکی پەرستن و حیکمەتی خوا لە دروستکردنی جندو مرۆڤدا، پێویستیی بە هەڵوەستەیەکی باش هەیە، بۆیە ئێمە دوایی لە کورتە باسێك لە بارەی حیکمەتی خوا لە دروستکردنی جندو مرۆڤدا دەخەینەڕوو و، لێرەدا بە خێرایی بەسەر تەفسیری ئایەتەکاندا دەچین.

**٢)-** ﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ﴾، من هیچ جۆرە بژیوێکم لێیان ناوێ، بژیو لێرەدا بە ماڵ و سامان لێك دەدرێتەوە، وەك لە چەند شوێنێکدا خوا ﷻ فەرموویەتی، بۆ وێنە: لە سووڕەتی **(الشورى)**دا دەفەرموێ: ﴿يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ...﴿١٢﴾﴾، واتە: خوا بۆ هەر کەسێ بیەوێ بژیو فراوان دەکات، وەتەنگیشی دێنێ، بۆیان زۆر دەکات و بۆشیان کەم دەکات، بەپێی ئەوەی حیکمەتی خوا دەیخوازێ، بەڵام وێڕای ماڵ و سامان بژیو بۆ خواردنیش بەکاردەهێنرێ، وەك خوا ﷻ لە بارەی بەهەشتییەکانەوە لە سووڕەتی **(مریم)**دا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾﴾، واتە: بۆ بەهەشتییەکان خۆراك هەیە، بەیانیان و ئێواران لە بەهەشت دا، کەواتە: **(رِزْق)**، بە مانای ماڵ و سامان دێ بە گشتیی، کە بەشێك لەو ماڵ و سامانەش بریتیە لە خواردن و خۆراك،

بەڵام بە مانای خواردنیش دێ بە تایبەت، کەواتە: دەبێ تەماشای سیاقەکە بکەین، کام واتایە هەڵدەگرێ؟، ئایا واتا فراوانەکە یان واتا تەسکەکە لەگەڵیدا دەگونجێ؟ لێرەدا واتا فراوانەکە زیاتر لەگەڵیدا دەگونجێ، ﴿مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ﴾، واتە: من هیچ جۆرە بژیوێکم، یانی: هیچ جۆرە ماڵ و سامانێکم لێیان ناوێ.

٣)- ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ﴾، ناشمەوێ ئەوان خواردنم پێبدەن، بۆیە ئەوەی پێشێ **(رِزْق)**، ماڵ و سامانە بە گشتیی، ئەمەیان خواردن دانە: ناشمەوێ خواردنم پێ بدەن، واتە: من نە پێویستییم بە ماڵ و سامانی ئەوان هەیە، بۆم خەرج بکەن، نە پێویستییشم بە خواردن و خۆراکی ئەوان هەیە، پێم بدەن.

٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ﴾، بە دڵنیایی خوا بەس خۆی زۆر بژیو دەرە، **(الرَّزَّاق: الكَثِيْر الإِرْزَاق)**، ئەوەی زۆر بژیو دەدات.

٥)- ﴿ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾، خاوەن هێزی پتەوە، **(مَتِيْن)**، لە **(مَتْن)**ەوە هاتوە، **(مَتْن)**، بە مانای پشت دێ و، بە مانای شتی پتەوو ڕەق دێ، **(المَتِيْن: الشَّدِيْدُ المُحْكَم)**، سەخت و، پتەو، قاییم، پێم وایە ئەگەر لە کوردییدا بگوترێ: (پتەو) مانایەکی پڕ بە پێستیەتی، خاوەن هێزێکی پتەوە، واتە: هێز و توانای خوا عزوجل هیچ درزو، کەلێن و، بێ هێزیی ڕووی تێناکات.

## مەسەلەی چوارەم:

**بێگومان ستەمكارانی بێبڕواو هاوبەش دانەری ڕۆژگاری تۆش، ئەی موحەممەد ﷺ! بەشێك لە سزایان هەیە، وەك هی هاوەڵە ڕابردووەكانیان، بۆیە پەلەكردنی ناوێ، هاوار بۆ بێبڕوایان، سزای سەخت بۆ بێبڕوایان، لەو ڕۆژەدا كە هەڕەشەیان پێی لێ دەكرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَـٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَـٰبِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی بۆ ئەوانەی ستەمیان كردوە، بەشێك هەیە، وەك بەشی هاوەڵەكانیان، وشەی (**ذَنُوبٌ**)، لە ئەصڵی زمانی عەڕەبییدا گوتراوە: (**الدَّلْوُ العَظِيمَةُ يَسْتَسْقِي بِها السُّقاةُ عَلى القَلِيبِ**)، (**دَلْوٌ**): دۆڵچەی مەزنی پێ دەگوترێ، ئەوە كە ئەوانەی كاتی خۆی ئاوكێش بوون، ئاویان پێ لە بیرێ پێ دەردەكێشاو پێیان بەش كردوە، دەفرێكی گەورە بووە لە چەرم دروستكراوە، پتەو بووە، وا پێدەچێ تەنەكەیەك ئاو، یان كەمتر یان زیاتریشی بردبێ، ئاویان پێ هەڵكێشاوە لە بیرێ: ئەوە دۆڵچەیەك بۆ تۆ، ئەوە دۆڵچەیەك بۆ وی، دۆڵچەی كوردییش هەر لە (**دلْوُ**)وەكەوە هاتوە، دوایی خوازراوەتەوە بۆ پشك و بەش، واتە: ئەوانەی ستەمیان كردوە لە ڕۆژگاری تۆدا، كە ستەم كردنەكەیان بریتی بووە لە هاوبەش بۆ خوا دانان و، بێبڕوایی و، بە درۆ دانانی پەیامی خواو، بێبڕوایی بەرانبەر بە ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتی خوا، ئەوانەش پشك و بەشێكیان هەیە، وەك پشك و بەشی هاوەڵەكانیان، واتە: هی گەلانی ڕابردوو كە ئەوانیش بە هۆی تاوانكاریی و خراپەكاریی و بێبڕواییەوە، سزادراون، ئەوانی ڕۆژگاری تۆش بەشێك لە سزایان بۆ هەیە.

٢)- ﴿فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ﴾، با تاڵووڵەکەم لێ نەکەن، لە بنەڕەت دا، (فَلَا يَسْتَعْجِلُونِي) بووە، واتە: پەلەم لێ نەکەن، زوو سزایان بۆ بێنم، ئەوانیش پشك و بەشی خۆیان هەیەو بەشیان نابڕێ، وەك یەك بە یەكێك بە توانجەوە پێی دەڵێ: کاکە بەشی تۆش نابڕێ! بەشی وانیش نابڕێ و بەشی خۆیان دیارییکراوە، بەپێی تاوان و، ستەم و خراپەی خۆیان، وەك چۆن گەلە پێشووەکان بەشی خۆیان پێدرا، ئەوانیش بەشی خۆیان پێ دەدرێ، با پەلەم لێ نەکەن.

٣)- ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ﴾، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان، لەو ڕۆژەدا کە هەڕەشەیان پێی لێ دەکرێ، لەو ڕۆژەدا کە هەڕەشەیان لێ دەکرێ کە ڕۆژی دواییە، سزای سەخت بۆ وان، یاخود لەو ڕۆژەدا کە هەڕەشەیان لێ دەکرێ، کە بریتیە لە سزای دنیایی، سزای سەخت بۆ وان، ئنجا ئەو سزا دنیاییە:

١- دەگونجێ بەڵایەك بێ، دەگونجێ ئەو بەڵایەش بەڵایەکی زەمینیی بێ، وەك لافاو، بەڵایەکی ئاسمانیی بێ بۆیان دابەزێ.

٢- یاخود: مەبەست پێی سزای دنیایی بێ، بە دەستی بڕواداران کە سزا بدرێن، کە وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: لەم ئایەتەدا ئاماژە هەیە بۆ ئەوەی لە جەنگی بەدردا بەسەریان دێ، کە لاشەکانیان فڕێ درانە قەلیبی بەدرەوە، چونکە باسی (ذَنُوبٌ)، دەکرێ (ذَنُوبٌ)، یانی: دۆڵچە، کە دۆڵچەش ئاوی پێ لە بیر هەڵدەهێنجرێ، ئەو بیرەی کە لاشەکانی بێبڕوایانی تێ فڕێدران، بۆ ئەوەی لە گۆڕێ نەبن، قەل و داڵ و دڕندە بیانخوات، فڕێیاندانە بیر و چاڵێکەوە، (وَالقَلِيبُ: كَانَتْ بئراً غَيْرَ مَطْوِيّة)، بیرێکی چاك نەکراو، واتە: هەر چاڵێك بوو لێدرابوو بۆ ئاو، جەنازەکانیان فڕێداونە ئەوێ، بۆ ئەوەی دڕندەو داڵ نەیانخۆن، تاکو خەڵکی مەککە دێن دەیانبەنەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی جەنازەکانیان لەو چاڵەدا کۆکرانەوە، دواندنی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا...﴿٤٤﴾﴾ الأعراف، ئەم ئایەتەی هێنا، دوای ئەوەی فەرمووی: فلانکەس! فلانکەس! فلانکەس! [ناوی ژمارەیەکیان هێنا، لە ناسراوەکانیان ئەوانەیان کە زیاتر بڕیار بەدەست و ناسراو بوون]، ئێمە ئەوەی خوا

بەڵێنی پێدا بووین، بۆی هێنایەنە دی، ئایا ئێوەش ئەوەی خوا هەڕەشەی پێ لێ کردن، بۆی هێنانە دی؟ هەتا هاوەڵان یەکێك لەوانە عومەر خوا لێی ڕازی بێ و هاوەڵانی دیکە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بۆچی چەند لاشەیەك دەدوێنی بۆنیان کردووەو ڕووحیان لە بەردا نەماوە؟ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئێوە بیسەرتر نین بۆ قسەکەم لەوان، بەڵام ناتوانن، وەڵام بدەنەوە.

ئنجا لێرەدایە کە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: ئێوە بیسەرتر نین {**مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ**}[1] بەڵکو فەرموویەتی: (**مَا أَنْتُمْ بأَعْلَمَ**)، واتە: وەك چۆن ئێوە دەزانن قسەکەم، ئەوانیش دەیزانن، نەك بیبیستن، مەبەستی ئەوە بووە کە ڕووح دوای ئەوەی لە جەستە دەچێتەدەرێ، هەستەوەرەکانی ئەو جەستەیە لە کار دەکەون، ئەگەر بیستنە، ئەگەر دیتنە، ئەگەر قسەکردنە، بە هەر حاڵ هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازیبێ کە گوتوویانە: دەنگەکەیان بیستوە، مەبەستیان ئەوە نەبووە بەو گوێیە جەستەییە بیبیستن، واتە: ڕووحەکانیان ئاگادارن، ئنجا دەگونجێ ئەمە مەبەست پێی ئەوەش بێ، بەڵام بێگومان هەڕەشەی گەورەی خوا کە لە بێبڕوایانی کردوە، لە ڕۆژی دواییدا دێتە دی و، دەگونجێ هەردووکیشیان لە یەك کاتدا مەبەستبن، هەم هەڕەشەی دنیایی کە لە جەنگی بەدردا لێیان دەقەومێ و، سەرانیان دەکوژرێن، هەم لە ڕۆژی دواییشدا، کە ڕۆژی دوایی هەم ئەوانیش دەگرێتەوە و، هەم جگەلە ئەوانیش دەگرێتەوە.

---

(١) [حديث أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلى الله عليه وسلم، أَمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بِأَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلاً مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ، فَقُذِفُوا فِي طَوِيٍّ مِنْ أَطْوَاءِ بَدْرٍ، خَبِيثٍ مُخْبِثٍ وَكَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ، الْيَوْمَ الثَّالِثَ، أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا ثُمَّ مَشَى، وَاتَّبَعَهُ أَصْحَابُهُ وَقَالُوا: مَا نُرَى يَنْطَلِقُ إِلاَّ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِهِمْ: يَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ وَيَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ! أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا، فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا؟ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا تُكَلِّمُ مِنْ أَجْسَادٍ لاَ أَرْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ. أخرجه البخاري في: ٦٤ كتاب المغازي: ٨ باب قتل أبي جهل].

## کورتە باسێک لە بارەی حیکمەتی خواوە لە دروستکرانی جندو مرۆڤدا

بەڕێزان! لە سێ بڕگەی گوشراودا ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم:** خوا ﷻ هیچ شتێکی نەخوڵقاندوە مەگەر حیکمەت و ئامانجێکی لە پشتەوەیە، ئەمە لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەم ڕاستییە ڕاگەیەندراوە، بەبێ بەڵگەی نەقلییش هەر بە عەقڵیش دیارە کە خوا هیچ شتێکی نەخوڵقاندوە، حیکمەت و ئامانجێکی لە پشتەوە نەبێ.

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ﴿٢٢﴾﴾ الجاثیة، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق خوڵقاندوون، هەق یانی: چەسپاو، حیکمەت، ئامانج، ئنجا ئەگەر سەرنجی هەر شتێك بدەین لە گەردووندا دەبینین هەرکامیان، ئەرکێکی پێ سپێردراوە و ئەو ئەرکەی خۆی بە باشترین شێوە جێبەجێ دەکات، وەك مووسا ؑ لە وەڵامی فیرعەوندا کە لێی پرسی: ﴿فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ ﴿٤٩﴾﴾ طه، واتە: ئنجا پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی مووسا؟ ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾ طه، واتە: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە کە بوونی بەهەر شتێك داوە، بە هەموو شتێك و، دواییش ڕێنمایی کردوە، واتە: هێناویەتە دی، بەڵام دواییش ڕێنمایی کردوە چی بکات، چۆن بکات و چ کارێك ئەنجام بدات و چ ئەرکێك ڕایپەڕێنێ؟

هەروەها لە سوورەتی (**الأعلی**)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، ئەو زاتەی هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ڕێکیخستوە، ئەو زاتەی هەموو شتێکی ئەندازەگیری کردوەو ڕێنماییشی کردوە.

هـەر لـە گەردیلەیەکـەوە تاکو کەهکەشانەکان و تاکـو گەلە کەهکەشانەکان، تاکو هەمـوو گـەردوون، هیـچ شـتێك نیـە ئەرکێکـی نەبـێ، خـۆر ڕۆژانـە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هەڵـدێ لـە کاتێـکی دیارییکـراودا، دوایـی لـە ڕۆژئـاوا ئـاوا دەبـێ، مانـگ لـە مـاوەی (٢٧) شـەوو یـەك لەسـەر سـێی شـەوێکدا، جارێـك بـە دەوری زەویـدا دەخولێتـەوە، پێشـێ وەك دەمـە داسـێك دەردەکـەوێ، مانگـی یـەك شـەوە (هیلال) دوو شـەوە سـێ شـەوە، تاکـو دەبێتـە (بـەدر) و جێخونکـە دەبەسـتێ و دەکەوێتـە سـێزدە وچـواردە و پـازدە، دوایـی وردە وردە کـەم دەکات، تاکـو دووبـارە دەبێتـەوە دەمـە داسـێك و ون دەبـێ، بۆیـە خـوا فەرمویـەتی: ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ۝٥﴾الرحمـن، واتـە: خـۆرو مانـگ بـە ژمێـرەو بـە ئەنـدازە دانـدراون.

هەروەهـا هـەر شـتێکی دیکـە، سـەرنجی بدەیـن، دەزانیـن ئامانـج و حیکمەتێـك لـە پشـتیەوە هەیـە، کەواتـە: مـرۆڤ کـە لـە گەردوونـدا خـوا ﷻ لـە چەنـدان ئایەتـدا ڕایگەیانـدوە، گـەردوونی هەمـووی بـۆ مـرۆڤ دەسـتەبەر و، ملکـەچ کـردوە، دەسـتەمۆو رام کـردوە، بـۆ وێنـە دەفەرمـوێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ ۝٧﴾هـود، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە ئاسـمانەکان و زەوی لـە شـەش ڕۆژانـدا (بـە شـەش قۆنـاغ) هێناونـە دی، ئـەو کاتـە عەرشـی خـوا لەسـەر ئـاو بـوو، تاکـو تاقییتـان بکاتـەوە کامەتـان کـردەوەی باشـترە.

وەك دەفەرمـوێ: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ ۝٣٠﴾البقـرة، ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ ۝٧﴾الحديـد، ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ۝٣٩﴾فاطـر، ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ ۝١٣﴾الجاثية، هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوییدایـە لـە لایـەن خۆیـەوە بـۆ ئێـوەی دەسـتەمۆ کـردوەو ڕام کـردوەو ئنجـا ئەگـەر هەمـوو شـتێك حیکمەتێـك و ئامانجێـکی لـە پشـتەوە بـێ، مرۆڤیـش کـە گـەورەی گەردوونـەو جێنیشـینی خوایـەو، خـوا بـۆ تاقیکردنـەوە خوڵقاندوویـەتی و، ئەمانـەتی خـۆی پـێ سـپاردوە: ﴿إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ

مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴿٧٢﴾ الأحزاب، واتە: ئێمە سپاردەی خۆمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرن و لێی ترسان، کەچی مرۆڤ هەڵیگرت، مرۆڤێکی ئاوا ناگونجێ کە حیکمەتێك و ئامانجێك لە پشت دروستکرانیەوە نەبێ!

**برگەی دووەم:** با تەماشایەکی قسەی زانایان بکەین، لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە کە خوا دەفەرموێ: [جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروستکردوون، بمپەرستن]، زانایان زۆر قسەیان لە بارەی ئەم ئایەتەوە کردوون، هەڵبەتە قسەکردنەکەیان زیاتر لەوەوە هەڵقولاوە، کە خوا ﷻ بێگومان خاوەنی بێ نیازیی ڕەهایە و، پێویستیی بە جگەلە خۆی نیە، ئنجا کە دەفەرموێ: مرۆڤ و جندم بۆ ئەوە دروستکردوون، بمپەرستن، ڕواڵەتەکەی بۆنی ئەوەی لێ دێ، کە خوا پێویستیی بە پەرستنی ئەوان بێ، بۆیە زانایان کە تەماشای تەفسیرەکانیانم کردوە، بە جۆرێك لە جۆرەکان هەوڵیانداوە، ئەم ئایەتە موبارەکە تەئویل بکەن، بۆ وێنە:

**(الشوكاني)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] چەند ڕایەك دێنێ:

١- (**قَالَ الواحِديُّ: قَالَ المُفَسِّرُونَ: هَذَا خَاصٌّ لِأَهْلِ طاعَتِهِ، يَعْنِي: مَن أُهِّلَ مِنَ الفَرِيقَيْنِ، فالآيَةُ مَحْمُولَةٌ عَلى المُؤْمِنِينَ مِنهم**)، (**واحِدي**)، [کتێبێکیشی هەیە بە ناوی (**أسباب النزول**)]، دەڵێ: ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەمە تایبەتە بە وانەوە کە فەرمانبەریی بۆ خوا دەکەن، واتە: ئەوانەی کە لەو دوو کۆمەڵە ئامادە کراون بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

٢- (**قَالَ القُشَيْرِيُّ: والآيَةُ دَخَلَهَا التَّخْصِيصُ بِالقَطْعِ، لِأَنَّ المَجانِينَ لَمْ يُؤْمَرُوا بِالعِبادَةِ، ولا أرادَها مِنهم**)، (**قُشَيْرِيّ**) واتە: ئایەتەکە بە دڵنیایی تایبەتکردنی هاتۆتە سەرێ، چونکە شێتەکان فەرمانیان پێ نەکراوە بە خواپەرستیی و خوا لێی نەویستوون.

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص:١١٢.

مەبەستی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە بەڵێ بەگشتیی هاتوە، بەڵام مانایەکەی تایبەتە، تایبەتکەرەکەش مەرج نیە دەقێکی دیاریکراو بێ، هەندێ جار بە عەقڵ دیارەو، هەندێك جار بە دەقەکانی سوننەت دیارە، ئەو کە دەڵێ: شێتەکان فەرمانیان پێ نەکراوە بە خواپەرستیی، شێت و ئەوانەی لە حوکمی شێت دان، فەرمانیان پێ نەکراوە بە خوا پەرستیی، ئەوە لە دەقەکانی سوننەتدا هاتوە، هەروەها چەمکی گشتیی ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، واتە: خوا لەسەر هیچ کەسێك پێویست ناکات مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، شێت کە لە توانای دانیە، مانای وایە فەرمانی پێ نەکراوە بە خوا پەرستی، هەروەها منداڵ و بێ توانا (عاجز) و زۆر لێکراو (مُكـرَه).

٣- (مُجاهِد) دەڵێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾، **(أي: إلاَّ لِيَعْرِفُوني)، (قَالَ الثَّعْلَبيُّ: وهَذَا قَوْلٌ حَسَنٌ؛ لِأَنَّهُ لَوْ لَمْ يَخْلُقْهم، لَما عُرِفَ وُجودُهُ وتَوْحِيدُهُ)، (مُجاهِدٍ)** گوتوویەتی: کە خوا دەفەرموێ: بەس بۆئەوەی بمپەرستن جند و مرۆڤم دروستکردوون، یانی: کە بمناسن، **(ثعْلَبِي)** کە یەکێکە لە زانایان گوتوویەتی: ئەمە قسەیەکی باشە، چونکە ئەگەر خوا جندو مرۆڤی دروست نەکردبان، نەدەناسرا، نە خۆی بوونەکەی دەناسراو، نە یەکتاییەکەشی دەزاندرا.

٤- **(ورُوِيَ عَنْ مُجاهِدٍ أنَّهُ قَالَ: المَعْنى إلاَّ لِآمُرَهُمْ وَأَنْهَاهُمْ، كَمَا قَالَ تَعَالَى:** ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٥﴾ ﴾البينة) **(مُجاهِد)** گوتوویەتی: [ کە دەفەرموێ: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون، بمپەرستن]، واتە: بۆ ئەوە دروستم کردوون، فەرمانیان پێ بکەم و، لێیان قەدەغە بکەم، [کە فەرمانکردن و قەدەغەکردنەکەش هەن، ئنجا چەندیان فەرمانەکە جێبەجێ دەکەن و، خۆیان لە قەدەغەکە دەپارێزن، ئەوە بابەتێکی دیکەیە] وەك لە سوورەتی **(البينة)**دا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٥﴾ ﴾، فەرمانیان پێ نەکراوە، مەگەر بەوە نەبێ کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ و یەکلا بکەنەوە.

٥- (**قَالَ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ: هُوَ مَا جُبِلُوا عَلَيْهِ مِنَ السَّعادَةِ والشَّقَاوَةِ، فَخَلَقَ السُّعَداءَ مِنَ الجِنِّ والإِنْسِ لِلْعِبادَةِ، وخَلَقَ الأَشْقِياءَ لِلْمَعْصِيَةِ**)، زەیدی کوڕی ئەسلەم گوتوویەتی: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە ئەوەی کە لەسەری سرووشتێنراون لە بەختەوەریی و لە ماڵوێرانیی، بەختەوەرەکانی لە جندو مرۆڤ بۆ ئەوە دروستکردوون، بیپەرستن و پەرستوویانە، بەڵام بێ بەخت و چارەرەشەکانی بۆ سەرپێچی دروستکردوون و گوناهیشیان کردوە.

دەڵێم: ئەوە تەئویل و مانا لێدانەوەیەکە، لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکەدا ناگونجێ.

٦- (**وَقَالَ الكَلْبِيُّ: المَعْنى إلاَّ لِيُوَحِّدُونِي، فَأَمَّا المُؤْمِنُ فَيُوَحِّدُهُ فِي الشِّدَّه والرَّخاءِ، وأَمّا الكافِرُ فَيُوَحِّدُهُ فِي الشِّدَّةِ دُونَ النِّعْمَةِ**)، (**الكَلْبي**) گوتوویەتی: [کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾] واتە: مەگەر بۆ ئەوەی من بەتاك بگرن و تەنیا من بپەرستن، ئنجا هەرچی بڕواداره لە سەغڵەتیی و لە فەڕحانییداو، لە ناخۆشیی و لە خۆشییدا هەر خوا بە یەك دەگرێ، بەڵام بابای بێبڕوا تەنیا لە کاتی سەغڵەتییدا خوا بە یەك دەگرێ، بەڵام لە کاتی نیعمەت و خۆشییدا خوای لە بیر دەچێ.

٧- (**وقالَ جَماعَةٌ: إلّا لِيَخْضَعُوا لِي ويَتَذَلَّلُوا، ومَعْنى العِبادَةِ فِي اللُّغَةِ: الذُّلُّ والخُضُوعُ**)، کۆمەڵێکیش گوتوویانە: [کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾] واتە: بۆ ئەوەی بۆم ملکەچ بن و تەسلیم بن و، مانای عیبادەت لە زماندا: ملکەچیی و ژێر دەستەییە.

٨- (**إبن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**التحرير والتنوير**)دا، دەڵێ: (**فَمَعْنى الإرادَةِ هُنا: الرِّضا والمَحَبَّةُ، ولَيْسَ مَعْناها الصِّفَةُ الإلَهِيَّةُ**)، واتە: [کە لێرەدا دەفەرموێ: من مرۆڤ و جندم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون، بمپەرستن] مەبەست لە ویستنی خوا کە پەرستنی لێیان ویستوە، مەبەست پێ ڕازیبوون و خۆشویستنە، نەك ئەو سیفەتەی خوا ﷻ کە هەموو شتێکی پێ دەوێ، [بەڵکو ئەوەی شتە تایبەتەکانی پێ دەوێن، خۆشویستن و ڕەزامەندیی خوا تایبەتە بەو شتانەوە کە خوا خۆشیدەوێن، کە بریتیە لە بەندایەتیی و تاعەت و فەرمانبەریی بۆ خوا.

ئەمە ڕای ئەو زانایانە بوو کە هێنام، بەڵام لە ڕاستییدا من ئەو ڕایانەم هیچیان بە دڵ نیە و ئێستاش دێینەسەر بڕگەی سێیەم.

**برگەی سێیەم:** من ئاواى تێدەگەم، کە دەگونجێ بە عەرەبی ئاوا تەعبیری لێ بکەین: (﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ **بِإِرَادَتِهِمُ الحُرَّةَ الَّتِي أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا لِلإِبْتِلاَءِ وَالخِلاَفَةِ وَحَمْلِ الأَمَانَةِ، لِيَسْعَدُوا فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ**)، واتە: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون، تاکو بە ویستی ئازادانەی خۆیان کە پێمداون، بۆ تاقیکردنەوەو، بۆ جێنیشینایەتیی کردن و، بۆ هەڵگرتنی سپاردەکەم، بەندایەتییم بۆ بکەن، تاکو سەرەنجام لە دنیاو دوارۆژدا بەختەوەربن.

خوا ﷻ هیچ شتێکی دروست نەکردوە لە گەردووندا، حیکمەت و ئەرکێکی بۆ دیاریی نەکردبێ، بەڵام ئەو حیکمەت و ئەرکانەی خوا دیاری کردوون، بۆ دروستکراوەکان، بۆ دروستکراوەکان باشە، نەك بۆ خوا ﷻ، بۆ وێنە: خوا خۆری دروستکردوەو، ئەو ئەرکە دەبینێ کە بەبێ خۆر ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی نەدەبوو، هەروەها مانگی دروستکردوە بە هەمان شێوە و، ئەم زەوییەی بۆ ئێمە پانڕاخستوەو پڕی کردوە لە نیعمەت و، ئەم ئاسمانە شینە گومەزەی بەسەر ئێمەدا هەڵداوە و چیایەکانی خوڵقاندوون، هەرچی ڕووەکە بۆ ئێمەی خوڵقاندوە، هەرچی دارو درەخت و میوەو دانەوێڵەیە کە ژیانی بەشەر پێویستیی پێیەتی، هەر کامێك لەو شتانەی دروستیکردوە، حیکمەت و ئامانجێکی لە پشتەوە هەیە، ئەو دروستکراوە، لە خودی خۆیدا لەو حیکمەت و ئامانجەو، لەو ئەرکەی بۆی دیاریی کراوە، بەهرەمەندە.

پاشان مرۆڤ و جند لەو نیعمەتانە بەهرەمەندن و، مرۆڤیش کە دروستکراوە بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خوا، مرۆڤ خۆی لە بەندایەتیی کردنەکەی بۆ خوا بەهرەمەندە، ئنجا خوا ﷻ مرۆڤ و جندی لە ئەصڵدا بۆیە دروستکردوون، کە بەهرەمەندبن، زانیویشیەتی کە بەهرەمەند نابن بە بێ بەندایەتیی کردن بۆ خوا و، بەبێ پەرستنی خوا، بۆیە بەندایەتیی خۆی لەسەریان پێویست کردوە، تاکو بەهرەمەندیان بکات.

کەواتە: بەو شێوە لێکدانەوەیە ئەو ئیشکالە ڕواڵەتییەی زانایان ویستوویانە بەو تەئویلانە لایبەرن، بۆ خۆی لادەچێ، لە شوێنی دیکەشدا باسم کردوە، لە سەرەتای تەمەنمەوە لە ساڵانی هەشتایەکاندا جارێك لە مەجلیسێك ساڵی (١٩٨٣ز) بوو، پرسیارێکم لێ کرا، کە یەکەم جار بوو ئەو پرسیارە هەر ببیستم، یەکێك گوتی: باشە خوا یان پێویستیی بە دروستکراوەکان هەیە، یان پێویستیی پێیان نیە، لە نێوانیاندا مرۆڤ، ئەگەر پێویستیی پێیان نیە، کەواتە: شتێکی پووچ و بێ حیکمەتی کردوە، پێویستییشی پێیان نیەو دروستیشی کردوون، ئەگەر پێویستییشی پێیانە، کەواتە: خوا موحتاجی دروستکراوەکانی خۆیەتی، وەڵامت چییە؟ خوای پەروەردگاریش پێم وایە هیدایەتی دام بۆ وەڵامێکی ڕاست.

گوتم: شتەکە بەو شێوەیە دابەش ناکرێ، خوا یان پێویستیی بە دروستکراوەکانی هەیە، یان پێویستیی پێیان نیە.

گوتی: چۆن؟

گوتم: حاڵەتێکی دیکەی سێیەم هەیە، ئەویش ئەوەیە خوا ﷻ پێویستیی بە دروستکراوەکان نیە، کە بۆ ئەوە دروستی کردبن و بێ حیکمەتیش دروستی نەکردوون، بەڵام دروستکراوەکانی بۆیە دروستکردوون، بەهرەمەند بن لە بوونی خۆیان و، ئەو ئەرکانەی بۆی دیاریی کردوون، تاکو بەهرەمەند دەبن، لەو ئەرکەی خۆیان.

گوتی چۆن؟

گوتم: وێنەیەکت بۆ دێنمەوە: تۆ بە شوێنێکدا دەڕۆی بابایەکی هەژارو نەدار دەبینی نایناسیی، یان بابایەکی ئیفلیج و، نەخۆشە، هیچ ئیشێکت پێی نیە، خۆشی داوات لێ ناکات، هەر بۆ خۆت دەست دەبەیە گیرفانێ و دیارییەکی دەدەیە، ئایا پێویستییت پێی هەیە بەو هەژارو نەدارە؟ نەخێر، بەڵام ئایا کارەکەت کارێکی بێ حیکمەتە، نەخێر، بەڵکو حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، ئەو مرۆڤەت بەهرەمەند کردوە.

خـواش ﷻ ئێمـەی خوڵقانـدوە بـۆ ئـەوەی ئێمـە بەهرەمەنـد بـکات، زانیویشـیەتی بەهرەمەنـد نابیـن بەبـێ پەرسـتنی وی، ئەگـەر خـوا نەپەرسـتین دەبـێ هەندێکـمان هەندێکـمان بپەرسـتین، یـان دارو بـەرد بپەرسـتین، یـان هـەواو ئـارەزووی خۆمـان بپەرسـتین، یـان مانـگ و خـۆر، یـان یەکێـك لـە دروسـتکراوەکانی دیکـە بپەرسـتین، مـرۆڤ ئەگـەر خـوا نەپەرسـتێ، یـان دەبـێ مرۆڤێـکی وەك خـۆی بپەرسـتێ، یان شـتێك کـە لـە خـوار خۆیەوەیـە، بیپەرسـتێ، ئـەو کاتـەش بەدبەخـت دەبـێ، بـەڵام مـرۆڤ بـەوە بەختـەوەر دەبـێ، خـوا بپەرسـتێ، خـواش ویسـتوویەتی ئێمـە بەهرەمەنـد بـکات، بۆیـە پەرسـتنی خـۆی لەسـەر ئێمـە پێویسـت کـردوە، نـەك لەبـەر ئـەوەی پێویسـتیی پێیـەتی، بەڵکـو ئێمـە خۆمـان پێویسـتییمان بەوەیـە خـوا بپەرسـتین، تاکـو بەهرەمەنـد بیـن، ئـازاد بیـن، ئـازا بیـن، ڕزگار بیـن، دەربـاز بیـن، ڕاسـت و سـاغ و پـاك و چـاك بیـن لـە دنیـاداو، سـەربەرزو خۆشـحاڵ بیـن لـە ڕۆژی دوایـی دا.

پێـم وایـە ئـەوە تەفسـیرکردنی ڕێـك و ڕاسـتی ئـەم ئایەتـە موبارەکەیـە کـە لـە تەفسـیرەکاندا بـەم شـێوەیە نەمبینیـوەو زۆریـان ویسـتوویانە تەئویلـی بکـەن، هـەر لەبـەر ئـەوەی گوتوویانـە: کـردەوەکانی خـوا هیـچ ئامانـج (غرض)یـان تێـدا نیـە، واتـە: خـوا هیـچ کارێـك نـاکات لەبـەر ئـەوە پێویسـتیی بـەو کارەیـە، ئـەوە ڕاسـتە، بـەڵام کـە ئامانجـی خوایـان تێـدا نیـە، مانـای ئـەوە نیـە حیکمەتیـان تێـدا نیـە، حیکمەتەکـەی خـواش ئەوەیـە کـە ئێمـە بەهرەمەنـد بـکات، بۆیـە بەندایەتیـی بـۆ خـۆی، لەسـەر ئێمـە پێویسـت کـردوە، زانیویەتی بـەو بەندایەتییەکردنەمـان بـۆ خـوا، بەهرەمەنـد دەبیـن و قازانـج دەکەیـن لـە دنیـاو دوارۆژدا.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیرکردنی سوورەتی (**الذاريات**)، دێنین.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

# نێوەڕۆک



## تەفسیری سووڕەتی (الفتح)

## تەفسیری سووڕەتی (الحجرات)

## تەفسیری سووڕەتی (ق)

## تەفسیری سووڕەتی (الذاريات)